١٣

زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی

# بەرنامەی پێغەمبەر

## بۆ پەروەردەی منداڵان

نوسینی

محمد نور بن عبدالحفیظ سوید

چاپی دووەم

وەرگێڕانی

سهام بەرزنجی - ڕێدار ئەحمەد

پێداچونەوەی

نەوا محمد سعید - جومعە صدیق کاکە

التفسير

مەبەست لەم زنجیرەیە

## زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی

١. دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردی یە بە گرنگترین وکاریگەرترین دەقی ئەو کتێبانەی کە مەشخەڵی سەرڕێی هزری هاوچەرخی ئیسلامین.

٢. ئاشناکردنی خوێنەرو لاوی موسوڵمانی کوردە بە دەقی ئەو کتێبانەی کە سەرچاوەن بۆ رۆشنبیری ئیسلامیی و سازێنەری بێداریو رابوونی ئیسلامیی پیرۆزن.

٣. شارەزاکردنی ڕاستەوخۆی لاوی کورد بەم سەرچاوانە، ئازادکردنیانە لە گشت کۆت وبەندو بۆچوونی تەسکی حزبایەتی و تاکرەوی و ڕەوتگەرایی.

٤. بناغەیەک بێ بۆ بنیادنانی کەسایەتیەکی ئیسلامی بەهێز بۆ هەر تاکێکی موسوڵمانی کورد تا توانای ئەنجامدانی ئەو گۆرانکاریانەی هەبێ کە خودای پەروەردگار پێی سپاردوە.

لەگەڵ ڕێزو تەقدیرمان بۆ بیروڕای نووسەرانی ئەم زنجیرەیە، مەرجیش نیە ئێمە پابەندی هەموو بیروبۆچوونەکانیان بین.

با دەستووریشمان لەوەرگرتن فەرمایشتەکەی خودای پەروەردگار بێت.﴿ ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ ۚ أُوْلَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمْ أُوْلُوا۟ ﴾الزمر- ١٨

نوسینگەی تەفسیر

# بەرنامەی

# پێغەمبەر

## بۆ پەروەردەی منداڵان

### لەگەڵ چەند نمونەیەکی کرداریی ژیانی پێشینانی چاك


نوسینی: محمد نور بن عبد الحفيظ السويد

وەرگێڕانی

سهام بەرزنجی　　　ڕێدار أحمد

پێداچونەوەی

نەوا محمد سعيد　　　جومعە صديق کاکە






٢٠٠٩

ناوی کتێب بە عارەبی: منهج التربية النبوية للطفل
ناوی نوسەر: محمد نوربن عبد الحفيظ السويد
نۆرەی چاپ: چاپی یەکەمی (دار ابن كثير)
ساڵی چاپ: ١٤١٩هـ – ١٩٩٨م
ناوی کتێب بە کوردی: بەرنامەی پێغەمبەر بۆ پەروەردەی منداڵان
ناوی وەرگێڕ: سهام بەرزنجی، ڕێدار أحمد
پێداچونەوەی: نەوا محمد سعید، جومعە صدیق کاکە
پیتچنین جومعە صدیق کاکە
نەخشەسازی ناوەوە: شنۆ حمدامین
بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن/ هەولێر
نۆرە و ساڵی چاپ: دووەم ١٤٣٠ك – ٢٠٠٩ز
ژمارەی سپاردن: ٢٥٩ساڵی ٢٠٠١
تـــــیراژ: ٢٠٠٠ دانە

تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت: ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨ - ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل: ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ - ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢ ٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

# وتەی بڵاوکار

خوێنەری بەڕێز...

ئەم پەرتوکەی بەردەستت هەوڵێکی زۆر بە نرخ و پڕ بایەخە لە خستنەوەی چۆنیەتی پەروەردەکردنی منداڵ بە شێوەیەکی راست ودروست، ئەو پەروەردەیەی کە پێغەمبەرﷺ و هاوەڵانی بەڕێزی پەیڕەویان کرد و نەوەیەکی زۆر چاکیان پێگەیاند، کە رەوتی مێژووی مرۆڤایەتی گۆڕی و زۆر گۆڕانی مەزنی ئەنجام دا.

ئەمڕۆش پتر لە هەرکات و ساتێکی دیکە خێزانی موسڵمان پێویستی بەوە هەیە گرنگی بە پەروەردەکردنی منداڵەکەی بدات، و بەچاکی ئاگاداری بێت، چونکە لە هەموو لایەکەوە هەوڵ بۆ لەخشتەبردنی هەیە..

ئەگەرچی ئێمەش پێشتر توانیمان پەرتوکی (بەرنامەی پەروەردەی منداڵان)ی دانراوی (مامۆستا محمد سینەمۆکی) چاپ و بڵاو بکەینەوە، کە سودێکی زۆری بە پەروەردەکاران گەیاند، ئەوەبوو لە ماوەی چوار ساڵدا سێ جار چاپ و بڵاوکرایەوە.. بەڵام هێشتا کتێبخانەی کوردی لەم بوارەدا هەژارەو پێویستی بە پەرتوکی فراوان و گشتگیر و زانستی زیاتر هەیە کە هەموو قۆناغەکان بگرێتەوە، بۆیە بڕیارمان دا پەرتوکی (منهج التربية النبوية للطفل)ی (محمد نور سيد) وەرگێڕینە سەر زمانی کوردی و چاپ و بڵاوی بکەینەوە.

چاپی عەرەبی ئەم پەرتووکە زۆر بە گەرمی پێشوازی لێکرا، بە جۆرێك لەماوەی ساڵێکدا دووجار چاپکرایەوە، ئەوەی ئێمەش زانیبێتمان تا ئێستا زیاد لە حەوت جار چاپ کراوەتەوە، جگە لە دووجار پوختەکراو و زیادکراوە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر زیندوویەتی و پێویستی بابەتەکە.

جا بەهیوای ئەوەی ئەم پەرتوکە ببێتە چرای هەموو ماڵێك و هەموو خێزانێك لێی بەهرەوەر بێت، خوای گەورەش پشت و پەنای هەمومان بێت..

**نوسینگەی تەفسیر**

# وتەی وەرگێڕ

خوێنەری بەڕێز...

پاش ئەوەی ئەرکی وەرگێڕانی ئەم پەرتوکە نایابەمان پێ سپێردرا، ئێمەش لەبەر گرنگی و بایەخی بابەتی پەرتوکەکە بە گوڕ و تینێکی زۆرەوە دەستمان کرد بە وەرگێڕانی و بەپێی توانا‌ش هەوڵمان داوە کە بە زمانێکی ساناو سادە دایبڕێژین تا هەموو خوێنەوارێك لەهەر ئاستێکدا بێت بتوانێت سوودمەند بێت لێی، بەجۆرێك لە واتای دەقە بنەڕەتیەکە لامان نەداوەو خۆمان لە زیاد و کەم کردن پاراستووە، لەهەر جێگایەکیشدا هەستمان کردبێت پێویستی بە روونکردنەوە هەبێت پەراوێزمان بۆداناوەو روونمان کردۆتەوەو ئاماژەمان بەوە کردووە، کە ئەو زیادەیە هی وەرگێڕە.

ئەوەندەی بکرێت هەوڵمان داوە وەرگێڕانەکە هەڵەو کەم و کورتی تێدا نەبێت، بەڵام سروشتی کاری مرۆڤ وایە کە بێ کەم و کورتی نیە، هەر هەڵەو ناتەواویەکت تێدا بەدی کرد ئەوە لە ئێمەوەیەو هەر تەواوی‌و چاکیەکیشی تێدابوو ئەوە بەهرەو بەخششی پەروەردگارە...

وەك ئەمانەتێکی زانستی دەڵێین: بۆ واتاکردن و راڤەی ئایەت و فەرموودەکانیش سوودمان لە چەند کتێبێك وەرگرتووە، وەك (قورئانی پیرۆز) وەرگێڕدراوی مامۆستا (هەژار) و (تەرجەمەی قورئان)ی مامۆستا (محمد صالح ابراهیمی) و (تەفسیری ئاسان بۆ تێگەیشتنی قورئان)ی مامۆستا (برهان ئەمینی)، لەگەڵ هەرچوار بەرگەکەی کتێبی (ریاض الصالحین)ی مامۆستا (نوری فارس حەمەخان).

خوای گەورە پاداشتی بەخێری ئەوان و ئێمەش بداتەوەو ئەم هەوڵەمان بکاتە چرایەکی گەش و رووناك بۆ رۆشنکردنەوەی هەمووماڵێکی موسڵمان و ببێتە مایەی بەختەوەریان.

لە کۆتاییدا ئەوەی مابێتەوە ئاماژەی بۆ بکەین ئەوەیە کە چاپی عەرەبی ئەم کتێبە شەش پێشەکی بۆ نووسراوە، ئێمە لە نێو ئەو شەش پێشەکیەدا دوو پێشەکی پوخت و گشتگیرمان هەڵبژارد، ئەمەش لەبەر ئەوەی کە ئەرکی چاپکردنی کتێبەکە زۆر زیاتر نەبێت...ئەگینا هەرچەندە لەبارەی بەنرخی ئەم کتێبەوە بنووسرێت هێشتا کەمە...

دەخوازین هەوڵەکەمان جێگای دڵخۆشی و سوودمەند بوونتان بێت و لە نزای خێر بێبەشمان مەکەن..

**وەرگێڕان**

## بسم الله الرحمن الرحيم

# نزاو بانگهێشتی

## چاپی سێیەم

خودایە پڕ بە ئاسمانەکان و زەوی، پڕ بە هەرشتێکی دی ویستت لێی بێت، سوپاس و ستایش بۆ تۆ، لە پاشان:

یـا رب لـولا أنـتَ مـا أهتـدينا    ولا تـصَدَّقْنا ولا صَـلَّينا
فـأنْزِلَنْ سـكينةً علينـا    وثَبِّـتِ الأقـدام إن لاقينـا

- پاڕانەوەی هاوەڵان لە غەزای (الاحزاب)دا-

اللهم يا مُقَلِّب القلوب والأبصار، ثبِّت قلوبنا على دينك.

﴿ رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً ۚ إِنَّكَ أَنتَ الْوَهَّابُ ﴾آل عمران/٨.

﴿رَبِّ اشْرَحْ لِي صَدْرِي ﴿٢٥﴾ وَيَسِّرْ لِي أَمْرِي ﴿٢٦﴾ وَاحْلُلْ عُقْدَةً مِّن لِّسَانِي ﴿٢٧﴾ يَفْقَهُوا قَوْلِي ﴾ طه/ ٢٥-٢٨.

﴿رَبَّنَا افْتَحْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ قَوْمِنَا بِالْحَقِّ وَأَنتَ خَيْرُ الْفَاتِحِينَ ﴾الأعراف/٨٩.

﴿وَيَا قَوْمِ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوا إِلَيْهِ يُرْسِلِ السَّمَاءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا وَيَزِدْكُمْ قُوَّةً إِلَىٰ قُوَّتِكُمْ وَلَا تَتَوَلَّوْا مُجْرِمِينَ ﴾هود/٥٢.

﴿ قَالُوا يَا قَوْمَنَا إِنَّا سَمِعْنَا كِتَابًا أُنزِلَ مِن بَعْدِ مُوسَىٰ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ يَهْدِي إِلَى الْحَقِّ وَإِلَىٰ طَرِيقٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٣٠﴾ يَا قَوْمَنَا أَجِيبُوا دَاعِيَ اللَّهِ وَآمِنُوا بِهِ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُجِرْكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴾الأحقاف/٣١-٣٢.

﴿ وَقَالَ الَّذِي آمَنَ يَا قَوْمِ اتَّبِعُونِ أَهْدِكُمْ سَبِيلَ الرَّشَادِ ﴿٣٨﴾ يَا قَوْمِ إِنَّمَا

هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا مَتَٰعٌ وَإِنَّ ٱلْءَاخِرَةَ هِىَ دَارُ ٱلْقَرَارِ ﴿٣٩﴾ مَنْ عَمِلَ سَيِّئَةً فَلَا يُجْزَىٰٓ إِلَّا مِثْلَهَا ۖ وَمَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُو۟لَٰٓئِكَ يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ يُرْزَقُونَ فِيهَا بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٤٠﴾ وَيَٰقَوْمِ مَا لِىٓ أَدْعُوكُمْ إِلَى ٱلنَّجَوٰةِ وَتَدْعُونَنِىٓ إِلَى ٱلنَّارِ ﴿٤١﴾ تَدْعُونَنِى لِأَكْفُرَ بِٱللَّهِ وَأُشْرِكَ بِهِۦ مَا لَيْسَ لِى بِهِۦ عِلْمٌ وَأَنَا۠ أَدْعُوكُمْ إِلَى ٱلْعَزِيزِ ٱلْغَفَّٰرِ ﴿٤٢﴾ لَا جَرَمَ أَنَّمَا تَدْعُونَنِىٓ إِلَيْهِ لَيْسَ لَهُۥ دَعْوَةٌ فِى ٱلدُّنْيَا وَلَا فِى ٱلْءَاخِرَةِ وَأَنَّ مَرَدَّنَآ إِلَى ٱللَّهِ وَأَنَّ ٱلْمُسْرِفِينَ هُمْ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ﴿٤٣﴾ فَسَتَذْكُرُونَ مَآ أَقُولُ لَكُمْ ۚ وَأُفَوِّضُ أَمْرِىٓ إِلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَصِيرٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴿٤٤﴾ فَوَقَىٰهُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِ مَا مَكَرُوا۟ ۖ وَحَاقَ بِـَٔالِ فِرْعَوْنَ سُوٓءُ ٱلْعَذَابِ ﴾غافر/٣٨-٤٥.

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگاری جیهانیان و چاکترین درود و سڵاو لەسەر پێغەمبەری گەورەمان و خانەوادە و گشت یاوەرانی بێت.

لە (عمر کوڕی خطاب)ەوە ﷺ دەگێڕنەوە کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((إنما الأعمال بالنيات، وإنما لكل إمرئ ما نوى، فمن كانت هجرته الى الله ورسوله، فهجرته الى الله ورسوله، ومن كانت هجرته الى دنيا يصيبها، أو إمرأة ينكحها فهجرته الى ما هاجر اليه)).[1] واتە: هەموو کردەوەیەك بەپێی نیەت و مەبەستە، بۆ هەرکەسێکیش ئەوە هەیە کە لە نیەتیدایە، ئەو کەسەی کۆچ کردنی بۆ لای خواو پێغەمبەرەکەیەتی، ئەوە کۆچەکەی بۆ لای خواو پێغەمبەرە، ئەو کەسەش کۆچەکەی لەپێناوی مەبەستێکی دنیادا بێت تا پێی بگات، یان لەپێناوی گەیشتن بە ئافرەتێك بێت کە بیخوازێ ئەوا کۆچەکەی بۆ لای ئەو شتەیە کە کۆچی لەپێناودا کردووە.

## چەند وتەیەکی پەروەردەیی:

١- پیاوێك بە (اعمش)ی وت: ئەو منداڵانەی کە لە دەورتن! (اعمش) وتی: بێدەنگ بە، ئەوانە کاروباری ئایینەکەت دەپارێزن.[2]

٢- پیاوێك کوڕەکەی لای (ابن سحنون) فێری زانیاری دەبوو، بە (ابن سحنون)ی وت: خۆم کاروبارەکان ئەنجام دەدەم تا کوڕەکەم بەوەوە سەرقاڵ نەبێت. (ابن سحنون) وتی: ئایا زانیوتە کە پاداشتی ئەو کارەت مەزنترە لە حەج و سەنگەرگرتن و جیهاد؟[3]

٣- دەستپێشخەری بکەن لە پەروەردەکردنی منداڵەکانتاندا، بەر لە کەڵەکەبوونی ئیش و کارەکان، ئەگەرچی گەورە عاقڵمەندترە، بەڵام دڵی سەرقاڵترە. (پەند)

٤- من بڕوام بە هێزی مەعریفە هەیە، بڕوایشم بەهێزی رۆشنبیری هەیە، بەڵام من زیاتر بڕوام بەهێزی پەروەردەکردنە.[4]

---

١ متفق عليه.
٢ عن الكفاية في علم الرواية ص١١٥.
٣ عن التربية في الإسلام ص٢٥٠.
٤ سيد قطب –مجلة الرسالة عدد ٩٩٥ سنة ١٩٥٢.

# پێشکەش بێ

* بۆ باوکم کە لە منداڵیمدا هاندەرم بوو بۆ لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز و فـەرموودە شیرینەکان.

* بۆ دایکم کە واتای خۆشەویستی و ئەمەك و دڵسۆزی و حـەزکردن بـە فێربـوونی زانستی لە دەروونمدا چاند.

أبــتي وأمــي يــا رجـائي في المنــى    أبـــتي وأمـــى منبـــع الإيثــــار
إنـــي جعلــت ذخيرتـــي بـــدعاكما    ورضـــاكما عـــوني علــى الأخطــار[1]

* پاداشتی ئەم کارە پێشکەش بە دایك و باوکی خۆشەویستم دەکەم.

* بەم ئایەتە پیرۆزانە بە نزاکردنەوە روو لە خودای خۆم دەکەم و تکای قبوڵ بـوون و کۆتایی چاك لە دنیاو قیامەتدا دەخوازم:

---

١ ديوان الأميري (أمي).

# نـــــزا

﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ ﴾غافر/٦٠.

﴿ رَبَّنَا وَاجْعَلْنَا مُسْلِمَيْنِ لَكَ وَمِن ذُرِّيَّتِنَا أُمَّةً مُّسْلِمَةً لَّكَ ﴾البقرة/١٢٧.

﴿رَبِّ هَبْ لِي مِن لَّدُنكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً إِنَّكَ سَمِيعُ الدُّعَاءِ ﴾آل عمران:٣٨.

﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ اجْعَلْ هَذَا الْبَلَدَ آمِنًا وَاجْنُبْنِي وَبَنِيَّ أَن نَّعْبُدَ الْأَصْنَامَ ﴾ ابراهيم/٣٥.

﴿رَبِّ اجْعَلْنِي مُقِيمَ الصَّلَاةِ وَمِن ذُرِّيَّتِي رَبَّنَا وَتَقَبَّلْ دُعَاءِ (٤٠) رَبَّنَا اغْفِرْ لِي وَلِوَالِدَيَّ وَلِلْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ يَقُومُ الْحِسَابُ ﴾ابراهيم/٤٠-٤١.

﴿رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴾الفرقان/٧٤

﴿رَبِّ أَوْزِعْنِي أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ الَّتِي أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَالِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَالِحًا تَرْضَاهُ وَأَدْخِلْنِي بِرَحْمَتِكَ فِي عِبَادِكَ الصَّالِحِينَ ﴾النمل/١٩.

﴿قَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِي أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ الَّتِي أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَالِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَالِحًا تَرْضَاهُ وَأَصْلِحْ لِي فِي ذُرِّيَّتِي إِنِّي تُبْتُ إِلَيْكَ وَإِنِّي مِنَ الْمُسْلِمِينَ ﴾الأحقاف/١٥.

## بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان

## وتەی پێشەکی بانگبەر: (ابو حسن علی الحسنی الندوی)

سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگاری جیهانیان، درود و سڵاویش لەسەر گەورەمان پێغەمبەرﷺ و لەسەر خانەوادەو هەموو یاوەرانی بێت، و لەسەر هەرکەسێك کە بە چاکە شوێنکەوتەیان بێت تا رۆژی دوایی.

پاشان برای بەڕێزم (محمد نور سوید) داوای لێکردم کە وتەیەك دەربارەی پەرتوکەکەی (منهج التربیة النبویة للطفل) چاپی سێیەم بنوسم، دانەیەکیش لەو کتێبە بەنرخەی پێشکەش کردم، کاتێك روانیمە لاپەڕەکانی بینیم کە نووسەرانێکی هەڵبژاردەو خاوەن خامەو فیکری ئیسلامی و پەروەردە هەڵسەنگاندنی خۆیان بەرامبەر ئەم هەوڵە زانستیە گەورەیە دەربڕیوە، کە بۆشاییەکی گەورەی بواری پەروەردەکردنی منداڵی پڕ کردۆتەوە، دانەری ئەم پەرتووکەش هیچ پێویستی بە وتەیەکی نوێ نەبووە بۆ پێناسەکردنی پەرتووکەکەی، چونکە نووسەرانێکی ناسراو و دیار پێناسەیان کردووەو ناساندویانە، ناونیشانی کتێبەکەش بۆخۆی چاکترین ناسێنەرە.

دیارە کتێبەکە وەك دەردەکەوێت لە دووجار چاپکردنی لەماوەیساڵێکدا جێگەی رەزامەندی بووە، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر بەسوودی و کەڵکی ئەوەی کە تێیدا خراوەتە روو، کە شایستەی خوێندنەوەو بەهرەمەندبوونە لێی.

دیارە دانەر هەوڵی زۆری داوە بۆ کۆکردنەوەی بابەت دەربارەی ئەم باسە خۆشە" کە نووسەرانی بواری پەروەردە پەیان بەم بابەتانە نەبردووە، بە پێچەوانەی ئەوەشەوە بەرنامەی پەروەردەیی رۆژئاوا کە کۆڵەکەی ئەوان بووە، چونکە ئەم چەرخەی ئێمە تێیدا دەگوزەرێن سەردەمی داگیرکاری فیکرییە، موسڵمانانیش هەموو بوارەکانی زانین و رۆشنبیرییان داگیر کراوە، بواری پەروەردەش گۆڕەپانێکی فراوان بوو، کە دەستەڵاتی ماددی ئەوروپی بێتە ناویەوەو تێکەڵی ببێت، هەموو پێناسەکانی پەروەردەش لە یەك مەبەستدا بە یەك دەگەن کە ئەویش ئامادەو پێگەیاندنی منداڵە تاوەکو بتوانێت ئارەزووە دنیاییەکانی بەدی بهێنێت، ئەو ئەزموونانەی لەسەر ئەنجام دەدرێت، کە لەسەر ئاژەڵ و گیانلەبەران تاقیکراوەتەوە، بە بەدواداچوونی ئەو بەرنامە ماددییەش کۆمەڵگاکەمان ئادەمیزادی وای تێدا پەروەردە نابێت کە هەڵگری رەوشتی بەرز بێت.

دانەریش لەسەر بنچینەی لێکۆڵینەوەی ژیاننامە(سیرە)ی پێغەمبەرﷺ و سوننەتەکانی ئاماژەی بەوە داوە کە: قۆناغی پەروەردەکردنی منداڵ لە ژنهێنانەوە دەست پێدەکات،

پەیوەندیەکانی نێوان دایك و باوك، و پێکەوە گونجانی باوك و دایـك، و رێککـەوتنیان لەسـەر چاکە، کاریگەری خۆیان لەسەر دەروونـی منـداڵ و خواسـتەکانیدا هەیـە، هـەروەها گرنگـی پێگەیشتنی منداڵ لە ئامێزی دایك و خزم و کەس و ژینگەکەیدا، و پەیوەندیەکانی بە دایك و باوك و خزمەکانیەوە خستۆتەروو، وە باسی رەچاوکردنی نمونە ئیسلامیەکانی لـە قۆناغـەکانی پێگەیشتن و پەروەردەکردنی فیکری منداڵی کـردووە، جەختیـشی کـردوەوە لەسـەر پێویـستی بەکاربردنی ئەو هۆکارانەی کە دەگونجێت لەگـەڵ سروشـتی منداڵەکـەدا، ئەمـەش بـە سـوود وەرگرتن لە بەرنامەی شیرینی پێغەمبەرﷺ و ئەوەی لە فەرمودە پیرۆزەکانیدا هاتووە، لەگەڵ وتەی پیاوانی بواری پەروەردەی ئیسلامی، کورتەیەکی لە چیرۆك و سەرگوزشتە ئیسلامیە بـە سوودەکانی ناو پەرتووکە ئیسلامیەکان، دەربارەی پەروەردەکردنی بیری منـداڵ خـستۆتە ڕوو، تا بیری منداڵی موسڵمان لەگەڵ کەشی ئیسلامیدا ڕابێـت و، چـێژی ئیـسلامی تێـدا گەشـە بکات و، سروشتێکی ئیسلامیانەی لێ پێك بێت، کە چاکەو خراپـە، سـوود و زیـان، لەیـەك جیابکاتەوە و بەرگری خـۆیی (مناعـة ذاتيـة)ی تێـدا بێـت، دیـارە ژیاننامـەی پێغەمبـەری خواﷺش کەرەستەی ئاڕاستەدار ساز و ئامادە دەکات بۆ پەروەردەکردنی رەفتار و رەوشت لـە هەموو ئاستەکاندا.

دایکی ئیمانداران(عائشه)ل لە ناساندنی رەوشتی پێغەمبەری خواداﷺ دەڵێت: ((كان خُلُقُه القرآن))رەوشتی قورئان بووە، قورئانی پیرۆزیش ژیاننامەی پێغەمبەری خوایﷺ بۆ موسڵمانان خستۆتە روو: ﴿ لَّقَدۡ كَانَ لَكُمۡ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٌ ﴾ الأحزاب/٢١. واتە: (بەراستی پێغەمبەری خواﷺ سەرمەشقێکی چاکە بۆ ئێوە).

ناتوانرێ شوێن پێـی ئـەو سەرمەشـقە هـەڵبگیرێت تـا ژیاننامەکـەی لەگـەڵ بەرنامـەی پێغەمبەرایەتی لەسەر هەموو ئاستەکان نەخرێتە روو، ئا ئەمەش یەکەم هـەوڵی خـستنەڕووی ژیاننامەو بەرنامەی پێغەمبەرە لە پەروەردەی منداڵ و ژیانی نێو ماڵ و خێزاندا.

خودا پاداشتی برای بەڕێزم (محمد نور سويد) بداتەوە لەسەر ئەم داهێنانەو پێشکەوتن لـەم باسە بەپێزەدا، لە خوداش داواکارم کە موسڵمانان پێی سوودمەند بن، وە شایەنی ئەوەیـە کـە لە هەموو ماڵێکدا هەبێت، و لە بەرنامە پەروەردەییەکان بژمێردرێت لەبەر رۆشـنایی ئـەوەی کە دانەر لە فیکری ئیسلامی بۆ پەروەردە خستوویەتیە روو.

**ابو الحسن علی الحسنی الندوی**

**دار العلوم/ ندوة العلماء**

**١٤١٣/١١/١٧ کۆچی ١٩٩٣/٥/١١ زاینی**

# بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان

## پێشەکی بەڕێز دکتۆر محمد فوزی فیض الله

لەوانەیە کە لێکۆڵینەوە لە سوننەتە شیرینەکانی پێغەمبەر و گرنگیدان بە فەرموودەی پیرۆز بە(متن و سند)ەوە، لە دیارترین دیاردەکانی راپەڕینی ئیسلامی ئەم سەردەمە بێت. هۆی ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەمانە:

١) گەڕانەوەی ئوممەتی محمدﷺ بۆ دەستگرتن بە ئەو نیگایەی دابەزیوە بۆ پێغەمبەرﷺ بە هەردوو جۆرەکەی: (المتلو): ئەوەیە کە دەخوێندرێتەوە کە قورئانە.

(غير المتلو): وەکو قورئان ناخوێندرێتەوە کە فەرموودەی پێغەمبەرەﷺ.

٢) ئوممەتی ئیسلامی کاتێك لە سەرفرازییە دێرینەکەی و سەروەرییە نەبڕاوەکەی دواکەوت، هەموو هۆکارەکانی هەستانەوەو پێشکەوتنی تازەی گرتە بەر تا بگەڕێتەوە بۆ ئەو سەروەرییە نەبڕاوەی، بەڵام هیچی دەست نەکەوت، بۆیە دڵنیابوو لەوەی کە ئەم ئوممەتە چاك نابێت مەگەر بەو رێگایەی کە نەوەکانی پێشووی پێ چاك بوو، عەرەب و موسڵمانانی پێشین هەر بە قورئان و سوننەت چاك بوون.

٣) هەروەها لەوانەیە گرنگیدان بە سوننەت لەم سەردەمەدا بۆ بەرپەرچدانەوەی رۆژهەڵاتناسەکان و بە رۆژئاوایی کردن بوویێت، ئەوانەی کە خۆیان بە گومان بوون و خەڵکیشیان خستە گومان بەرامبەر بە سوننەتی پێغەمبەرەکەیان، ئەویش بە تانەوتەشەر دان لەو هاوەڵانەی فەرموودەیان گێڕاوەتەوەو لە فەرموودەکەش، هەروەها بە ناشیرین کردن و خەوش گرتن لە پەرتووکە ڕاستەکان (كتب الصحيح) و داهێنانی فەرموودەی لاواز یاخود لاوازکردنی هەندێکیان، بەهۆی جیاوازی هەندێك لە ریوایەتەکانی فەرموودە، کە ئەوەش وای لە هەندێك لە دەستەڵاتداران کرد بوێرن باسی پشتگوێخستنی سوننەت بکەن و تەنها کار لەسەر قورئانی پیرۆز بکەن.

لەپێناوی ئەمەشدا پەیڕەوکارانی سوننەت و پسپۆڕانی وردبینی قوڵ لە سوننەتدا بەرەنگاریان بوونەوە، تا هەموو پڕوپاگەندەو گومانەکانیان پوچەڵ بکەنەوەو بەرپەرچی هەموو ئەو ناڕەواییانە بدەنەوە کە لەبارەی سوننەتەوە دەوروژێنرا.

بەمەش سەرقاڵ بوون بە سوننەت بوو بە جۆرێك لە خزمەتکردنی ئیسلام و زانستەکانی و

بەرگری لە شەریعەت و بەڵگەکانی.

دیارە گرنگیدان بە سوننەتی پێغەمبەرﷺ لەم سەردەمەدا بەهیچ شێوەیەك ئەوە ناگەیەنێ -لای ئەوانەی بایەخ بە سوننەت دەدەن و کەسانی دیکەش- کە پێش قورئانی پیرۆز بخرێت. هەروەها هەرگیز ئەو مانایەشی نیە کە فیقهی ئیسلامی پشتگوێ بخرێت، و پێشنیازی زمانی عەرەبی و هونەرەکانیشی نیە، با هەندێك لەوانەی لەسەرەتاوە سەرقاڵی سوننەتی پیرۆز بوون وایان گومان بردبێت، بەڵکو قورئان کتێبی یەکەمی موسڵمانانە، هیچ موسڵمانێك مشت و مڕ لەمە ناکات، سوننەتیش راستەوخۆ پاش ئەوە دێت لە گرنگیدا، گشتییەکانی تایبەت دەکرێ، رەهاکانی دەبەسترێتەوە، و پوختە و کورتەی روون دەکاتەوە، و راڤەی واتاکانی دەکرێت، و ئامانجەکانی روون دەکرێتەوە، و مەبەستەکانی بەدی دەهێنرێت.

بەڵام فیقهی ئیسلامی لەسەر قورئان وسوننەت راگیرکراوەو لەسەریان وەستاوەو لێیان هەڵدەگۆزێت، و حوکمەکانی بە کۆشش(اجتهاد) کردن لێ دەردەهێنرێت، کە بەگیانی شەریعەت دادەنرێت، و ئەو بزوێنەرەیە کە زیندوویەتی بەربڵاوی و هەمیشە مانەوەی بە فیقهی ئیسلامی بەخشیوە.

ئەمەش لەبەر ئەوەی شەریعەت؛هەروەك (شاطبی): دەڵێت: هەموو شتێکی گچکە دەقی لەسەر نەهاتووە بۆ خۆی، بەڵکو بەشێوازی گشتی (کلی)، و دەستەواژەی رەها هاتووە، کە بە شێوەی چەندەها ژمارە بەکاردەهێنرێت و سنووردار ناکرێت.

ئیجتیهاد کردنیش لە دەرهێنانی حوکمی شتە نوێیەکان، کە دەقی لەسەر نەهاتووە، رێڕەوی فیکری فیقهی بووە لای پێشین و پاشینان، لەسەردەمی هاوەڵان و سەردەمی شوێنکەوتوان و ئەوانەی لەدوای ئەوانیش هاتوون، وە پێغەمبەری خواﷺ لەوەدا مۆڵەتی دابوو بە(معاذ)و هاوەڵانیش بڕیاریان لەسەرداوە، هەروەها رازی بوو بە ئیجتهادی(سعد کوڕی معاذ) لە حوکمدانی بەسەر(بنی قریضة)دا.

هەروەها لە هەندێك لە پێشینی فەرموودەناسمان بەدی کردوەوە کە ئیجتهادیان بە هۆکارە جۆراوجۆرەکانی ئەنجام داوە: (احمد): وێڕای توند دەست گرتنی بە سوننەتەوە، بەڵام کاری بە(المصالح المرسلة) کردووە، (مالك)یش - پێشەوای خەڵکی مەدینە- کاری بە چاکخوازی (استصلاح) و (قیاس) دەکرد، فەرموودەناسانی دیکەش کاریان بە (سد الذرائع) و عورف کردووە.

ئەوەیش سەبارەت بە حەنەفیەکان دەوترێت کە ئەوان خاوەنی راوبۆچونن (اصحاب الرأي)، بەو واتایەی کە وازیان لە فەرمووده هێناوە، و کار بە بیروبۆچوونەکان دەکەن، راست نیە، چونکە ئەوەی بە دروستی لە (ابو حنیفه)ەوە هاتووە ئەوەیە کە دەڵێت: (ئەوەی لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەری خواﷺدا هاتبێت لەسەر سەر و لەسەر چاوە).

بەڵکو ئەوەی لای زانایان ئاشکرایە ئەوەیە کە (ابوحنیفە) وتویەتی: (هەتا ئێستاش خەڵکی لە چاك بووندان، مادام کەسانی وایان تێدایە کە داوای فەرمووده بکات، خۆ گەر داوای زانیارییان کرد بەبێ فەرمووده ئەوا خراپ بوون).

هەروەها وتەیەکی تریشی هەیە دەڵێ: (ئاگاداربن لەوەی کە لەبارەی ئایینی خوای گەورە بەپێی بیروبۆچوونی خۆتان قسە بکەن، لەسەرتان پێویستە شوێن سوننەت بکەون، چونکە ئەوەی لێی لابدات گومڕا دەبێت).

بێگومان مەبەستی لە ڕاوبۆچوونی ناپەسند، هەوا و ئارەزوو و، ئەو ڕاوبۆچوونانەیە، کە پشت بە هیچ بەڵگەیەکی قورئان یان سوننەت، یاخود (قیاس) لەسەر ئەو دەقانەی هاوشێوەی ئەون نابەستێت، بەڵام دید و بۆچوون بە واتای شارەزایی لە هەڵێنجانی حوکمەکاندا، ئەوەیان بەجێیە لای ئەوان و کەسانی دیکەشەوە، لەبەر ئەمەش (ابن قتیبە) لە کتێبی (المعارف)یدا، (اوزاعی) و (سفیان الثوری) بە خاوەن بۆچوونەکان (أصحاب الرأي) داناوە، کە ئەو دوانە لە کەڵەپیاوانی فەرمودەناسین. وە هەندێك نووسەری شوێنەکەوتووی (مالك) بە خاوەن بۆچوون ناودەبات، هەروەك (الخشني) لە کتێبەکەیدا (قضاة قرطبة) رایگواستووە.

لەم ئوممەتە موسڵمانەدا إن شاء الله هیچ کەس نیە کە بیروبۆچوونی خۆی بخاتە پێش سوننەتی پێغەمبەرﷺ، ئەم وتەیەی ئیمام (شافعی)ش بەسە لەم ڕووەوە کە لە نامە بەناوبانگەکەیدا هاتووە: ((هیچ کەس بۆی نیە کە سوونەتێکی پێغەمبەریﷺ پێ گەیشتبێت لەبەر قسەی هەر کەسێکی دی وازی لێ بهێنێت)).

~ ~ ~

سەرقاڵ بوون بە سوننەتەوە سیمایەکی ڕاپەڕینی زانستی ئەم سەردەمەیە، بە توێژینەوە لە دەستنووسەکان و راڤەی (متن)ەکانی و گرنگی دان بە زنجیرەی (راوی)یەکان، و چاپکردنی (مصنفات)ەکانی کە پێشتر رۆشناییان نەبینیوە، هەروەها پێڕستی وشەکانی، و ڕێکخستنی لایەنەکانی فەرمووده بە مەبەستی ئاسانکردنی، تا لێکۆڵەرەوان بگەڕێنەوە سەری، وە جیاکردنەوەی فەرموودەی (صحیح) لە (ضعیف).

ئەمە دەبێتە لێکۆڵینەوە دەربارەی لایەنەکانی ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ و بە تاك دانانی لە پۆلێن کردندا، بە مەبەستی شوێنکەوتن و کردنیان بە پێشەنگی خۆ: وەك ژیانی لە کاتی ئاشتی و شەڕدا، وە ژیانی لە نێو ماڵی خۆیدا و، ژیانی لە نێو هاوەڵاندا، هەڵوێستی دەربارەی دووڕووەکان و بێباوەڕەکان لە(اهل الذمة) ئەوانەی کە سەرانە دەدەن.

هەروەها لێکۆڵینەوە لە ڕێنمونی پێغەمبەر ﷺ لە پەرستش و هەڵس و کەوت و فەتوا و دادوەری و جێبەجێکردنی سنوورەکان و برایەتی نێوان خەڵك، و پەیمان بردنە سەر، و چاکسازی نێوان لایەنە ناکۆکەکان... هاوشێوەی دیکەی ئەوانە وای لە پێشەوایان کردووە، کە نامە و توێژینەوەی تایبەت لەوبارەیەوە بکەن کە گرنگترینیان: (زاد المعاد)ی (ابن قیم)ە.

ئەم کتێبەش کە ئێستا لە بەردەستمدایە، یەکێکە لەو پەرتووکە بەنرخانەی کە گرنگی بە لایەنێکی دیاریکراو لە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ و ڕێنوێنی پێغەمبەر دەدات، کە ئەویش(التربیة النبویة للطفل).

ئەگەرچی دەربارەی پەروەردەی ئایینیو پەروەردەی پێغەمبەر ﷺ پێشتر نووسرابێت، بەڵام وەك من بزانم لەبارەی پەروەردەی پێغەمبەر بۆ منداڵ نەنوسراوە، ئەوەش لایەنێکی سەربەخۆو گرنگ و زیندووە لە لایەنە گرنگەکانی ڕێنوێنی پێغەمبەر ﷺ بۆ پەروەردەی منداڵ.

دانەر بە بیروباوەڕێکی بڕوادارانەوە باسی لێوە کردووەو بە فیکرێکی ڕۆشنبیرانەی سەرکەوتوو و پەسەند، و بە دید و تێڕوانینێکی ڕوونی قوڵ، و ڕێکخستنی ئەندازیارانەی بەچێژەوە بە چەند بەشێك دایمەزراندووە کە یەك لەدوای یەك ڕێکی خستوون:

بەشێکی تایبەت بە ئامۆژگاریەکانی بۆ دایکان و باوکان، و بەشێکی دەربارەی مافەکانی منداڵی شیرەخۆر و، بەشێکی دی لەبارەی بنیاتنانی کەسێتی منداڵ لەکاتی لەشیربڕینەوەوە تا پێگەیشتن (بلوغ)، ئەمەش لە گرنگترین بەشەکانی کتێبەکەیە، تەوەرەی پەروەردەی منداڵیش، نووسەر لەسەر بنچینەی بنیاتنانی بیروباوەڕ و خواپەرستی و کۆمەڵایەتی و ڕەوشتی و سۆزداری و فیکری و جەستەیی و جنسی و تەندروستی دایمەزراندووە، هەروەها بەشێکی تەواوی تایبەت کردووە بەڕێنمونی منداڵ بۆ چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك و پاراستنی مافەکانیان، بەشێکی دیکەش تایبەتە بەشێوازەکانی پێغەمبەر ﷺ بۆ پەروەردەکردنی فیکری و دەروونی، کە کاریگەرە لەسەر منداڵ. پاشان کۆتایی ئەو بەشانەی بە بەشێکی تایبەت بە

تەمبیٚ‌کردن(تأديب)ی منداڵ هێناوە، نووسەر بە دوو چل فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ کۆتایی بە لێکۆڵینەوەکەی دەهێنێت: یەکەم چل فەرموودەیان ئاڕاستەی باوکانە، دووەم چل فەرموودەش ئاڕاستەی رۆڵەکان(منداڵان)ە.

نووسەر لە لێکۆڵینەوەکەیدا پشتی بە چەند سەرچاوەیەکی باوەڕ پێکراو بەستووە: لە پەروەردەو سوننەت و تەفسیر و مێژوو و بانگەواز و فیقە و، ئێستای جیهانی ئیسلامی و رۆشنبیری ئیسلامی، لەهەموو سەرچاوەیەکیش بۆ چاکترکردنی باسەکەی وەرگرتووەو هەموو ئەو شتانەیشی کە دەیلێیت کردوویەتیە جێی متمانە.

هەروەها پشتگیری هەموو بیرۆکەیەکی پەروەردەی کردووە کە بینیبێتی و، بە فەرموودەی پیرۆز تۆماری کردووە، لەگەڵ بەجێهێنانی لای هاوەڵانی پێشین و، ڕێڕەوی پێشەوا و زانا پەروەردەکارە دیارەکان، هەروەها تیۆرە پەروەردەییەکانی بۆ منداڵ بەستۆتەوە بە راستیە ئایینیە چەسپاوەکان و، ئەو واقیعە مێژووییانەی کە ماوەتەوە و دیمەنە بڕیاردراوەکان لە دیدی پەروەردەکارانی ئیسلامی، جا لەو بارەیەوە زۆر شتی سەیری هێناوە، بەشێوەیەك کە کتێبەکەی بەراستی نزیکە ببێتە مەوسوعەیەکی پەروەردەی ئایینی بۆ منداڵ، هەروەها ببێتە پێڕست بۆ خستنەڕووی زۆربەی ئەوەی لە سوننەتی پیرۆز و شوێنەواری پێشینانی چاك و رێوشوێنی پەروەردەکاران دەربارەی پەروەردەی منداڵی موسڵمان، من وای دەبینم کە ئەم پەرتووکە بەنرخە شوێنەوارێکی زانستی و جێبەجیٚ‌کردنی فراوانی لە کۆمەڵگای موسڵماندا دەبێت کە دایکان و باوکان و پەروەردەکاران لێی سوودمەند دەبن، هەروەها ئەو پەروەردەکارانەی کە منداڵەکانیان نەگەیشتوونەتە تەمەنی پێگەیشتن، هەتا ئەوانەشی کە پێگەیشتوون، چونکە بە زمانێکی ساناو ئاسانکراو نووسیویەتی و بەستوویەتیەوە بە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزەوە، هەروەها بە سوننەتە بێگەردەکان رازاندویەتیەوە و، بە چیرۆك جوانی کردووە، و بە پەند و شوێنەواری پێشینی چاکی ئەم ئوممەتە نەخشاندوویەتی و جوانی کردووە، بۆیە هیچ شتێك لەوە خێراتر نیە بچێتە دڵی بڕوادار لەم یادهێنانەوانە کە بەهۆیەوە بابای موسڵمان پێی سەلامەت دەبیٚ لە کۆی کۆمەڵی موسڵمانان.

گەواهی ئەوەش دەدەم بەسەر زۆربەی بەشەکانی ئەم کتێبەدا رۆیشتم، و سوودی بیٚ‌وێنەم لیٚ وەرگرتووە، خوازیاری ئەوەشم کە گەر بۆم بکرایە هەمو کتێبەکەم بپشکنیایە، یاخود زیاتر لەهەموو بەشەکانی رامابام، هەتا خووڕەوشتی خۆمم لە پەروەردەکردنی منداڵەکانمدا

ڕاست بکردایەتەوە، بەوەش سوودم دەبوو بۆیان و دەربازم دەکردن لەو شتانەی کە دەوروبەریان لە کۆمەڵ دەیهێنێتە ڕێگایان، لە سەرلێشێوانی بریقەدار، لەگەڵ هۆکارەکانی بۆ پڕکردنەوەی بۆشاییان بەشتێك کە سود و قازانێجیان پێ ناگەیەنێت، زانستیشیان لا خۆشەویست ناکات و، ئایندەیان بۆ بنیات نانێت و، عەزمیان بەهێز ناکات، بەئومێدی تێگەیشتنی ئەم پەرتووکە دەخوێنمەوەو لێی سوودمەند دەبم، زۆر کەسی دیکەش دەیخوێنێتەوەو سوودمەند دەبێت لێی.

هەمووومان داوای دەستکەوتی زیاتر بۆ دانەر دەکەین، لەگەڵ باشترین پاداشت بۆی لە دنیاو قیامەتتدا، بەرامبەر ئەو هەوڵەی پێشکەشی ئەم ئوممەتەی کردووە و، کەلێنێکی پێ پڕ کردۆتەوە و، کتێبخانەی پەروەردەیی منداڵی موسڵمانی لە هەژاری پێ دەوڵەمەند کردووە.

پاکانە بۆ کەس ناکەم لای خوا، هەتا ئێستاش سوننەت ئەو چاوگەیە کە ئاوی نابڕێتەوە، هەموو هاتووەکان لە کارێزی پێغەمبەرەوە دەردەچێت ئەگەر هەموو خەڵکی سەرزەویش بێت، چەندەها کەسی پێشین شتیان بۆ دوابینیشیان بەجێ هێشتووە.

خوا پاداشتی پێغەمبەر و سەروەرمان محمد ﷺو ئەوەی شوێنی دەکەوێت بداتەوە.

**أ.د. محمد فوزي فيض الله**

**مامۆستا و سەرۆکی بەشی فیقهی ئیسلامی و مەزهەبەکانی لە زانکۆی دیمەشق، و سەرۆکی بەشی (الفقه والأصول) لە کۆلیجی شەریعەت و دراساتی ئیسلامی لە زانکۆی کوێت.**

**کوێت . شویخ**

**١١/ذي القعدة الحرام/١٤٠٤ ك – ١٩٨٤/٨/٨ز**

## وتەیەك دەربارەی بەرنامەكە

لە بەرنامەی ئەم پەرتووكەدا وامان پەیڕەو كردووە كە سەرچەشمە(نبع)ی سوننەت بنچینەو پاڵپشتی سەرەكی هەڵێنجانی بیرۆكەو ڕێككردنی بێت، نووسەر پێشتر هیچ بیرۆكەیەكی تری لا نەبووە تا بێت بۆی لە فەرموودەكانی پێغەمبەردا بەدوای بەڵگەدا بگەڕێت، بەڵكو بە پێچەوانەی ئەوەی كردووە.

هەموو جارێ كە فەرموودەیەكی پێغەمبەری خوا ﷺی دەبینیەوەو دڵی ڕۆشن دەبوو بەو ڕووناكییەی كە خوا دەیخستە دڵیەوە، دوای ئەوەی كاتێكی زۆری بەسەر بردووە لە خوێندنەوەی كتێبە ڕۆژئاواییەكان دەربارەی پەروەردەی منداڵ، كە جگە لە بیرورا و مەزهەبی جۆراوجۆر تیایاندا نەدەگەیشتە هیچ شتێك، و هەریەكەیان باس لە هەوڵ و ئەزموونە ناتەواوەكەی خۆی دەكات، بەڵام فەرموودەی پێغەمبەرﷺ یەك لایەكەرەوەی جیاوازییەكانەو هەموو شتەكان لەجێگای خۆیدا دادەنێت و، ڕوونی دەكاتەوەو ڕێنموونی دەكات و فەرمان دەكات و قەدەغە دەكات، بەمجۆرەش لێكۆڵینەوەو بەدواداچوونی زۆرتری فەرموودەكانی پێغەمبەرﷺ كە تایبەت بێت بە منداڵ بڕوای زیاتر دەبوو، بەبێ بێزار بوون و ماندوویەتی، تا دەهات دڵنیاتر دەبوو لە پارێزراوی ئەو بەرنامەیەی كە گرتوویەتیە بەر، ئەوەش زیاتر چالاكی كردووە لەسەر بەردەوامی لە گەڕان دەربارەی پەیوەندی پێغەمبەری خواﷺ بە منداڵانەوە، ئاڕاستەی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ، یاخود بە دان پێداهێنان یان بە ڕاستكردنەوە.

ئیمام (علی)ﷺ بانگەوازێكی ئاڕاستەی هەموو ئوممەت كردووە كە دەست بگرن بە سەرچاوەی سوننەتەوە، ئەو شوێن پێ هەڵگرتنەشە كە ڕەفتار و ڕەوشتی ڕاست. جا دەڵێت: ئەگەر لە پێغەمبەری خواوەﷺ فەرموودەیەكم بۆ باس كردن، ئەوا بزانە كە ئەوە گونجاوترین و ڕێنیشاندەرترین و پارێزەرترینە لەهەموو شتێكی دی.[١]

لەبەر ئەوە ئەم پەرتوكە لە هەگبەیدا چەندین خاڵی دیار و جیاكەرەوەی هەڵگرتووە كە ئەمانەن:

١- فەرموودەی پێغەمبەری خواﷺ بنچینەی بابەتی ئەم كتێبەیە، پاشان جێبەجێكردنەكانی یاران و شوێنكەوتوان و پێشینە چاكەكان.

---

١ رواه ابو يعلى في مسنده ١/٤٤٤ بسند صحيح.

٢- جێبەجێکردنی ئەوەی لەم پەرتوکەدایە مانای وەرگرتنە لە سەرچاوەی بێخەوش، کە سەقامگیری و دامەزراوی لەخۆ گرتووە، بە پێچەوانەی رێچکەکانی دیکەوە.

٣- شوێن پێ هەڵگرتنی خودی پێغەمبەری خوایەﷺ ئەمەش پەرستشی خوای گەورە و، بەجێهێنانی فەرمانەکانیەتی. (سعید کوڕی اسماعیلی زاهد) دەڵێت:[1] هەرکەسێك سوننەتی بەکردارو گوفتار لەسەر خۆی بڕیار بدات، ئەوە دانایی دەربڕیوە، ئەو کەسەش ئارەزووی لەسەر خۆی زاڵ کرد ئەوە داهێنراو(بدعە)ی دەربڕیوە، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِنْ تُطِيعُوهُ تَهْتَدُوا﴾ ئەگەر گوێڕایەڵی (پێغەمبەر) بن هیدایەتتان دەدرێت.

٤- جیهانی منداڵ زۆر لایەنی نەزانراوو نادیاری تێدایە، هەر بۆیە پێویستی هەیە بە کەسێکی کامڵ و زانا بە لایەنە شاراوەکانی، ئەو کەسەش تەنها پێغەمبەری خواﷺیە کە ئەم سیفەتەی تێدایە هەتا ئەو جیهانەی منداڵمان بۆ ئاشکرا بکات کە ئێمە شارەزای نین.

٥- ئەم پەرتووکە نەهاتووە بە نیشاندانی ئەو گرفتانەی کە دایکان و باوکان و پەروەردەکاران لەگەڵ منداڵاندا بەدەستیەوە گیرۆدەن، یاخود گرفتەکانی خودی منداڵان بەڵکو خواردنێکی وای بۆ داناون کە ئەو نەخۆشی و گرفتانە لە ریشەوە دەربهێنێت. خۆ گەر گرفتێکیش رووی دا ئەوە مانای ئەوەیە کە ناتەواویەك هەبووە لە پێدانی ئەو خۆراکە پەروەردەییەی پێغەمبەرداﷺ، ئەرکی سەرشانی پەروەردەکاریش هەر ئەوەیە کە بگەڕێتەوە بۆ ئەو خۆراکەی کە لە ناخی ئەم پەرتوکەدایە، و بە شێوەیەکی باش پێشکەشی منداڵی بکات، بەوەش دەتوانرێت ئەو گرفتانە لەناو ببرێت.

٦- لەتوانای هەر پەروەردەکار و بەرپرسێك یاخود دایك و باوکێکدا هەیە، کە هەستێت بە لێتوێژینەوەی ئەم پەرتوکە، راپەڕاندنی منداڵەکانیان لەهەر ئاستێکدا بن، وایان لێ دەکات سەرلەنوێ دەست پێبکەنەوە.

٧- ئەم پەرتووکە نەهاتووە بەراودرکاری بکات لەگەڵ قوتابخانە پەروەردەییە رۆژئاوایی یا رۆژهەڵاتیەکان، ئەوەش لەبەر چەند هۆیەك کە ئەمانە گرنگترینیانە:

أ) بۆشایی بیروباوەڕ کە لێکۆڵەرەوەی رۆژئاوایی بەدەستیەوە گیرۆدەیە، ئەوەش وای لێکردووە کە هەڵێنجانی بیرۆکەکانی ناتەواو بێت.

---

[1] كتاب الجامع لأخلاق الراوي وآداب السامع —للخطيب البغدادي: ١/٨٠.

ب) بەخۆوەگرتنی بیروبۆچوونی زۆر دەیگەیەنێتە ئاستی دژایەتیکردن لەگەڵ یەکدیدا، جا منداڵی موسڵمانیش پێویستی بەوە نیە کە بکرێتە کێڵگەیەکی تاقیکارییەکانی بێباوەڕان، لەکاتێکدا پێغەمبەرێکی هەیە کە شوێنی بکەوێت.

ج) ئەو بیرۆکانەش پشت بە کۆمەڵە تاقیکردنەوەیەکی کارگەیی دەبەستێت کە بارودۆخی خۆی هەیە لەپاڵ هەل و مەرجی نمونە تاقیکراوەکان لەگەڵ بارودۆخی لێکۆڵەردا.

٨- راستە کە ئەم کتێبە ئاراستەی منداڵان کراوە، لەگەڵ ئەوەشدا دایکان و باوکان و پەروەردەکارانیش پەروەردە دەکات، و هەموو سەرپێچی ئارەزووەکانیان و تافی لاوێتیان و کەمتەرخەمی کردنیان لە هەستان بە ئەرکەکانیان دەوەستێنێت.

٩- ئەم کتێبە بە خستنەرووی فەرموودە ئاسانەکانی پێغەمبەرﷺ یاخود نمونەی جێبەجێکراو جیادەکرێتەوەو زۆر بە کەمی قسەی نووسەری تێدا هاتووە، و قەرەبووی ئەوەیشی بە وتەی پێشینانی چاك و زانایان کردۆتەوە، دیارە گرتنەبەری ئەم شێوازەش بەهۆی بەگوێکردنی ئامۆژگاری یەکێك لە زانایانی سەرڕاست بووە، خوا پاداشتی خێری بداتەوە.

١٠- نووسەر نمونەی بەجێهێنراو و پیادەکراوی لە ژیانی پێشینانی چاك خستۆتە روو، تا زیاتر بیرۆکەکەی روون بێت، و ببێتە بابەتێکی ئاراستەکراو لەبەردەستی پەروەردەکار و، ئەویش لێی سودمەند بێت و بەپێی کاتی گونجاو کە خۆی هەڵی دەبژێرێت بۆ ئەم ئاراستەیە لە دەروونی منداڵدا بیچەسپێنێت، هەروەك دەڵێن: لەکاتی یادکردنەوەی پیاوچاکاندا رەحمەت دێتە خوارێ.

١١- هەموو شتێکی وەرگیراو یاخود چیرۆك، ئاماژە بەو سەرچاوەیە کراوە کە لێی وەرگیراوە.

١٢- کتێبەکە لەشەش بەش پێك هاتووە: بەندی یەکەم، ئەمەش ئاراستەی دایك و باوك و پەروەردەکاران کراوە، پاشان بەندی دووەم: کە ئەویش منداڵ لە کاتی لەدایك بوونەوە تا لەشیر برینەوە(دووساڵ)، بەندی سێیەم: بنیاتنانی کەسێتی منداڵ -لە دووساڵیەوە تا باڵغ بوون-، بەندی چوارەمیش: ئامەزرۆگاری چاکە لەگەڵ دایك و باوك و ترساندنیان لە سپڵەیی بەرامبەریان، بەندی پێنجەمیش: شێوازەکانی پەروەردەیی پێغەمبەرﷺ بۆ منداڵ، بەندی شەشەمیش: چاك تەمبێکردنی منداڵ.

١٣- کتێبەکە وێڕای ئەوەی خرایە روو، بەمانە جیادەکرێتەوە:

أ) گشتگیری: لەبەر ئەوەی لە دەروازەی هەموو بوارەکانی ژیان دەدات کە منداڵ پێویستی پێیەتی.

ب) واقیعێتی: چونکە لەسەر واقیعی رێنوێنیەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ هاوەڵان دامەزراوە تا منداڵانی خۆیان پێ پەروەردە بکەن، ئاراستەکاریە راستەوخۆکانی پێغەمبەرە ﷺ بۆ منداڵان، نەك بە تاقیکردنەوەی نێو تاقیگە یاخود سەرژمێری، وەك ئەو پەروەردەیەی کە رۆژئاوا پیادەی دەکات.

ج) جیهانێتی: چونکە لەگەڵ منداڵی موسڵماندا دەدوێت، جا لەسەر هەر بەشێکی سەرزەوی دا بژی و لەهەر کاتێکدا بگوزەرێ.

د) یەکسانی: یەکسانی لەنێوان هەموو منداڵاندا کردووەو لەگەڵ هەموو منداڵێکدا دەدوێت، هیچ جیاکارییەك نیە لەنێوان منداڵی هەژار و دەوڵەمەندا، یا لەنێوان فەرمانڕەواو فەرمانبەردا، یان لەنێوان منداڵی ڕەش و سپی دا.

ه) هاوسەنگی: ئەم پەرتوکە کە گشتگیرە لە بنیاتیدا، هەروەها هەموو خواستەکانی منداڵ بەدی دێنێت، و وای لێ دەکات کە ئێستای سەردەمی منداڵی و ئایندەی لە هاوسەنگیەکی جێگیردا بگوزەرێنێ.

و) یەکبوون: بەو پێیەی منداڵانی موسڵمانان لە یەك سەرچاوەوە شت وەردەگرن، کە ئەویش پێغەمبەری خوا ﷺیە، بەو هۆیەشەوە یەك هەست و یەك ئاکار و یەك رەوشت و یەك فیکریان لەلا دروست دەبێت.

١٤- نووسینی ئەم لێکۆڵینەوەیە بەچەند قۆناغێکدا تێپەڕیوە: کۆکردنەوە، کردنە دەروازە، پاشان نووسین، دواتر داڕشتنەوەی بنەڕەتە پەیوەستەکانی لەسەر بنەما سەرەکیەکان، و بنچینە چەسپاوو نەگۆڕەکان، کە هاوشێوەی هاوکێشە ماتماتیکیەکانە، کە دەتوانێت منداڵ بنیات بنێت و گرفتەکانی چارەسەر بکات، وەك چەندین یاسای چەسپاو، گەر لە منداڵدا دەرکەوت، ئەوا بە ویستی خوای گەورە دەیکاتە منداڵێکی موسڵمان.

رۆڵی دایك و باوك لە دوای پێدانی ئەم بەرنامە لەگەڵ پێشکەش کردنی بە منداڵ بەو شێوازانەی پێغەمبەر ﷺ کە لە بەندی پێنجەمدا روونکراوەتەوە کۆتایی دێت، دەرئەنجامی

کۆتایشی بەدەست خودای گەورەیە، بەمەش لێپرسیراوێتی دایك و باوك لە پەروەردەکردنی منداڵەکەیاندا بەرزتر دەبێتەوە، لەبەر ئەوەی ئەوان ئەو شێوازانەیان پەیڕەو کردووە، کە خوای گەورە پێویستی کردووە لەسەریان، ئەویش شوێن پێ هەڵگرتنی پێغەمبەری خوایە: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْآخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴾الأحزاب/٢١. واتە: بەراستی پێغەمبەری خوا بۆ ئێوە سەرمەشقێکی چاکە، بۆ ئەوانەی کە ئومێدیان بە خوا و ڕۆژی دوایی هەیەو یادی خوا زۆر دەکەن.

﴿مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ ٱللَّهَ وَمَن تَوَلَّىٰ فَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا ﴾النساء/٨٠.واتە: (هەرکەسێك گوێڕایەڵی پێغەمبەری خوا بێت بەراستی گوێڕایەڵی خوای کردووە، هەرکەسێکیش پشت هەڵبکات، جا ئێمە تۆمان نەناردووە چاودێر بیت بەسەریانەوە).

بەو جۆرە ئاسانکاری کراوە بۆ باوکان و دایکان کە کۆتایی پەرتوکەکەی بە چل فەرموودە هێناوە، کە پێغەمبەری خوا ئاڕاستەی کردوون، لەگەڵ چل فەرموودەکە ئاڕاستەی منداڵان کراوە تا لەبەری بکەن.

١٥- لە کۆتاییدا ئەمە هەوڵێکی کەمە و دەیخەمە بەر دەستی خوێنەر، کە ماوەی دە ساڵی تەواو خەریکی بووم، جا هەرچی چاکەو ڕاستی تێدابێت ئەوە لەلای خوای گەورەوەیە و، هەرچی ناتەواوی و کەم و کورتی و هەڵەشی تێدا بێت ئەوە لە خۆمەوەیە، ئەمە ئەوەیە کە من پێی گەیشتووم، لەگەڵ لاوازی تواناکان و، سەرەتایی داواکردنی زانیاری، ئەم کۆششە پەروەردەییەش ناتوانم بڵێم هەر هەمووی ڕاستە، بانگەشەی ئەوەش ناکەم کە ئەمە فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەیەتی، چونکە ئەوە کاری من نیە، لەم ڕووەوە ئەوەم بەسە کە ئیمام (احمد)و (مسلم)و (ترمذی) گێڕاویانەتەوە کە پێغەمبەری خوا ئامۆژگاری بەرپرسی سوپا یاخود کەرت(سریە)یەکی دەکرد و دەیفەرموو: ((**وإذا حاصرت حصناً فأرادوك أن تنزلهم على حكم الله، فلا تنزلهم على حكم الله، ولكن أنزلهم على حكمك، فإنك لا تدري أتصيب حكم الله فيهم أم لا**)). واتە: (گەر گەمارۆی قەڵایەکت دا و خەڵکەکەی داواتان لێ کردیت، کە حوکمی خوایان لەسەرجێبەجێ بکەیت، ئەوا حوکمی خوایان لەسەر جێبەجێ مەکە بەڵکو حوکمی خۆت، چونکە تۆ نازانیت حوکمی خوا دەپێکیت یان نا؟)

لە کۆتاییشدا دانایان وتویانە: ئەوەی شتێکی دانا ئەوە دەبێتە نیشانە، خۆ گەر چاکی کرد ئەوا خەڵك سۆزیان دەبێت بەرامبەری، و گەر خراپیشی کرد ئەوا قسەی نابەجێی پێ دەوترێت.[١]

لە کۆتاییدا لە قوڵایی دڵمەوە داواکارم لەخوای گەورە کە پاداشتی هەموو ئەو کەسانەی، کە هاوکاریان کردووم و چاکەیەکیان لەگەڵدا کردووم، بە باشترین پاداشت بداتەوەو پاداشتی زۆری من و ئەوانیش بداتەوە، لە ڕۆژێکدا کە ماڵ و منداڵ هیچ سودێکیان نیە، مەگەر ئەوەی بە دڵێکی ساغ و تەواو دەگاتە بەردەم خوای گەورە.

هەروەها نووسەر سوپاسی هەموو کەسێك دەکات کە ئامۆژگاریەکی چاکی بکات و ئاگاداری بکاتەوە لە هەڵەو کەموکورتیەکانی تا بەشداری بکات لە بنیاتنانی منداڵی موسڵمان.

لە هەموو خوێنەرێکیش کە سودمەند دەبێت لێی داواکارم کە لە پەنهاندا بۆم بپاڕێتەوە، تا فریشتەکان (ئامین) بۆ پاڕانەوەکە بکەن و بڵێن: بۆتۆش بەهەمان شێوە.

خوای گەورەش لە دواوەی مەبەستەوەیە.

**محمد نور سوید**

**خوای گەورە لە خۆی و دایك و باوکی و لە موسڵمانان ببورێت**

**کوێت – ١٢/ربیع الاول/١٤٠٤ – ١٩٨٣/١٢/١٥**

١ عن کتاب الحلل في اصلاح الخلل من کتاب الجمل للبطلیوسي المتوفي سنة ٥٢١هـ تحقیق سعید عبدالکریم سعودي.

## پێناسەکانی ناونیشانی ئەم کتێبە:

١-(منهج) (بەرنامە): (م) بەسەرەو ژێرەوە واتە ڕێگای ڕوون و نەخشەیەکی کێشراو، بەرنامەی خوێندن، بەرنامەی فێربوون، هاوشێوەی ئەوانە، کۆیەکەشی بریتیە لە (مناهج[1] = بەرنامەکان).

٢- (التربیة) (پەروەردە): (تربیە) لە بنەڕەتدا سێ واتای هەیە:

یەکەم: (ربا، یربو) واتە زۆر بوو، گەشەکردوو.

دووەم: (ربی، یربي) لەسەر کێشی(خفـي، يخفـي) بە مانای گەشەکردوو و گەورەبوو و پێگەیشت.

سێیەم: (رَبّ، یَربُّ) بە واتای: چاکی کردوەو فەرمانی گرتە دەست.

(البیضاوی) لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: (الرب) لە بنەڕەتدا بە واتای (پەروەردە) دێت، ئەویش بریتیە لە شتێك هێدی هێدی بەرەو کاملی بڕوات، پاشان وەسفی خوای گەورەی پێکراوە بە سیفەتی(مبالغە).

بەلام (راغب الاصفهانی) لە کتێبی (المفردات)دا دەڵێت: (الرب) لە بنچینەدا (پەروەردە)یە، ئەویش دروست کردنی شتە وردەوردە تا دەگاتە رادەی تەواوی خۆی.[2]

دوای ئەوەی باسمان کرد دەکرێ بڵێین:

پەروەردە (التربیە): بریتیە لە پرۆسەی بنیاتنانی منداڵ، هێدیهێدی تا دەگاتە رادەی تەواوی و کامڵ بوون.

واتای زمانەوانی پەروەردەمان لە وشەی (بنیاتنان = بناء)دا کۆکردۆتەوە، لەبەر ئەوەی واتای کۆششکردن دەدات، لەگەڵ دانانی شت لە شوێنی خۆیدا و، چاوپیاخشاندنەوە بە چاودێریکردن و چاکسازی دوور لە پشتگوێخستن.

هێدی هێدی یاخود پلە بەپلە (شیئاً فشیئاً): بەشێوەیەکی پلەپلەییە، جا ئەوەی کە ئەمڕۆ زەحمەتە بەدی بهێنرێت دەکرێت سبەینێ بەدی بهێنرێت.

---

١ المعجم الوسیط.

٢ اصول التربیة الإسلامیة وأسالیبها (النحلاوي) ص١٢.

تا گەیشتن بە رادەی تەواوی و کامڵ بوون(التمام والکمال): ئەویش ئەو ئاستەیە کە منداڵ دەیگاتێ و تێیدا دەتوانێت لەخودی خۆیدا دەست بگرێت بە شەرعی خواوەو لەناخی خۆیدا لێپرسینەوە لەگەڵ خۆی بکات و، چاودێری بکات و، چاودێری پەروەردەی خۆی بکات بە خوێندنەوەی قورئان و دەست گرتن بە شەرعی پاك و بێگەردەوە.

٣- (النبوية - پێغەمبەریی) مەبەست لە پێغەمبەریی، هەموو ئەوانەیە کە پێغەمبەری خواﷺ بەقسە یا کردەوە یاخود بڕیاردان هەیبێت، کە تایبەت بێت بە قۆناغی منداڵیەوە.

٤- (للطفل - بۆ منداڵ): (طفل = منداڵ) هەموو منداڵێك دەگرێتەوە تا تەمەنی بالغ بوون، نێر و مێ تێیدا وەك یەکە، کۆیەکەشی بریتیە لە منداڵان (الأطفال).[١]

مەبەستیش لە قۆناغی منداڵان لە کاتی لەدایك بوونەوەیە تا باڵغ بوون، قۆناغی سەرەتاش بە منداڵێتی دەست پێدەکات، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ نُخْرِجُكُمْ طِفْلًا﴾الحج/٥. واتە: پاشان بە منداڵ (کوڕ یا کچ) دەرتان دێنین.

قۆناغی کۆتاییش بە باڵغ بوون دەست پێدەکات، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا بَلَغَ الْأَطْفَالُ مِنكُمُ الْحُلُمَ فَلْيَسْتَأْذِنُوا كَمَا اسْتَأْذَنَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾النور/٥٩. واتە:(کاتێ منداڵەکانتان بلوغیان بوو، با ئەوانیش مۆڵەت وەربگرن، هەروەکو کەسانێك کە بەرلەوان بوون و مۆڵەتیان وەردەگرت).

(غَلَمة): (جەوان = فتیە) کۆیەکەی (غلام = جەوانان)ە، ئەمەش ئەوانەیە کە سمێڵیان تازە لێهاتووە، واتە کوڕانیان، (زمخشری)یش دەڵێت: (غلام) بریتیە لە بچووك تا کاتی موو لێهاتنی، گەر پاش موو لێهاتنی وترا ئەوە بۆ مەجازە.[٢]

(الصبيان = منداڵان): (نووی): دەڵێت: (صِبیان) پیتی (ص)ەکەی ژێرەی هەبێت، ئەمە لە زماندا بەناوبانگە، (ابن درید) دەڵێت: (صُ)ەکە (بۆرە)ی لەسەرە،[٣] لە (مختار الصحاح)یشدا هاتووە: (الصبی): (غلام = جەوان)ە، کۆیەکەی (صبية و صبيان)و کچیش دەبێتە (صبية= کیژۆڵە)و کۆیەکەی (الصبايا) هەروەك (مطية: مطايا).

---

١ المعجم الوسيط.

٢ فيض القدير ٦/٣٥٤، وأنظر التفسير الكبير للرازي ٢١/١٥٥.

٣ شرح صحيح مسلم باب حكم بول الطفل الرضيع وكيفية غسله.

(ابن نجيم)يش لە (الأشباه والنظائر)[١] لــە بــابی (احكــام الــصبيان)دا دەڵێــت: بريتيــە لــە كۆرپەلە مادام لە سكی دايكيدايە، خۆ گەر لەدايك بوو وە كوڕ بوو ئەوە (صــبی =كــوڕ)ـــە، پێی دەڵێن (رجل = پياو)، هەروەك لە ئايەتی ميراتدا هاتووە[٢]، ئەمە هەتا بــاڵغبوون، ئينجــا (غلام = جەوان)ە هەتا نۆزەساڵی و، (شاب = گەنج)ـە هەتا تەمەنی سی و چوار ساڵی، پاشان (كهل= بەتەمەن)ـە تا پەنجاو يەك ساڵی، (شيخ = زۆر پير) تا كۆتايی تەمەنی، لە زمانەوانيدا بەم جۆرەيە.

بەڵام لە شەرعدا(غلام=جەوان) تا باڵغ بوون، پاشان (شاب=گەنج)،و تا سی ساڵی(فتــی= تازەپێگەيشتوو)ـە و،(كهل = بەتەمەن)ـە تا پەنجاساڵی، دوای ئەوەش(شيخ = زۆرپير).

---

١ غمز عيون البصائر شرح كتاب الأشباه والنظائر للحموي ٣/٣٠٩ طبع بيروت.

٢ پێی دەوترێت پياو هەروەك لە ئايەتی ميراتدا هاتووە، واتە: بۆ مەجازە، هــەروەك فــرەزان (ابــن حجر) لە شەرحی بخــاری لــە دەروازەی ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتًا غَيۡرَ بُيُوتِكُمۡ ﴾النــور/٢٧. باسی كردووە، هەروەك لە فەرهەنگيشدا هاتووە. (سەرچاوەی پێشوو).

# بەشی یەکەم

# ئامادە و سازکردنی ژن و مێرد و پەروەردەکاران بۆ پەروەردەکردنی منداڵ

## بەندی یەکەم

## چەند پێشەکیەکی گشتی بۆ دایك و باوك

دەستپێك

٢ـ بەرپرسیارێتی پەروەرە.

٣ـ هەوڵدان بۆ خواستنی ئافرەتێکی چاکی پەروەردەکار.

٤ ـ پاداشتی خەرجکردنی ماڵ بۆ ژن و منداڵ.

٥ ـ ئامانجەکانی هاوسەرگرتنی ئیسلامی.

٦ ـ سیفەتەکانی پەروەردەکاری سەرکەوتوو.

٧ ـ مژدەیەك بۆ دایك و باوکان.

٨ ـ منداڵ جوانی ژیانی دنیایە.

٩ ـ ململانێی شەیتان لەگەڵ مرۆڤ لەسەر وەچە.

١٠ ـ چاکی دایك و باوك و شوێنەواری لەسەر منداڵەکانیان.

١١ ـ پاڕانەوە لەکاتی جووتبوون بەمەبەستی بوونی منداڵێکی چاك.

١٢ ـ هاوسەرگرتن و خزمایەتی.

١٣ ـ منداڵ کە کاتێ هیچ نەبووە.

١٤ ـ منداڵ دڵۆپە ئاوێکە.

١٥ ـ سەرنجدانی دروست بوون لە منداڵداندا و گەشەی کۆرپەلە.

١٦ ـ چارەسەری پێغەمبەرﷺ بۆ نەزۆکی.

## ١٧ ـ سزای ئەوكەسەی خۆی لە منداڵەكەی بێبەری دەكات.

### دەستپێك :

((منداڵ یەكەم شت كە دەیبینێ لە بووندا ماڵ و كەس و كارەكەیەتی، هەربۆیە لە زیهن و هۆشیدا یەكەم وێنەی ژیان لە بارودۆخیان و شێوەی گوزەرانیان وێنا دەكرێت، و لە دەروونیدا نەرمییەك دروست دەكات كە توانای هەموو شتێكی هەبێت و بەهەموو كاریگەرییەك هەڵبچێت، بەشێوەی ئەم ژینگە یەكەمەی، ئیمام (غزالی) دەڵێت: منداڵ سپاردەیە لای دایك و باوكی و دڵی بێگەردی وەك گەوهەرێكی سافی بێنەخش و نیگار وایە، بۆیە ئامادەیە بۆ هەموو شتێك كە نەخشی لەسەر بكرێت، و ئارەزوو بۆ هەموو ئەو شتانە هەیە كە سەرنجی بۆی رابكێشرێت، جا گەر لەسەر چاكە ڕاهێنرا و فێركرا ئەوا لەسەر ئەو چاكەیە پەروەردە دەبێت، و دایك و باوكی لەگەڵ هەموو مامۆستایەكی و پەروەردەكارێكیدا دڵخۆشی دنیاو قیامەت دەبن.. خۆ گەر لەسەر خراپە ڕاهێنراو وەكو ئاژەڵ پشتگوێ خرا، ئەوا بەدبەختی و تیاچوون ئاكامی دەبێت و ئۆباڵیشی لە ئەستۆی پەروەردەكەر و سەرپەرشتیارەكەیەتی. پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێت: ((كل مولود يولد على الفطرة، وانما أبواه يهودانه أو يمجسانه أو ينصرانه)).[١] واتە: هەموو منداڵێك لەسەر فیترەت لەدایك دەبن، دایك و باوكی دەیكەن بە جولەكەیاخود ئاگرپەرست یاخود گاور.

(ابو العلاء)یش ئاماژەی بۆ ئەمە كردووەو دەڵێت:

وينشأ ناشئ الفتيان منا  على ما كان عوّده أبوه
وما دان الفتى بحجىً ولكن  يعوده التدينَ أقربوه

جا گەر ماڵ ئەو هەموو شوێنەواریەی لەسەر ژیانی منداڵ هەبێت، ئەوا بۆ بەدیهێنانی مەبەستی پێشوو پێویست دەكات لە دڵ و دەروونیدا گیان و ئایین و چاكەكاری بچێنین)).[٢]

---

١ دایك و باوك دوو رەگەزی گرنگن، و ناردنی منداڵەكەیان بۆ قوتابخانەی تایبەتی -بەناوی فێربوون و زانست- ئەوە لەناوبردنی منداڵە، گەر دایك و باوكی ئاگاداری نەبن، هەروەك فەرامۆشی كردنیشی رێگەی تیاچوونی منداڵەكەیە -پەنا بەخوا-.

٢ رسالة أنجح الوسائل.

## ٢- بەرپرسیارێتی پەروەردە:

((ئەی دەستەبەرکار (کفیل)، گەر بەرپرسیارێتی منداڵت پێدراو لەرێگەی خراپدا بەرەڵات کرد، دەترسم سزات دووقات ببێت، سزا بدرێیت لەسەر لێڵ کردنی ئەو گەوهەرە زۆر ڕێزلێنراوە بە سزایەکی زۆر توند، لەو تاوانە گشتیەشدا بەشێکی سەپێنراو وەردەگریت)).[1]

لەبەر ئەوەشە دەبینین پێغەمبەری خواﷺ بەرپرسێتیەکی تەواوی پەروەردەکردنی منداڵان دەخاتە سەر شانی دایك و باوك:

لە(ابن عمر)ەوە‌ڵ دەگێڕنەوە کە دەڵێ: گوێم لێبوو پێغەمبەری خواﷺ دەیفەرموو: **((کلکم راعٍ وکلکم مسؤول عن رعيته: الإمام راعٍ ومسؤول عن رعيته، والرجل راع عن أهله ومسؤول في رعيته، والمرأة راعية في بيت زوجها ومسؤولة عن رعيتها، والخادم راعٍ في مال سيده ومسؤول عن رعيته، وكلكم راعٍ ومسؤول عن رعيته)).**[2] واتە: ئێوە هەمووتان شوانن و بەرپرسیارن لەوەی لەبەردەستاندایە؛ پێشەوا چاودێرەو لێپرسراوە لەوەی لەژێر چاودێرییایەتی، پیاو چاودێرە لەنێو خێزانەکەیداو بەرپرسیارە لێیان، ژن چاودێری ماڵی مێردەکەیەتی و بەرپرسیارە لێی، خزمەتکار چاودێرە لەماڵی گەورەکەی و بەرپرسیارە لەوەی لەبەردەستیدایە، ئێوە هەمووتان شوانن و بەرپرسیارن لەوەی لەبەردەستاندایە.

هەتا پێغەمبەری خواﷺ ڕێسایەکی بنەڕەتی دادەنێت ئەو مانایە دەدات کە منداڵ لەسەر ئایینی دایك و باوکی گەورە دەبێت، و ئەوان کاریگەری زۆر بەهێزیان بەسەر منداڵدا هەیە.

(بخاری) لە (ابوهریرە)ەوە‌ڕ گێڕاویەتیەوەو دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: **((ما من مولود يولد الاّ يولد على الفطرة، فأبواه يهودانه أو ينصرانه أو يمجسانه، كما تنتج البهيمة جمعاء، هل تحسون فيها من جدعاء؟)).** واتە: هەموو منداڵێك لەسەر فیترەت[3] لەدایك دەبێت، جا باوك و دایکی دەیکەنە جولەکە یاخود گاور یا ئاگرپەرست، هەروەك چۆن ئاژەڵ بە تێر و تەواوی پەیدا دەبێ، ئایا هیچ دانەیەکی لوتبڕاوی تێدا دەبینیت؟

---

١ السعادة العظمى -ص٩٠ للشيخ محمد الخضر حسين.

٢ متفق عليه.

٣ فیترەت (فطرة) ئەو پەیمانە دەگرێتەوە کە خوای گەورە لە پشتی ئادەم لە هەموو بەندەکانی وەرگرتووە، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِىٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ ۖ قَالُوا۟ بَلَىٰ ۛ شَهِدْنَآ ۛ أَن تَقُولُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَـٰذَا غَـٰفِلِينَ﴾ الأعراف/١٧٢. -وەرگێڕ-

پاشان (ابوهريره) دەڵێ: ئەگەر حەز دەکەن ئەم ئایەتە بخوێننەوە: ﴿فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ﴾الروم/٣٠.[١] واتە: فیترەتی خوایە کە خەڵکی لەسەر ئەو فیترەتە دروست کردوە، و هیچ گۆڕانکاریەك لە بەدیهێنراوانی خوادا نیە، ئا ئەوەیە ئایینی راست و پتەو.

خوای گەورەش فەرمانی بەدایك و باوکان کردووە و هانی داون کە منداڵەکانیان پەروەردە بکەن، و بەرپرسیارێتی ئەوەشی خستۆتە ئەستۆیان، وەك دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ لَّا يَعْصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾التحريم/٦.واتە: ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە، خۆتان و خاوخێزانتان بپارێزن لە ئاگرێ کە سوتەمەنیەکەی مرۆڤ و بەردە، کە بە فریشتەی زۆر تورەو بەهێز سپێردراوەو هەرچی خوا فەرمانیان پێ بکات نافەرمانی ناکەن و هەر ئەوە ئەنجام دەدەن کە فەرمانیان پێکراوە.

ئیمام(علی) لەبارەی ئەو ئایەتەوە دەڵێ: خۆتان و خاوخێزانتان فێری چاکەپەروەری بکەن.[٢]

(فخر الرازی)یش لە تەفسیری(قُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ)دا دەڵێت: واتە خۆتان بپارێزن بە وازهێنان لەو شتانەی کە خوا لێی قەدەغەکردوون.[٣]

(مقاتل) دەڵێت: واتە: موسڵمان خۆی و خاوخێزانەکەی چاك گۆش بکات، و فەرمانیان پێ بکات بە چاکەو رێگرییان بکات لە خراپە.

لە (الکشاف)یشدا دەڵێ: (قُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ) خۆتان بپارێزن بە وازهێنان لە گوناهەکان و ئەنجامدانی فەرمانبەرییەکان (الطاعات) خاوخێزانەکانیشتان بەهەمان شێوە بپارێزن بەوەی کە چۆن لە خۆتان دەپرسنەوە ئاواش لەوان بپرسنەوە.

---

١ رواه البخاري: كتاب ٢٣ باب ٨٠ و٩٣ وكتاب ٦٥ سورة ٣٠، وكتاب ٨٢ باب ٣ ورواه مسلم: كتاب ٤٦ حديث رقم ٢٢-٢٥ وسنن ابي داود كتاب ٣٩ باب ١٧ والترمذي: كتاب ٣٠ باب ٥ والموطأ: كتاب ١٦ حديث ٥٢ ومسند احمد: الجزء الثاني من ٢٣٣ و ٢٥٣ و ٢٧٥ و ٢٨٢ و ٣١٥ و ٣٤٦ و ٣٩٣ و ٤٧٠ و ٤٨١ والجزء الثالث ص ٣٥٣ و ٤٣٥، والجزء الرابع ص٢٢، أنظر مفتاح السنة ص٥٣٥.

٢ رواه الحاكم في مستدركه ٤٩٤/٤ وقال: صحيح على شرط الشيخين، و لم يخرجاه.

٣ التفسير الكبير (٤٦/٣٠).

لەبەر ئەوە دەبێت بە بەردەوامی هەوڵ بدرێت و کاری تەواو بکرێت بۆ چاکسازی منداڵان و راستکردنەوەی هەڵەکانیان، راهێنانیان لەسەر چاکەکاری، دیارە ئەمەش رێبازی پێغەمبەران و نێردراوانە، وەك دەبینین پێغەمبەر (نوح) کوڕەکەی خۆی بانگ کرد بـۆ بڕواهێنـان، هـەروەها (ابراهیم)✕ کوڕەکانی راسپارد کە تەنها پەرستشی خوا بکەن.

ئیمام (نووی) لە کتێبەکەیدا (بستان العارفین)[1] لە ئیمام (شافیعی)ەوە هێناویەتی، ئەویش لە(فضیل)ەوە کە وتوویەتی: (داود) پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (خودایە! چۆن بـووی بـۆ مـن ئاواش بە بۆ کوڕەکەم! خوای گەورەش وەحی بۆ کرد و پێی فەرموو: داود! بە کوڕەکەت بڵێ کە تۆ چۆن بووی بۆ من ئەویش وەها بێت، تا منیش چۆنم بۆ تۆ وەهاش بم بۆ ئەو).

لەبەر ئەوە ئیمام (غزالی): لە پەیامەکەی (ایها الولد)دا بڕیاری داوە کە واتـای پـەروەردە هاوشێوەی کاری جوتیارێکە، دڕك بژار دەکات، و گیاناموکان لە کێڵگەکەیـدا هەڵدەکێـشێت، تا رووەکەکەی باش بێت و گەشەی تەواو بکات.

(ابن قیم)یش جەختی لەسەر ئەو بەرپرسـیارێتیە کـردووەو قـسەی بـەجێ و سـوودمەندی کردووە، و دەڵێت:[2] هەندێ لە زانایان وتوویانە: خوای گەورە لە رۆژی دواییدا پرسیار لە بـاوك دەکات دەربارەی منداڵەکەی، بەر لەوەی کە پرسیار لە منداڵ بکات دەربارەی باوکی، چـونکە چۆن باوك مافی لەسەر منداڵەکەیەتی، بەهەمان شێوەش منداڵ مافی لەسـەر بـاوکی هەیـە، هەروەك خوای گەورە دەفـەرموێت: ﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حُسْنًا ﴾العنکبـوت/٨. واتـە: (مرۆڤمان راسپاردووە کە چاك بن لەگەڵ دایك و باوکیاندا).

لە شوێنێکی دیکەدا دەفەرموێت: ﴿قُوٓاْ أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا ﴾التحریم/٦.واتـە: (خۆتـان و خاووخێزانتان بپارێزن لە ئاگرێ کە سوتەمەنیەکەی مرۆڤ و بەردە).

ئیمام (علی کوڕی ابوطالب)یش دەڵێت: فێریان بکەن و ئەدەبیان بدەن.

خـوای گـەورەش فەرموویـەتی: ﴿وَٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشْرِكُواْ بِهِۦ شَيْـًٔا ۖ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا وَبِذِى ٱلْقُرْبَىٰ ﴾النساء/٣٦. واتە: (خودا بپەرستن و هیچ شتێك مەکەن بە هاوبەشی و لەگەڵ دایك و باوك و کەسانی نزیکدا باش بن).

---

١ ص٤٥.

٢ أحكام المولود ص٢٢٩.

پێغەمبەری خواﷺش فەرموویەتی: ((أعدلوا بين أولادكم))[1] واتە: لەنێوان منداڵەكانتاندا دادگەر بن.

ڕاسپاردەی خوای گەورە بۆ باوكان بەرامبەر منداڵەكانیان لەپێشترە لە ڕاسپاردەی منداڵان بەرامبەر باوكان، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَوْلَٰدَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلَٰقٍ نَّحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُمْ إِنَّ قَتْلَهُمْ كَانَ خِطْـًٔا كَبِيرًا ﴾الإسراء/٣١. واتە: منداڵانی خۆتان لە ترسی هەژاری و نەداری مەكوژن، هەر ئێمە ڕزق و ڕۆزی ئەوان و ئێوەش دەدەین، بەڕاستی كوشتنی ئەوانە گوناهێكی گەورەیە.

(ابن قیم) درێژە بە وتەكەی دەدات و دەڵێت: (هەركەسێ فێكردنی شتی بەسود بەمنداڵەكەی پشتگوێ خست و بەرەنجەڕۆیی وازی لێ هێنا، ئەوە ئەوپەڕی خراپەكاری كردووە، زۆرێك لە منداڵانیش بەهۆی باوكانیانەوە تووشی خراپەكاری بوون، چونكە پشتگوێیان خستوون و فێری فەرز و سوننەتەكانی ئاینیان نەكردوون، بۆیە بە منداڵی لەدەستیان دەرچوون و بەگەورەییش نە سودیان بۆ خۆیان هەیە و نە بۆ دایك و باوكیان، هەروەك هەندێك لە باوكان سەرزەنشتی كوڕەكانیان كردووە لەسەر نەدانی مافەكانیان، ئەویش وتوویەتی: باوكە! تۆ بە منداڵی مافەكانی منت نەداوە، بۆیە منیش لە گەورەییدا مافەكانی تۆم نەدا، تۆ بە ساوایی منت فەوتاند، منیش لە پیریدا تۆم فەوتاند).

هاوسەرگرتن و خستنەوەی وەچە بەرپرسیارێتیەكی مەزنەو مرۆڤ لە ڕۆژی دواییدا لێپرسینەوەی لەبارەیەوە لێ دەكرێت:

(ترمذی) لە (ابو سعید خدری) و (ابوهریرە)ەوە دەگێڕێتەوە، كە وتوویانە: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((**يؤتى بالعبد يوم القيامة فيقول له: ألم أجعل لك سمعاً وبصراً ومالاً وولداً؟ وسخّرت لك الأنعام والحرث؟ وتركتك ترأس وتربع؟ فكنت تظن أنك ملاقي يومك هذا؟ فيقول: لا، فيقول له: اليوم أنساك كما نسيتني..**)) وفي رواية ((ألم أزوجك)).واتە: لەرۆژی دواییدا خوای گەورە بەندەكەی دەهێنێت و پێی دەفەرموێت: ئایا من گوێ و چاوو ماڵ و منداڵم بەتۆ نەدابوو؟ كێڵگە و ئاژەڵم نەخستبوە خزمەتت؟ وازم لێ

[1] ((أعدلوا بين أولادكم في النحل كما تحبون أن يعدلوا بينكم في البرّ واللطف)) **واتە: لە شت بەخشین بە منداڵەكانتان دادگەر بن، هەروەك چۆن حەزدەكەن لە چاكە و لوتفدا ئەوان لەنێوانتاندا دادگەر بن.** صحيح، رواه الطبراني عن نعمان بن بشير. أنظر صحيح الجامع الصغير برقم ١٠٤٦.

نەهێنابووی سەرۆکایەتی بکەی و حاڵت باش بێ؟ ئایا وات گومان دەبرد کە بەم رۆژە بگەیت؟ ئەویش لە وەڵامدا دەڵێ: نەخێر، پاشان پێی دەفەرمویێت: ئەمڕۆش من تۆ لەبیر دەکەم هەروەك تۆ منت لەبیر کرد.. – لە گێڕانەوەیەکیشدا: ئایە هاوسەرم بۆ پێك نەهێنای؟

چ گەواهییەك لەسەر پوچیی مێشك و نەمانی هەستی مرۆڤ گەورەترە لەوەی کە ئەو کاتە دێنێتە پێش چاوی خۆی کە منداڵەکەی پێدەگات و لەخەیاڵیدا نەخشە دەکێشێ و چۆن خۆی لەنێو پیاواندا رێك دەخات، کەچی بە پەروەردەیەکی چاك ئەو بوارەی بۆ نارەخسێنێت کە ببێتە سەردارێکی مەرد.[1]

بەڵام ئەم پەروەردەیە کە مافی منداڵە لەسەر دایك و باوکی، نە بەخشینە و نە دیارییە، پێغەمبەری خواﷺش ئەوەی دوپات کردۆتەوە، وەك فەرموویەتی: **((إنما سماهم الله أبراراً، لأنهم بروا الآباء والأبناء، كما أن لوالدك عليك حقاً، كذلك لولدك عليك حق))**.[2] واتە: (خوای گەورە بە زۆرچاکان (ابرار) ناوی ناون، لەبەر ئەوەی چاك بوون بەرامبەر باوکان و منداڵەکانیان، هەروەك چۆن تۆ مافت بەسەر منداڵەکەتەوە هەیە، بەهەمان شێوەش منداڵەکەت مافی لەسەر تۆ هەیە).

(نسائی) و (ابن حبان) لە (صحیح)ەکەیدا بە (مرفوع)ی دەگێڕنەوە: **((إن الله سائل كل راعٍ عما أسترعاه أَحَفِظَ أم ضَيَّعَ؟ حتى يسأل الرجل عن أهل بيته))**[3] واتە: (خوای گەورە پرسیار لە سەرکارەکان دەکات دەربارەی ئەوەی کە لەبەردەستیاندا بووە، کە ئایا مافی پاراستووە یاخود فەوتاندوویەتی؟ تەنانەت پیاویش دەربارەی خاووخێزانەکەی پرسیاری لێ دەکرێت).

وە لە گێڕانەوەی (عبدالرزاق)دا هاتووە: **((إن الله عز وجل سائل كل ذي رعية فيما أسترعاه؛ أقام أمر الله فيهم أم أضاعه؟ حتى إن الرجل لَيُسأل عن أهل بيته))**.واتە: خوای گەورە پرسیار لە هەموو کاربەدەستێك دەکات دەربارەی ئەوەی لەبەردەستیدا بووە، ئایا فەرمانی خودای لەسەر بەجێهێناون یاخود فەوتاندوویەتی؟ تەنانەت پیاوان سەبارەت بە خاووخێزانیان پرسیاریان لێ دەکرێت.

---

١ السعادة العظمى ص٩٠ للشيخ محمد الخضر حسين.

٢ أخرجه البخاري في الأدب المفرد؛ ورواه الطبراني، وفيه عبيدالله بن الوليد الوصافي وهو ضعيف كذا قاله الهيثمي في المجمع (١٤٦/٨).

٣ أنظر سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم ١٦٣٦.

## ٣- هەوڵدان بۆ خواستنی ئافرەتێکی چاکی پەروەردەکار:

((ئیسلام ئایینی خێزانەو بڕیار دەدات کە شوێنکەوتەی بڕوادار بێت لە خێزانەکەیدا و ئەرکەکانی ماڵەوەی دیاری دەکات، ماڵی موسڵمانیش کرۆکی کۆمەڵی ئیسلامیەیە، و ئەو خانانەیە کە لێی پێك دێت، هەروەها لەگەڵ خانەی دیکەش.

ئەوەی کە یارمەتی باوك دەدات لە پەروەردەکردنی منداڵەکەیدا، و چاودێریکردنی لە پرۆسەی پەروەردەییی: ئەو هاوسەرە چاکەیە کە رۆڵ و ئەرکی خۆی تێدەگات و بەجوانترین شێوەش پێی هەڵدەستێت، پایەی سەرەکیشە لەم کارەدا، ئەو کارەشی رۆڵی مێژوویی هەیە لە ژیانی کۆمەڵگاکاندا، چونکە وەچەیەکی چاکساز بۆ کۆمەڵگا بەرهەم دێنێت کە ئومەت بەرەو چاکەو بەهێزی دەبات.

ماڵ قەڵایەکە لە قەڵاکانی ئەم بیروباوەڕە، هەر بۆیە پێویست دەکات کە قەڵاکەی لەنێوخۆیدا یەکگیر بێت، و لەخودی خۆیدا پتەو بێت، و هەر تاکێك تێیدا لەسەر کەلێنێکی دەوەستێت تا هیچ شتێکی لێوە نەیەتە ناوەوە، خۆ گەر وانەبێت، ئەوا دەست بەسەرداگرتنی سەربازان لەناو قەڵاکەیاندا سانا دەبێت، بۆیە هیچ گران نابێت بۆ هەرکەسێك بیەوێت بچێتە ژوورەوەو زەحمەت و ئەستەم نابێت لەبەردەم هەر هێرش بەرێکدا.

ئەرکی بڕواداریش ئەوەیە کە ئەم قەڵایە لەناوەوە پتەو بکات، و ئەرکی سەر شانیەتی کە کەلێنەکانی پڕ بکاتەوە، بەر لەوەی بە بانگەوازەکەیەوە بۆ دوور بڕوات.

دەبێت دایکی موسڵمانیش هاوکار بێت، چونکە تەنها بەباوك قەڵاکی پتەو و پارێزراو نابێت، هەر بۆیە پێویستە باوك و دایك هەبن تا بەسەر کوڕ و کچەکانیانەوە چاودێر بن، بێهودەییە کۆمەڵگەیەکی ئیسلامی تەنها بە کۆمەڵە پیاوێك دابمەزرێ، بەڵکە هەر دەبێت ئافرەت لەو کۆمەڵگایەدا هەبن، چونکە ئەوانن پاسەوانانی تازەپێگەیشتوان، کە تۆوی ئایندەو بەروبوومەکەین.

ئەمە فەرمانێکەو پێویستە بانگخوازانی ئیسلام تێی بگەن و بەچاکیش خەڵکی لێی تێبگەیەنن:

(پێویستە یەکەمین هەوڵ ئاراستەی ماڵ بکرێت، ئاراستەی هاوسەر یاخود دایك، پاشان ئاراستەی منداڵەکان بکرێت، پاشان بۆ کەس و کار بەگشتی، وە پێویستە گرنگی تەواو بە پێگەیاندنی ئافرەتی موسڵمان بدرێت، تا ماڵێکی موسڵمان پێ بگات و دروست ببێت، ئەو

کەسەش دەیەوێت ماڵێکی موسڵمان بنیات بنێت، پێویستە یەکەمجار بەدوای ئافرەتێکی موسڵماندا بگەڕێت، ئەگینا بنیاتنانی کۆمەڵی ئیسلامی دوادەکەوێت، و دیوارەکانی بە بێهێزی و پڕ کەلێنی دەمێنێتەوە).[١]

چاکترین شتیش کە ئافرەتی لەسەر بخوازرێت بریتییە: لە ئایینەکەی و چاکی و لە خواترسانی و روولەخوابوونیەتی، جا بەم جۆرە ئافرەتە چاو رۆشن دەبێتەوە و، ئەمیندار دەبێت لەسەر خۆی و ماڵ و سامانی مێردەکەی و پەروەردەی منداڵەکانی، تا لەگەڵ نانخواردندا خۆراکی ئیمانیان دەرخوارد بدات و، لەگەڵ شیردا چاکترین ڕێبیر(مبدأ)یان پێ بدات و، یادی خوای گەورەو درودو سلاو لەسەر پێغەمبەرەکەیﷺ بەگوێیاندا بدات تا لە کانیاوی تەقواو خۆپارێزی بخۆنەوەو خۆشەویستی ئیسلام تا مردن لەدڵیاندا پچەسپێنێت، مرۆڤیش لەسەر ئەوە گەورە دەبێت کە لە لاویدا پێی راهاتووەو ڕەوشتەکانی باوك و دایکیش بۆ منداڵەکانیان دەگوازرێتەوە.

زۆرجار تەقواداری لە منداڵدا دەرکەوتوە، راست وەکو دایك و باوکی یان یەکێکیان، یاخود مامی یان خاڵی، لە ڕێنماییەکانی پێغەمبەریشداﷺ ئاماژە بۆ ئەوە کراوە:

(ابن عدی)و (ابن عساکر) لە(عائشە)وەڵ دەگێڕنەوە کە سەردارمان پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((**تَخَيَّروا لنطفكم، فإن النساء يَلِدْنَ أشباه إخـوانهن وأخـواتهن**)).[٢] واتە: (ئافرەتی چاك بۆ نوتفەکانتان هەڵبژێرن، چونکە ئافرەتان هاوشێوەی براو خوشکەکانی خۆیان دەبێت).[٣]

(دارقطنی) لە(عائشە)وەڵگێڕاویەتیەوە کە وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی:((**أختاروا لنطفكم المواضع الصالحة**)) واتە: (بۆ نوتفەکانتان جێی چاك هەڵبژێرن).

مافی پیاوە کە هەوڵی ڕۆشنبیربوونی ژنەکەی بدات، لەبەر ئەوەی ڕۆشنبیری یارمەتی دەدات لە بەڕێوەبردنی ماڵ و پەروەردەکردنی منداڵ بە پەروەردەیەکی چاك، ئافرەتیش بۆی هەیە چەندی بوێت لە زانستەکان فێری ببێت، بەجۆرێك کە بگونجێت لەگەڵ ڕێزو تەواوی

---

١ دستور الأسرة في ظلال القرآن ص١١٢.

٢ رحمة الإسلام بالنساء للشيخ محمد حامد ص٤٠-٤١.

٣ **لە گێڕانەوەی (ابن ماجە) و (بیهقی)دا**: ((تخيروا لنطفكم، فأنكحوا الأكفاء وأنكحوا اليهم)) صحيح، أنظر صحيح الجامع رقم٢٩٢٨.

خۆیدا، هەروەك وتراوە: ژن و پیاو وەك كۆپلە شیعرێك وان، جوان نیە نیوەدێرێكی رێك و پێك بێت و نیوەدێرەكەی تر نارێك بێت.[١]

پێغەمبەری خوا ﷺ ش ستایشی ئافرەتی قورەیشی كردووە بەهۆی ئەو رەوشت باشیەی هەیانە، كە بەسۆزن بەرامبەر منداڵەكانیان و بەرامبەر مێردەكانیان چاودێر و دڵنەواین.

(بخاری)و (مسلم) لە(ابوهریرە)وە ﷺ هێناویەتی كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((خَیْرُ نساءِ رَكِبْنَ الإبل؛ صالح نساء قریش، أحناه علی ولد في صغره، وارعاه علی زوج في ذات یدهٍ)). واتە: چاكترین ئەو ئافرەتانەی سواری حوشتر بوون ئافرەتە چاكەكانی قورەیشن، زۆر بەسۆزن بۆ منداڵەكانیان لە بچووكیدا و زۆر چاودێرن لەسەر ماڵی مێردەكانیان.

ئافرەت كە هەڵدەستێ بە پەروەردەكردنی منداڵەكانی و خزمەتكردنی مێردەكەی، ئەوا ئەم كارەی بۆ بەرزترین پلە بڵندی دەكات و دەیخاتە ریزی ئافرەتە مەزنەكانەوە، ئەو كارەشی هاوتای جیهادی پیاوە لە مەیدانی جەنگ و نوێژی هەینیەیە لە مزگەوتەكاندا.

(مسلم) لە(صحیح)ەكەیدا گێڕاویەتەوە كە (اسماء كچی یزید كوڕی السكن) م هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی: من نێردراوی كۆمەڵێك لە ئافرەتانی موسڵمانم، هەموویان هاوڕای منن و ئەو قسەیە دەكەن كە من ئێستا دەیڵێم، خودا تۆی بۆ پیاوان و ئافرەتان رەوانە كردووە، ئێمەش بڕوامان پێ هێنایت و شوێنت كەوتین، ئێمەی چینی ئافرەتانیش نیشتەجێی نێوماڵەكانمانین و داپۆشراوین، پیاوان بەهۆی نوێژی هەینیان و ناشتنی مردوو و جیهاد كردنەوە فەزڵیان بەسەر ئێمەدا دراوە، لەكاتێكدا ئەوان جیهاد دەكەن، ئێمەش سامانەكانیان بۆ دەپارێزین و منداڵەكانیان پەروەردە دەكەین، جا ئەی پێغەمبەری خوا ئایا بەمە ئێمە لە پاداشتیاندا بەشدار دەبین؟!

پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوڕی دایەوە بۆ لای هاوەڵانی و فەرمووی: ((هل سمعتم مقالةَ امرأةٍ، أحسن سؤالاً عن دینها من هذه؟)) واتە: بیستوتانە ئافرەتێك هەبێ دەربارەی ئایینەكەی پرسیاری لەمە باشتر بكات؟

وتیان: نەخێری ئەی پێغەمبەری خوا.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((أنصرفي یا أسماء! وأعلمي من وراءك من النساء: إن حُسن تَبَعُّلِ أحداكنَّ لزوجها، وطلبها لمرضاته، وإتباعها لموافقته، یعدل كل ما

---

١ دراسات في الشریعة الإسلامیة ص٩٨ للشیخ محمد الخضر حسین.

**ذكرت)).**واتە: ((أسماء)! بڕۆ ئەو ئافرەتانەی لەگەڵ تۆدان تێیان بگەیەنە" چاکی ژنایەتی هەرکامتان بۆ مێردەکەی و هەوڵی ڕازی کردنی و شوێنکەوتنی ڕەزامەندی ئەو، هاوپاداشتی هەموو ئەوانەیە کە باست کرد).

(ماوردی) هەڵبژاردنی ژن بە مافی منداڵ دادەنێت لەسەر باوکی، ئەمەی لە قسەی (عمر کوڕی خطاب)ﷺ دەرهێناوە کە دەڵێ: (یەکەمین مافی منداڵ لەسەر باوکی لێ گرتن و هەڵبژاردنی دایکیەتی، جوان و خانەدان و بەدین و پاك و ژیر بێت لە کاروبارەکانی و ڕەوشتی جێی ڕەزامەندی بێت، و عەقڵ و تەواوییەکەی تاقیکرابێتەوە، و لەهەموو کات و بارێکدا بەدەم داواکاریەکانی مێردەکەیەوە بچێت.[1]

هەتا پێغەمبەری خواﷺ بڕیاری لەسەر بۆچوونی (جابر کوڕی عبدالله) دا لە هەڵبژاردنی ژنەکەیدا، تاکو هەستێت بە کاری پەروەردەکردنی خوشکە بچووکەکانی، سەرەڕای منداڵەکانی خۆی لە ئاییندەدا.

(جابر) لە فەرموودەیەکی درێژدا[2] دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خواﷺ پرسیاری لێ کرد: ((**هل تزوجت بكراً أم ثَيِّباً؟**)) واتە: ئەو ئافرەتەی هێنات کچ بوو یان بێوەژن؟

جابر وتی: بێوەژن بوو، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((**هلا بكراً تُلاعِبُها وتُلاعبك؟**))،واتە: بۆ کچێکت نەهێنا تا گەمەو یاری لەگەڵدا بکەیت و ئەویش گەمەو یاریت لەگەڵدا بکات؟

جابر دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا! باوکم مردووەو کۆمەڵێك خوشکم هەیە، حەزم نەکرد کەسێك مارەبکەم کە وەك خۆیان وابێت (واتە لە تەمەندا) و نەتوانێ فێری ئەدەبیان بکات و سەرپەرشتیان بکات، هەربۆیە بێوەژنم هێنا، تا چاودێرییان بکات و فێری ئەدەبیان بکات.

لەبەر ئەمە یەکێك لە ئەرکەکانی سەرشانی ئافرەتی دایك بەرامبەر مێردەکەی ئەوەیە کە دەبێت بەجوانی بەوپەڕی ئارام گرتن و هێمنی و سۆزەوە هەستێت بە پەروەردەکردنی منداڵەکانی، و لەبەرچاوی لێیان تورە نەبێت و دوعایان لێ نەکات و جنێویان پێنەدات و لێیان

---

١ كتاب نصيحة الملوك، لأبي الحسن الماوردي، تحقيق الشيخ الخضر محمد خضر ص١٦٢.
٢ أخرجه الخمسة. أنظر الحديث بطوله في تيسير الوصول ٦٢/١ وجامع الأصول ١٥/١.

نەدات، چونکە ئەو کارانەی دەبنــە هـۆی ئـازاردانی باوکەکـەیان، و لەوانەیـە خـوای گـەورە دوعاکەی قبوڵ بکات و بەو هۆیەشەوە هەردووکیان بکەونە ناخۆشی و ئازارێکی گەورەوە.[١]

لە کۆتاییدا، ژن(هاوسەر)ی چاك گەنجینەیەکی راستەقینەیە کە پیاو لە دنیـا و قیامەتـدا بۆی دەمێنێتەوە.

(ترمذی) لە (ثوبان)ەوە دەگێڕێتەوە، وتوویەتی: کاتێـك ئایـەتی ﴿وَٱلَّذِينَ يَكۡنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلۡفِضَّةَ ﴾التوبة/٣٤. هاتە خوارەوە، ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خواﷺدا بـووین لـە هەندێ لە گەشتەکانیدا، چەند یاوەرێك وتیان: ئەمە دەربارەی زێـڕ و زیـودا هاتۆتـە خـوارێ، خۆزگە بمانزانیایە کە چ ماڵێك چاکترە تا بمانگرتایـە خـۆ.. پێغەمبـەری خـواﷺ فـەرمووی: ((**أفضله لسان ذاكر، وقلب شاكر، وزوجة صالحة، تعين المؤمن على إيمانه**)). واتە: چاکترین ماڵ زمانێکی زیکرکەر و دڵێکی سوپاسگوزار و ژنێکی چاکە کە یارمەتی بـڕوادار دەدات بـۆ زیادکردنی بڕواکەی.

(ابـوداود)یـش لـە (ابـن عبـاس)ەوەش گێڕاویەتیـەوە کـە کاتێـك ئـەم ئایەتـە هاتـە خوارەوە﴿وَٱلَّذِينَ يَكۡنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلۡفِضَّةَ ﴾التوبة/٣٤. لەسەر موسڵمانان زۆرگـران بوو، بۆیە (عمر) وتی: من دەروتان لێ دەکەمەوە، ڕۆیشت و وتی: ئەی پێغەمبەری خـواﷺ! ئەم ئایەتە لەسەر یاوەرانت قورسە؟

پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((**إن الله لم يفرض الزكاة الاّ ليطيب ما بقي من أموالكم، وإنما فرض المواريث، لتكون لمن بعدكم**)). واتە: خوای گەورە زەکاتی لە ماڵەکەتاندا بۆ ئەوە فەرزکردووە تا ئەوەی دەمێنێتەوە پاك بێتەوە، هەروەها میراتگری فـەرزکردووە تـا بـۆ پـاش خۆتان بمێنتەوە.

(عمر) وتی: الله أكبر! پاشان پێغەمبەری خواﷺ پێی فـەرموو: ((**ألا أخبرك بمـا يكـنز الرجل: المرأة الصالحة، إذا نظر اليها زوجها سرَّتهُ، وإذا أمَرها أطاعته، وإذا غـاب عنـها حفظته**)). واتە: ئایا گەنجینەیەکت پێ بڵێم کە پیاو پاشەکەوتی بکـات: ئـافرەتی چـاك، گـەر مێردەکەی سەیری بکات پێی دڵخۆش بێت، و گەر فەرمانی بەسەردا بدات گوێڕایەڵی بێـت، و گەر لێی دوورکەوتەوە ماڵ و منداڵی بۆ بپارێزێت.

پەروەردگارا! وا بکەی هاوسەرەکانمان بەهەمان شێوە چـاك و فەرمانبـەری مێـردو نهێنـی پارێز بن.

---

١ المرأة المسلمة، للشيخ وهبي سليمان الغاوجي ص١٥٣.

## ٤- پاداشتی خەرجکردنی ماڵ بۆ ژن و منداڵ:

خەرج کردنی ماڵ شوێنەواری باشی هەیە لە پرۆسەی پەروەردەکردندا، بەتایبەت کاتێك کە شەرع سەرچاوەی ئاراستەکاری بێت ﴿لِيُنفِقْ ذُو سَعَةٍ مِّن سَعَتِهِۦ﴾الطـلاق/٧. واتـە: (بـا هەرکەسێك بەگوێرەی هەبوونی خۆی ئەرکی بەخێوکردن بدات، نە زیادەڕەوی و دەست بڵاوی و نە رژدی و بەرچاوتەنگی، بەڵکو هاوسەنگی یە لـەنێوان خـەرجکردن و هەوڵدانـدا، هـەروەها مەشقی منداڵی پێگەیشتووە لەسەر هەوڵـدان بـەپێی توانـای خـۆی، و بەچـاك بـەڕێوەبردنی ئابووری ماڵی خۆی).

فەرموودەی زۆر هاتووە کە مرۆڤ هان دەدات بـۆ خـەرجکردنی مـاڵ، و پاداشـتی لەسـەر وەردەگرێت، نەك هەر ئەوە، بەڵکو پێش هەموو خێر و چاکەکردن(صدقات)ەکان دەکەوێت:

(مسلم) لە (ابوهریرە)ەوەﷺ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: (( **دینـار أنفقته في سبيل الله ودينار أنفقته في رقبة، ودينار تصدقت به على مسكين، ودينار أنفقتـه على أهلك، أعظمها ألذي أنفقته على أَهْلِكَ** )). واتـە: (دینارێـك لـە رێـی خـوادا خـەرجت کردبێت، دینارێك بۆ ئازادکردن بەندەیەکت دابێت، دینارێك بەخشی بێتـت بـە هـەژارێك، وە دینارێك بۆ خاووخێزانی خۆت خەرجت کردبێت، مەزنترینیان ئەوەیە کە بۆ خاووخێزانی خـۆت خەرجت کردبێت).

لە (سعد کوڕی ابووقاصﷺ)یش دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خواﷺ دەفـەرمووێ: (( **إنك مهما أنفقتَ على أهلك من نفقةٍ، فإنك تؤجر، حتى اللُّقْمَة ترفعها الى فَيّ امرأتك** )).[1] واتە: تۆ هەر شتێك بۆ خاووخێزانەکەت خەرج بکەیت، پاداشتت دەدرێتەوە، هەتا لەسەر پاروەنانێك کە بەرزی دەکەیتەوە بۆ دەمی ژنەکەت پاداشتت دەدرێتەوە.

لە (ابوهریرە)ەوەﷺ دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: ئەی پێغەمبـەری خـوا! باشـترین خێرکـردن کامەیە؟ فەرمووی: ((جهد المقل، وأبدأ بمن تعـول))[2] واتـە: خێرکردنـی هـەژارێك، وە لـەو کەسانەوە دەست پێبکە کە بەخێوکردنیـان لەسەرشانتە.

---

١ رواه أبويعلى في مسنده ٨١/٢ بسند صحيح ورواه احمد ١٧٢/١.

٢ رواه الحاكم في مستدركه (٤١٤/١) وقال صحيح على شرط مسلم و لم يخرجاه، وأقـره الـذهبي، ورواه أحمد(٩٤/٤).

ئیمام (احمد)یش لە(مقدام کوڕی معد یکرب)ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خواﷺ فەرموی: **((ما أطعمت نفسك فهو لك صدقة، وما أطعمت ولدك فهو لك صدقة، وما أطعمت زوجتك فهو لك صدقة، وما أطعمت خادمك فهو لك صدقة))**[1] واتە: هەرشتێکت دەرخواردی خۆت دا ئەوە خێرە، هەرچیت دەرخواردی منداڵەکەت دا ئەوە بۆ تۆ خێرە، هەرچیت دەرخواردی ژنەکەت دا ئەوە بۆ تۆ خێرە، هەرچیت دەرخواردی خزمەتکارەکەت دا ئەو بۆ تۆ خێرە.

(ابوحنیفە) لە (مسند)ەکەیدا لە (ابن عباس)ەوەش دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: **((إذا مات أحدكم مغموماً مهموماً، كان أفضل عند الله من ألف ضربة بالسيف في سبيل الله))**. واتە: (ئەگەر یەکێکتان بە دڵتەنگی و غەمبارییەوە مرد، ئەوە لای خوای گەورە چاکترە لە لێدانی هەزار شمشێر لەپێناوی خوادا).

عەللامە (ملا علی القاری) لە راڤەی ئەم فەرموودەیەدا دەڵێت: (مغموماً) واتە غەمبارییەك کە دڵی تەنگ بکات، (مهموماً) دووپاتکردنەوەی پێش خۆیەتی، ئەمەش بەهۆی زۆری منداڵ و پەیداکردنی نانی حەڵاڵ بۆیان، ئەمەش لای ئەهلی کەماڵ بە (فەرزی عەین) دادەنرێت، لەو بارەدا ئەوە لای خوای گەورە چاکترە لە لێدانی هەزار شمشێر لەپێناوی خوادا، کە لە زۆر کاتدا (فەرزی کیفایە)یە.

(قضاعی) لە (ابن عباس)ەوە دەگێڕێتەوە، و (ابونعیم)یش لە (الحلیە)دا:

**((طلب الحلال جهادٌ))** واتە: پەیداکردنی رزقی حەڵاڵ جیهادە.

(طبرانی)یش لە (ابن مسعود)ەوە دەگێڕێتەوە:

**((طلب الحلال فريضة))** واتە: پەیداکردنی حەڵاڵ فەرزە.

(دیلمی)یش لە (انس)ەوە دەگێڕێتەوە: **((طلب الحلال واجب على كل مسلم))** واتە: (پەیداکردنی رزقی حەڵاڵ ئەرکی سەرشانی هەموو موسڵمانێکە).

(ابن عساکر)یش لە (انس)ەوەﷺ دەگێڕێتەوە: **((من مات كالاً في طلب الحلال، مات مغفوراً له))**.[2] واتە: هەرکەسێك لە پەیداکردنی رزقی حەڵاڵدا ماندووبێ و بمرێ، ئەوا بە لێخۆشبوویی مردووە.

---

١ رواه أحمد باسناد جيد.

٢ شرح مسند ابي حنيفة للمحدث الملا علي القاري ص٦٢

لە (ابن عمر)ەوەش دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((**كفى بالمرء إثماً أن يُضَيِّع من يقوت**)).[١] واتە: ئەو خراپەیە بۆ مرۆڤێك بەسە کە بژێوی کەسانێکی لە ئەستۆدا بێت و بیانفەوتێنێ.

ئەمەش (عمر کوڕی خطاب)ﷺ کوڕەکەی خۆی فێردەکات کە چۆن رۆزی حەڵاڵ بۆ منداڵەکانی پەیدا بکات:

(ابن مبارك) لە کتێبی (الزهد)دا هێناویەتی و سەنەدەکەی داوەتە پاڵ (حسن): دەڵێ: رۆژێکیان (عمر کوڕی خطاب) بە هەندێك لە کۆڵانەکانی مەدینەدا دەڕۆیشت، کچێکی بچوکی بەدیکرد کە جارێك هەڵدەستا و جارێکی دی دادەنیشتەوە، فەرمووی: چەند داماوە! ئەوە کێیە؟ (ابن عمر) وتی: ئەوە یەکێکە لە کچەکانی تۆ، ئەی پێشەوای موسڵمانان، وتی: ئەی چیەتی؟ (ابن عمر) وتی: ئەوەی لای تۆیە لێت گرتۆتەوە، (عمر) وتی: ئەوا من لەوەی لای خۆم بێبەریم کردووە، ئەی تۆ بۆ دەستەوسانی کاسبی بۆ بکەیت، هەروەك ئەو خەڵکەی کاسبی بۆ کچەکانیان دەکەن؟ سوێند بەخوا هیچت لەلای من نیە تەنها بەقەدەر ئەوە نەبێت کە هەرپیاوێکی موسڵمان لەلای من هەیەتی، و کتێبی خوا لەنێوان من و تۆدایە.. (حسن) دەڵێ: جا بەخوا بەسەریدا زاڵ بوو.[٢]

## پێویست دەکات باسی پاداشتی ژن لە خەرجکردنی ماڵ و سامانی خۆی بۆ مێردو منداڵەکانی بکەین:

لە (ابوهریرە)ەوەﷺ دەگێڕنەوە کە رۆژێکیان پێغەمبەری خواﷺ لە بەیانیەوە رۆیشت و هاتە لای ئافرەتان لە مزگەوت و لەدیاریان راوەستا و فەرمووی: ((**يا معشر النساء! ما رأيت من نواقص عقول قطُّ ودين؛ أذهبَ بقلوب ذوي الألباب منكنَّ، وإني قد رأيت أنكنَّ أكثر اهل النار يوم القيامة، فَتَقَرَّبْنَ الى الله بما استطعتُنَّ**)). واتە: ئەی کۆمەڵی ئافرەتان! هیچ کەسێکی عەقڵ و دین ناتەواوم نەبینیوە، لە ئێوە زیاتر دڵی ژیرمەندا ببات، من دیتم کە ئێوە لە رۆژی قیامەتدا زۆرینەی خەڵکی دۆزەخ بوون، کەواتە خۆتان لەخوا نزیك بکەنەوە بەوەی لەتواناتاندا هەیە.

---

١ رواه الحاكم في مستدركه ٤١٥/١ وقال صحيح الأسناد و لم يخرجاه وأقره الذهبي.

٢ الزهد والرقائق ص٣٧٥ للإمام عبدالله بن المبارك.

ژنەکەی (عبدالله کوڕی مسعود) لەنێو ئافرەتەکاندا بوو، کاتێ گەڕایەوە بۆ لای (عبدالله) هەواڵی ئەوەی پێدا کە لە پێغەمبەری خواﷺی گوێ لێبوو، پاشان خشڵەکانی خۆی هەڵگرت، (ابن مسعود) وتی: ئەو خشڵانە بۆ کوێ دەبەیت؟ وتی: خۆمیان لە خوا و پێغەمبەرەکەی پێ نزیك دەکەمەوە، (عبدالله)ش وتی: ماڵ خراپ، خێراکە بیدە من و کوڕەکەم، بەراستی بۆ ئێمە گونجاوە، ئەویش وتی: نەخێر نابێ، هەتا نەڕۆمە لای پێغەمبەری خواﷺ.. دەڵێت: چوو بۆ لای پێغەمبەری خواﷺ مۆڵەت بخوازێ، وتیان: ئەی پێغەمبەری خواﷺ ئەوە زەینەبە دەیەوێت بێتە خزمەتت! فەرمووی: کام (زینب)؟ وتی: ژنی (ابن مسعود)، فەرمووی: مۆڵەتی بدەن بێت؟ چووە ژوورەوە بۆ لای پێغەمبەرﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ من گوێبیستی قسەیەکی تۆ بووم، پاشان گەڕامەوە بۆ لای (ابن مسعود) و بۆم گێڕایەوە، و خشڵەکانم هەڵگرت تا خۆمیان لەخوای گەورەو تۆ پێ نزیك بکەمەوە، بەڵکو خوای گەورە لەگەڵ خەڵکانی نێو دۆزەخم دانەنێ، (ابن مسعود) وتی: بیبەخشە بە من و کوڕەکەم، ئێمە بۆ ئەوە دەشێین، منیش وتم: مۆڵەت لە پێغەمبەری خواﷺ دەخوازم؟

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((**تصدقي به عليه، وعلى بنيه، فإنهم له موضع**))[١] واتە: (بەوو کوڕەکانی ببەخشە، بەراستی ئەوان شیاوی ئەوەن).

لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا: (( **صدق أبن مسعود، زوجك وولدك أحق من تصدقت به عليهم**)). واتە: ((ابن مسعود) ڕاست دەکات، مێرد و کوڕەکەت لەهەموو کەس شایستەترن، کە پێیانی ببەخشیت).

لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا: ((**نعم، لهما أجران: أجر القرابة، وأجر الصدقة**)).واتە: (بەڵێ بۆ ئەوان دووپاداشتی هەیە: پاداشتی خزمایەتی و پاداشتی خێرکردن).

---

١ رواه ابن خزيمة في صحيحه ١٠٦/٤ واسناده صحيح.

## ٥- ئامانجەکانی هاوسەرگرتنی ئیسلامی:

هاوسەرگرتن لە ئیسلامدا بۆ مەبەستی زایەندی (جنسی) نێوان ژن و پیاو نیە، ئەگەرچی ئەوە ئامانجێکی ناوەندییە، بۆ دابین کردنی پێویستیەکانی جەستە، بەڵکو کۆمەڵێك ئامانجی بەرزی هەیە، گرنگترینیان:

### ١- زیادکردنی ژمارەی موسڵمانان، و شادی خستنە نێو دڵی پێغەمبەری خوا ﷺ.

لە (معقل کوڕی یسار)ەوە دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی: ئافرەتێکی چاك و جوانم بەدڵ چووە، بەڵام منداڵی نابێت، ئایا بیخوازم؟ فەرمووی: نەخێر، جارێکی دیکەش هاتەوەو پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری لێ کرد، بۆ جاری سێیەم هاتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ((**تزوجوا الولود، فإني مكاثر بكم الأمم**)).[1] واتە: (ئەو ئافرەتانە بخوازن کە منداڵیان دەبێت، حەزدەکەم ئێوە لەنێو ئوممەتەکاندا زۆربن).

(ابن ماجه)ش لە(عائشه)ەوە دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((**النكاح من سنتي، ومن لم يعمل بسنتي فليس مني؛ وتزوجوا، فإني مكاثر بكم الأمم يوم القيامة**)).واتە: (ژن هێنان و شووکردن لە سوننەتی منە، ئەو کەسەشی بە سوننەتی من کارنەکات ئەوە لە من نی، ژن بخوازن، حەز دەکەم ئێوە لە ڕۆژی قیامەتدا لەناو ئوممەتاندا زۆر بن).

### ٢- پاك ڕاگرتنی دەروون و نزیك بوونەوە لەخوای گەورە:

ئەمەش فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺیە کە فەرموویەتی: ((**وفي بضع أحدكم له صدقة**)). واتە: (بەجووت بوون لەگەڵ خێزانەکانتاندا چاکەتان بۆ دەنوسرێ).

وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! یەکێکمان ئارەزووی خۆی تێر بکات، ئایا لەوەدا پاداشتی بۆ هەیە؟!

فەرمووی: ((**أرأيتم لو وضعها في حرام، أكان عليه وِزْر؟**)) ئەی ئەگەر ئارەزووەکەی بەحەرام تێرکرد، ئایا گوناهی لەسەرە؟

وتیان بەڵێ، فەرمووی: ((**فكذلك، لو وضعها في الحلال، كان له فيها أجر**)) هەر بەو شێوەیە، کە لە حەڵاڵدا تێری کرد، ئەوا پاداشتی بۆ هەیە.[2]

---

١ رواه ابوداود والنسائي.

٢ رواه مسلم ونسائي وأحمد.

## ٣ـ پێگەیاندنی نەوەیەکی موسڵمان:

لەکاتی جووتبووندا نیاز و مەبەستی بوونی منداڵێکی چاکیان هەبێت:

(بخاری) لە(صحیح)ەکەیدا - باب من طلب الولد للجهاد- لە (ابوهریرە)ەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((قال سليمان بن داود عليهما السلام: **لأطوفنَّ الليلة على مئة أمرأة، أو تسع وتسعين، كلهن يأتي بفارس؛ يجاهد في سبيل الله؛ فقال له صاحبه: قل إن شاء الله، فلم يقل إن شاء الله، فلم تحمل منهنَّ الاّ أمرأة واحدة، فجاءت بشق رجل؛ والذي نفس محمد بيده! لو قال إن شاء الله، لجاهدوا في سبيل الله؛ فرساناً أجمعون.**)) واتە: ((سلیمان کوڕی داود) فەرمووی: من ئەم شەو دەچمە لای سەد ژنم، یاخود نەوەد و نۆ، هەریەکێکیان سوارچاکێکی دەبێت و لەپێناوی خوای گەورەدا جیهاد دەکات، هاوەڵەکەی پێی وت: بڵێ إن شاء الله، بەڵام ئەو نەیوت: إن شاء الله، جا لەو ئافرەتانە تەنها یەکێکیان سکی بوو، ئەویش نیوەپیاوێك(ناتەواو)ی لێ دەرچوو، سوێند بەو کەسەی گیانی (محمد)ی بەدەستە! گەر بیوتایە إن شاء الله ئەوا هەموان دەبوونە سوارچاك و لەپێناو خوادا جیهادیان دەکرد.

(ابن حجر) وتوویەتی:[١] وتەکەی-باب من طلب الولد للجهاد- واتە ئەو کەسەی لەکاتی جووتبووندا نیەتی ئەوەی هەبێت کە کوڕێکی ببێت تا لەپێناوی خوادا جیهاد بکات، ئەوا ئەو کەسە بەو نیەتەوە پاداشتی خۆی دەست دەکەوێت ئەگەریش ئەوەی بۆ نەبوو.

(ابوالحسن الماوردی)یش دووپاتی ئەو مانایە لەکاتی جووتبووندا دەکاتەوەو دەڵێت:

لە هەموو ئەمانەدا نیەتی منداڵی بێت، وە پەنا بگرێت بەخوا لە شەیتانی دوورخراوە لە رەحمەتی خودا، لە منداڵیشدا نیەتی ئەوەبێت، بەڵکو خوای گەورە منداڵێکی پێ ببەخشێت کە خودا بپەرستێت و هاوبەشی بۆ دانەنێت، و لەسەر دەستی ئەو خەڵك چاك بکات، و حەق بەرپا بکات، و پشتیوانی راستگۆیی بکات و سود بە بەندەکان بگەیەنێت، و وڵات ئاوەدان بکاتەوە.[٢]

---

١ فتح الباري ٧/٢٧٢.

٢ كتاب نصيحة الملوك للماوردي، تحقيق الشيخ خضر محمد خضر ص٦٦.

## ٤- بەردەوامی وەچەی مرۆڤ:

(طبرانی) لە (ابوحفصە)وەﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((**لا يدع أحدكم طلب الولد، فإن الرجل إذا مات وليس له ولد أنقطع اسمه**)).[1] واتە: (هیچ کەس لەئێوە وازنەهێنێت لە داواکردنی خستنەوەی منداڵ، چونکە ئەگەر مرۆڤ مرد و منداڵی نەبوو ناوی دەبڕێتەوە).

ئەوەی لەم سەردەمە نوێیەدا مایەی سەرنجە ئەوەیە کە بێباوەڕانی رۆژئاوا و رۆژهەڵات و کلکەکانیان لە وڵاتی موسڵماناندا، بیرۆکەی سنورداركردنی وەچە (تحديد النسل) لەنێو موسڵماناندا برەو پێدەدەن، و لەهەمان کاتیشدا هانی بێباوەڕان دەدەن لەسەر منداڵ بوون، ئەمەش بۆ ئەوەیە تا ژمارەی موسڵمانان کەم بێتەوەو ژمارەی بێباوەڕان زیاد بێت.

جا لەبەر ئەوەیە پێغەمبەری خواﷺ هانی منداڵ بوون دەدات تا ببێتە هۆی سەرفرازی و بەهێزی موسڵمانان:

لە (ابن عمر)ەوەش دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((**ما ولد في أهل بيت؛ غلام، الاّ أصبح فيهم عِزّ لم يكن**)).[2] واتە: (هەرماڵێك منداڵێکیان ببێ، ئەوا سەربەرزییەکیان بۆ دەبێت کە پێشتر نەبووە).

## ٦- سیفەتەکانی پەروەردەکاری سەرکەوتوو:

هەندێك سیفاتی بنەڕەتی هەن، کە هەتا پەروەردەکار(المربي) لێیان نزیك بێتەوە یارمەتیدەری دەبێت لە پرۆسەی پەروەردەکردندا، تەواوی‌و کەماڵی مرۆییش تەنها بۆ پێغەمبەران -سەلامی خوایان لێ بێ- بووە، بەڵام ئادەمیزاد هەموو توانایەکی دەخاتە کار، بەپێی توانای خۆی چاودێریی خۆی دەکات، ئەوەش بۆ گەیشتن بە خووڕەوشتە باش و سیفەتە جوانەکانە، بەتایبەتی پەروەردەکار لە پایەی پێشەنگی پەروەردەییدایە، و نەوەی نوێ وەك پەروەردەکار و ئاڕاستەکەرێك تەماشای دەکەن، ئەمانەش گرنگترین ئەو سیفەتانەیە کە پەروەردەکار هەوڵی بۆ دەدات -خوای گەورە یارمەتی منیش و ئێوەش بدات بۆ جێبەجێ کردنیان-:

---

[1] أنظر كنز العمال ٢٨١/١٦واسناده حسن، كذا قاله الهيثمي في المجمع ٢٥٨/٤.

[2] رواه الطبراني في الأوسط: قال الهيثمي في المجمع ١٥٥/٨: وفيه هاشم بن صالح ذكره ابن ابي حاتم و لم يخرجه و لم يوثقه وبقية رجاله وثقوا.

### أ ) لەسەرخۆیی و ئارامگرتن (الحلم والأناة):

(مسلم) لە (ابن عباس)ەوەش هێناویەتی کە پێغەمبەری خواﷺ بە (أشج عبد القیس)ی فەرمووە: ((**إن فيك خصلتان يحبهما الله: الحِلْمُ والأناة**)). واتە: دوو خەسڵەتت تێدایە خوا خۆشی دەوێن: لەسەرخۆیی و ئارامگری.

ئەمەش سەرگوزشتەیەکی خۆشە، کە گرنگی لەسەرخۆیی و ئارامگری روون دەکاتەوە لە بنیاتنانی خوورەوشتی نەوەی نوێدا،(عبدالله کوڕی طاهر) وتوویەتی: ڕۆژێکیان لەلای (مأمون) دانیشتبووم، بانگی خزمەتکارەکەی کرد و وتی: ئەی غولام! کەس وەڵامی نەدایەوە، دووەم جار بانگی کرد و دەنگی هەڵبڕی: ئەی غولام! خزمەتکارێکی تورکی هاتە ژوورەوەو وتی: ئایا نابێت خزمەتکار خواردن و خواردنەوە بخوات؟ هەر لای تۆ بچینە دەرەوە هاوارهاوارتە: ئەی غولام! هۆ غولام، هەتا کەی! (مأمون) بۆ ماوەیەکی درێژ سەری داخست، هیچ گومانم لەوە نەبوو کە فەرمانم پێبکات لەسەری بدەم، پاشان تەماشای کردم و وتی: ئەی (عبدالله)! پیاو گەر ئاکاری خۆی چاك کرد خوورەوشتی خزمەتکارەکانی خراپ دەبێت، خۆ ناشتوانین ئاکاری خۆمان خراپ بکەین تا خوورەوشتی خزمەتکارەکانمان راست بکەینەوە.[1]

### ب ) نەرم و نیانی و خۆدوورگرتن لە توندوتیژی (الرفق والبعد عن العنف):

(مسلم) لە (عائشە)ەوەهێناویەتی کە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((**إن الله رفيق، يحب الرِّفق، ويعطي على الرِّفق ما لا يعطي على العنف، وما لا يعطي على ما سواه**)). واتە: (خوای گەورە نەرم و نیانەو نەرم و نیانیشی خۆش دەوێ، ئەوەندەی کە لەسەر نەرم و نیانی دەیبەخشێ لەسەر توندوتیژی نایبەخشێ، وە لەسەر هیچ شتێکی دی نایبەخشێ).

هەر لە (عائشە)ەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((**إن الله رفيق، يحب الرفق في الأمر كله**)).[2] واتە: (خوای گەورە نەرم و نیانە و نەرم و نیانیشی لەهەموو کارێکدا خۆش دەوێت).

هەر لەوەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((**إن الرفق لا يكون في شيء الاّ زانه، ولا يُنزع من شيء الاّ شانه**)).[3] واتە: (نەرم و نیانی لە هەرشتێکدا هەبێت جوانی دەکات، وە لەهەر شتێکدا نەمێنێت ناشیرین و نارێکی دەکات).

---

١ تربية الأولاد في الإسلام، للشيخ عبدالله علوان ٢/ ٢٨٥.

٢ متفق عليه.

٣ رواه مسلم.

هەروەها (مسلم) لە (جریر کوڕی عبداللە)ﷺ هێناویەتی کە وتوویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خواﷺ بوو دەیفەرموو: ((من يُحرم الرفق يُحرم الخير كله)) واتە: (هەرکەسێ لە نەرم و نیانی بێبەش بێت، ئەوا لەهەمو چاکەیەك بێ بەشە).

(احمد) لە (عائشە)ەوەڵ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خواﷺ پێی فەرمووە: ((يا عائشة! ارفقي، فإن الله اذا أراد بأهل بيت خيراً، دلّهم على الرِّفقِ)). واتە: (عائشە)! نەرم و نیان بە، ئەگەر خوا ویستی چاکەی بۆ خەڵکی هەر ماڵێك هەبێت، ئەوا نەرم و نیانیان نیشان دەدات.

لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا: ((إذا اراد الله بأهل بيت خيراً، أدخل عليهم الرفق)). واتە: گەر خوا ویستی چاکەی بۆ خەڵکی ماڵێك بنێرێت، ئەوا نەرم و نیانی دەخاتە نێویانەوە.

لە (ابوهریرە)ەوەﷺ دەگێڕنەوە، دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خواﷺ نوێژی شێوانمان دەکرد، کە دەچووە کڕنووش (حسن) و (حسین) دەچوونە سەر پشتی، کاتێك کە سەری بەرز دەکردەوە بەهێواشی و نەرم و نیانیەوە دایدەگرتن و دایدەنان، کە دەچووە کڕنووش ئەوان دەهاتنەوە، کە لەنوێژ بوویەوە، هەریەکەیانی لە شوێنێکدا دانا، منیش هاتمە لای و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا! ئایا بۆ لای دایکیان نەبەمەوە؟ فەرمووی: نەخێر، جا بریسکەیەك درەوشایەوە و بەدیار کەوت، پاشان فەرمووی: بگەنەوە لای دایکتان، و هەتا چوونە ژوورەوە لەبەر رۆشناییەکەیدا دەڕۆیشتن.[1]

خوێنەری بەڕێز! فەرموو لەگەڵ ئەم چیرۆکە، کە بە ئامۆژگاری رازاوەتەوە تا هەڵس و کەوت و لەسەرخۆیی پێشینانی چاك ببینین:

دەگێڕنەوە کە بەندەیەکی (زين العابدين)، لەکاتێکدا بە مەسینەیەکی لە گڵ دروستکراو ئاوی بەدەستی دا دەکرد، مەسینەکە بەربوویەوە سەر قاچی (زين العابدين) و شکا و قاچیشی بریندار بوو، بەندەکە خێرا وتی: گەورەم، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلْكَـٰظِمِينَ ٱلْغَيْظَ﴾[2] ئەوانەی کە رقەکانیان دەخۆنەوەو دەری نابڕن، (زين العابدين) وتی: ئەوا رقەکەم

---

١ رواه الحاكم في مستدركه ٣/١٦٧ وقال: صحيح الأسناد؛ و لم يخرجاه؛ وقال الذهبي: صحيح.
٢ آل العمران/١٣٤.

خواردەوە، پاشان بەندەکە وتی: ﴿وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِ﴾ ئەوانەی لێبوردەن بەرامبەر خەڵك، (زیـــن العابـــدین) وتـــی: ئـــەوا لێـــت خـــۆش بـــووم، ئـــەمجا بەندەکـــەی وتـــی: ﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾خوای گەورە چاکەکارانی خۆش دەوێت، (زین العابدین) وتی: لەبەرخاتری خـوا برۆ ئازاد بە.[1]

## ج- دڵێکی میهرەبان (القلب الرحيم):

لە (ابوسلیمان مالك کوڕی حویرث)ەوەﷺ دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: ئێمـە چـەند لاوێکـی هاوتەمەن بووین، هاتینە لای پێغەمبەری خواﷺ، بیست شەو لەلایماینەوە، لەو ماوەیـەدا پێغەمبەری خـواﷺ میهرەبـان و نـەرم و نیـان بـوو، وا گومـانی بـرد کـە ئێمـە تامـەزرۆی خاوخێزانەکانمانین، بۆیە پرسیاری دەربارەی کەس و کارمان کـرد، ئێمـەش پێمـان راگەیانـد، فـەرمووی: ((أرجعوا الى أهلكم، فأقيموا فيهم، وعلّموهم، وبرُّوهم، وصلوا كذا في حـين كذا، وصلوا كذا في حين كذا، فإذا حضرت الـصلاة، فليـؤذن أحـدكم، وليـؤمكم أكبركم)).[2] واتە: (بگەڕێنەوە بۆ لای خاوخێزانتان، و لەناویاندا بمێننەوە، و فێریـان بکـەن و لەگەڵیاندا چاك بن، ئاوەها و ئاوا نوێژ بکەن، و کە کاتی نوێژ داهات با یەکێکتان بانگ بدات و لەهەمووتان گەورەتر پێشنوێژیتان بۆ بکات).

(بزار)یش لە (ابن عمر)ەوەﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویـەتی: ((إن لكل شجرة ثمرة، وثمرة القلب الولد، إن الله لا يرحم من لا يرحم ولده؛ والذي نفسي بيده! لا يدخل الجنة الاّ رحيم)). واتە: (هـەموو درەختێـك بـەروبوومێکی هەیـە، بەرهـەمی دڵـیش منداڵە، خوای گەورە بەزەیی بە کەسێکدا نایەتەوە کـە بـەزەیی بـە منداڵەکەیـدا نەیەتـەوە، سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە! تەنها کەسی میهرەبان دەچێتە بەهەشتەوە).

وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا! هەموومان بەزەییمان هەیە، فەرمووی: ((لـيس رحمتـه أن يرحم أحدكم صاحبه، وإنما الرحمة أن يرحم الناس)). واتە: (بەزەیی ئەوە نیە کە بەرامبـەر هاوڕێکەت بەبەزەیی بیت، بەڵکو بەزەیی ئەوەیە کە بەرامبەر هەموو خەڵك بەبەزەیی بیت).

لە (ابو أمامەﷺ)ەوە دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ ئافرەتێکی بینی، کـە

---

١ تربية الأولاد في الأسلام للشيخ عبدالله علوان ٢/٢٨٥.

٢ متفق عليه.

دوو كیژۆڵەی لەگەڵدا بوو، یەكێكیانی هەڵگرتبوو، و ئەویتریشیان دەستی گرتبوو، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((**والداتٌ حاملاتٌ رحیمات؛ لو لا ما یـأتین الى أزواجهـن، لـدخل مصلّیاهن الجنة**)).[١] واتە: (دایكانێك بەسك هەڵیانگرتوون و میهرەبانن، گەر لەبەر ئەوە نەبێت كە بەسەر مێردەكانیان دەهێنن، ئەوا نوێژكەرەكانیان دەچوونە بەهەشت).

لە (ابو امامە)ەوە دەگێڕنەوە كە ئافرەتێك هاتە لای پێغەمبـەری خـواﷺ و دوو منـداڵی پێبوو، پێغەمبەرﷺ سێ دەنكە خورمای پێدا، ژنەكەش هەریەكەو دەنكەخورمایەكی پێـدان، پاشان یەكێك لە منداڵەكان گریـا، ئافرەتەكـە دەنكـە خورماكـەی تریـشی دوولـەت كـرد و هەریەكەی لەتێكی پێدان، پێغەمبەری خواﷺ فـەرمووی: ((**والداتٌ؛ حاملاتٌ؛ رحیمـات بأولادهن، لو لا ما یصنعن بأزواجهن؛ دخل مصلّیاهن الجنـة**)).[٢] واتـە: دایكانێـك بەسـك هەڵیانگرتوون، بەرامبەر منداڵەكانیان میهرەبانن، گـەر بـەهۆی ئـەوەوە نـەبێت كـە بەسـەر مێردەكانیانی دەهێنن، ئەوا نوێژكەرانیان دەچوونە بەهەشت.

### د- هەڵبژاردنی ئاسانترین كار لەنێوان دوو كاردا، گەر تاوان نەبێت:

لە (عائشە)ەوەڵگێڕاویانەتەوە كە پێغەمبەری خواﷺ هەرگیز لەنێوان دوو شتدا سەرپشك كرابێ، ئەوا ئاسانەكەیانی هەڵبژاردووە، گەر تاوان نەبوبێت، خۆ گەر تـاوان و گونـاه بووبێـت ئەوا دوورترین كەس بووە لێی، وە هەرگیز پێغەمبەری خواﷺ تۆڵەی خۆی لـە هـیچ كەسـێك نەكردۆتەوە، مەگەر سنووری خوا بەزێنرابێت، بۆیە لەبەر خوای گەورە تۆڵەی دەسەندەوە.

### هـ- ناسكی و نەرمی (الليونة والمرونة):

لێرەدا شایانی ئەوەیە كە واتا فراوانەكەی (ناسكی = الليونـە) تـێ بگـەین، كـە ئـەویش بریتیە لە توانای تێگەیشتنی خەڵكانی دیكە بەشێوەیەكی تێر و تەواو، نـەك لـە دیدگایـەكی تەسكەوە" وە هیچ كاتێك مانای لاوازی و بێوەریی نادات، بەڵكو مانای ئەو ئاسانكاریەیە كە شەرع ڕێگەی پێداوە.

---

١ رواه الحاكم في مستدركه ٤/١٧٣ وقال: صحيح الأسناد على شرط الشيخين، و لم يخرجـاه، وقـد أعضله شعبة عن أعمش.

٢ رواه الحاكم في مستدركه ٤/١٧٤ وسكت عنه.

لە (ابن مسعود)ەوەﷺ دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((**ألا أخبركم بمن يحرم على النار؛ أو بمن تحرم عليه النار؟ تحرم على كل قريب هيّن ليّن سهل**)).[1] واتە: (ئایا هەواڵی ئەوەتان بدەمێ کە کێ لەئاگر حەرام کراوە؟ یاخود کێ ئاگری لەسەر حەرام کراوە؟ ئاگر حەرام کراوە لەسەر هەموو کەسێکی نزیکی کارئاسانی ناسکی سانا).

## و- دوورکەوتنەوە لە تووڕەیی (الأبتعاد عن الغضب):

تووڕەیی و دەمارگیری شێتانە، سیفەتێکی خراپە لە پرۆسەی پەروەردەکردن و بواری کۆمەڵایەتیدا. جا ئەگەر مرۆڤ توانی زاڵ بێت بەسەر تووڕەبوونیدا، و رقی خۆی بخواتەوە، ئەوە مانای سەرکەوتنە بۆ خۆی و بۆ منداڵەکانیشی، پێچەوانەی ئەوەش ئەنجامی پێچەوانەی دەبێت.

کاتێك پیاوێك داوای ئامۆژگارییەکی تایبەت بەخۆی لە پێغەمبەری خواﷺ کرد، ئەویش ئاگاداری کردەوە لە تووڕەبوون و هەرسێ جارەکە فەرمووی: ((**لا تغضب**))[2] تووڕە مەبە.

هەروەها پێغەمبەری خواﷺ ئازایەتی بەوە داناوە کە مرۆڤ بتوانێت تووڕە نەبێت، هەروەك (ابوهریره) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((**ليس الشديد بالصُّرَعة، وإنما الشديد الذي يملك نفسه عند الغضب**)).[3] واتە: (ئازایەتی بە زۆرانبازی نیە، بەڵکو ئازا ئەو کەسەیە کە لە کاتی تووڕەبووندا خۆی بگرێت).

دەگێڕنەوە کە (زین العابدین کوڕی حسن) بەندەیەکی خۆی بانگ کرد، دوو جار بانگی کرد، وەڵامی نەدایەوە، پێی وت: ئایا گوێت لە بانگەکەم نەبوو؟ وتی: بەڵێ گوێم لێبوو، وتی: ئەی چی وای لێکردی وەڵامم نەدەیتەوە؟ وتی: لێت دڵنیابووم و بە رەوشت پاکی تۆ ئاشنا بووم بۆیە تەمبەڵیم کرد، (زین العابدین) وتی: سوپاس بۆ خوا کە خزمەتکارەکەمی لێم دڵنیا کردووە.[4]

---

١ رواه الترمذی وقال حديث حسن، ورواه ابن حبان والخرائطي واحمد والطبراني، أنظر سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم ٩٣٨.

٢ رواه البخاري عن ابي هريرة.

٣ متفق عليه.

٤ تربية الأولاد ٢/٣٥٢.

## ز- میانڕەوی و ناوەندێتی (الاعتدال والتوسط):

زیادەڕۆیی (التطرف) خوویەکی ناپەسەند و بێزراوە لەهەموو کاروبارێکدا، لەبەر ئەوە دەبینین کە پێغەمبەری خواﷺ لە کۆڵەکەی دیندا حەزی بە میانڕەوی کردووە، ئیدی دەبێت بۆ کاروبارەکانی دیکەی ژیان چۆن بێت؟ کە گرنگترینیان پرۆسەی پەروەردەیە.

لە (ابومسعود عقبە کوڕی عمر البدری)ەوەﷺ دەگێڕنەوە کە پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ و وتی: من بەهۆی فلان کەسەوە درەنگ بۆ نوێژی بەیانی دێم، چونکە نوێژەکەی درێژ دەکاتەوە... جا دەڵێ: هەرگیز نەمدیوە پێغەمبەری خواﷺ لەکاتی وتاردانـدا لەو ڕۆژە توڕەتر بێت، فەرمووی: ((**يا ايها الناس! إن منكم منفرين، فأيكم أمَّ الناس فليوجز، فإن من ورائه الكبير؛ والصغير؛ وذا الحاجة**)).[1] واتە: (ئەی خەڵکینە! لەناوتانـدا کەسی وا هەیە خەڵك دەڕەوێننەوە، هەرکامێکتان پێشنوێژی بۆ خەڵك کرد، با نوێژەکەی کورت بکاتەوە، چونکە لەدوایەوە گەورەو بچووك و کەسانی خاوەن ئیش هەن).

## ح- ڕەچاوکردنی کاتی ئامۆژگاری چاك:

زۆرجار زۆر قسەکردن بەرهەمی نابێ" لەهەمان کاتدا دەبینین کە سەرپشکی بە ئامۆژگاری چاك بە ویستی خوا هەموو کاتێك بەرهەمـدار دەبێت، لەبەر ئەوە پێشەوا (ابو حنیفە) ئامۆژگاری قوتابیەکانی دەکرد و دەیوت:[2] (باسی فیقهەکەت بۆ کەسێك مەکە کە ئارەزووی لێی نەبێت). هەروەها یاوەرانیش ئەوەیان لە هەڵس و کەوتی پێغەمبەراﷺ هەست پێکردبوو.

لە (ابو وائل شقیق کوڕی سلمە)ەوە دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: (ابن مسعود)ﷺ هەموو پێنج شەممەیەك جارێك ئامۆژگاری دەکردین، بۆیە پیاوێك پێی وت: (ابو عبدالرحمن)! خۆزگە هەموو ڕۆژێك ئامۆژگاریت بکردباین، ئەویش وتی: ئەوەی کە ڕێگریم لەو کارە لێ دەکات ئەوەیە کە من حەزناکەم بێزارتان بکەم، و من ڕەچاوی کاتی ئامۆژگاریتان دەکەم کە پێغەمبەری خواﷺ ڕەچاوی کاتی ئێمەی دەکرد لەترسی سیوا هاتنەوەمان.[3]

---

١ متفق عليه.

٢ مقدمة حاشية ابن عابدين.

٣ متفق عليه.

## ٧- مژدەیەکی دڵخۆشکەر بۆ دایك و باوکان دەربارەی فەرِی منداڵ بەسەریاندا:

(مسلم) لە (ابوهریرە)ەوە‌ﷺ هێناویەتی کە پێغەمبەری خوا‌ﷺ فەرموویەتی: **((إذا مات الإنسان إنقطع عمله إلا من ثلاث، صدقة جارية أو علم ينتفع به، أو ولد صالح يدعو له))**. واتە: کاتێك ئادەمیزادێك دەمرێت، کردەوەکانی لێی دەپچرێت مەگەر لەسێ شت نەبێت: خێرێکی بەردەوام، یاخود زانستێك کە سوودی لێ وەربگیرێت، یان منداڵێکی چاك کە بۆی بپاڕێتەوە.

(کوڕی ابوحاتم)یش[1] لە (ابو درداء)ەوە‌ﷺ دەگێڕێتەوە کە دەڵێت: لای پێغەمبەری خوا‌ﷺ باسی زیادبوونی تەمەنمان کرد، فەرمووی: **((إن الله لا يؤخر نفساً اذا جاء أجلها، وإنما الزيادة في العمر؛ أن يرزق الله العبد ذرية صالحة، يدعون له، فيلحقه دعاؤهم في قبره))**.[2] واتە: (خوای گەورە ئەجەلی هیچ کەسێك دوا ناخات، زیادبوونی تەمەنیش ئەوەیە کە خوای گەورە وەچەیەکی چاك بە بەندەی خۆی ببەخشێت، کە داوای لێخۆشبوونی بۆ بکەن پاش مردنی وخواش دوعاکەیانی پێ‌دەگەینێت لەگۆڕەکەیدا).

(بخاری) لە (ادب المفرد)دا لە (ابوهریرە)ەوە‌ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا‌ﷺ فەرموویەتی: **((تُرفع للميت بعد موته درجته، فيقول: أي ربي! أي شيء هذا؟ فيقول له: ولدك أستغفر لك))**.[3] واتە: (پلەی مردوو لەپاش مردنی بەرز دەکرێتەوە، بۆیە دەڵێت: ئەی خوایە ئەوە چیە؟ پێی دەفەرموێت: ئەوە منداڵەکەت داوای لێخۆشبوونی بۆ کردوویت).

## ٨- منداڵ جوانی ژیانی دنیا و ئاشوبیەتی:

منداڵ بەخششی خوایە بۆ مرۆڤ، دڵ بە بینینان شاد دەبێت، چاویش بە سەیرکردنیان رۆشن دەبێت، بە قسەکردن لەگەڵیان دەروون تەڕ دەبێت، ئەوان خونچەگوڵی ژیانی دنیان، ئەمەش ئایەتە پیرۆزەکانی قورئان دووپاتیان کردۆتەوە: ﴿ زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلْبَنِينَ وَٱلْقَنَٰطِيرِ ٱلْمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلْفِضَّةِ وَٱلْخَيْلِ ٱلْمُسَوَّمَةِ وَٱلْأَنْعَٰمِ

---

١ ذكره ابن كثير في التفسير (٣٧٣/٤ و ٥٧٣/٢).

٢ ورواه الحكيم, أنظر كنز العمال ٢٨١/١٦.

٣ ورواه الطبراني في الأوسط، وفيه ضعفاء قد وثقوا، كذا قاله الهيثمي في المجمع١٠/ ٢١٠ بالفاظ متقاربة.

وَٱلۡحَرۡثِۗ ذَٰلِكَ مَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسۡنُ ٱلۡمَـَٔابِ ﴾آل عمران/١٤. واته:(خۆشەویستی ئارەزووەکان بۆ خەڵکی رازاوەتەوە لە ژنان و منداڵ و کیسەی زێر و زیو و ئەسپی خۆشرەنگ و نیشانەدار و پڕ خاڵ و مەڕ و ماڵات و کشتوکاڵ، ئەمانە کاڵای ژیانی دنیان، سەرئەنجامی چاك لای خوایە). ﴿ٱلۡمَالُ وَٱلۡبَنُونَ زِينَةُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَٱلۡبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ خَيۡرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا وَخَيۡرٌ أَمَلًا ﴾الكهف/٤٦. واته: (ماڵ و منداڵ زینەت و جوانی ژیانی دنیان، بەڵام توێژوی کردەوەی چاك پاداشتی زۆری لای پەروەردگارت هەیە، هەر ئەوەیە چاکترین ئومێدو ئاوات). ﴿ ٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا لَعِبٞ وَلَهۡوٞ وَزِينَةٞ وَتَفَاخُرُۢ بَيۡنَكُمۡ وَتَكَاثُرٞ فِي ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَوۡلَٰدِ ﴾الحديد/٢٠. واته: (بزانن کە بەراستی ژیانی ئەم دنیایە تەنیا گاڵتەو ئاراییش و شانازی کردنە لەنێوانتانداو زیادەخوازی یە لە ماڵ و منداڵدا).

هەر لەبەر ئەوەیە کە دەبینین بێباوەڕان هەڵخەڵەتاون بەو جوانی و رازاندنەوەیەو دەستیان کردووە بە شانازی کردن بە منداڵەکانیانەوەو پێیان وایە کە دارودەستەیەکیان هەیە دەیانپارێزێت، وە خوا لێیان رازیە، لەبەر ئەوەشە کە ئەم هەموو منداڵەی پێ بەخشیون، وە بەسەر بڕواداراندا خۆیانیان پێ بەرز کردۆتەوە، لەکاتێکدا ئایەتەکان شوێنیان کەوتون و بەدوایانەوەن لەسەر ئەو بیرۆکە سواوانەو بەخۆنازینە نەفامیانە، بڕوادارانیش بێگومانن کە ئەو زۆربوونە هیچ سوودی نابێت بۆیان و لەسزای خوا رزگاریان ناکات: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَن تُغۡنِيَ عَنۡهُمۡ أَمۡوَٰلُهُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُهُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيۡـٔٗاۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۚ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾آل عمران/١١٦. واته: بەراستی ئەوانەی کافر بوون ماڵ و منداڵیان هەرگیز لەسزای خوا رزگاریان ناکا، ئەوانە ئەهلی ئاگرن و بە هەتاهەتایی تێیدا دەمێننەوە.

﴿فَلَا تُعۡجِبۡكَ أَمۡوَٰلُهُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُهُمۡۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُم بِهَا فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَتَزۡهَقَ أَنفُسُهُمۡ وَهُمۡ كَٰفِرُونَ ﴾التوبة:٥٥. واته: (ماڵ و منداڵی ئەوانە جێگای سەرسوڕمانت نەبێت، خوا دەیەوێت بەهۆی ئەوانەوە ئەشکەنجەیان بدات لەم دنیایەدا و بەسەختی گیانی ئەوان دەربچێ و بەبێبڕوایی بمرن).

﴿كَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ كَانُوٓاْ أَشَدَّ مِنكُمۡ قُوَّةٗ وَأَكۡثَرَ أَمۡوَٰلٗا وَأَوۡلَٰدٗا فَٱسۡتَمۡتَعُواْ بِخَلَٰقِهِمۡ فَٱسۡتَمۡتَعۡتُم بِخَلَٰقِكُمۡ كَمَا ٱسۡتَمۡتَعَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُم بِخَلَٰقِهِمۡ وَخُضۡتُمۡ

كَٱلَّذِي خَاضُوٓاْۚ أُوْلَٰٓئِكَ حَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴾التوبة/٦٩. واتە: ((ئێوەی دووڕوو) هەروەك كەسانێكن كە بەر لەئێوە بوون (و ڕێگای دووڕووییان گرتە بەر)، ئەوانە لە ئێوە بەهێزتر و ماڵ و منداڵیشیان زۆرتر بوو، ئەوان لە بەشی خۆیان (لەدنیا و لەرێگای هەواو هەوەس و تاواندا) كەڵكیان وەرگرت، ئێوەش لە بەشی خۆتان (لەم ڕێگایەدا) كەڵكتان وەرگرت، بەو جۆرەی كە بەر لەئێوە كەڵكیان وەرگرت، وە ئێوە چوونە ناو (كوفر و دووڕوویی) هەروەك ئەوان چوون، ئەوانە كاروكردەوەیان لە دنیا و ئاخیرەتدا تیاچوو، وە هەر ئەوانەش زیان لێ كەوتوون).

﴿ أَيَحۡسَبُونَ أَنَّمَا نُمِدُّهُم بِهِۦ مِن مَّالٖ وَبَنِينَ ٥٥ نُسَارِعُ لَهُمۡ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِۚ بَل لَّا يَشۡعُرُونَ ﴾المؤمنون/٥٥-٥٦. واتە: (ئایە ئەوانە وا دەزانن كە ئەو ماڵ و سامان و نەوەیەی پێیان دەبەخشین (هۆی ئەوەیە خۆشمان دەوێن)!! نەخێر بەڵكو مەبەستمانە بەپەلە لە ناز و نیعمەت بەهرەوەریان بكەین، بەڵكو ئەوانە هەستیان نیەو نازانن).

﴿وَقَالُواْ نَحۡنُ أَكۡثَرُ أَمۡوَٰلٗا وَأَوۡلَٰدٗا وَمَا نَحۡنُ بِمُعَذَّبِينَ ٣٥ قُلۡ إِنَّ رَبِّي يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقۡدِرُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ٣٦ وَمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُكُم بِٱلَّتِي تُقَرِّبُكُمۡ عِندَنَا زُلۡفَىٰٓ إِلَّا مَنۡ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ جَزَآءُ ٱلضِّعۡفِ بِمَا عَمِلُواْ وَهُمۡ فِي ٱلۡغُرُفَٰتِ ءَامِنُونَ ﴾سبأ/٣٥-٣٧. واتە: (وتیان ماڵ و منداڵی ئێمە (لەهەمووتان) زیاترە، (ئەمە نیشانەی ئەوەیە كە خوا ئێمەی خۆش دەوێت) و ئێمە هەرگیز سزا نادرێین، بڵێ: پەروەردگاری من بۆ هەر كەس كە بیەوێ رزق و رۆزی زیاد دەكا، بەڵام زۆربەی خەڵك نازانن، وە ماڵ و منداڵی ئێوە هەرگیز نابێتە هۆی ئەوەی كە ئێوە لە من نزیك بكاتەوە، مەگەر ئەوانەی بڕوا بێنن و كاری چاك ئەنجام بدەن، بۆ ئەوانە پاداشتی دووچەندان هەیە بەرامبەر ئەو كارانەی كردوویانە، و ئەوانە لە ژوورەكانی (بەهەشتدا) لە هێمنایدان).

گوتارە قورئانیەكان هاتووە تا مرۆڤ لە ئاشووبی منداڵ ئاگادار بكاتەوە، لەوەی كە سەركێشی خۆشەویستیان بگاتە ئاستی بەسووك سەیركردنی فەرمانەكانی پەروەردگار، وە ببێتە هۆی ئەوەی خوا رقی لێیان بێت و تورە بێت بەرامبەریان، لەبەر ئەوە ئایەتەكان وا بڕیار دەدەن كە:

﴿ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَأَوۡلَٰدُكُمۡ فِتۡنَةٞ وَأَنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥٓ أَجۡرٌ عَظِيمٞ ﴾ الأنفال/٢٨.
واته: (بزانن کە سامان و منداڵتان ئاشووبە (هۆی تاقیکردنەوەیە)، بەراستی پاداشتی گەورە (بۆ ئەوانەیە کە لەو تاقیکردنەوەیەدا دەربچن) لای خودایە، خوداش پاداشتی گەورەی لەلایە).

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ مِنۡ أَزۡوَٰجِكُمۡ وَأَوۡلَٰدِكُمۡ عَدُوّٗا لَّكُمۡ فَٱحۡذَرُوهُمۡۚ وَإِن تَعۡفُواْ وَتَصۡفَحُواْ وَتَغۡفِرُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ١٤ إِنَّمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَأَوۡلَٰدُكُمۡ فِتۡنَةٞۚ وَٱللَّهُ عِندَهُۥٓ أَجۡرٌ عَظِيمٞ ﴾التغابن/١٤/١٥. واته: (ئەی ئەو کەسانەی کە بڕواتان هێناوە! بەراستی هەندێ لە ژنان و منداڵانتان دوژمنی ئێوەن، جا خۆتانیان لێ بپارێزن، وە گەر ببەخشن و چاوپۆشی بکەن و لەتاوان ببورن، ئەوا بەراستی خوا لێبوردەو میهرەبانە، بەراستی ماڵ و منداڵانتان هۆی تاقیکردنەوەتانە لەکاتێکدا کە پاداشتی مەزن لای خوایە).

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمۡ وَٱخۡشَوۡاْ يَوۡمٗا لَّا يَجۡزِي وَالِدٌ عَن وَلَدِهِۦ وَلَا مَوۡلُودٌ هُوَ جَازٍ عَن وَالِدِهِۦ شَيۡـًٔاۚ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞۖ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلۡغَرُورُ ﴾لقمان/٣٣. واته: (ئەی خەڵکینە! خۆ لە نافەرمانی پەروەردگارتان بپارێزن و لەڕۆژێ بترسن کە باوك لەبری کوڕی سزا نادرێ و منداڵیش لەبری باوك سزا نادرێ، بەراستی بەڵێنی خوا هەقە، جا نەکا ژیانی دنیا فریوتان بدات، هەروەها (شەیتانی گزیکار) بە کەرەمی خوا مەغرورتان نەکا).

دیارە هەڕەشەش بۆ ئەو کەسەیە کە خۆشەویستی منداڵەکەی پێش شەرعی خوای گەورە بخات، هەڕەشەکەش بەم شێوەیە: ﴿ قُلۡ إِن كَانَ ءَابَآؤُكُمۡ وَأَبۡنَآؤُكُمۡ وَإِخۡوَٰنُكُمۡ وَأَزۡوَٰجُكُمۡ وَعَشِيرَتُكُمۡ وَأَمۡوَٰلٌ ٱقۡتَرَفۡتُمُوهَا وَتِجَٰرَةٞ تَخۡشَوۡنَ كَسَادَهَا وَمَسَٰكِنُ تَرۡضَوۡنَهَآ أَحَبَّ إِلَيۡكُم مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَجِهَادٖ فِي سَبِيلِهِۦ فَتَرَبَّصُواْ حَتَّىٰ يَأۡتِيَ ٱللَّهُ بِأَمۡرِهِۦۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴾التوبة/٢٤. واته: (پێیان بڵێ: ئەگەر باوکتان و منداڵەکانتان و براکانتان و ژنەکانتان و خێڵەکانتان، وە ماڵ و داراییەك کە بەدەستتان هێناوەو بازرگانیەك کە دەترسن بێبازاڕی رووی تێبکات، و خانووبەرەو کۆشك و تەلارێك حەز دەکەن لێتان تێك نەچێت، لاتان خۆشەویستترە لە خوا و پێغەمبەرەکەی و جیهاد لە پێناوی ئەودا، جا چاوەڕێ بن کە خوا فەرمان دەداو تۆڵەتان لێ دەستێنێت، وە خوا هۆزو دەستەی فاسق رێنوێنی ناکا).

بەڵام چ هۆ و ئامرازێك بەكار بهێنرێ كاتێك منداڵ رێبازێكی دوور لە باوەڕ دەگرێتە بەر و بەشوێن رێی داوێن پیسانی لەسنوور دەرچوودا دەڕوات -خوا پەنامان بدات لەو جۆرە منداڵانە-، ئەوەش دابڕانێكی جەستەیی و هەستی و دەروونیە: ﴿لَا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ أُولَٰئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الْإِيمَانَ وَأَيَّدَهُمْ بِرُوحٍ مِنْهُ وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ أُولَٰئِكَ حِزْبُ اللَّهِ أَلَا إِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾المجادلة/٢٢. واتە: (نابینیت كەسانێك باوەڕیان بەخواو بەرۆژی دوایی هەبێت، كەسانێكیان خۆش بوێت، كە دژایەتی خواو پێغەمبەرەكەی دەكەن، هەرچەندە ئەو دوژمنانە باوكیان، یا نەوەكانیان، یا براكانیان، یا عەشیرەتیان بن، ئەوانەی كە بەو شێوەیەن (ئیمانیان لەهەموو كەسێك لا بەنرختر وپیرۆزترە) خوا ئیمانی لە دڵیاندا چەسپاندووەو جێگیری كردووە، لەبەهرەو میهرەبانی تایبەتی خۆی پشتگیری كردوون و یارمەتی داون، سەرەنجامیش دەیانخاتە باخاتی بەهەشتەوە، كە جۆگە و رووبار بەژێر درەخت و كۆشكەكانیدا تێدەپەڕێت، هاورێ لەگەڵ ژیانی نەبڕاوەدا، ئەوانە خوا لێیان رازیەو ئەوانیش لەخوا رازین، ئا ئەوانە دەستە و تاقم و لایەنی خوای گەورەن، ئاگاداربن بەڕاستی هەر لایەن و دەستە و تاقمی خوا سەركەوتوو و سەرفرازن).

ئەوەی كە دەبێتە مایەی داپۆشینی ئاشووبی منداڵ، ئەنجامدانی رۆژوو، نوێژ و، خێر(صدقة)، و فەرمان بەچاكە و رێگری لە خراپەیە، هەروەك لە فەرموودەدا هاتووە:

لە (حذیفة)ەوە دەگێڕنەوە لە فەرموودەیەكی درێژدا هاتووە كە دەڵێت: گوێم لێبوو پێغەمبەری خواﷺ دەیفەرموو: ((**فتنة الرجل في أهله و ماله وولده ونفسه وجاره، يكفّرها الصيام والصلاة والصدقة والأمر بالمعروف والنهي عن المنكر**)).[1] واتە: (ئاشووبی پیاو لە خاووخێزانەكەی و ماڵ و سامانەكەی و منداڵەكەی و خۆی و دراوسێكەیدایە، رۆژوو و نوێژ و خێركردن و فەرمان بەچاكە و رێگری لە خراپە كردنیش ئەو ئاشووبە دادەپۆشێت).

خوا منداڵی چاكی وا ببەخشێت بە هەموومان كە یارمەتیدەرمان بن لەسەر گوێڕایەڵی خوا، وە یادمان بخەنەوە گەر لەبیرمان چوو، و ئامۆژگاریمان بكەن گەر دووركەوتینەوە.

---

١ أخرجه الشيخان والترمذي.

## ٩- ململانێی شەیتان لەگەڵ مرۆڤ لەسەر وەچە:

دیارە ململانێ لەنێوان مرۆڤ و شەیتاندا لەسەر وەچە و منداڵ هەیە، شەیتان سوێندی خواردووە کە هەوڵبدات بۆ دوورخستنەوەی وەچە لە بەرنامەی خوا، وە لایان بدات لە گوێڕایەڵی کردنی، ئەمەش خوای گەورە هەواڵی پێداوین تا بەرچاوڕۆشن بین لە کارو فرمانماندا، تا ئاگاداری ئەوە بین، خوای گەورەش تەمەنی منداڵیی پاکی تایبەت کردووە بۆمان تا پێش شەیتان ئەم دەرفەتە بۆ خۆمانی دەستەبەر بکەین، خۆ گەر دایك و باوك ئەو دەرفەتەیان لەدەست چوو ئەوا ماوەیەکی بنەڕەتی بەهێزیان لەدەست داوە، بۆیە پێویستیان بە کۆششی زیاتر و کاری مەزنتر لە ئاییندەدا هەیە بۆ چاککردنەوەی منداڵەکەیان: ﴿ قَالَ أَرَءَيْتَكَ هَٰذَا ٱلَّذِى كَرَّمْتَ عَلَىَّ لَئِنْ أَخَّرْتَنِ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ لَأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٦٢﴾ قَالَ ٱذْهَبْ فَمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ فَإِنَّ جَهَنَّمَ جَزَآؤُكُمْ جَزَآءً مَّوْفُورًا ﴿٦٣﴾ وَٱسْتَفْزِزْ مَنِ ٱسْتَطَعْتَ مِنْهُم بِصَوْتِكَ وَأَجْلِبْ عَلَيْهِم بِخَيْلِكَ وَرَجِلِكَ وَشَارِكْهُمْ فِى ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَوْلَٰدِ وَعِدْهُمْ ۚ وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ إِلَّا غُرُورًا ﴾ لإسراء/٦٢-٦٤. واتە: (شەیتان بی شەرمانە وتی: ئا یەمەیە کە لەمن ڕێزدارترە؟! بە هەقیقەت ئەگەر تا ڕۆژی قیامەت زیندوو ڕامگری، هەموو وەچەکانیان جگە لە ژمارەیەکی کەم لاڕێ دەکەم (و ڕەگ و ریشەی چاکیان لەبن دەردێنم)، فەرمووی: برۆ (بەقسەی خۆت بکە)، جا هەرکەس لەوانە بەدوات بکەون، بەراستی دۆزەخ سزاتانە، سزایەکە زۆر و تەواو، وە هەرکەس لەوانە کە دەتوانی بە دەنگی خۆت دنەی بدەو بەرگریان لێ بکە و، لەشکری سوارەو پیادەت بنێرە سەریان ولەماڵ و منداڵیاندا بەشداری بکە و بە بەڵێن سەرگەرمیان بکە، بەڵام بەڵێنی شەیتان تەنها فریودان و درۆ و گزییە).

ئیمام (مسلم) لە (عیاض کوڕی حمار) هێناویەتی کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **((قال الله تعالى: إني خلقتُ عبادي حُنفاء، فجاءت الشياطينُ فاجْتالتهم))**. واتە: (خوای گەورە دەفەرموێت: من بەندەکانی خۆم بەپاکی دروست کردووە، پاشتر شەیتانەکان هاتن و لەڕێ لایاندان).

بەرامبەر دیاردەی باوکایەتی و دایکایەتی دەستەیەك خەڵك بەدی دەکەین کە خوای گەورە تاقیکردونەتەوە بە لەدەستدانی ئەم نیعمەتە، وە تاقیکردونەتەوە بە بێبەش بوونیان لێی،

ئەمەش لەبەر حیکمەتێکە کە هەر خۆی دەیزانێ و بڕیاری لەسەریەتی، تا دڵەکان بە ئاراستەکراوی بۆ لای خوا بمێنێتەوەو بە پاڕانەوە رووی تێ بکات بۆ داواکردنی منداڵ، بەتایبەت منداڵێکی چاك: ﴿ لِّلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ۚ يَهَبُ لِمَن يَشَآءُ إِنَٰثًا وَيَهَبُ لِمَن يَشَآءُ ٱلذُّكُورَ ﴿٤٩﴾ أَوْ يُزَوِّجُهُمْ ذُكْرَانًا وَإِنَٰثًا ۖ وَيَجْعَلُ مَن يَشَآءُ عَقِيمًا ۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌ قَدِيرٌ ﴾الشورى/٤٩-٥٠. واتە: فەرمانڕەوایی ئاسمانەکان و زەوی تایبەتی خوایە، هەرچی بیەوێ دروستی دەکا، بەهەرکەس بیەوێ کچی دەداتێ و بەهەرکەسیش کە بیەوێ کوڕی پێدەدات، یا ئەگەر خوا بیەوێ هەردووکیان پێکەوە دەکات، وە هەر کەسێکیش کە بیەوێ نەزۆکی دەدا، بەراستی ئەو زانا و بەتوانایە.

بەڵام کۆمەڵگای نەفامی ئەم گرفتەیان بە پرۆسەیەکی قەرەبووکەرەوە چارەسەر کردووە، کە ئەویش بە منداڵی خۆکردن(تبني)ی منداڵی خەڵکانی تر، کەوا بەخێوی دەکەن و دەیخەنە سەر ناوی خۆیان، چەندین ئایەت هاتووە بۆ پوچەڵکردنەوەی ئەو بیرۆکانە، و گەڕاندنەوەی کاروبار بۆ شوێنی گونجاوی خۆی، و ناوی کوڕ بدرێتە پاڵ ناوی باوکی راستەقینەی خۆی: ﴿ مَّا جَعَلَ ٱللَّهُ لِرَجُلٍ مِّن قَلْبَيْنِ فِى جَوْفِهِۦ ۚ وَمَا جَعَلَ أَزْوَٰجَكُمُ ٱلَّٰٓـِٔى تُظَٰهِرُونَ مِنْهُنَّ أُمَّهَٰتِكُمْ ۚ وَمَا جَعَلَ أَدْعِيَآءَكُمْ أَبْنَآءَكُمْ ۚ ذَٰلِكُمْ قَوْلُكُم بِأَفْوَٰهِكُمْ ۖ وَٱللَّهُ يَقُولُ ٱلْحَقَّ وَهُوَ يَهْدِى ٱلسَّبِيلَ ﴿٤﴾ ٱدْعُوهُمْ لِءَابَآئِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ ٱللَّهِ ۚ فَإِن لَّمْ تَعْلَمُوٓا۟ ءَابَآءَهُمْ فَإِخْوَٰنُكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَمَوَٰلِيكُمْ ۚ وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَآ أَخْطَأْتُم بِهِۦ وَلَٰكِن مَّا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾الأحزاب/٤-٥. واتە: ئەو منداڵانەی کە بەنێوی ئێوە بانگ دەکرێن، (خوا) نەیکردۆتە منداڵی هەقیقی ئێوە، ئەمە قسەی سەرزارەکی خۆتانە، هەر خوا هەق دەڵێ و هەر ئەویشە کە رێگای راستتان نیشان دەدا، ئەوانە بەنێوی باوکەکانیانەوە بانگ بکەن، ئەمە لای خوا دادگەرانەترە، جا گەر باوکیانتان نەزانی، ئەوانە برای ئایینی و دۆستی ئێوەن، وە هیچ تاوانێکتان لەسەر نیە (بەر لە هاتنەخوارەوەی ئەو ئایەتە) ئەگەر هەڵەیەکتان کردبێ تاوانبار نین، بەڵام ئەگەر بەدڵ و بە ئەنقەست بیکەن، وە خوا لێبوردەو میهرەبانە.

## ١٠- چاکی دایك و باوك و شوێنەواری لەسەر منداڵەکانیان:

چاکی باوك و دایك، کە دوو پێشەنگی چاکی منداڵی تازەپێگەیشتوون، شوێنەوارییەکی گەورەی لەسەر دەروونی منداڵ هەیە، وێڕای خۆپارێزی و لەخواترسان و شوێنکەوتنی بەرنامەکەی، لەتەك هەندێ کۆشش و هاریکاری نێوانیان، منداڵ لەسەر گوێڕایەڵی و روو لەخوا بوون گەشە دەکات، هەر ئەوەیە کە ئەم ئایەتە دوپاتی کردۆتەوە: ﴿ ذُرِّيَّةً بَعْضُهَا مِنْ بَعْضٍ ﴾آل عمران/٣٤. وەچەیەکن (لەروانگەی هەڵبژاردندا) هەندێکیان لە هەندێکی ترە.

بەڵام ئێمە تێبینی دەرچوون لەم بنچینەیە دەکەین، ئەوەش حیکمەتێکی تێدایە کە خوای گەورە خۆی دەیزانێ، و تا دڵەکان هەر بەئاگایی و بێداری بمێننەوە، و لەخوا بپارێتەوە تا منداڵی چاکی پێ بدات.

چاکی دایك و باوك سودی گەیاندووە بە وەچەو منداڵانیان" ئەوەتا گەورەمان (خضر)[1] بەخۆڕایی و بەبێ وەرگرتنی کرێ دیوارێك دروست دەکات، جا سەردارمان (موسا) پرسیاری لێ دەکات کە بۆچی کرێ وەرناگرێ، وەڵامی ئەویش بۆی: ﴿وَكَانَ أَبُوهُمَا صَٰلِحًا ﴾الكهف/٨٢. واتە باوکیان پیاوێکی چاك بوو.[2]

هەروەها فریشتەکانیش بۆ بڕواداران و دایك و باوکانیان و نەوەکانیان دەپاڕێنەوە: ﴿رَبَّنَا وَأَدْخِلْهُمْ جَنَّٰتِ عَدْنٍ ٱلَّتِى وَعَدتَّهُمْ وَمَن صَلَحَ مِنْ ءَابَآئِهِمْ وَأَزْوَٰجِهِمْ وَذُرِّيَّٰتِهِمْ ۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾غافر/٨. واتە: پەروەردگارا! بیانخەرە ئەو باخ و باخاتەی بەهەشتی عەدەنەوە کە بەڵێنت پێدابوون، هاوڕێ لەگەڵ دایك و باوك و هاوسەر و نەوەکانیان، بەراستی هەرتۆ خوایەکی زۆر بەدەستەڵات و دانایت.

---

١ هەروەك لە صحیحی بخاری دا هاتووە ناوی (خضر) بووە.

٢ (ابن کثیر) لە تەفسیرەکەیدا گێڕاویەتیەوە کە پشتی حەوتەم (باپیرەی حەوتەم)ی پیاوێکی چاك بووەو خوای گەورە نەوەکەی لێ سودمەند کردووە. (الفخر الرازی)یش لە تەفسیرەکەیدا (١٦٢/٢١) لەسەر ئەو ئایەتە دەڵێت: ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە چاکەکاری باوك سوودی بایەخ دان بە کاروباری منداڵەکانی تێدایە. ئینجا دەڵێت: کە چاودێریکردنی بەرژەوەندییەکانی ئەو دوو منداڵە هەتیوە، لەبەر چاکی باوکیان درایە پاڵ خوای گەورە، چونکە ئەوەی بەرژەوەندییەکانی منداڵ دەگرێتە خۆی بۆ چاودێری مافی باوکان تەنها خوای گەورەیە.

ئەگەر وەچەکان لەسەر گوێڕایەڵی خواو بانگەواز کردن بۆ ئایینەکەی پێگەیشتن، ئەوا دیداری نێوانیان لە بەهەشتی نەبڕاوەدا دەبێت، هەروەك خوای گەورە رایگەیاندووەو دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱتَّبَعَتْهُمْ ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَٰنٍ أَلْحَقْنَا بِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَمَآ أَلَتْنَٰهُم مِّنْ عَمَلِهِم مِّن شَىْءٍ كُلُّ ٱمْرِىٍٕۭ بِمَا كَسَبَ رَهِينٌ ﴾الطور/٢١. واتە: (ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوەو نەوەکانیشیان بە ئیمان و باوەڕەوە شوێنیان کەوتوون، ئەوا لە بەهەشتدا نەوەکان بە باوانیان دەگەیەنین، و هیچ لە پاداشتی کردەوەی ئەوانیش کەم ناکەینەوە، هەرکەسە بارمتەی کردەوەی خۆیەتی).

هەر لەبەر ئەمەیە کە یەکێك لە پیاوچاکان وتوویەتی: (کوڕەکەم! من لەپێناوی تۆدا زۆر نوێژ دەکەم).

هەروەها (سهل التستری) پەیمان بە منداڵەکەی دەدات کە هێشتا لە پشتیدایە، و دەست بە کاری چاکە دەکات، بە ئومێدی ئەوەی کە خوای گەورە منداڵێکی چاکی پێ ببەخشێت و، دەڵێت: (ئەو پەیمانەی کە خوا لە جیهانی نادیار (عالم الذّرّ)دا لەسەری داناوم بەجێی دێنم، چاودێری منداڵەکانم دەکەم، لەم کاتەوە تا خوای گەورە دەیانهێنێتە جیهانی بینران و دەرکەوتن)).[1] ئەمەش بەڵگەیە لەسەر سووربوونی پێشینانی چاك لەسەر بوونی منداڵی چاك، خوای گەورە منداڵی چاك بە من و بە ئێوەش ببەخشێت، هەر ئەو بیسەر و وەڵامدەرە.

(بیهقی) لە کتێبی (الأعتقاد)دا[2] بە سەنەدی خۆی لە (ابن عباس)ەوە هێناویەتی، کە کاتێك ئایەتی ﴿ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴾النجم/٣٩. (واتە: ئادەمیزاد تەنها ئەو کردەوانەی بۆ هەیە کە کردوویەتی)، هاتە خوارەوە، دوابەدوای ئەوە خوای گەورە ﴿أَلْحَقْنَا بِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ ﴾ی دابەزاند، جا خوای گەورە منداڵانی بەچاکی باوکانەوە بردە بەهەشت.

لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا دەربارەی ﴿أَلْحَقْنَا بِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ ﴾، (ابن عباس) ﷺ وتوویەتی: خوای گەورە لە بەهەشتدا وەچەکانی باوەڕدار بەرزدەکاتەوە بۆ پلەی ئەو، ئەگەریش کردەوەکانیان لەو کەمتر بێت ئینجا ئەمەی خوارەوەی خوێندەوە:

﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱتَّبَعَتْهُمْ ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَٰنٍ أَلْحَقْنَا بِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَمَآ أَلَتْنَٰهُم مِّنْ عَمَلِهِم مِّن شَىْءٍ كُلُّ

---

١ حاشية ابن عابدين ١/٥٣ ط٢.

٢ كتاب الأعتقاد للحافظ ابي بكر بن الحسين البيهقي، المتوفي سنة ٤٥٨هـ، ص٧٤-٧٥.

ٱمۡرِيِٕۭ بِمَا كَسَبَ رَهِينٞ ﴾الطور/٢١. واتە: (ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوەو نەوەکانیشیان بە ئیمان و باوەڕەوە شوێنیان کەوتوون، ئەوا لە بەهەشتدا نەوەکان بە باوانیان دەگەیەنین، و هیچ لە پاداشتی کردەوەی ئەوانیش کەم ناکەینەوە).

(ابن شاهین) دەگێڕێتەوە[1] کە (حارثة کوڕی نعمان)ﷺ هاتە لای پێغەمبەری خواﷺ و لەوکاتەدا قسەی لەگەڵ پیاوێکدا دەکرد، بۆیە دانیشت و سڵاوی نەکرد، (جبرائیل) فەرمووی: ئەگەر سڵاوی بکردایە وەڵامان دەدایەوە؟ پێغەمبەری خواﷺ بە (جبرائیل)ی فەرموو: ئایا دەیناسیت؟ فەرمووی: بەڵێ، ئەوە لەو هەشتا کەسەیە کە لە ڕۆژی (حنین)دا ئارامیان گرت، خوای گەورە بەهەشتی بە خۆیان و منداڵەکانیان بەخشیوە.

(سعید کوڕی مسیب) دەڵێت: من کاتێك نوێژ دەکەم کوڕەکەم یاد دەکەوێتەوە، بۆیە نوێژەکەم زیاتر دەکەم.

هەروەها دەگێڕنەوە کە خوای گەورە حەوت وەچەی پیاوچاك دەپارێزێت، ئەمە لەم ئایەتەدا ئاماژەی بۆ کراوە: ﴿إِنَّ وَلِـِّۧيَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي نَزَّلَ ٱلۡكِتَٰبَۖ وَهُوَ يَتَوَلَّى ٱلصَّٰلِحِينَ﴾الأعراف/١٩٦. واتە: (بەڕاستی پشتیوانی من خوایە، ئەو خوایەی کە ئەم کتێبەی ناردۆتە خوارێ، هەر ئەویش پشتیوانی هەموو چاکانە. (قرطبي) وای وتووە.[2]

## ١١- هاوسەرگرتن و خزمایەتی:

نیعمەتی هاوسەرگرتن یەکێکە لە بەخششەکانی خوای گەورە بۆ مرۆڤ، و سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەران بووە، خوا کردوویەتی بە سوننەت و ڕێباز لە پێناوی بەردەوامی ژیانی مرۆڤایەتیدا بەهۆی هاوسەرایەتی نێوان نێر و مێ، ئەم پەیوەندییەش قەدەری خوای تێدا دەردەکەوێت کە ژن و پیاوی پێکەوە کۆکردۆتەوە: ﴿ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ أَزۡوَٰجٗا وَجَعَلَ لَكُم مِّنۡ أَزۡوَٰجِكُم بَنِينَ وَحَفَدَةٗ وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِۚ أَفَبِٱلۡبَٰطِلِ يُؤۡمِنُونَ وَبِنِعۡمَتِ ٱللَّهِ هُمۡ يَكۡفُرُونَ ﴾النحل/٧٢. واتە: (خوا هەر لەخۆتان هاوسەرانی بۆ فەراهەم هێناون، هەر لەڕێگەی هاوسەرانتانەوە کوڕ و کوڕەزای پێبەخشیون، وە لەهەموو رزق و ڕۆزییەکی چاك و بەسوود بەهرەوەری کردووە، (لەگەڵ ئەو ڕاستیانەدا) ئایا ئەوانە هەر بڕوا بە

---

١ ذكره ابن حجر في الأصابة ٣١٢/١.

٢ أنظر حسن الأسوة رقم ٩٤.

ناحەقی دەکەن، و لەبەرامبەر ناز و نیعمەتەکانی خواوە ئەوانە هەر ناشوکر و حەقپۆش دەبن؟ ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ وَجَعَلْنَا لَهُمْ أَزْوَاجًا وَذُرِّيَّةً ﴾الرعد/٣٨. واتە: (بێگومان پێش تۆ پێغەمبەرانی ترمان ڕەوانە کردووەو هاوسەر و نەوەشمان پێ بەخشیون).

خوای گەورە مرۆڤی ئاراستە کردووە بۆ بیرکردنەوەو ڕامان لە دیاردەی هاوسەرگرتن (الزواج)، ئەم هاوسەرگرتنەش نیشانەیەکە لە نیشانەکانی خوای گەورە لەسەر زەوی کەوا مەزنی و تواناو دەسەڵاتی لەسەر دەروون هەیە کە ڕووبکاتە لای خوای گەورە، بۆ داواکردنی یارمەتی لێی و ئیمان و بڕواهێنان بە بەرنامەکەی: ﴿ وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴾الروم/٢١. واتە: (یەکێك لە نیشانەو بەڵگەکانی تری (خوای گەورە) ئەوەیە کە هەر لەخۆتان هاوتاو هاوسەری بۆ دروست کردوون بۆ ئەوەی لەلایدا ئارام بگرن، لەنێوانتاندا خۆشەویستی و سۆزو میهرەبانی فەراهەمهێناوە، بەڕاستی ئا لەو دیاردانەدا نیشانەو بەڵگە هەیە بۆ کەسانێك کە بیردەکەنەوەو تێدەفکرن).

ئەم خزمایەتیە(مصاهرة) سەرسوڕهێنەرەی کە خوای گەورە لەنێوان مرۆڤەکاندا دایناوە و بە چاودێری خۆی ئاڕاستەی دەکات و بەچاودێری خۆی چاودێری دەکات و خۆشەویستی و سۆز و میهرەبانی و دڵئارامی پێدەدات: ﴿ وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ مِنَ الْمَاءِ بَشَرًا فَجَعَلَهُ نَسَبًا وَصِهْرًا ۗ وَكَانَ رَبُّكَ قَدِيرًا ﴾الفرقان/٥٤. واتە: هەر ئەو زاتەیە کە لە ئاو(منی) مرۆڤ بەدی دەهێنێ، وە کردوویەتی بەهۆی خزمایەتی (بەهۆی نەسەب یان بەهۆی ژن و ژنخوازی)، بێگومان پەروەردگاری تۆ دەسەڵاتی بێسنوورە.

## ١٢- پاڕانەوە لەکاتی جووتبووندا بۆ داواکردنی منداڵی چاك:

(عبدالرزاق) بە سەنەدی خۆی لە (ابن عباس)ەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: **((لو أن أحدهم إذا أتى أهله قال: بسم الله، اللهم جنّبنا الشيطان، وجنّب الشيطان ما رُزقْتنا، فيولد بينهما ولد، فلا يصيبه الشيطان ابداً)).**[1] واتە: (گەر یەکێك کە دەچێتە لای خێزانەکەی و وتی: بەناوی خوا، خوایە شەیتانما لێ دورخەرەوە، و شەیتان لەوە دوورخەرەوە کە پێمانی دەبەخشی، جا ئەگەر هەر منداڵێکیان بوو، هەرگیز شەیتان ناتوانێ

---
١ أخرجه الشيخان.

زیانی پێ بگەیەنێ).

لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا هاتووە: ((لو أن احدهم إذا جامع قال: اللهم جنبنا الشيطان، وجنب الشيطان ما رُزِقتنا، فقُضي بينهما ولد، لم يضره الشيطان إن شاء الله)). واتە: (گەر یەکێك لەگەڵ خێزانی جووت بوو وتی: خوایە شەیتانمان لێ دوورخەرەوە، و شەیتان لەوە دوورخەرەوە کە پێمانی دەبەخشی، ئەگەر منداڵیان بوو، هەرگیز شەیتان ناتوانێ زیانی پێ بگەیەنێ، إن شاء الله).

هەروەها (عبدالرزاق) لە (حسن)ەوە دەگێڕێتەوە، وتوویەتی: ئەگەر پیاو چووە لای ژنەکەی، با بڵێ: ((بسم الله، اللهم بارك لنا فيما رزقتنا، ولا تجعل للشيطان نصيباً فيما رزقتنا)). واتە: (بەناوی خوا، خوایە بەرەکەت بخە ئەوەی کە پێمانی دەبەخشی، و هیچ بەشێکی شەیتان مەخەرە ئەوەی پێت بەخشیوین).

دەڵێ: ئەوا ئومێد هەیە ئەگەر ژنەکە سکی پڕ بوو منداڵێکی چاکی ببێت.

## ١٣- منداڵ کاتێ کە هیچ نەبووە:

دوای ئەوەی پرۆسەی هاوسەرایەتی لەنێوان هەردوو لا پێکهات، ئینجا ژن و مێرد روو دەکەنە خوای گەورەو داوای نەوەیەکی باش دەکەن، کە وەچەی چاکیان پێ ببەخشێت، جا هەرکاتێ ئەو نیعمەتە دوا بکەوێت، ژن و مێرد نەوەندەیتر پێدادەگرن و داوا لەخوا دەکەن پێیان ببەخشێت، ئا لێرەدا مرۆڤ ئایەتێك لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزی دێتەوە یاد، ئایەتەکە ئەوەی بەبیر دێنێتەوە کە پێشتر هیچ نەبووە، و ئەوەی کە ئەوی هێناوەتە ئەم جیهانە هەر خوایە، بۆیە بەراستی پێویستە لەسەر مرۆڤ کە بەندایەتی تەنها بۆ ئەو خوایە بنوێنێ کە هێناویەتە بوون: ﴿هَلْ أَتَىٰ عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ حِينٌ مِّنَ ٱلدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْـًٔا مَّذْكُورًا﴾الأنسان/١.واتە: (ئایا زەمانێك بەسەر مرۆڤدا نەهاتووە کە شتێك نەبووبێت کە ناونیشانێکی هەبێت).

## ١٤- منداڵ دڵۆپە ئاوێکە (الطفل نطفة):

ئایەتەکان مرۆڤیان ئاراستە کردووە بۆ بیرکردنەوە لە بنەڕەتی خۆی و لەو ماددانەی کە لێی پێکهاتووە، تا ئاشنا بێت بەو نیعمەتەی کە خوا پێی بەخشیوە، ئیدی خۆی بەگەورە نەزانێت و کەش و فس کەر و لوتبەرز نەبێت و پێی شەرم نەبێت کە خوا بپەرستێت: ﴿فَلْيَنظُرِ

ٱلْإِنسَـٰنُ مِمَّ خُلِقَ ﴿٥﴾ خُلِقَ مِن مَّآءٍ دَافِقٍ ﴿٦﴾ يَخْرُجُ مِنۢ بَيْنِ ٱلصُّلْبِ وَٱلتَّرَآئِبِ ﴾الطارق/٥-٧. واتـە: (بـا ئادەمیزاد سەرنج بدات لەچی بەدی هێنراوە، لە ئاوێکی هەڵقوڵاو (کە مەنی پیاوو هێلکۆکەی ئافرەتە، هەردوکیان هەڵدەقوڵێن بۆ پێکهێنانی ئادەمیزاد) بەدیهێنراوە، کـە لـەنێوان پـشتی پیاو و ئێسکەکانی سینەی ئافرەت دەردەچێت).

﴿قُتِلَ ٱلْإِنسَـٰنُ مَآ أَكْفَرَهُۥ ﴿١٧﴾ مِنْ أَىِّ شَىْءٍ خَلَقَهُۥ ﴿١٨﴾ مِن نُّطْفَةٍ خَلَقَهُۥ فَقَدَّرَهُۥ ﴾عبس/١٧-١٩. واتە: (بەکوشت بچێت ئادەمیزاد، چی وای لێ کردووە کە کافر بێت، (بۆ بیر ناکاتەوە) خـوا لەچـی بـەدیهێناوە، لـە دڵۆپـەئاوێك بـەدیهێناوەو هـەموو ئەنـدامانی دەر و نـاوی پـێ بەخـشیوەو ئەندازەگیریی وردی لە بەدیهێنانیدا ئەنجام داوە).

﴿ أَفَرَءَيْتُم مَّا تُمْنُونَ ﴿٥٨﴾ ءَأَنتُمْ تَخْلُقُونَهُۥٓ أَمْ نَحْنُ ٱلْخَـٰلِقُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾الواقعة/٥٨-٥٩. واتە: (ئایا سەرنجتان لە (مەنی) و ئـاوی پیـاوان داوە چیە و چـۆنە، مەگـەر ئێـوە (سـەرەتا (مـەنی و هێلکۆکە) دروست دەکەن، یان خۆتان و نەوەکانیشتان دروستکراوی ئێمەن).

﴿إِنَّا خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَـٰهُ سَمِيعًۢا بَصِيرًا ﴾الأنسان/٢.واتە:(ئێمە ئادەمیزادمان بەدیهێناوە لە تێکەڵەیەك(ئاوی پیاو و ئاوی ژن)، ئینجا دەستگای بیستن و بینینمان پێ بەخشی).

## ١٥- سەرنجی دروست بوون لە منداڵداندا و گەشەی کۆرپەلە:

دوای ئەوەی ئاوی پشتی پیاو و ئاوی سینەی ئافرەت بەیەکـەوە دەلکـێن، ئینجـا کـردەی پێکهێنانی کۆرپەلەی سەرەتا دەست پێدەکات، خوای گەورەش دیاری دەکات نێر بێ یان مێ، لەگەڵیشیدا کـردەی دروسـتبوون دەسـت پێدەکـات: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى يُصَوِّرُكُمْ فِى ٱلْأَرْحَامِ كَيْفَ يَشَآءُ ۚ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾آل عمران/٦ واتە: (هەر خوایە کە لە منداڵدانـدا بەهـەر شێوەیەك بیەوێت وێنەو نەخشەتان دەکێشێت، جگە لەو خوایە خوایەکی تر نیـە، و ئـەو زاتـە باڵادەست و دانایە).

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْأَرْحَامِ ۖ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا ۖ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌۢ بِأَىِّ أَرْضٍ تَمُوتُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴾لقمان/٣٤.واتە: (بەراستی هەر خوا زانیاری (بەرپابوونی) رۆژی قیامەت دەزانێ، بارانیش هەر ئەو دەیبارێنێ،

و دەزانێت چی لە سکی دایکاندا هەیە، هیچ کەس نازانێ سبەی چی دەست دەکەوێت، هیچ کەس نازانێ لەسەر چ زەوییەکدا دەمرێت، بەراستی هەر خوا زانایەو زۆریش ئاگادارە).

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمۡ فِي رَيۡبٖ مِّنَ ٱلۡبَعۡثِ فَإِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن تُرَابٖ ثُمَّ مِن نُّطۡفَةٖ ثُمَّ مِنۡ عَلَقَةٖ ثُمَّ مِن مُّضۡغَةٖ مُّخَلَّقَةٖ وَغَيۡرِ مُخَلَّقَةٖ لِّنُبَيِّنَ لَكُمۡۚ وَنُقِرُّ فِي ٱلۡأَرۡحَامِ مَا نَشَآءُ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى ثُمَّ نُخۡرِجُكُمۡ طِفۡلٗا ثُمَّ لِتَبۡلُغُوٓاْ أَشُدَّكُمۡۖ وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰٓ أَرۡذَلِ ٱلۡعُمُرِ لِكَيۡلَا يَعۡلَمَ مِنۢ بَعۡدِ عِلۡمٖ شَيۡـٔٗاۚ وَتَرَى ٱلۡأَرۡضَ هَامِدَةٗ فَإِذَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡهَا ٱلۡمَآءَ ٱهۡتَزَّتۡ وَرَبَتۡ وَأَنۢبَتَتۡ مِن كُلِّ زَوۡجِۢ بَهِيجٖ ﴾الحج/٥.واتە: (ئەی خەڵکینە ئەگەر ئێوە گومانتان لە زیندووبوونەوە هەیە، ئەوە چاك بزانن کە ئێمە سەرەتا ئێوەمان لە خاك و خۆڵ دروست کردووە، لەوەودوا (نەوەکان) لە دڵۆپەئاوێك (پەیدا دەبن)، دڵۆپەئاوەکەش دەبێتە خوێنپارە، پاشان دەبێتە گۆشتپارەیەکی تەواو و سەروسیمادار، یا ناتەواو، (هەموو ئەم شتانە دەهێنینەوە یادتان) تا بۆتان روون بێ (کە ئێمە ئێوەمان ئاوا دروست کردووەو دروست کردنەوەشتان لامان زۆر ئاسانە)، ئینجا هەر شتێك کە بمانەوێت لە منداڵداندا بڕیاری لەسەر دەدەین (کوڕ یا کچ، تەواو یا ناتەواو)تا کاتێکی دیاریکراو، لەوەودوا بەساوایی (لەسکی دایکتان( دەرتان دێنین، دوایی گەورەدەبن و هێز و توانا پەیدا دەکەن و (بیرو هۆش دەکەنەوە) هەتانە دەمرێنرێ (پێش ئەوەی بگاتە ئەو قۆناغە)، هەشتانە دەمێنێ تا دەگاتە تەمەنی پیری، تا وای لێدێ دوای ئەوەی ئەوسا شتێکی دەزانی، هەموو شتێکی لەبیر دەچێتەوەو هیچ نازانێت).

﴿ وَٱللَّهُ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٖ ثُمَّ مِن نُّطۡفَةٖ ثُمَّ جَعَلَكُمۡ أَزۡوَٰجٗاۚ وَمَا تَحۡمِلُ مِنۡ أُنثَىٰ وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلۡمِهِۦۚ وَمَا يُعَمَّرُ مِن مُّعَمَّرٖ وَلَا يُنقَصُ مِنۡ عُمُرِهِۦٓ إِلَّا فِي كِتَٰبٍۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ﴾فاطر/١١. واتە: (خوا ئێوەی لەخاك بەدیهێناوە، پاشان لە دڵۆپەئاوێك، پاش ئەوە کردوونی بە جووت (نێر و مێ)، هیچ مێینەیەك دووگیان نابێت و (سکەکەی) دانانێت بەبێ ئاگاداری ئەو زاتە، هیچ تەمەن درێژێك تەمەنی درێژ نابێت و لەتەمەنی کەم نابێتەوە بەبێ ئەوەی یاداشت کرابێت لە کتێبێکدا، بێگومان ئەو شتانە لای خوا زۆر ئاسانە).

﴿يَخۡلُقُكُمۡ فِي بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمۡ خَلۡقٗا مِّنۢ بَعۡدِ خَلۡقٖ فِي ظُلُمَٰتٖ ثَلَٰثٖۚ ﴾الزمر/٦. واتە: (لە سکی دایکتانا ئێوە دروست دەکات، لەناو سێ تاریکستاندا (کە مەبەستی سێ پێستەکەیە کە کۆرپەلەی تیا حەشار دراوە).

ئا لێرەوە کرداری دووگیانی و چاودێری خوا بۆ کۆرپەلەی نوێ دەست پێدەکات، تەنانەت نەفسیەتی دایکی دووگیان کاریگەری لەسەر دورست دەبێت و هەست بە ئازارێك دەکات کە پێشتر نەیبینیوە، ئەمەش ئەم ئایەتە وێنای کردووە: ﴿وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ إِحْسَٰنًا حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ كُرْهًا﴾الأحقاف/١٥. واتە: (ئێمە ئامۆژگاری ئادەمیزادمان کردووە کە چاك هەڵوێست و چاك رەفتار بێت لەگەڵ دایك و باوکیدا، دایکی بە ئازارەوە (بەپێستی سکی نۆ مانگ) هەڵی رتووە).

بەلام کەمترین ماوەی سکپڕی شەش مانگە: ﴿وَوَضَعَتْهُ كُرْهًا وَحَمْلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ﴾الأحقاف/١٥. واتە: (سکپڕبوون و لەشیر بڕینەوەی سی دانە مانگی خایاندووە.

ماوەی دووگیانی و شیردان سی مانگە، دوو ساڵ شیردانە، کەواتە شەش مانگیش ماوەی سکپڕی یە، ئەمە فەتوای (علی کوڕی ابو طالب)ـە کە بۆ (عمر کوڕی خطاب)ی دا).

فەرموودەیەکی (بخاری) و (مسلم) کە لە (ابن مسعود)ەوە دەیگێڕنەوە، ئەو گەشەکردنی کۆرپەلەی کۆکردۆتەوە، کە دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ کە راستگۆی باوەڕپێکراوە دەفەرموێت: ((**إن أحدكم يُجمع خلقُهُ في بطن أمه أربعين يوماً، ثم يكون علقةً مثل ذلك، ثم يكون مضغة مثل ذلك، ثم يُرسلُ الملك، فينفخ فيه الروح، ويُؤمر باربع كلمات: بكتب رزقه؛ وأجله؛ وعمله؛ وشقي؛ أو سعيد**)). واتە: (هەریەك لەئێوە لەناو سکی دایکیدا خودا دروستی دەکات و کۆی دەکاتەوە، چل رۆژ دڵۆپە ئاوێکە، پاشان چل رۆژ خوێنپارەیە کە خۆی بە دیواری منداڵدانەوە هەڵواسیوە، پاشتر چل رۆژ گۆشتپارەیە، ئینجا خوای گەورە فریشتەیەك دەنێرێ و رۆحی بەبەردا دەکات، و بەچوار وشە فەرمانی پێ دەکرێ: بە نووسینی رزق و رۆزییەکەی، ئەجەل و کارو کردەوەی، بەدبەختە یاخود بەختەوەرە).

## ١٦- چارەسازیی پێغەمبەری خواﷺ بۆ نەزۆکی:

(ابوحنیفە) لە (مسند)ەکەیدا لە (جابر کوڕی عبداللە)وەﷺ دەگێڕێتەوە، کە پیاوێك لە ئەنصاریەکان هاتە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ و پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا هەرگیز منداڵم پێ نەبەخشراوەو هیچ منداڵمان نەبووە؟ پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((**فاين أنت من كثرة الأستغفار، وكثرة الصدقة تُرزقُ بها**)). واتە: (باشە تۆ لەگەڵ زۆر داوای لێبوردن و زۆر ماڵ بەخشیندا چۆنیت، تا خوا بەهۆیەوە پێت ببەخشێت؟)

دەڵێ: پاش ئەوە کابرا زۆر خێری دەکرد و زۆریش داوای لێخۆشبوونی دەکرد، (جابر) وتی:

نۆ کوڕی بوو.

(ملا علی القاری)ی فەرزان لە راڤەی ئەم فەرموودەیەدا دەڵێت: رەنگە ئەوە لەو ئایەتەی قورئان وەرگیرابێت کە لە سەرگوزشتەی (نـوح)×دا دەفـەرموێت: ﴿ فَقُلْتُ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارًا ﴿١٠﴾ يُرْسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا ﴿١١﴾ وَيُمْدِدْكُم بِأَمْوَٰلٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَل لَّكُمْ جَنَّـٰتٍ وَيَجْعَل لَّكُمْ أَنْهَـٰرًا ﴾نوح/١٠-١٢. واتە: (وتم: ئێوە داوای لێخۆشبوون لە پەروەردگارتان بکـەن، چونکە ئەو زاتێکی لێخۆشبووە، (ئەوکاتە) بارانتان بەلێزمە و خوڕەم بـۆ دەبارێنێـت، مـاڵ و سامان و نەوەتان پێدەبەخشێت، هەروەها باخ و باخات و رووبار و چەم و جۆگـەتان بـۆ بـەدی دێنێت).

هەر لەو بارەیەوە هاتووە: کە هەر کەسێك زۆر داوای لێخۆشبوون بکات خـوای گـەورە لـە هەموو پـەژارەو ناسـۆرێکدا دەرووی لێ دەکاتـەوە، و لـە هـەموو تەنگانەیەکـدا دەرووی لێ دەکاتەوەو لەلایەکەوە رزق و رۆزی پێدەدات کە بەهیچ جۆرێ بە خەیاڵیدا نەهاتووە.[١]

## ١٧- سزای ئەو کەسەی خۆی لە منداڵی یان لە دایکی یـان لـە باوکی بێبەری دەکات:

لە(ابن عمر)ەوەم دەگێڕنەوە کە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: **((من انتفى من ولده، ليفضحه في الدنيا، فضحه الله تبارك وتعالى يوم القيامة، على رؤوس الأشهاد، قصاص بقصاص))**.[٢] واتە: (هەرکەسێك خۆی لە منداڵەکەی بێبەری بکات بۆ ئەوەی لە دنیا ریسوای بکـات، ئـەوا خوای گەورە لە رۆژی قیامەتدا لەبەرچاوی هەموو خەڵك ریسوای دەکات، تۆڵە بەتۆڵە.

(معاذ کوڕی انس) لە پێغەمبەری خواﷺ دەگێڕێتەوە کـە فەرموویـەتی: **((إن لله تعـالى عباداً لا يكلمهم الله يوم القيامة، ولا يزكيهم ولا ينظر اليهم))**. واتە: (خوای گەورە بەندەی وەهای هەیە کە لە رۆژی قیامەتدا نایاندوێنێ و پاکیان ناکاتەوە و تەماشایان ناکات).

وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوان کێن؟ فەرمووی: **((متبرئ من والديه، راغب عنـهما، ومتبرئ من ولده))**.[٣] واتە: (کەسێکە کە خۆی بێبەری کردبێ لە دایـك و بـاوکی و وازی لێ

---

١ رواه احمد والحاكم عن ابن عباس، شرح مسند ابي حنيفة لعلي القاري ص٥٨٧.

٢ رواه أحمد والطبراني في الكبير والأوسط ورجال الطبراني رجال الصحيح خلا عبدالله بن احمد وهو ثقة امام قاله الهيثمي في المجمع ١٥/٥.

٣ رواه أحمد والطبراني، زاد (ولهم عذاب اليم) وفيه زبان بن فائد، ضعفه احمد وابن معين، وقال ابوحاتم: صالح كذا قاله الهيثمي ١٥/٥.

هێنابن، هەروەها ئەو کەسەی کە خۆی لە منداڵی بێبەری دەکات).

(خشخاش العنبری) وتوویەتی: چوومە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ و کوڕێکی خۆم لەگەڵدا بوو، پێغەمبەرﷺ پێی فەرمووم: ئەمە کوڕی تۆیە؟ وتم: بەڵێ، فەرمووی: ((**لا تجني عليه، ولا يجني عليك**)).[1] واتە: (تۆ مافی ئەو پێشێل مەکە و ئەویش مافی تۆ پێشێل نەکات).

(حاکم)[2] لە (ابو رمثة) دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: لەگەڵ باوکمدا دەچووین بەرەوڕووی پێغەمبەری خواﷺ، باوکم سلاوی لێکرد و ماوەیەك دانیشتین، پێغەمبەری خواﷺ بە باوکمی فەرموو: ئەوە کوڕی تۆیە؟ وتی: ئەرێوەڵا (سوێند بە پەروەردگاری کەعبە) کوڕمە، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: بە راستیتە؟ وتی: شایەتی دەدەم لەسەری.. پێغەمبەری خواﷺ بە زەردەخەنە پێکەنی بەوەی کە من لە شێوەی باوکم دەچووم و بە سوێندخواردنی باوکم لەسەر ئەوە، ئینجا فەرمووی: ((**أما ان ابنك هذا لا يجني عليك ولا تجني عليه**)). واتە: (بـا ئـەم کوڕەت مافی تۆ پێشێل نەکات و تۆش مافی ئەو پێشێل نەکەیت).

پاش ئەوە پێغەمبەری خواﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿أَلَّا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ﴾ تا دەگاتە ﴿هَٰذَا نَذِيرٌ مِّنَ النُّذُرِ الْأُولَىٰ﴾النجم/٣٨-٥٦.

---

١ رواه احمد بإسناد صحيح وابن ماجة وابويعلي والبغوي وابن قانع وابن منده والطبراني وسعيد بن منصور: أنظر سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم ٩٩٠.

٢ رواه الحاكم وقال صحيح الأسناد وأقره الذهبي.

# بەندی دووەم

## منداڵ لە ساتی لەدایك بوونەوە تا دووساڵی

(طبرانی)لە (عائشه)ەوەﷺ دەگێڕێتەوە کە وتویەتی:

گوێم لە پێغەمبەری خواﷺ بوو دەیفەرموو:

((من ربى صغيراً حتى يقول لا اله الا الله لم يحاسبه الله)).[1]

واتە: (هەرکەسێك ساوایەك پەروەردە بکات تا دەڵێت لا اله الا الله، خوای گەورە لێپرسینەی لەگەڵ ناکات).

**دەستپێك: پاڕانەوەکانی بەزەحمەت لەدایك بوون.**

**١- کاری یەکەم رۆژی لەدایك بوون:**

**سەرفیترە و میرات - مژدە و خۆشی - بانگدان و قامەتکردن - پاڕانەوە - شیرینی وەردان لە دەمی منداڵ.**

**٢- کاری حەوتەمین رۆژی لەدایك بوون:**

**ناونان - سەرتاشین - گوێزەبانە (حەوتەوانە) - خەتەنەکردن.**

**٣- لەشیر پێدانەوە تا دووساڵی.**

**٤- حوکمی میزی منداڵی شیرەخۆر و چۆنیەتی پاككردنەوەی.**

**٥- رێگە پێدراوە کە دایك شیرەخۆری لەگەڵ خۆیدا بباتە مزگەوت.**

**٦- بەچاك نەزانینی بردنی ئەو منداڵانەی لە قۆناغێکدان رانەهاتوون لەسەر راگیرکردنی میز و پیسایی‌بۆ نێو مزگەوتی.**

**٧- مافی دایەنێتی بۆ دایك.**

**٨- مافی سەرپەرشتی بۆ باوکە.**

---

١ قال الهيثمي في مجمع الزوائد ٨/١٥٩: رواه الطبراني في الصغير والأوسط، وفيه سليمان بن داود الشاذكوني وهو ضعيف.

## دەستپێك: پاڕانەوەكانی بەزەحمەت لەدایك بوون:

ژانی منداڵ بوون ئازار و ماندووبوونی جەستەیی و دەروونـی خـۆی هەیـە، وە چركەسـاتی هاتنەدەرەوەی كۆرپەش چركەساتە زۆر ناخۆشەكانە بۆ ژن و مێـرد، وەك لـەم ئایەتـەدا خـوای گەورە بارودۆخی ئەو چركەساتانەی (مریم)مـان بـۆ وێنـا دەكـات: ﴿فَحَمَلَتْهُ فَانتَبَذَتْ بِهِ مَكَانًا قَصِيًّا ﴿٢٢﴾ فَأَجَاءَهَا الْمَخَاضُ إِلَىٰ جِذْعِ النَّخْلَةِ قَالَتْ يَا لَيْتَنِي مِتُّ قَبْلَ هَٰذَا وَكُنتُ نَسْيًا مَّنسِيًّا﴾مريم/٢٢-٢٣. واتە: (دەستبەجێ (مریم) سكی پڕ بوو، (بە غەم و پەژارەوە) بەرەو شوێنێكی دوور رۆیشت، ژان گرتی و بردی بۆ لای قەدی دارخورمایـەك، (بـەدەم ئـاه و ناڵەوە) دەیوت: خۆزگە پـێش (ئـەم بەسـەرهاتە) بمردمایـەو وەك شـتێكی بـێنرخ فـەرامۆش بكرامایە).[1]

ئەو زیكردەی كە لەكاتی ژانگرتندا باشە بوترێت ئـەو زیكرەیـە كـە پێغەمبـەری خـواﷺ لەكاتی ژانگرتنی (فاطمـة)ی كچیدا فێـری كـردوین: (ابـن سـنی) بـە سـەنەدێكی (ضـعیف) دەگێڕێتەوە كە كاتێك (فاطمة) وەختی منداڵبوونی هـات، پێغەمبـەری خـواﷺ (ام سـلمە)و (زینب كچی جحش)ی بانگ كرد و فەرمانی پێكردن كە (آية الكرسي) لەگەڵ ئەم دوو ئایەتەی لەلا بخـوێنن: ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَىٰ عَلَى الْعَرْشِ يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ يَطْلُبُهُ حَثِيثًا وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ وَالنُّجُومَ مُسَخَّرَاتٍ بِأَمْرِهِ ۗ أَلَا لَهُ الْخَلْقُ وَالْأَمْرُ ۗ تَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ﴾الأعراف/٥٤. واتە: (بێگومـان پـەروەردگارتان (الله)یـە كـە بەدیهێنەری ئاسمانەكان و زەوی یە لەماوەی شەش رۆژدا (مەگـەر هـەر خۆیـشی بزانێـت ئـەو رۆژانە ماوەیان چەند بووە)، پاشان لەسەر عەرش و تەختی فـەرمانڕەوایی وەسـتا، شـەوو رۆژ دادەپۆشێت و بەشێنەیی (عەوداڵە) بەدوایدا، خۆر و مانگ و ئەستێرەكان (هەرهەموویان) بـە فەرمانی ئەو كەوتونەتە گەڕ و لەژێر فـەرمانی دەرناچـن، ئاگـاداربن و بـزانن و تێفكـرن كـە هەرچی دروستكراوە سەر بەو زاتەیەو ئەو بەدیهێناوە، (كەواتە با) هەموانیش فەرمانبـەرداری ئەو بن و لە فەرمانی دەرنەچن، موبارەك و پیرۆز و گەورەیی زاتی (الله) پەروەردگاری هـەموو جیهانەكانە).

---

[1] (محمد كوڕی اسحاق) دەڵێ: كاتێك (مريم) سكی پڕ بوو، جا سكی گەورەبوو، و گەڕایەوە، ئیدی خوێنی وەستا و بەهەما شێوەی ئافرەتانیتر كە تووشی ئازار و ناڕەحەتی دەبن و رەنگیـان دەگـۆڕێ، ئەویش وای لێهات هەتا زمانی قەڵشی.. (مختصر ابن كثير)٢/٤٤٨.

﴿إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ مَا مِن شَفِيعٍ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ إِذْنِهِۦ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ فَٱعْبُدُوهُ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ﴾يونس/٣.
واتە: بەراستی پەروەردگاری ئێوە ئەو زاتەیە کە ئاسمانەکان و زەوی لە شەش رۆژدا دروست کردووە، لەوەودوا لەسەر تەختی فەرمانڕەوایی وەستا، هەرخۆیشی پلانی هەموو شتێکی داناوەو هەموو شتێکی رێکخستووە، هیچ کەس نیە تکاکار بێت مەگەر دوای مۆڵەتدانی ئەو زاتە، هەر ئەویشە خوای پەروەردگارتان، هەر ئەو بپەرست، ئایا ئەوە بۆچی یادەوەری وەرناگرن؟

هەروەها هەردوو سورەتی (ناس) و (فلق) بخوێندرێ.[1]

هەروەها (ابن سنی) لە (ابن عباس)ەوەم گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((إذا عسر على المرأة ولدها، أخذ إناءً لطيفاً يكتب فيه ﴿كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَ مَا يُوعَدُونَ ...﴾الأحقاف/٣٥. الى آخر الآية، و ﴿كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَهَا لَمْ يَلْبَثُوٓا۟ إِلَّا عَشِيَّةً أَوْ ضُحَىٰهَا﴾ النازعات/٤٦، و ﴿لَقَدْ كَانَ فِى قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ﴾يوسف/١١١،(( ثم يغسل ويسقى المرأة منه وينضح على بطنها وفرجها)).[2] واتە: (گەر ژنێك منداڵ أبوونەکەی بەزەحمەت بێ، ئەوا دەفرێکی بچووك بێنێ و تێیدا ئەمانە بنووسێ: ﴿كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَ مَا يُوعَدُونَ ...﴾الأحقاف/٣٥ تا کۆتایی ئایەتەکە، و ئایەتی ﴿كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَهَا لَمْ يَلْبَثُوٓا۟ إِلَّا عَشِيَّةً أَوْ ضُحَىٰهَا﴾ النازعات/٤٦، و ئایەتی ﴿لَقَدْ كَانَ فِى قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ﴾ يوسف/١١١، دوای نووسینی ئەوانە ئافرەتەکە خۆی پی بشوات و لێی بخواتەوەو بەسەر سك و داوێنیدا بپرژێنێ.

ئافرەت لەو کاتە زۆر نارەحەتەدا پێویستی بە پەنابردنە بەر پاڕانەوە لەخوای گەورە هەیە بە ئەندازەی ملکەچ بوونی بۆ خوا بەوپەڕی ڕاستگۆیی و دڵسۆزییەوە، لەگەڵ نوێکردنەوەی تۆبەی تەواو (بەجۆرێك کە نەچێتەوە سەر کاری خراپ)، جا خوای گەورە زۆر بەخێرایی منداڵبوونەکەی لەسەر ئاسان دەکات، هۆکارەکانی بەرگری ژانگرتن و نارەحەتیەکەی بۆ دەستەبەر دەکات.

---

١ ذكره ابن تيمية في كتاب (الكلم الطيب) ص٨٧ تحقيق عبدالقادر الأرناؤوط وقال: رواه ابن السني في (عمل اليوم والليلة) رقم٦٢٥ واسناده ضعيف.

٢ (عمل اليوم والليلة) باب ما تعوذ به المرأة التي تطلق رقم ٦٢٤.

شیخ (ابن ظفر المکی) وتوویەتی:[١] پێیان وتم کە (ابوالسری منصور کوڕی عمار)ﷺ کاتێك منداڵ بووە، دایکی تووشی ئازاری منداڵبوون دەبێت و مامانیش لەلای دەبێت، بە (منصور) دەڵێت: (منصور)! خێرا بگەرە باوکت و بانگی بکە بۆ ئێرە، ئەویش پێی دەڵێت: لەم کاتی نارەحەتیەدا هانا بۆ دروستکراوێك دەبەیت کە نە زیان دەگەیەنێت نە سوودی دەبێت و منیش بۆ لای ئەو دەنێری؟ وتی: ئێستا دەمرم، (منصور) پێی وت: بڵێ: (یاالله أغثني) خوایە فریام کەوە، ئەویش ئەوەی وت، هەر لەوکاتەدا کۆرپەکەی بوو).

## یەکەم: کاری یەکەم ڕۆژی لەدایك بون

لە ڕاستیدا چاودێری خوای گەورە بۆ مرۆڤ بەردەوامە و سۆز و بەزەییشی بۆ تەنها چرکەساتێ ناپچڕێت، و ئاسانکاری خوا بۆ بەندەکانی لە چرکەساتی یەکەمدا ئەم ئایەتە پیرۆزە ئاماژەی بۆ کردووە: ﴿ثُمَّ ٱلسَّبِيلَ يَسَّرَهُۥ﴾عبس/٢٠. واتە: (لەوەودوا ژیانی بۆ ئاسان کردووەو سەرپشکی کردووە لە پەیڕەوی کردنی ڕێگەی چاکە یا خراپە، کوفر یان ئیمان).

بەو جۆرە منداڵ لە سکی دایکی دێتە دەرێ و ماوەی ژیانی کۆرپەلەیی کۆتایی دێت، تا ژیانی ساوایی دەست پێ بکات، ئا لێرەوە منداڵەکە مافەکانی لەسەر بەخێوکاری دەست پێ دەکات، کە بەجۆرەیە:

١- **دەرکردنی سەرفیترە:** بە پشتیوانی خوا لە بەندی سێیەمدا لە بارەیەوە دەدوێین -إن شاء الله-.

### ٢- مافی میراتگری:

لە (ابوهریرە)ەوەﷺ دەگێڕنەوە لە پێغەمبەری خواﷺ کە فەرموویەتی: ((**إذا استهل المولود ورث**))[٢] واتە: (گەر منداڵ هاتە ژیانی نوێ، بووەتە میراتگر).

لە (سعید کوڕی مسیب) و (جابر کوڕی عبدالله) و (مسور کوڕی مخرمە)ەوە دەگێڕنەوە کە وتویانە: پێغەمبەری خواﷺ فەرمانی داوە کە: ((**لا یرث الصبي حتى یستهل صارخاً واستهلاله أن یصبح أو یعطس أو یبکي**)).[٣] واتە: (منداڵی ساوا میراتی پێنادرێ تا دەست نەکات بە قیژەقیژ و واقەواق، ویقەکەشی ئەوەیە کە هاوار بکات یاخود بپژمێت یان بگریێ).

---

١ کتاب أنباء نجباء الأبناء لأبن ظفر المکي المتوفی سنة٥٦٥هـ، ص١٦٣.

٢ رواه ابوداود. أنظر سلسلة الأحادیث الصحیحة رقم ١٥٣.

٣ ذکره احمد بن حنبل في روایة ابنه عبدالله وصححه ابن حبان. أنظر سلسلة الأحادیث الصحیحة رقم ١٥٢.

لە (شرح السنة)دا وتوویەتی: ئەگەر کەسێك مرد و میراتگرەکەی لەو کاتەدا لەسکی دایکیدا بوو، واتە هێشتا نەبووبوو، میراتی بۆ دەوەستێنرێت، گەر بەزیندوویی لەدایك بوو ئەوا میراتی پێدەدرێت، خۆ ئەگەر بە مردوویی لەدایك بوو ئەوا میراتی پێنادرێت بەڵکو دەدرێتە کەسانی دیکەی میراتگری پیاوەکە، ئەگەر بەزیندویی لەدایك بوو پاشی ئەوە مرد، ئەوا پێی دەدرێت، ئیدی گەر واق و ویقی کرد یا نەیکرد، پاش ئەوەی کە نیشانەکانی ژیانی تێدا بینرا لە پژمین یاخود هەناسە یا جوڵە کە مانای زیندوویەتی بگەیەنێت.[1]

## ٣- مزگێنی دان و پیرۆزبایی کردن بەبۆنەی بوونی کۆرپەی نوێ:

کۆمەڵگای ئیسلامی بەپێی ئەو دەستەبەریو هاوسۆزیە کۆمەڵایەتیەی هەیەتی، لێ ناگەڕێ کە هیچ بۆنەیەك شادی بێت یان شین، بگوزەرێ بەبێ بەشداربوونی تاکەکانی نێو کۆمەڵگەی ئیسلامی، تاوەکو دیواری ئەم کۆمەڵگەیە لێکدراو و تێکهەڵکێش بێت بە شێوەیەکی بەهێز و بەتین.

وە ئەو منداڵە نوێیەی دێتە ریزی ئەو کۆمەڵگایەوە کە لای ئەو نوێیە، ئەندامەکانی ئەو کۆمەڵگایە بەخێرهاتنی لێ دەکەن و بەپەلەن لە مژەپێدانی دایك و باوکی، هەروەك فریشتەکان مژدەیان بۆ نێردراوانی خوا دەبرد - سەلامی خوا لەسەر پێغەمبەرمان و لەهەموویان بێ-: ﴿ فَنَادَتْهُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَهُوَ قَآئِمٌ يُصَلِّى فِى ٱلْمِحْرَابِ أَنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكَ بِيَحْيَىٰ مُصَدِّقًۢا بِكَلِمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَسَيِّدًا وَحَصُورًا وَنَبِيًّا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾مريم/٧. واتە: (لەکاتێکدا (زکریا) لە پەرستگادا بوو، بە پێوەوەستابوو نوێژی دەکرد، فریشتەکان بانگیان کرد: خوای گەورە مژدەت دەداتێ بە بوونی (يحيا)، کە بڕوا بە (عیسا)ی پێغەمبەری خوا دەهێنێت، و گەورەو ڕێزدارەو خۆپارێزە لە گوناهان و، پێغەمبەرێکە لە چاکان).

﴿ يَٰزَكَرِيَّآ إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَٰمٍ ٱسْمُهُۥ يَحْيَىٰ لَمْ نَجْعَل لَّهُۥ مِن قَبْلُ سَمِيًّا ﴾مريم/٧.واتە: ئەی (زکریا)! ئێمە مژدەت دەدەینێ بەوەی کە کوڕێکت پێ دەبەخشین و ناویشی (يحيا)یە، پێش ئەو کەسمان هاوناوی ئەو نەکردووە.

پەلەکردن لە پیرۆزبایی کردن و مژدەپێدان، خۆشی و ئاسودەیی زیاتر دەخاتە دڵی دایك و باوکەوە، ئەمەش کۆمەڵگەی ئیسلامی دەکاتە کۆمەڵگایەکی خاوەن پەیوەندی پتەوو بەهێز و

---

١ المنتقى من أخبار المصطفىﷺ لأبن تيمية، تحقيق محمد حامد الفقي ٤٦٧/٢.

پیرۆزبایی لە دایك و باوك دەكرێت بەو پیرۆزباییە زۆر جوانەی کە شێخ (حسن البصری) پیرۆزبایی پێکردووە: ((بورك لكم في الموهوب، وشَكَرتَ الواهب، ورُزِقتَ برَّهُ وبلغ أشدّه)). واتە: (پیرۆز بێت لێت ئەو پێدراوەو سوپاسگوزاری بەخشەر بیت و چاکەی ئەوت بەسەردا برژێ و منداڵەکەشت پێبگات و گەورەبێ. هەروەك (ابن قیم): لە(تحفة المولود)دا باسی ئەمەی کردووە).

## ٤- بانگدان بەگوێی ڕاستیدا و قامەت بەگوێی چەپیدا بدرێ:

ئیمام (احمد)و (ابوداود)و (ترمذی) دەگێڕنەوە، کاتێ (فاطمة) (حەسەن کوڕی علی)ی بوو، پێغەمبەری خواﷺ بانگی نوێژی بە گوێدا خوێند.

نهێنی و دانایی (حکمە)ی بانگ خوێندن وەك (دهلوی): دەڵێت، ئەوەیە:

(١)بانگدان لە دروشمەکانی ئیسلامە.

(٢)ڕاگەیاندنی ئایینی (محمدی)یە.

(٣)پاشان هەر دەبێت کە منداڵی تازەلەدایك بوو تایبەت بکرێت کە بانگەکە بەدەنگ بەگوێیدا بخوێندرێ.

(٤)زانراوە کە یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی بانگ ئەوەیە کە شەیتان لێی هەڵدێت، شەیتانیش ئازاری تازەلەدایکبوو دەدات لە یەکەم ساتی گەشەیەوە، هەتا لە فەرموودەدا هاتووە کە یەکەم زیڕاندنی منداڵ لەبەر ئەوەیە کە شەیتان ئازاری دەدات.[1]

(بخاری) و (مسلم) لە (ابوهریرە)وەﷺ هێناویانە کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((ما من بني آدم مولود؛ الاّ نخسه الشيطان حين يولد؛ فيستهل صارخاً من نخسه إياه، الاّ مريم وابنها)). واتە: (هەموو ئادەمیزادێك کە لە دایك دەبێت" شەیتان لەکاتی لەدایکبوونیدا چرنووقی لێ دەدات و تیی دەوەژێنێ، هەر بۆیە لەو کاتەدا و لەبەر تیوەژاندنەکەی هاوار دەکات، جگە لە مەریەم و کوڕەکەی).

پاشان (ابو هريرە) دەڵێت: ئەگەر حەزتان کرد ئەم ئایەتە بخوێننەوە: ﴿وَإِنِّيٓ أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ﴾آل عمران/٣٦. واتە: (من تۆ دەکەمە پەناگەی ئەو و نەوەکەشی کە بیانپارێزی لە شەیتانی دەرکراو لە بەزەیی خوا).

---

[1] كتاب حجة الله البالغة للدهلوي.

(ابن قيم)یش نهێنی دیکەی بانگ خوێندن بەگوێی منداڵدا ئاشکرا دەکات و دەڵێت:

(٥)بۆ ئەوەی کە یەکەمین شت کە مرۆڤ بە گوێیدا دەدرێت وشەکانی گەورەیی و بەرزی و مەزنی پەروەردگاری لەخۆ گرتبێت، لەگەڵ ئەو شایەتمانەی کە یەکەمین شتە کە بەهۆیەوە پێی دەچێتە نێو ئیسلام، ئەوەش هەروەك تەلقین وایە بۆی کە دروشمێکی ئیسلامییە لەکاتی هاتنە نێو دنیادا، هەروەك لەکاتی ماڵئاوایی لە دنیادا تەلقینی بە یەکخواپەرستی دەدرێ.

(٦)هیچ جێی نکوڵی نیە کە کاریگەری بانگدان دەگاتە دڵی منداڵ و کاری لێ دەکات، با هیچ هەستیش بەوە نەکات، لەگەڵ ئەوەشدا سوودی دیکەی هەیە، وەك:

(٧)هەڵهاتنی شەیتان لە وشەکانی بانگ خوێندن، لە کاتێکدا کە پێشتر سیرەی لێ گرتبوو تا لەدایك بێت، تا ببێتە هاوەڵی لەو نەهامەتیەی کە خوای گەورە بۆی دیاریکردووە و رازی بووە لەسەری، جا شەیتانەکەی لەیەکەم کاتی خۆ پێ‌هەڵواسینیەوە گوێی لەوە دەبێت کە لاوازی دەکات و رقی لێی دەبێتەوە.

(٨)مانایەکی دیکەشی ئەوەیە کە بانگەوازەکەی بۆ لای خوا و ئایینی ئیسلام و پەرستشی خوا پێش بانگەوازی شەیتان بکەوێت، هەروەك خوای گەورە لەسەر ئەو فیترەتە پاکەی کە بەدیهێناوەو رایهێناوە پێش شەیتان دەکەوێت کە منداڵەکە بگۆڕێت و بیگوازێتەوە، وە لەبەر حیکمەتی دیکەی تریش.[1]

جا ئیدی کۆرپە تازەبووەکە کوڕ بێت یا کچ، ئەوە بەخشش و نیعمەتی خوایە لەسەر بەندەکانی.

(طبرانی) لە (ابن عباس)ەوەم دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((**إذا ولدت الجارية بعث الله عز وجل اليها مَلَكاً يزف البركة زفاً يقول: ضعيفة خرجت من ضعيفة، القيِّم عليها معان الى يوم القيامة، وإذا ولد الغلام؛ بعث الله اليه ملكاً من السماء فقبّل بين عينيه، وقال: الله يقرئك السلام**)). واتە: (کاتێك کچ لەدایك دەبێت، خوای گەورە فریشتەیەکی بۆ لا رەوانە دەکات و خێر و بەرەکەت بەخێرایی دێنێ و دەڵێ: زەعیفەیەك زەعیفەیەکی بووە، ئەو کەسەی سەرپەرشتی ئەو کچە دەکات تا رۆژی قیامەت یارمەتی دەدرێت، گەر کوڕیشی بوو، خوای گەورە فریشتەیەکی لەئاسمان بۆ دەنێرێ و نێوچاوانی ماچ دەکات و دەڵێت: خوای گەورە سلاوت لێ دەکات).

---

١ أحكام المولود لأبن القيم.

## ٥- نزاو سوپاسگوزاری خوای گەورە لەسەر ئەم نیعمەتە نوێیە:

(حافظ ابو يعلى الموصلي) لە (مسند)ەکەیدا لە (انس)ەوەﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((**ما أنعم الله على عبد نعمة من أهل؛ أو قال: أو ولد، فيقول: ما شاء الله، لا قوة الاّ بالله، فيرى فيه آفة دون الموت**)). واتە: هەرکاتێك خوای گەورە نیعمەتی کەس و کاری بە بەندەی خۆی بەخشی، (یان دەڵێ) یاخود منداڵی پی بەخشی، بڵێت (**ما شاء الله، لا قوة الاّ بالله**)، ئەوە هیچ بەلایەکی لێ نابینێ جگە لە مردن.

## ٦- شیرینی لەدەم وەردانی منداڵ (تحنيك الولد):[1]

لە (صحیح)ی (بخاری) و (مسلم)دا هاتووە لە (ابوموسا)ﷺ کە وتویەتی: کوڕێکم لەدایك بوو، بردم بۆ خزمەت پێغەمبەری خواﷺ، ناوی نا(ابراهیم) و خورمایەکی لەناو دەمیدا نەرم و شل کردەوەو دەمی منداڵەکەی پێ شیرین کرد. (بخاری ئەوەی بۆ زیاد کردووە) دوعـای خێـری بۆ کرد کە بەرەکەت بکەوێتە ژیان و تەمەنیەوە، پاش ئەوە منداڵەکەی دامەوە.

هەر لە (صحیح)ی (بخاری) و (مسلم)دا هاتووە، لـە (هـشام کـوڕی عـروە)، ئـەویش لـە (اسماء)ەوە دەگێڕێتەوە، کە (اسماء) لە مەککەدا سکی هەبوو بە (عبـدالله کـوڕی زبـیر)، جـا وتی: لەسەر منداڵ بوون بـووم دەرچـووم، گەیـشتمە مەدینـە و لـە (قبـاء) دابـەزیم و لـەوێ منداڵەکەم بـوو، پـاش ئـەوە بردمـە لای پێغەمبـەری خـواﷺ و خـستمە کۆشـیەوە، داوای خورمایەکی کرد و لەدەمی خۆیدا نەرم و شلی کردەوەو پاشان تفاندیە دەمی، هەر بۆیە یەکەم شت کە چووە ناو سکیەوە لیکی پێغەمبەری خواﷺ بوو، وتی: پاشـان بـە خورماکـە دەمـی منداڵەکەی شیرین کرد، دوای ئەوە دوعای فەڕ و بەرەکەتی بۆ کرد، جـا ئـەو منداڵـە یەکـەم منداڵی لەدایکبووی (مهاجر)ەکان بوو لە ئیسلامدا لە شاری مەدینەدا، (اسماء) وتی: زۆر زۆر پێی خۆشحاڵ بوون، چونکە پێشتر پێیان وتبوون کە جوولەکـە جادوویـان لـێکردوون و ئیـدی منداڵتان نابێت.

---

١ دکتۆر (فاروق مساهل) لە گۆڤـاری (الأمـــة)ی قەتـەری ژمـارە(٥٠) لـە وتارێکیـدا بـە ناونیشانی (اهتمام الإسلام بتغذية الطفل =گرنگیدانی ئیسلام بە خـۆراکی منـداڵ)، لەسـەر فـەرموودەی (التحنيك) دەڵێت: ئەو مژینە بەهەموو پێوانەیەك موعجیزەیەکی پزیشکی پێغەمبەری خـواﷺیە کە مرۆڤایـەتی چواردە سەدە ئاوا مانەوە تا ئاشنا بن بە ئامانج و حیکمەتی شـیرین کردنـی دەمـی منـداڵ، ئینجـا بـۆ پزیشکەکان روون بۆوە کە هەموو منداڵێکی بچووك (بەتایبەتی تازە لەدایك بوو و شیرەخۆر) روبەڕووی مردن دەبنەوە گەر ئەم دوو شتەیان لێ رووبدات:

(١) گەر بەهۆی برسێتیەوە بڕی شەکر لە خوێن کەم بێت. (٢)گەر پلەی گەرمی جەستەیان لەکاتی وەبەرکەوتنی کەشی ساردی دەوروبەرەوە دابەزیە خوارەوە.

هەروەها (مسلم) لە (صحیح)ەکەیدا دەگێڕێتەوە لە (عائشە)ەوە ڵ کە منداڵیان دەهێنایە لای پێغەمبەری خواﷺ، ئەویش دوعای فەڕ و بەرەکەتی بۆ دەکردن و خورمای شلکراوەی دەکرد بە دەمیانەوە، جارێك منداڵێکیان هێنا بۆ لای، منداڵەکە میزی پێداکرد، پێغەمبەری خواﷺ داوای ئاوی کرد و شوێنی میزەکەی پێ تەڕ کرد.

ئیمام (نووی):لە شیکردنەوەی (فیبرك علیهم)دا دەڵێت: واتە داوای فەڕی بۆ دەکردن و دەستی بەسەریاندا دەهێنا، بنەڕەتی (برکة = فەڕ)یش چەسپاندنی زۆربوونی چاکەیە.

وە لەبارەی وشەی (فیحنکهم)، شارەزایانی زمان دەڵێن: (تحنیك) مژینی خورما یاخود هاوشێوەی ئەو، پاشان مەڵاشووی منداڵەکەی پی چەور دەکرێ، لەم رووەوە (حنکتە) لە زمانی عەرەبیدا بە دوو شێوە بەناوبانگە،(حنکتە) بە (تخفیف) سوککراوەیی، هەروەها بە (تشدید) قورسکراوەیی، لەم گێڕانەوەیەشدا بە (تشدید) وقورسکراوی هاتووە، ئەمەش ناودارترینیانە، وە وتەی (بصبي يَرضع) (یاء فتحەی لەسەرە) واتە: (رضیع) شیرەخۆر، واتە ئەو منداڵەی کە لەشیر نەبڕابێتەوە.

بەڵام یاساکانی ئەم دەروازەیە ئەمانەیە:

- پەسەندی شیرین کردنی دەمی ساوای تازەلەدایك بووی تێدایە.

- خەڵکی چاکەخواز و خاوەن فەزڵ دەمی منداڵ شیرین بکەن و دوعای بۆ بکەن.

- هەڵگرتنی منداڵان و بردنیان بۆ لای کەسانی باش پەسەندە، تا بەهۆیانەوە فەرڕدار بێت، ئیدی ئەو پەسەندیە لەکاتی لەدایکبوونیدا بێت یاخود دواتر وەك یەکە.

- هاندانی تێدایە بۆ چاك هەڵسوکەوت کردن و نەرم و نیانی و خۆبەکەم زانین و هاوسۆزی بەرامبەر منداڵ و کەسانی دیکە.[1]

## - چۆنیەتی شیرینی بەدەمەوەکردنی پێغەمبەری خواﷺ بۆ ساوای تازەلەدایك بوو:

لە (انس)ەوەﷺ دەگێڕنەوە کە وتویەتی: کاتێك (ام سلیم) کوڕێکی بوو، بە مندا ناردی بۆ لای پێغەمبەری خواﷺ، منیش هێنام و خورمایشم لەگەڵ خۆم هەڵگرت و بردمە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ، عەباکەی بەسەر شانیەوە بوو حوشترێکی ئامادە دەکرد، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: خورمات پێیە؟ دەڵێ: وتم بەڵێ، خورماکەی وەرگرت و خستیە دەمیەوەو تێکەڵی کرد، پاشان بە لیکەکەی کۆی کردەوەو شلی کردەوە، پاشان دەمی کردەوە، ئینجا

---

١ شرح صحيح مسلم، باب حكم بول الرضيع وكيفية غسله.

خورمای شلکراوەی دا بە منداڵەکەو منداڵەکەش بە زمانی دەیلێستەوە، پاشان پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((حب الأنصار التمر)): ئەنصارییەکان حەز بە خورما دەکەن.

پاشان لە دەمیدا نەرم و شلی کردەوەو کردی بە دەمیەوە، و ناوی نا (عبداللە)، دواتر لەنێو ئەنصاریەکاندا گەنجی لەو باشتر نەبوو.[1]

## دووەم: کاری ڕۆژی حەوتەم:

### ١- ناونانی منداڵ:

کە منداڵ لەدایك دەبێت یەکەمین ڕێزلێنان و چاك بوون بۆی ئەوەیە کە ناوێکی چاك و نازناوێك(کنیە)ی جوان و ناسك و پیرۆزی لێ بنرێت، چونکە ناوی چاك لەگەڵ یەکەم بیستندا پێگەو شوێنێکی لە دەروونەکاندا هەیە، هەر بەو جۆرەش خوای گەورە فەرمانی بە بەندەکانی کردوەو لەسەری پێویست کردوون کە بەناوە جوانەکانی لێیبپاڕێنەوە، وەك دەفەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ فَٱدْعُوهُ بِهَا ۖ وَذَرُوا۟ ٱلَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِىٓ أَسْمَـٰٓئِهِۦ ۚ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾الأعراف/ ١٨٠.واتە: هەرچی ناوە جوان و پیرۆزەکان هەیە هەمووی شایستەی خوایە، جا بەو ناوانە دوعا و نزا بکەن و هانا وهاواری بۆ بەرن، واز بێنن لەوانەی کە ناوە پیرۆزەکانی دەشێوێنن، لە ئایندەدا پاداشتی کاروکردەوەکانیان وەردەگرن.

هەروەها خوای گەورە فەرمانی داوە کە بە سیفەتە بەرزەکان وەسفی بکرێت، فەرموویەتی: ﴿قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱللَّهَ أَوِ ٱدْعُوا۟ ٱلرَّحْمَـٰنَ ۖ أَيًّا مَّا تَدْعُوا۟ فَلَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ﴾الإسراء/ ١١٠. واتە: (پێیان بڵێ: ئێوە لە نزاو دوعاتاندا هاواری (اللە) بکەن، یان بە سیفەتی پیرۆزی (الرحمن) هانای بۆ بەرن، بەهەر ناوو سیفەتێکی جوان و بەرز هاواری بۆ بکەن و نزا بکەن دروستە، چونکە ئەو خاوەن هەموو سیفات و ناوە پیرۆز و بەنرخەکانە).

پێغەمبەری خواﷺ باشترین ناوی لە منداڵەکانی خۆی دەنا، وە (محمد کوڕی حنفیە) لەبەر پیرۆزیو ڕێز و بەگەورەزانین و بەباش دانانی ناوی پێغەمبەرﷺ ئەو ناوەی لەخۆی نا.[2] ئەوەش (ابو یعلی) لە (محمد کوڕی حنفیە)و ئەویش لە (علی)ﷺ دەگێڕێتەوە[3] کە مۆڵەتی لە

---

١ رواه احمد في مسنده ٨٨/٣ ومختصراً في ١٨٨/٣، وكذا رواه مسلم والبخاري.

٢ مغني المحتاج (٢٩٥/٤).

٣ رواه ابويعلى في مسنده ٢٥٩/١ بسند صحيح. قال المحقق (حسين اسد): ورواه ابوداود والترمذي

پێغەمبەری خواﷺ وەرگرت کە ئەگەر لەدوای ئەو کوڕێکی بوو بەناوی ئەوەوە نـاوی بنێـت و هەمان نازناوی لیٚ بنێت؟ دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ مۆڵەتی پێدان، وە دەڵێت: ناوی (محمد) بوو و نازناویشی (ابوقاسم) بوو.

(ابوداود) و (نسائی) لە (ابو وهبی جشمی) دەگێڕنەوە کە وتویەتی: پێغەمبـەری خـواﷺ فەرموویـەتی: ((تسموا بأسماء الأنبياء، وأحب الأسماء الى الله تعالى: **عبدالله وعبـدالرحمن، وأصدقها: حارث وهمام، وأقبحها حرب ومرّة**)).[1] واتە: منداڵەکانتان بەناوی پێغەمبەرانەوە ناو بنێن، خۆشترین ناویش لای خوای گەورە (عبـدالله و عبـدالرحمن)ـە، وە راسـتگۆترینیش (حارث و همام)ـە، و ناشرینترین ناویش (حرب و مرّة)یە.[2]

هەروەها (ابوداود)یش لە (ابودرداء)ەوە دەگێڕێتـەوە کـە وتویـەتی: پێغەمبـەری خـواﷺ دەفەرموێت: ((**إنكم تُـدعَوْنَ يـوم القيامـة بأسمـائكم، وأسمـاء آبـائكم، فاحـسنوا أسماءكم**)).[3] واتە: (ئێوە لەرۆژی قیامەتدا بەناوی خۆتان و باوکتانەوە بانگ دەکرێن، جا لەبەر ئەوە ناوی چاك لە خۆتان بنێن).

لە (ابن عمر)ەوەش دەگێڕنەوە[4] کە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویـەتی: ((**أحبُّ الأسماء الى الله تعالى: عبدالله وعبدالرحمن**)). واتە: (خۆشەویـستترین نـاو لای خـوای گـەورە (عبـدالله و عبدالرحمن)ـە).

هەروەها (طبرانی) لە (ابو بسره) بە (مرفوع)ی دەگێڕێتـەوە: ((**خيرُ أسمـائكم: عبـدالله وعبدالرحمن وحارث**)).[5] واتە: (چاکترینی ناوەکانتان (عبدالله و عبدالرحمن و حارث)ن).

هەر بۆیە هاوەڵان دەستیان کرد بە جێبەجێ کردنی ئەو فەرموودەیە، هـەتا (ابـن صـلاح)

---

وابن سعد في الطبقات والحاكم في المستدرك وصححه ووافقه الذهبي.

١ في سنده مجهول لكن يشهد لبعضه أحاديث صحيحة، أنظر جامع الأصول ١/٣٥٧ ت.الأرناؤوط.

٢ **چونکە (حارث) جوتیار یان کاسبکار دەگرێتەوە، ئادەمیزادیش بە سروشت و بە ویستی خۆی لەوە بەدەر نیە، (همام)یش لەسەر کێشی (فعّال) ئەو کەسەیە کـە ئەگـەر ویستی کارێك بکات هـەوڵی زۆری بۆ دەدات، هەموو کەسێکیش هەوڵ بۆ کارێك دەدات چ چاك بێت یان خراپ، (حرب) واتە شـەڕ و جەنگ، (مرّة) واتا تاڵ، (ابو مرّة)ش کونیەی شەیتانە. -وەرگێڕ-**

٣ وأخرجه بن حبان في صحيحه ورجاله ثقات الاّ أن فيه انقطاعاً.

٤ رواه مسلم وابوداود والترمذي

٥ صحيح، أنظر صحيح الجامع رقم (٣٢٦٩).

دەگێڕێتەوە کە لەنێو هاوەڵاندا نزیکەی (٢٢٠) کەسیان منداڵەکانیان ناوناوە (عبداللە)، (العراقی)یش وتوویەتی: لە کۆی هەموویان نزیکەی (٣٠٠) پیاو ناویان (عبدالله) بووە.[١]

لەم بارەیەوە لەو شتە جوانانەی کە پێغەمبەری خواﷺ کردی، ئەوەبوو ئەو ڕۆژەی کوڕەکەی (عباس) لەدایك بوو ناوی نا (عبدالله):

لە (ابن عباس) دەگێڕنەوە وتوویەتی: (ام فضل کچی حارث) بۆی باسکردم و وتی: لەکاتێکدا من بەرێگادا دەڕۆیشتم و پێغەمبەری خواﷺ لە ژوورەوە بوو، فەرمووی پێم: ئەی (ام فضل)! وتم: لە خزمەتتدام ئەی پێغەمبەری خوا! فەرمووی: تۆ سکت هەیە و سکەکەت کوڕە، وتم: چۆن؟! ئەی قوڕەیش سوێندیان خواردووە لەسەر ئەوەی کە ئافرەتان منداڵیان نابێت؟ فەرمووی: هەر ئەوەیە کە من پێم وتیت، کاتێك لەدایك بوو بیهێنە بۆم.. کاتێك منداڵەکەم بوو بردم بۆ لای پێغەمبەری خواﷺ و ناوی نا (عبدالله)، پاشان فەرمووی: ((**أذهبي به فلتجدنه كيساً**)) واتە: بیبەرەوە، کەسێکی هۆشمەند دەردەچێت.

وتی: منیش چوومە لای (عباس) و ئەو هەواڵەم پێدا، زەردەخەنە گرتی و چوو بۆ لای پێغەمبەری خواﷺ، (عباس) پیاوێکی جوانی بالآبەرز بوو، کاتێك پێغەمبەری خواﷺ چاوی پێی کەوت هەستا لەبەری و نێوچاوانی ماچ کرد و لەلای راستیەوە داینا، پاشان فەرمووی:((**هذا عمي، فمن شاء فليباه بعمه**)). واتە: (ئەوە مامە، ئەوەی ئارەزووی لێبوو با شانازی بە مامیەوە بکات).

(عباس) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا! واش نا.. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((**ولم لا أقول وأنت عمي وبقية آبائي، والعم والد**)).[٢] واتە: (بۆ ئەوە نەڵێم کە تۆ مامی و بەجێماوی باپیرانمی، مامیش وەك باوك وایە).

(مسلم)و (ابو داود) لە(انس)ەوەرضي الله عنه دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((**ولد لي الليلة غلام؛ فسميته باسم أبي ابراهيم**)). واتە: (ئەمشەو کوڕێکمان بوو، بەناوی باوکمەوە ناوم نا (ابراهیم)).

(مسلم)یش لە (صحیح)ەکەیدا لە (جابر)ەوەرضي الله عنه هێناویەتی کە یەکێك لە ئێمە کوڕێکی بوو، ناوی نا (قاسم)، پێیان وت: بە نازناوی (ابوقاسم)ەوە ناوت نابەین و بەچاوی رێزەوە

---

١ عن (المنهل اللطيف في أصول الحديث) للشيخ محمد بن علوي المالكي الحسني ص١٩٤.

٢ عن (المنهل اللطيف في أصول الحديث) للشيخ محمد بن علوي المالكي الحسني ص٢٣٠.

سەیرت ناکەین، ئەویش چووە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ و ئەوەی بۆ باس کرد، پیغەمبەرﷺ فەرمووی: کوڕەکەت ناو بنێ (عبدالرحمن).

هەروەها (مسلم) هێناویەتی کە: پیاوێك لە ئێمە کوڕی بوو ناوی نا (محمد)، کەس و کارەکەی پێیان وت: رێگەت پێنادەین بەناوی پێغەمبەری خواﷺوە ناوی بنێیت، ئەویش منداڵەکەی دا بە کۆڵیا و بردی بۆ لای پێغەمبەری خواﷺ و پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا! کوڕێکمان بووەو منیش ناوم ناوە (محمد)، بەڵام کەس و کارەکەم پێم دەڵێن: لێ ناگەڕێین بەناوی پێغەمبەری خواﷺوە منداڵت ناو بنێیت؟ پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: **((تسمّوا باسمي، ولا تكتنوا بكنيتي، فإنما أنا قاسم؛ اقسم بينكم))**. واتە: (بەناوی منەوە منداڵ ناو بنێن، بەڵام بەنازناوی منەوە نازناو دامەنێن، چونکە من (قاسم)م و دابەشکەری نێوانتانم).

پێغەمبەری خواﷺ بڕیاری ئەوە دەدات کە نەتەوە بڕوادارەکانی پێشوو منداڵەکانیان بەناوی پێغەمبەرەکانیان و پیاوچاکەکانیەنەوە ناو دەنا:

(مسلم) لە (مغيره کوڕی شعبه)ەوەﷺ هێناویەتی کە دەڵێت: کاتێك چوومە (نجران)، پرسیاریان لێ کردم و وتیان: ئێوە دەخوێننەوە (يا اخت هارون)، کەچی موسا پێش (عیسا) بەوەندەو بەوەندە ساڵە هاتووە؟ کاتێك هاتمەوە بۆ خزمەت پێغەمبەری خواﷺ لەو بارەیەوە پرسیارم لێکرد، فەرمووی: **((إنهم كانو يسمّون بأنبيائهم والصالحين قبلهم))**.[1] واتە: (ئەوان منداڵەکانیان بەناوی پێغەمبەران و پیاوچاکانی پێش خۆیانەوە ناو دەنا).

هەر بۆیە هاوەڵی پایەبەرز (زبير کوڕی عوام) ناوی یاوەرە شەهیدەکانی بۆ منداڵەکانی هەڵدەبژارد، بەو ئومێدەی کە هەمان رێگەی ئەوان بگرن و بگەنە پلەی شەهیدی لەپێناوی خوادا:

(زوبیر)ﷺ دەڵێ: (طلحة کوڕی عبدالله تیمی) منداڵەکانی خۆی بەناوی پێغەمبەرانەوە ناو دەنێ، دەشزانێ کە پاش (محمد)ﷺ هیچ پێغەمبەرێکی دیکە نایەت، منیش منداڵەکانم بەناوی شەهیدەکانەوە ناو دەنێم، بەڵکو شەهید بن.

هەر لەسەر ئەو بنەمایەو ئەو رێبازە، ناوی منداڵەکانی بەم جۆرە لێنا: (عبدالله)ی بەناوی (عبدالله کوڕی جحش)ی شەهیدی غەزای (أحد)، و (منذر)ی بەناوی (منذر کوڕی عمرو الانصاری) لە بەنی سەعد، و (عروه)ی بەناوی (عروه کوڕی مسعود الثقفی)، و (حمزه)ی

---

١ ورواه احمد والترمذي والنسائي وعبد بن حميد وابن ابي شيبة وغيرهم. أنظر حسن الأسوة ص١٣٥.

بەناوی (حمزةکوڕی عبدالمطلب)ی شەهیدی غەزای (أحـد)و، (جعفـر)ی بـەناوی (جعفـر کـوڕی ابوطالب) شەهیدی غەزای (مؤتە)ـ و (مصعب)ی بەناوی (مصعب کوڕی عمیر) هەڵگری ئاڵاو شەهیدی غەزای (احد)، (عبیدە)ی بەناوی (عبیدە کوڕی حارث) شـەهیدی غـەزای (بـدر)، و (خالد)ی بەناوی (خالد کوڕی سعید) شەهیدی (مرج الـصفر)، (عمـر) بـەناوی (عمـر کـوڕی سعید)ی برای (خالد) کە لە ڕۆژی (یەرموك)دا شەهید بوو، ناونا.[1]

پاش ناونانی منداڵی یەکەم، دایك و باوکی بەناوی ئەوەوە دەناسرێن:

(ابوداود) و (نسائی) لە (ابوشریح)ەوە دەگێڕنەوە، کە ئەو پێـشتر بـە (ابـو حکـم) ناویـان دەبرد، پێغەمبەری خواﷺ پێی فەرموو: ((**إن الله هم الحَكَم، وإليه الحُكْم**)). واتـە: (خـوای گەورە خۆی دادوەرەو دادوەری تەنها بۆ ئەوە).

ئەویش وتی: هۆزەکەم لەهەر شتێکدا پێك نـەهاتبن هاتوونەتـە لام و منـیش داوەریـم لـە نێویاندا کردووە، هەردوولاشیان ڕازی بووە! پێغەمبەری خـواﷺ فـەرمووی: ((**ما أحسن هذا! فما لك من الولد؟**)) واتە: ئەوە زۆر باشە! ئایا کـوڕت هەیـە؟ وتـی: (شـریح) و (مـسلم) و (عبدالله)م هەیە. فەرمووی: کامیان گەورەکەیانە؟ وتی: (شریح)، فـەرمووی: ((**أنـت ابـو شریح**)) تۆ باوکی (شریح)یت.[2]

(حاکم)یش ئەمەی گێڕاوەتەوەو ئەوەشی بۆ زیاد کردووە: جا دوعای بۆ ئەوو کوڕەکەشی کرد.

لە (شرح السنة)دا هاتووە: (الحَكَم = دادوەر) ئەو فەرمان بەدەستەیە کە بڕیارێکی دا ڕەت نەکرێتەوە، ئەم سیفەتەش جگە لە خوای گەورە شایستەی کەسی دیکە نیـە، هـەروەك خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَٱللَّهُ يَحْكُمُ لَا مُعَقِّبَ لِحُكْمِهِۦ﴾الرعـد/٤١. واتـە: خـوا خـۆی فەرمانڕەوایی دەکات، کەس ناتوانێت بەدوای فەرمانەکەیدا بچێت و هەڵیوەشێنێتەوە.

پیاو بەناوی کوڕە گەورەکەیەوە بناسرێت، گەر کوڕی نەبوو ئەوە بەناوی گـەورەترین کـچی بناسرێ، ئافرەتیش هەر بەو شێوەیە بەناوی گەورەترین کوڕیەوە دەناسرێ، خـۆ ئەگـەر کـوڕی نەبوو ئەوا بەناوی گەورەترین کچیەوە دەناسرێ.[3]

---

١ أنظر تربية النشء في ظل الإسلام ص١٢٤ للدكتور محمود محمد عمارة.

٢ اسناده صحيح. أنظر جامع الأصول ١/٣٧٣ ت.الأرناؤوط.

٣ شرح السنة(٦/٣٩٤) والحديث رواه أبوداود والنسائي والبخاري في الأدب المفرد والحاكم، كذا قاله

هەروەها دەکرێ منداڵیش نازناوی بۆ دابنرێ، هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ منداڵی بچووکی بە نازناوەکەی بانگ دەکرد نەك بە ناوەکەی، بە مەبەستی گاڵتەکردن لەگەڵیدا، کە دەیفەرموو: ((يا أبا عمير! ما فعل النغير))[1] واتە: (ئەی (ابوعمیر) فەرخەچۆلەکەکە چی کرد؟)

## شەیتان ناوی ناشیرین و ناشەرعی دەخاتە دڵانەوە:

لەبەر ئەوە پیاوی بەختەوەر و ژنی بەختەوەر ئەو کەسەیە کە لەو ناوانە دوور بکەوێتەوە:

(ترمذی) لە (سمرە کوری جندب)ەوە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی:((**لما حملت حواء طاف بها ابليس، وكان لا يعيش لها ولد، فقال: سميه عبدالحارث، فإنه يعيش، فسمته فعاش، وكان ذلك من وحي الشيطان وأمره**)).
واتە:(کاتێك حەوا سکی هەبوو، شەیتان بەدەوریدا سوڕایەوە، دایە حەوا کوری بۆ نەدەما (دەمردن)، شەیتان پێی وت: ناوی بنێ (عبدالحارث) ئەوا دەژی و دەمێنێ، ئەویش ئەو ناوەی لێنا و ژیا، ئەوەش لە نیگا و سروشی شەیتان و فەرمانەکانیەتی).

لەو ناوانەی کە پەسەند نیە بۆ ناولێنانی منداڵ: ((**لا تسمين غلامك يساراً؛ ولا رباحاً؛ ولا نجيحاً؛ ولا افلح**)).[2] واتە: (کورەکەت ناومەنێ (یسار) و (رباح) و (نجیح) و (افلح)).[3]

(ترمذی) لە (عمر)ەوە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەوفەرموێت: ((**لأنهين أن يمسى رافع؛ وبركة؛ ويسار**)).[4] واتە: (قەدەغەی دەکەم کە منداڵ بەناوی (رافع) و (برکە) و (یسار) ناوبنرێت).[5]

ئەوەی کە سەرنجت رادەکێشێ ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ گرنگی داوە بە گۆڕینی ناوە ناشیرینەکان:

(ترمذی) لە (عائشە)ەوە هێناویەتی کە پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی ناشیرینی دەگۆڕی.[6]

---

محقق شرح السنة، طبع دار الكتب العلمية.

١ رواه مسلم.

٢ رواه مسلم واللفظ له والترمذي وابوداود.

٣ **(یسار) بە مانای (چەپ)و (رباح) ئەو شتەی بەدەست خراوەو براوەتەوە(قازانج)، (نجیح) ئەوکەسەیە کە هەموو رایەکی راست بێت، (افلح) ئەوکەسەیە کە هەر شتێکی کە دەیەوێت بەدەستی دێنێت. - وەرگێڕ**

٤ اسناده قوي، أنظر جامع الأصول ٣٧١/١ ت.الأرناؤوط.

٥ **(رافع) واتە بەرزکەرەوە، (برکە) واتە فەڕ و بەرەکەت. -وەرگێڕ-**

٦ اسناده صحيح، المصدر السابق، وأنظر صحيح الجامع رقم٤٩٩٤وأنظر سلسلة الأحاديث الصحيحة

جا لەو ناوە ناشیرینانەی کە گۆڕی، ناوی (برّة) بوو کە گۆڕی بۆ (زینب):

(مسلم)و (ابو داود) لە (محمد کوڕی عمرو کوڕی عطاء)ەوە: دەگێڕنەوە کە دەڵێت: کچەکەمم ناو نا (برّة)، (زەینەب کچی ابو سلمە) پێی وتم: پێغەمبەری خواﷺ قەدەغەی کردووە ئەم ناوە لە منداڵ بنرێت، لەکاتێکدا من بە منداڵی ناونرابووم (برّة)، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((لا تزكوا أنفسكم، الله أعلم بأهل البر منكم)). واتە: (تەزکیەی خۆتان مەکەن (خۆتان بەپاك دامەنێن) خوا دەزانێ کێ چاکەکارە لەناوتاندا).[1]

وتیان: ئەی ناوی بنێین چی؟ فەرمووی: ناوی بنێن (زینب).

هەروەها ناوی (عاصیە)ی گۆڕی بۆ (جمیلە):[2]

(مسلم)و (ابو داود) لە (ابن عمر)ەوە م گێڕاویانەتەوە کە پێغەمبەری خواﷺ ناوی (عاصیە)ی گۆڕی و ناوی نا (جمیلە).

ناوی (اصرم)یشی گۆڕیوە بۆ (زُرْعة):[3]

(ابو داود) لە (بشیر کوڕی میمون)ەوە رضي الله عنه هێناویەتی، ئەویش لە مامی (اسامە کوڕی اخدری)یەوە، دەگێڕێتەوە کە پیاوێك هەبوو ناوی (اصرم) بوو، لەگەڵ کۆمەڵێکدا بوو بۆ خزمەت پێغەمبەری خواﷺ هاتن، پێغەمبەرﷺ پێی فەرموو: ناوت چیە؟ وتی: (اصرم)، فەرمووی بەڵکو تۆ (زُرعة)یت.

## چۆن ناوێکی چاك بۆ منداڵەکەت هەڵدەبژێریت؟

سێ ئەگەر هەیە کە پێشەوا (ماوردی) پێشکەشی دەکات:

١/ ناوەکە لە ناوەکانی کەسانی دیندار وەرگیرابێت، لە پێغەمبەران و نێردراوان و بەندەچاکەکانی خوا، نیەتیش لەوەدا نزیك بوونەوە بێ لەخوای گەورە، بەهۆی خۆشەویستیان و زیندوو راگرتنی ناوەکانیان و شوێنکەوتنی خواوە بێ، لە هەڵبژاردنی ناوی ئەو دۆست و (أولیاء)انەی خواو ئەوەی کە لە ئایین هێناویانە، هەروەك باسیشمان کرد کە خۆشەویستترین ناو لای خوای گەورە (عبدالله) و هاوشێوەکانیەتی.

---

رقم٢٠٧.

١ (برّة) واتە چاکەکار و سودمەند. -وەرگێڕ-

٢ (عاصیە) واتا یاخی، و (جمیلە) واتا جوان. -وەرگێڕ-

٣ (اصرم) لە (صرم)ەوە هاتووە و بەمانای بڕین دێت، (زُرْعة) لە (زَرْع)ەوە هاتووە بەمانای تۆو دێت. -وەرگێڕ-

(شیخ دهلوی) وتوویەتی:[١] بزانە کە مەزنترین مەبەستە شەرعیەکان ئەوەیە یادی خوا بێتە ناو زیاترکردنی داواکردنی یارمەتیە پێویستیەکانیان تا هەموو ئەوانە ببێتە زمان و بانگی بکەن بۆ لای حەق، وە لە ناونانی منداڵدا بەو جۆرە هەستکردنە بە یەکخواپەرستی، هەروەها عەرەبەکان و خەڵکانی کەش ناوی ئەوانەیان لە منداڵەکانیان دەنا کە دەیانپەرست، کاتێك کە پێغەمبەرﷺ هات تا ڕێورەسمی یەکخواپەرستی بەجێ بگەیەنێت، لەم ڕووەوە پێویستی کرد کە بەهەمان شێوە لە ناونانیشدا سوننەت پەیڕەو بکرێت، ئەو دوو ناوەش[٢] کە لەهەموو ناوەکانیتر خۆشەیستترن کە بدرێنە پاڵ ناوێك لە ناوەکانی خوای گەورە لەبەر ئەوەیە کە ئەو دوانە بەناوبانگترین ناوی خوان، وە ناتوانرێت لە کەسی دیکە بنرێت، بە پێچەوانەی ئەوانی دیکەیان، و تۆش دەتوانی لەمەوە نهێنی خۆشەویستی ناونانی منداڵ بە (محمد) و (احمد) تێبگەیت، خەڵکانێکی زۆر شەیدای ناونانی منداڵەکانیانن بەنێوی پێشینە مەزنەکانیانەوە، وە خەریکە وای لێ دێت کە ئەوە ببێتە خۆ بەرزکردنەوە بە ئاین و لەو ئاستەدا بێت دان بەوە بهێنرێ کە ئەوە لە ئەهلی دینە.

٢/ یا ئەوەتا کە ناوەکە پیتی کەم بێت و لەسەر زمان سانا بێت، و لە دەربڕینـدا ئاسان بێت، بە خێرا ببیسترێت.

٣/ یاخود ئەوەیە کە چاك بێت لە واتادا و گونجاو بێت لەگەڵ بارودۆخی منداڵی ناونراودا، باوبێت لەناو کەسانی چینەکە و میللەتەکەیو کەسانی ئاستی ئەودا.[٣]

## ٢- سەرتاشینی منداڵ:

ئیمام (مالك) دەگێڕێتەوە کە (فاطمة) کێشانەی قژی (حسن) و (حسین) و (ام کلثوم)ی کرد و هێندەی کێشەکەی زیوی بەخشی.

(ابن اسحاق)یش باسی دەکات کە کاتێ (فاطمة) (حسین)ی بوو، پێغەمبەری خواﷺ پێی فەرموو: ((**یا فاطمة! أحلقي رأسه وتصدقي بزنة شعره فضة**)). واتە: (ئەی (فاطمة)! سەری بتاشەو هێندەی کێشی قژی زیو بکەرە خێر).

جا کێشەکەی هێندەی درهەمێك یان چەند درهەمێك بوو.

---

١ في كتابه حجة الله البالغة.

٢ عبدالله و عبدالرحمن.

٣ نصيحة الملوك ص١٦٦.

(شیخ دهلوی): دەربارەی ئەم فەرموودەیە دەڵێت: هۆی زیو بەخشین ئەوەیە، کاتێك منداڵ لە کۆرپەلەییەوە گوێزرایەوە بۆ منداڵێتی، ئەوە بەخششێکە و پێویستە سوپاسگوزاری لەسەر بکرێت و چاکترین شت بۆ سوپاسگوزاری ئەوەیە هەست بکرێت کە قەرەبووی کردۆتەوە، لەکاتێکدا کە قژی کۆرپە پاشماوەی گەشەی کۆرپەلەییەتی، و لێکردنەوەی نیشانەیە بۆ سەربەخۆیی بوونی گەشەی منداڵی، و پێویست کراوە کە فەرمان بکرێت قژەکە بە زیو بکێشرێت، بەڵام تایبەتمەند کردنی زیو بۆ ئەوەیە کە ئاڵتون گرانترەو تەنها دەوڵەمەند دەستی دەکەوێت، گشت شت و مەکێکیش هیچ گرانایيەکی نیە لە کێشانەی قژی منداڵدا.

## ٣- گوێزەبانە (حەوتیانە = العقیقة):[1]

لە (ام کرز الکعبیه)ەوە دەگێڕنەوە[2] کە پرسیاری لە پێغەمبەری خواﷺ کردووە دەربارەی گوێزەبانە، ئەوی فەرموویەتی: ((**عن الغلام شاتان و عن الجارية شاة، لا يضركم أذكراناً كنَّ ام إناثاً**)). واتە: (بۆ کوڕ دوو کاوڕ سەردەبڕدرێت و بۆ کچیش یەك کاوڕ، هیچ زیانی نیە بۆتان نێر بێت یان مێ).

هەروەها (سمره) وتوویەتی:[3] پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((**كل غلام رهينة[4] بعقيقته؛ تذبح عنه يوم سابعه، ويسمى فيه ويحلق رأسه**)). واتە: (هەموو منداڵێکی تازە لەدایکبوو گەردن بەندی ئەو گوێزەبانەیە کە لە ڕۆژی حەوتەمی تەمەنیدا بۆی سەردەبڕدرێت، هەر لەو ڕۆژەدا ناودەنرێت و سەری دەتاشرێت).

---

١ لە کتێبی (العین)ی (خلیل کوڕی احمد الفراهیدی)دا لاپەڕە٦٢ هاتووە دەڵێت: عەرەب دەڵێن (عق رجل عن ابنه) ئەگەر گوێزەبانەکەی تاشی وکاوڕی سەربڕی، ئەوا ئەو کاوڕەی کە سەردەبڕدرێت بۆ ئەو مەبەستە ناودەبرێت بە (عقیقه = گوێزەبانە). و(العقة: العقيقة، وتجمع عقاً) گوێزەبانەش ئەو قژەیە کە بەسەر منداڵی تازە لەدایك بووەوە هەیە، بەو کاوڕە ناودەبرێت کە بۆ ئەو گوێزەبانەیە سەردەبڕدرێت، ناوی سەربڕاو دەکەوێتە سەر خواردنەکە، وە وتراوە (اعقت الحامل) چونکە گوێزەبانەی کردووە لەسەر منداڵەکەی لە سکیدا، کە ئەویش (مُعقّ و عقوق)ـە.

٢ رواه احمد والترمذي وابو داود والنسائي والحاكم وابن حبان في صحيحه عنها.

٣ رواه اصحاب السنن، والحديث صحيح، انظر صحيح الجامع ٤١٨٤ وقال رواه الترمذي والحاكم.

٤ (رهينة) واتە بارمتە، واتە وەك شتی بارمتەکارو کە ناتوانرێ سودی لێ وەربگیرێت یان سودی لێ ببینرێت بەبێ کردنەوەی بارمتەکە، لەوانەیە مەبەستی لەوە ساغی منداڵی تازە لەدایکبوو بێت لەگەڵ پەروەردەبوون لەسەر ئەو شێوازە ویستراوە گەردنبەند بێت بە گوێزەبانەکەوە، ئەمەیە مانای (عقیقە = گوێزەبانە) هەروەك (دهلوی) دەڵێت.

ئیمام (احمد)یش لە (اسماء کچی یزید)ەوە بە (مرفوع)ی گێڕاویەتیەوە: ((**العقيقة حق، عن الغلام شاتان متكافئتان وعن الجارية شاة**)).[١] واتە: (گوێزەبانە حەقە، بۆ کوڕ دوو کاوڕی وەك یەك و بۆ کچیش یەك دانە).

هەروەها (طبرانی) لە (ابن عباس)ەوە بە (مرفوع)ی دەگێڕێتەوە: ((**عن الغلام عقيقتان، وعن الجارية عقيقة**)).[٢] واتە: (بۆ کوڕ دوو گوێزەبانە (دوو کاوڕ)، و بۆ کچیش یەك گوێزەبانە).

(طبرانی) و (ضیاء) لە (بریدە)ەوە بە (مرفوع)ی دەگێڕنەوە: ((**العقيقة تذبح لسبع؛ أو لأربع عشرة، أو لإحدى وعشرين**)).[٣] واتە: (گوێزەبانە لە حەوتەمین ڕۆژ، یاخود چواردەمین ڕۆژ، یان بیست و یەکەمین ڕۆژ سەر دەبڕدرێت).

(انس)یش رضي الله عنه قوربانی دەکردە گوێزەبانەی کوڕەکانی.

لەبەر گرنگی دانی زۆری پێشینانی چاك بە گوێزەبانە، ڕێگە درابوو کە ئەو کەسەی پارەی نەبوایە بۆ سەربڕین لە بری منداڵەکەی، ئەوا چۆلەکەیەکی سەر دەبڕی:

لەم بارەیەوە ئیمام (مالك) لە (موطأ)دا[٤] بە سەنەدی خۆی لە (محمد کوڕی ابراهیم کوڕی حارث تیمی) دەگێڕێتەوە کە وتویەتی: گوێم لە باوکم بوو دەیوت: گوێزەبانە چاکە بکرێت گەر بە چۆلەکەیەکیش بێت.

ئیمام (مالك) پاش ئەوە دەڵێت: گوێزەبانە لەلای ئێمە ئەوەیە کە هەرکەسێك گوێزەبانەی کرد ئەوە لەبری کوڕەکەی گوێزەبانەی بە کاوڕێك کرد، کاوڕی نێر و مێ، گوێزەبانەش واجب نیە، بەڵام واچاکە کاری پێبکرێت و لەو کارانەیە کە هەتا ئەمڕۆش خەڵکی لەسەری دەڕۆن، ئەوەی گوێزەبانەی کرد لەبری منداڵەکەی، ئەوا لە ئاستی قوربانیکردندایە، وە نابێت کاوڕەکە کوێر یاخود لەڕ و لاواز یان پەل شکاو یان نەخۆش بێت، هیچ لە گۆشتەکەی و پێستەکەی نافرۆشێت، ئێسکەکانیشی ناشکێنرێ، خاوەنەکانیشی لە گۆشتەکەی دەخۆن و لێی دەبەخشن، نابێت خوێنی سەربڕاوەکە لە منداڵەکە بدرێت.[٥]

---

١ صحيح، انظر صحيح الجامع رقم٤١٠٦-٤١٠٧.

٢ صحيح أنظر صحيح الجامع رقم (٤١٣٢).

٣ رواه الطبراني في الكبير، ورجاله رجال الصحيح، كذا قاله الهيثمي في المجمع(٥٩/٤).

٤ الموطأ — كتاب العقيقة.

٥ الموطأ — كتاب العقيقة.

شیخ (دهلوی): وتوویەتی: واچاکە ئەوەی هەیبوو دوو کاوڕ بۆ کوڕ بکاتە قوربانی، لەبەر ئەوەی کوڕان سوودیان بۆیان لە کیژان زیاترە، هەر بۆیە ئەم زیادە سوپاسگوزارییە دەگونجێت لەگەڵ زیادە بەرزبوونەوە.

بەڵام هۆی فەرمان کردن بە گوێزەبانە ئەوەیە کە عەرەبەکان گوێزەبانەیان دەکرد بۆ منداڵەکانیان، بەڵکو گوێزەبانە لایان کارێکی پێویست و نەریتێك بوو کە دەبوو بەجێ بهێنرێت، ئەو کارەشیان بەرژەوەندی زۆری تێدابوو، وەك بەرژەوەندی میللی و شارستانی و دەروونی، هەر بۆیە پێغەمبەری خواﷺ هێشتیەوەو کاری پێ‌کرد و هانی خەڵکیشی دا بۆ ئارەزووکردنی.

## بەڵام پێغەمبەری خواﷺ شێوازی بەجێهێنانی ئەو نەریتەی گۆڕی:

لە (بریدە)وەﷺ دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: ئێمە لەسەردەمی نەفامیدا ئەگەر کوڕمان ببوایە کاوڕێکمان بۆ سەردەبڕی و خوێنەکەیمان بەسەریدا هەڵدەسوو، بەڵام کاتێك ئیسلام هات، کاوڕێکمان بۆ سەردەبڕی و سەرمان دەتاشی و زەعفەرانمان لەسەری دەدا.[1]

(شربینی): وتویەتی: تێهەڵسوونی منداڵی تازە لەدایکبوو بە خوێنی سەربڕاوەکە شتێکی ناپەسند(مکروە)ـە، چونکە کارێکی نەفامی بووە، بەڵام حەرام نیە چونکە فەرموودەی (صحیح)ی لەسەرە، هەروەك لە کتێبی (المجموع)دا هاتووە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((**مع الغلام عقيقة، فأهرقوا عليه دماً، وأميطوا عنه الأذى**)). واتە: (کوڕ گوێزەبانەی لەگەڵدایە، جا خوێنی بەسەردا هەڵسوون، و پیسی و ئازاری لێ لابدەن).

(حسن)و (قتادە)ش وتویانە: خوێن تێهەڵسوون (مستحب)ە، پاشان خوێنەکە دەشۆرێ لەبەر هەبوونی ئەم فەرموودەیە، سونەتە سەری منداڵ زەعفەرانی لێ بدرێ، هەروەك لە (المجموع) بە (صحیح)ی داناوە..أ.هـ.[2]

---

١ رواه الحاكم في مستدركه ٢٣٨/٤ وقال صحيح على شرط الشيخين وأقره الذهبي.

٢ شرح المحتاج ٢٩٤/٤.

## بەرژەوەندییەکانی فەرمانکردن بە گوێزەبانە و پەندەکانی:[1]

١- نەرمی نواندن لە ئاشکراکردن و بڵاوکردنەوەی بنەچەی منداڵ: هەر دەبێت ئاشکرا و بڵاو بکرێتەوە کە ئەو کەسە منداڵی بووە تاوەکو شتی ناخۆشی پێنەوترێت، جوانیش نیە کە بە شەقامدا بسوڕێتەوەو هاوار بکات کە منداڵی بووە، لەبەر ئەوە پێویستە لەم ئاشکراکردن و بڵاوکردنەوەیەدا نەرمی بنوێنن و زۆر پەلە نەکەن.

٢- شوێنکەوتنی بانگەوازی بەرچاوتێریە و خۆدوورگرتن و سەرپێچی بانگەوازی ڕەزیلی و دەست نوقاوی.

٣- گاورەکان گەر کوڕیان لەدایك بوایە بە ئاوێکی زەردباو ڕەنگیان دەکرد کە پێیان دەوت (المعمودیە)، دەشیانوت بەوە منداڵەکە دەبێتە گاور، هەر لەبەر بەرامبەرکێی ئەو ناوە ئەم ئایەتەی قورئان دابەزی: ﴿ صِبْغَةَ ٱللَّهِ ۖ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ صِبْغَةً ۖ ﴾البقرة/١٣٨. واتە: (ڕەنگ و نەخشی خوا، کێ لە خوا چاکتر ڕەنگ و نەخش دادەڕێژێ.[2] بۆیە پێی خۆش بوو کە حەنیفیەکان لەبەرامبەر ئەو کارەی ئەوان کارێکیان هەبێت و بەوەش هەست بکەن کە منداڵەکە حەنیفیە و شوێنکەوتەی (ابراهیم) و (اسماعیل)ـە! لە هاودەنگی لەسەر سەربڕینی کوڕەکەو پاشان خوا نیعمەتی خۆی بەسەردا ڕژاند و بەرانێکی بۆ نارد، وە لە بەناوبانگترین یاساکانیان حەجە کە ئەویش سەرتاشین و قوربانی کردنی تێدایە، هەربۆیە لاسایی کردنەوەی ئەوان لەوەدا بەرزبوونەوەیە بە میللەتی حەنیفی و بانگەوازێکە کە ئەو منداڵە ئەوەی بۆ کراوە کە لە کارەکانی ئەو میللەتە بێت).

٤- ئەم کارە لەسەرەتای لەدایکبوونیەوە ئەوە بەخەیاڵیدا دەهێنێت کە ئەم منداڵەی لەپێناوی خوادا کردوەتە قوربانی، هەروەك (ابراهیم)ﷺ پێی هەستا، لەمەشدا جوڵاندنی زنجیرەی چاکەکاری و ملکەچ کردن هەیە.

٥- قوربانیەکە لەبری منداڵەکە دەکرێت: منداڵ هەر لە یەکەمین کاتەکانی هاتنە دنیایدا، تا

---

١ خاڵی (١ – ٤) لە کتێبی (حجة الله البالغة)ی دهلوی و خاڵی (٥–٦) لە کتێبی (احکام المولود)ی ابن قیم وەرگیراوە.

٢ (صِبْغَةَ اللَّهِ) واتە دینی خوا و ئەو فیترەتەی کە خوا خەڵکی لەسەر دروست کردووە، ناوی ناوە (صبغة) واتە ڕەنگ، چونکە دین و فیترەی خوا شوێنەواری لەسەر خەڵك بەجێ هێشتووە وەك چۆن ڕەنگ شوێنەوار لەسەر ڕەنگکراو بەجێ دەهێڵێ. –وەرگێڕ–

ئەوپەڕی سوودمەندی سوود لەو قوربانیە وەردەگرێت، هەروەکو چۆن پاڕانەوە بۆی و بردنی بۆ شوێنەکانی پەرستن و ئیحرام بەستن لەجیاتی وی و شتی دیکە سوودمەند دەبێت.

٦- بارمتەگیری کۆرپەی لەدایکبوو هەڵدەوەشێنێتەوە: چونکە ئەو منداڵە بارمتە کراوە بە گوێزەبانە، ئیمام (احمد) وتوویەتی: گوێزەبانە بارمتەیە لە تکاکاری(الشفاعە) بۆ دایك و باوکی، و (عطا کوڕی ابو رباح) وتوویەتی: منداڵ بارمتەیە بە گوێزەبانەکەی، لەو بارەیەوە وتویەتی: تکا و پاڕانەوەی منداڵەکەی لێ حەرام دەبێت. خوای گەورە قوربانی سەربڕینی لە بری منداڵ کردۆتە مایەی رزگاربوون لە دەست بارمتەکەی لەو شەیتانەی کە هەر لەکاتی هاتنە دەرەوەی بۆ دنیاوە خۆی پێوە هەڵدەواسێ و لە کەمەری دەئاژنێ، کەواتە گوێزەبانەکە دەبێتە قوربانی و مایەی رزگاربوون لە بەندکردن و دیلی شەیتان و رێگری کردنی لە کۆشش کردن بۆ رۆژی دوایی کە سەرنجامی گەڕانەوەیە بۆی، وەك بڵێی منداڵەکە بەند کراوە بۆ سەربڕین لەلایەن شەیتانەوە بەو چەقۆیەی کە بۆ شوێنکەوتوان و دۆستانی ئامادە کردووە، دیارە شەیتانیش سوێندی بۆ پەروەردگاری خواردووە کە نەوەی (ئادەم) لە ریشەوە دەردێنێ مەگەر کەمێکیان نەبێت، و هەردەم لە بۆسەدایە بۆ ئەو کۆرپەیەی دێتە دنیاوە، کۆرپە ئەوکاتەی لەدایك دەبێت دوژمنەکەی دەستپێشخەری دەکات و دەیگرێتە خۆی، و سوورە لەسەر ئەوەی کە لە چنگیدا بێت و بیخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە، و لە گەڵ دۆستان و حیزبەکەیدا بێت (حیزبی شەیتان)، ئەوەش لەهەموو شت زیاتر سوورە لەسەری و زۆربەی کۆرپە لەدایکبووەکانیش لە پێڕی ئەو و سەربازی ئەون، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَرَجِلِكَ وَشَارِكْهُمْ فِي ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَوْلَـٰدِ﴾الأسراء/٦٤. واتە: (هاوبەشییان بکە لە ماڵ و سامان و نەوەدا)، وە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ صَدَّقَ عَلَيْهِمْ إِبْلِيسُ ظَنَّهُۥ﴾سبأ/٢٠. واتە: (بەراستی گومانی شەیتان راست دەرچوو بەرامبەر ئەو کەسانە.. هەر بۆیە ساوا مەبەستە لەم بارمتەگیرییەدا، خوای گەورەش کردوویەتیە یاسا بۆ دایك و باوکان کە کۆرپەکەیان دەرباز بکەن بە سەربڕینێك کە بۆی بکرێتە قوربانی، خۆ گەر بۆی سەرنەبڕدرێت ئەوا هەر بە بارمتەیی دەمێنێتەوە).

پرسیارێك دەمێنێتەوە بوترێ: دیاریکردنی رۆژی حەوتەم چ حیکمەتێکی تێدایە؟

شیخ (دهلوی): وەڵام دەداتەوەو دەڵێ: تایبەتکردنی حەوتەمین رۆژیش لەبەر ئەوەیە کە:

(هەر دەبێت ماوەیەك لەنێوان لەدایکبوون و گوێزەبانەدا هەبێت، چونکە خاووخێزان و کەس و کاری منداڵ لەسەرەتای لەدایکبووندا سەرقاڵی چارەسازی دایك و منداڵەکەن، هەر

بۆیە لەو کاتەدا داوایان لێ ناکرێت کە سەرقاڵیەکەیان چەندبارە زیاد بکەن، لەوانەیە مرۆڤ لەو کاتەشدا کاوڕی دەست نەکەوێت مەگەر هەوڵی بۆ بدات، خۆ گەر ئەو کارە (گوێزەبانە) لە یەکەم ڕۆژدا بوایە ئەوا کارەکەیان لەسەر گران دەبوو، حەوت ڕۆژیش ماوەیەکی چاکەو زۆر نیە بۆ نێوان بڕی خۆ ئامادەکردن).

- بەڵام لابردنی ئازار بۆ خۆچواندنە بە حاجی هەروەك باسمان کرد.

- ناونانیشی لەبەر ئەوەیە کە منداڵ پێش ئەوە پێویستی بەو ناوە نیە.[1]

(دروست نیە گوێزەبانە لە ماڵی منداڵە ساواکە بکرێت، چونکە گوێزەبانە خۆبەخشی(تبرع)ە، جا گەر سەرپەرشتیار لە ماڵی ساواکە گوێزەبانەی کرد، ئەوا ئەو دەبێ بیبژێرێ و ئەو (ضامن)ە، هەروەك (نووی) لە (المجموع) رایگواستووە).[2]

## ٤- خەتەنەکردن(الختان):[3]

پێناسەی (ختان): لەزمانەوانیدا بریتیە لە بڕینی قوڵفە یاخود ئەو پێستەی کە بەسەری (زەکەر)ەوەیە.

بەڵام لە زاراوەدا: (ختان) بریتیە لەو گۆشتەی کە بە خوارەوەی سەرەگۆ(حشفة)وەیە، واتە شوێنی بڕینی (زەکەر)، هەر ئەوەشە کە یاسا شەرعیەکانی لەسەر پێك دێت، هەروەك ئیمام (احمد) و (ترمذی) و (نسائی) لە پێغەمبەری خواﷺوە دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: ((**إذا ألتقى الختانان فقد وجب الغسل**)).[4] واتە: ئەگەر (ختان=شوێنی خەتەنەکردن)ی ژن و پیاو بەیەك گەیشتن ئەوا خۆشۆرین واجب دەبێت).

ئەو فەرموودانەی لەسەر هاندان بۆ خەتەنەکردن هاتوون:

ئیمام (احمد) لە (مسند)ەکەیدا لە فەرموودەی (عمار کوڕی یاسر)دا دەگێڕێتەوە کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((**من الفطرة: المضمضة؛ والأستنشاق؛ وقص**

---

١ حجة الله البالغة: ٢/١٤٤.

٢ شرح المحتاج (٤/٢٩٣).

٣ أنظر في البخاري كتاب ٧٧ باب ٦٣ وكتاب ٧٩ باب ٥١، ومسلم كتاب (٢ ح٤٩ و ٥٠)، وفي ابي داود كتاب ٣٢ باب ١٦، والترمذي كتاب ٤١ باب ١٤، والنسائي كتاب ٤٨ باب (١ و٧٥)، ومسند احمد ٢/٢٢٩-٢٣٩- ٢٨٣-١٤٠-٤٨٩ و٤/٢٦٤.

٤ صحيح. أنظر سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم ١٢٦١.

الشارب؛ والسواك؛ وتقليم الأظافر؛ ونتف الإبط؛ والأستحداد؛ والأختتان)). واتـە: (لـە فیترەتەوەیە: ئاو لەدەم وەردان، و ئاو لە لووت وەردان، و بەرسمێڵ کـردن، و سـیواك کـردن، و نینۆك کردن، و هەڵکێشان و کردنی مووی بن باڵ، و بەرتاشین، و خەتەنەکردن).

لـە (صـحیح)ی (بخـاری)و (مـسلم)دا هـاتووە، لـە فـەرموودەی (ابـوهریرە)وەﷺ، کـە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویـەتی: ((الفطرة خمس: الختان، والأستحداد، وقص الـشارب، وتقليم الأظافر، ونتف الإبط)). واتە: (ئەم پێنجە لە فیترەتەوەیە: خەتەنەکردن و ، بەرتاشین، نینۆك کردن و، بەرسمێڵ کردن و، هەڵکێشان و کردنی مووی بن باڵ).

هـەروەها (احمـد) لـە (شـداد کـوڕی اوس)ەوەﷺ دەگێڕێتـەوە کـە پێغەمبـەری خـواﷺ فەرموویەتی: ((الختان سنة للرجال ومكرمة للنـساء)). واتـە: (خەتەنـەکردن سـوننەتە بـۆ پیاوان[1] و ڕێزلێنانە بۆ ئافرەتان[2]).

---

[1] (ابن جزيّ) دەڵێت: لەلای (مالك) و (ابو حنيفه) سوننەتی موئەکەدە، (شافيعی)ش دەڵێ فەرزە. بڕوانە (القوانين الفقهية)ی (ابن جزيّ).

[2] بیریـاری ناسـراو (شـيخ عبـدالله ناصـح علـوان) وتوویـەتی: شـەرع ناسـان (الفقهـــاء) و پێـشەوا کۆششکارەکان (الأئمة المجتهدون) هاودەنگن لەسەر ئەوەی کە خەتەنەکردنی ئافرەتان (مستحب)ـە و (واجـب) نیە.(تربية الأولاد ١/١١٤)

فرەزانی کۆششکار (يوسف القرضاوی) وتوویەتی: میانڕەویترین و ڕاستترین و پەسـەندترین قـسە کە لە واقیع و دادگەرییەوە نزیکتر بێت لـەبارەی خەتەنـەی کچان، بریتیـە لـە خەتەنـەکردنێکی سـوك (خفیف) (کـەمێکی لێ ببڕێ) هـەروەك لـە هەنـدێ فـەرموودەدا هـاتووە کـە پێغەمبـەری خـواﷺ بـەو ئافرەتەی فەرموو کە ئەرکی خەتەنەکردنی کچانی لەسـەر بـوو و ئـەنجامی دەدا: ((أشّمي ولا تنهكي فإنه أنضَر للوجه وأحظى عند الزوج)) واتـە: کـەمێکی لێببـڕە و لەڕەگـەوە مـەیبڕە، چـونکە ئەمـە جـوانی و ڕەونەقی دەدات بە ڕوخساری ئافرەتەکە و مایەی ئەوەیە کە ژنەکە لەلای مێردەکەی بەختـدار بێـت.. (فتاوى معاصرة ٣ ٤٤٣). بەڵام (مناوی) لـە ڕاڤـەی (أحظى عند الزوج)دا وتوویـەتی: بـۆ جووتبـوونی پیاوەکـە خۆشترە و ئارەزووی بۆی زیاترە، چونکە گەر ئـافرەتی خەتەنـەکار پێـستی خەتەنـەکردنی لەڕەگـەوە بـبڕێ ئەوا ئافرەتەکە ئارەزووی کز(ضعيف) دەبێت.

(ابن القيم) لە (أبي البركات) گوتەکەی ڕادەگوێزێ: کە وا باشە خەتەنەکاری کچان زیاد نەبڕێ، جا ئەگەر شوێنی خەتەنە(بظر)ی کچ کورت بوو یان مام ناوەندی بوو زۆر درێژ نەبوو، ئەوکاتە دروست نیە لێی ببڕدرێ. (بڕوانە ختان البنات بين الشرع والطب- تأليف الشيخ محمد السيد الشناوي- من علماء الأزهـــر- دار القلم للملايين).

(محمود مهدي الاستانبولي) لە (تحفة العروس أو الزواج الإســـلامي الـــسعيد)دا دەڵـێ: خەتەنـەکردنی ئافرەتان بریتیە لە بڕینی بەشێکی گەشەکردووی شوێنی خەتەنە(بظر) کە بە ڕەهایی لە وڵاتـە فێنـك و ساردەکاندا قەدەغەیە ئەنجام بدرێت، بەڵام لە وڵاتە گەرمەکاندا ڕێگەپێدراو و پێویستە ئەنجام بدرێت.

بەم جۆرە گرنگیدانی ئیسلام و سووربوونیمان لەمەڕ خەتەنەکردنی کوڕ[١] و کچ بۆ دەردەکەوێت، ئەوەش پاش ڕۆژی حەوتەم دەستی پێ دەکرێت، هەروەك (بیهقی) لە (جابر)ەوەﷺ دەگێڕێتەوە کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ لە ڕۆژی حەوتەمی لەدایکبوونی (حسن) و (حسین)دا گوێزەبانەی بۆیان کردووەو خەتەنەی کردوون.

(ابن جزی)یش دەڵێ: (خەتەنەکردنی منداڵ لە ڕۆژی یەکەم و ڕۆژی حەوتەمیدا ناپەسەندا، چونکە ئەوە کردەوەی جولەکەکانە).

یەکەمین کەسیش کە خەتەنە کرابێت گەورەمان (ابراهیم)ـە× کە لە تەمەنی هەشتا ساڵیدا خەتەنە کراوە، هەروەك (بخاری) و (مسلم) لە (ابوهریرە)ەوەﷺ دەگێڕنەوە کە:

((إن ابراهیم أختتن وهو ابن ثمانین سنة)). واتە: ((ابراهیم)× لە تەمەنی هەشتاساڵیدا خەتەنە کرا).

لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا هاتووە: ((إنە أول من أضاف الضیف وأول من لبس السراویل، وأول من أختتن)). واتە: ((ابراهیم) یەکەم کەس بوو کە میوانداری میوانی کردووە، و یەکەم کەس بووە شەرواڵی لەبەر کردووە، و یەکەم کەسیش بووە خەتەنە کراوە).

خەتەنەکردن دوای (ابراهیم) لای پێغەمبەران و شوێنکەوتوان بەبەردەوامی مایەوە تا هاتنی پێغەمبەرﷺ، خەتەنەکردنیش سوننەتی پێغەمبەران و پەیامبەرانە و مرۆڤیش شوێن پێیان هەڵدەگرن بۆ ئەوەی ببنە شوێنکەوتوویەکی ساغ و ڕاست.

لەم ڕووەوە (ترمذی) و ئیمام (احمد) لە (ابو ایوب)ەوە دەگێڕنەوە کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: ((أربع من سنن المرسلین: الختان، والتعطر، والسواك، والنكاح)). واتە: (چوار شت لە سوننەتەکانی پێغەمبەرانە: خەتەنەکردن، و بۆنی خۆش لەخۆدان، و سیواك کردن، و ژنهێنان و شوکردن).

هەروەها (بخاری) لە (سعید کوڕی جبیر) دەگێڕێتەوە کە وتویەتی: پرسیار کرا لە (ابن عباس)ﷺکە هێندەی کێ دەبووی کە پێغەمبەری خواﷺ گیانی بەخوا سپارد، دەڵێت: من ئەو کاتە خەتەنە کرابووم، لەو سەردەمەدا پیاو خەتەنە نەدەکرا تا تێدەگەیشت.

---

-وەرگێڕ-

١ (ابن جزيّ) دەڵێت: پیاوان خەتەنەی کوڕان دەکەن و ئافرەتانیش هی کچان.

لە گێڕانەوەی (حاکم)یشدا:[١] پێغەمبەری خواﷺ وەفاتی کرد، من ئەو کاتە تەمەنم پازدە ساڵ بوو، و خەتەنە کرابووم.

بانگهێشت کردنی خەڵکی بۆ چێشت خواردن لەکاتی خەتەنەکردنی کوڕ کارێکی جوانە، ئەم چێشت دروست کردنەش بۆ دەربڕینی دڵخۆشیە، بەڵام بۆ خەتەنەکردنی ئافرەت بانگهێشتەی نانخواردن ئەنجام نادرێت بۆ داپۆشینی ئەو کارە.[٢]

لەبەر زۆر سووربوونی ئیسلام لەسەر خەتەنەکردن، کاتێك پیاوێك موسڵمان دەبێت و پێشتر خەتەنە نەکرابێت، ئەوا پێویستە سەرەڕای خۆشتن خەتەنەش بکرێت، هەروەك (احمد) و (ابوداود) گێڕاویانەتەوە لە (عثیم کوڕی کلیب)ەوە، ئەویش لە باوکی و لە باپیریەوە، دەگێڕێتەوە: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەری خواﷺ و وتی: من موسڵمان بووم، پێغەمبەری خواﷺ پێی فەرموو: ((ألق عنك شعر الكفر وأختتن)). واتە: (مووی کوفر لەخۆت بتاشە و خۆت خەتەنە بکە).

هەروەها (حرب) لە (مسائل)ەکەیدا لە (الزهری) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((من أسلم فليختتن وإن كان كبيراً)). واتە: (هەر کەسێ موسڵمان بوو با خەتەنە بکرێت، با لەتەمەنیشدا گەورە بێت).

لەوپەڕی گرنگی پێدانیشەوەیە کە نوێژی ئەوکەسەی خەتەنە نەکرابێت دروست نەبێت، لەم بارەیەوە لە (ابن عباس)ەوە دەگێڕنەوە کە دەڵێت: خەتەنە نەکراو نوێژی وەرناگیرێت و ئەو شتەشی سەری بڕیبێت لێی ناخورێت.[٣]

هەروەها هەر لەبەر زۆر گرنگی پێدانیشە کە (ابن قتيبه) لەبارەی ئایەتی: ﴿ صِبْغَةَ ٱللَّهِ وَمَنۡ أَحۡسَنُ مِنَ ٱللَّهِ صِبۡغَةٗ ﴾البقرة/١٣٨. وتویەتی: مەبەست لەمە خەتەنەکردنە، بە (صبغة) ناویشی بردووە چونکە گاورەکان منداڵەکانیان لە ئاو رەنگ دەکرد و دەیانوت: ئەمە پاکییە بۆیان وەك خەتەنەی شوێنکەوتوانی ئابینی (ابراهيم)، خوای گەورەش دەفەرمێت ﴿ صِبْغَةَ ٱللَّهِ ﴾ واتە پابەندی رەنگ و نەخشی خوا بن نەك رەنگ و نەخشی گاورەکان بۆ منداڵەکانیان، مەبەستی لەوە ئابین و بەرنامەی (ابراهيم)ە.

---

١ مستدرك ٣/٥٣٤.

٢ أنظر القوانين الفقهية لأبن جزيّ ص٢١٤.

٣ رواه وكيع عن سالم عن عمرو بن هرم عن جابر عن يزيد عن ابن عباس.

یەکێك لە باس و سەرگوزشتە جوانەکانی فیقهیش دەربارەی کاری خەتەنەکردن ئەوەیە کە (خطابی) باسی کردووە: (خەتەنەکردن گەرچی لەکۆی سوننەتەکاندا باسی کراوە، بەڵام لای زۆربەی زانایان واجبە، چونکە دروشمێکی ئایینە، و هەر بەهۆی ئەویشەوە موسڵمانی لە بێباوەڕ پێ جودا دەکرێتەوە، گەر خەتەنەکراوێك لەنێو کۆمەڵێك کوژراوی خەتەنەنەکراودا دۆزرایەوە ئەوا نوێژی لەسەر دەکرێت و لە گۆڕستانی موسڵماناندا دەنێژرێت).[١]

## سێیەم: لە شیرپێدانەوە تا دووساڵی و لە شیربڕینەوە:

کاتێ ئیسلام پیاوو ئافرەتی بە پەیوەندی ژن و مێردایەتی وابەستە کرد، و کۆی کردنەوە لە یەك شوێنی جێگیردا کە ئەویش خێزانە، بەرپرسیارێتی خستە ئەستۆی هەر یەکێکیانەوە بۆ پێکهێنانی خشتی چاك لەبنیاتنانی کۆمەڵگایەکی چاکدا، بۆ هەریەکە لەژن و پیاویش ئەرك و مافی دیاریکردووە، لەسەر مێرد پێویستە بژێویان بدات و لەسەر ژنیش شیردان، شیردان بە منداڵە تازە لەدایکبووەکەی کە پێویستی بەوە هەیە دەستەکانی بهێنێت بەسینگی دایکیدا تا لە دەروونەوە هەست بە شادی و ئاسودەیی سۆزداری بکات، و شیرەکەی دایکی لەگەڵ بەزەیی هەڵقوڵاویدا نۆش بکات، و شیری دایکی لە مەمکەکانیەوە بمژێت کە خوای بەرز و باڵادەست بۆی رەخساندووە، ئەو کارگەشی لە سینگی دایکدا ساز کردووە کە شیر بەرهەم دێنێت، جا ئەو دایکە هەژار بێت یان دەوڵەمەند، ئەمەش بۆ پاراستنی گەشەی ساوا و کۆرپەی نوێیە لەم جیهانە نامۆیەدا.

دیارە داب و نەریتی عەرەبەکانیش شیرپێدان بوو، نەك هەر ئەوان، بەڵکو پێشتر داب و نەریتی هەموو مرۆڤایەتی بووە، قورئانیش دەربارەی گەورەمان (موسا)✕ پێمان رادەگەیەنێ کە: ﴿وَحَرَّمْنَا عَلَيْهِ الْمَرَاضِعَ ..﴾القصص/١٢. واتە: (ئێمە پێشتر هەموو دایەن و شیردەرێکمان لەو حەرام کرد).

پێغەمبەری خواﷺش لەسەر شیرپێدان پێگەیشتووە کە (حليمە سعديە) شیری پێداوە، بەو هۆیەشەوە بووەتە دایکی شیریی، خوای گەورەش چەند یاسایەکی شەرعی بۆ شیرپێدان داناوە، لەوانە: ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَاتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَاتُكُمْ وَعَمَّاتُكُمْ وَخَالَاتُكُمْ وَبَنَاتُ الْأَخِ وَبَنَاتُ الْأُخْتِ وَأُمَّهَاتُكُمُ اللَّاتِي أَرْضَعْنَكُمْ وَأَخَوَاتُكُمْ مِنَ الرَّضَاعَةِ﴾النساء/٢٣. واتە: (ئەم جۆرە کەسانەتان لێ حەرام کراوە (مارەی بکەن):

---

١ أنظر تربية الأولاد في الإسلام.

دایکانتان، کچانتان، خوشکتان، پوورتان (خوشکی دایك و باوك)، کچی براتان، کچی خوشکتان، ئەو دایکانەی کە شیریان داونەتێ، خوشکە شیرییەکانتان).

شیرو شیرپێدانیی دەستکردیش پێشتر نەبوو، بەڵکو لەم سەردەمەدا داهات کە ئەویش زۆری نەخایاند گەڕانەوەو دەستیان دایە هات و هاواری توند بۆ گەڕانەوە بۆ شیری سروشتی، موسڵمانی پابەندیش بە شەرعی ئیسلامەوە هیچ پێویستی بەوە نەبووە کە لە شیرپێدانی سروشتییەوە بیگۆڕێت بۆ شیرپێدانی دەستکرد و پاشان بێتەوە سەر شیرپێدانی سروشتی، چونکە ئەو تینویەتی خۆی بە بەرنامەو پەیڕەوی خوای گەورە دەشکێنێت و لەسەر ئەویش دەڕوات، تەنانەت گوتاری قورئانی هاتووە بۆ دایك و بانگی دەکا کە بە گرنگیەوە شیری خۆی بدات بە منداڵەکەی، با لە تاریکترین بارودۆخی سەختدا بێ و پەیوەندی لەگەڵ مێردەکەی خراپ بووبێ، تەنانەت دوای تەڵاقدانیشی دەبێ شیری پێبدات، ئەمەش گرنگیدان و یاسادانانی خوایە بۆ منداڵ و دادی پەروەردگارە لە ئاست مافی ئەو منداڵەدا: ﴿ وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ ۖ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ ﴾البقرة/٢٣٣. واتە: (با دایکان دووساڵی تەواو شیر بە منداڵەکانیان بدەن، بۆ هەرکەسێ کە دەیەوێت شیری تەواوی بداتێ).

(لەسەر ژنی تەڵاق دراو واجبێك بەرامبەر منداڵە شیرەخۆرەکەی هەیە، واجبێك کە خوای گەورە لەسەری فەرز کردووەو بۆ سروشتەکەی واز لێ ناهێنێت، کە ناکۆکی نێوان ژن و مێرد خراپی بکات و باجەکەش بکەوێتە سەر ئەم منداڵە، کەواتە ئەم منداڵە خوا لە ئەستۆی خۆی دەگرێ و دەیخاتە ئەستۆی دایکی کە شیری پێبدات و کرێی شیردانەکە لە باوکەکە وەربگرێتەوە، خوای گەورەش لەپێشترە بۆ خەڵکی لە خۆیان و لەوان چاکتر و بەبەزەییترە لە دایك و باوکان، هەر بۆیە خوای گەورە لەسەر دایکی فەرز کردووە کە دوو دانە ساڵی تەواو شیر بە کۆرپەی ساوا بدات، لەبەر ئەوەی خوای باڵادەست و پاك و بێگەرد دەزانێ ئەو ماوەیە نمونەییە لە هەموو روویەکی تەندروستی و دەروونیەوە بۆ منداڵ" ﴿لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ ﴾ بۆ هەرکەسێك کە دەیەوێت شیری تەواو بدات بە کۆرپەکەی.

لێکۆڵینەوە تەندروستی و دەروونییەکانی ئەمڕۆش ئەوەیان سەلماندووە کە ماوەی دوو ساڵ زۆر پێویستە تا منداڵ لە رووی تەندروستی و دەروونیەوە گەشەیەکی ساغ و دروست بکات، بەڵام بەخششی خوا لەسەر موسڵمانان بەو جۆرە نیە وازیان لێ بهێنێت تا ئەو کارە لەرێی تاقیکردنەوەو ئەزموونەوە فێر بن، بەراستی رەسیدی مرۆیی لە ئازووخەو توێشووی منداڵی بەو

جۆرە نەبووە کە وازی لێ بهێنرێت لە هەموو ئەو ماوە درێژەدا نەفامی بیخوات، خوای گەورەش بە بەزەیی و میهرەبانە بەرامبەر بەندەکانی، بەتایبەت لە ئاست ئەو منداڵە بچووک و لاوازانە کە پێویستیان بە سۆز و چاودێری هەیە.[١]

ئیسلام تەنها بەوە نەوەستاوە کە شیرپێدانی منداڵ بپارێزێت پاش تەڵاق و جیابوونەوەی دایك و باوك لە یەکدی، بەڵکو لەوە زیاتر تێپەڕی کردووە تا گەیشتۆتە ئەوەی کە بەجێهێنانی سزای سەر دایکی زیناکاری دواخستووە، ئەمەش بۆ ئەوەی کە شیرپێدانی لە مەمکەکانی دایکیەوە تەواو ببێت، بەراستی ئەمەش بەزەییە بۆ منداڵ و سووربوونە لەسەری، تا بە جەستەیەکی بەهێزەوە پێبگات و ساغ و دروست و دوور لەنەخۆشی بێت:

ئیمام (احمد)[٢] چیرۆکی ئەو ئافرەتە (غامدی)یەی گێڕاوەتەوە کە زینای کردبوو، پێغەمبەری خواﷺ پێی فەرموو: بگەڕێوە تا منداڵەکەت دەبێت، کاتێك منداڵەکەی بوو هەڵیگرت و هاتەوە، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەوا منداڵەکەم بووە؟ پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: بڕۆرەوە شیری پێبدە تا لەشیر دەیبڕیتەوە، کاتێك لە شیری بڕییەوەو منداڵەکەی هێنایەوە پارچەیەك نانی بەدەستەوە بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەوەتا لەشیرم بڕیوەتەوە، پێغەمبەری خواﷺ منداڵەکەی دا بە پیاوێك لە موسڵمانان، و فەرمانی دا چاڵێك بۆ ئافرەتەکە هەڵبکەنن... فەرموودەی رەجم کردن باسکراوە.

هەر لەم رووەوە پزیشکی داناو کارامە (ابن سینا) دووپاتی گرنی شیرپێدانی سروشتی کردۆتەوە و وتویەتی: (پێویست دەکات کە تا چەند بتوانرێت منداڵ شیری دایکی پێ بدرێت، چونکە بەراستی لە مژینی مەمکەکانی دایکیدا سودی زۆر مەزنی تێدایە بۆ دوورخستنەوەی ئەو شتانەی زیانی پێ دەگەیەنێت).

بەڵام دکتۆر (بلدی) دەڵێت: شایستەترین شیر شیری دایکە کە لەهەموو شیرەکان باشتر و سەرکەوتووتر دەبێت بۆ هەموو منداڵان، گەر نەخۆشیەك یاخود هۆکارێکی نەبێت کە شیرەکە خراپ بکات..[٣] ئەوەش زیاد دەکات و دەڵێت: شیردان سەلامەتی دایك و منداڵی تێدایەو سوودبەخشە بەهەردووکیان و پارێزەری تەندروستی دایك و منداڵەکەیە.

---

١ الظلال ٢/٣٧١ ط٤.

٢ في مسنده ٥/٣٤٨

٣ تدبير الحبالى والأطفال والصبيان - تأليف أحمد بن محمد بن يحي البلدي، تحقيق الدكتور محمود الحاج قاسم محمد - طبعة وزارة الثقافة العراقية ص١٨٦.

ئا لێرەدا دەبینین کە پزیشکی (بلدی) پێش پزیشکەکانی ئەمڕۆ کەوتۆتەوە لە سەلماندنی سوودەکانی شیردان لە مەمکی دایك کە لە زۆر نەخۆشی دەیپارێزێت، لە نێویاندا شیرپەنجەی مەمك.

تەنانەت (عمر کوری خطاب)ﷺ موچەی بۆ کۆرپەی ساوا نەدەبڕییەوە هەتاوەکو لەشیر دەبڕایەوە،[١] بەڵام دواتر لەوە پاشگەز بوویەوەو لەکاتی لەدایکبوونەوە موچەی بۆ دەبڕییەوە هەتاکو ماوەی شیرپێدانی درێژە بکێشێت، ئەوە بوو شەوێکیان بە دەوری مزگەوتدا دەسوڕایەوە، منداڵێك دەگریا، بە دایکی منداڵەکەی وت: شیری بدەرێ، ئەویش وتی: ئەمیری باوەڕداران موچە بۆ کۆرپەی ساوا دانانێت هەتا لەشیر نەبڕێتەوە، منیش لەشیر بڕیومەتەوە، (عمر)یش وتی: وەخت بوو من بیکوژم، شیری بدەرێ، بزانە کە ئەمیری باوەڕداران بەشی بۆ تەرخان دەکات، ئەوەبوو پاش ئەو رووداوە پشکی بۆ کۆرپەی تازەلەدایکبوو لەساتی لەدایکبوونەوە دادەنا.[٢]

بەمەش بەڵێنی خوای گەورە جێبەجێ کرا کە دەفەرمووێ: ﴿نَّحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُمْ﴾الأسراء/٣١. (واتە ئێمە رزق و رۆزی ئەوان، لەگەڵ ئێوەش دەدەین).

## شیردان بە مەمکی دایك خاسیەتی باشی زۆر و جۆراوجۆری هەیە:

منداڵ کاتێك کە کۆرپەلە بووە (لەسکی دایکیدا)، بەخۆراکی دایکی دروست بووە، لەکاتێکدا کە شیرەخۆرە درێژە بە خۆراکەکەی دەدات بەهۆی شیری دایکیەوە، شیری سروشتیش درێژەپێدەری پێکهێنانیەتی، ئەمەش بەهێزترین هۆکاری شیردانی سروشتیە، جا چەند حیکمەتێك لە شیرداندا هەیە کە هەندێ پزیشك باسیان کردووە، لەوانە:

١- منداڵ شیرێکی خاوێنی پاکژکراوی پێدەدرێت.

٢- نەسارده و نەگەرم.

٣- لەهەموو کاتێکدا ساز و ئامادەیە.

٤- بە هەڵگرتن و مانەوە خراپ نابێت.

---

١ لە چەرخی ئێستاماندا پێی دەڵێن (عەلاوە)، واتە: زیادکردنی موچەی مانگانەی فەرمانبەری میری، کاتێك منداڵێکی لەدایك دەبێ، بەڵام ئیمامی (عمر)ﷺ موچەی بۆ باوکی منداڵەکە دەبڕییەوە گەر فەرمانبەری میری با یان فەرمانبەری میری نەبا، ئەوەش دەستپێشخەریەکی شارستانی (عمر)ەﷺ.

٢ مصنف عبدالرزاق ٣١١/٥.

٥- لەگەڵ گەدەی منداڵی شیرەخۆردا دەگونجێت.

٦- بەشی پێویستیەکانی منداڵی شیرەخۆر دەکات.

٧- بەرگریەکی تایبەتی دژی میکرۆب لە منداڵدا زیاد دەکات.

٨- شیرپێدانی راستەوخۆ لە مەمکی دایکەوە رێگە لە قەڵەوبوونی منداڵ و دایك دەگرێت.

٩- شیرخواردن لە مەمکی دایکیەوە سۆز و بەزەیی گەشە پێدەکات و پەیوەندی سۆزداری نێوان دایك و کۆرپە ساواکەی بەهێزتر دەکات.[1]

کرداری شیردان کاتێك نیەتی باش و خواستی رەزامەندی خوای لەگەڵدا بێت، بەراستی هەموو کاتێك بەرهەمی خۆی فەراهەم دێنێت، بە ویستی خوا، لەبەر ئەوەشە کە دەگێرنەوە (عمرو کوری عبدالله) بە ژنەکەی وتوە کە شیری بە کورەکەی دەدا: با شیرپێدانی کورەکەت وەك شیردانی ئاژەڵ نەبێت بە بێچووەکەی، کەوا سۆزت بۆی دەجولێ و میهرەبان دەبی بۆی تەنها لەبەر ئەوەی لە منداڵدانتدا بووە، بەڵکو بە مەبەستی بەدەستهێنانی پاداشتی خوا شیری پێبدە، وە ئەو کۆرپەیە بەهۆی شیردانی تۆوە بەرەوشتێکەوە بژیێ کە یەکخواپەرست بێت.[2]

لەو شتە ناپەسەندانەی کە لەکاتی شیردان دەکرێ بریتیە لە سکپری دایکەکە، جا بەو هۆیەوە شیرەکە پیس دەبێت، بەمجۆرەش کۆرپە شیرەخۆرەکە لە خواردنی شیری سروشتی بێبەش دەبێت، هەر ئەمەشە کە پێغەمبەری خواﷺ لێی ئاگاداری کردووین: لە (ابن مسعود)ەوە دەگێرنەوە کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ دە شتی حەلاڵی بە پەسەند دانەناوە، یەکێك لەوانە ((**فساد الصبي**)) خراپبوونی منداڵ.[3]

((**فساد الصبي**= خراپبوونی منداڵ)یش بە خەوش تێکراو (غیلە) ناونراوە، کە ئەویش سکپری ئافرەتی شیردەر دەگرێتەوە کە بەو هۆیەوە شیرەکەی خراپ دەبێت.

---

١ مقالة (اهتمام الإسلام بتغذية الطفل) بقلم دكتور فاروق مساهل، مجلة (الأمة) القطرية، العدد (١٤٠٥/٥٠).

٢ نصيحة الملوك للماوردي، ص١٦٦.

٣ أخرجه أبوداود والنسائي.

## چــوارەم: حــوكمی میــزی منــداڵی شــیرەخۆرە و چــۆنیەتی پاككردنەوەی:

ئیمام (مسلم) لە (صحيح)ەكەیـدا ژمارەیـەك فـەرموودەی پێغەمبـەریﷺی گێڕاوەتـەوە دەربارەی چۆنیەتی شۆردنی میزی منداڵی شیرەخۆر، لەوانە:

١- لە (عائشه)ەوە م دەگێڕنەوە كە منـداڵیان دەهێنایـە خزمـەت پێغەمبـەری خـواﷺ، ئەویش دوعای فەڕ و بەرەكەتی بۆ دەكردن و خورمای شلكراوەی دەكرد بە دەمیانەوە، جارێـك منداڵێكیان هێنا بۆ لای، منداڵەكە میزی پێداكرد، پێغەمبەری خـواﷺ داوای ئـاوی كـرد و شوێنی میزەكەی پێ تەڕ كرد.

٢- هەر لە (عائشه)ەوە دەگێڕنەوە كە وتویەتی: منداڵێكی شیرەخۆریان هێنا بـۆ خزمـەت پێغەمبەری خواﷺ، لە كۆشیدا میزی بەخۆدا كرد، پێغەمبەریشﷺ داوای ئاوی كرد و رژاندی بە شوێنەكەیدا.

٣- لە (ام قيس كچی محصن)ەوە دەگێڕنەوە كە كوڕێكی بـچووكی خـۆی هێنایـە خزمـەت پێغەمبەری خـواﷺ كـە خـواردنی نـەدەخوارد (شـیرەخۆربوو)، ئـەویش خـستیە كۆشـیەوە، منداڵەكە میزی بەخۆیدا كرد،پێغەمبەریشﷺ تەنها ئاوی بە شوێنی میزەكـەدا پرژانـد.. لـە گێڕانەوەیەكی دیكەدا: داوای ئاوی كـرد و پرژانـدنی بەسـەر جلەكانیـدا.. لـە گێڕانەوەیـەكی دیكەشدا: پێغەمبەری خـواﷺ داوای ئـاوی كـرد و پرژانـدی بەسـەر جلەكانیـدا و بەشـۆرین نەیشۆری... جا ئیمام (شافعی) رای وایە كە ئاوی پیا بپرژێنرێت و، (حەنەفی)و (مالكی)یش دەڵێن دەبێ بشۆردرێت، بەڵام سەبارەت بە میزی كوڕ ئەوا هەموویان یەكـدەنگن كـە پیـسە، هەروەك ئیمام (نووی): بۆمانی گواستۆتەوە.[1]

---

١ شرح صحيح مسلم باب حكم بول الطفل الرضيع وكيفية غسله.

## پێنجەم: دروستە کە دایك منداڵی شیرەخۆرەی لەگەڵ خۆی بباتە مزگەوت:

دروستە دایك کە کۆرپە شیرەخۆرەکەی لەگەڵ خۆی هەڵگرێت بۆ چوونە مزگەوت هەتا بە جەماعەت نوێژەکەی بکات، گەر خۆی ئارەزووی بکات و مێردەکەی مۆڵەتی دابوو، بەڵگەی ئەوەش ئەوەیە کە پێغەمبەری خواﷺ نوێژەکەی کورد دەکردەوەو خێرا دەیکرد لەبەر سۆز و بەزەیی بەرامبەر منداڵی ساوا، کە گوێی لە گریانی دەبێت، لە ترسی ئەوەی کە دایکی لە نوێژەکەیدا تووشی فیتنە نەکات:

(عبدالرزاق) لە (مصنف)ەکەیدا لە (ابن جریج)ەوە دەگێڕێتەوە کە وتویەتی: (عطاء) هەواڵی دامێ کە پێی گەیشتووە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((**إني لأخفف الصلاة أسمع بكاء الصبي خشية أن تفتن أمه**)). واتە: (کاتێك گوێم لە گریانی منداڵێك دەبێت نوێژەکەم بە سووکی دەکەم لەترسی ئەوەی نەبادا دایکی تووشی فیتنە بکات).

هەروەها گێڕاویانەتەوە کە ڕۆژێکیان پێغەمبەری خواﷺ لەنوێژی بەیانیدا سورەتی ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾ ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ﴾ی خوێندەوە، کاتێك لێبوویەوە، وتیان: بۆچی نوێژەکەت کورت کردەوە؟ فەرمووی: ((**سمعت بكاء صبي، فخشيت على أمه أن تفتن**)). واتە: (گوێم لەگریانی منداڵێك بوو، ترسام کە دایکی تووشی فیتنە بکات).

(کاسانی) لە (البدائع)دا لە باسی ئەمەدا دەڵێت: ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە دەبێ ئیمام ڕەچاوی بارودۆخی هۆزەکەی بکات، چونکە ڕەچاوکردنی بارودۆخی هۆز (کەسانی نوێژکەر بەجەماعەت) هۆکارێکە بۆ زۆربوونی نوێژکەران بەکۆمەڵ، ئەمەش هاندان و بانگهێشتەیە بۆی.

لە (أنس کوڕی مالك)ەوەرضي الله عنه دەگێڕنەوە: کاتێك پێغەمبەری خواﷺ گوێبیستی گریانی منداڵ بوایە کە لەگەڵ دایکیدا بوو، سورەتی کورت یان سورەتی سووکی دەخوێند.[1]

هەر لەوەوە دەگێڕنەوە" کە پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێت: ((**إني لأدخل في الصلاة؛ فأريد إطالتها، فأسمع بكاء الصبي، فأتجوز في صلاتي مما أعلم من وجد أمه من بكائه**)).[1]

---

١ رواه ابن خزيمة في صحيحه ٣/٥٠. قال المحقق مصطفى الأعظمي ورواه مسلم.

واتە: (کاتێك دەچمە نوێژەوە، دەمەوێت درێژی بکەمەوە، بەڵام کە گوێم لە گریانی منداڵ دەبێت (لەناو نوێژەکەدا)، ئیدی نوێژێکی کورت و سوك دەکەم، چونکە دەزانم دایکی منداڵەکە چەند خەمی پێدەخوات).[1]

لە گێڕانەوەی (احمد)یشدا:[2] أنس وتوویەتی: ((پێغەمبەری خواﷺ لەکاتی نوێژکردندا گوێی لە هاواری منداڵێك بوو، نوێژەکەی سوك کرد، وامان گومان برد کە ئەو کارەی لەبەر بەزەیی هاتنەوەی بەو منداڵە ئەنجام داوە کە زانیویەتی دایکی لەگەڵێدا لە نوێژدایە)).

## شەشەم: ناپەسەندی (کراهیە)ی بردنی ئەو منداڵانەی کە لە قۆناغێکدان رانەهاتوون لەسەر راگیرکردنی پیسایی، بۆ نێو مزگەوت:

لەم قۆناغەدا منداڵ ناتوانێت بە تەنها بۆ خۆی پێویستی خۆی جێبەجێ بکات، و ناتوانێ بچێتە حەمام بۆ جێبەجێکردنی پێویستیەکانی خۆی، و ناتوانێت بەبێ دایك یان باوکی بچێتە ئاودەست، کەواتە نابێت ئەم جۆرە منداڵە بۆ مزگەوت ببرێن، نەك هەر ئەوە، بەڵکە پێغەمبەری خواﷺ قەدەغەی کردووە لە دایکان و باوکان کە منداڵ لەو قۆناغەدا بۆ مزگەوت ببەن.

(ابن ماجە) و(عبدالرزاق) لە (مصنف)ەکەیدا لە (واثلة کوڕی الاسقع)ەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((جنبوا مساجدکم؛ صبیانکم...الحدیث))[3] واتە: منداڵەکانتان -کە لەو قۆناغەدان- لە مزگەوت دوور بخەنەوە.

## حەوتەم: مافی دایەنێتی بۆ دایکە:

پەروەردەکردنی نەوەو بایەخ پێدانیان لەکاتی منداڵیدا ئەوەیە کە لە فیقهدا بە دایەنگا (حضانة) ناسراوە، لەبەر ئەوەی ئافرەت سروشتیان وایە کە سۆز و بەزەیی و ئارامی زیاتریان هەیە، ئەوان بەتواناترن لە پیاو، لەبەر ئەوەشە ئافرەتان لەم بارەیەوە پێش پیاوان خراون، هەر بۆیە دایك پێش باوك خراوەو لەوەی لە دوایانەوەیە لە پێشترە، و داپیرەش لە پێشترە لە باوك و باپیر و ئەوەی دوای ئەوان دێت لە پیاوان.[4]

---

١ رواه ابن خزيمة في صحيحه ٣/٥٠ ورواه البخاري ومسلم.

٢ في مسنده (١٨٨/٣).

٣ سنده ضعيف.

٤ بڕوانە ئەو بابەتە بە پوختەکراوی و رێککراوی بەشێوەیەکی فیقهی لە کتێبی (أحکام المرأة غـب

(ابوداود)و (حاکم) لە (عمرو کوڕی شعیب)، ئەویش لە باوکیەوەو لە باپیریەوە دەگێڕنەوە: ئافرەتێك وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ! سکم بۆ ئەم منداڵەم وەکو دەفر وابوو، هەردوو مەمکیشم ئاوپێدەر بوون بۆی، کۆشیشم لەخۆی گرتبوو، جا باوکی منی تەڵاق داوەو دەیەوێت لێمی بستێنێتەوە!!

پێغەمبەری خواﷺ پێی فەرموو: ((انت أحق به؛ ما لم تنكحي)) واتە: (تۆ بۆ ئەو لەپێشتری و مافت زیاترە گەر شوو نەکەیت).

## هەشتەم: مافی سەرپەرشتیارێتی بۆ باوکە (سەرپەرشتیاری منداڵ)[1]:

کاروباری چاودێری منداڵ و سەرپەرشتی کردنیان و بەڕێوەبردنی ماڵ و سامانیان و ئەدەب دادانیان، و ئاراستەکردنیان بۆ پیشەیەك و فێرکردنیان، هەروەها کاروباری دادگا، و جێبەجێکردنی سنوور کە لە فیقهدا بە (ولایة = سەرپەرشتیاریی) ناسراوە، ئا لەمەدا پیاوان لە ئافرەتان بەتواناترن، لەبەر ئەوەی سروشتیان وایە کە بەهێز و توندوتیژ دامەزراون، جا لەبەر ئەوە پیاوان پێشی ئافرەتان خراون، ئەمەش حوکمێکە هیچ مافێکی ئافرەتی تێدا نیە لەکاتی بوونی پیاودا.

---

الفقه الإسلامي)ی دکتۆر احمد الحجی الکردی.

١ المصدر السابق ص١٤٩-١٥٠.

# بەندی سێیەم

## شێوازە پەروەردەییەکانی پێغەمبەرﷺ بۆ منداڵان

**دەستپێك.**

**دەروازەی یەکەم: بنچینەکانی ئەو شێوازانەی کە داواکراوە دایکان و باوکـان و پەروەردەکاران پێوەی پابەند بن.**

**دەروازەی دووەم: بنچینەی شێوازە فیکریە کاریگەرەکان لەسەر عەقڵی منداڵ.**

**دەروازەی سێیەم: بنچینەی شێوازە فیکریـە دەروونییـە کاریگـەرەکان لەسـەر دەروونی منداڵ.**

((زۆربەی خەڵك نازانن کە منداڵ یەکێکە لە پیاوانی ئوممەت، بەڵام بە جل و بەرگی منداڵی داپۆشراوە، گەر لەبارەیەوە ئەوەمان بۆ دەرکەوت کە چی لەژێردا پەنادراوە، دەبینین کە ئەویش لە ریزی پیاوە بەهێزەکاندایە، بەڵام سوننەتی خوا وایە کە ئەو پەردەیە لا ناچێت مەگەر وردەوردە بە پەروەردەکردن نەبێت. بە شێوازی لێزانانەی چاك و بەشێوەیەکی پلەبەندی نەبێت وەرناگیرێت.))[١]

**شیخ محمد الخضر حسين:**

١ السعادة العظمى ص٩٠ شيخ محمد خضر حسين.

## دەستپێك:

لە میانەی فەرموودەكانی پێغەمبەرﷺ و هەڵس و كەوتەكانی لەگەڵ منداڵاندا ئەم شێوازە پەروەردەییانــە وەردەگریــت كــە فیكــر لــە هــەڵێنجان پێــی دەگــات.. ســەرەڕای گوتــارە راستەوخۆكانی بۆ منداڵان.. یاخود بۆ باوكان لە چــۆنیەتی هــەڵس و كــەوت كردنیــان لەگــەڵ منداڵەكانیاندا، دەبینین زۆرەو هەر ئەوەش بەڵگەیە لەسەر دەوڵەمەندی بابەتەكانی فــەرموودە لەم بارەوە، هەروەها هیچ بوارێك ناهێڵێتــەوە بــۆ لاســایی كردنــەوەی رۆژهــەلات و رۆژئــاوا، لەسایەی ئەو زۆریەشدا دایك و باوك و بەخێوكاران و پــەروەردەكاران دەتــوانن كــە بــچنە نــاو هــەموو دەروازە دەروونــی و فیكریــەكانی منــداڵ، چــونكە رێگایــان بــۆ روونــاك دەكاتــەوەو چارەسەری سەركەوتوویان دەربارەی بنیاتنانی كەسێتی منداڵ و پــەروەردەكردنی و پێكهێنــانی پێ دەبەخشێت بەو جۆرەی كە خستمانە روو.

لــەم هەڵێنجانــەدا هەنــدێ فــەرموودە دووبــارە دەبێتــەوە، ئــەوەش لــە راســتیدا دووبارەبوونەوەیەكی بێزاركەر نیە، بــەڵكو دەرخــستنی گۆشــەیەكی نــوێی فەرموودەكەیــە لــە سێبەر و بیرۆكەكاندا، جا پاش دەستنیشان كردنی ئەو شــێوازانە دەركــەوت كــە بەســەر ســێ بنچینەدا دابەش دەبێت، كە هەر یەكەشیان چــەندین لقــی رێــسای بنــەڕەتی لــە شــێوازەكانی پەروەردەیی پێغەمبەر بۆ منداڵانی لێدەبێتەوە.

**بنچینەی سەرەكی یەكەم:** ئاڕاســتەی دایكــان و باوكــان و پەروەردەكارانــە كــە چیان لەسەرە كە پابەند بن پێوەی، ئەمەش بۆ بەندوبەست كردنی خووڕەوشت و بیروبۆچوونیانە.

**بنچینەی دووەمیش:** بریتیە لــە شــێوازە فیكریــە كاریگــەرەكان، كــە پــەروەردەكاران و دایكان و باوكان دەتوانن لەرێی بەجێهێنانیەوە بگەنە فیكر و هۆشی منداڵەكەو ئەو بیرۆكانەی كە هەیەتی بیچەسپێنێت تێیدا و گەشە بە تواناكانی هۆشی بكات، و بنیاتی كەسایەتیەكە بنێت.

**بنــچینەی ســێیەمیش:** بنــەماكانی شــێوازە دەروونیــە كاریگــەرەكانــە كــە بەهۆیــەوە پەروەردەكاران و دایكان و باوكان دەتوانن بچنە نێــو دەروونــی منداڵــەوەو كــاری تێبكــەن، و متمانە بەخۆبوونی گەشەپێبكەن و بە تێرو تەواوی بنیاتی بنێن.

**بنچینەی چوارەم:** شێوازی هاندانی چاكەكردنە لەگــەڵ دایــك و بــاوك و ترســاندنە لــە ئازاردانی دڵیان. لێرەدا پێویستی بەخۆداهاتنەوەی دایك و باوك دووپات دەكەینەوە كە لەگــەڵ

دایك و باوكیان باش بن، چونكە چاكەكردن یەكسەر دەگوێزرێتەوە، و ئازاردانی دڵی دایك و باوكیش پەتاكەی بۆ منداڵان دەگوێزرێتەوە، ئەوكەسەش هیچی نەبێت ناتوانێ ببەخشێت، وە دەروازەی چاكەكردن لەگەڵ دایك و باوك زۆر گەورەو فراوانە، جا مرۆڤ هەرچەندی چاكە پێشكەش بە دایك و باوكی بكات هەر كەمتەرخەمە، هەست كردنیش بە كەمتەرخەمی كردنی بانگێشتەیەك دەبێ بۆ زیاتركردنی چاكەكردن بەرامبەر بە دایك و باوكی، خوا من و تۆش لە چاكەكاران دابنێ.

**بنچینەی پێنجەم:** بریتیە لە شێوازی تەمبێ كردنی منداڵ و چۆنیەتی لێدانی، و كەی لێی دەدرێت، لە چ شوێنێكی دروستە بدرێ، كە سیفەتەكانی ئامێری لێدانەكەیە، وە لێدان وەك دەرمان و خوێ وایە، كەوا زیادكردن و كەم كردن حاڵەتی دڵڕەنجاندن و یاخی بوونەكە وەك خۆی دەهێڵێتەوە. كەواتە پێویستی بە بایەخ پێدان و وردی و بەچاودێری كردن هەیە.

ئەمەش هەوڵێكی كەمە و لەخوای گەورە داواكارم كە سەركەوتنمان پێ ببەخشێت، هەرچی پێكان و راستیەكی تێدابێت ئەوە رێز و بەخششی خوای گەورەیە.. هەرچیش بەو جۆرە نەبوو ئەوە هەڵەی منی كەمتەرخەمە كە ئومێدەوارم خوای گەورە لێم خۆش بێت و چاوپۆشیم لێ بكات.

دەبێت ئاماژە بۆ ئەوەش بكەم كە شێوازی هەڵێنجان راستەوخۆ لە فەرموودەوە بووە بە پێچەوانەی ئەوەی كە هەندێك لە پەیڕەوكارانی شێوازی رۆژهەڵاتی یان رۆژئاوایی دەیكەن، پاشان گەڕان بەدوای بەڵگە لەشەرعدا بۆی بەمەزەندەی خۆم -خواش زاناترە- ئەم كارە پینەكردنەو زۆر نابات سەردەم پوچەڵی ئەو شێوازە دەردەخات كە شەریعەت دەخاتە بەردەم كۆمەڵە دژیەكیەكان كە لە بنەڕەتدا دەولەمەندە تێیدا، و گەر شێوازی پێشینی چاكمان گرتە بەر كە كیتاب و سوننەت سەرچەشمە و سەرچاوەی سەرەكیەتیو كاروكردەوەی پێشینی چاكیش بەجێهێنانی كرداریی ئەوەیە كە لە قورئان وسوننەتدا هاتووە.

# دەروازەی یەکەم

## بنچینەی ئەو شێوازانەی کە لە دایکان و باوکان و پەروەردەکاران داواکراوە کە پێوەی پابەند بن

**بنچینەی یەکەم: پێشەنگێکی چاك.**

**بنچینەی دووەم: دیاریکردنی کاتی گونجاو بۆ ڕێنمایی کردن.**

**بنچینەی سێیەم: دادگەریو یەکسانی لەنێوان منداڵاندا.**

**بنچینەی چوارەم: بەدەمەوەچوونی مافەکانی منداڵان و جێبەجێکردنی.**

**بنچینەی پێنجەم: پاڕانەوە.**

**بنچینەی شەشەم: کڕینی شتی یاری بۆیان.**

**بنچینەی حەوتەم: یارمەتیدانی منداڵان لەسەر چاکەو گوێڕایەڵی.**

**بنچینەی هەشتەم: دووركەوتنەوە لە زۆر سەرزەنشت کردن وقسە پێوتن.**

لە (ابن عباس)ەوە رضي الله عنه وتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

((علّموا، ويسِّروا ولا تعسروا، وبشروا ولا تنفروا، وإذا غضب أحكم فليسكت))[1]

واتە: (فێربن، و ئاسانکار بن و شت گران، و زەحمەت مەکەن، مژدەدەر بن و خەڵك مەتەکێننەوە، ئەگەر یەکێك لەئێوە توڕە بوو با بێدەنگ بێت).

[1] رواه احمد والبخاري في الأدب المفرد. صحيح: أنظر صحيح الجامع رقم ٤٠٢٧.

## بنچینەی یەکەم: پێشەنگێکی چاك:

پێشەنگی چاك كاریگەری مەزنی لەسەر دەروونی منداڵ هەیە، زۆر جار منداڵ لاسایی دایك و باوكی دەكاتەوە، هەتا بەهێزترین شوێنەواری لەسەر بەجێ دەهێڵن: ((**فابواه يهوّدانه ويمجّسانه أو ينصّرانه**)) واتە: دایك و باوكی دەیكەنە جولەكە یان ئاگرپەرست یان گاور، پێغەمبەری خواﷺش هانی دایكان و باوكان دەدات كە پێشەنگێكی چاك بن بۆیان لە چاندنی رەوشتی راستگۆیی لایان لە كاتی هەڵس و كەوت كردنیاندا لەگەڵ منداڵان.

ئیمام (احمد) لە (ابوهریرە)ەوەﷺ هێناویەتی كە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((**من قال لصبي تعال هاك، ثم لم يعطه، فهي كذبة**)). واتە: (هەركەسێ بە منداڵێك بڵێ وەرە شتێكت بدەمێ و پاشان هیچی نەداتێ ئەوە بەدرۆ لەسەری دەنووسرێت).

(ابوداود) لە (عبدالله كوڕی عامر)ەوە هێناویەتی كە وتوویەتی: رۆژێكیان پێغەمبەری خواﷺ لە ماڵمان دانیشتبوو، دایكم بانگی كردم و وتی: وەرە شتێكت دەدەمێ، پێغەمبەری خواﷺ پێی فەرموو: دەتویست چی بدەیتێ؟ وتی: دەمویست خورمای بدەمێ،جا پێی فەرموو:((**أما إنك لو لم تعطه شيئاً كُتبت عليك كذبة**)).واتە: (خۆ گەر هیچ شتێكت پێنەدایە بەدرۆ لەسەرت دەنووسرا).

منداڵان بەهۆی چاودێریكردنی خووڕەوشتی گەورەكانەوە شوێن پێی ئەوان هەڵدەگرن، ئیدی گەر دایك و باوكیان بە راستگۆ بینی ئەوا لەسەر راستگۆیی پەروەردە دەبن، لە شتەكانی دیكەشدا بەهەمان شێوە.

ئەوەتانێ (ابن عباس)ی منداڵ، كاتێ دەبینێ لەبەرچاوی یەكێ شەونوێژ دەكات ئەویش خێرا هەڵدەستێت و خۆی دەگەیەنێتە پێغەمبەری خواﷺ:

(بخاری) لە (ابن عباس)ەوە ههێناویەتی كە وتوویەتی: شەوێكیان لەلای پورم (میمونە) مامەوە، كاتێك هەندێ شەو تێپەڕیبوو پێغەمبەرﷺ هەستا بۆ شەونوێژ كردن و لە كوندەیەكی هەڵواسراو دەستنوێژێكی سوكی گرت، پاشان هەستا و نوێژی كرد، منیش هەستام وەك ئەو دەستنوێژم گرت و لەلای چەپیەوە راوەستام، پێغەمبەری خواﷺ خستمیە لای راستیەوە، و پاشان نوێژی كرد هێندەی خوا بیەوێ... فەرموودە.

منداڵەكە بەو شێوەی كە بینیبووی هەستاو دەستنوێژی گرت، پاشان وەستا نوێژ بكات.. پێشەنگی چاكی كاریگەر لەسەر منداڵ تا بەو جۆرە دەبێت.

داواکردنیش لە دایك و باوك كە پێشەنگی چاك بن لەبەر ئەوەیە كە منداڵی تازەپێگەیشتوو چاودێری كردار و گفتاریان دەكات و لەبارەی هۆكاری شتەوە پرسیار دەكات، خۆ گەر چاك بوو ئەوە هەر زۆر باشە، ئەوەتا (عبداللە كوڕی ابوبكرە)ی منداڵ چاودێری دوعا و پاڕانەوەی باوكی دەكات و لەو بارەیەوە پرسیاری لێدەكات و باوكیشی وەڵامی دەداتەوەو هۆی ئەو كارەی پێ دەڵێت:

(ابوداود) لە (عبداللە كوڕی ابوبكرە)ەوە هێناویەتی دەڵێت: وتم بە باوكم: باوكە هەموو دەمەوبەیانیەك گوێم لێیە دەڵێیت: (اللهم عافني في سمعي، اللهم عافني في بصري، ولا الـه الاّ أنت) خوایە بیستنم بپارێزە، خوایە بینینم بپارێزە، هیچ خوایەك نیە تەنها تۆ نەبیت، سێ جار لەكاتی لەخەو هەستان و ئێوارانیش سێجار دووبارەی دەكەیتەوە، وتی: كوڕی شیرینم! گوێم لە پێغەمبەری خواﷺ بوو بەوانە دەپاڕایەوە، منیش حەزم لێیە سوننەتی ئەو جێبەجێ بكەم.

دایك و باوكیش لەسەریانە فەرمانەكانی خوای گەورەو سوننەتەكانی پێغەمبەری خواﷺلە رەفتار و كردەوەیاندا جێبەجێ بكەن و ئەوەی لە توانایاندایە لەو بوارەدا بەزیادەوە بیكەن، چونكە منداڵەكانیان لە چاودێریكردنێكی بەردەوامدان، بەیانی و ئێوارەو لەهەموو كات و ساتێكدا،چونكە توانای منداڵیش لە وەرگرتنی بە ئاگایی و بێ ئاگایشدا زۆر زۆر گەورەیە، گەورەترە لەوەی كە ئێمە گومانی پێ دەبەین و بەو چاوەوە سەیری دەكەین كە بوونەوەرێكی بچووكەو تێناگات و هۆشیار نیە.[1]

## بنچینەی دووەم: دیاریكردنی كاتی گونجاو بۆ ڕێنمایی كردن:

هەڵبژاردن و دیاریكردنی كاتی گونجاو لەلایەن دایك و باوكەوە بە مەبەستی ڕێنماییكردنی منداڵەكەیان و ئەو شتانەی كە دەیانەوێت و ئەوەی حەزیان لێیەتی بیدەن بە گوێیدا، ڕۆڵی كارای هەیە لەسەر ئەوەی كە ئامۆژگاریەكە بەرهەمدار بێت و سوودی خۆی بگەیەنێت، و هەڵبژاردنی كاتی گونجاوی كاریگەر لەسەر منداڵ هەوڵی كاری پەروەردكردن كەم و ئاسان دەكات، چونكە بەراستی كات هەیەكە دڵەكان شت وەردەگرن و كات هەیە شت وەرناگرن،جا گەر دایك و باوك توانیان لە كات و ساتی شت وەرگرتنی دڵی منداڵەكانیان ڕێنماییان بكەن ئەوا سەركەوتنێكی مەزن لەو كارە پەروەردەییەیاندا بەدەست دەهێنن.

---

١ منهج التربية الإسلامية ٢/١١٧ لمحمد قطب.

پێغەمبەری خوا ﷺ ش وردبین بووە لە دیاریکردنی کات و شوێنی گونجاو بۆ ڕێنمایی‌کردنی منداڵ، وە سوودمەند بوون لێیان بۆ ئەوەی کە بیروبۆچوون بدەن بە گوێی منداڵاندا، و هەڵس و کەوتی چەوتی ڕاست بکەنەوە و خووڕەوشتێکی ساغ و دروست بنیات بنێن.

پێغەمبەری خوا ﷺ ش سێ کاتی سەرەکی بۆ ڕێنمایی‌کردنی منداڵ بۆمان خستۆتە ڕوو، جا دەبێت ئەو کاتانە چ کاتێك بێت؟

## ١) گەشت، ڕێگا، سواریی:

ئەو فەرموودەیەی (ابن عباس)یش م کە (ترمذی) گێڕابوویەوە کە وتی: ڕۆژێکیان لە پشتی پێغەمبەری خوا ﷺ وە بووم، فەرمووی: یا غلام...فەرموودە) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو ڕێنمونیانەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕێگادا بووە کە پێکەوە ڕۆیشتوون، ئیدی بەپێ ڕۆیشتبن یان بە سواری وڵاغ، وە ئەم ڕێنمایی و ئامۆژگارییانە لە ژوورێکی دیاریکراودا نەبووە، بەڵکو لە هەوایەکی پاك و ئازاد و بەربڵاودا بووە، کە دەروونی منداڵ تێیدا زیاتر ئامادەیە بۆ شت وەرگرتن، و بەهێزترە بۆ وەرگرتنی ئامۆژگاری و ڕێنمونی.

لە گێڕانەوەی (حاکم)دا[١] ئەوە دووپات دەکاتەوە کە ڕۆشتنەکەیان بەسواری وڵاغ بووە، و گێڕاویەتیەوە لە (ابن عباس)ەوەم کە وتوویەتی: (کیسرا) هێسترێکی بەدیاری ناردبوو بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بە گوریسێکی موودار پێی دەڕۆیشت و پاشان منی خستە دواوەی خۆی و ماوەیەکی زۆر پێکەوە ڕۆشتین، دوای ئەوە سەرنجێکی داو فەرمووی: (یا غلام= ڕۆڵە) منیش وتم: لە خزمەتتدام ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: ((**أحفظ الله يحفظك**... فەرموودە)).[٢]

تەنانەت پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕێگادا یەکێ لە منداڵان هەڵدەگرێت و نهێنیەك لە نهێنیەکانی خۆی پێ دەڵێ تا بیپارێزێت، ئەمەش بەهۆی بەهێزی کاریگەریی قسەکردنە لەسەر منداڵ لەو جۆرە کاتانەدا.

ئیمامی (مسلم) لە (عبدالله کوڕی جعفر)ەوەم هێناویەتی، وتوویەتی: ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ لەپشت خۆیەوە سواری کردم و نهێنیەکی پێ وتم کە بۆ هیچ کەسی باس ناکەم، خۆشەویستترین شتیش کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ بەجێهێنانی کاری پێشاو خۆی پەنا بدایە شوێنێکی بەرز یاخود پەرژینی باخەخورما بوو.

---

١ المستدرك ٥٤١/٣.

٢ رقم ٢٧٥ عمل اليوم والليلة للنسائي ت.د.فاروق حمادة.

## ٢- کاتی نانخواردن:

لەو کاتەدا منداڵ هەوڵ دەدات کە لە خووڕەوشتی خۆی دەربچێ، و بەرامبەر ئارەزووکردنی خۆراکدا لاواز دەبێت، و هەندێك جار کردەوەی ناپەسەند بکات، و هەندێ جاری دیکەش واز لە ئادابەکان دەهێنێت، بۆیە گەر دایك و باوك بەردەوام لە کاتی نانخواردندا لەگەڵی دانەنیشن هەڵەکانی بۆ ڕاست بکەنەوە، ئەوا منداڵەکە لەسەر خووڕەوشتە خراپەکانی دەمێنێتەوە، هەروەها بە دانەنیشتن لەگەڵیان کاتی نانخواردن دایك و باوك کاتێکی گونجاوو دەرفەتێکی چاك لەدەست خۆیان دەدەن بۆ ئامۆژگاری و فێرکردنی منداڵەکەیان:

پێغەمبەری خواﷺیش لەگەڵ منداڵاندا نانی خواردووە، و کۆمەڵێ هەڵەی بینیوە لێیان و بەشێوەیەکی زیندوو و عەقڵی و دەروونی منداڵی بزواندووەو بەرەو ڕاستکردنەوەی بردووە، پێغەمبەریشﷺ ئا بەم شێوەیە بووە.

(بخاری) و (مسلم) لە (عمر کوڕی ابوسلمە)وەﷺ هێناویانە کە وتوویەتی: منداڵ بووم، پێغەمبەری خواﷺ بەخێوی دەکردم، کە نانم دەخوارد بەئارەزووی خۆم دەستم دەگێڕا بەناو قاپەکەدا، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((**يا غلام! سمِّ الله تعالى، وكُل بيمينك، وكل مما يليك**)). واتە: (ڕۆڵە! (کاتێ نان دەخۆیت) ناوی خوای گەورە بێنە (بڵێ بسم الله)، و بەدەستی ڕاستت بخۆ، و لەبەردەمی خۆتەوە بخۆ).

دەڵێ: تا ئێستا هەر بەو شێوەیە نان دەخۆم کە فێری کردم.

لە گێڕانەوەیەکی کەدا کە (ابوداود) و (ترمذی) و (ابن حبان) لە (صحیح)ەکەیدا هێناویانە: ((**ادن يا بني! فسمِّ الله وكل بيمينك وكل مما يليك**)).[1] واتە: (نزیك بەرەوە ڕۆڵە و (بسم الله) بکە و بەدەستی ڕاست و لەبەردەمی خۆتەوە بخۆ).

لەم گێڕانەوەیەدا دەبینین پێغەمبەری خواﷺ بانگی منداڵەکە دەکات تا لەگەڵی نان بخوات بەوپەڕی نەرم و نیانیەوە (**ادن** = نزیك بەرەوە لێم) پاشان شێوازی نانخواردن و ئادابەکانی پێدەڵێت.

هاوەڵانی بەڕێزیش منداڵەکانیان لەگەڵ خۆیان دەبرد بۆ دەعوەت و وەلیمە، بەتایبەت ئەوانەی کە پێغەمبەری خواﷺ ئامادەی دەبوو،کە لەم دەعوەت و زەماوەندانەوە فێری زانستێکی بەسوود و دەستووری جوان دەبوون و هێزی پیاوەتیان وردەوردە بەدەست دەهێنا.

---

[1] صحيح: أنظر صحيح الجامع رقم ٢٥١.

(عاصم کوڕی کلیب) لە باوکیەوە[١] ئەویش لە پیاوێکی ئەنصاریەوە گێڕاویەتیەوە کە وتوویەتی: لەگەڵ پێغەمبەری خواﷺ تەرمێکمان بردە دەرەوە بەرەو گۆڕستان، تا گەیشتینە گۆڕستان، وتی: بینیم ئامۆژگاری گۆڕهەڵکەنەکەی دەکرد و دەیفەرموو: ((**أوسع من قِبَل راسه، أوسِع من قبل رجليه**)) واتە: (لای سەری فراوان بکە و لای قاچەکانیشی فراوان بکە).

کاتێ رۆشت نێردراوی ئافرەتێکی قورەیشی پێگەیشت و وتی: فلانە ئافرەت خۆت و هاوەڵانت بانگهێشتی نانخواردن دەکات، دەڵێت: چووین بۆ لای، کاتێ کە خەڵکەکە دانیشتن خواردنیان هێنا، پێغەمبەری خواﷺ دەستی برد بۆ خواردنەکەو ئەوانیش دەستیان پێکرد، لەکاتێکدا کە نانی دەخوارد لەناکاو دەستی کێشایەوە، دەڵێ: ئێمە بەو شێوەیە دانیشتبووین کە منداڵان لە خزمەت باوکیاندا دادەنیشن، دەڵێ: باوکانمان سەیری پێغەمبەری خواﷺیان دەکرد کە چۆن پارووەکەی ناودەمی ئەمسەروئەوسەر پێدەکرد، لەولاشەوە پیاوێك لەدەستی کوڕی خۆی دەدا هەتا ئێسکەگۆشتی دەستی دانێتەوە. پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((**أجد لحم شاة أخذت بغير إذن أهله**)) واتە: (گۆشتی مەڕ دەبینم بەبێ مۆڵەتی خاوەنەکەی بردراوە).

لە گێڕانەوەیەکیکەدا: باوکم لەگەڵ خۆی بردمی، دەڵێت: لەبەردەم باوکماندا دانیشتین وەك مەجلیسی منداڵان لای باوکیان.

لە گێڕانەوەی سێیەمیشدا: کاتێ کە منداڵ بووم لەگەڵ باوکمدا چوومە دەرەوە، پێغەمبەری خواﷺش لەگەڵیاندا بوو.. پاشان فەرموودەکەی باس کردووە.

## ٣- کاتی نەخۆشکەوتنی منداڵ:

نەخۆشی دڵی رەقی گەورەکانیش نەرم دەکات، ئەی دەبێت بۆ منداڵانێك چۆن بێت کە هێشتا دڵ و دەروونیان ئاوەدانە بە نەرم و نیانی و چاك پێشوازیکردن؟! منداڵ کاتێك کە نەخۆش دەکەوێت لەنێوان دوو سروشت و خووی مەزندایە بۆ راستکردنەوەی هەڵەکانی و رەفتاری بگرە بیروباوەڕیشی، خوو و سروشتی فیترەتی منداڵێتییەکەی و سروشتی نەرم و نیانی دڵ و دەروونی لەکاتی نەخۆشیدا، پێغەمبەری خواﷺ بۆ ئەمە ئاراستەی کردووین، ئەوەتا سەردانی منداڵێکی جوولەکە دەکات لەکاتی نەخۆشکەوتنیو بۆ موسڵمان بوون بانگی دەکات... و ئەو سەردانەش بوو بە کلیلی رووناکی ئەو منداڵە:

---

١ رواه الدارقطني ٤/٢٨٥.

(بخـاری) لـە (انـس)ەوەﷺ گێڕاویەتیـەوە کـە وتوویـەتی: کـوڕە جولەکەیـەك خزمـەتی پێغەمبەری خواﷺی دەکرد، نەخۆش کەوت، پێغەمبەری خواﷺ چـوو بـۆ سـەردانیو لـەلای سەریەوە دانیشت و فەرمووی: (اسلم) موسڵمان ببە، کوڕەکەش سەیری باوکی کرد کـە لـەلای بوو، باوکی وتی: بە گوێی (ابوقاسم) بکە، کوڕەکەش موسڵمان بوو، پێغەمبەری خـواﷺ کـە هەڵسا فەرمووی: ((الحمدلله الذي أنقذه من النار)) واتە: (سوپاس بۆ ئـەو خوایـەی کـە لـە ئاگری دۆزەخ رزگاری کرد).

وەك دەبینین ئەو منداڵە خزمەتی پێغەمبەری خواﷺی دەکـرد و تـا ئـەو کاتـەش بـانگی نەکردبوو بـۆ موسـڵمان بـوون، هـەتا پێغەمبـەری خـواﷺ کـاتی گونجـاوی دەسـتکەوت بـۆ بانگەشەکردنی، ئەوەبوو هاتـە لای و سـەردانی کـرد و بـانگی کـرد، بـۆ ئـەو شـێوازەی کـە پێغەمبەری خواﷺ بانگەوازی منداڵانی پێکرد لە خۆم و ئێـوەش دەخـوازم وەك ئـەو بـین لـە ئارامگری و حەوسەڵەو هێمنی لە بانگەوازدا، لەگەڵ هەڵبژرادنی کاتی گونجاو بۆ چاندنی تۆوی ئیمان تا لە سەر خاکێکی بەپیتی چاك و لە کاتێکی شیاودا گەشە بکات.

ئا بەم جۆرە دایك و باوك سێ کاتی سەرەکی گونجاویان لەبەردەستدایە بـۆ ئاڕاسـتەکردن و ڕێنمایکردنی منداڵەکەیان و بنیاتنانی کەسێتی، ئەو سێ کاتەش: گەشت و سەیران و ڕۆیـشتن بە ڕێگادا بەپێ یان بە سوارییی، لەگەڵ کاتی نانخواردن، وە کاتی نەخۆشی، کاتی دیکـەش کـە دایك و باوك بە گونجاوی بزانن بۆ منداڵەکەیان.

## بنچینەی سێیەم: دادگەری و یەکسانی لەنێوان منداڵاندا:[1]

ئەمەش پایەی سێیەمە کە داوا لە دایکان و باوکان کراوە پێوەی پابەندبن تابتوانن ئەوەی دەیانەوێت بەدی بهێنن، ئەویش دادگەری و یەکسانیـیە لەنێوان منداڵاندا.. چونکە شوێنەواری مەزنیان هەیە لەسەر خێراکردنی منداڵان بەرەو چاکەو گوێڕایەڵی. ئەوەندەش بەسە کە بزانین هەست کردنی منداڵ بەوەی کە دایك و باوکیان یا یەکێکیان براکەی زیاتر خۆش دەوێت و ڕێزی لێ دەگرێت ولەم زیاتر نازی پێدەدات، تەنها بەم هەستکردنە خوا نەکا ئەو منداڵە وا

---

[1] ئەوانەی بە پێویستی دەزانن کە یەکسانی بکرێ جیاوازییـان هەیـە لەسـەر چۆنیەتی یەکسانی، (محمد کوڕی حسن) و (احمد) و (اسحاق) و هەندێك لە شافیعیەکان دەڵێن: دادگەری وا دەبێت کە کوڕ دوو هێندەی کیژی پێ بدرێت وەك لە میراتدا پێی دەدرێت، جەماوەری زانایانیش دەڵێن: جیاوازی نیـە لەنێوان کوڕ و کچدا، وا دەردەکەوێت کە فەرمان بە یەکسانی کراوە.

لە کتێبی (تحقيق القضية في الفرق بين الرشوة والهدية)ی شیخ عبدالغني النابلسي ل٢١٩.

چەقاوەسوو دەبێت کە دایك و باوکی خۆیان بۆ راناگیرێت لە بەردەمیدا، و ئیرەیی بردنێکی بۆ دروست دەبێت کە دایك و باوك نەتوانن سەرکێشیەکەی بوەستێنن، ئەوەتانێ براکانی (یوسف) کاتێ زانیان کە باوکیان زیاتر مەیلی دڵی بەلای (یوسف)دایە، باوکیان بەهەڵە دانا: ﴿ إِذْ قَالُواْ لَيُوسُفُ وَأَخُوهُ أَحَبُّ إِلَىٰٓ أَبِينَا مِنَّا وَنَحْنُ عُصْبَةٌ إِنَّ أَبَانَا لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴾یوسف/٨.واتە: ((وتیان): بەراستی یوسف و براکەی لای باوکمان، لەئێمە نازدارترن و زیاتر لەئێمە گرنگیان پێدەدات، لە حاڵێکدا ئێمە کۆمەڵێکی بەهێزین، بەراستی باوکمان لە سەرشێواویەکی ئاشکرادایە).

دەرئەنجامی ئەو بۆچوونەشیان ئەوەبوو کە هەستن بە کارێکی بەد دەرهەق براکەیان و مافی باوکایـــــــەتی: ﴿ ٱقْتُلُواْ يُوسُفَ أَوِ ٱطْرَحُوهُ أَرْضًا يَخْلُ لَكُمْ وَجْهُ أَبِيكُمْ وَتَكُونُواْ مِنۢ بَعْدِهِۦ قَوْمًا صَٰلِحِينَ ﴿٩﴾ قَالَ قَآئِلٌ مِّنْهُمْ لَا تَقْتُلُواْ يُوسُفَ وَأَلْقُوهُ فِى غَيَٰبَتِ ٱلْجُبِّ يَلْتَقِطْهُ بَعْضُ ٱلسَّيَّارَةِ إِن كُنتُمْ فَٰعِلِينَ ﴿١٠﴾ ﴾یوسف/٩-١٠. واتـە: (یوسـف بکـوژن، یـان فڕێـی بدەنـە شـوێن و زەوییەکی دوور، ئەو کاتـە رووی باوکتـان یـەکلایی دەبێتـەوە بـۆ ئێـوەو خۆشەویـستیەکەی هەمووی بۆ ئێوە دەبێت، ئینجا دوای نەمانی یوسف دەبنە کوڕ و کەسـانێکی رێـك و پێـك.. یەکێك لە براکان وتی: ئەگەر بڕیاربێ هەر شتێکی لێ بکەن، ئەوا یوسـف مـەکوژن، بـەڵکو بیخەنە ناو بیرێکی قووڵەوە، دوایی کاروان دێت و دەیدۆزنەوەو دەیبەن).

بەم جۆرە ئەو پلانەیان بەرامبەر برابچووکەکەیان رێکخست و پتـەوکرد کـە هێـشتا بـاڵغ نەبووبوو، وە هیچ گوناهێکیشی نەبوو ئەوە نەبێت کە باوکی ئەوی زیاتر لـە براکـانی خۆشـتر دەویست.. ئەو ئیرەیی بردنە بووە هۆی ئەو فێڵ و تەڵەکەیە، لەبەر ئەوە باوك و دایك هەرچـی ئامۆژگاری و رێنموونی پێشکەش مندالـەکانیان بکـەن، و هانیـان بـدەن و بیانترسـێنن هـیچ ئاکامێکی نابێت گەر پابەند نـەبن بـە دادگـەری و یەکـسانی مـاددی و مەعنـەوی لـەنێوان منداڵەکانیانـدا، و مـەیلی دڵیـان دەرنەخـەن بـەلای یەکێکیانـدا لەبـەردەم مندالـەکانیان و نەوەکانیاندا.

پێغەمبەری خواﷺش ڕێسایەکی مەزنی بۆ داناوین لە چۆنیەتی چاکبوون بۆ منداڵان و ملکەچبوونیان بۆ دایك و باوکیان.. کە ئەویش دادگەری و یەکسانیە.. فەرموو لەگەڵ ڕوونکردنەوەی ئەمەدا:

(بخاری) و (مسلم) لە (نعمان کوڕی بشیر)ەوەرضي الله عنه گێڕاویانەتەوە کە باوکی بردویەتیە خزمەتی پێغەمبەری خواﷺ و وتی: من بەندەیەکم هەبوو داومە بەم منداڵەم؟ پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی:

((أكل ولدك نحلته مثل هذا)) واتە: (ئایا هەموو منداڵەکانت وەك ئەمەت پێبەخشیون؟).

وتی: نەخێر، فەرمووی: ((لا تشهدني على جور)). واتە: (کەواتە من مەکە بە شاهێد لەسەر جەورو ستەم).

پاشان پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((أيسرُّك أن يكونوا اليك في البر سواء؟)) واتە: (ئایا حەزناکەیت کە هەموویان وەك یەك بۆت باش بن؟)

وتی: بەڵێ حەز دەکەم، فەرمووی: ((فلا إذن)) واتە: کەواتە نابێ وابکەیت.

لە گێڕانەوەی (مسلم)یشدا: فەرمووی: ((أفعلت هذا بولدك كُلهم؟)) واتە: (ئایا ئەوەت بۆ هەموو منداڵەکانت کردووە؟)

وتی: نەخێر. فەرمووی: ((أتقوا الله وأعدلوا في أولادكم)) واتە: (دەی لەخوا بترسن و دادگەربن و بەیەك چاو سەیری منداڵەکانتان بکەن).

ئیدی باوکم لەو خێرەی پاشگەز بوویەوە.

لە گێڕانەوەی (الدارقطنی)شدا ٤٢/٣: پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((لك ولد غيره؟)) واتە: منداڵی دیکەی جگە لەمت هەیە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: ((فأعطيتهم كما أعطيته؟)) واتە: ئەوانیش وەك ئەم پێت بەخشیوون؟

وتی: نەخێر، فەرمووی: ((ليس مثلي يشهد على هذا، إن الله تعالى يحب أن تعدلوا بين أولادكم، كما يحب أن تعدلوا بين أنفسكم)). واتە: (کەسێکی وەك من نابێتە شاهیدی شتی وا، چونکە خوای گەورە حەزدەکات کە دادگەربن لەنێوان منداڵەکانتاندا، هەروەك چۆن حەز دەکات لەنێوان خۆتاندا دادگەر بن).

ئیمام (احمد) و (ابوداود) و (نسائی) و (ابن حبان)یش فەرموودەکەی (نعمان کوڕی بشیر)یانڕضي الله عنه گێڕاوەتەوە، کە وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((**اعدلوا بين أولادكم، اعدلوا بين أولادكم، اعدلوا بين أولادكم**))[1] واتە: دادگەربن لەنێوان منداڵەکانتاندا، دادگەربن لەنێوان منداڵەکانتاندا، دادگەربن لەنێوان منداڵەکانتاندا.

هەر لە (نعمان کوڕی بشیر)ەوەﷺ کە وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((**أعدلوا بين أولادكم في النحل كما تحبون أن يعدلوا بينكم في البرّ واللطف**))[2]، واتە: (لە شت بەخشین بە منداڵەکانتان دادگەر بن لە نێوانیاندا، هەروەك چۆن حەزدەکەن لە چاکە و لوتفدا ئەوان لەنێوانتاندا دادگەر بن).

شیخ (عبدالغنی النابلسی): لە لێکدانەوەی ئەم فەرموودەیەدا دەڵێت: رووی نیشانەو بەڵگە لەم فەرموودەیەدا ئەوەیە کە نایەکسانی لەنێوان منداڵاندا حەرامە، لە سەرووی ئەمەشەوە جیاکردنەوەی هەندێك لە منداڵان بەسەر هەندێکیەیاندا کارێکە لەوانەیە ببێتە هۆی پەیدابوونی دوژمنایەتی و کینەو رق لە نێوانیاندا و ئەوەش ببێتە هۆی پچڕاندنی پەیوەندی بەزەیی یان.[3]

پێشینانی چاکیش بەهۆی زۆر بەئاگابوونیانەوە دادگەر بوون لەنێوان منداڵەکانیاندا تەنانەت لە ماچکردنیشدا، ئەمەش وەك بەدەمەوەچوونی بانگەوازی پێغەمبەری خواﷺ و بەجێهێنانی فەرمانەکانی، هەتا پێغەمبەری خواﷺ هۆشیاری دەدات لەبارەی دادگەری لە ماچکردنی منداڵی کوڕ و کچدا:

(بیهقی) گێڕاویەتیەوە لە (انس)ەوەﷺ: کە پیاوێك لە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ دانیشتبوو، کوڕێکی هات ماچی کرد و لەسەر کۆشی داینا، پاشان کچێکی هات و لە تەنیشت خۆیەوە داینا، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((**فما عدلت بينهما**)) دادگەر نەبویت لەنێوانیاندا.

(طاوس) دەڵێت: جیاوازی کردن لە نێوانیاندا دروست نیە، تەنانەت لە کولێرەیەکی سووتاویشدا.

---

١ اسناده حسن. انظر سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم ١٢٤٩.

٢ رواه ابن ابي الدنيا في كتاب العيال (١٧٢/١) وقال محققه: حديث صحيح.

٣ عن تحقيق القضية في الفرق بين الرشوة والهدية، للشيخ النابلسي ص٢١٧.

(ابن مبارك)یش هەمان شتی وتووەو هاومانای ئەوەشی لە (مجاهد) و (عروە)وە گێڕاوەتەوە.[١]

باشە چ بەرنامەیەك لە هەموو جیهاندا و كام قوتابخانەی پەروەردەیی سەرگۆی زەوی دەتوانێت هۆشیاری بدات دەربارەی دادگەری لە ماچكردن و دانان لە كۆش و تەنیشتدا؟! بەراستی ئەمە چرای رووناكی بەخشی پێغەمبەرە ﷺ.

لە زۆر كاتیشدا دەمەقاڵێ و شەڕ دەكەوێتە نێوان منداڵان خۆیان، یان لەنێوان منداڵانی كەدا روو دەدات، لەو كاتەدا هەتا دڵ و دەروونی ئەو منداڵانە پاك بێتەوە، دوور كەویتەوە لە فێڵ و تەڵەكەو ئیرەیی، جا دەبێت جیابكرێنەوەو رەوا بەدی بهێنرێت و نارەواش پوچەڵ بكرێتەوە.. و دادگەر و یەكسان بێت لە نێوانیاندا، ئەوەتا پێغەمبەری خوا ﷺ دوو منداڵ پێكەوە شەڕیان دەكرد جیایان دەكاتەوە و بیروبۆچوونە هەڵەكانیان بۆ راست دەكاتەوەو داوا لە گەورەكان دەكات بۆ لابردنی ستەم بە هەموو شێوەكانیەوە، هەر كاتێكیش ستەم لابرا و نەما دادگەری شوێنی دەگرێتەوە.

(مسلم) لە (جابر كوڕی عبدالله)وە رضي الله عنه گێڕاویەتیەوە كە وتوویەتی: دوو منداڵ پێكەوە شەڕیان دەكرد، یەكێكیان (مهاجر) بوو، ئەویكەش (انصار)، (مهاجر)ەكە هاواری كرد: ئەی (مهاجر)ەكان.. (انصار)یەكەش هاواری كرد: ئەی (انصار)یەكان..جا پێغەمبەری خوا ﷺ چوویە دەرەوەو فەرمووی: ئەوە چیە؟ بانگەوازی نەفامییە؟ وتیان: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دوو منداڵن شەڕیان كردووە، یەكێكیان شەقێكی لەدواوەی ئەوی تر هەڵداوە، فەرمووی: ((**لا بأس ولینصر الرجل أخاه ظالماً أو مظلوماً، إن كان ظالماً فلینهه، فإن هذا له نصر، وإن كان مظلوماً فلینصره**)). واتە: (قەیناكات، با هەركەس لەئێوە براكەی خۆی سەربخات، ئەگەر ستەمكار بوو نەهێڵێت ستەم بكات و ئەوەش سەركەوتنە بۆی، خۆ ئەگەر ستەملێكراو بوو ئەوا سەری بخات).

ئەوەش دادگەرییە كە منداڵانت بینی شەڕیان دەكرد، لێكیان بكەیتەوە، چونكە هەردەبێت یەكێكیان ستەمكار و ئەوی دیكەیان ستەملێكراو بێت، لەبەر ئەمەشە كە (ترمذی) وتویەتی: (ابو عبدالله احمد كوڕی حنبل)م بینی بەلای هەندێك منداڵانی خوێندكاردا تێپەڕی شەڕیان دەكرد و لێكی جیاكردنەوە.[٢]

---

١ المصدر السابق ص٢١٨.

٢ الآداب الشرعیة والمنهج المرعیة لمحمد بن مفلح المقدسي الحنبلي ١/١٨٢.

لە کۆتایی ئەم پایەدا ئەم مزگێنییە ئاڕاستەی دایکان و باوکانی دادگەر و پەروەردەکارانی یەکسانیخواز دەکەین، تا پاداشتی رۆژی دواییان ببینن، سەرەڕای بەدیهێنانی ئامانجە پەروەردەییەکانی دنیایان، ئەمەش بەدەستهێنانی چەند مینبەرێکە لە رووناکی، خوای گەورە من و ئێوەش بخاتە رێزی ئەوانەوە... و هەردوولامان سەرکەوتوو بکات بۆ دەستگرتن بە دادگەرییەوە.

(مسلم) لە (عبداللە کوڕی عمرو کوڕی عاص)ەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە وتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((**إن المقسطين عند الله على منابر من النور.. الذين يعدلون في حكمهم وأهليهم وما وُلُوا**)). واتە: (دادپەروەران لە رۆژی قیامەتدا لای خوای گەورەن لەسەر مینبەرانێك لە رووناکی، ئەوانەی کە دادگەرن لە فەرمانداریی و بڕیاری راست دەدەن و لەناو خێزانەکانیان و کەس و کاری خۆیاندا و دادپەروەرن لەگەڵ ژێردەستەکانیاندا).

دەمێنێتەوە پرسیارێکی گرنگ کە رووبەڕووی دایکان و باوکان دەبێتەوە، کە ئەوەیە: کەی رێگە بە فەزڵدان دراوە؟

ئیمام (احمد کوڕی حنبل): وای دەبینێت کە فەزڵدانی منداڵ بەسەر یەکدا حەرامە، گەر هۆیەك یاخود پێویستیەك بۆ ئەو فەزڵدانە نەبێت، لەو بارەدا هیچ رێگرێك نیە هەروەك لە (المغنی)دا وتویەتی:[1] گەر هەندێکیانی تایبەتکرد بە مانایەك کە پێویست بێت تایبەتی بکات وەك پێویستی بە شتێك، یان کاتێك یاخود کوێری یان زۆری خێزان یاخود سەرقاڵبوونی بە زانست و زانیارییەوە، و هاوشێوەی ئەوانە لە فەزڵ یان نەبەخشین بە هەندێك لە منداڵەکانی لەبەر لە دەستووری شەرع دەرچوونی، یان بیدعەچێتی، یان بەهۆی ئەوەی کە ئەوەی وەری دەگرێت لە شتێکی خراپ و سەرپێچی خوادا سەرفی دەکات، لە (احمد)ەوە گێڕاویانەتەوە کە بەڵگەیە لەسەر دروستی ئەوە، بەهۆی ئەو قسەیەیەوە دیاریکردنی هەندێکیان بە وەستان هیچی تێدا نیە گەر لەبەر پێویستیەك بێت، بەڵام قەدەغەی کردووە ئەگەر لەسەر شێوەی تایبەتکردن و بەخشین بێت لە واتادا.[2]

---

١ أنظر المغني لأبن قدامة ٥/٦٠٤.

٢ عن تحقيق القضية في الفرق بين الرشوة والهدية، للشيخ النابلسي ص٢١٨.

## بنچینەی چوارەم: بەدەمەوەچوونی مافەکانی منداڵ:

ماف پێدانی منداڵ و حەق لێ قبوڵکردنی، لەدەروونیدا هەستێکی لەبار و ئیجابی بەرامبەر ژیان دەچێنێت، و فێر دەبێت کە ژیان وەرگرتن و بەخشینە، هەروەها مەشق پێکردنی منداڵیشە لەسەر ملکەچبوون بۆ حەق، چونکە لەبەردەمیدا پێشەنگێکی چاك دەبینێت، خۆ راهاتنی لەسەر قبوڵکردنی حەق و ملکەچبوون بۆی بە شێوەیەکی دادگەرانە وزەو تواناکانی ئاوەڵا دەکات تا رێگای خۆی دیاری بکات بۆ گوزارشت کردن لە خۆی و داواکردنی مافەکانی، پێچەوانەی ئەوەش دەبێتە هۆی خەفەکردنی و لاواز بوونی... ئەوەتانێ پێغەمبەری خواﷺ مۆڵەت لە منداڵێکی لای راستی دەخوازێت تا دەست لەو مافەی خۆی هەڵگرێت و بیداتە ئەو پیاوە بەتەمەنەی کە لەلای چەپیەوەیە، بەڵام منداڵەکە کەسی تر بەسەر خۆی هەڵنابژێرێ لە خواردنەوەی بەرماوەی پێغەمبەر، پێغەمبەری خواﷺش قاپەکەی پێ‌دەدات تا بیخواتەوە و شادبێت بە بەهرەمەندبوون بە مافی خۆی.

(بخاری) و (مسلم) لە (سهل کوڕی سعد)ەوەﷺ هێناویانە، جارێکیان خواردنەوەیەکیان هێنا بۆ پێغەمبەری خواﷺ و لێی خواردەوە، لەلای راستیەوە کوڕێك دانیشتبوو، لای چەپیشیەوە پیاوانێکی بەساڵاچوو، پێغەمبەری خواﷺ بە کوڕەکەی فەرموو: **((أتأذن لي أن أعطي هؤلاء؟))** ئایا مۆڵەتم دەدەیت بیدەم بەوانە؟ کوڕەکە وتی: نەبەخوا، ئەی پێغەمبەری خوا! بەشی خۆم لە بەرماوەی تۆ بە کەسی تر نادەم، پێغەمبەری خواﷺ جامەکەی دایە دەستی..

(رزین) ئەوەشی بۆ زیاد کردووە: کوڕەکە (فضل کوڕی عباس) بوو.[١]

کاتێکیش منداڵێك دێتە پێشەوەو رەخنەی هەیەو نارازییە بەهۆی هەستکردنی بە لە بیرکردنی مافەکانی، دێت بۆ لای پێغەمبەری خواﷺ، بەر لە غەزای (احد) و بە خۆشەویست و (مصطفی)کەی دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا! رازی بوویت ئامۆزاکەم بەشداری شەڕ بکات.. کە من گەر زۆرانی لەگەڵدا بکەم دەیبەزێنم! پێغەمبەریشﷺ مۆڵەتیان دەدات لەبەردەمیدا زۆرانێ بکەن.. کاتێکیش لە کوڕە مامەکەی دەباتەوەو دەیدا بە زەویدا، پێغەمبەری خواﷺ

---

١ أنظر جامع الأصول ٥/٨٤. ت.الأرناؤوط. ذكره النووي في كتابه (رياض الصالحين) باب (التنافس في أمور الآخرة).

مۆڵەی پێدا تا ببێتە سەربازێکی موسڵمان بۆ شەڕ کردن لە دژی هاوبەشپەرستان.. جا ئایا هیچ کەسێك لە دنیادا هەیە کە پلەوپایەی بەرزتر بێ، و ڕێز و قەدر و جێگای بڵندتر بێ و زیاتر سوپادار و خاوەن شوێنکەوتە بێت لە پێغەمبەری خواﷺ؟ نەخێر.. هەزار نەخێر.

جا لەگەڵ ئەو پایەبەرزیەی حەقەکەی لەمنداڵەکە قبوڵ کرد، پێغەمبەرﷺ فێری کردووین و ڕێنمایی کردووین کە حەق لە بچووك قبوڵ بکەین بەبێ هیچ خۆ بەگەورەگرتن و لوت بەرزی و کەش و فش کردنێك بەسەر منداڵدا.. دەکرێت لە دەستەیەك لە گەورەکان بپرسین بۆ فێڵ و پێچ و پەنا بەکاردەهێنن و ڕادەکەن لە ملکەچبوون و بەدەمەوەچوونی مافەکانی منداڵان، جا بۆ کەسانی هاوشێوەی ئەوانە ئەم فەرموودەیەیان ئاڕاستە دەکەین:

(ابن عساکر) و (دیلمی) لە (ابن مسعود)ەوە‎ گێڕاویانەتەوە، کە وتوویەتی: وتم بە پێغەمبەری خواﷺ: چەند وشەیەکم فێر بکە سوودی زۆری تێدا کۆ بووبێتەوە؟ فەرمووی:

((**اعبد الله ولا تشرك به شيئاً، وزلْ مع القرآن أينما زال، وأقبل الحقَّ ممن جاء به صغيراً أو كبيراً وإن كان بغيضاً بعيداً، واردُدِ الباطل ممن جاء به صغيراً أو كبيراً، وإن كان حبيباً قريباً**)). واتە: (خوا بپەرستە و هیچ شتێك مەکە بە هاوبەشی، و لەگەڵ قورئاندا بە لە هەرکوێیەك بوو، و حەق قبوڵ بکە هەر کەس هێنابێتی، گەورە بێت یا بچووك، با کەسێکی دووریش بێت کە رقت لێی بێت، ناڕەواش (باطل) بدەرە دواوە، هەرکەس هێنابێتی، بچوك بێت یا گەورە، با کەسێکی خۆشەویستی نزیکیشت بێ).

منداڵیش مافی خۆیەتی کە ببێتە پێشەوا و سەرکردە گەر زانا و قورئان خوێنی تەواو بوو بەسەر ئەو کەسەی لەڕووی زانست و زانیارییەوە لەم گەورەترە:

ئیمام (عبدالرزاق) لە (مصنف)ەکەیدا گێڕاویەتیەوە لە (مهاجر کوڕی حبیبی زبیدی)ەوە کە دەڵێت: (ابوسلمە کوڕی عبدالرحمن) و (سعید کوڕی جبیر) پێکەوە بوون، (سعید) بە (ابوسلمە)ی وت: فەرموودەمان بۆ باس بکە شوێنت دەکەوین، (ابو سلمە) وتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((**إذا كان ثلاثة في سفرفليؤمّهم أقرؤهم، وإن كان أصغرهم، فإذا أمّهم فهو أميرهم**)). واتە: (کاتێ سێ‌کەس بۆ سەفەر دەچن، با لەناو خۆیاندا ئەو کەسەیان کە لە یاساکانی نوێژ شارەزاترەو قورئانخوێنترە بکەنە پێشنوێژ(ئیمام)ی خۆیان، با لە هەمووشیان بچوکتر بێت، جا گەر بووە پێشنوێژیان، ئەوا ئەمیریانە).

(ابوسلمە) وتی: کەواتە ئەوە ئەو ئەمیرەیە کە پێغەمبەری خواﷺ فەرمانی پێکردووە.

ئیمام (مسلم)یش گێڕاویەتیەوە کە (ابو موسا) سێجار مۆڵەتی چوونەژوورەوەی لە (عمر) خواست، جا وەك ئەوەی هەست بکات سەرقاڵە گەڕایەوە.. (عمر) وتی:ئایا گوێت لـە دەنگـی (عبداللە کوڕی قیس) نەبوو؟! مۆڵەتی پێبدەن، بۆیان بانگ کرد، پێی وت: چی وای لێکردیـت ئەو کارە بکەیت؟ وتی: ئێمە فەرمانمان بەوە پێدەکرا، وتی: دەبێت لەسەر ئەوە بەڵگە بهێنیت ئەگینا خۆم دەزانم چی دەکەم، جا چوویە دەرەوە بۆ لای کـوڕی ئەنـصاریەکان، وتیـان: کـەس شاهێدیت لەسەر ئەوە بۆ نادات بچوکترین کەسمان نەبێت، (ابـو سـعدی) هـات و وتـی: ئێمـە فەرمانمان بەوە پێ دەکرا، (عمر) وتی: ئەو فەرمانەی پێغەمبەری خـواﷺ لـێم شـاراوە بـوو بەهۆی سەرقاڵیم بە کاری بازرگانی و بازاڕەوە.

لەگێڕانەوەیەکی دیکەدا: کەسی کۆڕەکـە لەگـەڵی نـەهات تـەنها بـچووکترینیان نـەبێت، (ابوسعید) دەڵێ: وتم: من بچووکترین کەسی ئەم خەڵکەم، دەڵێت: لەگەڵ خۆت بیبە.

لە گێڕانەوەیەکی کەشدا: کەسمان لەگەڵت نایەت تەنها بچوکترینمان نـەبێت لـە تەمەنـدا، ئەی (ابوسعید) هەستە!

برای موسڵمانم! بینیت کە ئەمیری باوەڕداران شایەتیەکی حەق وەردەگرێت لـە منـداڵێکی وەك(ابو سعیدی خدری)؟ جا ئایا شوێن پێی هەڵنەگرین؟!

پێشینانی چاکیش هەمان ڕێگای قبوڵکردنی حەقیان لە منداڵی بچووك گرتۆتە بەر، ئیدی شێوەی هەرچۆن بووبێت.

ئەوەتانێ (ابوحنیفە): ئامۆژگاری لە وتەی منداڵێکی بچووك وەردەگرێت، کاتێك کە ئیمام منداڵەکەی بینی بە قوڕ یاری دەکرد، بە منداڵەکەی وت: وریابـە نەکەویتـە نـاو قوڕەکـەوە، منداڵە بچووکەکە بە ئیمامی گەورەی وت: تۆ وریای خۆت بە نەکەوی، چونکە کـەوتنی زانـا کەوتنی جیهانە، جا (ابوحنیفە) بەو وتەیە دڵی هەژا، پاش بیستنی ئەو وتەیەی ئـەو منداڵـە بچووکە فەتوایەکی دەرنەدەکرد تا یەك مانگی تەواو لەگەڵ قوتابیـەکانیـدا لێـی نـەکۆڵیباوەو تاوتوێی نەکردایە.[1]

---

1 مقدمة حاشية ابن عابدين.

(مسعر) وتوویەتی: لەگەڵ (ابوحنیفه)دا دەڕۆیشتم،جا پێی نا بە قاچی منداڵێکی بچووکدا کە نەیبینیبوو، منداڵەکە بە (ابوحنیفه)ی وت: یا شێخ! لە تۆڵەسەندنەوەی ڕۆژی قیامەت ناترسیت؟ وتی: (ابو حنیفه) بورایەوەو لەسەری وەستام تا هۆشی هاتەوە، پێم وت: ئەی (ابو حنیفه) بۆ قسەی ئەو منداڵە ئەوەندە زۆر کاری لەدڵت کرد؟ وتی: دەترسم پێی وترابێت.[١]

(ابن ظفر المكي) گێڕاویەتیەوە[٢] و وتوویەتی: پێم گەیشت کە (سری کوڕی مغلسی سقطی) ئایەتی:﴿ وَنَسُوقُ ٱلْمُجْرِمِينَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ وِرْدًا ﴾مریم/٨٦. بۆ مامۆستاکەی خوێندەوە، وتی: مامۆستا (ورد) چی یە؟ وتی: نازانم، پاش ئەوە ئایەتی ﴿ لَّا يَمْلِكُونَ ٱلشَّفَٰعَةَ إِلَّا مَنِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحْمَٰنِ عَهْدًا ﴾مریم/٨٧. خوێندەوە، و وتی: مامۆستا! (عهد) چی یە؟ ئەویش وتی: نازانم، جا (سری) خوێندنەوەکەی بڕی و وتی: کە تۆ نازانیت بۆ خەڵکی هەڵدەخەڵەتێنی؟! جا مامۆستاکەی لێی دا، (سری) وتی: مامۆستا! نەزانی و لەخۆبایی بوون بەست نەبوو، هەتا ستەم و ئازاردانیشت خستە پاڵ، مامۆستاکەی داوای لێبوردنی لێ کرد و لای خوای گەورە تۆبەی کرد لە فێرکردن، و رووی کردە داواکردنی زانست و هەمیشە دەیوت: (سری) لە کۆیلەتی نەفامی دەربازی کردم.

گەر زیادەییمان کردبێت لە گێڕانەوەی ئەم چیرۆکانەدا، ئەوە بۆ ڕۆشنکردنەوەی ڕێگەیە بۆمان، و مەشق پێکردنمانە لەسەر گوێڕاگرتن بۆ قسەی منداڵ.

(حسین کوڕی فضل) کە منداڵ بوو چوو بۆ خزمەت هەندێ لە خەلیفەکان کە ژمارەیەکی زۆر لە زانایانی لابوو، جا حەزیکرد قسە بکات، سەرزەنشتی کرد و وتی: منداڵێك ئا لەم شوێن پایەدا قسە بکات؟! ئەویش وتی: خۆ گەر منداڵیش بم ئەوا لە پەپوەکەی (سلیمان) بچوکتر نیم و تۆش لە (سلیمان) گەورەتر نیت کاتێ پەپوو پێی وت: ﴿أَحَطتُ بِمَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ﴾ النمل/٢٢. واتە: ((ئەوەی من پێم زانیوە، تۆ پێت نەزانیوە)).. پاشان وتی: ئەی نابینیت کە ئەو (سلیمان)ی لە حوکمەکە تێگەیاند، خۆ گەر فەرمانکردن بە گەورەیی تەمەن بوایە (داود) لەپێشتر بوو).[٣]

---

١ ص٤٠٦ مناقب ابي حنيفة للإمام الموفق بن احمد المكّي المتوفي سنة٥٦٨هـ.

٢ ص١٤٦ أنباء نجباء الأبناء، لأبن ظفر المكي.

٣ ص٦٤ تذكرة الآباء وتسلية الأبناء، لأبن العديم.

پێشتریش ئەوە خرایە روو کە ئیمام (مالك) قسەی ئیمام (شافعی)ی منداڵی قبوڵ کرد و بینیمان چۆن منداڵێکی بچووك هەڵەکەی بۆ ئیمامی گەورە راستکردەوە.

ئەوەتا (عمر کوڕی عبدالعزیز)یش کاتێ جڵەوی خەلیفایەتی گرتە دەست و لە هەموو لاوە شاند دەهات بۆ پیرۆزبایی لێکردنی بەبۆنەی وەرگرتنی پۆستی نوێوە، منداڵێك وەك نوێنەری یەکێ لە شاندەکان هاتە پێشەوە تا بەناوی شاندەکەیەوە قسە بکات، خەلیفە (عمر) وتی: چییە هۆزەکەتان لەو بەتەمەنتری تێدا نیە قسە بکات؟ منداڵەکە بە (عمر)ی وت: ئەی ئەمیری باوەڕداران، گەر فەرمان بەپێی گەورەیی تەمەن بوایە دەبوو ئێستا ئەوەی لە تۆ بەتەمەنترە لەشوێنی تۆدا بوایە.. ئەی ئەمیری باوەڕداران! ئایە نەتزانیوە کە مرۆڤ بە هۆی دوو بچووکەکەوەیە، دڵی و زمانی؟! خەلیفە وتی: ئەی منداڵ! ئامۆژگاریم بکە؟ ئەویش ئامۆژگاری کرد و پەندی دادا هەتا خەلیفەی گریاند.[1]

ئەو دەروونە مەزنانە.. و ئەو سەرە پڕ زانست و زانیاریانەت بینی کە چۆن ئامۆژگاری و رێنمایی لە منداڵان وەردەگرێت، و بە لەخۆبردوویییەوە گوێیان بۆ دەگرێت، و لە بیروبۆچوونەکانیان سوودمەند دەبێت، و بیرۆکە هەڵەکانی خۆیان، و شێوازی مامەڵەیانی پێ راست دەکەنەوە.. خوای گەورە من و تۆش بخاتە سەر رێی هیدایەتی ئەوان و حەق قبوڵ بکەین جا لە گەورە بێت یان لە بچووك.

## بنچینەی پێنجەم: پاڕانەوە بۆ منداڵان:

نزاو پاڕانەوە لەو پایە سەرەکیانەیە کە دایکان و باوکانی پێ دوێندراوە کە پابەند بن پێوەی لەو کات و ساتانەی گیرابوونی دوعادا کە پێغەمبەری خواﷺ روونی کردۆتەوە، چونکە پاڕانەوەی دایك و باوك لای خوای گەورە گیرایە، بەهۆی دوعاوە وزەو تینی سۆزداری زیاتر دەبێت، و بەزەیی و دڵنەرمی لەدڵی دایك و باوکدا جێگەی خۆی دەکاتەوە.. و ئەوانیش بەملکەچیەوە روو دەکەنە خوای گەورەو تکای لێ دەکەن کە منداڵەکەیان و داهاتووی چاك بکات، ئەمەش سوننەت و رێبازی پێغەمبەران و نێردراوانەکە بەو شێوەیە خرایە روو کە لە ئایەتەکانی یەکەم لاپەڕەی ئەم کتێبەدا هاتووە.

---

[1] مواقف حاسمة بين العلماء والحكام، لعبدالعزيز البدري، أنظر ص٦٤ من كتاب تذكرة الآباء و تسلية الأبناء، لأبن العديم.

جا لەبەر ئەمەیە کە ترسناکی ئەوە بەدی دەکەین کە کەسێ نزا لە منداڵەکەی خۆی بکات، بەراستی ئەوە کارێکی زۆر مەترسیدارە، کە هەرچەندە لەبارەی ترسناکییەوە بلێین هێشتا کەمە، چونکە نزاکردن لە منداڵ وێرانی بۆ منداڵ و داهاتووەکەی تێدایە، هەروەها ماڵوێرانی دایك و باوکیشە بەهەمان شێوە.

پێغەمبەری خواﷺیش قەدەغەی کردووە لە دایکان و باوکان کە دوعا لە منداڵەکانی خۆیان بکەن، چونکە ئەوە پێچەوانەی رەوشت و دەستووری ئیسلامە، و یەکناگرێتەوە لەگەڵ پەروەردەی پێغەمبەریدا، و دوورە لە بەرنامەی پێغەمبەرﷺ لە بانگەوازکردنی خەڵکی بۆ لای ئیسلام، هەتا پێغەمبەری خواﷺ دوعای لە موشریکانی (طائف)یش نەکرد و فەرمووی:((**أرجو من الله تعالى أن يخرج من اصلاهم من يعبد الله**)) واتە: (ئومێدەوارم کە خوای گەورە لە نەوەکانی ئەمانە کەسانێك بێنێتە کایەوە کە خوا بپەرستن.. ئەوەبوو خوای گەورە ئومێدەکەی هێنایە دی).

لەبەر ئەمە دەبینین پێغەمبەری خواﷺ قەدەغەی کردووە دایکان و باوکان دوعا لە منداڵی خۆیان بکەن:

(ابوداود) گێڕاویەتیەوە:کە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((**لا تدعوا على أنفسكم، ولا تدعوا على أولادكم، ولا تدعوا على خدمكم، ولا تدعوا على أموالكم، لا توافقوا من الله ساعة فيترل فيها إعطاء فيستجاب لكم**)). واتە: (دوعا لە خۆتان مەکەن، و دوعا لە منداڵەکانتان مەکەن، و دوعا لە خزمەتکارەکانتان مەکەن، و دوعا لە ماڵ و سامانتان مەکەن... نەبادا هاوکاتی ئەو ساتە بێ کە خوای گەورە نزای تێدا گیرا دەکات و دوعاکەتان گیرا بێت).

ئیمام (غزالی)یش باسی کردووە: پیاوێك هات بۆ لای (عبداللە کوڕی مبارك) و شکایەتی لە منداڵەکەی دەکرد کە دڵی دەڕەنجێنێت، پێی وت: دوعای خراپت لێی کردووە؟ وتی: بەڵێ، ئەمجا (عبداللە) وتی: تۆ ئاوا خراپت کردووە.[1]

با لەبری ئەوەی بە دوعاکردن لێی ببیتە هۆی خراپبوونی منداڵەکەت، ببە هۆی چاکبوونی منداڵەکەت و دوعای چاکی بۆ بکە، هەروەك پێغەمبەری خواﷺ دەیکرد و دەپاڕایەوە بۆ منداڵان و خوای گەورەش فەڕ و بەرەکەتی دەخستە ناییندەیانەوە بە کار و سامان و منداڵ:

---

١ الإحياء ٢/٢١٧.

(بخاری) لە (ابن عباس)ەوەم هێناویەتی، وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ نووساندمی بە سینگیەوەو فەرمووی: ((**اللهم علّمه الحكمة**)) واتە: (خوایە دانایی فێر بکە).

لە گێڕانەوەیەکی کەدا: ((**علّمه الكتاب**)) واتە: (شارەزای قورئانی بکە).

لە گێڕانەوەی (مسلم)یش و (بخاری)دا: ((**اللهم فقهه في الدين**)) واتە: (خوایە لە ئایین شارەزای بکە).

لەلای (احمد) ئەم زیادەیەش هەیە: ((**وعلمه التأويل**)) واتە: (فێری تەفسیری بکە).

بە هۆی دوعای پێغەمبەری خواﷺوە (ابن عباس) کە گەورەبوو بوو بە زانای ئوممەت و تەرجومانی قورئان.

ئەوەتانێ لەشوێنێکی کەدا پێغەمبەری خواﷺ شێوازی دوعاکردن بەکاردەهێنێت بۆ دەربازکردنی منداڵێك لە هەڵبژاردنی دایکە گاورەکەی بەسەر باوکە موسڵمانەکەیدا، ئەمەش پەند و ئامۆژگاری تێدایەو گرنگی ئەو شێوازەی پێغەمبەرﷺ دەردەخات، کەشێوازە نائیسلامیەکان تیایاندا نیە.

(عبدالرزاق)[1] لە (عبدالحميد الانصاری)ەوە، ئەویش لە باوکیەوەو پاشان لە باپیریەوە دەگێڕێتەوە کە دەڵێت: باپیری موسڵمان بوو و ژنەکەی موسڵمان نەبوو، منداڵێکی بچووکی هەبوو باڵغ نەبووبوو، هێنایە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ، ئەویش باوکی منداڵەکەی لێرە دانا و دایکیشی لەولاوە دانا، پاشان منداڵەکەی سەربەست کرد لە هەڵبژاردنیاندا، و فەرمووی: ((**اللهم أهده**)) واتە: (خوایە هیدایەتی بدەی... منداڵەکە چوو بۆ لای باوکی).

خۆ دەڵڕەنجاندن زۆر کەمتر و بچووکترە لە کافر بوون، لەگەڵ ئەوەشدا چارەسازی پێغەمبەرﷺ بۆکافربوونیش دوعاکردن بوو بۆی، لەبەر ئەوە دەتوانین بڵێن کە دوعاکردن ڕەگ و ڕیشەی سپڵەیی و خراپەی منداڵ بەرامبەر دایك و باوکی دەردەهێنێت و ریشەکێشی دەکات گەر دایك و باوك لە پاڕانەوەکەیاندا دڵسۆز بن ولەسەری بەردەوام بن، تەنانەت لە سەفەریشدا:

ئیمام (مسلم) گێڕاویەتیەوە: پێغەمبەری خواﷺ کە سواری حوشترەکەی دەبوو بە مەبەستی سەفەر و چوونە دەرەوە، سێجار (الله اكبر)ی دەکرد و دەیفەرموو: ((**سبحان الذي سخّر لنا هذا وما كنا له مقرنين، وإنا الى ربنا لمنقلبون، اللهم إنا نسألك في سفرنا هذا البرّ**

---

[1] رواه عبدالرزاق في مصنفه(٧/١٦٠) بسنده. ورواه احمد والنسائي ايضاً.

**والتقوى، ومن العمل ما ترضى، اللهم هوّن علينا سفرنا هذا، وأطوِ عنا بعده، اللهم أنت الصاحب في السفر والخليفة في الأهل، اللهم إني أعوذ بك من وعثاء السفر، وكآبة المنظر، وسوء المنقلب في المال والأهل والولد))**.[١] واتە: (پاك و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی کە ئەمەی بۆ رەخساندوین، ئەگینا ئێمە ئەوەمان بۆ رام نەدەکرا، و ئێمە هەر بۆ لای خوا دەگەڕێینەوە، خودایە لەم سەفەرەماندا داوای خێر و چاکە و تەقوا و لەخواترسانت لێ دەکەین، لەگەڵ کارێك کە جێگەی رەزامەندی تۆ بێت، خوایە ئەم سەفەرەمان بۆ ئاسان بکە و رێگەی دوورمان بۆ نزیك بکەرەوە، خوایە هاورێی تەواو لەسەفەردا هەر تۆی، و هەر تۆش چاودێری کەس و کارمانی، خوایە پەنادەگرم بەتۆ لە رەنج و مەینەتی رێگاوبان و سەفەر، و دیمەنی ناشیرین و دزێو، و ناخۆشی لە ماڵ و منداڵ و خێزاندا، وە لەوەیش کە بە پەستی و دڵتەنگی لەسەفەرم بگەڕێمەوە).

دایکانیش سووربوون لەسەر ئەوەی کە منداڵەکانیان لە دوعای پێغەمبەری خوا ﷺ بەهرەوەر بن و بەو هۆیەشەوە لە دنیاو قیامەتدا خۆشبەخت بن. ئەوەتا (ام سُلَيم) -دایکی ئەنەس- داوا لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەکات کە بۆ (انس) بپاڕێتەوە:

لە (أنس)ەوە رضي الله عنه دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: (ام سليم) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەمە (انس)ی خزمەتکارتە بۆی بپاڕێرەوە، فەرمووی: **((اللهم أكثر ماله وولده، وبارك فيما أعطيته))**.[٢] واتە: (خوایە ماڵ و منداڵی زۆر بکە و بەرەکەت بخەرە ئەوەی پێیدەبەخشیت).

لە گێڕانەوەیەکی دیکەی (بخاری)دا دەڵێت: (ام سليم) بردمی بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و نیوەی سەرپۆشەکەی خۆی لێوە پێچابووم و نیوەکەی دیکەشی دابوو بەسەرما، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەمە (انس)ی کوڕمە، هێناومە بۆ لات تا خزمەتت بکات، جا دوعای بۆ بکە، فەرمووی: **((اللهم أكثر ماله وولده))** واتە: (خوایە ماڵ و منداڵی زۆر بکە).

وتی: سا بەخوا ئەمڕۆ سامانم زۆرە و منداڵ و منداڵی منداڵم ژمارەیان لە سەد تێپەر دەکات.

(ترمذی)ش لە (ابو خلده)وە -رەحمەتی خوای لێبێ- دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: وتم بە (ابو عاليه): ئایا (انس) هیچی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستووە؟ وتی: دەساڵ خزمەتی کردووە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی پاڕاوەتەوە، و بێستانێکی هەبوو ساڵانە دووجار میوەی دەگرت، و

---

١ ورواه ابن خزيمة في صحيحه ٤/١٣٨-١٤١.

٢ أخرجه الشيخان والترمذي.

ڕێحانەشی تێدابوو بۆنی میسکی لێ دەهات.

(عبدالله کوڕی هشام)یش ﷺ گێڕاویەتیەوە کە دایکی بە منداڵی بردوویەتی بۆ خزمەت پێغەمبەری خواﷺ، ئەویش دەستی بەسەریدا هێناوەو بەیعەتی لێ وەرنەگرتووە..

لە گێڕانەوەیەکی کەدا: دەستی بەسەریدا هێناو دوعای بۆ کرد، جا ئەو لەبری هەموو خاووخێزانی کاوڕێکی دەکردە قوربانی.[1]

لە (ابو حمزە کوڕی عبدالله)وە، دەڵێت: پرسیارم لە باوکم (عبیدالله کوڕی عتبە کوڕی مسعود) کرد: چ شتێکی پێغەمبەری خواﷺت لە یادە؟ وتی: لە یادمە تەمەنم پێنج یان شەش ساڵان بوو، لەگەڵ خۆی بردمی، و لە کۆشیدا داینام و دەستی هێنا بە سەرمدا وبۆم پاڕایەوە و داوای فەڕ و بەرەکەتی بۆ من و وەچەکانم کرد.[2]

کەسی وەهاش هەیە کە بڵێ منداڵ لاسار(عاقّ)ەو بەگوێی دایك و باوکی ناکات؟ وەڵامی ئەوەش لێبوردەیی گەورەمان (یعقوب)ە لەگەڵ منداڵەکانیدا کە دەیفەرموو: ﴿سَوْفَ أَسْتَغْفِرُ لَكُمْ رَبِّيٓ﴾یوسف/٩٨. واتە: لای پەروەردگارم بۆتان دەپاڕێمەوە.[3]

## بنچینەی شەشەم: کڕینی شتی یاری بۆ منداڵان:

بڕیاردانی پێغەمبەری خواﷺ لەسەر ئەو یاریەی کە (عائشە)ڵ گەمەی پێدەکرد پێمان نیشان دەدات کە منداڵ پێویستی بە شتی یاری هەیە، و بوکەڵەی بچووکی خۆش دەوێت.

هەروەها بەدیکردنی پێغەمبەری خواﷺ بۆ چۆلەکەکەی (ابوعمیر) کە یاری پێدەکرد، بەڵگەیەکی دیکەیە لەسەر پێویستی منداڵ بە شتی یاری کە بیگرێت بە دەستیەوەو گەمەی پێ بکات.

(حسین)یش توتکەیەکی هەبوو یاری پێدەکرد:

لە(علی)ەوەﷺ، کە وتوویەتی: شەوان کاتێکم هەبوو کە تێیدا دەچوومە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ، کە دەهاتم مۆڵەتم دەخواست، گەر ببینیایە نوێژی بکردیە کە (سبحان

---

١ رواهما الحاكم في مستدركه ٤٥٦/٣ وسكت عنهما الذهبي أيضاً.

٢ رواه الحاكم في مستدركه ٢٥٩/٣ وسكت عنه الذهبي أيضاً.

٣ هەندێك لە موفەسیرەکان دەڵێن: لەکاتی دەمەوبەیاندا بۆیان دەپاڕێتەوەو داوای لێخۆشبوونیان بۆ دەکات.

الله)ی دەکرد ئەمجا دەچوومە ژوورەوە، خۆ ئەگەر لەنوێژدا نەبوایە مۆڵەتی دەدام، شەوێکیان هاتم بۆ لای و مۆڵەتی دام، فەرمووی: ((أتاني الملك، أو قال: جبريل، فقلت: أدخل، فقال، إن في البيت ما لا أستطيع أن أدخل، قال: فنظرت، فقلت: لا أجد شيئاً فطلبتُ، فقال لي: أنظر، فنظرت فإذا جَرْو للحسين بن علي مربوطاً بقائم السرير في بيت أم سلمة، فقال: إن الملائكة، أو قال: إنّا معشر الملائكة، لا ندخل بيتاً فيه تمثال، أو كلب، أو جنب)).[1] واتە: (فریشتەیەك هات بۆ لام، یاخود فەرمووی (جبریل) هات بۆ لام، منیش وتم: وەرە ژوورێ، فەرمووی: شتێك لە ماڵەکەدایە کە من نەتوانم بێمە ژوورەوە، منیش سەیرم کرد و وتم: هیچ شتێ نابینم، داوام لێکرد، فەرمووی: سەیر بکە، منیش سەیرم کرد، بینیم توتکەکەی (حسین کوڕی علی) بوو لەماڵی (ام سلمه) بە قاچی قەرەوێڵەکەوە بەسترابوو، فەرمووی: فریشتە، یاخود ئێمەی کۆمەڵی فریشتان ناچینە ماڵێکەوە کە پەیکەر یان سەگ یان لەش پیسی تێدا بێت).

بەڵام کێ ئەو یاریانە بۆ منداڵ بهێنێت؟ لەراستیدا ئەوە کاری دایکان و باوکانە، کە ئەو یاریانەی گونجاوە لەگەڵ تواناو تەمەنیدا بۆی بکڕن و بیخەنە بەردەستی و لەبەردەمی دایبنێن، ئەوەش بۆ ئەوەی عەقڵ و هەستەکانی بخاتە کار، و وردەوردە گەشە بکات، بۆ ئەوەی یاریەکەش باش و بەسوود بێت بۆ منداڵ، پێویستە کە دایك و باوك لەکاتی کڕینی یاری بۆ منداڵەکانیان ئەم پرسیارانە لەخۆیان بکەن:

پ١: ئایا ئەو یارییەی کە ئامادەی دەکەیت لەو جۆرەیە کە چالاکییەکی جەستەیی تەندروستی بەسوودی منداڵ دەوروژێنێت؟

پ٢: ئایا لەو جۆرانەیە کە فێری دۆزینەوە(اکتشاف) و کارپێکردن(تحکم)ی شتەکانی دەکات؟

پ٣: ئایا لەو جۆرانەیە کە بواری هەڵوەشاندنەوەو رێکخستنەوەی تێدابێت؟

پ٤: ئایا لەو جۆرانەیە کە هانی دەدات بۆ لاساییکردنەوەی رەفتاری گەورەکان و شێوەی بیرکردنەوەیان؟

ئەگەر وەڵامەکان (بەڵێ) بوون، ئەوا یارییەکە گونجاوو بەسوود و پەروەردەییە.[2]

---

١ رواه ابو يعلى في مسنده (١/٤٤٥) بسند صحيح.

٢ مقال للدكتورة صالحة سنقر في مجلة المعلم العربي السورية (ص٧٦٣) عدد (١١و١٢) عام١٩٧٩.

## بنچینەی حەوتەم: یارمەتیدانی منداڵان لەسەر چاکە و گوێڕایەڵی و رەخساندنی هۆکارەکان بۆیان:

ڕەخساندنی هۆکارەکان بۆ منداڵ هەتا بۆ دایك و باوکی چاك بێت و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوای گەورە بێت، یارمەتی منداڵ دەدات لەسەر چاکەو گوێڕایەڵی و چوست و چالاك بێت بۆ بەدەمەوەچوون و کارکردن، چونکە رەخساندنی کەشی لەبار وا لە منداڵ دەکات کە لەخۆیەوە بەشێوەیەکی زۆر چاك بڕوات، بەوەش دایك و باوك گەورەترین دیاریان پێشکەش بە منداڵ کردووە لە یارمەتیدانی بۆ سەرکەوتن.

بەهۆی زۆر گرنگی و بایەخپێدان بە رەخساندنی کەش و هۆکار تا منداڵ بەرامبەر دایك و باوکی چاك بێت، پێغەمبەری خواﷺ دوعای بۆ باوکان دەکرد کە خوا سۆز و بەزەیی و رەزامەندی خۆی بەسەریاندا ببارێنێت لەبەر یارمەتیدانیان بۆ منداڵەکانیان.

(ابن حبان) گێڕاویەتیەوە لە پێغەمبەری خواﷺوە کە فەرموویەتی: ((**رحم الله والداً أعان ولده علی برّه**)). واتە: (خودا رەحم و بەزەیی بە باوکێك بکات کە یارمەتی منداڵەکەی دەدات لەسەر چاکەکاری).

(طبرانی)ش لە (ابوهریرە)ەوەﷺ گێڕاویەتیەوە وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی:

((**أعینوا أولادکم علی البرّ، من شاء استخرج العقوق من ولده**)).واتە: (یارمەتی منداڵەکانتان بدەن بۆ چاکەکردن، کەسێك بیەوێت سپڵەی و لاساری لە منداڵەکەیدا لادەبات).

کەواتە لێرەدا بەرپرسیارێتیەکی گەورە هەیە کە کەوتۆتە سەر شانی دایك و باوك بەوەی کە یارمەتی منداڵەکەیان بدەن لەسەر چاکە و لە توانایاندا هەیە کە سپڵەیی و لاساری تیایاندا دەربهێنن، ئەمەش بە دانایی و ئامۆژگاری چاك و کاتی درێژ فەراهەم دێت.

## بنچینەی هەشتەم: دوورکەوتنەوە لە زۆر سەرزەنشتکردن و رەخنە لێگرتن:

دەبینین کە پێغەمبەری خواﷺ زۆر سەرزەنشت و لۆمەی هەڵس و کەوت و کاروکردەوەی منداڵی نەدەکرد، و پەنای نەدەبردە بەر شکاندنەوەو سەرزەنشت کردن، ئەوەتانێ (انس)ﷺ ماوەی دەساڵی بەردەوام و لەسەر یەك خزمەتی پێغەمبەری خواﷺ دەکات، لە وەسفی پەروەردەی پێغەمبەرﷺدا وتوویەتی: بۆ هەرکارێك کردبێتم نەیوتوە بۆ کردت، وە هەرکارێکیش نەمکردبێت نەیوتوە بۆ نەتکرد.

ئیمام (احمد)یش لە (انس)ەوەﷺ هێناویەتی کە وتوویەتی: دەساڵ خزمەتی پێغەمبەری خواﷺم کرد، لەسەر هیچ فەرمانێکی کە پێی کردووم و دوام خستبێت یان نەمکردبێت سەرزەنشتی نەکردووم، خۆ ئەگەر یەکێکیش لە خاوخێزانەکەی سەرزەنشتیان کردبام دەیفەرموو: ((**دعوه فلو قُدر –أو قال– لو قُضي أن يكون كان**)). واتە: (وازی لێ بێنن، ئەگەر قەدەری خوا وابوایە کە ببێ دەبوو).

ئەم شێوازەی پێغەمبەری خواﷺ وردیی سەرنج و گیانی شەرمی لە منداڵێکی وەك (انس)دا چاندبوو، کە وای لێکردبوو ئەم تێبینیە لە پێغەمبەری خواﷺ بکات.

بەڵکو رووداوی پێشین هەیە کە بەڵگەیە و رێنموونی باوکان و دایکان دەکات بۆ دوورکەوتنەوە لە لۆمەو سەرزەنشت کردن و زۆر دەرخستنی کەموکورتیەکانی منداڵ:

(عبدالرزاق) لە (عروە)ەوە گێراویەتیەوە[1]، ئەویش لە باوکیەوە، کە وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ" یان (ابوبکر)، یان (عمر)ﷺ بە پیاوێکی وت کە نەنگی و خەوشی لە کارێکی منداڵەکەی گرت: کوڕەکەت تیرێکی کەوانەکەی خۆتە.

کاتێك کە باوك نەنگی لە کاری منداڵەکەی دەگرێت، بەراستی ئەوە نەنگی لەخۆی گرتووە، چونکە ئەو منداڵە لەو بووە، باشتر وابوو کە پەلە بکات بۆ پەروەردەکردنی.

(شمس الدين الانبابی) لە نامەکەیدا بەناوی (رياضة الصبيان وتعليمهم وتأديبهم)، ئەم بیرۆکەیەی روون کردۆتەوەو وتوویەتی: نابێت لە هەموو کاتێکدا زۆر سەرزەنشتی بکرێت، چونکە سەرزەنشتکردن و ئەنجامدانی کاری ناشیرین و خراپ لەلای ئاسایی دەبێت.[2]

---

١ عن البيان والتعريف في اسباب ورود الحديث (١٠٢/٢) لأبن حمزة.

٢ التربية في الإسلام ص١٣٠.

# دەروازەی دووەم

## بنچینەی شێوازە فیکرییە کاریگەرەکان لە عەقڵی منداڵدا

**بنچینەی یەکەم: گێڕانەوەی چیرۆك.**

**بنچینەی دووەم: دواندنی راستەوخۆ.**

**بنچینەی سێیەم: دواندنی منداڵ بە پێی توانای عەقڵی.**

**بنچینەی چوارەم: گفتوگۆی هێمنانە.**

**بنچینەی پێنجەم: رێگایەکی کرداریی ئەزموونی.**

**بنچینەی شەشەم: کەمەندکێش کردنی منداڵ بۆ لای پێشەنگێکی جێگیر کە پێغەمبەری خوایە ﷺ.**

﴿ وَإِذْ قَالَ لُقْمَٰنُ لِٱبْنِهِۦ وَهُوَ يَعِظُهُۥ يَٰبُنَىَّ لَا تُشْرِكْ بِٱللَّهِ ۖ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَٰلُهُۥ فِى عَامَيْنِ أَنِ ٱشْكُرْ لِى وَلِوَٰلِدَيْكَ إِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٤﴾ وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشْرِكَ بِى مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا ۖ وَصَاحِبْهُمَا فِى ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًا ۖ وَٱتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَىَّ ۚ ثُمَّ إِلَىَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٥﴾ يَٰبُنَىَّ إِنَّهَآ إِن تَكُ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ فَتَكُن فِى صَخْرَةٍ أَوْ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَوْ فِى ٱلْأَرْضِ يَأْتِ بِهَا ٱللَّهُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ ﴿١٦﴾ يَٰبُنَىَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ وَأْمُرْ بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱنْهَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَ ۖ إِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴿١٧﴾ وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلَا تَمْشِ فِى ٱلْأَرْضِ مَرَحًا ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ﴿١٨﴾ وَٱقْصِدْ فِى مَشْيِكَ وَٱغْضُضْ مِن صَوْتِكَ ۚ إِنَّ أَنكَرَ ٱلْأَصْوَٰتِ لَصَوْتُ ٱلْحَمِيرِ﴾لقمان/١٣-١٩.

## بنچینەی فیکری یەکەم: گێڕانەوەو خوێندنەوەی چیرۆك بۆ منداڵ:

چیرۆك رۆڵێکی گەورەی هەیە لە سەرنج راکێشانی منداڵ و هۆشیاری فیکری و عەقڵیدا، و پلەی یەکەمی گرتووە لە شێوازە فیکرییە کاریگەرەکان لە سەر عەقڵی منداڵدا، کەوا چێژ و خۆشیی لەخۆ گرتووە، چیرۆکانێکی زۆری پێغەمبەر بۆ منداڵان بەدی دەکەین، کە پێغەمبەری خواﷺ بۆ هاوەڵە ئامادەبووەکانی بە گەورەو بچووکەوە گێڕاوەتەوە، ئەوانیش بەوپەڕی بەئاگاییەوە گوێبیستی گێڕانەوەی پێغەمبەرﷺ دەبوون بۆ ئەو روداوانەی کە لە سەردەمی رابردوودا روویداوە، تاکو ئامادەبوان و ئەوانەی لەپاش ئەوان دێن تا رۆژی دوایی پەند و ئامۆژگاری لێ وەربگرن.

تێبینیەکی گرنگیش هەیە، ئەویش ئەوەیە کە چیرۆکەکانی پێغەمبەری خواﷺ پشت بە راستیە چەسپاوەکان دەبەستێ، کە لە سەردەمانی زوودا روویداوە، و دوورە لە ئەفسانەو شتی پڕوپووچ، چیرۆکانێکی وەهایە کە متمانە بوون بەو مێژووە لە منداڵدا زیندوو دەکاتەوە، هەروەها گیانی تیژڕەوی و دەرچوون (الأندفاع والأنطلاق) زیاد دەکات، و هەستێکی ئیسلامی بەخوڕی تێدا دروست دەکات کە سەرچاوەکەی وشك بوونی بۆ نیە، لەگەڵ هەستکردنێکی قووڵدا کە تەمبەڵی نازانێت.

دەنگ و باسی زانایانی رەسەن و عاقڵمەندە چاکەکان لە چاکترینی ئەو هۆکارانەیە کە شتی چاکە لە دەروندا دەچێنێت، و پاڵی پێوە دەنێت بۆ بەرگەگرتنی ناڕەحەتی و ناخۆشییەکان لەپێناوی مەبەستە جوان و پەسەندەکان و ئامانجە پایەبەرزەکانیدا، و وای لێ دەکات کە شوێنی ئەو کەسانە بکەوێت کە خاوەن قوربانیدان و سەرفرازین، تا بگاتە بەرزترین پلەو بەرزترین شوێنپایە.

ئا لێرەدا هەندێك لە زانایانی پێشین وتوویانە: ((چیرۆکەکان سەربازێکن لە سەربازەکانی خودای گەورە کە بە هۆیانەوە خوا دڵی بەندە نزیك و خۆشەویستەکانی پێ دەچەسپێنێت..)) شایەدەکەش لە قورئانی پیرۆزدا ئەمەیە: ﴿ وَكُلًّا نَّقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنبَآءِ ٱلرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِۦ فُؤَادَكَ ۚ وَجَآءَكَ فِى هَٰذِهِ ٱلْحَقُّ وَمَوْعِظَةٌ وَذِكْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴾هود/١٢٠. واتە: (هەموو ئەوانەی بۆمان گێڕایەتەوە لە چیرۆك و هەواڵی پێغەمبەران، بۆ ئەوەیە کە دڵی تۆی پێ دابمەزرێنین و دڵنیات بکەین، دڵنیاش بە کە لەو سورەتەدا حەق و راستیت بۆ هات و بۆت روون کرایەوە، هەروەها ئامۆژگاری و بیرخستنەوەی باشی تیایە بۆ ئیمانداران).

ئیمام (ابو حنیفه)ش: دەڵێت: چیرۆك دەربارەی زانایان و کردەوە چاکەکانیان خۆشەویستترە لام لە زۆرێك لە فیقه" چونکە ئەوە ئادابی خەڵکە.. شایەدەکەشی لە قورئانی پیرۆزدا ئەمەیە: ﴿ لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِأُولِي الْأَلْبَابِ ﴾یوسف/١١١. واتە: (بەراستی لە چیرۆك و بەسەرهاتی پێغەمبەراندا پەند و ئامۆژگاری هەیە بۆ کەسانی ژیر و هۆشمەند).[١]

جا ژمارەیەك لە چیرۆکەکانی پێغەمبەرﷺ لە شوێنی دیکەی ئەم کتێبە خراونەتە روو، وەك چیرۆکی (اصحاب الاخدود = هاوەڵانی چاڵەئاگرەکان) و چیرۆکی (جریج)ی خواپەرست، و چیرۆکی (هاوەڵانی ناو ئەشکەوتەکە)، و چیرۆکی (أویسی قرنی)، لێرەشدا هەندێك چیرۆکی دیکەی پێغەمبەرﷺ زیاد دەکەین بۆیان تا ببێتە توێشوو بۆ دایکان و باوکان و پەروەردەکاران، ئەو چیرۆکانەش ئەمانەن:

١- چیرۆکی سەروەرمان (ابراهیم) و (اسماعیل) و دایکی!

٢- چیرۆکی (کیفل).

٣- چیرۆکی کەچەڵ و بەڵەك و کوێرەکە.

٤- چیرۆکی ئەوکەسەی هەزار دیناری قەرزکردبوو.

## ١- چیرۆکی سەروەرمان (ابراهیم) و (اسماعیل) و دایکی!

(بخاری) لە (عبداللە کوڕی عباس)ەوەم هێناویەتی، کە وتوویەتی: ((بۆ یەکەمجار کە ئافرەتان پشتێنیان داهێنا لەلایەن دایکی (اسماعیل)ەوە بوو، چونکە خاتوو (هاجر) کە سکی پڕ بوو بە (اسماعیل)ەوە، خاتوو (سارە) کە ژنی گەورەی (ابراهیم) بوو رقی لێ هەڵگرت، جا دایکی (اسماعیل) پشتێنی لەقەدی خۆی بەست تاکو دیاردەی سکپڕییەکەی لە (سارە) بشارێتەوە و لەناو ماڵدا خزمەتی دەکرد و خۆی وا پیشان دەدا کە کارەکەری خاتوو (سارە)یە و هەوێی نیە، هەتا بەوە (سارە)خاتون رقەکەی نەمێنێت، بەڵام سوودی نەبوو، پاشان (ابراهیم) ئەوو (اسماعیل) کە شیرەخۆرە بوو لە (بیت المقدس)ەوە بردنی هەتا لەلای ماڵی خوا لە بن شاخێکی گەورە لەسەر زەمزەم لە سەرووی مزگەوتەکە داینان، لەو رۆژانەدا مەککە ئاوەدانی لێ نەبوو، وە ئاوی لێ نەبوو، لەوێ داینان، و هەمبانەیەك خورما و کوندەیەك ئاوی بۆ دانان،

١ مقدمة (صفحات من صبر العلماء) ومقدمة (رسالة المسترشدين).

ئینجا (ابراهیم) هەستا بگەڕێتەوە، دایکی (اسماعیل) شوێنی کەوت و پێی وت: ئەی (ابراهیم)! بۆ کوێ دەچیت، و ئێمە لەم دۆڵە بەجێ دەهێڵی کە نە هاودەم و نە شتێکی لێیە؟! چەند جارێك ئەمەی بۆ دووبارە کردەوە، ئەویش ئاوڕی لێ نەدەدایەوە، پاشان وتی: ئایا خوا فەرمانی بەمە پێکردوویت؟ فەرمووی: بەڵێ، وتی: کەواتە پەکمان ناخات، ئینجا گەڕایەوە.

(ابراهیم)یش ڕۆشت تا گەیشتە سەر کەل بەجۆرێك کە نەیانـدەبینی، ڕووی کـردە ماڵی خواو، پاشان دەستی بەرز کردەوەو ئەم دووعاو نزایانەی کرد و فەرمووی: ﴿ رَّبَّنَآ إِنِّيٓ أَسۡكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيۡرِ ذِي زَرۡعٍ عِندَ بَيۡتِكَ ٱلۡمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱجۡعَلۡ أَفۡـِٔدَةٗ مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهۡوِيٓ إِلَيۡهِمۡ وَٱرۡزُقۡهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَشۡكُرُونَ ﴾ابراهیم/٣٧. واتە: (پەروەردگارمان! من هەندێ لە نەوەکانم لە دۆڵێکی وشکی بێکشتوکاڵدا جێنشین کرد" لە پاڵ ماڵی پیرۆزتدا، لەپاڵ (بیت الحرام)دا، پەروەردگارا، من ئەمەم بۆیە کرد تا بەچاکی نوێژەکانیان ئەنجام بدەن، بەڵکو هەندێ لەو خەڵکە کەمەندکێش بکەیت بۆ لایان، وە لە رزق و ڕۆزیی جۆراوجۆر بەهرەمەندیان بکەیت، بەڵکو سوپاسگوزار بن).

ئیتر دایکی (اسماعیل) شیری بە (اسماعیل) دەدا و لەو ئاوەی دەخـواردەوە، هـەتا کونـدە ئاوەکە تەواو بوو، تینووی بوو، کوڕەکەشی تینووی بوو، سەیری کـرد کوڕەکـەی لـە تینوانـدا تەپاوتل دەکات، ئیدی چاوی بەرایی نەدەدا کە بەوشێوەیە جگەرگۆشەکەی ببینێ، لەبەر ئـەوە ڕۆیشت، ڕووی کردە شیوەکە و تەماشای کرد تا بزانێ کەس دیارە، کەسی نەدیت، لـە کێـوی (صفا) هاتە خوارەوە، تا گەیشتە ناو شیوەکە، لەوێ دامێنی کراسەکەی خۆی هەڵکرد و خۆی گورج کردەوەو وەك ئادەمیزادێکی ماندوو بەپەلە دەڕۆیشت و هەوڵی دەدا، هەتا لـە شـیوەکە پەڕیەوە، ئەمجا سەرکەوتە سەر کێوی (مروە)، لەسەری ڕاوەستا تا بزانێ کەس نابینێت، هـیچ کەسی نەبینی، ئەمەی حەوت جار دووبارە کردەوە.

(ابن عباس) دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: لەبەر ئەوەیە ئێستا لەکاتی حەج و عـەمرەدا خەڵك حەوت جار لەنێوان ئەو دوو کێوەدا ڕادەکەن.

کە لە جاری حەوتەم گەیشتە سەر (مروە) گـوێی لـە دەنگێـك بـوو، خـۆی بـەخۆی وت: بێدەنگ بە... کە گوێی بەباشی هەڵخست، دەنگەکەی بیستەوە، وتـی: شـتێکت گوێلێبـوو، ئەگەر یارمەتیدەرت بۆ هاتبێت، کە سەرنجی دا وا فریشتەیەك لە شوێنی زەمزەمە، بە پاژنەی

پێی، یان فەرمووی: بە باڵی زەوی هەڵدەکۆڵی هەتا ئاو دەرکەوت، ئیدی بەخۆڵ دەوری ئاوەکەی کردە حەوز و بە دەست ئاوای دەکرد، زووزوو بەچەنگ ئاوی دەکردە ناو کوندەکەی، پاش هەموو چەنگێك ئاوەکە هەڵدەقولایەوە، لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا: چەندی ئاوی دەردەکرد ئەوەندەش هەڵدەقولایەوە...

(ابن عباس) وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((**یرحم الله ام اسماعیل، لو ترکت زمزم -أو قال: لو لم تغرف- لکانت زمزم عیناً معیناً**)). واتە: (خودا رەحم بە دایکی (اسماعیل) بکات، ئەگەر وازی لە زەمزەم بهێنایە، -یان فەرمووی: ئەگەر هەڵینەگۆزیایە- هەتاهەتایە زەمزەم دەبوو بە کانیاو کە بەخوڕ لەبەری دەڕۆیشت).

دەڵێ: دایکی (اسماعیل) لێی خواردەوەو شیری بە کوڕەکەی دا، فریشتەکە پێی فەرموو: مەترسن لە پەککەوتن، چونکە خانەی خودا لێرەدایەو ئەو منداڵە و باوکی دروستی دەکەن، خوای گەورەش کەس و کارەکەی بەزایە نادات.

(بیت)یش ئەوکاتە بەرزاییەکی وەك تەپۆڵکە بوو، لافاو لێی دەدا و لە راست و چەپیەوە لێی دەبرد.. بەوجۆرە مانەوە هەتا چەند کەسێکی (جورهم)ی (یان: خێزانێك لە جورهومیەکان) لە رێگەیەکەوە هاتن کە شینایی بە درەنگی لێ شین دەبوو و کەم ئاو بوو، جا لەخوار مەککەوە دابەزین، باڵندەیەکیان بینی، وتیان: ئەو باڵندەیە بەسەر ئاوەوە دەسوڕێتەوە، لەم دۆڵەشدا ئێمە شك بەرین ئاوی لێ نیە، نوێنەرێك یان دوانیان نارد، کە چوون ئاوەکەیان دۆزیەوە، گەڕانەوەو هەواڵی ئاوەکەیان بۆیان بردەوە، ئەوانیش هاتن بۆ لای ئاوەکە، و دایکی (اسماعیل) لەسەر ئاوەکە بوو، وتیان: رێگەمان دەدەیت کە لەلای تۆ هەوار هەڵدەین؟ وتی: بەڵێ، بەڵام ئاوەکە هی منەو مافی ئێوەی بەسەرەوە نیە، وتیان: بەڵێ باشە.

(ابن عباس) دەڵێ: پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: دایکی (اسماعیل) بەمە خۆشحاڵ بوو چونکە حەزی لە هاودەم و هاونشین بوو، ئیدی لەوێ دابەزین و ناردیان بەشوێن کەسوکارەکانیاندا و ئەوانیش هاتن و کۆچ و باریان خست و مەککەیان ئاوەدان کردەوە.

منداڵەکە گەورە بوو، بووە هەرزەکار، لەوانەوە فێری زمانی عەرەبی بوو، دایکی (اسماعیل) مرد، (اسماعیل) ژنی لەوان هێنا، پاشان (ابراهیم) هات تا بەسەریان بکاتەوە، بەڵام (اسماعیل) لەماڵ نەبوو، پرسیاری (اسماعیل)ی لە ژنەکەی کرد، ژنەکە وتی: چووە شتێکمان بۆ پەیدا بکات، - لە گێڕانەوەیەکی کەدا: چووە بۆ راو-، ئینجا دەربارەی حاڵ و گوزەرانیان

پرسیاری لێی کرد، وتی: ژیانمان خراپە، لە تەنگانەو ناخۆشیداین و، سکاڵای لەلا کرد، (ابراهیم) فەرمووی: کە مێردەکەت هاتەوە سڵاوی لێ بکە و پێی بڵێ: کە ئاستانە(داری ژێر دەرگا)ی دەرگاکەی بگۆڕێ.

کە (اسماعیل) هاتەوە، وەك ئەوەی هەستی بە شتێك کردبێ، فەرمووی: هیچ کەس هاتووە بۆ لاتان؟ ژنەکە دەڵێ: بەڵێ، پیرەمێردێ بەم ڕەنگ و شێوەیە هات، پرسیاری تۆی کرد و پێیم وت، پرسیاری لێم کرد: گوزەرانمان چۆنە؟ پێم وت کە لە ماندووبوون و سەختڵەتیداین. فەرمووی: هیچی پێ ڕانەسپاردیت! وتی: با، فەرمانی پێکردم کە سڵاوت لێ بکەم و پێت دەڵێ: کە ئاستانەی دەرگاکەت بگۆڕە، فەرمووی: ئەو پیاوە باوکم بوو، فەرمانی پێکردووم کە لێت جیاببمەوە، کەواتە بڕۆوە بۆ لای کەس و کارەکەت، جا تەڵاقی دا.

ژنێکی دیکەی لێیان هێنا، جا چەندی خوا حەزبکات ئەوەندە (ابراهیم) نەهاتە لایان، پاشان هاتەوە بۆ لایان، (اسماعیل)ی نەبینی، چووە لای ژنەکەی و هەواڵی (اسماعیل)ی پرسی، وتی: چووە بژێویمان بۆ پەیدا بکات، دەفەرموێ: ئێوە چۆنن؟ و پرسیاری حاڵ و گوزەرانیانی کرد، وتی: لە خێر و بەرەکەت و فراوانی داین، و سوپاسی خوای گەورەی کرد، فەرمووی: خواردنتان چی یە؟ وتی: گۆشت، فەرمووی: خواردنەوەتان چی یە؟ وتی: ئاو، فەرمووی: خودایە پیت و فەڕ و بەرکەت بخەرە گۆشت و ئاویانەوە.

پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: لەو ڕۆژەدا دانەوێڵەیان نەبوو، ئەگینا بۆ ئەویش نزای پیت و فەڕی بۆیان دەکرد.

فەرمووی: بە بەرەکەتی ئەو نزایە خواردن و خواردنەوەی مەککە بە پیت و فەڕن.

(ابراهیم) فەرمووی: کە مێردەکەت هاتەوە، سڵاوی لێ بکە و فەرمانی پێبکە ئاستانەی دەرگاکەی لەجێی خۆی چەسپ بکات و بیهێڵێتەوە.

کە ئیسماعیل دێتەوە دەفەرموێت: کەس هاتووە بۆ لاتان؟ وتی: بەڵێ، پیرەمێردێکی نوورانی ڕێکوپێك هات ـ زۆر وەسفی کرد-، دەربارەی تۆ پرسیاری لێ کردم، هەواڵی تۆم بۆ باس کرد، پرسیاری کرد: گوزەرانمان چۆنە؟ منیش بەچاکی وەڵامم دایەوە، فەرمووی: بە هیچ ڕاینەسپاردیت؟ وتی: بەڵێ سەلامت لێ دەکات و فەرمانت پێدەکات کە ئاستانەی دەرگاکەت لەجێی خۆی چەسپ بکە و بیهێڵەوە. فەرمووی: ئەوە باوکمە، ئاستانەی دەرگاکەش تۆی، فەرمانی پێکردووم کە لەلای خۆم بتهێڵمەوەو پێکەوە بژین.

چەندی خوا حەزبکات (ابراهیم) ئەوەندەی پێچوو نەگەڕایەوە بۆ لایان، کە هاتەوە بۆ لایان (اسماعیل) لەوکاتەدا لە ژێر دارێکی گەورەی نزیك زەمزەم خەریکی داتاشینی تیر بوو، کە چاوی بەباوکی کەوت لەبەری هەستا و ئەوەیان کرد کە باوك بەکوڕ و کوڕ بەباوکی دەکات.

پاشان (ابراهیم) فەرمووی: ئەی (اسماعیل)! خودا فەرمانێکی داوە بەسەرما، فەرمووی: فەرمانی پەروەردگارت بەجێبهێنە، فەرمووی: یارمەتیم دەدەی؟ فەرمووی: منیش یارمەتیت دەدەم، فەرمووی: خوای گەورە فەرمانی پێکردووم تا لەوێدا خانوویەك دروست بکەم -ئاماژەی بۆ تەپۆڵکەیەکی بەرزتر لە دەوروبەرەکەی کرد-، ئیدی دەستیان کرد بە بناغەدانانی خانەی خودا و بەرزیان کردەوە، (اسماعیل) بەردی دەهێنا و (ابراهیم)یش دیواری دروست دەکرد تا خانووەکە بەرز بوویەوە، ئەوجا ئەو بەردەی هێنا و بۆی دانا، (ابراهیم) چووە سەری و دیواری دروست دەکرد، (اسماعیل)یش بەردی دەدایە دەستی، و دەیان فەرموو: ﴿رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ﴾ البقرة/١٢٧.[1] واتە: (خودایە ئەم کارەمان لێ وەربگرە چونکە هەر خۆت بیسەر و زانایت بە حاڵمان).

دەفەرموێ: هەردووکیان دیوارەکەیان دروست دەکرد هەتا بە دەوری (بیت)دا دەسوڕانەوەو هەردووکیان دەیانفەرموو: ﴿رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ﴾ البقرة/١٢٧.[2]

## ٢- چیرۆکی (کیفل):[3]

(ترمذی) لە (عبدالله کوڕی عمر)ەوەم گێڕاویەتیەوە کە وتوویەتی: گوێم لێبو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: (لە نەتەوەو هۆزەکانی بەر لەئێوە پیاوێك هەبوو ناوی (کیفل) بوو، سڵی لە هیچ شتێ نەدەکردەوە، ئافرەتێك هات بۆ لای پێویستیەکی پێی هەبوو، ئەویش بەخششێکی زۆری پێدا، لە گێڕانەویەکدا: شەست دیناری پێدا، کاتێ ویستی کاری خراپەی لەگەڵدا بکات، ئافرەتەکە موچڕك بە لەشیدا هات و گریا، پێی وت: بۆ دەگریت؟ ئافرەتەکە وتی: چونکە هەرگیز ئەم کارەم نەکردووە، ئەوەیش ئێستا وام لێ دەکات بیکەم پێویستی و موحتاجیە، وتی: تۆ ئەمە لە ترسی خوای گەورە دەکەیت؟! من شایستەترم بەو ترسە، بڕۆ ئەوەی پێم بەخشیبوویت بۆ خۆت بێ، وە سوێند بەخوا ئیدی هەرگیز سەرپێچیی ناکەم، جا ئەو

١ أنظر جامع الأصول ٢٩٥/١٠ ت.الأرناؤوط.
٢ أنظر جامع الأصول ٢٩٥/١٠ ت.الأرناؤوط.
٣ ئەم چیرۆکە لەو تەمەندا بۆ منداڵ دەگێڕدرێتەوە کە نزیك بوونەتەوە لە تەمەنی باڵغ بوون.

ئەوە (کیفل) مرد و لەسەر دەرگاکەی نووسرابوو: خوای گەورە لە (کیفل) خۆش بووە.. خەڵکی سەریان سوڕما، ئەوەبو خوای گەورە دەربارەی (کیفل) نیگای بۆ پێغەمبەری سەردەمەکەیان کرد).

## ٣- چیرۆکی بەڵەك و کەچەڵ و کوێرێك:

(بخاری) و (مسلم) لە (ابوهریره)ەوەﷺ هێناویانە کە لە پێغەمبەری خوایﷺ بیستووە دەیفەرموو: (سێکەس لە نەوەی (اسرائیل) هەبوو کە بەڵەك و کەچەڵ و کوێر بوون، خوای گەورە ویستی تاقیان بکاتەوە، فریشتەی نارد بۆ لایان، فریشتەکە دەچێتە لای بەڵەکەکەو پێی دەڵێ: چیت لە هەموو شتێ زیاتر لا خۆشەویستە؟ وتی: حەزم لە رەنگ و بۆیەکی جوان و پێستێکی جوانە و ئەم بەڵەکیەم نەمێنێ کە بووەتە هۆی ئەوەی خەڵکی بێزیان لێم بێتەوە، فریشتەکە دەڵێ: ئەی لە ماڵ و ساماندا حەزت لەچی یە؟ وتی: حەزم لە حوشترە، یان وتی: حەزم لە مانگایە -اسحاق گومانی هەبوو- لەوەی کە بەڵەك و کەچەڵەکە یەکیان وتی: وشتر ئەویتریان وتی: مانگا، دەفەرموێ: جا وشترێکی ئاوسی لەسەر گوانی پێدرا و ئینجا وتی: خوا پیت و فەڕی تێ بخات..

دەفەرموێ: رۆشت بۆ لای کەچەڵەکەو پێی وت: چیت لە هەموو شتێ زیاتر لا خۆشەویستە؟ وتی: زۆر حەزم لە قژێکی جوانەو ئەم کەچەڵیەشم نەمێنێ کە بۆتە هۆی ئەوەی خەڵك بێزیان لێم بێتەوە. دەڵێ: فریشتەکە دەستی هێنا بە سەریدا و کەچەڵیەکەی نەما و قژێکی جوانی پێدرا، ئینجا پێی دەڵێ: ئەی لە ماڵ و ساماندا حەزت لەچی یە؟ وتی: مانگا، جا مانگایەکی ئاوسی دەدرێتێ و، ئینجا وتی: خوا پیت و فەڕی تێ بخات.

دەفەرموێ: پاش ئەوە هات بۆ لای کوێرەکە و وتی: چیت لە هەموو شتێ زیاتر لا خۆشەویستە؟ وتی: مەڕ، کاوڕێکی زاوی بەرخ لەبەری پێدا...

ئیتر بەرەبەرە ئاژەڵەکان زاوزێ دەکەن و بەرهەم دێنن، تا ئاوا زۆر دەبن ئەمیان دەبێتە خاوەنی پڕ شیوێك وشتر و ئەویان پڕ شیوێك مانگا و ئەوی‌دیکەیان پڕ شیوێ مەڕ...

دەفەرموێ: پاش ئەوە فریشتەکە لەسەر شێوەو باری پێشووی بەڵەکەکە هات بۆ لای بەڵەکەکەو پێی وت: پیاوێکی هەژار و رێبوارم، لەم سەفەرەمدا پێویستیەکانم لێ براوە، ئەمڕۆ ناگەم بەهیچ کەس تەنها خوای گەورە نەبێت، پاشان تۆ، جا تۆو ئەو کەسەی کە ئەم شێوە جوانەو ئەو پێستە چاکە و ئەو ماڵە زۆرەی پێداویت، وشترێکم بدەرێ، تا لەم سەفەرەمدا

خۆمی پێ بگەیەنمە جێ، وتی: خاوەن بەش زۆرن و بەرتۆ ناکەوێ.. فریشتەکە وتی: وەك بڵێی دەتناسم! ئەری تۆ ئەو پیاوە بەڵەکە نەبوویت کە خەڵك بێزیان لێ دەکردی، وە ئەو هەژارە نەبوویت کە خوا پێی بەخشیت و دەوڵەمەندی کردیت؟ وتی: بەڵکو من ئەم ماڵ و سامانەم لە باووباپیرانمەوە بۆ ماوەتەوە.. وتی: ئەگەر درۆ بکەیت خوای گەورە بتگێڕێتەوە سەر شێوەو حاڵی جارانت.

دەفەرموێ: ئەوجا چوو بۆ لای کەچەڵەکە لە شێوەی جارانی ئەودا و چیی بە بەڵەکەکە وتبوو بە کەچەڵەکەشی وت، بەڵەکەکە وەڵامی چی بوو کەچەڵەکەش هەمان شتی وت، فریشتەکەش وتی: ئەگەر درۆ بکەیت خوای گەورە بتگێڕێتەوە سەر شێوەو حاڵی جارانت.

ئەمجا چووە لای کوێرەکە لەشێوەی جارانی کوێرەکە خۆیدا و وتی: پیاوێکی هەژار و ڕێبوارم، لەم سەفەرەمدا پێویستیەکانم لێ بڕاوە، ئەمڕۆ ناگەم بەهیچ کەس تەنها خوای گەورە نەبێت، پاشان تۆ، جا تۆو ئەو کەسەی چاوی چاك کردیتەوە، کاوڕێکم بدەرێ بەڵکو لە سەفەرەکەمدا پێی بگەمەوە جێ، دەڵێ: منیش پێشتر کوێر بووم، خوای گەورە چاوی پێبەخشیمەوە، چیت دەوێ بیبە، و چی بۆ من دەهێڵیتەوە بیهێڵەرەوە، سوێند بەخوا ئەمڕۆ هەرشتێك ببەیت لە پێناوی خوادا ڕێگەت لێ ناگرم، فریشتەکە وتی: ماڵی خۆت بۆ خۆت، بەڵکو لەلایەن خوای گەورەوە ئێوە تاقی کرانەوە، و لێت ڕازی بوو، بەڵام لە هەردوو هاوڕێکەت ڕەنجاوو ناڕازیە.[1]

## ٤- چیرۆکی ئەو پیاوەی هەزار دیناری قەرز کرد:

(بخاری) لە (ابوهریرە)وەﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خواﷺ باسی پیاوێکی کرد لە نەوەی (اسرائیل) کە داوای لە هەندێ کەسی نەوەی (اسرائیل) کرد هەزار دیناری قەرزی بدەنێ، و وتی: بڕۆ شاهیدم بۆ بهێنە تا ئاگاداری بن و ببنە شاهید، وتی: خوای گەورە بەسە شاهید بێت. وتی: دەباشە کەفیلم بۆ بهێنە، پیاوەکە وتی: خوای گەورە بەسە کەفیل بێت، وتی: ڕاستت کرد، پارەکەی پێدا بۆ ماوەیەکی دیاریکراو، پیاوەکەش چوو بۆ گەشتی سەر دەریا و پێویستیەکەی خۆی پێ بەجێ هێنا، پاشان چاوەڕوانی بەلەمێکی کرد تا لەکاتی دیاریکراو بێتەوە بۆ لای، بەڵام هیچ بەلەمێکی بەدی نەکرد و دەستی نەکەوت، بۆیە هەستا کۆتەڵە دارێکی هێنا و هەڵی کۆڵی و هەزار دینارەکەی لەگەڵ نامەیەکدا خستە ناوی و شوێنی

١ أنظر جامع الأصول (٣٢١/١٠) ت. الأرناؤوط.

هەڵکۆڵینەکەی وەك خۆی لێ کردەوە، و بردی بۆ ناو دەریاکە و وتی: خودایە! ئاگاداریت کە من هەزار دینارم قەرز کرد لە فلانەکەس، ئەویش داوای کەفیلی لێ کردم، وتم: تەنها خودا بەسە بۆ شاهێدی، ئەویش بە شاهیدی تۆ رازی بوو، ئێستاش من چەند هەوڵم دا بەلەمێکم دەست بکەوێت بەڵام نەبوو، دوای ئەوە کۆلکە دارەکەی فڕێدایە ناو دەریاکەوە هەتا لەئاوەکە نغرۆ بوو، پاشان رۆشت، و بەردەوام لە بەلەمێك دەگەڕا دەستی بکەوێت تا پێی بگەڕێتەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی.

ئەو پیاوەشی کە قەرزەکەی پێدابوو هاتە دیار دەریاکە و چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد بەلکو بەلەمێك بێت و پارەکەی بۆ هێنابێتەوە، بەڵام ئەو کۆتەڵە دارەی بینی کە پارەکەی تێدابوو، بۆ سوتاندن بردیەوە بۆ خاوخێزانەکەی، کاتێ دارەکەیان ورد کرد، پارەکە و نامەکەیان بینی..

ئینجا کابرای قەرزار هات بۆ لای و هەزار دیناری بۆ هێنا و وتی: سوێند بەخوا هەر بەدوای بەلەمێکدا دەگەڕام تا بگەڕێمەوە و پارەکەت بۆ بهێنمەوە، بەڵام بەر لەم بەلەمەی پێی هاتم هیچی دیکەم دەست نەکەوت، ئەویش وتی: خوای گەورە ئەوەی کە لە کۆتەڵە دارەکەدا بۆت ناردبووم لەبری تۆ گەیاندی.. پیاوەکەش بە دڵخۆشیەوە گەڕایەوەو هەزاردینارەکەی خۆشی بردەوە.

ئا بەو جۆرە منداڵ لەگەڵ ئەو چیرۆکانەدا دەژی کە پێغەمبەری خواﷺ گێڕاویەتیەوە، لەگەڵ سەرگوزشتەکانی ژیاننامەی پێغەمبەرﷺ، و چیرۆکەکانی قورئانی پیرۆز دەژی، بەمەش لەنێو کەش و گەرمیەکی ئیمانیدا دەژی کە زیاتر دامەزراو و پتەوی دەکات.

## بنچینەی فیکری دووەم: دواندنی ڕاستەوخۆی منداڵ:

دواندنی ڕاستەوخۆی عەقلی منداڵ و روونکردنەوەی ڕاستیەکان بۆی و ڕێکخستنی زانیارییە فیکرییەکان بۆی تا لەبەریان بکات و تێیان بگات، وا لە منداڵ دەکات کە زیاتر و چاکتر شت وەربگرێت و پتر ئامادەی فێربوون بێت.. بەڵام پێچ و پەنا خستنە نێو هەڵس و کەوت لەگەڵ منداڵدا بێ سوودە، پێغەمبەری خواشﷺ بەو جۆرە فێری کردووین، کە لە زۆر بۆنەدا ڕاستەوخۆ و بێ پێچ و پەنا و بە روون و ئاشکرایی منداڵ بدوێنین.

ئەو فەرموودەیەی (ابن عباس)یشم کە (ترمذی) هێناویەتی، و وتوویەتی: ڕۆژێکیان لە پشت پێغەمبەرەوەﷺ بووم، فەرمووی: ((**یا غلام إني أعلمك كلمات**)) واتە: (ڕۆڵە! من چەند شتێکت فێر دەکەم...) بەڵگەیە لەسەر ئەوە.

ئەوەتا پێغەمبەری خواﷺ دەچێتە نێو ئەو بابەتانەی کە دەیەوێت و بە منداڵە تازەپێگەیشتووەکە دەڵێت: ((**إني أعلمك**))، پێغەمبەرﷺ (چەند وشەیەك)ی کورتی بەسوود فێری منداڵەکە دەکات کە نە دوورودرێژەو نە بێزارکەرە، ئەوەش پێکەوە گونجانە لەگەڵ سروشتی فیکری منداڵەکەدا کە پێویستی بە وشەی کورتی پوختی پڕ مانا و بیرۆکە هەیە، خۆ گەر رابمێنین لە سروشتی ئەو وشانەی کە پێغەمبەرﷺ ئاراستەی کردوە دەبینین چەند ریسایەکی فیکریی بیروباوەڕی لە ژیانی منداڵدا پێك دەهێنێت بۆ ژیانی ئێستای منداڵی و بۆ کاتی لاویی چاوەڕوان کراوی پاش ئێستاش، دەبا پێکەوە ئەم وشانە بخوێنینەوەو چاودێری بکەین:

((**أحفظ الله يحفظك، أحفظ الله تَجْدهُ تُجاهكَ؛ إذا سألت فأسأل الله، وإذا أستعنت فاستعن بالله؛ وأعلم أن الأمة لو أجتمعت على أن ينفعوك بشيء، لم ينفعوك الا بشيء قد كتبه الله لك، وإن أجتمعت على أن يضروك بشيء لم يضروك الا بشيء قد كتبه الله عليك، رُفعت الأقلام و جفَّت الصُّحف**)). واتە: (ئاگات لە خوا بێ (فەرمانی جێبەجێ بکە و قەدەغەی مەشکێنە) خوداش دەتپارێزێ (بەچاوی رەحمەت ئاگای لە ماڵ و منداڵ و ئایینت دەبێ)، خوا بپارێزە (لە ئاگاداری خوا غافڵ مەبە)، دەبینیت خوا لەگەڵتایە(لەخۆشی و تەنگانەدا فریات دەکەوێ)، هەرکاتێك ویستت شتێك داوا بکەی ئەوا لەخودای داوا بکە، هەرکاتێك ویستت داوای یارمەتی بکەیت، ئەوا هەر لە خودای داوا بکەو پشت تەنها بەو ببەستە، ئەوەش بزانە گەر هەموو خەڵك کۆ ببنەوە بۆ ئەوەی سوودێکت پێ بگەیەنن، سوودیان نابێت مەگەر ئەو سوودەی کە خوا بۆی نووسیویت، وە گەر هەموو خەڵك کۆببنەوە بۆ ئەوەی زیانێکت تووش بکەن، ناتوانن مەگەر ئەو زیانەی کە خوای گەورە لەسەری نووسیوی، قەڵەمەکان هەڵگیران و نووسراوەکان وشك بوونەوە).

جوانی ئەو دواندنە راستەوخۆیەت بەدی کرد کە بە سەرنج ڕاکێشانی منداڵەکە دەستی پێکرد: ((یا غلام = ڕۆڵە))، کە ئەوەش دەبێتە مایەی وروژاندنی هەست و ئاگایی منداڵ و وای لێدەکات هەست بە بایەخپێدانی کەسانی بەرامبەر بکات، هەروەك لاوان هەستی پێدەکەن کاتێ گوێیان لێ دەبێت بانگ دەکرێن بە (ئەی لاو)، پاشان ئایا هیچ گوتارێکی وەك ئەم

گوتارە ئاوا گشتگیرت بەدی کردووە کە عەقڵی منداڵ بدوێنێت؟! ئایا هاوشێوەی ئەو ڕێسا هەمووەکیەت (کلیة) خوێندۆتەوە یا بیستووە کە فیکر و عەقڵی منداڵ دادەمەزرێنێت، تا ببێتە پشتەك(مرتكز) بۆی لە ڕووبەڕووبوونەوەی ژیاندا ؟!

هەورەها پێغەمبەرﷺ بەو دواندنە ڕاستەوخۆیەی ڕێنمایی منداڵ دەکات بۆ ڕێگایەکی کرداریی تا لە گرێکوێرەکانی نەخۆشیەکانی دڵ وەك ئیرەیی(حسد) و رق و کینە و فێڵ و تەڵەکە دەربازی ببێت، ئەمەش بە ڕیزبەندییەکی فیکری سەرسوڕهێنەر دێتەدی.

(ترمذی) لە (انس)ەوەرضي الله عنه هێناویەتی وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((یا بُنيّ! إذا قدرت أن تصبح وتمسي وليس في قلبك غش لأحد، فأفعل.. يا بُنيّ! وذلك من سنتي، ومن أحيا سنتي فقد أحياني، ومن أحياني كان معي في الجنة)). واتە: (کوڕەکەم! گەر دەتوانیت شەووڕۆژ بکەیتەوە و دڵت هیچ گەردی بەرامبەر کەس تێدا نەبێت، ئەوا بیکە.. کوڕەکەم! ئەوەش لە سوننەتی منە، و هەرکەس سوننەتی من زیندوو بکاتەوە ئەوا وەك ئەوە وایە کە من زیندوو بکاتەوە، ئەو کەسەش زیندووم بکاتەوە لە بەهەشتدا لەگەڵ مندایە).

لێرەشدا پێغەمبەرﷺ دەستەواژەی ((یابني = کوڕەکەم))ی بەکار هێناوە، ئەوەش بۆ وروژاندنی هەستی منداڵ و سەرنج ڕاکێشان بۆ لای خۆی، و بێدارکردنەوەی بۆ گوێگرتن لە باسەکەیە.

لە خستنەڕووی ئەو وتانەی پێغەمبەرەوەﷺ ئەو شێوازی قەناعەت پێکردنە بەدی دەکەین کە لەگەڵ منداڵدا بەکاری هێناوە، لەگەڵ چۆنیەتی ڕێککردنی زانیارییەکان بۆی تا لەبەری بکات، و لە دواندنەکەدا ڕیزبەندی لەگەڵدا بەکار هێناوە تا لێی تێبگات، ئەمەش لە کەشێکی هێمن و ئاسوودە، و وروژاندنێکی سەرسوڕهێنەردا بە وشەی (یا بني).

## بنچینەی فیکری سێیەم: دواندن بەپێی توانای عەقڵیی منداڵ:

منداڵیش وەك هەر بوونەوەرێکی زیندووی دیکە سنووری خۆی هەیە کە توانای تێپەڕاندنی نیە، عەقڵ و فیکریش هێشتا لە تافی گەشەو فراوانبووندایە، و تێگەیشتنی دایك و باوك و پەروەردەکارانیش لە پلەی گەشەکردنی عەقڵی کە پێی گەیشتووە چارەسەرکردنی زۆر گیروگرفت بۆیان ئاسان دەکات، چونکە لەوەوە دەزانن کە کەی بیدوێنن و ئەو شتانەی کە بەکاری دەهێنن چی بێت، و ئەو بیرۆکانەی کە پێشکەشی دەکەن چیە.

بەڵگەی ئەمەش ئەوەیە کە بەر لە غەزای (بدر)، کاتێ هاوەڵان منداڵە شوانێکی قورەیشیان گرت، دەربارەی ژمارەی سوپای قورەیش پرسیاریان لێکرد، بەچاکی وەڵامی بۆ نەدرایەوە، ئەوانیش لێیان دا، هەتا پێغەمبەرﷺ هات بۆ لایان -کە ئەو زانای راستەقینەی دەروونناسیە بێ ڕکابەر- ئەوەبوو پرسیاری لە منداڵە شوانەکە کرد: ئەو سوپایە رۆژانە چەند حوشتر سەر دەبڕن؟ کوڕەکە وتی: نۆ تا دە دانە، ئەوجا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: کەواتە ژمارەی سوپاکە لەنێوان نۆسەد تا هەزار کەسدایە.

پێغەمبەرﷺ زانی کە ئەو منداڵە شوانە لە ژمارەی هەزاران نازانێت، بەڵام توانای عەقڵی دەرك بە ژمارەی دەیان دەکات.. دەیانی چ شتێکیش؟ دە حوشتر کە ژماردنی لای هەموو منداڵێك ئاسانە بەهۆی گەورەیی قەبارەیانەوە.

ئەمەش بەڵگەیەکی دیکەیە: کاتێك پێغەمبەری خواﷺ کچێکی بچووك بە زمانی حەبەشی بانگ دەکات کە ئەو لێی تێدەگات، خۆ بەهەر شێوەیەکی دیکە قسەی لەگەڵدا بکردایە لە مەبەستەکەی تێنەدەگەیشت..

(ابن تیمیه) لە کتێبەکەیدا (أقتضاء الصراط المستقیم) هێناویەتی کە پێغەمبەری خواﷺ بە دایکی (خالد) کچی (خالد کوڕی سعید کوڕی عاص)ی فەرموو -کە ئەو کاتە منداڵ بوو، لە خاکی حەبەشە لەدایك بووە لەو کاتەی کە باوکی بۆ ئەوێ کۆچی کرد-، کراسێکی لەبەر کرد و فەرمووی: ((**یا أم خالد! هذا سنا**)). واتە: (ئەی دایکی (خالد) ئەمە چاکە.. (سنا) بە زمانی حەبەشی واتە: (چاك = حسن)).[1]

(بخاری) و (مسلم)یش لە (عائشە)وەڵ گێڕاویانەتەوە کە وتوویەتی: پێغەمبەری خوامﷺ بینی بە عەباکەی دەیشاردمەوە، لە کاتێکدا کە من سەیری ئەو حەبەشیانەم دەکرد کە لە مزگەوتدا یارییان دەکرد، هەتا خۆم بێزار دەبووم. جا ڕێزی کچی تازەپێگەیشتوو بگرن کە سوورە لەسەر یاریکردن.

(نسائی)ش لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا لە (عائشە)وە، وتوویەتی: رەشپێستەکان هاتن لەرۆژی جەژندا لەبەردەم پێغەمبەری خواﷺدا یارییان دەکرد، پێغەمبەری خواﷺ بانگی کردم، منیش لەسەر شانیەوە سەیرم دەکرد هەتا خۆم بێزار بووم و رۆیشتم.

---

١ قال ابن حجر في الفتح معلقاً (٣١/١٣): وإن الممازحة بالقول والفعل إنما يقصد به التأنيس. واتە: مەبەست لە سوعبەت کردن بە طوفتار و کردار خەمرەوینەیە.

هەر لە نموونەکانی ژیانی، کاتێ کە (انس)ﷺ کەمتەرخەمی بنواندایە لە خزمەتکردنی پێغەمبەرداﷺ، یاخود کارێکی لەبیر بکردایە و خاووخێزانی پێغەمبەرﷺ سزایان بدایە، پێغەمبەری خواﷺ (تێگەیشتوو لە سنووری توانای منداڵ) دەیفەرموو: ((**دعوه، فلو قدر لکان**)) واتە: (وازی لێ بێنن، گەر لەتوانایدا بوایە دەیکرد).

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە منداڵ خاوەنی توانایەکی فیکری و جەستەیی دیاریکراوە، داوا لێکردنی بۆ ئەنجامدانی کاروباری وەها کە لە سەرووی توانایەوە بێت وەك چاندنی تۆو وەهایە لە هەوادا..

تەنانەت لە گاڵتەوگەپ کردنیشدا پێغەمبەری خواﷺ بەپێی توانای عەقڵی و فیکرییان گاڵتەی لەگەڵ دەکردن، و بە شتانێك گاڵتەی لەگەڵ دەکردن کە هەستیان پێدەکرد و تێی دەگەشتن و دەیانزانی.

جا ئایا گاڵتەوگەپ کردنی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ (اباعمیر)ی منداڵدا.. ((**یا أبا عمیر! ما فعل النغیر**)) بەڵگە نیە لەسەر ئەوە؟ لە کاتێکدا کە (نغیر) باڵندەیەکی بچووك بوو منداڵێکی بچووك یاری پێ دەکرد.

خۆ ئەگەر بمانەوێت دواندنی پێچەوانەی ئەوە.. واتە دواندنی منداڵ بەشێوەیەك لە سەرووی توانای فیکرییەوە بێت، یاخی بوون و سەرکەشی و لاساری و هەندێك جاریش تەمبەڵی تێدا بەدی دەکەین، جا ئایا هیچ کەسێکت بینیوە کە بە زمانێك فەرمانت پێبکات و کارت بەسەردا بدا جگە لەو زمانەی کە تۆ دەیزانی، تۆش وەڵامی نەدەیتەوە، لەسەر ئەوە دەست بە لێدانت بکات؟ جا ئایا ئەوە هیچ دادگەریەکی تێدایە؟ منداڵیش هەر بەو جۆرەیە.

## بنچینەی فیکری چوارەم: گفتوگۆی هێمن و لەسەرخۆ لەگەڵ منداڵدا:

گفتوگۆی هێمن و لەسەرخۆ دەبێتە هۆی گەشەکردنی عەقڵی منداڵ، و توانای تێگەیشتنی فراوانتر دەکات، و چوست و چالاکی ئاشکراکردنی راستی کاروبارەکان و رێڕەوی رووداوەکان و رۆژەکان زیاتر دەکات، و مەشقکردنی منداڵ لەسەر وتوویژ و گفتوگۆ، باوك و دایك دەگەیەنێتە لوتکەی پەروەردەو بنیاتنان، چونکە ئەو کاتە منداڵ دەتوانێت گوزارشت لە مافەکانی خۆی بکات، و لە توانایدایە دەربارەی ئەو شتانەی نایانزانێت پرسیار بکات،

بەمەش کرانەوەی فیکری دەست پێدەکات و دەچێتە کوڕ و دانیشتنی گەورەکان، کەواتە ئامادەبوونیشی شوێنەواری خۆی هەیە، و بیروبۆچوونە فیکرییەکانیشی دەنگدانەوەی دەبێت لە دەروونی گەورەکاندا.. چونکە ئەو لە ماڵەوە لەگەڵ دایك و باوکی لەسەر گفتوگۆ و دەستوور و شێواز و ڕێگاکانی ڕاهاتووە و شارەزایی گفتوگۆی لە دایك و باوکیەوە بەدەست هێناوە.

بەڵام ئەوەی هەندێك کەس دەیکەن و منداڵەکەیان وا لێدەکەن کە بێدەنگ بێت.. تا بەو هۆیەوە جوانخویی ڕەوشتی و بێدەنگی تەواو و ئاکاری بەرز نیشان بدەن.. ئەمە شتێکی باش و چاکە، بەڵام بە مەرجێك کە منداڵ توانای گوزارشت کردن لە بیروبۆچوونەکانی خۆی هەبێت، و لە توانایدا بێت بە شێوەیەکی ڕێکوپێك و ڕەوشت جوانیەوە گفتوگۆ بکات.

پێغەمبەری خواش ﷺ بە هێمنی منداڵی دواندووە، ئەوەشمان خستە روو کاتێ لە منداڵە شوانەکەی پرسی دەربارەی ژمارەی سوپای قوڕەیشی، لە کاتێکدا کە هاوەڵان لە منداڵەکەشیان دا، ئەویش وەڵامی نەدەدانەوە.

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ بەشێوەیەکی هێمن و لەسەرخۆ ئەو لاوەی دواند کە هاتبوو داوای کرد ڕێگەی زیناکردنی پێ بدرێت، کاتێ لاوەکە هەستا تەواو رق و قینی لە زینا بۆوە.

پێشتریش لەباسی هەستانی منداڵ بۆ شەونوێژکردن ئەو فەرموودەیەی (ابن عباس)م خرایە روو کە (بخاری) گێڕابوویەوەو هانیدا لەسەر شەونوێژ، لە گێڕانەوەیەکی دیکەشدا زیادەیەك هەیە کە لێوەی بە گفتوگۆی پێغەمبەرمان ﷺ لەگەڵ منداڵێکی تازەپێگەیشتووی وەك (ابن عباس) ئاشنا دەبین، ئەمەش ئەو گفتوگۆ لەسەرخۆو هێمنانەیەیە:

لە (ابن عباس)ەوەم وتوویەتی: شەوێکیان لای (میمونە)ی پورم مامەوە، و چاودێری نوێژی پێغەمبەری خوام ﷺ دەکرد، پێغەمبەر ﷺ تێبینی ئەوەی کرد و فەرمووی: **((نامت العيون وغارت النجوم وبقي الحي القيوم))**. واتە: (چاوەکان نوستن و ئەستێرەکان ئاوابوون، تەنها خوای گەورەو هەمیشە زیندوو مایەوە).

پاش ئەوە کۆتایی سورەتی (ال عمران)ی خوێند: ﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ....ئایەتەکان﴾آل عمرام/ ١٩٠.

پاشان هەستایەوە بۆ لای کوندەیەکی هەڵواسراو و دەستنوێژی گرت و دەستی کرد بە نوێژکردن، منیش دەستنوێژم گرت و لەلای چەپیەوە وەستام، گوێی گرتم، لە گێڕانەوەیەکی

کەدا: پەرچەمی گرتم، و لە پشتیەوە سووڕاندمیەوە هەتا گەیاندمیە لای راستی خۆی، منیش گەڕامەوە شوێنی خۆم و لای چەپی، بۆ جاری دووەم و سێیەمیش خستمیەوە ئەولای، کاتێ لێبوویەوە فەرمووی: ((ما منعك أن تثبت في الموضع الذي أوقفتك فيه؟)). واتە: (چی وای لێکردیت لەو جێگایە رانەوەستی کە من دامنایت؟)

منیش وتم: تۆ پێغەمبەری خوایت و بۆ هیچ کەس نیە رێکی تۆ بوەستێت و یەکسان بێت لەگەڵ تۆدا، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((اللهم فقهه في الدين وعلّمه التأويل)). واتە: (خوایە شارەزای ئایینی بکە و فێری تەفسیری قورئانی بکە).[1]

هەر لە (ابن عباس)ەوە م کە وتوویەتی: چووم بۆ لای پێغەمبەری خواﷺ لەکاتێکدا کە شەونوێژی دەکرد، منیش هەستام لە پشتیەوە وەستام، گرتمی و بردمیە تەنیشتیەوە، کە لێبوویەوە فەرمووی: ((مالك؟! أجعلك حذائي فتخنس)). ئەوە چیتە؟! من دەتخەمە لاتەنیشتمەوە تۆ لادەچیت؟

منیش وتم: بۆ هیچ کەس نیە لە تەنیشت تۆوە نوێژ بکات کە تۆ پێغەمبەری خوایت.

ئەمەی بەدڵ بوو و داوای لەخوا کرد و پاڕایەوە کە تێگەیشتن و زانیاریم زیاد بکات.[2]

هەروەها منداڵێك کە مەبەستیەتی بەشداری غەزا بکات، پێغەمبەری خواﷺ بەشێوەیەکی لەسەرخۆ و هێمنانە گوێ لە بیروبۆچوونی دەگرێت و گفتوگۆی لەگەڵ دەکات و مافی خۆیشی دەداتێ:

لە (سمرە کوڕی جندب)ەوەﷺ دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: دایکم بێوەژن کەوت و هات بۆ مەدینە، خەڵکی دەهاتنە خوازبێنی، ئەویش دەیوت: شوو بە پیاوێك دەکەم کە ئەم منداڵەم بگرێتە ئەستۆی، جا پیاوێکی ئەنصاری مارەی کردەوە، دەڵێ: پێغەمبەرﷺ بەسەر منداڵی ئەنصارییەکاندا دەگەڕاو ئەوەی پێ‌گەیشتووبوایە دەری دەهێنا،ساڵێکیان منیش لەناو ئەوانەدا بووم کە بەسەریاندا دەگەڕێت، جا کوڕێکی دەرهێنا و منی رەت کردەوە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەوت دەرهێنا و منیشت رەت کردەوە، ئەگەر زۆرانبازی لەگەڵ بکەم دەیبەزێنم، دەڵێ: زۆرانبازیم لەگەڵ کرد و بەزاندم، پاشان منیشی دەرهێنا.[3]

---

١ بدائع الصنائع ٢٥٨/١.

٢ رواه الحاكم في المستدرك(٥٣٤/٣) وقال: صحيح على شرط الشيخين.

٣ رواه الحاكم في مستدركه (٦٠/٢) وقال: صحيح الأسناد. و لم يخرجاه، وأقره الذهبي.

پاش ئەوە هاوەڵانیش لەسەر ڕێبازی پێغەمبەری خواﷺ دەڕۆیشتن، ئەوەتانێ ئەمیری باوەڕداران (عمر کوڕی خطاب) باوکێك سکاڵا دێنێتە لای لەدەست لاساری کوڕەکەی، ئەوەی کە (عمر) کردی بانگکردنی کوڕەکە بوو تا ڕاستی تێبگات.. (عمر) بە کوڕەکەی وت: چی وای لێکردوویت دڵی باوکت بڕەنجێنیت؟ وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران، مافی منداڵ لەسەر باوکی چییە؟ وتی: ئەوەیە کە ناوێکی چاکی لێ بنێت و دایکێکی باشی بۆ هەڵبژاردبێت، و فێری خوێندنەوەی قورئانی بکات، وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران! ئەم باوکەی من هیچ یەك لەوانەی نەکردووە، (عمر) ئاوڕی لە باوکەکە دایەوەو وتی: پێش ئەوەی کوڕەکەت دڵی تۆ بڕەنجێنێت و خراپ بێت بەرامبەرت، تۆ خراپ بوویت بەرامبەری..

(عمر) منداڵانی دەدواند و تەنانەت لە کاروباری گرنگ و پڕبایەخیشدا ڕاوێژی پێدەکردن.[١]

براکەم، خەلیفەی موسڵمانان و سەرۆکی گەورەترین دەوڵەتی جیهانت بینی! (عمر) و تۆ چووزانی (عمر) چ هێزی بوو لە حەقدا؟! لە کاروباری گرنگ و پڕ بایەخدا ڕاوێژ بە منداڵان دەکات، ئەوانەی کە کەس گوێیان لێ ناگرێت، و بە کەم تەماشایان دەکەن، ئەو منداڵانەی کە پێغەمبەری خواﷺ دەیدواندن و ئەمیری باوەڕداران گفتوگۆی لەگەڵ دەکردن.. دە تۆش هێمنی و لەسەرخۆیی منداڵەکەت بدوێنە، و بە سۆز و خۆشەویستیەوە گفتوگۆی لەگەڵدا بکە، و بە نەرم و نیانیەوە گوێ بۆ بیروبۆچوونەکانی رابگرە. هەروەك خەلیفەی راشدینی پێنجەم (عمر کوڕی عبدالعزیز) گوێی راگرت و دواندی:

کاتێك (عمر کوڕی عبدالعزیز)ﷺ جڵەوی خەلیفایەتی گرتە دەست و، لە هەموو لاوە شاند و، نوێنەر دەهاتن بۆ خستنەڕووی پێویستی و داواکارییان، و بۆ پیرۆزبایی لێکردنی، شاندێکی حیجازییەکانیش هاتنە خزمەتی و لەنێویاندا منداڵێکی هاشمی هاتە پێشەوە تا قسە بکات، خەلیفە (عمر) وتی: با لەو بەتەمەنتر قسە بکات.

منداڵەکە بە (عمر)ی وت: خوای گەورە ئەمیری باوەڕداران سەرکەوتوو بکات، بێگومان مرۆڤ بە دوو بچووکەکەیەتی، دڵی و زمانی، گەر خوای گەورە زمانێکی پاراو و دڵێکی پارێزگاری بە بەندەی بەخشی، ئەو کەسە شایستەیە قسە بکات، و ئەو کەسەشی گوێی بۆ راگرت بە فەزڵ و چاکەی ئاشنا دەبێت، ئەی ئەمیری باوەڕداران! گەر فەرمان بەپێی تەمەن بوایە، ئەوا لەنێو ئەم ئوممەتەدا لە تۆ شایستەتر هەبوو کە ئێستا لەشوێنی تۆدا بێت!..

---

١ (حیاة عمر بن خطاب) للطنطاویین.

(عمر) وتی: راستت وت، چی دیکەت پێیە بیڵێ، منداڵەکەش وتی: خودا ئەمیری باوەڕداران سەرکەوتوو بکات، ئێمە شاندی پیرۆزبایی کردنین، نەك شاندی ئەوە بین شتمان لە تۆ دەست کەوێت، لەبەر ئەوە هاتووین بۆ لات کە خوای گەورە ئەو بەخششەی بە ئێمە دا کە تۆ بوویت بە خەلیفەمان، و هیچ ئارەزوو و ترسێك ئێمەی بۆ لای تۆ نەهێناوە، بەلام ئارەزوو ئەوەیە کە ئێمە لە ولاتی خۆمانەوە هاتووین، و ترسیش ئەوەیە کە ئێمە لە دادگەری تۆ دلنیا بووین کە ستەممان لێ ناکەیت.

(عمر) وتی: ئەی منداڵ! ئامۆژگاریم بکە!

منداڵەکە وتی: خوا ئەمیری باوەڕداران سەرکەوتوو بکات، کەسانێك لەنێو خەڵکیدا هەن خوای گەورە ئارامی لەسەرگرتوون و هیواو ئومێدی درێژکردوون و پیاهەڵدانی خەڵکی بەسەریاندا زۆر کردووە، ئەویش پێی هەڵخلیسکاندوون و خستوونیەتە ناو ئاگرەوە، تۆش با ئارامی خوا لە سەر تۆو درێژی هیوا و ئومێدت و زۆر پیاهەڵدانی خەڵك بەسەرتدا لەخۆت بایی نەکات و هەڵت نەخلیسکێنێت و نەگەیت بەو خەڵکانە، خوای گەورە وا بکات تۆ لەوان کەسان نەبیت و بتگەیەنێت بە چاکانی ئەم ئوممەتە... پاشان بێدەنگ بوو.

(عمر) وتی: ئەو منداڵە تەمەنی چەندە؟ وتیان: یازدەساڵانە، پاشان پرسیاری لەبارەوە کرد بینی کوڕی گەورەمان (حسین کوڕی علی)یەﷺ، جا زۆر سوپاسی کرد و بۆی پاڕایەوە.

لە (مصعب کوڕی سعد)ەوە، کە وتوویەتی: باوکم گەر لە مزگەوت نوێژی بکردایە نوێژەکەی کورت دەکردەوەو (رکوع) و کڕنووشی بە تەواوی ئەنجام دەدا، گەر لە ماڵیشەوە نوێژی بکردایە رکوع و کڕنووش و نوێژەکەی درێژ دەکردەوە، منیش وتم: باوکە هۆی چیە لە مزگەوت نوێژەکەت کورت دەکەیتەوەو لەماڵەوە درێژی دەکەیتەوە، وتی: کوڕم ئێمە ئیمام و پێشەوایەکین خەڵکی چاومان لێ دەکەن.[١]

لە (ابوبردە کوڕی ابو موسی)ەوە م، کە وتوویەتی: (ابوموسی)م بینی لە ماڵی (ام فضل) بوو، (ام فضل) پژمی و پێی وت (یرحمك الله)، منیش پژمیم بەلام بەمنی نەوت (یرحمك الله)، کاتێ گەڕامەوە بۆ لای دایکم ئەوەم بۆ باسکرد، کاتێ (ابوموسی) گەڕایەوە دایکم پێی وت: کوڕەکەم لای تۆ پژمی و تۆ پێت نەوتووە (یرحمك الله)، بەلام ئافرەتێك پژمی پێی دەڵێیت (یرحمك الله)؟ ئەویش وتی: کوڕەکەی تۆ پژمی و (الحمدلله)ی نەکرد، منیش (یرحمك الله)م پێی

---

١ رواه الطبراني لي الكبير، ورجاله رجال الصحيح، كذا قاله الهيثمي في المجمع (١٨٢/١).

نەوت، بەڵام ئافرەتەکە (الحمدللە)ی کرد و منیش (یرحمك اللە)م پێوت.. گوێم لە پێغەمبەری خواﷺ بوو دەیفەرموو: ((إذا عطس أحدكم فحمد الله فشمّتوه، وإذا لم يحمدالله فلا تشمّتوه)). واتە: (ئەگەر یەکێك لە ئێوە پژمی و (الحمدللە)ی کرد، ئێوەش (یرحمك اللە)ی پێبڵێن، بەڵام گەر (الحمدللە)ی نەکرد ئێوەش (یرحمك اللە)ی پێ مەڵێن).

دایکم وتی: چاکت کرد، چاکت کرد.[1]

لێرەدا نمونەیەکی زیندووی گفتوگۆی لەسەرخۆ و هێمن دەخەینە روو کە بۆتە هۆی راستکردنەوەی رێڕەوی پێشەوایەکی گەورە، پێشەوا (ابوحنیفە) منداڵێکی بینی بە قوڕ یاری دەکرد، بە منداڵەکەی وت: وریابە نەکەویتە ناو قوڕەکەوە، منداڵە بچووکەکە بە ئیمامی گەورەی وت: تۆ وریای خۆت بە نەکەوی، چونکە کەوتنی زانا کەوتنی جیهانە، ئەوەبوو (ابوحنیفە) پاش بیستنی ئەو وتەیەی ئەو منداڵە بچووکە فەتوایەکی دەرنەدەکرد تا یەك مانگی تەواو لەگەڵ قوتابیەکانیدا تاوتوویی نەکردایە.[2]

(الخطیب) بە سەنەدی خۆی لە (مجاشع کوڕی یوسف)ەوە گێڕاویەتیەوە کە وتوویەتی: لەشاری مەدینە بووم لای ئیمام (مالك) لە کاتێکدا فتوای بۆ خەڵك دەدا، (محمد کوڕی حسن) کە هاورێی (ابو حنیفە) بوو هات بۆ لای -تازەپێگەیشتوو بوو-، ئەمە پێش چوونی بۆ لای بە مەبەستی بیستنی (الموطأ) لێی، (محمد) وتی: چی دەڵێی دەربارەی کەسێك لەشی پیسە و تەنها لە مزگەوتدا ئاوی دەست دەکەوێت؟ (مالك) وتی: کەسی لەش پیس ناچێتە ناو مزگەوت، (محمد) پێی وت: ئەی باشە چی بکات ئەوا کاتی نوێژکردن هاتووەو ئاو دەبینێت، دەڵێ: (مالك) هەر دووبارەی دەکردەوە کە لەش پیس ناچێتە ناو مزگەوت، کە هەر زۆر لێی دووبارە کردەوە (مالك) وتی: ئەی باشە تۆ لەو بارەوە چی دەڵێی؟ وتی: تەیەموم دەکات و دێتە ناو مزگەوت و ئاو دەبات و دەڕواتە دەرەوەو خۆی پێ دەشوات، وتی: تۆ خەڵکی کوێیت؟ وتی: خەڵکی ئێرەم-ئاماژەی بۆ زەوییەکە کرد-، پاشان هەستایەوە، وتیان (محمد کوڕی حسن) هاورێی (ابوحنیفە)یە، (مالك) وتی: باشە (محمد کوڕی حسن) چۆن درۆ دەکات؟ وای باسکرد کە خەڵکی مەدینەیە؟ وتیان: نا، ئەو مەبەستی ئەوەبوو کە خەڵکی ئەمەیە-ئاماژەی بۆ زەویەکە کرد-، وتی: ئەمەم لەسەر گرانتر بوو لەوە.[3]

---

١ رواه الحاكم في مستدركه ٢٦٥/٤ وقال صحيح الأسناد ولم يخرجاه وأقره الذهبي.

٢ الإسلام بين العلماء والحكام، ص١١٢ لعبدالعزيز البدري، وص٦٤ من كتاب تذكرة الآباء وتسلية الأبناء لأبن العديم.

٣ بلوغ الأماني في سيرة الإمام محمد بن حسن الشيباني –للشيخ محمد زاهد الكوثري ص١٢.

## بنچینەی فیکری پێنجەم: مەشقکردنی هەستەکانی منداڵ بە ئەزموونی کردارییی:

مەشقکردنی هەستەکانی منداڵ زانست و زانیاری پێدەبەخشێت، بۆ نمونە کاتێك دەست بە گەشەکردن دەکات و دەست دەکات بە جولاندنی هەردوو دەستی بۆ کارێك لە کارەکان، ئەوە دەبێتە مایەی ورووژاندنی هۆشیاری لە عەقڵیدا. بەرامبەرەکەی دەبینێ کە چۆن هەستەکانی مەشق پێدەکات، خۆیشی ئەو کارە دووبارە دەکاتەوە، بەو جۆرە شارەزای کار دەبێت و هەنگاو بەهەنگاو بەرەو چاك فێربوونی کار دەچێت.

پێغەمبەری خواﷺ دەبینێت منداڵێك مەڕێکی کەوڵ دەکرد و چاك نەیدەزانی، پێغەمبەرﷺ ئەوەی پێکرا ئەوە بوو کە هەستا هەردوو قۆڵی هەڵکرد و بەبەرچاوی منداڵەکەوە دەستی کرد بە کەوڵکردنی مەڕەکە، و منداڵەکەش لە چۆنیەتی پێست داماڵینەکە راما، و لەوەوە عەقڵی دەخستە کار، و هۆشی دەدایێ بۆ فێربوون لە پێغەمبەری خواوەﷺ.

لەم رووەوە (ابوداود) لە (ابوسعید الخدری)یەوەﷺ هێناویەتی کە پێغەمبەری خواﷺ بەلای کوڕێکدا تێپەڕی کە خەریکی کاوڕێك بوو پێستەکەی کەوڵ دەکرد و چاك نەیدەزانی، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: لاچۆ، هەتاوەکو پیشانتی بدەم.. دەستی خستە نێوان پێست و گۆشتەکەو دەستی پێدا هێنا هەتا گەیشتە بن باڵی، پاشان وازی لێ هێناو رۆیشت نوێژی بۆ خەڵك کرد و دەستنوێژی نەگرت.

ئا بەمجۆرە ئەزموونە کردارییانە لە مەشق پێکردنی منداڵ دەتوانرێت ئاسۆی زانیاری بکاتەوەو مەودای تێگەیشتنی هۆش و عەقڵی فراوان بکات.

## بنچینەی فیکری شەشەم: کەمەندکێش کردنی منداڵ بۆ لای کەسێتیەکی چەسپاو کە ببێتە پێشەنگی کە پێغەمبەری خوایەﷺ:

لە(ابن عباس)ەوەکە وتوویەتی: شەوێك لەلای (میمونە)ی پوورم مامەوە، هەتا کاتێك هەندێك لە شەو تێپەڕی پێغەمبەری خواﷺ هەستا بۆ شەونوێژکردن، چوو بۆ لای کوندەیەکی هەڵواسراو، و دەستنوێژێکی سووکی گرت و پاشان دەستی کرد بە نوێژ کردن، منیش هەستام وەك ئەو دەستنوێژم گرت و لەلای چەپیەوە وەستام، ئەویش بردمیە لای راستیەیەوە، ئەوەندەی

خوا ئیرادەی کردبوو نوێژی کرد، پاشان راکشا و خەوت هەتا پرخەی هات، ئینجا بانگدەر هات و هەواڵی پێدا بۆ نوێژکردن، و چووە دەرەوە و نوێژی بۆ کردن.[١]

لە گێڕانەوەیەکی دیکەی (ابن خزیمە)دا: شەوێکیان لای (میمونە)ی پوورم مامەوە، چاودێریم کرد کە پێغەمبەری خواﷺ چۆن نوێژ دەکات، پاشان هەستا نوێژی کرد....

وا بەستەکردنی منداڵ بە خودی پێغەمبەری خواوەﷺ و شوێن پێ‌هەڵگرتنی، و چاندنی خۆشەویستی ئەو بەو شێوەی کە لە بنیاتنانی بیروباوەڕی منداڵدا دەخرێتە روو، و رێنماییکردنی بەو فەرمودەیەی پێغەمبەری خواﷺ کە (طبرانی) و (ابن نجار) هێناویانە لە (علی)ەوەرضي الله عنه کە فەرموویەتی: ((**أدبوا أولادكم على ثلاث خصال: حب نبيكم، و حب آل بيته، وتلاوة القرآن**)). واتە: (منداڵەکانتان لەسەر سێ رەوشت پەروەردە بکەن: خۆشەویستی پێغەمبەرەکەتان، و خاوخێزانی، و خوێندنی قورئان).

پەیوەست بوونی منداڵ بە پێغەمبەرەوەﷺ دەیکاتە مرۆڤێکی راست، و هۆش و تێگەیشتنی لەسەر ژیانی پێشەوای پێغەمبەران، و سەرکردەی مرۆڤایەتی، و خۆشەویستی خودای میهرەبان دەکاتەوە، و عەقڵی بە روناکی ئیمان دەگەشێتەوەو ئەو مێژووە سەربەرزە تێدەگات.. و سەری بەرز دەکاتەوە بە شوێنکەوتنی پێغەمبەری خواﷺ.

خۆ گەر لە پڕوپووچی رۆژئاوا لە پەروەردەکردنی منداڵ بڕوانین لە دەستگرتن بە کەسانی خەیاڵی وەك (سوپەرمان) و کەسی تر، ئەوا مەزنی و گرنگی و بایەخی پەیوەستکردنی عەقڵی منداڵ بە خودی پێغەمبەری خوامانﷺ بۆ دەردەکەوێت، تەنها ئەوەندەی بەسە کە ژیاننامەو خووڕەوشت و غەزاکانی بخەینە روو بۆ منداڵ تا پەلە بکات لە رۆیشتن بەرەو خۆشەویستی پێغەمبەرەکەی و دوورکەوتنەوە لە کۆمەڵە داوێن پیسەکان.

---

١ رواه ابن خزيمة في صحيحه ٣/١٧.

# دەروازەی سێیەم

## بنچینەکانی شێوازە دەروونییە کاریگەرەکان لەسەر دەروونی منداڵ

**بنچینەی یەکەم: هاوڕێیەتی کردنی منداڵ.**

**بنچینەی دووەم: شادی و خۆشی خستنە دەروونی منداڵ.**

**بنچینەی سێیەم: چاندنی پێشبڕکێی بنیاتنەر لەنێوان منداڵان و خەڵاتکردنی منداڵی سەرکەوتوو.**

**بنچینەی چوارەم: بنەمای هاندانی منداڵان.**

**بنچینەی پێنجەم: پیاهەڵدان و دەستخۆشی لێ کردن.**

**بنچینەی شەشەم: یاریکردن لەگەڵ منداڵ و خۆپچووککردنەوە بۆی.**

**بنچینەی حەوتەم: پەرەپێدانی متمانە بەخۆبوونی منداڵ.**

**بنچینەی هەشتەم: جوان بانگکردن.**

**بنچینەی نۆیەم: بەدەمەوەچوونی ئارەزووەکانیان و رازیکردنیان.**

**بنچینەی دەیەم: شوێنەواری دووبارەکردنەوە لەسەر دەروونی منداڵ.**

**بنچینەی یازدەیەم: پلەبەندی لە هەنگاوەکاندا.**

**بنچینەی دوازدەم: ئامەزرۆگەری و ترساندن.**

ڕۆحەکانیش بەهۆی پەروەردەی جوانەوە گەشە دەکەن، هەورەك چۆن جەستە بەهۆی خۆراکی دروستەوە گەشە دەکات، بۆ گەشەی جەستەش سنووری دیاریکراوی خۆی هەیەو مەبەستێکە تێپەڕاندنی نیە گەر گەیشتە چڵەپۆپەی خۆی دەست دەکات بە گەڕانەوە بۆ دواوە، بەڵام گەشەی گیان (روح) وابەستەیە بە ژیانی مرۆڤەوەو وەستانی بۆ نیە، مەگەر ئەو کاتە بوەستێت کە هەناسەکانی بوەستێت و لە قوتابخانەی ئەم جیهانە گەورەیە جیابێتەوە...

شێخ محمد الخضر حسین:

## بنچینەی دەروونی یەکەم: هاوڕێیەتی کردنی منداڵ:

هاوڕێیەتی کردن ڕۆڵێکی گەورەی هەیە لە کارکردنە سەر دەروونی منداڵدا، و ئاوێنەی هاوڕێیە بۆ هاوڕێکەی، و وەك پرۆسەی موتربەکردن وایە لەنێوان دوو هاوڕێدا کە لە یەکتریەوە شت فێر دەبن.

پێغەمبەری خواش ﷺ لە هەموو بوارەکاندا هاوڕێیەتی منداڵانی دەکرد، جار هەبوو (ابن عباس)ی لەگەڵ خۆی دەبرد بە ڕێگادا دەڕۆیشتن، جاری دیکەش هەبوو لەگەڵ منداڵەکانی (جعفر)ی ئامۆزایدا دەڕۆیشت، جاریش هەبووە (انس)ی لەگەڵ خۆیدا بردووەو هاوڕێیەتی کردووە، بەو جۆرە پێغەمبەری خوا ﷺ هاوڕێیەتی منداڵی دەکرد بەبێ پێناخۆش بوون و خۆبەگەورەگرتن و، بەبێ خۆبەزلزانی و لوتبەرزی، ئەمەش مافی منداڵە کە هاوڕێیەتی گەورەکان بکات تا لێیانەوە شت فێر ببێت و پاکخوویی (تهذیب)ی دەروونی بکات و، عەقڵی بەهێزتر بێت و، خوونەریتی چاکتر بێت.

لە (انس)ەوە رضي الله عنه دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ منداڵاندا یاری دەکرد و (جبریل) هات بۆ لای و بردی و دای بەزەویدا و سنگی شەق کردو.... فەرموودەکە.[1]

(حاکم)یش گێڕاویەتیەوە [2] کە (عبداللە کوڕی جعفر) وتویەتی: گەر دەتبینی من و (قثم)و (عبیداللە کوڕی عباس) یاریمان دەکرد، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ بەسەر وڵاخێکەوە بوو هات و فەرمووی: ((**أحملوا هذا إلي**)) ئەوەیان بهێنن بۆم و، خستمیە بەردەمی خۆی، پاشان بە (قثم)ی فەرموو ئەوەش هەڵگرن و بۆم بهێنن، جا خستیە پشت خۆیەوە و، شەرمی لە (عباس)ی مامی نەکرد کە (قثم)ی هەڵگرێت و (عبیداللە) بەجێبهێڵێت، پاشان سێ جار دەستی هێنا بەسەرمدا، کاتێ کە دەستی دەهێنا بە سەرمدا دەیفەرموو: ((**اللهم أخلف جعفراً في ولده**)) خوایە نەوە ببەخشیت بە جەعفەر لە منداڵەکانی.

بە (عبداللە کوڕی جعفر)م وت: (قثم) چی کرد؟ وتی: شەهید بوو، وتم بە (عبداللە): خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی ئاگادارن لە هەواڵی، وتی: بەڵێ.

ئەوەش منداڵێکی هاوەڵە کە باس دەکات چۆن خزم و کەس و کاری بردویانە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەوەش وای لێکردووە کە پاش ئەوە فەرمودەی پێغەمبەری خوا ﷺ

---

١ رواه الحاكم في مستدركه وقال صحيح الأسناد وأقرّه الذهبي.

٢ السعادة العظمى ص٩٠ للشيخ محمد الخضر حسين.

بگێڕێتەوەو ئەوەی بینیویەتی و بیستوویەتی لە پێغەمبەری خواﷺ بگێڕێتەوە کە ئەویش (أبو جحيفة)یەﷺ، دەڵێت: لەگەڵ چەند کەسێکی (بني عامر کوڕی صعصعه) لە (ابطح) هاتینە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ، فەرمووی: ((مرحباً! أنتم مني)) سڵاوتان لێ بێت، ئێوە لە منن.. کاتێك وەختی نوێژ هات، (بلال) چوویە دەرەوەو بانگی دا، و دەستی خستنە ناو گوێیەکانی، لە بانگەکەی خۆی دەسوڕاند، کاتی پێغەمبەرﷺ هەستایەوە رمێکی کورتی لە پێشەوە داکوتی و نوێژەکەی کرد.[1]

هاوەڵانیش بەو جۆرەیان دەکرد، (عمر) کوڕەکەی و (ابن عباس)ی لەگەڵ خۆی دەبرد، (زبیر)یش منداڵەکەی لەگەڵ خۆی دەبرد بۆ جەنگ تا هونەرەکانی جەنگ کردن فێر ببێت و بەهێزو خۆڕاگرانە گەورە ببێت، پاشان پێغەمبەری خواﷺ تەرکیزی کردۆتە سەر هاوڕێیەتی منداڵ لەگەڵ منداڵی دیکەدا، ئەوەبوو پێغەمبەری خواﷺ لەکاتی منداڵیدا یاری لەگەڵ منداڵاندا دەکردو لەگەڵیاندا دەژیا و، دەردەچوو لەگەڵیاندا و دەڕۆیشتن، بەو جۆرە پەروەردەو گەورە دەبوو.

پاشان کاتێ پێغەمبەری خواﷺ کۆمەڵێك لە منداڵان دەبینێت یاری دەکەن، لێیان جیانابێتەوە، و یاریەکەیان لێ تێك نادات، بەڵکو لەسەر ئەو گیانی بەکۆمەڵ یاریکردنە هانیان دەدات و چاودێری یاریەکەیان دەکات.

بۆیە دەبێت منداڵ هاوڕێیەتی منداڵی هاوتەمەنی خۆی بکات، ولە سەردەمی منداڵێتیدا هاوڕێی هەبێت، خۆ گەر دایك و باوك لە هەڵبژاردنی هاوڕێی چاك بۆ منداڵەکەیان سەرکەوتوو بوون، و چاودێری خوڕەوشتی ئەو کۆمەڵە هاوڕێیەیان کرد و لەژێر چاودێری و ئاگاداری خۆیاندا پەروەردەیان کردن و باوکان پێکەوە کۆبوونەوە بۆ لێکۆڵینەوە لە بارودۆخی منداڵەکانیان و دایکانیش پێکەوە دانیشتن بۆ توێژینەوە لە خووڕەوشتی منداڵەکانیان، ئەوا ئەمە هەموو چاکەی لێ دەکەوێتەوە.

چونکە هەروەك چۆن دایك و باوك لەسەریانە خۆراکی حەڵاڵ بۆ منداڵەکەیان دابین بکەن تا جەستەی بە حەڵاڵ گەورە بێت، و گۆشتەکەی دوور لە حەرام گەشە بکات، بە هەمان شێوە دایك و باوك لەسەریان پێویستە کە هاوڕێی چاك بۆ منداڵەکەیان دابین بکەن، تا لەگەڵیدا بدوێ و قسە بکات و یاری لەگەڵدا بکات و هاودەمی بکات.

١ رواه ابو يعلي في مسنده ١٩١/٢ بسند صحيح.

زۆر زۆریش ئاگادار بن لەوەی منداڵی خراپ دەستی منداڵەکەت بگرن و بەرەو خراپەو تاوانکاری ببەن و تۆش بەهۆی سەرکەشیتەوە بێئاگای لێی و بە دنیاوە شەکەت و ماندوویت، دایکیشی دڵخۆشە بە سەردان و هاتوچۆی هاورێکانیەوە، منداڵەکەشیان لەنێو چنگی منداڵانی خراپکاردا دەژی، ئەو تاوان و بەندیخانەی منداڵانیش ئەگەر سەردانیان بکەیت یان لەبارەیانەوە ببیستیت دەبینیت بەهۆی منداڵی خراپ بەهۆی بێئاگایی تۆوە منداڵەکەتیان بەخێرایی رفاندووە.

ئایا دەتەوێت منداڵەکەت لە بەندیخانەی منداڵاندا ببینیت، یان لە مزگەوت و ماڵی خوادا؟! دەسا پەلە بکە لە گەڕان بەدوای منداڵێکی چاکدا تا هاوڕێیەتی منداڵەکەت بکات و ببێتە هاوەڵی لە هات و چوونیدا، خۆ گەر منداڵێکی چاکت نەبینیەوە، ئەوا پەلە بکە لە رۆشتن بۆ لای مامۆستایەکی چاك تا رێنمونیت بکات و منداڵانی چاکت پێنیشان بدات و منداڵەکەی تۆش بخاتە لایان.

ئایە کاتی ئەوە نەهاتووە دایك و باوك بە ئاگابێنەوە؟! ئەوەتانێ دوژمنان دەمێکە بەئاگا هاتوون بۆ دزینی منداڵەکەتان لە ئامێزتاندا، ئەمەش بەهۆی رێکخراوە بێباوەڕەکان و یەکێتیە خراپەکارەکان، و یانە قێزەونەکانەوەیە.

## بنچینەی دەروونی دووەم: شادی و خۆشی خستنە دەروونی منداڵ:

شادی و خۆشی رۆڵێکی سەرسوڕهێنەریان هەیە لە دەروونی منداڵدا، بەشێوەیەکی بەهێز کاردەکاتە سەر دەروونی، منداڵانیش کە خونچەی بێگەرد و پاکن، شادییان خۆش دەوێت و حەزیان لێیەتی، بەڵکو ئەوان ئامرازی شادی گەورەکانن، و حەزیان لێیە کە زەردەخەنە لەسەر رووی گەورەکان بەدی بکەن.

هەروەها جوڵاندنی ئەو ژێکاریگەرە لە دەروونی منداڵدا بەرەوپێش چوون و زیندوویەتی لە دەروونیدا بەجێدەهێڵێت، و وای لێدەکات لەوپەڕی ئامادەییدا بێت بۆ وەرگرتنی هەر فەرمان و تێبینی و رێنماییەك.

پێغەمبەری خوایش ﷺ هەمیشە شادی و خۆشی دەخستە دەروونی منداڵانەوەو لەمەشدا شێوازی جۆراوجۆری بەکار دەهێنا، لەوانە:

- چاك پێشوازی کردن لێیان.

- ماچکردن و گاڵتەوگەپ کردن لەگەڵیاندا.

- دەست هێنان بەسەریاندا.

- هەڵگرتنیان و دانانیان لەکۆشی پیرۆزیدا.

- پێشکەشکردنی خواردنی باش پێیان.

- نانخواردن لەگەڵیاندا.

هەموو ئەوانە پێغەمبەری خواﷺ ئەنجامی دەدا بەو جۆرەی کە لە بنیاتنانی سۆزداریدا دەخرێتە روو، کەوا شادی چ کاریگەرییەکی بەهێزی هەیە، و خۆشی و شادی چ سەرکەوتنێکی هەیە لە بەختەوەرکردنی منداڵدا.

## بنچینەی دەروونی سێیەم: چاندنی پێشبڕکێکردنی بنیاتنەر لەنێوان منداڵاندا و خەڵاتکردنی منداڵی سەرکەوتوو:

پێشبڕکێکردن(التنافس) مرۆڤ بە شێوەیەکی گشتی دەجولێنێت چ جای منداڵێکی هەستدار، و خاوەن تواناو وزەی شاراوە کە مرۆڤ پەییان پێنابات و نایانزانێت هەتا رکابەرێك نەخاتە دەروونی خۆیەوە تا بەسەریدا زاڵ بێت و لێی بباتەوە، پێغەمبەری خواشﷺ گیانی پێشبڕکێی لە دەروونی منداڵدا دەوروژاند هەتا ئەو توانا زۆرەی مرۆڤ بجولێنێت، نمونەی ئەوەش کێبڕکێی فیکریی، کاتێ پێغەمبەری خواﷺ پرسیارێکی ئاڕاستەی هاوەڵانی کرد، لەنێو ئامادەبوانیشدا (ابن عمر)ی لێبوو کە بچووکترین کەسیان بوو:

(بخاری) هێناویەتی لە (ابن عمر)ەوە م کە دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: هەیە لەدەشتاییدا دارێك کە گەڵای هەڵناوەرێت و وەك موسڵمان وەهایە، پێم بڵێن چ دارێکە؟ خەڵکەکە کەوتنە ناو هەڵدانی دارەکانی دەشت، (عبداللە) وتی: بە دڵمدا هات کە دارخورما بێت، پاشان پێغەمبەری خواﷺ بۆی باسکردین و فەرمووی: ئەو دارە دارخورمایە.

لەگێڕانەوەیەکی دیکەدا (ابن عمر) ئەوە دەکاتە بەهانەی وەڵام نەدانەوەی کە (لەبەر ئەوەی من بچووکترین کەسیان بووم بێدەنگ بووم)، جا پرسیار عەقڵی منداڵ بەئاگادێنێت، و دەروازە داخراوەکانی تێگەیشتنی دەکاتەوە، و جوڵەی وەستاوی یا دەوری (مێشکی) بێدار دەکاتەوە.. ئەم جۆرە پرسیارەش لە وڵاتی شامدا پێی دەوترێت (حزورة، تحازیر) و لە میسریش پێی دەوترێت (فزورە، فوازیر).[1]

---

١ لەناو کوردەواریش پێی دەوترێت (مەتەڵ) —وەرگێڕ—

(ابن عمر)ی منداڵ لەوێدا لە زانست و زانیاری و وەڵامدا مونافەسەی گەورەکانی کردووە، بەڵام پابەند بووە بە ئەدەبەوە بەهۆی بچووکی تەمەنیەوە.

نمونەی دیکەی لەم جۆرە: پێشبڕکێی وەرزشی لەنێوان منداڵاندا:

پێغەمبەری خواﷺ پێشبڕکێی ڕاکردنی لەنێوان منداڵاندا ئەنجام دەدا هەتا ماسولکەکانیان گەشە بکات و جەستەیان بەهێز بێت:

(احمد) لە (عبداللە کوڕی حارث)ەوەﷺ هێناویەتی، کە وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ (عبداللە) و (عبیداللە) و (کثیر)ی کوڕانی (عباس)ی ریز دەکرد و پاشان پێی دەفەرمون: ((من سبق الي فله كذا وكذا)) هەرکێ زووتر بگاتە لام ئەوەو ئەوەی دەدەمێ.

دەڵێت: ئەوانیش پێشبڕکێیان دەکرد بۆ چوونە لای، جا دەکەوتنە سەر سنگ و پشتی و ئەویش ماچی دەکرد و لەئامێزی دەگرتن.

کەواتە کێبڕکێ و پێشبڕکێ شێوازێکە بەدەستی دایك و باوك و پەروەردەکارانەوە کە لەکاتی گونجاودا بەکاری بهێنن، جا بەهۆیەوە دەروونی منداڵەکانیان چوست و چالاك بێت، و هیممەت و چالاکیشیان بەرز بێتەوەو بەهرەکانیان گەشە بکات، و دیاری و بەخشیش پێشکەش بە براوەیان بکەن، هەروەك پێغەمبەری خواﷺ دەیکرد: ((من سبق الي فله كذا وكذا)).

بەمەش منداڵ هەست بە چێژ و شادی و بەختەوەری دەکات، هەموو منداڵێکیان پەلەدەکات و هەموو توانای بەکاردەهێنێت، ئەوەی پێی بکرێت دەیکات، تا سەرکەوتن بە دەست بهێنێت و خۆی ئامادە بکات بۆ ڕۆژی پێشبڕکێکە... خێرا دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە و خۆی ئامادە دەکات و مەشق دەکات و فێر دەبێت و، پرسیار دەکات و دەگەڕێ بە شوێن زانین و زانیاریدا، نیشانی دایك و باوکی دەدات، کە بە چ پلەیەك گەیشتووە، بەمجۆرەش وزەو توانا پەنهانەکانی دەتەقنەوە.

تێبینی و سوودێکی دیکەی ئەم شێوازە ئەوەیە کە گیانی کۆمەڵ و دوورکەوتنەوە لە تاکڕەوی گەشەپێدەکات، و لەسەر تێگەیشتنی ژیان رادێت، هەندێك جار دەیباتەوەو جاری دیکەش دەیدۆڕێنێ، جار وایە وەڵام دەزانێت و جاری دیکەش هەیە لێ ی دادەخرێت و نایزانێ، جاری وا هەیە دەیپێکێت و جاریش دەبێت هەڵە بکات.. ئا بەم جۆرە..

## بنچینەی دەروونی چوارەم: بنەمای هاندانی منداڵان:

هاندانی هەستی یا مەعنەوی هەمووی هەر چاکە، وە رەگەزێکی پێویستە لە رەگەزەکانی پەروەردە کە ناکرێت وازی لێ بهێنرێت،[1] بەڵام بەبێ زیادەڕەوی، هاندانیش رۆڵی گەورەی هەیە لەسەر دەروونی منداڵ، و پێشخستنی جوولەی باشی بنیاتنەری و لە ئاشکراکردنی وزەو توانا زیندووەکانی، و هەموو جۆرە ئارەزووەکانیدا، هەروەها بەردەوامی لەسەر کارو بەرەوپێشچوونی بەشێوەیەکی چاك زیاد دەکات، ئەو فەرمودەیەش خرایە روو لەبارەی ریزکردنی منداڵەکان لەلایەن پێغەمبەرەوەﷺ و هاندانیان لەسەر پێشبڕکێ و وتنی: ((من سبق الي فله كذا وكذا)) بەڵگەیە لەسەر ئەوە.

ئەوەتانێ (عمر)ﷺ لەگەڵ (عبدالله)ی کوڕیدا لە کۆڕ و دانیشتنی پێغەمبەری خواﷺ دێتە دەرەوە، لەکاتی هاتنە دەرەوەدا (عبدالله) بەباوکی وت: باوکە دارخورما هات بە دڵمدا، وتی: چی رێگرت بوو نەیڵێی؟! خۆ بتوتایە لەوەو لەوە لام خۆشتر بوو، دەڵێ: ئەوەی رێگەی لێگرتم ئەوەبوو کە بینیم تۆ و (ابوبکر) قسەتان نەکرد، منیش حەزم نەکرد قسە بکەم.[2]

(ابن حجر) لەبارەی ئەم فەرموودەیەوە وتوویەتی: وەك ئەوەی ئاماژەبێت بەوەی کە پێشخستنی گەورە ئەو کاتە یەکسان دەبن، بەڵام گەر لای بچووکەکە شتێ هەبوو دەیزانی کە گەورەکە لای نەبوو و نەیدەزانی ـ ئەوا رێگری لێ ناکرێت قسە بکات، با گەورەش ئامادە بێت، چونکە (عمر) دڵگران بوو لەوەی کە کوڕەکەی قسەی نەکرد، هەرچەندە ئەو پۆزش(عذر)ی بەوە هێنایەوە کە ئامادەبوونی ئەوو (ابوبکر) وایکرد وەڵام نەداتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا نیگەران بوو بەوەی قسەی نەکرد.[3]

(ابن قیم)یش لەسەر فەرموودەکە دەڵێت: ئەم فەرموودەیە دڵخۆش بوونی پیاوی تێدایە بەوەی کوڕەکەی پێکاویەتی و راستی زانیوە.. وە ئەوەشی تێدایە کە خراپ نیە کوڕ لەکاتی ئامادەبوونی باوکیدا وەڵام بداتەوە بەوەی دەیزانێت، خۆ گەر باوکەکە نەیزانی ئەوا هیچ نارەوشتیەکی تێدا نیە.[4]

---

١ منهج التربية الإسلامية لمحمد قطب ٢/١٤١.

٢ رواه البخاري.

٣ فتح الباري ١٣/١٥٣.

٤ كتاب (الطب النبوي) لأبن القيم ص٣٩٨.

ئەمەش نمونەیەکی دیکە لەبارەی گرنگیدانی (عمر) بە منداڵان و هاندانیان لەسەر ئەوەی کە لە کۆڕ و دانیشتنی گەورەکاندا قسە بکەن، و بیروبۆچوون و تێڕوانینەکانیان بخەنە روو:

ئەمەش نمونەیەکی تری بایەخ دان و هاندانی عومەرە بۆ منداڵان کە لە کۆڕ و دانیشتنی گەوراندا قسەبکەن و راوبیروبۆچونیان پێشکەش بکەن:

دەگێڕنەوە[1] کە (عمر) دەڵێ: بزانن ئەم ئایەتە بۆچی هاتۆتە خوارێ؟

﴿ أَيَوَدُّ أَحَدُكُمْ أَن تَكُونَ لَهُۥ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَابٍ ﴾البقرة:٢٦٦.

وتیان: خوا دەزانێت. (عمر) تورە بوو و وتی: بڵێن: دەیزانین یا نایزانین، (ابن عباس) وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران! لە بارەیەوە شتێکم لە دڵدایە؟ (عمر) وتی: دەی برازام! بیڵێ، و خۆت بە کەم مەزانە.. (ابن عباس) وتی: نمونەی بەکردار هێناوەتەوە، (عمر) وتی: چ کردارێك؟ (ابن عباس) وتی: ئیش و کار، (عمر) وتی: پیاوێکی دەوڵەمەند کاری چاکە دەکات و پاشان خوا شەیتانێکی بۆ دەنێرێت کاری خراپە دەکات، هەتاوەکو هەموو کردەوەکانی نغرۆ دەبێت.[2]

دەبا دروشمی دایکان و باوکان و پەروەردەکاران لە هاندانی منداڵاندا ئەوەبێت: (کوڕەکەم بیڵێ و خۆت بە کەم مەزانە).

هاندانی چاك بریتی یە لە هاندانی منداڵان لەسەر کاروباری چاك، وەك هاندانیان لەسەر کڕینی کتێبی بەسوود تاوەکو منداڵەکە ببێتە خاوەن کتێبخانەیەکی زانستی و لەگەڵ زۆربوونی ئەودا ئەویش گەشە بکات: ئەوەتانێ زانای گەورە (ابن عابدین) باسی پێگەیشتنی خۆی بۆ کوڕەکەی دەگێڕێتەوەو دەڵێت:[3] هۆکاری کۆکردنەوەی ئەم هەموو کتێبە بێهاوتایانە باوکی بوو، ئەوەبوو باوکی هەرکتێبێکی بویستایە بۆی دەکڕی، و پێی دەوت: هەرکتێبێکت دەستکەوت و حەزت لێی بوو بیکڕە من پارەکەیت بۆ دەدەم، بەراستی ئەوەی من مراندبووم لە سەربردەی پێشینەمدا تۆ ژیاندوتەوە، کوڕە شیرینەکەم، خوای گەورە پاداشتی چاکت بداتەوە.. جا ئەو کتێبانەی پێشینەکانی کە لەلای بوو (وقف) کرابوو لەسەر وەچەکانیان پێی دا.

---

١ رواه ابن المبارك في الزهد وابن جرير وابن ابي حاتم والحاكم في المستدرك عنه.

٢ فتح الباري ١٣/١٥٣.

٣ حاشية ابن عابدين ١/٧ ط٢.

## بنچینەی دەروونی پێنجەم: پیاهەڵدان و دەستخۆشی لێکردن:

گومانی تێدا نیە کە پیاهەڵدانی منداڵ شوێنەواری کارای هەیە لەسەر دەروونی منداڵەکە، کە هەست و نەستی دەجولێنێت، و منداڵەکە بەخێرایی رووەو راستکردنەوەی رەفتار و خوورەوشت و کردەوەکانی دەچێت، و دەروونی ئاسودە دەبێت، و بەو دەستخۆشی لێکردنە دەگەشێتەوە، و بەردەوام دەبێت لەسەر چالاکی و بەدوایدا دەچێت، پێغەمبەری خواش ﷺ کە زانای دەروونی راستەقینەیە، لەبارەی ئەو ژێ هەستیارەی دەروونی منداڵەوە ئاگادارمان دەکات کە بەهۆیەوە دەروونی بەرەو وەلامدانەوەو جێبەجێکردن دەجولێت:

(بخاري) لە (ابن عمر[1])ەوە هێناویەتی کە وتوویەتی: خەڵکی لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ خەویان بدیبا بۆ پێغەمبەریان دەگێڕایەوە، منیش ئاواتەخواز بووم کە خەوێك ببینم تا بۆی بگێڕمەوە، لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ کوڕێکی لاو بووم لە مزگەوتدا دەخەوتم، لە خەومدا بینیم کە دوو فریشتە هەڵیانگرتم و بردمیان بۆ لای ئاگرێك، کە وەك بیر پێچرابووەوەو لول درابوو و دوو قۆچی هەبوو، و خەڵکانێکی تێدابوو کە پێشتر دەمناسین، منیش دەموت: (اعوذ بالله من النار) پەنا بەخوا دەگرم لە ئاگر، دەڵێت: بەفریشتەیەکی دیکە گەیشتین پێی وتم: (لَم تُرَع) بۆ پەشۆکاوی، منیش ئەو خەوەم بۆ (حفصە) گێڕایەوە، ئەویش بۆ پێغەمبەری ﷺ باس کرد ئەویش فەرمووی: ((**نعم الرجل عبدالله، لو كان يصلي الليل**)).واتە: ((عبدالله) چاکترین پیاوە گەر شەونوێژ بکات).

ئەوەبوو پاش ئەوە تەنها بەشێکی کەم لە شەو دەنووست.

ئەمەش شوێنەواری پیاهەڵدانەکەی پێغەمبەری خوایە ﷺ (**نعم الرجل عبدالله**) کە لەبارەی کارێکەوە بەئاگای هێنایەوە کەلێی بێئاگابوو، بەشێوازێکی جوانی دڵرفێن و خۆشویستراو لە دەروندا (**لو كان يصلي الليل**). ئا بەو شێوەیە پیاهەڵدان و باسکردن بەچاکەو دەستخۆشی کردن لە شوێنی گونجاوی خۆیدا و کاتی شیاودا و بە شێوەیەکی میانڕەوانەو بەبێ دووروویی و گەورەکردن هەموو کاتێ ئاکامی دەبێت و بەرهەمدار دەبێت.

---

[1] (عبدالله کوری عمر) ﵄ لە ساڵی دووەم یان سێیەمی پێغەمبەرایەتی لەدایك بووە، لەگەڵ باوکیدا بەر لە باڵغ بوون موسڵمان بوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە (أحد) مۆڵەتی بەشداریکردنی پێنەدا، بەڵام لە (خندق) مۆڵەتی پێدا.

لەوەی دادێ ئەو قسەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ باس دەکەین کە بە کوڕێکی تازەپێگەیشتووی فەرموو کە فێری زمانی عەرەبی و سریانی بوو بۆ خزمەتکردنی پێغەمبەر ﷺ، ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ لە رۆژی خەندەقدا پێی فەرموو: ((**أما إنه نعم الغلام**)) بەراستی چاکترین کوڕە.

## بنچینەی دەروونی شەشەم: یاریکردن لەگەڵ منداڵ و خۆ بچووککردنەوە بۆی:

خۆ بچووککردنەوەو یاریکردن لەگەڵ منداڵ دەروونی گەشە پێدەکات و یارمەتی دەدات لە سەر دەرخستنی ئەوەی لە ناخیدا شاراوەتەوە، جا لەوەی دادێ ئەوە دەخەینە روو کە پێغەمبەری خوا ﷺ یاری و گەمەی لەگەڵ (حسین) و (حسن) دەکرد، و لەسەر پشتی دەیهێنان و دەیبردن، هەروەها یاریکردنی لەگەڵ مندالانی (عباس)دا، هەموو ئەوانە بەڵگەن لەسەر گرنگی و بایەخی یاریکردنی دایك و باوك لەگەڵ منداڵەکەیاندا.

هەر لەبەر زۆر گرنگی پێدانی پێغەمبەر ﷺ بە مندالان داوا لە دایکان و باوکان دەکات کە خۆیان بچووك بکەنەوەو خۆیان وەك منداڵ لێ بکەن بۆ منداڵەکانیان، و بانگەشەیەکی گشتی لەو بارەیەوە ئاراستەی هەموو دایکان و باوکان دەکات:

(ابن عساکر) لە (ابوسفیان)ەوە گێڕاویەتیەوە کە وتوویەتی: چوومە لای (معاویە)، دیتم لەسەر پشت راکشابوو، منداڵێکی کوڕ یان کچ لەسەر سنگی بوو یاری و قسەی خۆشی بۆ دەکرد، منیش پێم وت: ئەی ئەمیری باوەڕداران! ئەمە لای خۆت لابە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ((**من كان له صبي، فليتصاب له**)).واتە: (هەرکەسێك منداڵێکی هەبوو با خۆی وەك منداڵەکە لێ بکات و یاری لەگەڵدا بکات).

(بخاری)یش لە (صحیح)ەکەیدا بابی (من ترك صَبِيّة غيره حتى تلعب، أو قبلها، أو مازحها) لە (ام خالد کچی خالد کوڕی سعید)ەوە هێناویەتی کە وتوویەتی: لەگەڵ باوکمدا هاتمە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ کراسێکی زەردم لەبەردا بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (سَنَهْ، سَنَهْ)، (عبدالله) وتی: ئەو وشەیە بە زمانی حەبەشی بەمانای (چاك) دێت، (ام خالد) دەڵێت: چوم یاریم بە ئەنگوستیلەی پێغەمبەرایەتی دەکرد، باوکم قسەی پێوتم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((**دعها**)) وازی لێ بێنە.. پاشان فەرمووی: ((**أبلي وأخلقي، ثم أبلي وأخلقي، ثم أبلي وأخلقي**)) واتە: (جل کۆن بکە و بدڕێنە، جل کۆن بکە و بدڕێنە، جل کۆن بکە و بدڕێنە).

(ابن حجر) دەربارەی ئەو فەرموودەیە وتوویەتی: گاڵتەوگەپکردن بە قسە و کردار لەگەڵ کچی بچکۆلانەدا مەبەست لێی هاودەمیە، و ماچکردنیشی هەر لەوانە دادەنرێت.[١]

لە (ابوهریرە)ەوەﷺ کە وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ زمانی دەردەهێنا بۆ (حسن کوڕی علی) کاتێك (حسن) سورایی زمانی دەبینی پڕتاوی دەکرد بۆ لای ئەو.[٢]

ئەمەش نمونەیەکی نوێی گەمەکردنی پێغەمبەرەﷺ لەگەڵ (حسن) کە دەمی بۆ دەکردەوەو دەمی (حسن)ی دەخستە دەمیەوە:

(حاکم) لە (ابوهریرە)ەوەﷺ گێڕاویەتیەوە کە وتوویەتی: هەرگیز نەبووە (حسن) ببیـنم و چاوم پڕ ئەسرین نەبووبێت، ئەوەش لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خواﷺ ڕۆژێکیان هاتە دەرەوەو منی لە مزگەوت بینی و دەستی گرتم و لەگەڵیدا ڕۆشتم، هیچ قسەی لەگەڵ نەکردم هەتا گەیشتینە بازاڕی (بنی قینقاع)، لەوێ سوڕایەوەو تەماشای کرد و پاشان ڕۆیشت و منیش لەگەڵیدا بووم هەتا گەیشتینەوە مزگەوت، دانیشت و قاچ و پشتی کۆکردەوەو بە عەمامەکەی داپۆشی، و فەرمووی: ((**أين لُكَع؟؟ أدع لي لُكَع!!**)) ئەو منداڵە بچووکە لەکوێیە؟ منداڵە بچووکەکەم بۆ بانگ بکەن..

(حسن) بەراکردن هات و کەوتە کۆشیەوە و پاشان دەستی خستە نێو ریشیەوە، پاش ئەوە پێغەمبەرﷺ دەمی کردەوەو (حسن)یش دەمی خستە ناو دەمی، پاشان فەرمووی: ((**اللهم أحبه، فأحبه وأحب من يحبه**)) واتا: (خوایە! من خۆشم دەوێت، تۆش خۆشت بوێت و ئەو کەسەشت خۆش بوێ کە خۆشی دەوێت).

(ترمذی)و (ابوداود)یش گێڕاویانەوە لە (انس)ەوە، کە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((**يا ذا الأذنين**)) ئەی خاوەن دووگوێ، مەبەستی ئەوەیە کە یاری و گاڵتەی لەگەڵدا دەکرد. (رزین) ئەوەی بۆ زیادکردووە: دەیفەرموو پێم: ((**يا ذا الأذنين**)) ئەی خاوەن دووگوێ، گاڵتەی لەگەڵ دەکردم.[٣]

هەر لە (انس)ەوەﷺ کە وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ یاری لەگەڵ (زینب کچی ام سلمە) دەکرد و چەندین جار دەیفەرموو: ((**يا زوينب، يا زوينب**)) واتە: (زەینەبۆکە، زەینەبۆکە).[٤]

---

١ فتح الباري ١٣/٣١.

٢ رواه ابن حبان في صحيحه واسناده حسن. أنظر سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم ٧٠.

٣ اسناده صعيف/ أنظر جامع الأصول (١١/٥٥-٥٦)ت.الأرناؤوط.

٤ رواه الضياء بسند صحيح. أنظر صحيح الجامع رقم ٥٠٢٥.

لە(ابن مسعود)یشەوەﷺ کە وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ نوێژی دەکرد، هەر کاتێ کڕنووشی ببردایە (حسن) و (حسین) دەچوونە سەر پشتی، گەر بیانوویستایە ڕێگریان لێ بکەن، ئاماژەی دەکرد کە وازیان لێ بهێنن، کاتێ نوێژ تەواو دەبوو دەیخستنە کۆشی و دەیفەرموو: ((من أحبني فليحب هذين)) واتە: ئەو کەسەی منی خۆش دەوێت، با ئەم دوانەشی خۆش بوێت.[١]

## بنچینەی دەروونی حەوتەم: پەرەپێدانی متمانە بەخۆبوونی منداڵ:

پێغەمبەری خواﷺ بۆ دروستکردنی متمانە بەخۆبوونی منداڵ چەند ڕێگایەکی دەگرتە بەر، ئەمەش بۆ ئەوەی تا منداڵێکی بەهێزی لێ دەربچێت، ئەوەش بەم ڕێگایانە:

١- بەهێزکردنی ویست(ارادە)ی منداڵ: ئەمەش بە ڕاهێنانی لەسەر ئەم دوو کارە:

أ/ ڕاهێنانی لەسەر نهێنی پارێزی: هەروەك (انس) و (عبدالله کوڕی جعفر) کردیان، چونکە کاتێك منداڵ فێری شاردنەوەی نهێنیەکان و نەدرکاندنیان دەبێت، بەوە ویستی(ارادە) گەشە دەکات و بەهێز دەبێت، بەمەش متمانەی بەخۆی زیاد دەکات.

ب/ ڕاهێنانی لەسەر ڕۆژووگرتن: کاتێك بەرامبەر برسێتی و تینوویەتی خۆی دەگرێت لە بە ڕۆژووبووندا، منداڵ هەست بە چێژی سەرکەوتن بەسەر دەروونی خۆیدا دەکات و بەوەش ویستی بەهێز دەبێت و توانای ڕووبەڕووبوونەوەی ژیانی دەبێت و متمانەی بەخۆی زیاتر دەبێت.

٢- پەرەپێدانی متمانەی کۆمەڵایەتی: کاتێك منداڵ پێویستیەکانی ناوماڵ و فەرمانەکانی دایك و باوکی جێبەجێ دەکات، و لە کۆڕ و دانیشتنی گەورەکاندا دادەنیشێت و لەگەڵ منداڵاندا کۆدەبێتەوە بەوە متمانەی کۆمەڵایەتی بەخۆی گەشە دەکات.

٣- پەرەپێدانی متمانەی زانستی: ئەمەش بە فێربونی قورئان و سوننەتی پێغەمبەرﷺ و ژیانی مەزنیەوە دێتە کایەوە، بەوەش منداڵ گەورە دەبێت و سەیر دەکات زانستێکی فراوانی هەڵگرتووە لە منداڵیدا فێری بووە، هەر بەو هۆیەشەوە متمانەی زانستی بەخۆی پەرە دەستێنێت، چونکە ئەو چەند ڕاستیەکی زانستی دوور لە ئەفسانەو شتی پڕوپوچ هەڵدەگرێ.

---

١ رواه ابويعلى بسند حسن، أنظر سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم٣١٢.

٤- پەرەپێدانی متمانەی ئابووری و بازرگانی: ئەمەش بە راهێنانی منداڵ لەسەر کڕین و فرۆشتن و گەڕان لەگەڵ دایك و باوکیدا بە بازاڕدا و جێبەجێکردنی پێداویستیەکانی دایك و باوکی.

(مالك) لە (سلیمان کوڕی یسار)ەوە هێناویەتی کە وتوویەتی: ئالیکی گوێدرێژەکەی (سعید کوڕی ابووقاص) تەواو بووبوو، بە بەندەکەی وت: برۆ لە گەنمی ماڵەوە ببە و جۆی پێ بکڕە و هەر هێندەی خۆی وەرگرە.

پێغەمبەری خواشﷺ (عبدالله کوڕی جعفر) دەبینێت کە منداڵەو شتی منداڵانە دەفرۆشێت، بۆی پاڕایەوە کە خوای گەورە پیت و فەڕ بخاتە کارەکەی.. ئا بەو جۆرە سووربوونی پێغەمبەرﷺ بەدی دەکەین لەسەر پەرەپێدانی متمانەبەخۆبوونی منداڵ.

## بنچینەی دەروونی هەشتەم: جوان بانگکردنی منداڵ:

دەبینین پێغەمبەری خواﷺ لەو وتارانەیدا کە ئاڕاستەی منداڵانی کردبێت هەمەچەشنی بەکارهێناوە، ئەمەش بە مەبەستی سەرنج راکێشانی منداڵەکەو سازکردنی کەسێکی لەبار کە ئامادەبێت بۆ گوێگرتن و وەرگرتنی قسە.

ئەوەتانێ جارێ منداڵ بەناوی خۆیەوە بانگ دەکات و گاڵتەی لەگەڵ دەکات و دەفەرموێت: ((**يا أبا عمير، ما فعل النغير**))، جاری دیکەش بە منداڵیتیەکەی بانگی دەکات و دەفەرموێت: ((**يا غلام! إني أعلمك كلمات**)) رۆڵە! من چەند قسەیەکت فێر دەکەم، ((**يا غلام! سم الله تعالى وكل بيمينك**)) رۆڵە ناوی خوا بێنە و بەدەستی راستت نان بخۆ، زۆربەی جاریش بە سۆزەوە بانگی دەکرد و دەیفەرموو: ((**يا بني! إذا دخلت على أهلك فسلم**)) کوڕەکەم! کە دەچیتەوە ماڵەوە سلاویان لێ بکە. ((**يا بني! إذا قدرت أن تصبح وتمسي وليس في قلبك غش لأحد فافعل**)) کوڕەکەم، گەر توانیت شەووڕۆژ بکەیتەوەو دڵت هیچ گزی و فێڵێکی بەرامبەر خەڵك تێدا نەبێت ئەوا بکە.

هاوەڵانیش ﷺ ئەو منداڵە موسڵمانانەی کە باوکیشیان موسڵمان بووە، لە بانگکردنیدا پێیان دەوتن: ((يا ابن أخي)) ئەی برازاکەم، هەروەك (عمر) بە (ابن عباس)ی وتم: ((قل يا ابن أخي! لا تحقر نفسك)) ئەی برازاکەم! بیڵێ و خۆت بە کەم مەزانە، بەڵام منداڵی موسڵمان کە باوك و دایکی موسڵمان نەبن لە بانگکردندا پێیان دەوتن: ((يا بني)) کوڕم.

هەروەك (بخاری) لە كتێبی (الادب المفرد)دا گێڕاویەتیەوە لە (صعب كوڕی حكم)ەوە، ئەویش لە باوكی و لە باپیریەوە، كە وتوویەتی: هاتم بۆ لای (عمر كوڕی خطاب)ﷺ، پێی وتم: ئەی برازاكەم! پاشان پرسیاری لێكردم و منیش باسی ڕەچەڵەكی خۆمم بۆی كرد، تێگەیشت كە باوكم موسڵمان نەبووە، جا پاش ئەوە دەیوت: كوڕەكەم.. كوڕەكەم.[١]

(مسلم)یش لە (صحیح)ەكەیدا لە (اسحاق كوڕی مالك)ەوە گێڕاویەتیەوە، وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ پێی فەرمووم: ((یا بني!)) كوڕەكەم.

هەروەها لە (مغیرە كوڕی شعبە)ەوە گێڕاوەتەوە، كە وتوویەتی: هیچ كەس هێندەی من لەبارەی دەجاڵەوە پرسیاری لە پێغەمبەری خواﷺ نەكردووە، پێی فەرمووم: ((أي بني!... الحدیث)) كوڕەكەم!...فەرمودەكە.

ئیمام (نووی): وتوویەتی: لەم دوو فەرموودەیەوە ئەوە دەردەكەوێت كە دروستە مرۆڤ جگە لە كوڕی خۆی بە منداڵی بچووكی دیكە بڵێت: (كوڕم) و (ئەی كوڕم)، بۆ بچووككردنەوەی، و (ئەی ڕۆڵە) كە لە واتادا بۆ سۆز و نەرمی نواندنە، و ئەوەش دەگەیەنێت كە تۆ لە جێگەی كوڕمدایت لە بەزەییدا.. بەو كەسەش كە هاوتەمەنی قسەكەر بێت دەوترێت (براكەم)، لەبەر ئەو واتایەی كە باسمان كرد، خۆ گەر مەبەستی بەوە نەرمی و سۆز نواندن بێت هەروەك پێغەمبەری خواﷺ دەیكرد، ئەوە زۆر باشە و كارێكی چاكە.[٢]

ئیمام (احمد)یش لە (مسند)ەكەیدا گێڕاویەتیەوە[٣] لە (عبداللە كوڕی عباس)ەوە مكە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:

((أبن أخي! إن هذا الیوم من ملك فیه سمعه وبصره ولسانه، غفر له)). واتە: (برازای من! لەم ڕۆژەدا هەركەسێ گوێ و زمان و چاوی لەگوناه بپارێزێت، خوا لێی خۆش دەبێت. واتە: ڕۆژی عەرەفە).[٤]

لە گێڕانەوەی (بیهقی)یشدا لە (شعب الایمان) هاتووە بە واژەی: ((یا بن أخي! إن هذا یوم...الحدیث)).واتە: (ئەی كوڕی برام! لەم ڕۆژەدا......فەرموودەكە).[٥]

---

١ الأدب المفرد، باب قول الرجل یا بني لمن أبوه لم یدرك الإسلام، ورواه ابن ابي شیبة في مصنفه (٨٢/٩) باب: في الرجل یقول لإبن غیره: یا بني!

٢ شرح صحیح مسلم للإمام النووي، باب جواز قوله لغیر ابنه یا بني، واستحبابه للملاطفة.

٣ المسند ٣٢٩/١.

٤ الكنز ٦٨/٥.

٥ المصدر السابق.

لە گێڕانەوەی (طیالیسی)یشدا: ((مە یا **غلام!...**)) واتە: ئاگاداربە رۆڵە....[١]

هەروەها (احمد) ئەو فەرموودەی (ابن عباس)ی گێڕاوەتەوە[٢] کە وتوویەتی: رۆژێکیان لەپشت پێغەمبەرەوەﷺ سواری ولاخ بووم، فەرمووی: ((**یا غلام! أو یا غلیم! ألا أعلمك کلمات ینفعك الله بهن؟**)) واتە: (رۆڵە، یان رۆڵەکەم! ئایا چەند قسەیەکت فێرنەکەم کە خوای گەورە بەهۆیانەوە سوودت پێ بگەیەنێت؟)

وتم: بەڵێ فێرم بکە، فەرمووی: ((**أحفظ الله یحفظك.. الحدیث**)) واتە: (سنوری خوا بپارێزە خوا دەتپارێزێت..فەرموودەکە).

ئا لێرەدا بانگکردن بە (یا غلیم= رۆڵەکەم) بەدی دەکەیت.

لەوەی خستمانە روو جوانی بانگکردنی منداڵ بەدی دەکەین، جارێ بەناوی تەواوی خۆی و جارێکی دیکە بە (ئەی رۆڵە) و جاری سێیەمیش بە (برازاکەم) و جاری چوارەمیش بە (کورەکەم)، جا هەموو ئەوانە دەروونی منداڵ بەئاگا دێنێتەوە بۆ شت وەرگرتن، وای لێدەکات هەست بەوە بکات ئەو کەسەی بانگی دەکات خۆشی دەوێت.

لە جوان بانگکردنی منداڵ ئەوەیە کە بە نازناوەکەیەوە بانگی بکرێ، چونکە پێغەمبەری خواﷺ گەمەو گاڵتەی لەگەڵ منداڵ دەکرد و پێی دەفەرموو: ((**یا أبا عمیر! ما فعل النغیر**)) ئەی (ابوعمیر) چۆلەکەکە چی کرد؟

ئەوەیش کە (ابودرداء) لە (انس)ەوەﷺ دەگێڕێتەوە کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ نازناوی (پاقلە)ی لێنام، لەبەر ئەوەی من پاقلەم لێدەکردەوە، و بە (ابو حمزە) بانگ دەکرا، (حمزە) واتا: پاقلە.[٣]

جا هەمەچەشنەیی لە بانگ کردنی منداڵدا، وا لە منداڵ دەکات کە هەست بە بایەخ پێدانی گەورە بکات، کە ئەوەش دەبێتە مایەی بەدەمەوەچوون و جێبەجێکردنی ئەو فەرمانانەی کە بەهەموو شادی و دڵخۆشیەکەوە ئاراستەی دەکرێ.

هەروەها کارەکەری منداڵ چ کوڕ بێ چ کچ، بە جوانی بانگ بکرێن:

---

١ المصدر السابق.

٢ المسند ٣/٣٠٧.

٣ أدب الكاتب لأبن قتيبة، باب: أصول أسماء الناس.

لە (ابوهریرە)وەﷺ، لە پێغەمبەری خواوەﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((**لا يَقُلْ أحدُكم، أَطْعِمْ ربَّكَ، وأسقِ ربَّك، وليقُل: سيدي؛ مولاي، ولا يقل أحدكم: عبدي؛ أمتي، وليقل: فتاي؛ و فتاتي؛ و غلامي**)).[١] واتە: (هیچ کەسێ لە ئێوە نەڵێ: خواردن بدە بە خاوەنەکەت، ئاو بدە خاوەنەکەت، با بڵێ: گەورەم، سەردارم، وە با هیچ کەس لەئێوە نەڵێ: بەندەکەم (چ پیاو بێ چ ئافرەت)، با بڵێ: کوڕەکەم (کچەکەم) رۆڵەکەم).

کەواتە پەروەردەی چ کۆمەڵگەیەك هەیە بەو سۆز و بەزەیی و نەرم و نیانی و زمان شیرینییە بە خزمەتکارەکەی بڵێ: کوڕەکەم، کچەکەم، رۆڵەکەم، و لەگەڵ منداڵەکانی خۆی یەکسانیان بکات لە سۆزداری و بەنەرمی و زمان شیرینی بانگی یان بکات. ئەمە تەنها لە بەرنامەی پێغەمبەرداﷺ هەیە.

لە گێڕانەوەیەکی تردا پاساوێکی ناسك و جوانی پێغەمبەرﷺ هەیە لە ناساندنی سەرداران کە ئەوانە بەندەی خوان. کە دەفەرموێ: ((**لا يقولنَّ أحدكم: عبدي وأمتي، كلكم عبيد الله، وكلُّ نسائكم إماء الله، ولكن ليقل: غلامي، وجاريتي، وفتاي، وفتاتي**)). واتە: (هیچ کەس لە ئێوە نەڵێ: بەندەکەم (پیاو یان ئافرەت)، هەمووتان بەندەی خوان، هەموو ئافرەتەکانیشتان بەندەی خوان، بەڵام با بڵێ: رۆڵەکەم، کچەکەم، کوڕەکەم).

بەراستی پەروەردەی قورئانیە کە لە دڵ و دەروونی بڕواداردا ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾[٢] دەچەسپێنێ.

## بنچینەی دەروونی نۆیەم: بەدەمەوەچوونی ئارەزووەکانی منداڵ و رازیکردنی:

زۆر جار -نەك هەموو جار- بەدەمەوەچوونی منداڵ و رازیکردنی هەتا رازی بێت لەشێوازە چاکەکانە، جا منداڵەکە هەرچەند بچووکتر بێ، دەبێت رازی بکرێت و پێویست دەکات کە داواکاریەکانی جێبەجێ بکرێت، ئەمەش لەبەر هەستکردنی بەو پێداویستیەیە کە داوای دەکات، خۆ گەر بەدەمیەوە چوون ئەوا دەروونی دەکرێتەوەو دڵخۆش دەبێت و بەخۆشی و چوستیەوە دەڕوات، بەڵام گەر داواکەی بەجێنەهێنرا ئەوا قین و بوغز و کینە و لاساری زیاتر دەبێت، و بەجۆرێك هەڵس و کەوت دەکات کە حەزت لێی نەبێت و پێی رازی نەبێت.

---

١ رواه البخاري ومسلم وأبوداود واحمد.

٢ بەڕێزترتان لای خوا ئەو کەسەیە کە لە خواترس تر و پارێزکارترە.

پێغەمبەری خوا ﷺ بریار لەسەر رێسایەکی دەروونی زۆر مەزن دەدات بۆ چارەسەرکردنی زۆر لە گیروگرفتە دەروونیەکانی منداڵ، و هاوەڵانیش بەدەم ئەم رێسایەوە چوون و پەلەیان کردووە لە بەجێهێنانیدا.

(ابن عساكر) گێڕاوەیەتیەوە[١] لە (واثلة کوڕی الاسقع)ەوە رضي الله عنه -هەروەك لە (جامع الكبير)دا هاتووە- کە پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بۆ لای (عثمان کوڕی مظعون) کە منداڵێکی بچووکی خۆی لەگەڵ بوو ماچی دەکرد، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ئەمە کوڕتە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: ئەی (عثمان)! خۆشت دەوێ؟ وتی: ئەرێوەڵا ئەی پێغەمبەری خوا! خۆشم دەوێت، فەرمووی: خۆشەویستیەکەت بۆی زیاد بکەم؟ وتی: بەڵێ: دایك و باوکم بە فیدات بێ، فەرمووی: **((إنه من تَرضّى صبياً من نسله حتى يرضى، ترضاه الله يوم القيامة حتى يرضى))**.واتە: (هەرکەسێك منداڵێکی بچکۆلانەی وەچەی خۆی رازی بکات تا رازی دەبێت، خواش لە رۆژی قیامەتدا رازی دەکات هەتا رازی دەبێت).

لەم رووەوە گفتوگۆیەکیش لەنێوان (معاویە) و (أحنف کوڕی قیس)دا دروست بوو، (أحنف) بایەخ و گرنگی رازی کردنی منداڵ و بەجێهێنانی داواکانی بۆ (معاویە) خستبووە روو:

(یزید کوڕی معاویە) وتوویەتی: باوکم ناردی بەشوێن (أحنف کوڕی قیس)دا، کاتێ گەیشتە لای پێی وت: ئەی (ابو بحر)! چی دەڵێیت دەربارەی منداڵ؟ وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران! بەرهەمی دڵەکانمان و کۆڵەکەی پشتمانن، ئێمە زەوییەکی ملکەچین و ئاسمانێکی پڕ سێبەرین بۆیان و بەهۆی ئەوانەوە دەگەینە هەموو پایەیەکی بەرز، گەر داوایان کرد بیاندەرێ، گەر توڕە بوون رازیان بکە، ئەوانیش خۆشەویستی خۆیانت دەدەنێ، و بەپێی توانای خۆیان خۆشیان دەوێیت، و مەبە بە بارێکی گران و قورس بەسەریانەوە کە بێزار بن لە ژیانت و ئاواتی مردنت بخوازن و حەز بە نزیك بوونەوەت نەکەن.

(معاویە) پێی وت: بۆ خوا ئەی (أحنف)! لەکاتێکدا تۆ هاتیتە لام کە من لە (یزید) زۆر توڕەو دڵپڕ رق و کینە بووم، کاتێك (أحنف) چووە دەرەوە (یزید)ی رازی کرد و دووسەد هەزار درهەمی بۆ نارد، لەگەڵ دووسەد کراس، و (یزید)یش سەد هەزار درهەم و سەد کراسی لێ نارد بۆ (أحنف) و بە نیوەیی لەگەڵی بەشکرد.[٢]

---

١ عن (البيان والتعريف في اسباب ورود الحديث الشريف) لأبن حمزة ١٣٥/٢.

٢ إحياء علوم الدين للإمام الغزالي ٢١٨/٢.

(عدی کوڕی حاتم)یش‌ﷺ وتوویەتی: هاتمە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ کە لە مزگەوت دانیشتبوو، خەڵکەکە وتیان: ئەوە (عدی کوڕی حاتم)ە، منیش بەبێ (أمان) و نووسراوێك هاتبووم، کاتێك بەرەو لای بردرام دەستی گرتم - لەکاتێکدا کە پێشتر فەرمووبووی: ((**إني لأرجوا أن يجعل الله يده في يدي**)) واتە: (ئومێدەوارم خوای گەورە دەستی بخاتە ناو دەستم- وتی: خۆی بە من هەستاندەوە، ئافرەتێك گەیشت پێی کە منداڵێکی لەگەڵدا بوو، وتیان: پێویستیەکمان بەتۆ هەیە، جا چوو لەگەڵیاندا هەتا پێویستیەکەی بۆ بەجێهێنان... فەرموودەکە).[١]

## بنچینەی دەروونی دەیەم: شوێنەواری دووبارەکردنەوە لەسەر دەروونی منداڵ:

منداڵیش وەك هەر بوونەوەرێکی دیکە شتی لەیاد دەچێت و بێئاگا دەبێت، خوای گەورەش لە هەموو بوونەوەرە زیندووەکان بەو منداڵێتیە درێژە جودای کردۆتەوە، کە قۆناغێکی بێ ئەرکباری(تكليف)ە، بەڵکو قۆناغی خۆسازدانە بۆ ئەرکباری، و پێنووسی فریشتەکانیشی لەسەر هەڵگیراوە: ((**رفع القلم عن الثلاث: .... وعن الصبي حتى يحلم**)). واتە: (قەڵەم لەسەر سێ‌کەس هەڵگیراوە: .... وە لەسەر منداڵ تا باڵغ دەبێت).

خۆ گەر ئەوە تێگەیشتین ئەوا لامان ئاسان دەبێت کە بڕوا بە بنەمای دووبارەکردنەوە بهێنین، واتە: دووبارەکردنەوەی کاروفرمان زیاد لەجارێك هەتا کاریگەری هەبێت لەسەر دەروونی منداڵ و گوێڕایەڵی فەرمانەکە بێت، و بەدەم داواکەوە بێت.

بەڵگەی بنەمای دووبارەکردنەوەش لەو فەرموودەیەدایە: ((**مروا أولادكم بالصلاة، وهم أبناءُ سبع سنين، وأضربوهم وهم أبناءَ عشر سنين**))[٢] واتە: (منداڵەکانتان فێری نوێژ بکەن کاتێ تەمەنیان حەوت ساڵانە، و لەسەر نوێژنەکردن لێیان بدەن لە دەساڵیدا).

---

١ رواه الترمذي وقال حديث حسن غريب.

٢ رواه ابوداود وغيره.

پێغەمبەری خوا ﷺ سێ ساڵی لەسەریەکی داناوە بۆ چەسپاندنی کارێکی گرنگ لە ئیسلامدا کە ئەویش فەرمانی نوێژکردنە، گرنگی و بایەخی نوێژیش لای هەموان ئاشکرایەو لەبەر ئەوەشە ئەم وتارە قورئانیە هاتووە: ﴿ وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلَوٰةِ وَاصْطَبِرْ عَلَيْهَا ﴾طـه١٣٢. واتە: (فەرمان بدە بەسەر هەموو تاکەکانی خێزانتدا تا نوێژەکانیان بەچاکی ئەنجام بدەن، و بەردەوام و خۆڕاگربە لەسەریی).

بۆیە دەبێت لەو ساڵانەدا ئارام لەسەر منداڵ بگیرێت و داوای نوێژکردنی لێ دووبارە بکرێتەوە، وە بە تێڕوانینێکی ژمێریاری دەبینین کە لە میانەی ئەو سێ ساڵەدا و لەهەموو نوێژێکدا کە باوك و دایك فەرمان بە منداڵەکەیان بکەن کە نوێژ بکات، سەرەنجام ژمارەیەکی زۆر گەورەمان لەدووبارەکردنەوەی فەرمانەکە دەبێت کە: (٥ × ٣٦٥) × ٣ = ٥٤٧٥ جار.[1]

ئەم ژمارەیەش ئەگەر بەڵگە بێت لەسەر شتێك، ئەوا بەڵگەیە لەسەر گرنگی و بایەخی دووبارەکردنەوە، و دەروونی منداڵیش وەهایە کە لە یەکەمجار و دووەمجار و سێیەمجار بەدەم وەڵامدانەوەی فەرمانەکەوە نەیەت، بۆیە دەبێت لێی دووبارە بکرێتەوە بەبێ بێزاربوون و نائومێدی.

ئەوەتانێ هاوەڵی پایەبەرز (عبدالله کوڕی مسعود)ﷺ چاك لە بنەمای دووبارەکردنەوە لەگەڵ منداڵاندا تێگەیشتووە، و لە ڕێنماییەکیدا بۆ باوکان بەرامبەر منداڵەکانیان وتوویەتی: رایان بهێنن لەسەر چاکە، چونکە چاکە بە راهاتنە.

بۆ ئەوەی منداڵیش رابێت، پێویست دەکات کە چەند جارێك تێبینی بۆ دووبارە بکرێتەوە، چونکە منداڵ هەڵە دەکات، لەبەر ئەوەش بوو کە (انس)ﷺ سوننەتی پێغەمبەری خوای ﷺ جێبەجێ دەکرد و بەلای منداڵدا تێپەڕی بکردایە سڵاوی لێ دەکردن و دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ وەهای دەکرد.

جا کاتێك منداڵ دەبینێت و دەبیستێت کە گەورەکان چەند جارێك سڵاوی لێ دەکەن، فێری سڵاوکردن دەبێت و هێندەش نابات دەبێت بە خوونەریتی.

---

[1] بنەمای دووبارەکردنەوەم لەگەڵ کچەکانم پیادە کرد، ئەوەبوو زۆر سودبەخش بوو، بەتایبەتی لەنێوان تەمەنی حەوت و هەشت ساڵیدا کە یەکەمجار منداڵ لەسەر نوێژ رادەهێنرێ، منداڵ وا دەزانێ نوێژ بەدرێژایی تەمەن یەکجارە، پاشان وا دەزانێ لە رۆژێکدا یەکجارە، ئینجا وادەزانێ تەنها لە بەیانیان و ئێواران ئەنجام دەدرێ، هەتا دەگاتە باڵغبوون و تێدەگات و لە رۆژێکدا لەسەر پێنج نوێژەکە رادێت، سەرکەوتن و پشتیوانیش لە خواوەیە.

## بنچینەی دەروونی یازدەهەم: پلەبەندی هەنگاوەکان لەگەڵ منداڵ:

لە فەرموودەی پێشووەوە: ((مروا أولادكم بالصلاة، وهم أبناءُ سبع سنين، وأضـــربوهم وهم أبناءُ عشر سنين))[١] واتە: (منالەکانتان فێری نوێژ بکەن کاتێ تەمەنیان حەوت ساڵانە، لەسەر نوێژنەکردن لێیان بدەن لە دەساڵیدا).

لە بنەمایەکی مەزنی کاریگەر لە سەر دەروونی منداڵ سوودمەند دەبین کە ئەویش پلەبەندیە(التدرج) و ئەنجام نەدانی کارە بە یەکجارەکی، هەموو قۆناغێکیش کات و ساتی خۆی هەیە، نوێژیش کە پایەکی ئایینە و کۆڵەگەیەتی، بەسێ قۆناغدا لەگەڵ منداڵدا تێدەپەڕێت:

١- قۆناغی یەکەم: ئەم قۆناغەش لە ساتی ڕۆشتن و هۆشیاریەوەیە تا تەمەنی حەوت ساڵی، کە ئەویش قۆناغی سەیرکردنە، و تێیدا منداڵ دەبینێت کە باوك و دایکی نوێژ دەکەن، بۆیە ئەویش خێرا دەست دەداتە نوێژکردن، گەر دایك و باوکی مەشقیان پێکرد و رایانهێنا لەسەری ئەوە زۆرزۆر چاکترە.

٢- قۆناغی دووەم: قۆناغی فەرمان پێکردنە: ئەمیش لە تەمەنی حەوت ساڵیەوە تا تەمەنی دەساڵی درێژ دەبێتەوە، تێیدا دایك و باوك فەرمان ئاراستەی منداڵەکەیان دەکەن و داوای نوێژکردنی لێدەکەن.

٣- قۆناغی سێیەم: قۆناغی لێدانە، ئەم قۆناغەش لە دە ساڵیەوە دەست پێدەکات تا تەمەنی دواتری، منداڵ لەسەر نوێژنەکردن لێی دەدرێت.

ئەم پلەبەندیە لە هەنگاوەکاندا کاریگەرییەکی گەورەی هەیە لەسەر دەروونی منداڵ و بەدەمەوەچوونی، چونکە ئەو هێشتا تەواو پێنەگەیشتووە، بۆیە دەبێت پلەبەندی لەگەڵدا بەکاربهێنرێت، و لە قۆناغێکەوە بەرەو قۆناغێکی دیکە ببرێت، جا نەخشەی هەر کێشە یا ئامانجێکیش داوای پەلەکردنی تێدا بکرێت ئەوا بە چەند قۆناغ و هەنگاوێ تێدەپەڕێت، کە دایك و باوك وێنەی دەکێشن، و هاریکاری دەکەن بۆ بەجێهێنانی.

---

١ رواه ابوداود وغيره.

## بنچینەی دوازدەهەم: تامەزرۆگەری و ترساندن بۆ منداڵ:

تامەزرۆگەری (ترغیب) و ترساندن لە شێوازە دەروونیە سەرکەوتووەکانە بۆ چاکسازی منداڵ، و شێوازێکی روون و دیارە لە پەروەردەی پێغەمبەردا ﷺ، و پێغەمبەری خوا ﷺ لەزۆر بارودۆخدا لەگەڵ منداڵاندا بەکاری هێناوە، لەپێش هەمووشیانەوە چاکبوونە بۆ دایك و باوك، جا تامەزرۆیی داوە بۆ چاکبوون لەگەڵیاندا و ترساندونی لە لاساری و دڵڕەنجاندنیان، ئەمەش بۆ ئەوەبووە تا منداڵ بە دەمیەوە بچێت و بکەوێتە ژێر کاریگەرییەوەو لە ناخیەوە خووڕەوشت و رەفتاری چاك بکات.

تامەزرۆگاری و ترساندن شێوازێکی قورئانی تاقانەیە، کە هەرجارێك باسی بەهەشتی کردبێت باسی دۆزەخیشی کردووەو بە پێچەوانەوەش، چونکە نەفسی مرۆڤ ئارەزومەندی حەزکردنە لە تامەزرۆگەری(ترغیب) کارکردن و بەروبومەکەی، وە لە ئاگادارکردنەوە لە ئەنجام دانی کاری هەڵەو ئەنجام و ئاکامەکەی دەترسێ، مانای ترساندنیش ئەوە نیە کە ئەو کەسە بەشێوەیەکی زۆر خراپ و نەفس نیگەرانکەر بترسێندرێ، بەڵکو ترسەکە بریتی بێت لە یادهێنانەوەی منداڵ بە پاداشت دانەوەی ئەنجامی کار و سزادانی کارنەکردنەکە.

# بەندی چوارەم

## شێوازی هاندان لەسەر چاکەکردن بەرامبەر دایك و باوك و ترساندن لە دڵڕەنجاندنیان

ڕاسپاردە قورئانیەکان.

دەستپێك.

یەکەم: بنەماکانی چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك تا لە ژیاندان.

بنەمای یەکەم: پاداشتی چاکە لە دنیا و قیامەتدا.

بنەمای دووەم: پێشخستنی چاکە لەگەڵ دایك و باوك بەسەر فەرزەکانی کیفایەدا.

١- پێشخستنی چاکە لەگەڵ دایك و باوك بەسەر جیهاد کردن لەرێی خوادا.

٢- پێشخستنی چاکە لەگەڵ دایك و باوك بەسەر هاوسەر و هاوڕێیاندا.

٣- پێشخستنی چاکە لەگەڵ دایك و باوك بەسەر حەجدا.

٤- پێشخستنی چاکە لەگەڵ دایك و باوك بەسەر سەردانی مەزاری پێغەمبەردا ﷺ.

٥- پێشخستنی چاکە لەگەڵ دایك و باوك بەسەر منداڵەکانیدا.

٦- پێشخستنی چاکە لەگەڵ دایك بەسەر نوێژە سوننەتەکاندا.

٧- پێشخستنی چاکە لەگەڵ دایك و باوك بەسەر کۆچکردن لە پێناوی خوای گەورەدا.

کۆتایی: نمونەیەك دەربارەی چاکەکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ دایك و باوکیدا.

بنەمای سێیەم: گوێڕایەڵی نەکردنی دایك و باوك لە فەرمانکردنیان بە گوناه و سەرپێچی لەگەڵ مانەوەی چاکبوون بۆیان.

بنەمای چوارەم: ڕەواترین کەس کە چاکڕەفتار بێت بەرامبەری دایك و باوکتە.

بنەمای پێنجەم: پێشخستنی چاکبوون بۆ دایك بەسەر باوکدا کاتێ دژی یەکتر بوون پاش هەوڵدان بۆ ڕێکخستنی نێوانیان.

بنەمای شەشەم: خۆت و سامانەکەت هی باوکتە.

بنەمای حەوتەم: ئازادکردنی دایك و باوك لە هەرماڵێك کە لەلایان بێت.

بنەمای هەشتەم: پاڕانەوە بۆ یەکدی لە نێوان دایك و باوك و منداڵەکانیاندا.

بنەمای نۆیەم: مەبە بەهۆی جنێودان بە دایك و باوکت.

بنەمای دەیەم: ناوی خۆت بە ڕەچەڵەکی باوکتەوە بناسێنە و شانازی پێوە بکە.

بنەمای یازدەهەم: حەجکردن لەبری هەرکامیان کە بەهۆی نالەباری تەندروستیەوە توانای ئەنجامدانی نەبوو.

بنەمای دوازدەهەم: بەجێهێنانی نەزرەکانیان.

بنەمای سیازدەهەم: دڵرەنجاندن( عقوق ) لە گوناهە گەورەکانەو سزاکەی لەدنیاو قیامەتدا.

دووەم: بنەماکانی چاکەکردن پاش مردنی یەکێکیان یان هەردووکیان:

بنەمای یەکەم: بەجێهێنانی پەیمان و ڕاسپاردەکانیان.

بنەمای دووەم: پاڕانەوەو داوای لێخۆشبوون کردن بۆیان.

بنەمای سێیەم: بەجێهێنانی سیلەی ڕەحمیان و چاکەکردن لەگەڵ هاوڕێکانیاندا.

بنەمای چوارەم: خێرکردن بۆیان.

بنەمای پێنجەم، حەجکردن بۆیان.

بنەمای شەشەم: پەلەکردن لە ئەنجامدانی کردەوەی چاك تا خۆشی بخەیتە دڵی باوکەوە بە مردوویی.

بنەمای حەوتەم: سەردانی گۆڕەکەیان.

بنەمای هەشتەم: بەجێهێنانی سوێندیان و نەبوون بەهۆی جنێودان پێیان.

بنەمای نۆیەم: ڕۆژووگرتن لەبری ئەوان.

## ڕاسپاردە قورئانیەکان

### ئایەتی یەکەم:

﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا ۚ إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ ٱلْكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا ﴿٢٣﴾ وَٱخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ ٱلذُّلِّ مِنَ ٱلرَّحْمَةِ وَقُل رَّبِّ ٱرْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِى صَغِيرًا ﴿٢٤﴾﴾الإسراء/٢٣-٢٤.

واتە: (پەروەردگاری تۆ بڕیاری داوە کە جگە لەو کەسی‌تر نەپەرستن، هەروەها چاکەکاریش بن لەگەڵ دایك و باوکتاندا، هەرکاتێ یەکێکیان یان هەردووکیان بەپیری کەوتنە لای تۆ (تەنانەت) ئۆفیان لەدەست مەکەو (هەرگیز) پێیاندا هەڵمەشاخێ، بەردەوامیش قسەو گفتوگۆت لەگەڵیاندا با چاك و جوان و بەجێ بێت.. باڵی میهرەبانی خۆتیان بەسەردا بکێشە و ملکەچ بە بۆیان، (نزا بکە و) بڵێ: پەروەردگارا! ڕەحمیان پێ‌بکە و میهرەبان بە بۆیان هەروەکو چۆن ئەوان منیان پەروەردەکردووە بە بچووکی و منداڵیی).

### ئایەتی دووەم:

﴿وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حُسْنًا ۖ وَإِن جَٰهَدَاكَ لِتُشْرِكَ بِى مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَآ ۚ إِلَىَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾العنكبوت/٨. واتە: (ئێمە ئامۆژگاری ئادەمیزادمان کردووە بە چاك ڕەفتاریی لەگەڵ دایك و باوکیدا، خۆ ئەگەر زۆریان لێکردیت تا هاوەڵ و هاوبەشم بۆ بڕیار بدەیت، بێ‌ئەوەی زانستی و زانیاری (بیروباوەڕی لەو جۆرەت بۆ بسەلمێنن) ملکەچیان مەبەو بەگوێیان مەکە، دڵنیابن کە گەڕانەوەتان بۆ لای منە، ئەو کاتە ئاگادارتان دەکەمەوە لەو کردەوانەی کە ئەنجامتان داوە).

### ئایەتی سێیەم:

﴿وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَٰلُهُۥ فِى عَامَيْنِ أَنِ ٱشْكُرْ لِى وَلِوَٰلِدَيْكَ إِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٤﴾ وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشْرِكَ بِى مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا ۖ وَصَاحِبْهُمَا فِى ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًا ۖ وَٱتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ

إِلَيَّ ثُمَّ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٥﴾ لقمان/١٤-١٥.واتە:

(ئێمە ئامۆژگاری ئادەمیزادمان کردووە بە چاك رەفتاریی لەگەڵ دایك و باوکیدا، دایکی بە ئێش و ئازار و لاوازی و بێتاقەتیەکی زۆرەوە (بەپێستی سکی نۆ مانگ هەڵیگرتووە)، دوای دوو ساڵ لە شیری بڕیوەتەوە، (کەواتە) ئەی ئینسان سوپاسگوزاری منیش و دایك و باوکیشت بە، (وە دڵنیا بن کە) گەڕانەوەتان بۆ لای منە.. ئەگەر دایك و باوکت کۆششیان لەگەڵتا کرد، تا بەبێ هیچ (بەڵگە)و زانیارییەك هاوەڵ بۆ من بڕیار بدەیت، فەرمانبەرداریان مەبەو بەقسەیان مەکە، بەڵام هەر لە دنیادا هاورێ و هاوەڵ و خزمەتگوزارێکی چاك بە بۆیان (لەهەموو بارودۆخێکدا) هەر شوێنی ئەوانە بکەوە کە رێبازیان بۆ لای من گرتۆتە بەر، لەوەودوا گەڕانەوەتان بۆ لای منە، ئەوسا هەواڵی هەموو کارو کردەوەکانتان دەدەمێ).

## دەستپێك:

پەیوەندی ئەم بەندە بە پەروەردەکردنی منداڵەوە، گرنگی و بایەخەکەی لەوەدا دەردەکەوێت کە پەیوەندی راستەوخۆی هەیە بە هەموو مرۆڤێکەوە، نێر بێت یا مێ، ئەمەش لەبەر ئەوەی لە فەرموودە پیرۆزەکاندا هاتووە دەیخاتە روو کە چاکەکردنی دایك و باوك کاریگەری گەورەی هەیە لەسەر چاکەی منداڵەکانیان، وە گەر ویستمان کە منداڵەکانمان بەرامبەرمان چاك بن، ئەوا ئەوەمان لێ دەخوازێ -ئیدی رەبەن بین یان ژنمان هێنابێ- کە پەلە بکەین لە چاکەکردن بەرامبەر دایك و باوکمان، هەروەك سەروەرمان پێغەمبەری خواﷺ بەوە ئامۆژگاری کردووین:

(حاکم)[١] لە(ابوهریرە)وەﷺ گێڕاویەتیەوە لە پێغەمبەری خواﷺ کە فەرموویەتی: ((**عفّوا عن نساء الناس تعفّ نسائكم، وبرّوا آباءكم تبركم أبناؤكم، ومن أتاه أخوه متنصلاً فليقبل ذلك محقاً أو مبطلاً فإن لم يفعل لم يرد عليّ الحوض**)). واتە: (داوێن پاك بن بەرامبەر بە ئافرەتانی خەڵکی، ئافرەتانتان پاك داوێن دەبن، چاك بن بەرامبەر دایك و باوکتان، منداڵەکانتان چاك دەبن بۆتان، هەرکەس لەئێوە براکەی داوای لێبوردنی لێ کرد با لێی قبوڵ بکات جا گەر حەق بو یان ناحەق، خۆ ئەگەر وانەکات ئەوا لەسەر حەوزی کەوسەر نایەتە لام).

(طبرانی) بە سەنەدێکی (حسن) لە (ابن عمر)ەوە م گێڕاویەتیەوە کە وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((**بـرّوا آباءكم تبركم أبناؤكم، وعِفّوا تعف نساؤكم**)).واتە: (چاك بن بۆ دایك و باوکتان، منداڵەکانتان چاك دەبن بەرامبەرتان، داوێن پاك بن ئافرەتەکانتان داوین پاك دەبن).

گەر هۆکاری خراپی منداڵانمان بۆ روون بویەوە، لەکاتێکدا کە لە قۆناغی منداڵێتی دان، ئەو قۆناغەش بەهێزیو باڵادەستی دایك و باوك و قوڵی فیترەتیان جیادەکرێتەوە، هەر بۆیە رێگای راست و دروست بۆ راستکردنەوەی منداڵ، کە هەڵس و کەوتی وەك هەڵس و کەوتی چاکەکاران بێت، و بەشێوەیەکی ئاسایی بڕوات، بەوە دەبێت کە هەڵس و کەوتی خۆمان راست بکەینەوە، و پەیوەندیمان لەگەڵ دایك و باوکمان بگۆڕین بەرەو چاکبوون و گوێڕایەڵی و دوورکەوتنەوە لە دڵرەنجاندنیان بە هەموو جۆرو شێوەکانی، لەبەر ئەوە حاڵ و باری دایك و باوك بۆ منداڵەکان دەگوازرێتەوە بە هەست پێکردنەوە بێت یان بەبێ هەست پێ‌کردن. ئەوەش

---

١ وقال صحيح الإسناد و لم يخرجاه وقال الذهبي صحيح، المستدرك ٤/١٥٤.

ڕێبازێکی خوایی یە هەروەك پێغەمبەری خواﷺ ڕایگەیاندووە کە فەرموویەتی: ((**أعمل ما شئت كما تدين تدان**)).[١] واتە: (بەئارەزووی خۆت چی دەکەی بیکە، چۆن بکەیت ئاوات لەگەڵدا دەکرێتەوە).

گەر مرۆڤ لە دەوروبەری ڕابمێنێ ڕاستی ئەم قسەیە بەدی دەکات و، بەچاوی خۆی دەبینێ ئەو دایك و باوکانەی کاتی خۆی دڵی دایك و باوکیان ڕەنجاندووەو ئازاریان داون، منداڵی وایان لێ دەکەوێتەوە کە دڵیان دەڕەنجێنن و ئازاریان دەدەن، ئەوەش بنچینەیەکی ڕاستەوانەیی نەگۆڕی ڕێکوپێکە، هەر لەبەر ئەوەشە گوتمان: هەر دەبێ دایك و باوك ڕەفتاریان لەگەڵ دایك و باوکیان ڕاست بکەنەوە تاوەکو رۆڵەکانیان ڕەفتاریان لەگەڵ ئەواندا ڕاست و ڕێك بێت.

ماوەتەوە پرسیارێك: چۆن مرۆڤ دەتوانێت چاك بێت بەرامبەریان؟ و بنەماکانی چاکبوون و چاکەکردنیش چی یە؟ ئایا چاکەکردن لەکاتی ئامادەبوونی دایـك و باوکدایـە. یـان لـە کـاتی ئامادەنەبوونیشیاندا دەبێت؟ ئایا درێژە دەکێشێ بۆ پاش مردنیشیان؟

لە میانەی تۆژینەوەو بەدواداچوونی فەرموودەکانی پێغەمبەری خواﷺ دەبینین کـە چـەند بنەمایەك هەیە بۆ چاکبوون لەکاتی ژیانیاندا، و چەند بنەمایەکیش بۆ باشبوون پاش مردنیـان هەیە، بەوجۆرە دەروازەی چاکبوونی لەهەردوو بارەکەدا والآکردووە، و ماوەی چاکەکردن بواری هەیە و، کاتی سوودمەند بوون و ڕاستکردنەوەی هەڵەی ئەنجامدراویش درێژەی هەیە، ئـەوەش لە بەزەیی خوای گەورەیە بە بەندەکانی، بەڵام چ بەزەییەك، سەیر و سەرسوڕهێنەریش ئەوەیـە وێڕای ئەو هەموو ئاسانکاریەو زۆری بەزەییە خواییە، دەبیـنین دڵڕەنجانـدن و سـپڵەیی هێـشتا لەنێوان خەڵکیدا بڵاوە، بە شێوەو ڕەنگی هەمەجۆر ـ خوا پەنامان بدات لە سپڵەیی- ئەمەش ستەمکاریە لە خۆی و لە منداڵەکانی، ئەو کەسەش میهرەبان نەبوو بەرامبەر بـەخۆی بـەوەی کە چاك بێت بۆ دایك و باوکی، بـا میهرەبـان بێـت بەرامبـەر منداڵـەکانی و پەلـەبکات لـە چاکەکردن بەرامبەر دایك و باوکی هەتا خوای گەورە نەوەو منداڵـەکانی ئـەویش سـەرکەوتوو بکات بۆ چاکبوون بەرامبەری و بیانپارێزێت لە خراپەی سپڵەیی و توڕەیی خوای گەورە.

---

١ رواه عبدالرزاق في مصنفه.

## یەکەم: بنەماکانی چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك تا لە ژیاندان:

### بنەمای یەکەم: پاداشتی چاکە لە دنیا و قیامەتدا:

چاکبوون بۆ دایك و باوك کاریگەری زۆری هەیە لەسەر ژیانی دنیا و قیامەتی مرۆڤ، لەبەر ئەمەیە دەبینین پێغەمبەری خواﷺ نیشانە دیارەکانی ئەو چاکەیەو شوینەواری لە ژیانی موسڵماندا دیاری دەکات کە گەر هاتوو چاك بوو ئەوە دەبێتە هۆی چاکسازی کۆمەڵگا. روونی دەکاتەوە کە ئەو چاکەیە حەقەو پێویستە لەسەر مرۆڤ نەك سوننەتێك بێت و ببەخشێت:

(ابوداود) لە (کلیب کوڕی منفعه)ەوە گێڕاویەتیەوە، ئەویش لە باپیریەوە کە چۆتە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ و وتوویەتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ لەگەڵ کێدا چاك بم؟ فەرمووی: ((**أمّك واباك، وأختك وأخاك، ومولاك الذي يلي ذلك حقاً واجباً ورحماً موصولة**)). واتە: (دایك و باوکت، و خوشك و برات، و هەرکەسێك چاکەی لەسەرت هەیە لەدوای ئەوان، ئەمەش حەقێکی پێویستە و گەیاندنی خزمایەتیە).

ئیمام (احمد) لە (مقدام کوڕی معدی یکرب)ەوە گێڕاویەتیەوە لە پێغەمبەری خواﷺوە کە فەرموویەتی: ((**إن الله يوصيكم بأمهاتكم.. إن الله يوصيكم بأمهاتكم.. إن الله يوصيكم بأمهاتكم.. إن الله يوصيكم بآبائكم.. إن الله يوصيكم بالأقرب فالأقرب**)).[1] واتە: (خوای گەورە راسپێردەیتان دەکات بەرامبەر دایکتان.. خوای گەورە راسپێردەیتان دەکات بەرامبەر دایکتان.. خوای گەورە راسپێردەیتان دەکات بەرامبەر دایکتان.. خوای گەورە راسپێردەیتان دەکات بەرامبەر باوکتان.. خوای گەورە راسپێردەیتان دەکات بەرامبەر بە نزیکترین و پاشان نزیکتر).

(ابن ماجه) لە (ابو امامه)ەوەﷺ گێڕاویەتیەوە کە پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ مافی دایك و باوك لەسەر منداڵەکەیان چی یە؟ فەرمووی: ((**هما جنتك ونارك**)) واتە: (ئەوان بەهەشت و دۆزەخی تۆن).

---

١ صحيح أنظر صحيح الجامع رقم١٢٤٩. ورواه ابن ماجه من حديث عبدالله بن عياش.

(ترمذی) لـە (ابـن عمـرو کـوڕی عـاص)ەوەﷺ گێڕاویەتیـەوە کـە پێغەمبـەری خـوایﷺ فەرموویـەتی: ((رضى الرب في رضا الوالد، وسخط الرب في سـخط الوالـد)) [١] واتـە: (ڕەزامەندی پـەروەردگار لـە ڕەزامەنـدی باوکدایـە، و تـوڕەیی پـەروەردگاریش لـە تـووڕەیی باوکدایە).

ئیمام (احمد) و (نسائی) لە (جاهمە)ەوە بـە (مرفـوع)ی گێڕاویانەتـەوە کـە پێغەمبـەری خوایﷺ فەرموویەتی: ((إلزمها، فإن الجنة تحت أقدامها)). [٢] واتە: (دەستی پێوە بگرە، چـونکە بەهەشت لەژێر پێیدایە). واتە: لەژێر پێی دایکدایە، هەربۆیە پێویست دەکات ئاشنایی مەزنی پایەی باوك و دایك و بایەخی چاکەکردن بەرامبەریان بێت.

لە(أبو درداءﷺ)ەوە گێڕاویانەتەوە کە دەڵێت: گوێم لێبو پێغەمبەری خوایﷺ دەیفـەرموو: ((الوالد أوسط أبواب الجنة، فإن شئت فحافظ على الباب أو أترك هذا)). [٣] واتـە: (بـاوك دەرگا هەرەباش و بەرزەکەی بەهەشتە، ئیتر تۆش بە ئارەزووی خۆت حـەز دەکـەیت بەدەسـتی بهێنە بۆ خۆت، یان ئەو دەرگایە لەکیس خۆت بدە).

## شوێنەواری چاکەکردن بەرامبەر دایك و باوك لە دنیادا:

## درێژی تەمەن و زۆری رزق و ڕۆزی:

ئیمام (احمد) لە (انس)ەوەﷺ گێڕاویەتیەوە، کە وتوویەتی: پێغەمبەری خوایﷺ فـەرمووی: ((من سره أن يُمدَّ له في عمره، ويزداد في رزقه فليبرَّ والديـه وليـصل رحمـه)). واتـە: (هەرکەسێك پێی خۆشە کە تەمەنی درێژ بێت، و رزق و ڕۆزی زۆر بێت، با چـاك بێـت لەگـەڵ دایك و باوکیداو سیلەی ڕەحم و خزمایەتی بەجێ بهێنێت).

(ابـویعلی) و (طبرانـی) و (حـاکم) [٤] و (الاصـبهانی) لـە (معـاذ کـوڕی انـس)ەوەﷺ گێڕاویانەتەوە کە پێغەمبەری خوایﷺ فەرموویـەتی: ((من برَّ والديـه طـوبى لـه، زاد الله عمره))واتە: (خۆشبەختی بۆ ئەوکەسەی کـە چـاك بێـت لەگـەڵ دایـك و باوکیـدا، و خـوای گەورەش تەمەنی زیاد دەکات).

---

١ ورواه ابن حبان. أنظر سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم ٥١٦ ورواه الحاكم في مـستدركه ١٥٢/٤ وقال صحيح على شرط مسلم و لم يخرجاه.

٢ صحيح، أنظر صحيح الجامع رقم ١٩٢٤ ورواه البخاري في الأدب المفرد والطبراني والحاكم.

٣ رواه الحاكم في مستدركه ١٥٢/٤ وقال صحيح الإسناد و لم يخرجاه وأقره الذهبي.

٤ قال الحاكم: صحيح وأقره الذهبي. فيض القدير ٩٥/٦ للمناوي.

(ثوبان)یش‌ﷺ وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((**إن الرجل لُيحْرَم الرِّزق بالذنب يُصيبه و لا يَرُدُّ القدر الاّ دعاء، ولا يزيد في العمر الاّ البرّ**)).[١] واتە: (کەسێك بێبەش دەبێت لە رزق و رۆزی بەهۆی گوناهێکەوە کە دەیکات، و هیچ شتێکیش قەدەر ناگێڕێتەوە جگە لە پاڕانەوە، تەنها چاکەکردنیش تەمەن درێژ دەکات).

(سلمان)یش‌ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((**لا يردُّ القضاء الاّ الدعاء، ولا يزيد في العمر إلاّ البرّ**)).[٢] واتە: (هیچ شتێك قەزای خوا ناگێڕێتەوە دوعاو پاڕانەوە نەبێت و هیچ شتێك تەمەن درێژ ناکات جگە لە چاکبوون لەگەڵ دایك و باوك).

## شوێنەواری چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك لە رۆژی دواییدا :

### ١- چاوپۆشی کردن لە تاوانەکانی دونیای:

(ترمذی) لە (ابن عمر)ەوەم گێڕاویەتیەوە کە پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ گوناهێکی گەورەم کردووە، ئایا بۆم هەیە تەوبە بکەم؟ فەرمووی: ((**هل لك من أم؟**)) ئایا دایکت هەیە؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: ((**هل لك من خالة؟**)) پور(خوشکی دایك)ت هەیە؟ وتی: بەڵێ، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((**فبرّها**)) چاك بە بۆی.[٣]

(بخاری) لە (ادب المفرد) لە (عطاء کوڕی یسار)ەوە گێڕاویەتیەوە، ئەویش لە (ابن عباس)ەوە م، کە پیاوێك هاتۆتە لای و وتوویەتی: خوازبێنی ئافرەتێکم کرد، ئافرەتەکە شووی پێ نەکردم، یەکێکی تر خوازبێنی کرد، ئافرەتەکە حەزی کرد شوی پێ بکات، منیش غیرەم لەسەر پەیدا کرد، جا ئافرەتەکەم کوشت، ئایا تۆبەیەکم بۆ هەیە؟ پێی وت: دایکت ماوە؟ وتی: نەخێر، پێی وت: کەواتە تەوبە بکە بۆ لای خوای گەورەو بەگوێرەی توانات لێی نزیك بەوە.. جا دەڵێ: پرسیارم لە (ابن عباس) کرد: بۆچی پرسیاری ئەوەت لێ کرد کە دایکت لە ژیاندایە؟ ئەویش وتی: هیچ کردەوەیەك وەك چاکەکردن بەرامبەر بە دایك شك نابەم کە لەلای خوا نزیکتر بکاتەوە.

---

١ رواه ابن ماجه، وابن حبان في صحيحه واللفظ له، والحاكم بتقديم وتأخير وقال صحيح الأسناد.

٢ رواه الترمذي وقال حديث حسن غريب.

٣ ورواه الحاكم بألفاظ متقاربة وقال صحيح الإسناد.

## ٢- چوون بەهەشت:

(نسائی)[١] لە (عائشە)ەوەڵ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((**دخلت الجنة، فسمعت قراءة فقلت من هذا؟ فقيل: حارثة بن النعمان، فقال رسول الله ﷺ: كذلكم البرّ، وكان برّاً بأمه - وفي رواية احمد-كان أبرّ الناس بأمه**)). واتە: (چوومە بەهەشت گوێم لە دەنگی قورئان خوێندنی یەکێك بوو، وتم: ئەوە کێیە؟ وتیان (حارثة کوڕی نعمان)ـە،ئینجا پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: بەراستی چاکبوون بەو جۆرەیە، ئەو لەگەڵ دایکی چاکەکار بوو، -لە گێڕانەوەی احمد- باشترین کەس بووە لە چاکەکردن لە گەڵ دایکیدا).

(مسلم) لە (ابوهريرە)ەوەﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((**رَغِمَ أنفه، ثم رغم أنفه، ثم رغم أنفه: من أدرك أبويه عند الكبر أحدهما أو كلاهما، فلم يدخل الجنة**)). واتە: (لووتی بەقوڕدا چێت، پاشان لووتی بەقوڕدا چێت، پاشان لووتی بەقوڕدا چێت، ئەو کەسەی کە لەکاتی پیری دایك و باوکی دەمێنێ (و بەبێ بەهانەیەکی ڕەوا ئەوەندە خزمەتیان ناکات کە پێی بچێتە بەهەشت) ئیتر بە پیری یەکێکیان بگات یان هەردووکیان).

(نووی) دەڵێت:[٢] (رغم أنفه) کینایەیە بۆ زەبوونی، وەك ئەوەی لووتی بەقوڕدا بچێت بە سووکایەتی و بەکەم زانینە.

پێشتریش ئەو فەرموودەیی پێغەمبەری خواﷺ خرایە ڕوو کە بە پیاوێکی فەرموو: ((**هما جنتك ونارك**)) واتە: ئەوان بەهەشت و دۆزەخی تۆن.

ئیمام (احمد) بە سەنەدێکی (صحیح) گێڕاویەتیەوە: ((**من أدرك والديه، أو أحدهما، ثم دخل النار بعد ذلك، فأبعده الله، وأسحقه**)). واتە: (هەرکەسێك بەدایك و باوکی یان یەکێکیان (لەکاتی پیری) بگات و پاشان بچێتە دۆزەخەوە، ئەوا خوای گەورە دووری دەخاتەوەو سووك و ڕیسوای دەکات).

ئیمام (احمد) و (طیالیسی) و (حاکم) بە سەنەدی (صحیح) گێڕاویانەتەوە: ((**الوالد أوسط أبواب الجنة**)) باوك هەرەباشترین و بەرزترین دەروازەی بەهەشتە.

---

١ ذكره ابن حجر في الاصابة ٣١٢/١، واسناده صحيح.

٢ رياض الصالحين باب: بر الوالدين.

هەروەها لە (عروە)ەوە گێڕاویانەتەوە کە وتوویەتی: پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەری خواﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا! شایەتیم داوە کە جگە لە (الله) هیچ خوایەك نیە و تۆش پێغەمبەری خوایت، و هەر پێنج نوێژەکەی خۆم کردووە، و زەکاتی ماڵ و سامانەکەم داوە، و رۆژووی رەمەزانیشم گرتووە.

پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((من مات على هذا كان مع النبيين، والصديقين، والشهداء يوم القيامة هكذا -ونصب أصبعيه- ما لم يعق والديه)).[١] واتە: (هەر کەسێك لەسەر ئەوە بمرێت، لە رۆژی قیامەتدا لەگەڵ پێغەمبەران و راستگۆیان و شەهیداندا ئاوایە -دوو پەنجەی پێکەوە چەسپ کرد-، بە مەرجێ ئازاری دڵی دایك و باوکی نەدابێ).

هەمووشمان ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خواﷺ دەزانین کە:

((لا طاعة لبشر في معصية الله، إنما الطاعة في المعروف)) واتە: (گوێڕایەڵی کردن بۆ هیچ مرۆڤێك نیە لە کارێکدا کە سەرپێچی خوا بێت، بەڵکو گوێڕایەڵی لە کاری چاکەدایە).

## بنەمای دووەم: پێشخستنی چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك بەسەر فەرزەکانی کیفایەدا:

چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك فەرزە لەسەر هەموو تاکێکی موسڵماندا کە خوای گەورە لەسەر بەندەکانی خۆی فەرز کردووە، هیچ فەرزێك هاوتای نیە جگە لە فەرزێکی وەك خۆی و بەهەمان هێزەوە بێت، واتا فەرزە (عەینیەکان) لەسەر هەموو تاکێك هاوتای فەرزی چاکەکردنە لەگەڵ دایك و باوك، لەوانە وەك فەرزی نوێژ و رۆژووی رەمەزان و زەکات دان و ئەوەی لە ئایندا بە پێویست زانراوە، وجیهاد کردن لە پێناوی خوا لەکاتی فەرزی (عەینی)دا (کە ئەویش راپەڕینی گشتی بێت)، لەم جۆرە رەوشانەدا منداڵ دەبێت هەوڵ بدات بەپێی توانای پێکەوەیان بگونجێنێت، خۆ گەر ئەوەی بۆ نەکرا (پاش کۆششێکی زۆر) ئەوا فەرزە (عەینیەکە)ی خوای گەورە پێش دەخات بەسەر فەرزی چاکبوون بۆ دایك و باوك، لەبەر ئەمەیە کە ئیمام (غزالی) پاش ئەوەی ئەو فەرموودانەی لەبارەی چاکبوون بۆ دایك و باوکی هێنا، دەڵێت: زۆرینەی زانایان لەسەر ئەوەن کە گوێڕایەڵی کردنی دایك و باوك لەو شتانەدا کە جێگای گومانە (شبهات) واجبە، (واتە دەبێت گوێڕایەڵی دایکی باوکی بێت).[٢]

---

١ رواه أحمد والطبراني بأسادين ورجال احدى اسنادي الطبراني رجال الصحيح كذا قاله الهيثمي في المجمع ١٤٧/٨.

٢ الإحياء ٢١٨/٢.

بەڵام لە فەرزە کیفایەتەکان کە گەر هەندێك کەس هەستن بە ئەنجام دانی ئەوا بەسە بۆ کۆمەڵگای موسڵمان و لەسەر ئەوانی دیکە لا دەچێت، وە فەرزی چاکبوون بۆ دایك و باوك دەخرێتە پێش هەمو فەرزە کیفایەتەکانە، چ جای ئەوەی کاتێك فەرزی چاکبوون لەگەڵ دایك و باوك بەرانگژ(تعارض)ی شتە ڕێپێدراوەکان(مباحات) و، خێرەکان(مندوبات)بێت، لەبەر ئەمەیە، کە ئیمام (غزالی) وتوویەتی:[1]

هەرکەسێك سوننەتەکان سەرقاڵی بکەن و فەرزی لەکیس بچێت ئەوە سەرلێشێواوو فێڵ لێکراوە، هەرکەسێك فەرزەکانی سەرقاڵی بکەن و سوننەتەکان ئەنجام نەدات ئەوە بەهانەی بۆ هەیە.

با ئەو قسەیەی (غزالی) بکرێتە ڕێسایەکی بنەڕەتی لە ژیانی مرۆڤدا، و بەهۆیەوە هاوسەنگی بۆ کاروبارەکان دروست بکات و بەڕێوەیان ببات لەکاتی یەکنەگرتنەوەیاندا، بۆ ئەمەش چەند نمونەیەك دەهێنینەوە:

## ١- پێشخستنی چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك بەسەر جیهاد کردن لە ڕێی خوادا:

(حاکم)[2] گێڕاویەتیەوە کە (جاهمە)ﷺ هاتە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ و وتی: ویستم کە غەزا بکەم بۆیە هاتووم بۆ لات و پرس و رات پێبکەم؟ پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: **((ألك والدة؟))** دایکت ماوە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: **((أذهب فألزمها فإن الجنة عند رجليها))**. واتە: (بڕۆ چاکبە بۆی، چونکە بەهەشت لەلای قاچەکانیدایە).

لە هەردوو (صحیح)ەکەشدا هاتووە لە (عبدالله کوڕی مسعود)ەوەﷺ کە وتوویەتی: پرسیارم لە پێغەمبەری خواﷺ کرد دەربارەی ئەوەی چ کردەوەیەك لای خوا زۆر گەورەو زۆر خۆشەویستە؟ فەرمووی: **((الصلاة في وقتها))** واتە: نوێژ لەکاتی خۆی.

وتم: دوای ئەو؟ فەرمووی: **((بر الوالدين))** واتە: (چاکبوون بۆ دایك و باوك).

وتم: دوای ئەوە؟ فەرمووی: **((الجهاد في سبيل الله))** واتە: (جیهاد لە ڕێی خوادا).

یەکێك لە زانا گەورەکان کە (ابن حجر العسقلانی)یە راڤەی ئەم فەرموودەیەی کردووەو

---

[1] وتەیەکە لە یەکێك لە مامۆستاکانمەوە گوێبیستی دەبووم و دووبارەی دەکردەوە، و زۆر لێی سوودمەند بووم، خوای گەورە پاداشتی بداتەوە.

[2] رواه الحاكم في مستدركه ٢/١٠٤ وقال صحيح الأسناد وأقره الذهبي.

وتوویەتی: (ابن التين) وتوویەتی: پێشخستنی چاکە کردن لەگەڵ دایك و باوك بەسەر جیهاد کردن لەڕێی خوادا، دوو ڕوو لەخۆ دەگرێت:

یەکێکیان: وازهێنان لە جیهاد بۆ سوود گەیاندن بە دایك و باوك.

دووەمیان: ئەو کەسەی چاکە لەگەڵ دایك و باوکی دەکات وا دەبینێ کە لەسەر ئەمە پاداشت وەردەگرێ، هەروەك وا دەبینێ کە جیهادەکە لەو باشترە، بۆیە وریای دەکاتەوە کە ئەو پەڕی خێر لەمەیاندایە.

وتم (واتە ابن حجر): یەکەمیان ڕوون نیەو ئەو ئەگەرەشی هەیە کە بۆیە پێشی خستووە لەبەر ئەوەی جیهاد کردن لەسەری وەستاوە، و چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك ئەوەیە کە بۆ جیهاد کردن مۆڵەتیان لێ وەربگیرێ، لەبەر ئەوەی قەدەغەکردنی جیهاد بەبێ مۆڵەتیان چەسپاوە.[1]

لە هەردوو (صحیح)ەکەشدا هاتووە[2] کە لە (عبدالله کوڕی عمرو کوڕی عاص)ەوەﷺ گێڕاویانەتەوە کە وتوویەتی: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ و وتی: هاتووم پەیمانت لەگەڵدا ببەستم لەسەر کۆچکردن بۆ خزمەتت و جیهاد کردن، و پاداشتی خۆشم لە خوای گەورە دەوێت، فەرمووی: ((هل لك من والديك أحد حي؟)) دایك و باوکت کەسیان لە ژیاندا ماون؟ وتی: بەڵێ، هەردووکیان ماون، فەرمووی: ((فتبتغي الأجر من الله تعالى؟)) حەزیش دەکەیت کە خوای گەورە پاداشتت بۆ بنووسێ؟ وتی: بەڵێ.

فەرمووی: ((فأرجع الى والديك فأحسن صحبتهما)). واتە: (بگەڕێرەوە بۆ لای دایك و باوکت و بەجوانی ڕەفتاریان لەگەڵدا بکە).

لە گێڕانەوەیەکی کەشیاندا: پیاوێك هاتە خزمەتی و مۆڵەتی لێ خواست بۆ جیهاد کردن، فەرموی: ((أ حي والداك؟)) ئایا دایك و باوکت لەژیاندان؟ وتی: بەڵێ.

فەرموی: ((ففيهما فجاهد)) واتە: (دەی لە خزمەتکردنی ئەواندا جیهاد بکەو تێبکۆشە).

(ابن حجر) وتوویەتی: وتەکەی ((ففيهما فجاهد)) واتە: (گەر دایك و باوکت ماون ئەوا هەوڵ و کۆشش بدە بۆ چاکەکردن و هەڵس و کەوت بەجوانی نواندن لەگەڵیاندا، ئەو کارە شوێنی شەڕکردنت دژی دوژمن لە پێناوی خوا بۆ دەگرێتەوە).[3]

---

١ فتح الباري ٤/١٣.
٢ واللفظ للمسلم
٣ فتح الباري ٦/١٩.

ئیمام (غزالی)یش واتای مەزن زیاد دەکات لە حوکمدانی کاروبارەکان کاتێ لەگەڵ چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك یەکتر ناگرنەوە، و دەڵێت:

زۆربەی زانایان لەسەر ئەو رایەن کە گوێڕایەڵی کردنی دایك وباوك لەو شتانەی جێگای گومان(شبهات)ن واجبە، ئەگەریش لە حەرامە دیارەکاندا واجب نەکرابێت، تەنانەت گەر پێیان ناخۆش بوو کە بەبێ ئەوان نان بخۆیت، ئەوا لەسەرت پێویستە کە لەگەڵیاندا نان بخۆیت، چونکە وازهێنان لە شتێ کە جێگەی گومانە ئەوا ئەمە (ورع)ـە، و رەزامەندی دایك و باوکیش شتێکی حەتمیە، هەروەها بۆت نیە کە سەفەر بکەیت بۆ شتێکی رێپێدراو(مباح) یاخود سوننەتێك بەبێ مۆڵەتی ئەوان، دەستپێشخەری بۆ ئەنجامدانی حەجیش کە یەکێکە لە فەرزەکانی ئیسلام لە سوننەتەکانە چونکە دەتوانرێت دوابخرێت، و چوونە دەرەوەش بۆ داواکردنی زانست هەر لە سوننەتەکانە مەگەر داوای زانستێکی فەرز بکەیت لە بارەی نوێژکردن و رۆژووەوە، لە شارەکەتدا کەسی وەها نەبێت فێرت بکات، ئەمەش وەك ئەو کەسەی سەرەتا لە ولاتێکدا موسڵمان دەبێت کە هیچ کەسێکی تێدا نیە شەریعەتی ئیسلامی فێر بکات، ئەوە لەسەریەتی کە کۆچ بکات و بە مافی دایك و باوکەوە نابەسترێتەوە.[1]

ئیمام (کاسانی)ش لە (بدائع الصنائع)دا وتوویەتی:[2] (منداڵ نابێت بەبێ مۆڵەتی دایك و باوکی یان یەکێکیان، گەر ئەوەی دیکەیان مردبوو، بچێتە دەرەوە، چونکە چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك فەرزی (عەین)ـە، و بەسەر فەرزی کیفایەدا پێشخراوە).

## ٢- پێشخستنی چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك بەسەر هاوسەر و هاوڕێیاندا:

(ترمذی) لە (علی)ەوە-کرم الله وجهه- گێڕاویەتیەوە کە وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((**إذا فعلت أمتي خمس عشرة خصلة حل ها البلاء:... وأطاع الرجل زوجته وعقّ أمه وبرّ صديقه وجفا أباه....الحديث**)). واتە: (گەر ئوممەتەکەم پازدە خەسڵەتیان ئەنجام دا، ئەوا بەڵاو نەگبەتی روویان تێدەکات:... پیاو بەقسەی ژنەکەی بکات و ئازاری دڵی دایکی بدات، و چاکە لەگەڵ هاوڕێیدا بکات و مامەڵەی وشك و رەق بێت لەگەڵ باوکی و ئازاری بدات.... تا کۆتایی فەرموودەکە).

---

١ الإحياء ٢/٢١٨.

٢ ٧/٩٨.

(ابوداود) و (ترمذی)یش لە (ابن عمر)ەوەﷺ گێڕاویانەتەوە کە وتوویەتی: ژنێکم هەبوو خۆشم دەویست، بەڵام (عمر) رقی لێی بوو، بۆیە پێی وتم: تەڵاقی بدە، منیش رازی نەبووم، (عمر)ﷺ چووە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ و ئەوەی بۆ باس کرد، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: تەڵاقی بدە.[١]

لە (عائشە)ەوە ﷺ دەگێڕنەوە کە پرسیاری لە پێغەمبەرﷺ کردووە: رەواترین کەس کە ئافرەت مافەکەی بەجێ بهێنێ کێیە؟ فەرمووی: مێردەکەیەتی، دەڵێ: وتم: ئەی لەسەر پیاو؟ فەرمووی: دایکیەتی.[٢]

ئەو شاهێدیەمان بەسە بۆ ئەوەی لەو بێئاگاییە بێدارمان بکاتەوە و کە بەم فەرموودەیە کۆتایی پێ دەهێنین:

لە (عبدالله بن ابي أوفی)ەوەﷺ گێڕاویانەتەوە[٣] کە وتوویەتی: لەخزمەت پێغەمبەری خواﷺدا بووین، یەکێك هاتە لای و وتی: گەنجێك گیان دەدات و پێیان وتووە بڵێ (لا الە الا الله) بەڵام نەیتوانیوە بیڵێ، جا فەرمووی: ئایا نوێژی دەکرد؟ وتی: بەڵێ، پێغەمبەری خواﷺ هەستایەوەو ئێمەش لەگەڵی هەستاین، چوو بۆ لای گەنجەکە، پێی فەرموو: بڵێ (لا الە الا الله)، وتی: ناتوانم، فەرمووی: بۆ؟ وتیان: چونکی بۆ دایکی خراپ بووە، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: دایکی زیندووە؟ وتیان بەڵێ، جا بانگی دایکی کرد و پێی فەرموو: **((أرايتِ لو أجَّجتُ ناراً ضخمة فقيل لك: إن شفعت له خلينا عنه وإلاّ أحرقناه بهذه النار، أكنتِ تشفعين له؟))** واتە: (ئەگەر ئاگرێکی گەورە داگیرسێنم، و پێت بوترێت: ئەگەر تکای بۆ بکەیت وازی لێ دەهێنین، ئەگینا بەو ئاگرە دەیسوتێنین، ئایا تۆ تکای بۆ دەکەی؟)

وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ تکای بۆ دەکەم.

فەرمووی: **((فأشهدي الله وأشهديني إنك قد رضيت عنه))** واتە: (دەی کەواتە خوا بکە بە شاهید و منیش بکە بە شاهید کە تۆ لەو کوڕەت رازی بوویت).

وتی: خوایە! تۆ دەکەم بە شاهید، و پێغەمبەرەکەشت دەکەم بە شاهید کە من لەم کوڕەم رازی بووم.

---

١ پیاوێك هەمان پرسیاری لە ئیمام (احمد) کرد: ئەویش فەرمووی: باوکێکی وەکو (عمر)م بۆ بێنە تا فەرمان بە کوڕەکەی بکات بە تەڵاقدانی ژنەکەی و تا ئەویش گوێڕایەڵی بێت.

٢ رواه الإمام احمد والنسائي وصححه الحاكم.

٣ رواه امام احمد –ومختصراً والطبراني– واللفظ له.

ئەمجا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: **((یا غلام! قل لا اله الاّ الله وحده لا شریك له، واشهد أن محمداً عبده ورسوله))**. واتە: (رۆڵە! بڵێ: جگە لە (الله) هیچ خوایەکی دیکە نیە و هیچ هاوبەشێکی نیە، و شاهێدیش دەدەم کە (محمد) بەندەو نێردراوی خوایە).

کوڕەکەش وتی، جا پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: **((الحمد لله الذي انقذه من النار))**.واتە: (سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە لە ئاگر رزگاری کرد).

## ٣ـ پێشخستنی چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك بەسەر حەجدا:

لە هەردوو (صحیح)ەکەدا لە رێی (ابوهریرە)وەﷺ گێڕاویانەتەوە کە وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: **((وللعبد المملوك المُصلِح أجران))**. واتە: (بەندەی خاوەندار(واتە: کۆیلە)ی چاکەکار دوو پاداشتی بۆ هەیە).

سوێند بەوەی گیانی (ابوهریرە)ی بەدەستە! گەر لەبەر جیهادی رێی خوا و حەجکردن و چاکەکردن لەگەڵ دایکمدا نەبوایە حەزم دەکرد بە کۆیلەیی بمرم.

ئەمەو (ابوهریرە) حەجی نەکرد هەتا دایکی مرد، بەهۆی زۆر رێز گرتنی دایکی و چاك هەڵس و کەوتکردنی لەگەڵیدا.[1]

## ٤- پێشخستنی چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك بەسەر سەردانی مەزاری پێغەمبەری خواﷺدا:

ئەمەش نموونەیەکە لەوپەڕی چاکیو جوانیدا، و خاوەنەکەی رێزی پێشڕەوی دەست کەوتووە لە هەموو بوارێکدا بەهۆی سەرقاڵ بوونی بە دایکیەوە، بەهۆی پێویستی دایکی پێی نەیدەتوانی سەردانی پێغەمبەری خواﷺ بکات و ببینێ با بۆ تەنیا جارێکیش بێت، ئەو پیاوەش (أویسی قرنی)یە، -خوای گەورە وێنەی ئەو چاکبوونەی ئەو بە من و تۆش ببەخشێت-

(مسلم) لە (اسید کوڕی جابر)ەوە هێناویەتی کە وتوویەتی: (عمر کوڕی خطاب)ﷺ کە لە یەمەنەوە کۆمەکی بۆ دەهات پرسیاری لێ دەکردن: ئەرێ (أویس کوڕی عامر)تان تێدایە؟ ؟ دەڵێن: بەڵێ، وتی: لە (موورادی) و لەدوای ئەوە لە (قەرەنی)؟ دەڵێن: بەڵێ، وتی: بەڵەکیت پێوە بوو چاك بوویتەوەو جێی درهەمێکی ماوە؟ دەڵێ: بەڵێ، وتی: دایکت هەیە؟ وتی: بەڵێ.

ئیمام (عمر) وتی: لە پێغەمبەری خواﷺم بیستووە کە دەیفەرموو: **((یأتي علیکم أویس**

---

[1] رواه الترمذي أيضاً.

**بن عامر مع أمداد أهل اليمن من مرادٍ ثم من قرن وكان به برص فبرأ منه الاّ موضع درهم، له والدة هو بها برٌّ لو أقسم على الله لأبرّه، فإن أستطعت أن يستغفر لك، فأفعل))**. واتە: (لەگەڵ کۆمەکی خەڵکی یەمەندا (أويس کوڕی عامر)تان دێتە لا، لەهۆزی مورادەو لەدوای ئەو لە هۆزی قەرەنە، بەڵەکیەکی پێوە بوو چاك بۆتەوە تەنها جێی درهەمێکی پێوە ماوە، دایکێکی هەیە لە فەرمان و گوێڕایەڵیایەتی، ئەگەر سوێند لەسەر خوا بخوات خوا سوێندەکەی ناخات و بۆی جێبەجێ دەکات، گەر بتوانیت داوای لێخۆشبوونت بۆ بکات، ئەوا داوای لێبکە).

(عمر) وتی: داوای لێخۆشبوونم بۆ بکە، داوای بۆ کرد، وتی: کوێت دەوێ؟ وتی: کوفە، وتی: دەبا کاغەزێکت بۆ بنووسم بۆ کاربەدەستی کوفە تا ئاگای لێت بێ؟ وتی: حەزناکەم ناوم بکەوێتە ناو ناوانەوە، حەز بە ناو خەڵکە رەش و رووتەکە دەکەم.

دەڵێ: لە ساڵی ئایندەدا پیاوێکی خانەدانیان هات بۆ حەج، و (عمر) هەواڵی (اويس)ی لێ پرسی، وتی: کە من هاتم ماڵێکی پڕپووت و کەمێ شتومەکی هەبوو، (عمر)یش فەرموودەکەی پێشەوەی بۆ گێڕایەوە، جا کە پیاوەکە دەگەڕێتەوە دەچێتەوە لای (اويس) و دەڵێ: بۆم بپاڕێوە، دەڵێ: تۆ تازە لە سەفەری خێر گەڕاویتەوە، تۆ بۆ من بپاڕێوە، لە پاشان دەڵێ: (عمر)م بینیوە، دەڵێ: بۆی پاڕایەوە و داوای لێخۆشبوونی بۆ کرد. ئیدی دەردەکەوێت و خەڵکی پێی دەزانن و سەری تێدەکەن، ئەویش سەری خۆی هەڵدەگرێت!

(أسيد) دەڵێت: پۆشاکێکم دایە، هەرکەسێك بیبینیایە دەیوت: (أويس) ئەم پۆشاك(عەبا)ەی لەکوێ بوو؟

## ٥- پێشخستنی چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك بەسەر خۆشەویستی منداڵدا:

رووداوێکمان لەگەڵدایە ئێستا خۆی لەخۆیدا سەرسوڕهێنەرە، لە دەروازەیدا مەزنە، لە دڵسۆزیدا زۆر جوانە، واتاکانی چاکبوونی بۆ خاوەنی لە لوتکەدایە، روونی دەکاتەوە کە چۆن دڵسۆزی لە چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوکدا خاوەنەکەی دەرباز دەکات لە تاریکیە قەترانیەکاندا.. و لە تەنگ و چەڵەمە نارەحەتەکان.. کاتێ کە دەگاتە دواهەناسەکانی، خوای گەورە دەرووی لێ دەکاتەوە بەرامبەر ئەو چاکبوونەی کە لەگەڵ دایك و باوکیدا هەیبووە. - خوای گەورە من و تۆش پێکەوە بخاتە ریزی چاکەکارانەوە-:

لە هەردوو (صحیح)ەکەدا گێڕاویانەتەوە لە (ابـن عمـر)ەوەکـە وتوویـەتی: گـوێم لێبـوو پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: (جارێکیان سێ‌کەس لەوانـەی پێـشینانی ئێـوە بـە ڕێگایەکـدا دەڕۆیشتن، بۆ شەو چوونە ئەشـکەوتێ، بـەردێکی گـەورە لـە کێوەکـەوە گـل بـۆوەو دەرگـای ئەشکەوتی لێ داخستن، جا لەناو خۆیاندا وتیان: ڕزگارتان نابێت لەم بەردە، مەگەر بە کـردەوە چاکەکانتان لە خوا بپارێنەوە، پیاوێکیان وتی: خوایە دایك و باوکێکی زۆر پیرم هەبوو، هەموو جارێ کە شیرم دەهێنا لەپێش ئەوان کەس لە ماڵ و منداڵ لێیان نەدەخوارد، تا ڕۆژێك بەهۆی گەڕان بەدوای لەوەڕەوە دوورکەوتمەوەو نەگەڕامەوە بۆ لایان هـەتا ئـەوان خـەویان لێ کـەوت، شیرەکەم بۆیان دۆشی و بۆم بردن، سەیرم کرد نووستوون، حـەزم نـەکرد خەبـەریان بکەمـەوەو پێشم ناخۆش بوو بەر لەوان شیر بدەم بە منداڵەکانم، جا مامەوە و شـیرەکەم هـەر بەدەسـتەوە بوو، چاوەڕێم دەکرد تا لەخەو هەستن، منداڵەکانیشم لەبەر پێمدا لەبرسان دەکڕوزانـەوە، هـەتا بەیانی داهات، ئەوان هەستان و لەشیرەکەیان خوارد.. خوایە ئەگەر ئەمەم لەبەر ڕەزامەندی تۆ کردووە ئەوا دەروویەکمان لێ بکەرەوەو ئەم بەردەمان بۆ لادە، بەردەکە کـەمێك جـوڵا، بـەڵام نەیاندەتوانی لێی دەربچن..

یەکێکی دیکەیان وتی: خوایە خۆت ئاگاداری کە کچە مـامێکم هـەبوو، خۆشەویـستترین کەس بوو لام، -لەگێڕانەوەیەکی دیکەدا- ئەوپـەڕی خۆشەویـستی پیـاو بـۆ ئـافرەت چـەندە ئەوەندەم خۆش دەویست، داوای ئیشی خراپم لێی کرد، خۆی نەدا بەدەستەوە، هەتا سـاڵێکیان دووچاری گرانی و قات و قڕی بوو، بەناچاری هات بۆ لام و سـەد و بیـست دینـارم پێـدا بـەو مەجەی خۆیم بـدات بـە دەسـتەوە، ئـەویش وای کـرد، جـا کاتـێ دەسـتم لێـی گـیر بـوو - لەریوایەتێکی دیکەدا- کە لەنێوان قاچەکانی دانیشتم، وتی: لەخوا بترسە و ئەو مۆرە بەناهەق مەشکێنە، ئیتر منیش وازم لێی هێنا ئەگەر چی خۆشەویستترین کەس بوو لەلام، و زێڕەکەشم لێ وەرنەگرتەوە.. خوایە! ئەگەر ئەمەم لەبەر ڕەزامەندی تـۆ کـردووە ئـەوا دەروویـەکمان لێ بکەرەوە و لەم تەنگانەیە ڕزگارمان بکە، بەردەکە زیـاتر لـەدەم ئەشـکەوتەکە لاچـوو، بـەڵام نەیاندەتوانی لێی دەربچن.

سێیەمیش وتی: خوایە! خۆت دەزانی کە من جارێك چەند کرێکارێکم بـەکرێ گـرت، کـە کارەکە تەواو بوو کرێی هەموویانم دا تەنها یـەکێکیان نـەبێ کرێیەکـەی خـۆی وەرنـەگرت و ڕۆشت، منیش کرێکەی ئەوم خستە ئیشەوە هەتا بووە ماڵ و داراییەکـی زۆر، پـاش ماوەیـەك هاتەوەو وتی: ئەی بەندەی خوا! کرێکەم بدەیە، وتم: هەمو ئەوانەی دەیبینی لە وشترو گاگەل و

مەڕ و کۆیلە، هەمووی بەرهەمی کرێکەی تۆن، وتی: ئەی بەندەی خوا! گاڵتەم پێ مەکە، منیش وتم: گاڵتەت پێ ناکەم و بەراستمە، جا هەمووی برد و دایە پێش خۆی و هیچی لێ بەجێ نەهێشت.. جا ئەی خوایە! ئەگەر ئەوەم لەپێناو تۆدا کردووە ئەوا دەروویەکمان لێ بکەرەوەو لەم تەنگانەیە رزگارمان بکە. بەردەکە لاکەوت و دەرچوون و رۆیشتن.

## ٦- پێشخستنی چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك بەسەر نوێژە سوننەتەکاندا:

لە (ابوهریرە)ەوە‌ﷺ دەگێڕنەوە کە ئەویش بەرزی کردۆتەوە:[١]

(جریج) پیاوێکی خواپەرست بوو و، خەڵوەخانەیەکی هەبوو تیایدا دەحەسایەوە، دایکی هاتە لای و ئەویش نوێژی دەکرد، بانگی کرد: ئەی (جریج)، ئەویش (لەدڵی خۆیدا) وتی: خوایە! وەڵامی دایکم بدەمەوە، یا نوێژەکەم تەواو بکەم، جا لەسەر نوێژەکەی بەردەوام بوو، بۆ سبەینێش دێتەوە و بانگی دەکات، بەڵام (جریج) هەر نوێژەکەی پێشی دەخات، پاش سێیەم رۆژ و لە سێیەم جاردا دایکی دەڵێت: خوایە! نەیمرێنی هەتا رووی داوێنپیسانی پێ نیشان دەدەیت.

لەناو نەوەی ئیسرائیل باسی (جریج) و پەرستشەکەی کرا، ئافرەتێکی سۆزانی و داوێن پیسیش کە بەجوانی خۆی دەنازی وتی: ئەگەر حەز دەکەن دەچم لە خشتەی دەبەم، جا چووە لای و هەوڵی لەگەڵ دا بەڵام ئاوڕی لێ نەدایەوە،جا چووە لای شوانێك کە لە خەڵوەتگاکەدا دەحەوایەوە، خۆی خستە بەردەستی و ئەویش زینای لەگەڵ کرد، جا سکی پڕ بوو و منداڵی بوو، وتی: ئەوە لە (جریج)ـە، ئەوانیش چوون بۆ گیانی (جریج) و هێنایانە خوارەوەو خەڵوەتگاکەیان روخاند، و دەستیان کرد بە لێدانی، وتی: ئەوە چیتانە بۆ وا دەکەن؟ ئەوانیش دەڵێن: لەگەڵ ئەو ئافرەتە داوێن پیسە زینات کردووەو منداڵێکی لە تۆ بووە، کە رۆشت چوو بۆ لای منداڵەکە و دەستی لە سکی داو وتی: رۆڵە! باوکت کێیە؟ منداڵەکە وتی: شوانەکەیە... ئینجا خەڵکەکە بەرەورووی (جریج) دەچن و ماچی دەکەن و خۆیانی تێ هەڵدەسوون بۆ تەبەڕوك، و پێی دەڵێن: خەڵوەتگاکەت لە زێڕ بۆ دروست دەکەینەوە، دەڵێت: نەء، وەك خۆی لە قوڕ بۆم دروست بکەنەوە، ئەوانیش لەقوڕ دروستیان کردەوە..

جارێکیش لە کاتێکدا منداڵێك لە باوەشی دایکیدا شیری دەخوارد، پیاوێك بەسواری وڵاخێکی کەشخەوە بەوێدا رادەبووری و نیشانەی چاکی پێوە دەبێ، ژنەکە دەڵێ: خودایە! ئەم

---

١ أخرجه الشيخان واللفظ للمسلم.

کوڕەی منیش وەك ئەو سوارە لیٚ بکەیت، منداڵەکە مەمکی دایکی بەردا و تەماشای پیاوەکەی کردو وتی: خوایە وەك ئەوم لیٚ نەکەی، ئینجا ڕووی وەرگێڕایەوە بۆ لای مەمکەکەی ودەستی کردەوە بە شیرخواردن...

(ابوهریرە)ﷺ وتی: دەڵێیت لەبەرچاومە، کە چۆن پێغەمبەری خواﷺ باسی شیرخواردنەکەی کرد بەوەی کە پەنجەی شایەتمانی خۆی خستە دەمیەوەو دەیمژی..

لەپاشدا کەنیزەکێکیان بەوێدا هێنا، لێیان دەدا و دەیانگوت: داوێنپیسیت کردووە، دزیت کردووە، ئەویش هەر دەیوت: (حسبي الله تعالى ونعم الوكيل = تەنها خوام بەسە و ئەویش باشترین پشتیوانە)، دایکی منداڵەکە دەڵیٚ: خودایە! کوڕەکەم وەك ئەوە لیٚ نەکەی، منداڵەکە وازی لەشیرخواردن هێناو تەماشای کەنیزەکەکەی کرد و وتی: خودایە وەك ئەوەم لیٚ بکەی.

(ابن حجر) وتوویەتی: (ابن بطال) گووتی: هۆی دوعاکردنی دایکی (جريج) لە کوڕەکەی ئەوە بوو کە قسەکردن لە نوێژدا لای ئەوان ڕێگەپێدرابوو، هەر بۆیە کاتیٚ درێژەدان بەنوێژ و موناجاتەکەی بەسەر وەڵامدانەوەی دایکیدا پێشخست، ئەویش دوعای لێکرد لەبەر دواخستنی مافەکەی.

(ابن حجر) وتوویەتی: ئەوەی لە دووبارەکردنەوەی وتەی (أمي وصلاتي= دایکم و نوێژەکەم) دەردەکەوێت کە قسەکردن لای ئەو نوێژەکەی دەبڕێت، لەبەر ئەوە وەڵامی نەدایەوە..

(حسن کوڕی سفيان) لە ڕێگەی (ليث) لە (يزيد کوڕی حوشب) لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: بیستم پێغەمبەری خواﷺ دەیفەرموو: **((لو كان جريج عالماً لعلم أن إجابته أمه أولى من عبادة ربه))**[1] واتە: ئەگەر (جريج) زانابوایە، دەیزانی کە وەڵامدانەوەی دایکی لەپێشترە لە پەرستشەکەی بۆ پەروەردگاری.

## ٧- پێشخستنی چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك بەسەر کۆچکردن لە پێناوی خوادا:

لە (عبدالله کوڕی عمر)ەوە م دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەری خواﷺ و وتی: هاتووم پەیمانت پیٚبدەم لەسەر کۆچکردن و دایك و باوکیشم بەجیٚهێشت دەگریان، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: **((فأرجع اليهما فأضحكهما كما أبكيتهما))**[2]. واتە: (بگەڕێرەوە بۆ لایان و بیانخە پێکەنین هەروەك چۆن خستنتە گریان).

---

١ فتح الباري ٣/٣٢١.

٢ رواه الحاكم في مستدركه ٤/١٥٢ وقال صحيح الأسناد و لم يخرجاه وأقره الذهبي.

## کۆتایی: نمونەیەکی چاکەکاری پێغەمبەری خواﷺ بۆ دایك و باوکی شیریی و چاکەکردنی (فاطمة) بەرانبەر بە پێغەمبەرﷺ:

(أبوداود) لە (عمر کوری سائب)ەوەﷺ گێڕاویەتیەوە کە وتوویەتی: رایگەیاندووە کە رۆژێکیان پێغەمبەری خواﷺ دانیشتبوو، دایك و باوکی شیریی هاتن، هەستا و پێشوازی لە باوکی کرد و چمکێکی عەباکەی بۆ راخست و لەسەری دانیشت، پاشان پێشوازی لە دایکی شیریی کرد و بەشێکی ئەولای دیکەی عەباکەی بۆ راخست و لەسەری دانیشت، پاشان برا شیریەکەی هات، هەستا و لەبەردەمی خۆی داینیشاند.

هەروەها (ابوداود) لە (ابوطفیل)ەوەﷺ گێڕاویەتیەوە کە وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺم بینی لە (جعرانە)[1] گۆشتی بەش دەکرد، ئەو کاتە من منداڵ بووم و ئێسکی وشترەکانم هەڵدەگرت، ئافرەتێك هات هەتا لە پێغەمبەرﷺ نزیك بوویەوە، ئەویش عەباکەی خۆی بۆ راخست و لەسەری دانیشت، منیش وتم: ئەو ئافرەتە کێیە؟ وتیان: ئەوە ئەو دایکەیەتی کە شیری پێی داوە.

(بخاری) و (مسلم) و (مالك) گێڕاویانەتەوە لە (ام هانئ)ی مخوشکی (علی کوری ابوطالب)ﷺ کە وتویەتی: ساڵی فەتحی مەککە چووم بۆ لای پێغەمبەری خواﷺ، بینیم خۆی دەشوات و، (فاطمة)ی کچی بە عەبایەك پەنای بۆ کردووە، سڵاوم لێی کرد، فەرمووی: ئەوە کێیە؟ وتم: (ام هانئ کچی ابوطالب)، فەرمووی: ((**مرحباً بأم هانئ... الحدیث**)).

(بخاری) و (مسلم) لە (ابوحازم) گێڕاویانەتەوە، وتوویەتی: کەوا گوێی لێبووە (سهل کوری سعد) پرسیاری دەربارەی برینداربوونی پێغەمبەری خواﷺ و شکانی ددانی پێشەوەو تەنیشتی و شکانی کڵاوزرێی سەری کرا، (فاطمة)ی کچی پێغەمبەری خواﷺ خوێنەکەی دەشۆرد و (علی)یش لە قەڵغانا ئاوی بەدەستیدا دەکرد، کاتێ (فاطمة) سەیری کرد ئاوەکە لە خوێنەکە کەمترە پارچەیەك حەسیری هێنا و سوتاندی هەتا بوو بە خۆڵەمێش و نووساندی بە برینەکەیەوەو خوێنەکەی وەستایەوە.

## بنەمای سێیەم: گوێڕایەڵ نەبوونی فەرمانی دایك و باوك لە سەرپێچی کردنیاندا بۆ خوای گەورە و مانەوە بە چاکی لەگەڵیاندا:

---

[1] شوێنێکە نزیك مەککە.

خوای گەورە گوێڕایەڵی دایك و باوكی فەرز كردووە، خۆ گەر هەندێك لە دایكان و باوكان ویستیان ئەم فەرزە بقۆزنەوە بۆ شتێك كە خوای گەورە فەرمانی پێ نەكردبێت، لەو كاتانەدا خوای گەورە مۆڵەتی داوە بە موسڵمان و داوای لێكردووە كە گوێڕایەڵیان نەبێت، لەمەشدا چاكە هەیە بۆیان، و ئاگاداركردنەوەیانە بە گەڕانەوە بۆ لای فەرمانی خوای گەورە، خۆ گەر هەر سووربوون لەسەر سەرپێچیەكە یاخود كوفرەكە دەبێت منداڵەكەیان هەر بەچاكی هەڵس و كەوتیان لەگەڵدا بكات لەو شتانەدا كە سەرپێچی نیە.. ئەمەش رەوشتێكی ئیسلامی بەرزە لە چاكبوون بۆیان و بەچاكی هەڵس و كەوت كردن لەگەڵیان سەرەڕای لادانیان لە یاسای خوای گەورە، بەڵام بەبێ ئەوەی تانەوتەشەر یاخود گاڵتەوگەپ بكەن بە بیروباوەڕی و بەسووك سەیری بكەن.. وە هەموو شتێك كە بەلای بێباوەڕیدا بشكێتەوە گوێڕایەڵی دایك و باوكی تێدا نیە، و هەر فەرمانێك سەرپێچی تێدا بێت (وەك حەرام و رێپێنەدراوێكی حەرام كراو) گوێڕایەڵی دایك و باوكی تێدا نیە، لەپاڵ ئەوەدا دەبێت بە نەرم و نیانی و داناییەوە شەرعی خوای گەورەیان پێ رابگەیەنرێت، نەك بە رەقی و توند و تووڕەیی و لەخۆباییبوونەوە.

هەمووشمان ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خواﷺ دەزانین: ((**لا طاعة لبشر في معصية الله، إنما الطاعة في المعروف**)).[1] واتە: (گوێڕایەڵ بوون بۆ هیچ مرۆڤێك نیە لە شتێكدا كە سەرپێچی خوای گەورەی تێدابێت، بەڵكو گوێڕایەڵی بوون لە شتی چاكدایە).

(الفخر الرازی) لە (التفسیر)دا دەڵێت: مرۆڤ گەر ملكەچ بێت بۆ كەسێك ئەوا دەبێت ملكەچی دایك و باوكی بێت، لەگەڵ ئەمەشدا گەر ئەوان فەرمانیان پێكردن بە سەرپێچیكردنی فەرمانی خوا، نابێت شوێنیان بكەوێت، گەر ئەمە بۆ ئەوان ئاوا بێ، ئەی دەبێت بۆ كەسانی دیكە چۆن بێت.[2]

لەنێو هاوەڵانیشدا گەواهی زۆرە لەسەر ئەمە:

(مسلم) و (ترمذی) لە (سعد كوڕی ابووقاص)ەوەرضي الله عنه گێڕاویانەتەوە كە وتوویەتی: چوار ئایەت لە بارەی منەوە هاتۆتە خوارەوە، وتی: (ام سعد =دایكی سعد) سوێندی خوارد كە هەرگیز قسەی لەگەڵ ناكات هەتا لە ئایینەكەی هەڵنەگەڕێتەوە، نە دەخوات و نە دەخواتەوە،

---

١ رواه احمد والبخاري ومسلم وأبوداود والنسائي والطيالسي. أنظر سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم ١٨١ ورواه أبو يعلى في مسنده ٢٤١/١.

٢ أنظر تفسير الرازي ٣٥/٢٥.

دایکیشی پێی وت: تۆ دەتوت خوا ئامۆژگاری کردووی بۆ دایك و باوکت چاك بی، ئەوە من دایکتم و فەرمانی ئەوەت پێدەکەم.. دەڵێ: سێ ڕۆژ ئاوا مایەوە هەتا لە ماندوویەتیدا بوورایەوە، کوڕێکی تری هەبوو کە پێیان دەوت (عمارە) هەستا و ئاوی پێدا، ئەویش دەستی کرد بە دوعاکردن لە (سعد)، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی قورئانی پیرۆزی نارده خوارەوە:

﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حُسْنًا ۖ وَإِن جَٰهَدَاكَ لِتُشْرِكَ بِى مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَآ ۚ إِلَىَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾العنکبوت/٨. واتە: (ئێمە ئامۆژگاری ئادەمیزادمان کردووە بە چاك ڕەفتاریی لەگەڵ دایك و باوکیدا، خۆ ئەگەر زۆریان لێکردیت تا هاوەڵ و هاوبەشم بۆ بڕیار بدەیت، بێئەوەی زانستی و زانیاری (بیروباوەڕی لەو جۆرەت بۆ بسەلمێنێ) ملکەچیان مەبەو بەگوێیان مەکە، دڵنیابن کە گەڕانەوەتان بۆ لای منە، ئەو کاتە ئاگادارتان دەکەمەوە لەو کردەوانەی کە ئەنجامتان داوە).

﴿ وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشْرِكَ بِى مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا ۖ وَصَاحِبْهُمَا فِى ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًا ۖ وَٱتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَىَّ ۚ ثُمَّ إِلَىَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾لقمان/١٥. واتە: (ئەگەر دایك و باوکت کۆششیان لەگەڵتا کرد، تا بەبێ هیچ (بەڵگە)و زانیاریەك هاوەڵ بۆ من بڕیار بدەیت، فەرمانبەرداریان مەبەو بەقسەیان مەکە، بەڵام هەر لە دنیادا هاوڕێ و هاوەڵ و خزمەتگوزارێکی چاك بە بۆیان (لەهەموو بارودۆخێکدا) هەر شوێنی ئەوانە بکەوە کە ڕێبازیان بۆ لای من گرتۆتە بەر، لەوەودوا گەڕانەوەتان بۆ لای منە، ئەوسا هەواڵی هەموو کارو کردەوەکانتان دەدەمێ).[١]

(ابن جریر)یش بەسەنەدی خۆی لە (ابن زیاد)ەوە گێڕاویەتیەوە کە وتوویەتی:[٢] پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی (عبدالله کوڕی عبدالله کوڕی ابوسلول)ی کرد و فەرمووی: نابینیت باوکت چی دەڵێت؟ وتی: دایك و باوکم بەقوربانت بن، باوکم چی وتووە؟ فەرمووی: دەڵێت: کە گەڕاینەوە بۆ مەدینە، بەهێز و ماقوڵمان بێدەستەڵات و ژێردەستە دەردەکات، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! بەخوا ڕاستی کردووە، تۆ سەربەرز و ماقوڵیت و ئەویش سەرکز و لاواز، بەڵام بەخوا هەموو خەڵکی (یثرب) دەزانن کاتێ تۆ هاتیتە مەدینە کەس هێندەی من بۆ باوك و دایکی

---

١ (قرطبی) لە تەفسیری ئایەتی (٦٤/١٤)دا دەڵێ: گوێڕایەڵی دایك و باوك ڕەچاو ناکرێت لە ئەنجامدانی تاوانی گەورەدا یان لە وازهینان لە فەرزێك، بەڵکو گوێڕایەڵیان لە ڕێگەپێدراوەکاندا دەبێت.
(رازی) (١٤٧/٢٥) دەڵێت: واتە خزمەتکردنیان فەرزە و گوێڕایەڵیان پێویستە لەوەی کە سەرپێچی خوای گەورەی تێدا نەبێت، بەڵام ئەگەر داوای ئەوەیان کرد گوێڕایەڵیان مەکە.

٢ ورواه محمد بن اسحاق بن یسار کما في (مختصر ابن کثیر) للصابوني.

باش نەبوو، گەر ئێستاش خواو پێغەمبەرەکەی رازین کە سەری بهێنم بۆیان، ئەوا دەچم سەری دەهێنم، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: نەخێر.. کاتێ کە گەڕانەوە مەدینە، (عبدالله کوڕی عبدالله کوڕی ابوسلول) چووە دەرگای ماڵەکەی و بە شمشێرێکەوە وەستا و بە باوکی وت: تۆ وتوتە کە گەڕاینەوە مەدینە، گەورەو سەربڵندەکانمان سەرشۆڕ و لاوازمان دەردەکات؟ سوێند بەخوا! ئێستا دەزانیت کە سەر بڵندی بۆ تۆیە یان بۆ پێغەمبەری خواﷺ؟ وەڵاهی هەرگیز پێ نانێیتە سێبەریەوەو نایەیتە ناوی بە مۆڵەتی خواو پێغەمبەرەکەی نەبێت.

وتی: ئەی خەزرەج! کوڕەکەم نایەڵێ بچمە ماڵی خۆم.. ئەی خەزرەج! کوڕەکەم نایەڵێ بچمە ماڵی خۆم..!!

وتی: وەڵاهی بەبێ مۆڵەتی ئەو هەرگیز نایێتە ناوی، هەندێ پیاو لەدەوری کۆبوونەوەو قسەیان بۆ کرد، بەڵام ئەو هەر دەیوت: وەڵاهی بەبێ مۆڵەتی خواو پێغەمبەرەکەی ناچیتە ناوی، چوون بۆ لای پێغەمبەری خواﷺ و هەواڵیان پێدا، فەرمووی: بڕۆن پێی بڵێن وازی لێ بێنە با بچێتە ماڵی خۆی، هاتن و هەواڵیان پێدا، ئەویش وتی: کە فەرمانی پێغەمبەری خواﷺ هات ئەوا بەڵێ با بچێتەوە ماڵ.

(حمیدی) لە (مسند)ەکەیدا[1] وتوویەتی: (عبدالله کوڕی عبدالله کوڕی ابوسلول) بەباوکی وت: وەڵاهی هەرگیز ناچیتە ناو شاری مەدینە هەتا نەڵێیت پێغەمبەری خواﷺ سەربەرز و سەربڵندە و خۆم سەرشۆڕ و لاوازم.

دەبێت چاکەکردن لەگەڵیاندا لە کاروباری دونیادا بەردەوام بێت، و سیلەی رەحم لەگەڵیاندا هەمیشەیی بێت:

لە هەردوو (صحیح)ەکەدا گێڕاویانەتەوە لە (أسماء کچی ابوبکر صدیق)ەوە ﵁ کە وتوویەتی: لەو کاتەدا کە کافرەکانی قورەیش پەیمانی شەڕوەستاندنیان بەست لەگەڵ پێغەمبەری خواﷺدا و لە پەیمانی (حدیبیە)دا دڵنیایان پێیان دا، دایکم کە هەتا ئەو کاتە بێباوەڕ بوو، هات بۆ لام، پرس و رام بە پێغەمبەری خواﷺ کرد و وتم: دایکم هاتووە بۆ لام و بەنیازیشە دەستگیرۆیی بکەم، جا ئایا کۆمەکی بکەم و پێی ببەخشم لەکاتێکدا بێباوەڕیش بێ، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((نعم! صلي أُمَّكِ)) بەڵێ: سیلەی رەحمی دایکت بەجێ بهێنە.

(ابن عیینە) وتی: ئیدی خوای گەورە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: ﴿لَا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ

---

١ (مختصر ابن كثير) ٥٠٦/٣ للشيخ محمد علي الصابوني.

لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِي ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓاْ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴾ الممتحنة/٨. واتە: (دڵنیابن کە خوا جڵەوگیری ئەوەتان لێ ناکات کە چاکڕەفتار و دادپەروەر بن لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە جەنگیان دژ نەکردوون و دژایەتی ئاینیان نەکردوون و لە شوێنەوارتان دەریان نەکردوون، چونکە بەڕاستی خوا دادپەروەرانی خۆش دەوێت).

دەمێنێتەوە ئەوەی کە منداڵی موسڵمان تەواو سوور بێت لەسەر موسڵمان بوونی دایك و باوکی، و بانگەشەکردنیان بۆ لای ئیمان، و هاندانیان لەسەر بەجێهێنانی بەوپەڕی پەرۆشی و سۆز و بەزەیی و هێورییەکەوە کە ئەوەش ڕێڕەوی پێغەمبەران و نێردراوان بووە لە بانگەوازکردنی باوکیاندا، جا (ابراهیم) نمونەیەکمان دەربارەی بانگەوازکردن بۆ دەخاتە روو:﴿ وَٱذْكُرْ فِي ٱلْكِتَٰبِ إِبْرَٰهِيمَ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقًا نَّبِيًّا ﴿٤١﴾ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ يَٰٓأَبَتِ لِمَ تَعْبُدُ مَا لَا يَسْمَعُ وَلَا يُبْصِرُ وَلَا يُغْنِي عَنكَ شَيْـًٔا ﴿٤٢﴾ يَٰٓأَبَتِ إِنِّي قَدْ جَآءَنِي مِنَ ٱلْعِلْمِ مَا لَمْ يَأْتِكَ فَٱتَّبِعْنِيٓ أَهْدِكَ صِرَٰطًا سَوِيًّا ﴿٤٣﴾ يَٰٓأَبَتِ لَا تَعْبُدِ ٱلشَّيْطَٰنَ ۖ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ كَانَ لِلرَّحْمَٰنِ عَصِيًّا ﴿٤٤﴾ يَٰٓأَبَتِ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يَمَسَّكَ عَذَابٌ مِّنَ ٱلرَّحْمَٰنِ فَتَكُونَ لِلشَّيْطَٰنِ وَلِيًّا ﴿٤٥﴾ قَالَ أَرَاغِبٌ أَنتَ عَنْ ءَالِهَتِي يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ ۖ لَئِن لَّمْ تَنتَهِ لَأَرْجُمَنَّكَ ۖ وَٱهْجُرْنِي مَلِيًّا ﴿٤٦﴾ قَالَ سَلَٰمٌ عَلَيْكَ ۖ سَأَسْتَغْفِرُ لَكَ رَبِّيٓ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ بِي حَفِيًّا ﴿٤٧﴾ وَأَعْتَزِلُكُمْ وَمَا تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَأَدْعُواْ رَبِّي عَسَىٰٓ أَلَّآ أَكُونَ بِدُعَآءِ رَبِّي شَقِيًّا ﴿٤٨﴾ فَلَمَّا ٱعْتَزَلَهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ ۖ وَكُلًّا جَعَلْنَا نَبِيًّا ﴿٤٩﴾ وَوَهَبْنَا لَهُم مِّن رَّحْمَتِنَا وَجَعَلْنَا لَهُمْ لِسَانَ صِدْقٍ عَلِيًّا ﴿٥٠﴾ ﴾مریم/٤١-٥٠. واتە: (لە کتێبی ـ قورئاندا- باسی (ابراهیم) بگێڕەوە، ئەو کەسایەتیەك بووە، کە پێغەمبەر و راست و راستگۆ بوو، کاتێ (کەخوا هیدایەتی دا) بەباوکی وت: باوکی (بەڕێزم)! ئەوە تۆ بۆچی شتێك دەپەرستی کە نە گوێبیستە و نە بینایە و نە (لەتەنگانەدا) فریات دەکەوێت،، ئەی باوکی (بەنرخم) ئەو زانست و زانیاریەی کە بەمن گەیشتووە (دەربارەی دەسەڵات و توانای بەدیهێنەری ئەم جیهانە) بۆ تۆ نەهاتووە، پەیڕەوی من بکە و (گوێم لێ بگرە) ڕێنموونیت دەکەم بۆ ڕێگەو ڕێبازێکی راست و دروست.. ئەی باوکی (ئازیزم) شەیتان مەپەرستە، چونکە شەیتان یاخی بووە لەخوای میهرەبان و سەرکەشی کردووە.. ئەی (باوکی (بەڕێزم) من دەترسم سزایەك لەلایەن خوای میهرەبانەوە یەخەت پێبگرێت و ئەوکاتە ئیتر دەبیتە یار و هاودەمی شەیتان (لە دۆزەخدا).. (باوکی ابراهیم بە سەغڵەتیەوە) وتی: بۆچی

ئەی (ابراهیم)، تۆ (ئەوەندە) لەخواکانی من بێزاری، ئەگەر کۆڵ نەدەیت (لێت قبوڵ ناکەم و) بەردبارانت دەکەم، برۆ (ون بە لەبەرچاوم) هەر نەتبینمەوە.. (ابراهیم) وتی: سلاوت لێ بێ، (وا من دەڕۆم) داوای لێخۆشبوون و (هیدایەتت) لە پەروەردگارم بۆ دەخوازم، چونکە ئەو زاتە زۆر منی خۆش دەوێ و رێزی بۆ داناوم، وە من دوور دەکەومەوەو کەنارگیری دەکەم لە ئێوەو لەو شتانەی کە لەجیاتی خوا دەیپەرستن، من تەنها هانا و هاوار بۆ پەروەردگارم دەبەم و هەر ئەو دەپەرستم، ئومێدەوارم کە پەروەردگارم نائومێدم نەکات و دوعاو نزاو پەرستنم لێ وەرگرێت.. کاتێ (ابراهیم) کۆچی کرد و لەو خەڵکە گومڕایە و لەو شتانەی لەجیاتی خوا دەیانپەرست دوورکەوتەوە، ئێمە ئیسحاق و -لە (اسحاق)یش- (یعقوب)مان پێ بەخشی، هەر یەك لەوانیشمان کردە پێغەمبەر، بێگومان ئێمە لە رەحمەت و بەخشندەیی خۆمان هەموویانمان بەهرەوەر کرد، وە ئێمە زمانی (خەڵکی دیندارمان) هێناوەتە گفتوگۆ (کە هەتا دنیا دنیایە) باسی ئەوانە بەچاکیو پاکی و بڵندیی بکەن).

ئەوەتانێ (ابوهریرە)ش نمونەیەکی جوانمان دەربارەی سووربوونی لەسەر بانگەواز کردنی دایکی پێشکەش دەکات:

(بخاری) لە کتێبی (الادب المفرد)دا لە (ابوکثیر التمیمی)ەوە گێڕاویەتیەوە وتوویەتی: گوێم لە (ابوهریرە)ﷺ بوو دەیوت: هەر جولەکەو گاورێك ناوی منی بیستبێت خۆشی ویستووم، حەزم دەکرد کە دایکم موسڵمان بێت بەڵام ئەو رازی نەدەبوو، منیش پێم وت و گوێی پێ نەدام، چوومە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ و پێم وت: داوا لەخودا بکە کە دایکم موسڵمان ببێت، پێغەمبەری خواﷺ بۆی پاڕایەوە، چوومەوە بۆ لای و دەرگاکەی لەسەر خۆی داخستبوو، وتی: ئەی (ابوهریرە)! من موسڵمان بووم، جا هەواڵم بە پێغەمبەری خواﷺ دا و وتم: لای خوا بپاڕێوە بۆ من و دایکم، فەرمووی: ((**عبدك أبوهريرة وأمه أحبهما الى الناس**)). واتە: (خوایە! (ابوهریرە)ی بەندەت و دایکی لای خەڵك خۆشەویست بکە).

ئەوەش (ابوبکر) لەپاش فەتحی مەککە پەلەیەتی تا باوکی زوو بباتە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ و تەماحی ئیسلام بوونی هەبوو، پێی گەیشت:

لە (أسماء كچی ابوبكر صدیق)ەوەم كە وتوویەتی: كاتێ كە ساڵی فەتح بوو، پێغەمبەری خواﷺ گەیشتە (ذا طوی)[١]، (ابو قحافە) كەچاوی كوێر بووبوو بە كچێكی خۆی وت (كە بچووكترینیان بوو): كچەكەم ببە بۆ لای (ابوقبیس)، بردی بۆ ئەوێ، وتی: كچم چی دەبینی؟ وتی: رەشاییەكی مۆڵخواردوو دەبینم، و پیاوێك دەبینم لەبەردەم ئەو رەشاییەوە بەپەلە بەرەو ئێرە دێت، وتی: كچم ئەوانە ئەسپن، پاشان وتی: چی دەبینیت؟ وتی: دەبینم رەشاییەكە بڵاو بووەوە، وتی: سوێند بەخوا ئەوە ئەسپەكانیان تاو داوە، خێرا ببەرەوە بۆ ماڵەوە، بەپەلە رۆشتن هەتا گەیاندیە (ابطح)، ملوانكەیەكی گەڵای لەگەردندا بوو مرۆڤێ پچڕاندی، كە پێغەمبەری خواﷺ هاتە ناو مزگەوتەوە، (ابوبكر)ﷺ دەرچوو هەتا باوكی هێنا و رێی پیشان دەدا، كاتێ پێغەمبەری خواﷺ بینی فەرمووی: ((هلا تركت الشيخ في بيته حتى أجيئه؟!)). واتە: (بۆ ئەو پیرەت لەماڵەوە نەهێشتەوە هەتا ئێمە بچین بۆ لای ئەو؟)

وتی: با ئەو بێت بۆ لای تۆ رەواترە لەوەی تۆ بچیت بۆ لای ئەو ئەی پێغەمبەری خواﷺ، جا لەبەردەستی دانیشاند، پێغەمبەری خواﷺ دەستی هێنا بە سینگیدا و فەرمووی: موسڵمان بە، سەلامەت دەبیت، ئەویش موسڵمان بوو.[٢]

## بنەمای چوارەم: رەواترین كەس كە چاكرەفتار بیت بەرامبەری دایك و باوكتە:

زۆر جار مرۆڤ هەڵە دەكات لە هەڵبژاردنی هاورێ و دۆست و هاودەمدا و ناتوانێ كەسێكی دڵسۆزی بەئەمەك بدۆزێتەوەو بەشوێنی داواكردنیدا رادەكات و قاچەكانی هەڵدەكەون، لێرەو لەوێ بگەرێ بەوپەری لێبڕان و چوستیەوە بەڵكو كەسێكی دڵسۆزی بە ئەمەك ببینێتەوە لە دوورەوە هاورێیەك بەدی بكات و راست بێ لەگەڵی، هەتا گەر راست بێت لەگەڵیشی ئەم دەبینێت وا نیە، پێغەمبەری خواﷺ وازی لە مرۆڤ نەهێناوەو بارودۆخی وەها لەوەرگەڕاندا بێت بەڵكو رێگایەكی پوخت و زۆر كورتی پێ نیشان داوە بۆ گەیشتن بە هاورێی بەئەمەك.. كە ئەوانیش دایك و باوكن، لەهەردوو (صحیح)ەكەدا گێڕایانەتەوە لە (ابوهریرە)ەوەﷺ وتوویەتی: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ كێ رەواترین كەسە كە بەجوانی هاورێیەتی بكەم و هەڵس و كەوتی لەگەڵ بكەم، فەرمووی: دایكت، وتی: پاشان كێ؟ فەرمووی: دایكت، وتی: پاشان كێ؟ فەرمووی: دایكت، وتی: پاشان كێ؟ فەرمووی: باوكت.

---

١ (طوی) شوێنێكە لەلای دەرگای مەككەی پیرۆز، (مستحب)ە كە هەركەسێك بچێت بۆ مەككە لەوێ خۆی بشوات.

٢ رواه الحاكم في مستدركه (٤٦/٣) وقال: صحيح على شرط مسلم و لم يخرجاه وسكت عنه الذهبي.

لەگێڕانەوەیەکی کەدا: ئەی پێغەمبەری خواﷺ! کێ شایەنترین کەسە بە جوانی هەڵس و کەوتی لەگەڵ بکەم؟ فەرمووی: ((أمك، ثم أمك، ثم أمك، ثم أباك[1] ثم أدناك أدناك)). واتە: (دایکت پاشان هەر دایکت پاشان هەر دایکت، پاش ئەوە باوکت، ئەوجا خزم و کەس و کارت بەپێی نزیکیو دووریان لێتەوە).

لەوانەیە کەسی وا هەبێ کە بڵێ: من پێویستم بە هاوڕێ و هاودەم گرتن نیە؟ وەڵامی ئەمەش ئەوەیە: گەر وازت هێناوە لە هاوڕێگرتن ئەوە قەیناکا، بەڵام خۆ دایك و باوك لە زۆر بواردا کە دێتە ڕێگایان واز لە هاودەمیکردن و دواندن و راوێژ و گوێگرتن لە راوبۆچونت ناهێنن لە کاروباری ژیانیان و ژیانی خوشك و براکانتدا، فەرموودەکەی پێغەمبەریشﷺ خۆی چاکترین حوکمی یەکالاکەرەوەیە.

## بنەمای پێنجەم: پێشخستنی چاکبوون بۆ دایك بەسەر باوکدا کاتێ لە دژی یەك وەستان، پاش هەوڵدان بۆ ڕێکخستنەوەی نێوانیان:

(ابن حجر) لە راڤەی فەرموودەکەی پێشوودا ئەمەی وتوە:

(ابن بطال) وتوویەتی: پوختەی مەبەستی ئەوەیە کە دەبێت دایك سێ هێندەی باوك چاکەی بەرامبەر بکرێت، دەڵێت: ئەوەش بەهۆی ناڕەحەتی سکپڕی و پاشان لە دایکبوون و دوای ئەو کارەش شیرپێدان، ئەوەش تەنها دایك دەیکات و پێی ماندوو دەبێت، پاشان بەشداری باوك دەکات لە پەروەردەکردندا.. ئاماژەش بۆ ئەوە کراوە لەم فەرمایشتەی خوای گەورەدا: ﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَـٰلُهُۥ فِى عَامَيْنِ أَنِ ٱشْكُرْ لِى وَلِوَٰلِدَيْكَ إِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ ﴾لقمان/١٤. واتە: (ئێمە ئامۆژگاری ئادەمیزادمان کردووە بە چاك رەفتاری لەگەڵ دایك و باوکیدا، دایکی بە ئێش و ئازار و لاوازی و بێتاقەتی زۆرەوە (بەپێستی سکی نۆ مانگ هەڵی گرتووە)، دوای دوو ساڵ لە شیری بڕیوەتەوە، (کەواتە) ئەی ئادەمیزاد سوپاسگوزاری من و دایك و باوکیشت بە، (وە دڵنیا بن کە) گەڕانەوەتان بۆ لای منە).

جا لە ئامۆژگاریەکاندا یەکسانی خستە نێوانیان، و سێ کاروباریشی تایبەت کردووە بەدایك.

---

[1] قال النووي: هكذا منصوب بفعل محذوف أي ثم برّ أباك.

(قرطبی)ش وتوویەتی: مەبەست ئەوەیە کە دایك بەشی زیاتری چاکبوونی لەلایەن منداڵەکەیەوە پێدەبڕدرێت، لەمەشدا پێش دەخرێت بەسەر مافی باوکدا لەکاتی نۆرەبڕیندا.

(عیاض)یش وتوویەتی: جەماوەری زانایان بۆ ئەوە دەچن کە دایك لە چاکەکردن بەرامبەری پێش دەخرێت بەسەر باوکدا و، وتراویشە کە چاکبوون بەرامبەریان وەك یەکەو یەکسانە و هەندێکیشیان لە (مالك)ەوە گواستویانەتەوە، و یەکەمیان راستە.

منیش وتم (واتە ابن حجر): هەندێ لە شافعیەکان بۆ لای بیروڕای دووەم چوون، بەڵام لە (حارث محاسبی)یەوە کۆڕای زانایان وەرگیراوە لەسەر فەزڵدانی چاکبوون بۆ دایك و قسەی لەسەر هەیە.

ئەوەیش کە لە (مالك)ەوە وەرگیراوە لەمەدا راشکاو نیە، (ابن بطال) باس دەکات کە پرسیار لە (مالك) کرا: باوکم داوای کردم بەڵام دایکم رێگەی پێنەدام؟ وتی: گوێڕایەڵی باوکت بکە و سەرپێچی دایکیشت مەکە، (ابن بطال) دەڵێت: ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە چاکبوون بۆیان وەك یەکەو یەکسانە، هەروەها ئەوەشی وت: بەڵگەش لەسەر ئەمە زۆر روون نیە.

دەڵێت: پرسیارکرا لە (لیث) سەبارەت بە هەمان پرسیار، وتی: گوێڕایەڵی دایکت بە چونکە سێ بەشی چاکبوونی هەیە، ئەمەش ئەو رێگەیە دەستنیشان دەکات کە ناوهێنانی دایکی تێدا تەنها دووجار دووبارە بۆتەوەو زیاتر دووبارە نەبۆتەوە.

هەروەها دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: ((**إن الله يوصيكم بأمهاتكم، ثم يوصيكم بأمهاتكم، ثم يوصيكم بأمهاتكم، ثم يوصيكم بآبائكم، ثم يوصيكم بالأقرب فالأقرب**)).[1] واتە: (خوای گەورە ئامۆژگاریتان دەکات و، راتان دەسپێرێت لەبارەی دایکانەوە، پاشان ئامۆژگاریتان دەکات وراتان دەسپێرێت لە بارەی دایکانەوە پاشان ئامۆژگاریتان دەکات و راتان دەسپێرێت لە بارەی دایکان، و پاش ئەوە ئامۆژگاریتان دەکاتو راتان دەسپێرێت لە بارەی باوکانەوە، دوای ئەوە راتان دەسپێرێت و ئامۆژگاریتان دەکات لەبارەی خزمانەوە نزیکترین و نزیکتر و نزیك، چاك بن بەرامبەریان).

لە فەرموودەکەی (ابورمثة)شدا: گەیشتمە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ و گوێم لێ بوو

---

١ أخرجه البخاري في الأدب المفرد وأحمد وابن ماجه وصححه الحاكم بلفظه.

دەیفەرموو: ((أمك وأباك ثم أختك وأخاك ثم أدناك أدناك)).[١] واتا: (دایك و باوكت، پاشان خوشك و برات، دوای ئەوە خزمەكانت بەپێی نزیكیان).

(عیاض) وتوویەتی: هەندێ لە زانایان دوودڵ بوون سەبارەت بە باپیر و براو زیاتریش لەسەر ئەو بۆچوونەن كە باپیر پێش بخرێت.

وتم: (واتە ابن حجر): شافیعیەكان بەمە یەكلایان كردۆتەوە و وتوویانە: باپیر پێش دەخرێت پاشان برا، دوای ئەوە ئەوانەی كە نزیكن لە دایك و باوكەوە بەسەر ئەوانەی كە نزیكن لە یەكێكیانەوە، پاشان نزیكی بەهۆی رەحمەوەو لە نێوانیشیاندا مەحرەمەكان پێش دەخرێت بەسەر نامەحرەمەكاندا، لەپاش ئەوە هەموو بنەچەكان، پاشان خزمە نزیكەكان و دوای ئەوە خزمەتكار، پاشان دراوسێ، (ابن بطال) ئاماژەشی بۆ ئەوە كردووە كە ریزبەندەكە بە جۆرێكە كە ناتوانرێت چاكبوون بۆیان بە یەك تەوژم بگەیەنرێت، ئەوەش ئاشكرا و روونە.

ئەوەشی كە هاتووە دەربارەی پێشخستنی دایك بەشێوەیەكی رەها، ئەو فەرموودەیەیە لە (عائشە)وە گێڕاویانەتەوە[٢] كە پرسیارم لە پێغەمبەری خواﷺ كرد: كێ رەواترین كەسە بەسەر ئافرەتەوە؟ فەرمووی: مێردەكەی، وتم: ئەی لەسەر پیاو؟ فەرمووی: دایكی.

هەروەها ئەو فەرموودەیەش كە (عمرو كوڕی شعیب) لە باوكیەوەو پاشان لە باپیریەوە گێڕاویەتیەوە پاڵپشتی پێشخستنی دایك دەكات، كە ئافرەتێك وتویەتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ ئەم كوڕەم سكم بۆی دەفرێ بوو، مەمكم ئاودەریەتی، كۆشم جێگەی حەوانەوەیەتی، ئێستاش باوكی تەڵاقی داوم و دەیەوێت لێمی بسەنێ، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((أنت أحق به ما لم تنكحي))[٣] واتە: (تۆ لە پێشتری و رەواتری پێی گەر شوو نەكەیتەوە).

جا ئافرەتەكە بەوە گەیشت كە منداڵەكە بەو بدرێ و تایبەت بكرێ لەبەر ئەوەی منداڵەكەی پێویستی بەوە لەبەر ئەم سێ هۆیانە.

(محاسبی) ئەوەشی راگواستۆتەوە كە كۆڕای زانایان لەسەر ئەوەیە كە دایك لە باوك لەپێشترە لە چاكە لەگەڵكردندا.[٤]

---

١ حسن. أنظر صحيح الجامع رقم ١٤٠٠ وقال أخرجه أبو يعلى في سننه عن صعصعة المُجاشعي، والطبراني عن اسامة بن شريك. أخرجه الحاكم هكذا واصله عن أصحاب السنن الثلاثة وأحمد وابن حبان.

مەبەست لە (ادناك): نزیكی لە چاكبوون بۆیان.

٢ أخرجه احمد والنسائي وصححه الحاكم.

٣ كذا أخرجه الحاكم وأبوداود.

٤ فتح الباري ١٣/٥-٦.

## بنەمای شەشەم: خۆت و سامانەکەت هی باوکتن:[١]

ئیمام (احمد) و (ابوداود) و (ابن ماجە) لە (عبداللە کوڕی عمرو کوڕی عاص)ەوەم گێڕاویانەتەوە کە پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ سامان و منداڵم هەیە، باوکیشم سامانەکەم لێ داگیر دەکات؟ فەرمووی: ((**أنت ومالك لأبيك، إن أولادكم من أطيب كسبكم، فكلوا من كسب أولادكم**))[٢] واتە: (خۆت و سامانەکەت هی باوکتن، منداڵەکانتان لە باشترین کاسبکاری ئێوەن، دە ئێوەش لە کاسبی منداڵەکانتان بخۆن).

(ابو حنیفە)ش لە (مسند)ەکەیدا گێڕاویەتیەوە لە (عائشە)ەوە وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((**إن أولادكم من كسبكم، وهبة الله لكم، يهب لمن يشاء إناثاً ويهب لمن يشاء الذكور**)). واتە: (منداڵەکانتان لە کاسبکاری ئێوەن، و دیاری خوای گەورەن بۆ ئێوە، بۆ هەرکەسێك بیەوێت کچی دەداتێ و هەرکەسێکیش بیەوێت کوڕی دەداتێ).

هەروەها گێڕاویانەتەوە کە:[٣]((**إن أطيب ما أكلتم من كسبكم وإن أولادكم من كسبكم**)) واتە: (باشترین شتێ کە خواردبێتتان لە کاسبی خۆتان بووە، و منداڵەکانیشتان لە کاسبی ئێوەن).

(قرطبی)ش بەسەرهاتی (پیاوێکی پیر و کوڕەکەی) دەگێڕێتەوەو دەڵێت: لە (جابر کوڕی عبداللە)ەوەﷺ بە (سند متصل) گێڕامانەوە کە وتوویەتی: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ باوکم سامانەکەی بردووم، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: باوکتم بۆ بهێنە.. (جبرائیل-سەلامی خوای لێبێ) دابەزی بۆ لای پێغەمبەری خواﷺ و فەرمووی: ((**إن الله يقرئك السلام ويقول لك: إذا جاءك الشيخ فأسأله عن شيء قاله في نفسه ما سمعته أذناه**)). واتە: (خوای گەورە سەلامت لێ دەکات و دەفەرموێت: کە ئەو پیاوە پیرە هات بۆ خزمەتت پرسیاری دەربارەی شتێك لێ بکە کە لە دڵی خۆیدا وتی و گوێیەکانی خۆی نەیبیست).

کاتێ پیاوە بەساڵاچووەکە هات، پێغەمبەری خواﷺ پێی فەرموو: هۆی چیە کوڕەکەت شکاتت لێ دەکات؟ ئایا دەتەوێت سامانەکەی ببەیت؟ وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ پرسیاری

---

١ أنظر بتوسع مصنف عبدالرزاق (١٢٩/٩).

٢ صحيح. أنظر صحيح الجامع رقم ١٤٨٧.

٣ رواه البخاري والترمذي والنسائي وابن ماجه.

لێ بکە، ئایا بۆ یەکێ لە پوورەکانی (خوشکی دایکی و خوشکی باوکی) خەرج دەکەم یان بۆ خۆم؟ پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((**إيه... دعنا من هذا، أخبرني عن شيء قلتهُ في نفسك ما سمعته أذناك**)). واتە: (ئێ... با واز لەوە بێنین، پێم بڵێ ئەوە چی بوو کە لە دڵی خۆتدا وتت و گوێیەکانی خۆت نەیبیست؟)

پیاوە بەساڵاچووەکە وتی: بەخوا ئەی پێغەمبەری خواﷺ هەتا ئێستاش خوای گەورە یەقینمان بە تۆ زیاتر دەکات، لە دڵی خۆمدا شتێکم وت کە گوێیەکانم نەیانبیست، فەرمووی: بڵێ و منیش گوێت لێ رادەگرم. دەڵێ: وتم:[1]

غَـذَوتُك مولـوداً ومُنْتُـك يافعـاً ... تُعـلّ بمـا أجـني عليـك و تُنْهَـلُ

تخاف الرَّدى نفسي عليـك وإنهـا ... لـتَعْلَمُ أن المـوت وقـتٌ مؤجـلُ

فلمّا بَلَغـتَ الـسنَّ والغايـة الـتي ... إليها مدى ما كنتُ فيـك أؤمـلُ

جَعَلـتَ جزائـي غلظـة و فظاظـةً ... كأنــك أنــت المـنعم المُتفــضِّلُ

فليتــك اذا لم تَــرْع حــقّ أبــوّتي ... فعلت كما الجار المـصاحب يفعـلُ

فــأوليتنى حــق الجِـوار ولم تكــن ... علــيَّ بمــال دون مالــك تَبخــلُ

واتە: (ساوایەك بووی بەخێوم کردی تا گەورە بوویت، کەچی ئێستا پێت ناخۆشە باڵت بەسەردا بکێشم، لەوە دەترسی کە پەکم بکەوێت و لەسەرت ببمە بارگرانی، چاکیش دەزانی کە مردن کاتێکی دیاریکراوی هەیە، کاتێ گەیشتیت بەو تەمەن و مەبەستەی کە من ئومێدەواری بووم پێی بگەیت، کەچی پاداشتم بە توڕەیی و رق دەدەیتەوە، وەك ئەوەی تۆ خاوەن نیعمەت و فەزڵ بیت لەسەرم، خۆزگە کە مافی باوکایەتیم پێ رەوا نابینی و جێبەجێی بکەیت، وەك دراوسێیەکی چاك هەڵسوکەوتت لەگەڵم دەکرد، ئەو کاتە مافی دراوسێیەتیت پێ دەدام و لە ماڵی خۆت رەزیلیت لەگەڵدا نەدەکردم).

دەڵێت: ئەمجا پێغەمبەری خواﷺ بەرۆکی کوڕەکەی گرت و فەرمووی: ((**أنت و مالك لأبيك**))[2] واتە: (تۆ و سامانەکەشت موڵکی باوکتن).

---

١ ئەم چەند دێرە شیعرە حەماسیە دراوەتە پاڵ (امیە کوڕی أبو صلت).

٢ تفسير القرطبي ١٠/٤٥ ط٣. رواه ابن ماجه عن جابر، ورواه الطبراني عن سمرة وابن مسعود، والحديث صحيح. أنظر صحيح الجامع رقم ١٤٨٦.

پێشتریش واتای ئەو فەرموودەیە خرایە روو کە دەفەرموێت: ((**وإن كان خرج يسعى على ابويه الشيخين كبيرين فهو في سبيل الله**)).[١] واتە: (گەر بۆ هەوڵدان بۆ دایك و باوكی چوویێتە دەرەوە، ئەوەش لە پێناوی خوادایە).

هەروەها دایك و باوك ئەوەشیان بۆ هەیە کە شتێکیان بەخشی بە یەکێ لە منداڵەکانیان دواتر لێی بسەننەوە:

(ترمذي) لە (ابن عمر)ەوە گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((**لا يحل لأحد أن يعطي عطية فيرجع فيها الاّ الوالد لولده**)).[٢] واتە: (دروست نیە بۆ هیچ کەس کە شتێکی بەخشی لێی پاشگەز بێتەوەو وەریگرێتەوە، تەنها باوك نەبێت بۆی هەیە لە منداڵەکەی وەربگرێتەوە).

هەروەها لە (ابن عمر)و (ابن عباس)ەوەم گێڕاویانەتەوە، کە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:[٣] ((**لا يحل لرجل أن يعطي عطية أو يهب هبة ثم يرجع فيها الاّ الوالد فيما يعطي ولده، ومثل الذي يعطي العطية ثم يرجع فيها، كمثل الكلب فإذا شبع قاء ثم يعود في قيئه**)). واتە: (دروست(حەڵاڵ) نیە بۆ هەر کەس کە شتێك ببەخشێت یان بیکاتە دیاری، پاشتر لێی پاشگەز بێتەوە، تەنها باوك نەبێت لەوەی بەخشیوەیەتی بە منداڵەکەی (دەتوانێ پاشگەز بێتەوە)، وێنەی ئەو کەسەش کە شتێ دەبەخشێت و لێی پاشگەز دەبێتەوە وەك سەگ وایە، کە هەر دەخوات، کە تەواو تێر بوو دەڕشێتەوە، پاشان دێتەوە و رشانەوەکەی خۆی دەخوات).

لە (محمد کوڕی سیرین)یشەوە، دەڵێت: لە سەردەمی (عثمان کوڕی عفان)داﷺ دارخورما گەیشتە هەزار درهەم، جا (اسامە کوڕی زید) بە ئەنقەست دارخورمایەکی هەڵکۆڵی و بەزی دارخورماکەی دەرهێنا و دەرخواردی دایکی دا، پێی وت: چی وای لێکردیت ئەوە بکەیت خۆ دەزانیت دارخورما نرخی گەیشتۆتە هەزار درهەم، وتی: دایکم داوای لێ کردم، دایکیشم داوای هەر شتێکم لێ بکات و لەتوانامدا بێت پێمداوە.[٤]

---

١ رواه الطبراني ورجاله رجال الصحيح.

٢ ورواه ابن ماجه والبيهقي.

٣ رواه الترمذي النسائي وابن ماجه والبيهقي وابوداود.

٤ رواه الحاكم في مستدركه ٥٩٧/٣ وسكت عنه وقال الذهبي: أمه ماتت زمن الصديق والحديث فيه ارسال.

## بنەمای حەوتەم: ئازادکردنی دایك و باوك بۆ هەر ماڵێك کە لە گەردنیاندا بێت:

ئەمەش نموونەیەکی دیکەیە لە نمونە مەزنەکانی چاکەکردن، کە لە رۆژگاری پێشوودا و کاتی کۆیلایەتی، کوڕ خاوەنی سامان بوایە ئازاد دەبوو، و دایك و باوکیشی بە کۆیلەیی دەمانەوەو سامانیان نەبوو تا خۆیانی پێ ئازاد بکەن، بەڵام نمونەی ئەوە لە رەوشی ئەمڕۆماندا هەیە، بۆ نمونە دایك و باوك یەکێکیان قەرزی زۆری بەسەردا کەوتووە بەهۆی هەر هۆیەکەوە بێت، جا دەبێت هەڵوێستی پێغەمبەری خواﷺ لە ئاوەها بارودۆخێکدا چی بوو بێت؟

((**لا يجزي ولدٌ والداً الاّ أن يجده مملوكاً فيشتريه فيعتقه**)).[١] واتە: (هیچ منداڵێ لە چاکەی دایك و باوکی دەرناچێت مەگەر بە کۆیلەیی بیانبینێت و بیانکڕێت و ئازادیان بکات).

هەمان شتە گەر دایك و باوك یەکێکیان بکرێنە بەندیخانەوە بە هەر هۆیەکەوە بێت و، ماڵ و سامانیان نەبێت بۆ کەفالەتکردن و بەردانیان. ئەوەی لەسەر کوڕەکەیانە پەلەکردنە لەوەی کە ماڵ و سامانەکەی خۆی بخاتە خزمەتیانەوە چونکە هەروەك پێشتریش خستمانە روو: ((**أنت ومالك لأبيك**)) تۆ و سامانەکەت موڵکی باوکتن..

لە (ابن عباس)یشەوەﷺ دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: ((**من حجَّ عن أبويه أو قضى عنهما مغرماً بُعِث يوم القيامة مع الأبرار**)).[٢]

واتە: هەرکەسێ لە بری دایك و باوکی حەج بکات یان قەرزیان لەسەر بێت و بۆیان بداتەوە، خوای گەورە لەگەڵ چاکەکاراندا زیندووی دەکاتەوە.

## بنەمای هەشتەم: پاڕانەوە بۆیەکدی لەنێوان دایك و باوك و منداڵەکانیاندا:

پاڕانەوە پایەیەکی بنەڕەتی چاکەکردنە، و روکەشی دڵە کە گوزارشت لە خۆشەویستی و سۆز دەکات و بەڵگەی چاکەی نێو دڵە، چونکە دڵی پڕ لە خۆشەویستی سوورە لەسەر پاڕانەوەو ئەوەی لە دەروونیدایە دێت بە زمانیدا، و هەتا خۆشەویستی نێو دڵ لەنێوان دایك و باوك و منداڵەکانیدا زیاتر بێت پاڕانەوەش زۆرتر دەبێت.

لە (ابوهريرە)وەﷺ کە وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ دەفەرمویەتی: ((**ثلاث دعوات**

---

١ رواه الإمام احمد ومسلم وأبوداود والترمذي وابن ماجه.

٢ رواه الدارقطني ٢/٢٦٠.

مستجابات لا شك فيهن: دعوة المظلوم ودعوة المسافر، ودعوة الوالد على ولده))[١] واتـە: (سێ پاڕانەوە بەبێ هیچ گومانێك وەردەگیرێت و وەڵام دەدرێتەوە: پاڕانـەوەی سـتەم لێکـراو، پاڕانەوەی ڕێبوار، پاڕانەوەی باوك بۆ منداڵەکەی).

(بخاری) لە (انس)ەوەﷺ گێڕاویەتیەوە وتوویـەتی: پێغەمبـەری خـواﷺ چـووە مـاڵی (ام سلیم)، ئەویش ڕۆن و خورمای بۆ هێنا، فەرمووی: ((أعيدوا سمنكم في سـقائه وتمـركم في وعائه، فإني صائم)). واتە: (ڕۆنەکەتان بکەنەوە ڕۆندانەکەتان و خورماکەشـتان بکەنـەوە نـاو قاپەکەی خۆی، چونکە بەڕۆژووم).

پاشان هەستایەوەو چووە گۆشەیەکی ماڵەکـەو نوێـژی سـوننەتی کـرد و پاڕایـەوە بـۆ (ام سلیم)و خاوخێزانەکەی، (ام سلیم)یش وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ! داواکارییەکی تایبـەتی بچووکم هەیە، فەرمووی: چی یـە؟ وتـی: (انـس)ی خزمـەتکارت؟ پێغەمبـەرﷺ پاڕایـەوە و هەرچی چاکەی دونیاو قیامەت هەیە بۆمی داوا کـرد: ((اللهم أرزُقه مالاً وولداً وبارك له)). واتە: (خوایە ماڵ و سامان و منداڵی پێ ببەخشە و فەڕ و بەرەکەت بخەرە ناویەوە).

(انس) دەڵێ: من لە هەموو ئەنصارییەکان زیـاتر سامانم هەیـە، (امینـە)ی کـچم بـۆی باسکردم کە سەد و بیست و ئەوەندە کەس لە نەوەی من نێژرابوو.

(بخاری) لە (الادب المفرد)دا گێڕاویەتیەوە لە (ابوحـازم)ەوە جارێکیـان بـاوکی بـۆی بـاس کردووە کە لەگەڵ (ابوهریره)دا بەسوارییی ڕۆشتووە بۆ زەویەکەی خۆی لە (عقیـق)، کاتـێ کـە پێی نایە خاکەکەی خۆی، بەوپەڕی دەنگـی خـۆی هـاواری کـرد: (وعليـك الـسلام ورحمـة الله وبركاته) ئەی دایکە، ئەویش وتی: (وعليك السلام ورحمة الله وبركاته)، ئەم وتی: خـوا ڕەحمـت پێ بکات کە منت بە منداڵی پەروەردەکرد، دایکیشی دەیوت: کوڕەکەم! تۆش خـوا پاداشـتی چاکەت بداتەوەو لێت ڕازی بێت کە چۆن بە گەورەیی لەگەڵما چاك بوویت.

خوایە بەرەکەت بخەرە ماڵ و سامان و منداڵمانەوە.

لە (ام سلمه)ەوە ل کە پێغەمبەری خواﷺ بە (فاطمة)ی فەرمووە: مێردەکـەت و هـەردوو کوڕەکەتم بۆ بێنە، ئەویش هێنانی، پۆشاکێکی فـەدەکی بەسـەریاندا دا و داپیۆشـین، دەڵـێ: پاشان دەستی خستە سـەریان و فـەرمووی: ((اللهم إن هؤلاء آل محمد فأجعـل صـلواتك

---

١ رواه أبوداود والترمذي وقال حديث حسن وليس في رواية أبي داود (على ولده). ورواه الإمام أحمـد والبخاري في الأدب المفرد عن ابي هريرة ورواه ابن ماجه والطيالسي والطبراني وابن عساكر واحمد والخطيب عن عقبة بن عامر. أنظر صحيح الجامع رقم ٢٠٣١.

**وبركاتك علی محمد وعلی آل محمد إنك حميد مجيد**)). واتە: (خودایە ئەمانە کەس و کاری (محمد)ن، دە تۆش سەڵاوات و پیت و بەرەکەتی خۆت برژێنە بەسەر (محمد) و کەس و کاری (محمد)، بێگومان تۆ شایستەی سوپاس و پایەبەرزیت).

(ام سلیم) دەڵێ: عەباکەم بەرز کردەوە تا لەگەڵیان بچمە ژێری، لە دەستی وەرگرتم و فەرمووی: ((**إنك علی خير**))[1] تۆ لەسەر چاکەیت.

## بنەمای نۆیەم: مەبە بەهۆی جنێودان بە دایك و باوکت:

لە نیشانەکانی چاکەکردن ئەوەیە کە پارێزگاری ناوی دایك و باوکت بکەیت لە جوێن و قسەی ناشیرین بە هەموو جۆرو شێوەکانی، ئیدی لە خۆیانەوە بێت کە تۆ کارێکی وەها ئەنجام بدەیت کە پێی تورە بن و جنێو بە خۆیان بدەن، لەو بارەدا تۆ ببیتە هۆی ئەو جنێودانە، یاخود گەر خراپە بەرامبەر کەسێك بکەیت و ئەویش جنێو بە دایك یا باوکت بدات، یان یەکێك خراپە بەرامبەر تۆ بکات و تۆش جنێو بە دایك و باوکی بدەیت، ئەویش لە بەرامبەر ئەوەدا جنێو بە دایك و باوکی تۆ بدات.. و بەو جۆرە.

بە کورتی جنێودان بە دایك و باوك بە هەرشێوەیەك بێت لە شێوەکان یان بە هەرجۆرێك بێت لە جۆرەکان، ئیدی بە هەر هۆیەکەوە بێت.. ئەوە لە چاکەوە نیە، و پاراستنی ناوی دایك و باوك لە جنێو پێدان گەورەترین نیشانەی چاکەیە.

(ابن السنی) لە (ابوهريرە)ەوەﷺ گێراویەتیەوە کە پێغەمبەری خواﷺ پیاوێکی بینی کوڕێکی لەگەڵدا بوو، بە کوڕەکەی فەرموو: ئەمە کێیە؟ وتی: باوکمە، فەرمووی: ((**فلا تمش امامه، ولا تستسب له و لاتجلس قبله ولا تدعه باسمه**)).[2] واتە: (لەڕێگادا لەپێشیەوە مەڕۆ، مەبە هۆی جنێوپێدانی، لەپێش ئەودا دامەنیشە، و بەناوی خۆیەوە بانگی مەکە).

(ابن ابو دنیا) بە (مرسل)ی لە (ابوالمخارق)ەوەﷺ گێراویەتیەوە کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((**مررت ليلة اسري بي برجل مغيب في نور العرش، قلت: من هذا؟ أهذا ملك؟ قيل: لا، قلت: نبي؟ قيل: لا، قلت: من هو؟ قال: هذا رجل كان في الدنيا**

---

١ رواه احمد ٣٢٣/٦.

٢ رواه عبدالرزاق في مصنفه ١٣٨/١١ موقوفاً على أبي هريرة وقال حبيب الرحمن الأعظمي معلقاً: والحديث أخرجه البخاري في الأدب المفرد وروى عبدالرزاق ١٣٧/١١ قول طاووس (إن من الجفاء أن يدعو الرجل والده بأسمه).

لسانه رطب من ذكر الله وقلبه معلق بالمساجد ولم يستسب لوالديه)). واتە: (لەو شەوەی شەورۆییم پێکرا، بەلای پیاوێکدا تێپەڕیم نووقمی نێو نوری عەرش بووبوو، وتم: ئەوە کێیە؟ ئایا ئەوە فریشتەیە؟ وتیان: نەخێر، وتم: ئەی پێغەمبەرە: وتیان: نەخێر، وتم: ئەی کێیە؟ وتی: ئەوە پیاوێکە لە دنیادا زمانی تەڕ بوو بە یادی خوا و دڵی وابەستە بوو بە مزگەوتەوەو نەدەبووە هۆی جێنودان بە دایك و باوکی).

ئەوەش لە فەرموودەی (صحيح)دا چەسپاوە کە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((لعن الله من لعن والديه)). واتە: (خوا نەفرین لەو کەسە دەکات کە نەفرینی لە دایك و باوکی خۆی بکات).

لە هەردوو (صحيح)ەکەدا لە (عبدالله کوڕی عمرو کوڕی عاص)ەوەﷺ گێڕاویانەتەوە کە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((من الكبائر شتم الرجل والديه)). واتە: لە گوناهە گەورەکانە کە مرۆڤ جوێن بە دایك و باوکی بدات.

وتیان: ئەی پێغەمبەری خواﷺ ئایا کەس جنێو بە دایك و باوکی خۆی دەدات؟! فەرمووی:

((نعم! يَسُبّ ابا الرجل فيسب اباه ويسب امه فيسب أمه)). واتە: (بەڵێ، جنێو بە باوکی کەسێك دەدات و ئەویش جنێو بە باوکی ئەم دەدات، جنێو بە دایکی کەسێك دەدات و ئەویش جنێو بە دایکی ئەم دەدات).

## بنەمای دەیەم: ناوی خۆت بە ڕەچەڵەکی باوکتەوە بناسێنەو شانازی پێوە بکە:

ئیسلام سوورە لەسەر بڵاوکردنەوەو ناساندنی ڕەچەڵەکی منداڵ لە یەکەم ڕۆژی لە دایك بوونیەوە و ڕایسپاردووە کە گوێزەبانە (عقيقە)ی بۆ بکەن بە مەبەستی ناساندنی ڕەچەڵەکی منداڵە تازە لەدایك بووەکە، زۆر جار لە کۆمەڵگاکاندا شتی زۆر سەیر و سەرسوڕهێنەر ڕوو دەدات، لە کۆمەڵگای نەفامی کۆندا ڕەچەڵەکی (منداڵ) لە باوکی دەهێنرایە دەرەوەو لێی بەری دەکرا، لە کۆمەڵگای نەفامی هاوچەرخدا کوڕی ڕۆشنبیر شەرم دەیگرێت لە کاتێکدا کە پلەو پایەکی کۆمەڵایەتی دیار و بەرزی بەدەست هێناوە، ئەو گەوجە شەرم دەکات کە دان بە باوکیدا بنێت و بیناسێنێت لە کاتێکدا کە بە ڕێبواری هاتووە بۆ سەردانی.. یاخود شێوەی دیکەی هەڵهاتن لە ناساندنی ڕەچەڵەکی کوڕ بە باوکی خۆیەوە کە شەیتانەکانی ئەم سەردەمە دروستیان کردووە (پەنا بەخوا).

مەترسی ئەم کارە لەوەدایە کاتێ بزانین کە نکوڵی کردنی بنەچە مانای کوفر بەتەواوی دەدات. ئەمەش بەڵگەیە:

لە هەردوو (صحیح)ەکەدا لە (سعد کوڕی ابووقاص)ەوەﷺ گێڕاویانەتەوە کە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((**من أدعى الى غير ابيه وهو يعلم أنه غير ابيه، فالجنة عليه حرام**)).[1] واتە: (هەر کەسێ بنەچەی خۆی بگۆڕێ و خۆی بکات بە کوڕی غەیری باوکی و بەچاکی بشزانێت کە ئەوە باوکی نیە، ئەوە بەهەشتی لێ قەدەغەیە).

لەهەردو (صحیح)ەکەدا لە(ابوهریرە)ەوەﷺ پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((**لا ترغبوا عن آبائكم، فمن رغب عن ابيه فهو كفر**)). واتە: (واز لەباو وباپیری خۆتان مەهێنن و حاشایان لێ مەکەن، ئەوەی حاشا لە باووباپیری خۆی بکات ئەوە کوفری کردووە).[2]

هەر لە هەردوو (صحیح)ەکەدا[3] لە (ابوذر)ەوەﷺ: گوێی لە پێغەمبەری خواﷺ بووە کە فەرموویەتی: ((**ليس من رجل أدعى لغير ابيه وهو يعلمُهُ الاّ كفر، ومن أدعى ما ليس له فليس منّا وليتبوأ مقعده من النار، ومن دعا رجلاً بالكفر أو قال: عدو الله وليس كذلك الا حار عليه**)). واتە: (هەر کەسێك حاشا لە باوکی خۆی بکات و خۆی بکاتە نەوەی پیاوێکی تر، سووریش بزانێت کە ئەوە باوکی نیە، ئەوە کوفری کردووە، هەرکەسێ بە لاف و گەزاف شتێ بکات بەهی خۆی و هی ئەویش نەبێت ئەوە لە ئێمە نیە، و با جێگەی خۆی لە ناو ئاگری دۆزەخ ئامادە بکات، ئەو کەسەی بە کەسێکی دیکە بڵێت: ئەی کافر، یان پێی بڵێ: ئەی دوژمنی خوا، ئەو کەسەش وا نەبێ کە پێی دەڵێ، ئەوا ئەو قسەیە دەگەڕێتەوە بۆ خۆی).

---

۱ ورواه أبو يعلى في مسنده ۲/۵۹ بسند صحيح ورواه احمد ۱/۹٦۹ والبيهقي۷/٤۰۳.

۲ **بەوەی کە کوڕەکە بگاتە پلەیەکی بڵند لە دەوڵەمەندی یان پلەو پایەو شتی لەو جۆرە و دایك و باوکیشی نەدار بن، ئەویش بێزیان لێبکاتەوەو خۆی بە بنەچەیان نەزانێ.**

۳ واللفظ للمسلم.

## بنەمای یازدەهەم: حەجکردن لە بری هەرکامیان کە لەبەر هۆکاری تەندروستی نەیتوانی بیکات:

(لە (ابن عباس)ەوە م: ئافرەتێکی (خثعم)ی سەرلەبەیانی قوربانیکردن لەحەجدا پرسیاری لە پێغەمبەری خواﷺ کرد و (فضل)یش لە پشتیەوە دەبێت، وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ حەج کە فەرزی خوایە لەسەر بەندەکانی کەوتۆتە سەر باوکم لەم کاتی پیری و پەککەوتەییەدا، کە ناتوانێت خۆی بەسەر وڵاخەکەیەوە بگرێت، جا ئایا دەتوانم لە بری ئەوە حەجی بۆ بکەم؟ فەرمووی: بەڵێ.[1]

(ابن رزین)یش دەڵێ: ئافرەتەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ باوکم پیاوێکی بەساڵدا چووەو توانی حەج و عومرەو رۆیشتنی نەماوە؟ فەرمووی: ((**حج عن أبيك**))[2] لەبری باوکت حەجی بۆ بکە.

## بنەمای دوازدەهەم: بەجێهێنانی نەزرەکانیان:

لە (ابوهريره)ەوەﷺ، پێغەمبەری خواﷺ پیرێکی بەساڵاچووی بینی لەنێوان دوو کوڕیدا دەڕۆیشت، و خۆی پێیانەوە راگرتبوو، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ئەم پیاوە پیرە چیەتی بۆ وادەکات؟ هەدروو کوڕەکەی وتیان: ئەی پێغەمبەری خواﷺ نەزری لەسەرە، فەرمووی: ((**اركب أيها الشيخ، فإن الله غني عنك وعن نذرك**)).[3] واتە: (ئەی پیر بەسواری وڵاخ بڕۆ، خوای گەورە پێویستی بەتۆ و نەزری تۆ نیە).

---

١ رواه ابن خزيمة بسند صحيح ٣٤٢/٤.

٢ رواه ابن خزيمة في صحيحه ٣٤٦/٤ واسناده صحيح.

٣ رواه ابن خزيمة في صحيحه ٣٤٧/٤ ورواه مسلم.

## بنەمای سیازدەهەم: دڵڕەنجاندن (العقوق[1])ی دایك و باوك لە گوناهە گەورەکانەو سزاکەی لە دنیا و قیامەتدا:

لەهەردوو (صحیح)ەکەدا گێڕاویانەتەوە لە (ابوبکر)ەوەﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((ألا أنبئکم بأکبر الکبائر)) ئایا پێتان بڵێم گەورەترینی گوناهە گەورەکان چییە؟

وتمان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خواﷺ، فەرمووی: ((الأشراك بالله وعقوق الوالدين)). واتە: (هاوبەش بڕیاردان بۆ خودا و دڵڕەنجاندنی دایك و باوك).

پێغەمبەری خواﷺ لەو کاتەدا شانی دادابوو، دانیشت و فەرمووی: ((ألا وقول الزور)) واتە: قسەو شایەتی درۆ.

ئەوەندە دووبارەی کردەوە هەتا وتمان: خۆزگە ئیتر بێدەنگ دەبوو.

(نسائی)یش لە (عبدالله کوڕی عمر)ەوەم گێڕاوەیەتیەوە وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((ثلاثة لا ينظر الله اليهم يوم القيامة: العاق لوالديه، والمرأة المترجلة، والديوث، وثلاثة لا يدخلون الجنة: العاق لوالديه، والمدمن الخمر، والمنّان بما أعطى)). واتە: (سێ کەس لە رۆژی قیامەتدا خوای گەورە (بەچاوی رەحمەت) سەیریان ناکات: کەسێك دڵی دایك و باوکی رەنجاندبێ، و ئافرەتێك خۆی وەك پیاوان لێ بکات، و گەواد... سێ کەسیش ناچنە بەهەشتەوە: کەسێك دڵی دایك و باوکی رەنجاندبێ، و کەسێك لەسەر ئارەق خواردنەوە بەردەوام بێت تا دەمرێت، و کەسێك شت دەبەخشێت و منەتی لەسەر دەکات).

ئیمام (احمد) و (ابن ماجە) و (بخاری) لە (الادب المفرد)دا لە (معاذ)ەوەﷺ گێڕاویانەتەوە وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ بە دە وشە ئامۆژگاری کردووم:

١- ((لا تشرك بالله شيئاً وإن قُتلت و حُرِّقت)) واتە: (گەر بتکوژن و بتسوتێنن هاوبەش بۆ خوا بڕیار نەدەی).

٢- ((ولا تَعُقَنَّ والديك وإن أمراك أن تخرج من أهلك ومالك))واتە: (دڵی دایك و

---

١ بنەڕەتی وشەی (العقّ) وشەی (الشقّ)ـە بە مانای پارچەکردن، (عقوق الوالدين)یش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە بریتیە لە دابڕان لێیان، چونکە (الشق: پارچەکردن) و (القطع: دابڕین) یەك مانایان هەیە، دەوترێت: (عق ثوبه) بە مانای کراسەکەی دڕاند، (عق والديه يعقهما عقاً وعقوقاً).. شاعیر دەڵێ:
إن البنين شرارهم أمثاله من عقّ والده وبر الأبعدا (تەماشای کتێبی (العين)ی خلیل بکە.)

باوکت ئازار نەدەی، ئەگەریش فەرمانت پێ بدەن کە لە ماڵ و سامان و خاوخێزانت دەربچیت).

٣- ((ولا تتركنَّ صلاة مكتوبة متعمداً، فإن من ترك الصلاة مكتوبة متعمداً فقد برئت منه ذمة الله)). واتە: (هەرگیز نوێژە فەرزەکانت بە ئەنقەست واز لێ مەهێنە، چونکە ئەو کەسەی بە ئەنقەست واز لە نوێژی فەرز بهێنێت لە زیمەی خوای گەورە بەری دەبێت).

٤- ((ولا تشربن خمراً فإنه رأس كل فاحشة)). واتە: (ئارەق مەخۆرەوە، چونکە سەری هەموو خراپەکاریەکە).

٥- ((وإياك والمعصية، فإن بالمعصية حل سخطَ الله)). واتە: (ئاگاداربەو خۆت دوور بگرە لە سەرپێچی کردن، چونکە سەرپێچی کردن مایەی خەشم و توڕەیی خوای گەورەیە).

٦- ((وإياك والفرار من الزّحف وإن هلك الناس)). واتە: (ئاگاداربە لە راکردن لە رۆژی جەنگ و رووبەڕووبوونەوەدا، ئەگەریش خەڵك بەهیلاك چوون).

٧- ((وإذا أصاب الناس موت وأنت فيهم فاثبت)). واتە: (ئەگەر خەڵکی تووشی مردن (پەتا) هاتن و تۆش لە ناویاندا بوویت، خۆڕاگربە).

٨- ((وأنفق على عيالك من طَولِكَ)). واتە: (بەپێی توانای خۆت ژێواری منداڵەکانت بەڕێوە ببە و خەرجیان بۆ بکە).

٩- ((ولا ترفع عنهم عصاك أدباً)). واتە: (گۆچانت لەسەریان هەڵمەگرە بۆ تەمبێکردن).

١٠- ((وأخفهم في الله)) وە لەخوا بیانترسێنە.

(بخاری)یش لە (عبداللە کوڕی عمرو کوڕی عاص)ەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((الكبائر: الإشراك بالله، وعقوق الوالدين، وقتل النفس، واليمين الغموس)). واتە: (گوناهە گەورەکان ئەمانەن: هاوەڵ بۆ خوا دانان، و دڵڕەنجاندنی دایك و باوك، و کوشتنی مرۆڤ بە نارەوا، و سوێندی ناهەق و ماڵوێرانکەر).

لە هەردوو (صحیح)ەکەشدا لە (مغیرە کوڕی شعبە)ەوە ﷺ" پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((إن الله تعالى حرم عليكم عقوق الأمهات، ومنعاً وهات، ووأدِ البنات، وكره لكم قيل وقال وكثرة السؤال وإضاعة المال)). واتە: (خوای گەورە ئەمانەی لەسەرتان

حەرام کردووە: دڵڕەنجاندنی دایکان، و نەدانی ئەو مافەی کە لەسەرتە و داواکردنی شتێك کە مافی خۆت نیە، و زیندەبەچاڵ کردنی کچان.. و ئەمانەشی پێ ناخۆشە: وتی وتی، و پرسیارکردنی زۆر(لەیەك بابەت)، و بەفیڕۆدانی ماڵ و سامان).

هەروەها ئیمام (احمد) لە (مالك کوڕی عمرو قشیری)یەوە گێڕاویەتیەوەو وتوویەتی: گوێم لێبوو پێغەمبەری خواﷺ دەیفەرموو: ((**من أعتق رقبة مسلمة فهي فداؤه من النار، فإن كل عظمٍ من عظامه محررة بعظم من عظامه، ومن أدرك أحد والديه ثم لم يغفر له فابعده الله، ومن ضم يتيماً من ابوين مسلمين الى طعامه وشرابه حتى يغنيه الله وجبت له الجنة**)). واتە: (هەرکەسێك بەندەیەکی موسڵمان ئازاد بکات ئەوا هەر ئێسقانێك لە ئێسقانەکانی ئەو بەندە ئازادکراوە دەبێتە هۆی ئازادکردنی ئێسقانێکی ئەو کەسە لە ئاگری دۆزەخ، و هەرکەسێك دایك و باوکی یان یەکێکیان پیر ببێت و لێخۆشبوونی بەدەست نەهێنابێ خوای گەورە دووری دەخاتەوە لە ڕەحمەتی خۆی، ئەو کەسەشی منداڵێکی هەتیوی دایك و باوکێکی موسڵمان بهێنێت و لە خواردن و خواردنەوەی خۆی پێبدات هەتا خوا دەوڵەمەندی دەکات، ئەو کەسە بەهەشتی بۆ مسۆگەر کراوە).

(طبرانی)ش لە (الاوسط)دا گێڕاویەتیەوە لە (جابر کوڕی عبدالله)وەﷺ کە وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ هات بۆ لامان و لەو کاتەدا ئێمە کۆببوینەوە، فەرمووی: ((**یا معشر المسلمين، أتقوا الله وصلوا أرحامكم، فإنه ليس من ثواب أسرع من صلة الرحم، وإياكم والبغي فإنه ليس من عقوبة اسرع من عقوبة البغي، وإياكم وعقوق الوالدين فإن ريح الجنة توجد من مسيرة ألف عام، والله لا يجدها عاق ولا قاطع رحم ولا شيخ زانٍ، ولا جارٌ إزاره خيلاء، إنما الكبرياء لله رب العالمين**)). واتە: (ئەی کۆمەڵی موسڵمانان! لە خوابترسن و پارێزکار بن، سیلەی ڕەحم بەجێ بهێنن، بزانن کە هیچ پاداشتێ خێراتر نیە لە پاداشتی بەجێهێنانی سیلەی ڕەحم، و خۆتان دووربگرن لە دەستدرێژی و ستەم، چونکە هیچ سزایەك نیە خێراتر بێت لە سزای دەستدرێژی و ستەم، و خۆبپارێزن لە دڵڕەنجاندنی دایك و باوك چونکە بۆنی بەهەشت لە دووری هەزار ساڵەوە هەستی پێ دەکرێت، وەڵاهی ئەو کەسەی دڵی دایك و باوکی برەنجێنێت یان ئەوەی سیلەی ڕەحم بپچڕێنێت یان پیرێکی زیناکار، یان ئەو کەسەی کراسەکەی درێژبکاتەوە بۆ خۆبەگەورە زانین، بۆنی بەهەشت ناکەن، چونکە گەورەیی تەواو تەنها بۆ پەروەردگاری جیهانیانە).

لە نیشانەکانی ڕۆژی دواییش یەکێکیان وێنەیەکی قێزەونە لە دڵڕەنجاندنی دایـك و بـاوك، کە کوڕ باوکی خۆی دەکوژێت، لەم بارەوە پێغەمبەری خواﷺ دەفـەرموێت: ((**لا تقوم الساعة حتى يقتل الرجل جاره وأخاه وأباه**))[1] . واتە: (قیامەت دانایێ هـەتا پیـاو دراوسـێ و بـرا و باوکی خۆی نەکوژێت).

## بەڵام سزای دڵڕەنجاندنی دایك و باوك لە دنیادا:

(حاکم) و (اصبهانی) لە (ابوبکرە)ەوە گێڕاویانەتەوە کە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:

((**كل الذنوب يؤخر الله ما شاء منها الى يوم القيامة، الاّ عقوق الوالدين، فإن الله يجعله لصاحبه في الحياة الدنيا قبل الممات**)). واتە: (هەموو گوناهێك خوای گەورە بەویـستی خـۆی سزاکەی دوادەخات بۆ ڕۆژی قیامەت، تەنها دڵڕەنجاندنی دایك و باوك نەبێت، کە خوای گەورە لە دونیاداو بەر لەمردن سزاکەی دەدات).

## بەندوبەستکردنی دڵڕەنجاندن:

خولگەی بەندوبەستکردن(ضابط)ی دڵڕەنجاندنی دایك و باوك یان یەکێکیان هـەروەك (ابـن حجر الهيثمی) وتوویەتی:[2]

گەر کارێکی بەرامبەر کرد کـە ئـازاری پـێ بگەیـەنێت کـە ئاسـان نـەبێت و لـە داب و نەریتیشدا گەورە بێت، با حەرامیش نەبێت گەر بەرامبەر کەسێکی دیکە ئەنجامی بدات.

وەك ئەوەی لە کاتی گەیشتندا پێی دەم و چاوی بدا بە یەکدا، یـاخود بێتـە نـاو کۆمەڵـە خەڵکێکەوەو ئەم لەبەری هەڵنەستێتەوە و بەرەوپیری نەچـێت و هاوشـێوەی ئـەوە کـە ئـەهلی عـەقڵ و جوامێری ئەهلی داب و نەریت بە ئازاردانێکی گەورەی دابنێن.

## دووەم: بنەماکانی چاکەکردن لەگەڵ دایك و بـاوك پاش مردنی یەکێکیان یـان هەردووکیان:

هەندێ کەس بە منداڵی لە دایك و باوکی یەکێکیانی لەدەست داوەو کە ئەو کەسە گـەورە دەبێت لەسەریەتی کە شتێکیان بۆ بکات وەك بەگەورەگرتن و ڕێزلێنـان، یـاخود کـە ئـەم لـە ژیاندایە یەکێکیان دەمرێت، ئەوا لەسەریەتی کە بەردەوام بێت لە چاکەکردن بەرامبەری، باشە پایەکانی ئەو چاکەکردنە لەپاش مرنی یەکێکیان یان هەردووکیان چی یە؟

---

١ رواه البخاري في الأدب المفرد (٢٠٣/١) عن أبي موسى مرفوعاً.

٢ الزواجر ٧٣/٢.

## لە میانی رامان لە فەرموودە پیرۆزەکان حەوت پایە بەدی دەکەین کە ئەمانەن:

## بنەمای یەکەم: بەجێهێنانی پەیمان و ڕاسپاردەکانیان:

(ابوداود) و (نسائی) لە (شرید کوڕی سوید الثقفی)ەوە ﷺ گێڕاویانەتەوە کە وتوویەتی: دایکی وەسێتی بۆ کردبوو کە دوای مردنی کۆیلەیەکی بڕوادار ئازاد بکات، جا هاتە خزمەتی پێغەمبەری خواﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ دایکم وەسیتی کردووە کە لەبری ئەو کۆیلەیەکی باوەڕدار ئازاد بکەم، و منیش جاریەیەکی رەش پێستی (نوبی)م هەیە، ئایا ئازادی بکەم؟ پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: بانگی بکە بۆم، منیش بانگم کرد و هات، پێی فەرموو: پەروەردگارت کێیە؟ وتی: الله، فەرمووی: ئەی من کێم؟ وتی: پێغەمبەری خوا، فەرمووی: ((**اعتقها فإنها مؤمنة**)) واتە: (ئازادی بکە، ئەوە باوەڕدارە).

(ابوداود)یش لە (مالك کوڕی ربیعەی ساعدی)یەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە وتوویەتی: لە کاتێکدا کە ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەری خواﷺدا دانیشتبووین، کابرایەك لە (بنی سلمە) هات و وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ! ئایا لە چاکەکردن بەرامبەر دایك و باوکم هیچم لەسەر ماوە کە دوای مردنیان بەرامبەریان بیکەم؟ فەرمووی: ((**نعم، الصلاة عليهما والأستغفار لهما وإنفاذ عهدهما من بعدهما، وصلة الرحم التي لا توصل الاّ بهما وإكرام صديقهما**)).[1] واتە: (بەڵێ، دوعاکردن و داوای لێخۆش بوون بۆیان و بەجێهێنانی پەیمانیان لەپاش خۆیان، و سیلەی رەحم کە تەنها بەهۆی ئەوانەوەیە و رێزگرتنی هاوڕێکانیان).

ئەم فەرمودەیەش زۆربەی پایەکانی لەخۆ گرتووە.

لەوانەیە کوڕ تووشی نارەحەتی و سەختی بێت لە بەجێهێنانی ئەو وەسیەتەدا، بەڵکو راستێتی چاکبوون و بڕوای تەواو بەخوای گەورەو بەوەی کە ﴿ مَا عِندَكُمْ يَنفَدُ وَمَا عِندَ اللَّهِ بَاقٍ ﴾النحل/٩٦.(ئەوەی لای خۆتانە تەواو دەبێت و ئەوەی لای خوایە دەمێنێتەوە)، یارمەتیدەرە لە پەلەکردن بۆ بەجێهێنانی، ئەمەش نمونەیەك کە (بخاری) لە (عبدالله کوڕی زبیر)ەوە ﷺ هێناویەتی و وتوویەتی:

---

١ ورواه الحاكم في المستدرك ١٥٥/٤ وقال صحيح على شرط الشيخين ولم يخرجاه وقال الذهبي صحيح.

لە رۆژی روودانی جەنگی (جمل)دا، باوکم راوەستا بوو بانگی کردم و چوومە تەنیشتیەوە، وتی: کورِم! ئەوەی لەم رۆژەدا بکوژرێت یان ستەمکارە یان ستەملێکراو، بەڵام من وای بۆ دەچم لەم شەڕەدا بە ستەملێکراوی دەکوژرێم، ئەوەی زۆر بە تەنگیەوەم دانەوەی ئەو قەرزانەیە کە لەسەرمە، بڵێی لەبەر قەرزەکانمان شتێکمان بۆ بمێنێتەوە؟ پاشان وتی: کورِم! ماڵەکەمان بفرۆشە و قەرزەکەی منی پێ بدەرەوە، رایسپارد کە سێیەکی ماڵەکەی بۆ خێر بێت، وە لەو سێیەکە خێرە سێیەکی بۆ کورەکانی (عبداللە کوڕی زبیر) بێ، وتی: ئەگەر پاش دانەوەی قەرزەکان ماڵەکەمان شتێکی لێ مایەوە، ئەوا سێیەکی بۆ کورەکانت بێت.

(عبداللە) وتی: ئیدی باوکم هەر ئامۆژگاری دەکردم لەبارەی قەرزەکانی سەریەوەو دەیوت: کوڕی خۆم! ئەگەر بۆ شتێك دامایت، داوای یارمەتی لە گەورەکەم بکە، و هاوار بۆ ئەو بەرە، دەڵێت: سوێند بەخوا نەمزانی مەبەستی لە گەورەکەی کێیە، هەتا وتم: بابەگیان! گەورەکەت کێیە؟ وتی: گەورەی من (اللە)یە، ئەمجا وتی: سوێند بەخوا لەوە بەدوا هەرچەند بەهۆی قەرزەکەیەوە تووشی مەینەتی و سەغڵەتی بوومایە دەموت: ئەی گەورەی (زبیر) هاوارە قەرزەکەی بۆ بدەرەوە، دەڵێت: کاتێکیش (زبیر) کوژرا، نە زێڕی هەبوو نە زیو، بەڵام چەند پارچە زەوییەکی لەپاش بەجێمابوو، یەکێکیان لە (غابە)[1] بوو لەگەڵ یازدە خانوو لە شاری مەدینە، و دوو خانوو لە (بەصرە) و خانوویەك لە کوفە و خانوویەك لە میسر..

(عبداللە) دەڵێت: ئەو قەرزەی لەسەر (زبیر) بوو هی ئەوە بوو خەڵك ماڵیان دەهێنایە لای بە ئەمانەت و باوکیشم دەیوت: ئەمانەت وەرناگرم و دەترسم لەناو بچێ، بەڵام بەقەرز وەری دەگرم، (زبیر) هیچ کاتێ نە سەرکاری گرتبوە دەست و نە باجی سەندبوو، نەهیچی تری لەم بابەتەی هەبوو، ئەوەندە هەبوو لە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ و (ابوبکر)و (عمر)و (عثمان)دا دەچوو بۆ غەزا..

(عبداللە) دەڵێ: قەرزەکەیم حسێب کرد دوو ملیۆن و دووسەد هەزار بوو، دەڵێت: جارێکیان (حکیم کوڕی حزام) گەیشت بە (عبداللە کوڕی زبیر) و وتی: ئەی برازای خۆم! قەرزی سەر براکەم چەندە؟ دەڵێت: منیش شاردمەوەو راستم پێ نەوت و وتم: سەد هەزار، (حکیم) وتی: بەخوا وا دەزانم ماڵ و سامانەکەتان بەشی ئەوە ناکات، منیش وتم: باشە ئەگەر دوو ملیۆن بێت چی دەڵێی؟ وتی: وا دەزانم توانای دانەوەی ئەوەتان نیە، ئەگەر بۆتان نەدرایەوە ئاگادارم بکەن من یارمەتیتان دەدەم..

---

[1] شوێنێکە لە بەرزاییەکانی دەوروبەری مەدینە کە موڵکی خەڵکی مەدینەی لێبوو. —وەرگێڕ—

پێشتر (زبیر) زەویەکەی (غابە)ی بە سەد و حەفتا هەزار کڕیبوو، (عبدالله) بە ملیۆنێك و شەش سەد هەزاری فرۆشتەوە، پاش ئەوە جاڕیدا و وتی: هەرکەسێ هەقێکی لەسەر (زبیر) هەیە با لە (الغابە) بیتە لام، (عبدالله کوڕی جعفر) چوارسەد هەزاری لەسەر (زبیر) بوو، هات بۆ لای (عبدالله) و پێی وت: ئەگەر حەز دەکەن دەست لە قەرزەکەم هەڵدەگرم بۆ خۆتان بێت، (عبدالله) وتی: نەخێر، ئەمجا وتی: ئەگەر قەرزەکەشی هەمووی نادەنەوە و هەندێکی دوا دەخەن، من پەلەم نیە، کەی دەمدەنەوە کەیفی خۆتانە، (عبدالله) وتی: نەخێر هیچی دوا ناخەین، وتی: کەوابێ پارچەیەکم لە (الغابە) بۆ بڕبدەن، (عبدالله) وتی: باشە لەوێوە تا ئەوێ بۆ تۆ بێ، دەڵێت: ئەو پارچەیەی لە (الغابە)ی پێ فرۆشت و دایە دەستی و قەرزەکەی بەتەواوی دایەوە، هێشتا لە (غابە) چوار پشك و نیوی مابوو، دەڵێت: پاشان (عبدالله) چوو بۆ لای (معاویە) کە (عمرو کوڕی عثمان) و (منذر کوڕی زبیر) و (ابن زمعە)ی لەلا بوو، دەڵێت: معاویە پێی وت: (غابە)تان بە چەندە قرساندووە؟ وتی: هەر پشکێکی بە سەد هەزار درهەم، وتی: چەند پشکی ماوە؟ وتی: چوار پشك و نیوی ماوە، (منذر کوڕی زبیر) وتی: وا پشکێکیم بە سەد هەزار وەرگرت، (عمرو کوڕی عثمان)یش وتی: منیش پشکێکم بە سەدهەزار وەرگرت، (ابن زمعە)ش وتی: منیش پشکێکم بە سەد هەزار وەرگرت، (معاویە) وتی: چەند پشکی ماوە، (عبدالله) وتی: پشك و نیوێکی ماوە، (معاویە) وتی: منیش ئەوەم بە سەد و پەنجا هەزار وەرگرت.

دەڵێ: جا (عبدالله کوڕی جعفر)یش بەشەکەی خۆی بە شەش هەزار فرۆشت بە (معاویە).

دەڵێ: پاش ئەوەی کە (عبدالله کوڕی زبیر) لە دانەوەی قەرزەکان بوویەوە، کوڕانی (زبیر) پێیان وت: میراتەکەمان بەسەردا دابەش بکە، وتی: نەبەخوا ئێستا بەشی ناکەم، هەتاوەکو چوار ساڵ لەکاتی حەجکردندا جاڕ نەدەم کە کێ قەرزی بەلای (زبیر)ەوە با بێتە لامان بیدەینەوە.

دەڵێ: هەموو ساڵێ لە وەرزی حەجدا بەو جۆرە جاڕی دەدا، کە چوارساڵەکەی تەواوکرد، پاش ئەوە لە نێوانیاندا بەشی کرد و سێیەکە خێرەکەشی لە ماڵەکە جیاکردەوە، (زبیر) چوار ژنی هەبوو، هەریەکەیان ملیۆنێکی بەرکەوت، دەڵێت: هەموو ماڵەکەی پەنجا ملیۆن و دووسەد هەزار بوو.

ئەمەش لەو خێرە مەزنانەیە کە کوڕ پێشکەشی دایك و باوکی دەکات، لەگەڵ بڕوای تەواو بوون بە خوای گەورە لە ئاسانکردنی کاری خێر و بەجێهێنانی پەیمانەکانیدا، خوای گەورە من و تۆش بخاتە ریزی چاکەکارانەوە.

## بنەمای دووەم: پاڕانەوەو داوای لێخۆشبوون بۆیان:

(بخاري) لە (الادب المفرد)دا لە (محمد کوڕی سیرین)ەوە گێڕاویەتیەوە کە وتوویەتی: لای (ابوهریرە)ﷺ بووین، وتی: خودایە لە (ابوهریرە)ەو دایکی و ئەو کەسەی داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکات خۆش ببە، (محمد) وتی: ئێمەش داوای لێخۆشبوونمان بۆ دەکردن هەتاوەکو نزاکەی (ابوهریرە) ئێمەش بگرێتەوە.

پێشتریش فەرموودەی ((**الصلاة عليهما والأستغفار لهما**)) خرایە روو، هەر لە فەرموودەشدا هاتووە: ((**وولد صالح يدعو له**)) واتە: (منداڵێکی چاکی هەبێت کە بۆی بپاڕێتەوە).

هەر لە (ابوهریرە)ەوەﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: ((**إن الله Y ليرفع الدرجة للعبد الصالح في الجنة، فيقول: يا رب! أنى لي هذه؟ فيقول: بأستغفار ولدك لك**)).[1] واتە: (خوای بالادەست پلەوپایەی بەندەی چاك لە بەهەشتدا بەرز دەکاتەوە، بەندەکەش دەڵێت: ئەی پەروەردگار! ئەمەم لە کوێ بوو؟ خوای گەورە دەفەرموێت: بەهۆی پاڕانەوەو داوای لێخۆشبوونی کوڕەکەتەوەیە بۆت).

## بنەمای سێیەم: بەجێهێنانی سیلەی رەحم و چاکبوون بۆ هاوڕێ و دۆستیان:

(مسلم)[2] لە(ابن عمر)ەوەم گێڕاویەتیەوە کە ئەگەر بچوایەتە دەروە بەرەو مەککە گوێدرێژێکی هەبوو کاتێ کە لەسواری حوشتر بێزار بوایە سواری گوێدرێژەکە دەبوو و مێزەرێکیشی هەبوو سەری پێ دەبەست، رۆژێکیان بەسواری گوێدرێژەکەیەوە بوو، گەیشت بە دەشتەکیەك و پێی وت: ئەرێ تۆ کوڕی فلان کەس نیت؟ وتی: بەڵێ کوڕی ئەوم، گوێدرێژەکەی پێداو وتی: سواری ئەمە ببە و ئەم مێزەرەش لەسەر بکە، هەندێ لە هاوەڵان پێیان وت: خوا لێت خۆش بێت، گوێدرێژێکت هەبوو لەسەر پشتی پشووت دەداو مێزەرێکت هەبوو سەری خۆت پێ دەپێچا، دات بەو دەشتەکیە؟ ئەویش وتی: گوێم لێبوو کە پێغەمبەری خواﷺ دەیفەرموو: ((**إن من ابرّ البر صلة الرجل أهل ودّ أبيه بعد أن يولّي**)). واتە: (چاکترین چاکە

---

[1] رواه احمد والطبراني في الأوسط ورجالهما رجال الصحيح غير عاصم بن بهدلة وقد وثق كذا قاله الهيثمي في المجمع ١٠/٢١٠.

[2] ورواه احمد والبخاري في الأدب المفرد وأبوداود والترمذي. أنظر صحيح الجامع رقم ١٥٢٥.

ئەوەیە کە پیاو کەس و کاری ئاشناو دۆست و برادەری باوکی خۆی بەسەر بکاتەوە، پاش مردنی باوکی).

باوکی ئەو کابرایەش دۆستی (عمر) بووە.

پێشتریش ئەو فەرموودەیە خرایە روو: ((**وصلة الرحم التي لا توصل الاّ بهما وإكرام صديقهما**)).

(ابن حبان)یش لە (صحيح)ەکەیدا لە (ابوبردە)وە گێڕاویەتیەوە کە وتوویەتی: چووم بۆ (مدینە)، (عبدالله کوڕی عمر) هات بۆ لام و وتی: دەزانی بۆچی هاتووم بۆ لات؟ دەڵێ: منیش وتی: نەخێر، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خواﷺ بوو دەیفەرموو: ((**من أحبَّ أن يصل اباه في قبره فليصل إخوان أبيه بعدهُ**)). واتە: (هەرکەسێك پێی خۆشە لە گۆڕدا سیلەی رەحمی باوکی بەجێ بێنێ، با سەردانی دۆست و برادەرانی بکات پاش خۆی).

وتی: جا لە نێوان (عمر)ی باوکم و باوکی تۆدا برایەتی و دۆستایەتی هەبوو، منیش حەزم کرد ئەوە بەجێ بهێنم.[1]

لە (ابن عمر)یشەوەم کە پێغەمبەری خواﷺفەرموویەتی: ((**أحفظ ود ابيك لا تقطعه فيطفئ الله نورك**))[2] واتە: (دۆستایەتی باوکت بپارێزە و مەیپچڕێنە، چونکە گەر پچڕاندت خواش رووناکیت دەکوژێنێتەوە).

١ ورواه أبو يعلى. أنظر سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم ١٤٣٢.

٢ رواه الطبراني في الأوسط واسناده حسن كذا قاله الهيثمي في المجمع ١٤٧/٨.

## بنەمای چوارەم: خێرکردن بۆیان:

لە (عبدالله کوڕی عباس)ەوە ﷺ دەگێڕنەوە:[١] پیاوێك بە پێغەمبەری خوای ﷺ وت: دایکم مردووە، ئایا خێری بۆ بکەم سوودی پێ دەگەیەنێت؟ فەرمووی: بەڵێ، پیاوەکە وتی: ئەوا تۆ شاهێد بە کە حوشترێکی پشت نەکراوم هەیە، وا کردم بەخێر بۆی.

لە (عائشە)ەوەش گێڕاویانەتەوە[٢] کە پیاوێك بە پێغەمبەری خوای ﷺ وت: دایکم کت و پڕ کۆچی دوایی کرد، وا دەزانم کە گەر مەودای قسەکردنی هەبوایە خێری بۆ خۆی دەکرد، ئایا پاداشتی هەیە گەر من لە بری ئەو خێری بۆ بکەم؟ فەرمووی: بەڵێ.[٣]

(طبرانی)یش لە (الأوسط)دا گێڕایەتیەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: ((**ما على أحد إذا أراد أن يتصدق بصدقة أن يجعلها لوالديه إذا كانا مسلمين فيكون لوالديه أجرها ويكون له مثل أجورهما من غير أن ينقص من أجورهما شيء**)).واتە: (هیچی تێناچێت لەسەر هەر کەسێك کە ویستی خێرێك بکات بیکاتە هی دایك و باوکیشی گەر موسڵمان بوون، پاداشتەکەی بۆ دایك و باوکی دەبێت و خۆیشی وەك ئەوان پاداشتی بۆ دەبێت بەبێ ئەوەی کە هیچ لە پاداشتی ئەوان کەم بێتەوە).

(مالك) و (نسائی)ش لە (سعید کوڕی عمرو کوڕی شرحبیل کوڕی سعد کوڕی عبادە)ە لە باوکیەوە، ئەویش لە باپیریەوە گێڕاویەتیەوە، وتوویەتی: (سعد کوڕی عبادە) لە هەندێك لە غەزاکاندا لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشتبووە دەرەوە، دایکی لە مەدینە کەوتە سەرەمەرگ، پێیان وت: وەسیەت بکە، وتی: وەسێتی چی بکەم؟ماڵەکەم ماڵی (سعد)ە، ئەوەی وت و مرد بەر لەوەی کە (سعد) بگاتە لای، کاتێ (سعد) گەیشت ئەوەیان بۆ گێڕایەوە، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا گەر من خێری بۆ بکەم سوودی پێدەگات؟ فەرمووی: بەڵێ، (سعد) وتی: بێستانی ئەوەو ئەوە خێربێت بۆی، ناوی بێستانەکانی برد.

لە (ابوهریرە)ەوە ﷺ: پیاوێك بە پێغەمبەری خوای ﷺ وت: باوکم مردووەو ماڵ و سامانی لەپاش خۆی بەجێهێشتووەو هیچ وەسێتێکی نەکردووە، گەر من خێری بۆ بکەم ئایا دەبێتە هۆی هەڵوەرینی گوناهەکانی؟ فەرمووی: بەڵێ.[٤]

---

١ رواه الشيخان والنسائي وأبوداود.

٢ رواه الجماعة الاّ الترمذي.

٣ رواه ابن خزيمة في صحيحه ١٢٤/٤.

٤ رواه ابن خزيمة في صحيحه ١٢٣/٤ بسند صحيح.

## ئاو باشترین خێرە بۆیان:

(ابوداود) و (نسائی) لە (سعد کوڕی عبادە)ەوەﷺ گێڕاویانەتەوە کە وتوویەتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خواﷺ دایکم مردووە، چ خێرکردنێك زۆر باشە بۆی بکەم؟ فەرمووی: ئاو، ئەویش هەستا بیرێکی هەڵکەند و وتی: ئەمە خێری دایکی (سعد)بێت.

لە (جابر کوڕی عبداللە)ەوەﷺ گێڕاویانەتەوە کە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: **((من حفر ماءً لم يشرب منه كبد حرّي من جن ولا أنس ولا طائر الاّ آجره الله يوم القيامة، ومن بنى مسجداً كمَفْحص قطاة أو أصغر بنى الله له بيتاً في الجنة))**.[١] واتە: (هەرکەسێك بیری ئاوێك هەڵبکەنێت، هەرکەسێکی زۆرتینوو لە جنۆکە یا مرۆڤ یا باڵندە لێی بخواتەوە، خوای گەورە لەرۆژی قیامەتدا لەسەر ئەمە پاداشتی دەداتەوە، هەرکەسێکیش مزگەوتێك دروست بکات وەك هێلانە قەتێیەکیش بێت یان بچوکتر، خوای گەورە ماڵێکی لە بەهەشتدا بۆ دروست دەکات).

## بنەمای پێنجەم: حەجکردن بۆیان:

لە (ابو رزین)ەوەﷺ کە وتوویەتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ باوکم پیاوێکی بەساڵاچووەو توانای حەج کردن و عومرە و هات وچۆی نەماوە؟ فەرمووی: **((حُجّ عن أبيك وأعتمر))**.[٢] واتە: (حەج و عومرەکەی بۆ بکە).

لە (انس)یشەوەﷺ کە دەڵێ: پیاوێك هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خواﷺ و وتی: باوکم مرد و حەجی ئیسلامی نەکرد؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: **((أرأيت لو كان على أبيك دين أكنت تقضيه عنه؟))** واتە: ئایا ئەگەر باوکت قەرزێکی لەسەر بوایە دەتدایەوە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: **((فإنه دين عليه فأقضه))**[٣] واتە: ئەوەش قەرزە لەسەری و بیدەرەوە.

لە(ابن عباس)ەوە م دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: فلانی (جهنی) وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ! باوکم کاتێك مرد زۆر پیر بوو و حەجی نەکرد یان نەیتوانی حەج بکات؟ فەرمووی: **((حج عن أبيك))**[٤] حەج لەبری باوکت بکە.

---

١ رواه ابن خزيمة في صحيحه ٢/٢٦٩ قال المحقق مصطفى الأعظمي اسناده صحيح ورواه ابن ماجه.
٢ رواه الحاكم في مستدركه ١/٤٨١ وقال: صحيح على شرط الشيخين و لم يخرجاه.
٣ رواه البزار والطبراني في الأوسط والكبير واسناده حسن قال الهيثمي في المجمع ٣/٢٨٢.
٤ رواه ابن خزيمة في صحيحه ٤/٣٤٣ واسناده صحصح.

لە (زید بن ارقم)ەوەﷺ دە دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: **((إذا حج الرجل عن والديه تقبل الله منه ومنهما وأستبشرت أرواحهما في السماء وكتب عند الله باراً))**.[1] واتە: (ئەگەر کەسێك لەجیاتی باوك و دایکی حەج بکات، خوای گەورە لەویش و لەوانیش قبوڵ دەکات و روحەکانیان لە ئاسماندا خۆشحاڵ دەبن و لەلای خوداش بە چاکەکار دەنوسرێت).

لە (ابن عباس)ەوە م کە دەڵێت: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ و وتی: باوکم مرد و حەجی ئیسلامی لەسەر بوو، ئایا لەجیاتی ئەو حەج بکەم؟ فەرمووی: **((ارأيت لو أن أباك ترك ديناً عليه أقضيته عنه؟))**واتە: (ئەگەر باوکت قەرزێکی لەسەر بێت و بۆ تۆی بەجێ بهێڵێ بۆی دەدەیتەوە؟)

وتی: بەڵێ، فەرمووی: **((أحججْ عن أبيك))**[2] واتە: لەجیاتی باوکت حەج بکە.

لە (جابر کوڕی عبدالله)ەوەﷺ گێڕاویانەتەوە کە وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: **((من حجّ عن أبيه وأمه قضى عنه حجَّته، وكان له فضل عشر حجج))**[3] واتە: (هەرکەسێك لەبری دایك و باوکی حەج بکات، ئەوا حەجەکەی بۆ قەزا کردوونەتەوەو بۆخۆشی چاکەی دە حەجی هەیە).

## بنەمای شەشەم: پەلەکردن لە ئەنجامدانی کردەوەی چاك بۆ شادی خستنە دڵیان پاش مردنیان:

(ابن کثیر) لەبارەی ئایەتی ﴿وَقُلْ اعْمَلُوا فَسَيَرَى اللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ وَالْمُؤْمِنُونَ..﴾التوبة/١٠٥. وتوویەتی: باسکراوەو هاتووە کە کاروکردەوەی مرۆڤی زیندوو نیشانی مردووی خزم و هۆز و کەسە نزیکەکانی دەدرێت لە بەرزەخدا، پاشان ئەو فەرموودەیەی هێنایەوە کە (ابوداود الطيالسي) هێناویە بەسەنەدی خۆی لە (جابر)ەوە کە دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی:

**((إن أعمالكم تعرض على أقاربكم وعشائركم، فإن كان خيراً استبشروا به، وإن كان غير ذلك قالوا: اللهم ألهمهم أن يعملوا بطاعتك))**. واتە: (کاروبارەکانتان نیشانی مردوانی خزم و هۆزتان دەدرێت، خۆ گەر چاك بوون پێی دڵخۆش دەبن، گەر بەپێچەوانەی ئەوەشەوە بوو ئەوا دەڵێن: ئەی خودایە یارمەتیان بدەی تا کاروکردەوەیان بەپێی فەرمانی تۆ بێت).

---

١ رواه الدارقطني ٢/٢٦١ وقال العزيزي في شرح الجامع الصغير: هذا حديث صحيح.

٢ رواه الدارقطني ٢/٢٦٠.

٣ رواه الدارقطني ٢/٢٦٠.

پاشان ئەو فەرموودەی ئیمام (احمد)ی بەسەنەدی خۆی لە (انس)ەوەﷺ هێناوە کە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: **((إن أعمالكم تعرض على أقاربكم وعشائركم من الأموات، فإن كان خيراً استبشروا به، وإن كان غير ذلك قالوا: اللهم لا تُمتهم حتى هديهم كما هديتنا))**. واتە: (کاروکردەوەکانتان نیشانی خزمانی نزیك و کەس و کاری مردوتان دەدرێت، خۆ گەر چاك بوو ئەوا دڵخۆش دەبن پێی، خۆ گەر وەهاش نەبوو ئەوا دەڵێن: خوایە نەیانمرێنی هەتا هیدایەتیان دەدەیت هەروەك چۆن ئێمەت هیدایەت دا).

ئیمام (ابن مبارك)یش بە سەنەدی خۆی لە (ابودرداء)ەوە گێڕاویەتیەوە کە دەیوت: کاروکردەوەکانتان نیشانی مردوانتان دەدرێت، ئەوانیش دڵخۆش و دڵگران دەبن، پاشان دەیوت: خودایە من پەنات پێدەگرم لەوەی کە کردەوەیەك ئەنجام بدەم کە ببێتە مایەی ناشیرین بوونم لای (عبدالله کوڕی رواحە)ی خاڵم، لە پێغەمبەری خواﷺ دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: **((تُعرض الأعمال يوم الأثنين والخميس على الله تعالى وتعرض على الأنبياء وعلى الآباء والأمهات يوم الجمعة فيفرحون بحسناهم وتزداد وجوههم بياضاً وإشراقاً، فأتقوا الله، ولا تؤذوا موتاكم))**.[1] واتە: (کاروکردەوە رۆژانی دووشەممەو پێنج شەممە نیشانی خوای گەورە دەدرێت، و رۆژانی هەینیش نیشانی پێغەمبەران و باوکان و دایکان دەدرێت، بە کاروکردەوەی چاکیان دڵخۆش دەبن و روویان زیاتر سپی و گەش دەبێتەوە، دەی ئێوەش لەخواترسن و تەقوای خواتان هەبێت و ئازاری مردوانتان مەدەن).

لە(ابوهریرە)ەوەﷺ گێڕاویانەتەوە کە وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: **((إن مما يلحق المؤمن من عمله وحسناته بعد موته علماً علمه ونشره، أو ولداً صالحاً تركه، أو مسجداً بناه، أو بيتاً لابن السبيل بناه، أو نهراً كراه، أو صدقة أخرجها من ماله في صحته وحياته تلحقه من بعد موته))**.[2] واتە: (ئەوەی لەپاش مردن بە بڕوادار دەگات لە کاروکردەوەو چاکەکانی: زانست و زانیارییەکە کە فێری بووەو بڵاوی کردۆتەوە، یاخود منداڵێکی چاکی لەدوای خۆی بەجێهێشتبێت، یا مزگەوتێکی دروست کردبێت یاخود خانوویەکی بۆ کەسانی نەدار دروست کردبێت، یان بیرێکی هەڵکەندبێت، یاخود خێرێك کە لە ماڵەکەی لە تەندروستی و ژیانی خۆیدا سەرفی کردبێت پاش مردنی پێی دەگات).

---

١ وأورده في الجامع الصغير وقال: رواه الحكيم الترمذي عن والد عبدالعزيز رامزاً الى حسنه هكذا قاله الشيخ عبدالله سراج في كتابه (الإيمان بعوالم الآخرة)ص٩٦.

٢ رواه ابن خزيمة في صحيحه ١٢١/٤ بسند حسن لغيره لشواهده.

پێشتریش ئەو فەرموودە (صحیح)ەمان هێنایەوە کە دەفەرموێت: **((إذا مات الإنسان أنقطع عمله الاّ من ثلاث: صدقة جارية، أو علم ينتفع به، أو ولد صالح يدعوا له)).**[١] واتە: (کاتێ ئادەمیزاد دەمرێت، کاروکردەوەی کۆتایی پێ دێت، تەنها ئەم سیانە نەبێت: خێرێکی بەردەوام و نەبڕاوە، یان زانست و زانیارییەك کە خەڵك لێی سوودمەند بن، یان منداڵێکی چاك کە دوعاو نزای باشی بۆ بکات).

خوای گەورە لەو سێ خاسیەتە رزقی من و تۆش بدات و سەرکەوتوومان بکات لە بەجێهێنانی فەرمانەکانی و ئەو کارانەی مایەی رەزامەندیەتی.

## بنەمای حەوتەم: سەردانی گۆڕیان:

(مسلم) لە (ابوهريرە)ەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە وتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ سەردانی گۆڕی دایکی کرد و گریا و ئەوانەش لە دەوری بوون گریان، پاشان فەرمووی: **((أستأذنت ربي في أن استغفر لها فلم يأذنْ لي، واستأذنته في أن أزور قبرها فأذن لي، فزوروا القبور فإنها تذَكِّرُ الموت)).** واتە: (مۆڵەتم لە پەروەردگارم خواست کە مۆڵەتم بداتێ داوای لێخۆشبوونی بۆ بکەم، مۆڵەتی نەدام، مۆڵەتیشم خواست کە سەردانی گۆڕەکەی بکەم، مۆڵەی پێ دام، دە ئێوەش سەردانی گۆڕستان بکەن، چونکە مردنتان دەهێنێتەوە یاد).

لە (ابوبريدە)ەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە کە وتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **((كنتُ نهيتكم عن زيارة القبور، فقد أُذن لمحمد في زيارة قبر أمه، فزوروها، فإنها تُذَكِّرُ الآخرة)).**[٢] واتە: (بەر لەئێستا رێگری سەردانی گۆڕم لێ کردبوون، ئەوا ئێستا (محمد) مۆڵەتی دراوە کە سەردانی گۆڕی دایکی بکات، ئێوەش سەردانی گۆڕستان بکەن، چونکە قیامەتتان دێنێتەوە یاد).

لە گێڕانەوەی (حاکم)یشدا هاتووە:[٣] پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ هەزار سواری چەکداردا سەردانی گۆڕی دایکی کرد، هیچ رۆژێك نەبینراوە لەو رۆژە زیاتر بگری.

---

١ رواه مسلم وابن خزيمة في صحيحه ورواه أحمد ٢/٣٧٢.

٢ رواه الترمذي وقال حديث حسن صحيح.

٣ المستدرك (٣٧٥/١) وقال صحيح على شرط الشيخين واقره الدهبي.

## بنەمای هەشتەم: بەجێهێنانی سوێندیان و نەبوونە هۆی جنێو پێدانیان:

لە (عبدالرحمن کوڕی سمرە)ەوە کە وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((من بـرَّ قسمهما وقضى دينهما ولم يستسب لهما، كُتِبَ باراً وإن كان عاقاً في حياته.. ومن لم يـبر قسمهما ويقضي دينهما وأستسب لهما كتب عاقاً وإن كـان بـارّاً في حياتـه)).[١] واتـە: (هەرکەسێك سوێندیان بەجێ بهێنێت و قەرزیان بۆ بداتەوەو نەبێتە هۆی جنێو پێدانیان، ئـەوا بە چـاکەکار دەنووسـرێت ئەگەرچـی لـە ژیانیانـدا گوێڕایـەڵیان نـەبووبێت... ئـەو کەسـەش گوێڕایەڵی سوێندیان نەبێت و قەرزیان بۆ نەبژێرێت و ببێتە هۆی جنێو پێدانیان، بە سەرکەش و ناگوێڕایەڵ ناوی تۆمار دەکرێت با لەکاتی ژیانیاندا گوێڕایەڵیان بووبێت).

## بنەمای نۆیەم: ڕۆژووگرتن لەبری ئەوان:

لە (عبدالله کوڕی بردە)ەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتیـەوە کـە وتوویـەتی: ئافرەتێـك هاتە خزمەت پێغەمبـەری خـواﷺ و وتـی: دایکـم مـردووەو ڕۆژووی دوو مـانگی لەسـەرە؟ پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((صومي عنها)) لـەبری ئـەو بـەڕۆژوو بـە. ئافرەتەکـە وتـی: حەجیشی لەسەرە؟ فـەرمووی: ((فحجي عنـــها)) لـەبری ئـەو حـەجیش بکـە، ئـەمجا وتـی: جارییەیەکم هەبوو پێم بەخشیبوو، فەرمووی: ((قد آجرك الله وردها عليك المـيراث)) خـوا پاداشتی خێرەکەی دایتەوەو جاریەکەی لە میراتدا بۆ گێڕایتەوە.[٢]

---

١ رواه الطبراني في الأوسط وسكت الهيثمي في المجمع ١٤٧/٨ عن سنده.

٢ رواه الحاكم في مستدركه ٣٤٧/٤ وقال صحيح الأسناد و لم يخرجاه وأقره الذهبي.

# بەندی پێنجەم

## شێوازی تەمبێکردنی منداڵ

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((ما أعطي أهل بيت الرفق الاّ نفعهم ولا منعوه الاّ ضرهم)).[١] واتە: (خوای گەورە نەرم و نیانی بەخشیبێتە هەر ماڵێك، سوودی پێ‌گەیاندوون، هەرماڵێکیشی لێ بێ بەش کردبێت لێی زەرەرمەند بوون).

**دەستپێك.**

**بنەماکانی تەمبێکردنی[٢] منداڵ:**

**بنەمای یەکەم: تەمبێکردن پێداویستیەکی پەروەردەییە.**

**بنەمای دووەم: ڕاستکردنەوەی هەڵەی منداڵ لە پێشدا فیکریی و، پاشان کرداریی.**

**- ڕاستکردنەوەی فیکری هەڵە.**

**- ڕاستکردنەوەی هەڵە بە فێرکاری کرداریی.**

**بنەمای سێیەم: پلەبەندی لە تەمبێکردنی منداڵدا.**

**قۆناغی یەکەم: نیشاندانی قامچی بە منداڵان.**

**قۆناغی دووەم: گوێ ڕاکێشان.**

**قۆناغی سێیەم: لێدان و ڕێساکانی.**

**ڕێسای یەکەم: دەست پێکردنی لێدان لە تەمەنی دەساڵیەوە.**

**ڕێسای دووەم: زۆرترین لێدان بۆ تەمبێکردن سێ‌جارە، بۆ تۆڵەش دە جارە.**

**ڕێسای سێیەم: پابەندبوون بە خەسڵەتەکانی ئامێری لێدان و ڕێگای بەکارهێنانی و شوێنی بەکارهێنانی.**

**ڕێسای چوارەم: لەکاتی توڕەبووندا نابێت لێدان هەبێت.**

---

١ رواه الطبراني بإسناد صحيح. أنظر سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم ٩٤٧.

٢ تەمبێکردن (التأديب): واتە: (التهذيب والمجازاة) پاکخویی کردن و سزاو پاداشت. المعجم الوسيط ١/ ١٠

**ڕێسای پێنجەم: دەست لە لێدانی منداڵ هەڵگرە گەر ناوی خوای هێنا.**

**(( لێدانی باوك بۆ منداڵەكەی، وەك پەینە بۆ كشتوكاڵ ))**

**( لوقمان ئامۆژگاری كوڕەكەی دەكات )[1]**

**(( خوایە پەنات پێدەگرم لە:**

**خرا پەكاری ڕۆژگارێك كە منداڵیان تێدا یاخی دەبێت و،**

**گەورەكانیان تێیدا پلان و تەڵەكەیی دادەنێن و،**

**ئەجەلیان تێدا نزیك دەبێتەوە )**

**( هرم كوڕی حیان )[2]:**

**( منداڵ گەر لە سەرەتای گەشەكردنیەوە پشتگوێخرا،**

**بەزۆری ڕەوشت خراپ و درۆزن و حەسود و دز و قسەهێنەر و قسەبەرو خۆ هەڵقورتێنەر و پێكەنینی نابەجێ و فێلباز و بێشەرم دەردەچێت،**

**جا بەهۆی تەمبێكردنەوە لەهەموو ئەوانە دەپارێزیت ).**

**ئیمام (غزالی):**

١ كتاب (العيال) لإبن أبي دنيا (١/٥١٠).

٢ حلية الأولياء ٢/١٢٠.

## دەستپێك:

لە دەروازەی پێشوودا شێوازە پەروەردەییەکانی پێغەمبەرمانﷺ خستە روو، ئیدی فیکری بێت یان دەروونی، خۆ گەر هیچ رێگاچارەیەکت بەدی نەکرد لەگەڵ منداڵەکەتدا، مانای ئەوەیە کە ئەو منداڵە پێویستی بە چارەسازی تەمبێکردن هەیە، تا هەست بەوە بکات، کە کارەکە گرنگ و بەراستیە و هیچ گاڵتەیەکی تێدا نیە، و هەتا چێژی ئێش و ئازاری تەمبێکردن بکات ونرخی ئەو سۆزو نەرمی و خۆشەویستیە بزانێت، کە پێشی تەمبێکردنەکە دایك و باوکی بەرامبەری هەیانبوو، و هەست بە پێویستی ملکەچبوون و گوێڕایەڵی و رەوشت جوانی و رەفتار جوانی بکات.

بەڵام کامەیە بنچینەکانی تەمبێکردن و چۆن باوك منداڵەکەی تەمبێ بکات و ئەو فەرمودەیەی پێغەمبەری خواﷺ بێنێتە دی کە دەفەرموێت: ((**لأن يؤدب الأب ابنه خير له من أن يتصدق بصاع**)).[1] واتە: (باوك منداڵەکەی تەمبێبکات (فێری ئەدەب و رێزی بکات)، چاکترە بۆی لەوەی کە بە مشت خێر بکات).

پێش هاتنە ناو ئەم بابەتە دەبێ واتای چەمکی فیقهی (تەمبێکردن) بزانین، لەم رووەوە (کاسانی) دەڵێ:[2]

منداڵ بۆ ئەدەب وەرگرتن تەمبێ دەکرێت نەك بۆ سزادان، چونکە ئەو لە پێڕی تەمبێکردنە، ئەی نابینیت لەوەی کە پێغەمبەری خواﷺ گێڕاویانەتەوە و فەرموویەتی: ((**مروا صبيانكم بالصلاة اذا بلغوا سبعاً، وأضربوهم عليها اذا بلغوا عشراً**)). واتە: (نوێژ بە منداڵەکانتان بکەن لە حەوتساڵیدا، و لە سەر نوێژنەکردن لێیان بدەن لە دەساڵیدا).

ئەوەش رێگای تەمبێکردن و پاکخوویکردنە نەك بە رێگەی سزادان، چونکە دەبێتە مایەی تاوان، کاروکردەوەی منداڵیش بە تاوان دانانرێت بە پێچەوانەی شێت و ئەو منداڵەی کە ژیر نیە، لەبەر ئەوەی ئەو دوانە نە لە پێڕی سزادانن و نە لە پێڕی تەمبێکردنن.

١ رواه الترمذي.

٢ في كتابه (بدائع الصنائع) ٧/٦٣.

## بنەمای یەکەمی تەمبێکردن: تەمبێکردن پێویستیەکی پەروەردەییە:

تەمبێکردن تۆڵەسەندنەوە نیە لە منداڵ، بەڵکو ئامانجەکەی پەروەردەییەو هۆکارەکەشی هەر پەروەردەییە.

(ابن الجزار القيرواني)یش تەمبێکردنی منداڵی بچووکی بەپێویست زانیوە، و وتوویەتی: منداڵ زۆر بە ئاسانی ملکەچ دەکرێ، زۆر بەچاکی شت وەردەگرێ و قبوڵی دەکات، گەر یەکێك پێی وتین: هەندێك منداڵ هەن بە ئاسانی خووڕەوشت وەردەگرن و هەندێکی دیکەش وەها وەری ناگرن، هەروەها لەنێو منداڵاندا دەبینن هی وایان هەیە شەرم ناکات و هی واش هەیە زۆر شەرمنە، و لە نێویاندایە گرنگی دەدات بەوەی کە فێر دەکرێت و سوورە لەسەر فێربوون و کۆششی بۆ دەکات، هی وەهاش بەدی دەکەین زوو بێزار دەبێت لە فێربوون و رقی لێ دەبێتەوە، هەروەها منداڵی وەها دەبینین کە خاوەن چاودێرین و حەز لە فێربوون دەکەن، گەر پیایاندا هەڵدرا زانینی زۆر دەبێت، لە نێویشیاندا هەیە گەر خۆت یا مامۆستاکەی سەرکۆنەی کرد و قسەی پێوت ئەوجا فێر دەبێت، هی وەهاش هەیە هیچ فێرنابێت تا هەندێکی لێ نەدرێت، هەروەها جیاوازییەکی زۆری دژیەك بەدیدەکەین لەنێوان ئەوانەی لە دوبارەبونەوەی فێربوون بێزار دەبن و ئەوانەی حەزیان لێیەتی.

جاری وەهاش هەیە کە لەنێو منداڵاندا منداڵی وا دەبینین حەزی لە درۆکردنە، هی وەهاش بەدیدەکەین حەزی لە راستگۆییە، جا جیاوازی زۆریش بەدی دەکرێت لە خووڕەوشتیاندا، و دژایەتیش لە سروشتیاندا هەیە، واتای ئەو قسەیەی تۆ چیە کە دەڵێی: ئومێد وایە کە منداڵان هەر لە منداڵیەوە خووڕەوشت فێر بکرێن و تۆش لەوانەی کە دەڵێیت ئەمە لە سروشتەوەیە بەبێ تەمبێکردن فێربوون، ئایا وای بۆ دەچیت کە ئەدەب دادان سروشت و خوی ناپەسەند بگۆڕێت بۆ خووڕەوشتی چاك و پەسەندکراو؟

بە خاوەنی ئەم وتانە دەڵێین: بەڵام ئەوەی باست کرد لە رەوشتەکانی منداڵان و جیاوازیان و ئەوەی کە دەڵێت: ئایا وای بۆ دەچیت کە ئەدەب دادان سروشت و خوی ناپەسەند بگۆڕێت بۆ خووڕەوشتی چاك و پەسەندکراو؟ سوێند بەخوا ئەمە وایە، ئەو کەسەی خاوەنی سروشتێکی ناپەسەندە بەهۆی پشتگوێخستنیەوە لە منداڵیدا و وازلێ هێنانی بووە کە رابێت لەسەر هەر شتێ کە حەزی لێی بوبێت و لەگەڵ سروشتیدا بگونجێت لەوەی کە ناپەسەندە یاخود فێری شتانێك بێت کە ناپەسەندن کە لەوانەیە لە رەمەك(غەریزە)یدا نەبێت، چونکە ئەدەب وەرگرتن

پاش ئەوەی کە ئەو شتانەی بەسەردا زاڵ بوون ئـەوا گوێزانـەوەی گـران و نارەحـەت دەبێـت و توانای وازهێنان و جیابوونەوەی نیە لەوەی کە بە منداڵی فێری بووە، یـەکێك لـە پیتۆڵـەکان وتویەتی: زۆر کەس ڕێچکەی خراپیان بەهۆی خووڕەوشتەکانی منداڵیەوە وەرگرتووە، کـە ئـەو کاتە تەمبێ نەکراون و چاکسازی خووڕەوشتیان نەکراوە، بەچاکی بەڕێوە نەبراون.

لەبەر ئەوەیە کە ئێمە فەرمانمان پێکراوە منداڵان لـە کـاتی منداڵیـدا ئـەدەبیان دابـەین، چونکە ئەوان ویستی ڕەفتارەکانی خۆیانیان نیە بەوەی کە فەرمانی پێدەکرێت لەڕێبازی جوان و کارو کردەوەی پەسەند و ڕێگای بێ وێنە، گەر تا ئەو کاتە خوونەریتی خـراپ بەسـەریاندا زاڵ نەبوو بوو، کە ببێتە ڕێگر لەبەردەم ئەوەی، کـە دەیانـەوێت فێربکـرێن، جا ئەوکەسـەی کـە منداڵەکەی بە بچووکی ڕاهێنا لەسەر ئەدەب و کاروکردەوەی پەسەند و ڕێبـازی جـوان، ئـەوا بەوە پلەوپایەو خۆشەویستی و ڕێزی دەست دەکەوێت، و دەگاتە ئەوپەڕی بەختەوەری، ئەوەیش کە وازی لەمە هێنا کە ئەو کارە بکات و بەمنـداڵی ئـەدەبی منداڵەکـەی دابـدات و دەسـتی هەڵگرت لە چاودێریکردنی، ئەوە دەبێتە هۆی کەم و کورتیـەی مـەزن و نـەفس نزمـی، کـە لەوانەیە پلەوپایەی ئەو کارەی کاتێك بزانێت کە توانای گێڕانەوەی نـەبێت و کاتـێ تێبگـات ئەوەی کە لەدەستی چووە تووشی پەشیمانی بێت و بزانێت کە لەبەرهەمی هەڵەکردنـە، لەبـەر ئەمەیە کە ئێمە لەنێو خەڵکیدا دەبینین ئەو کەسەی کە دەزانێت ڕێبازەکانی خراپـە و ڕێگـای چاکەو پەسـەندکراوی لا شـاراوە نیـە و بـەڵام بەلایـەوە گرانـە کـە بـەرەولای بـچێت لەبـەر پێشخستنی ئەو خووەیەوەیە کە لەسەری ڕاهاتووە.

خۆ گەر بەهۆی شەرمکردن لە خەڵك زۆری لەخۆی کرد روکەشـی خـۆی بـە هەنـدێك لـەو ڕەوشتانە دەرخست، ئەوا کە کەسیان لێ دیار نەبوو دەگەڕێنەوە بۆ لای ئەو ڕێبازانەی کـە لـە ڕەمەکیدا ڕەگی داکوتاوە، لە ڕاستیدا خوو (عـادة) ئەوەیە کە مرۆڤ زیـاتر بـەلای خووەکەیـدا دەچێت و لەسەری سوور دەبێت، و دەستی پێوە دەگرێت..

کەواتە لە هۆکارە خراپەکاندا هیچ شتێك نیە ئەوەندە هۆکارێکی بـەهێز بێـت ئەگـەر لـە سروشتیدا وەك ئەو شتە هەبێت کە لەسەری ڕاهاتووە, خۆ گەر لەو خووەدا یارمەتی نـەدرێت، ئەوا بە تەنها خوو لەوەدا دەگاتە پلەیەکی بەهێز گەر ڕەگی داکوتا و جێگیر بـوو و بەتـەواوی بەسەریدا زاڵ بوو، هەروەها کاری خوو لەسەر شتە هەستپێکراوە باشەکان، خۆ گەر منداڵێکت بینی کە سروشت و خووی بـاش بـوو، ئـەوا ئـەو منداڵـە خەسـڵەتە چـاك و بـەڕێزەکانی لێ

جیانابنەوە، چونکە لە دوو لای بەهێزەوە لەسەری نەخش کراوە، هەروەك ئەوەی تر خووڕەوشتی ناپەسەندی پیسی لێ جیانابێتەوە، چونکە لەو دوو لایەوە لە سەری نەخش کراوە، مەبەستم خوو و سروشتە (العادة والطبیعة)، هەرچەندە هەندێك لە بیریاران دەڵێن: (العادة طبیعة ثانیة: خوو و نەریت سروشتی دووەمە)، شوێنی خوویش کە ئەو جێگەیە بێت پێویست دەبێت کە ئەدەبی منداڵ دابدرێت و لەسەر شتی جوان رابهێنرێت، و پەروەردەیەکی چاکیان بکرێت تاوەکو -ئەگەر سروشتیان سوودی تەمبێکردن و بەردەوامی قبوڵ کرد- چاك و بەڕێز دەربچن، وە ئەگەر گونجا کە لەنێو منداڵاندا کەسی وا هەبێ کە ئەوە وەرنەگرێت، ئەوا نابێت پشتی تێ بکەین و خۆمانی لێ گێل بکەین لەوەی، کە پێویستە لەکاتێکی وادا کە دەکرێت تەمبێ بکرێن و دواییش لۆمەی خۆمان بکەین و بڵێین:

ئێمە هەڵەمان کردووە کە لەکاتی خۆیدا ئەو وەختەی دەکرا تەمبێ بکرێن و ئەدەب وەربگرن، سەرزەنشتمان نەکردن، ئەوەشمان زانیوە کە هەڵەی بچووك لەسەرەتا و بنەڕەتی شتەکاندا، زیانی سەرەنجامەکەی کەم نییە، هەروەها سەرەنجامی راست و دروست، بەهۆی ئەوەوە بووە کە شتەکان رەنگدانەوەی بنەماو بنچینەکانیانن، بەم جۆرە بە تێروتەسەلی روونمان کردەوەو بەپێی پێویست ئاشکرامان کرد، و بۆ ئەو کەسە روون بویەوە کە لەم قسەیەمان تێگەیشتووە: راستیەکەی ئەوەیە کە ئەدەبی منداڵ دابدرێت، جا ئەگەر سروشتەکەی سروشتی ئەو کەسە بوو کە بەئەدەب و ژیر نەبوو، ئەوا ئەمە روونکەرەوەیە بۆ رێگر لە رێگەی راست، بەڵام گەر منداڵەکە سروشتی باش بوو، مەبەستم ئەوەیە کە خووی لەسەر شەرم و خۆشەویستی رێز و هۆگری و حەزکردن بە راستگۆیی راهاتبوو، ئەوا تەمبێکردنی ئاسان دەبێت، چونکە پیاهەڵدان و زەمکردن لە چاکە یان خراپەدا دەیگەیەننە پلەیەك، کە بە سزادان پێی ناگات، خۆ گەر منداڵەکە بێشەرم بێت و رێزی کەرامەتی لا نەبێت و هۆگری کەم بێت و حەز بەدرۆ بکات، تەمبێکردنی ناڕەحەت دەبێت، بۆیە دەبێت لە بەرامبەر ئەوانەدا تۆقاندن و ترساندن بەکار بهێنرێت لەکاتی ئەنجامدانی خراپەدا، پاشان گەر ترساندنەکە سەرکەوتوو نەبوو ئەوا بە لێدان بەدی دەهێنرێت، هەروەها پێویست بە بەسەرکردنەوەی قسە و دانیشتن و هەستانی لەنێو خەڵکدا و خەوتن و جوڵە و خواردن و خواردنەوەی دەکات، و لە هەموو ئەوانەدا پابەند دەکرێت بەهەموو ئەوانەی عاقڵمەندان خۆیان پێوە پەیوەست کردووە، هەتا وەکو ئەوان و هاوشێوەی ئەوان ببێتە خوویەك لە خووەکانیان.[١]

---

١ سیاسة الصبیان وتدبیرهم، ص١٣٤، تحقیق: د.محمد الحبیب السهیلة، طبع الدار التونسیة بتونس، وهو موجود في مکتبة الدار الوطنیة بحلب الشهباء.

خۆ گەر برِیارت دا لەگەڵماندا کە تەمبێکردن پێویستیەکی پەروەردەیی پاکخوویی راستکردنەوەیە بۆ منداڵ، واتای ئەوە دەگەیەنێ کە دایك و باوك و پەروەردەکاران بە ئاگابێن لە هەڵس و کەوتیاندا لەگەڵ منداڵ، و لە خوو و سروشتیان تێبگەن و جۆری سزاو رێگاکانی هەڵبژێرن.

## بنەمای دووەمی تەمبێکردن: راستکردنەوەی هەڵەی منداڵ بە شێوەیەکی فیکریی پاشان کرداریی:

گومانی تێدا نیە کە بنەبڕکردنی هەڵە لە رەگ و ریشەو بنەڕەتیەوە بە سەرکەوتنێکی گەورەو رۆشن و جوان لە پرۆسەی پەروەردەدا دادەنرێت، خۆ گەر لە سروشتی هەرهەڵەیەك راماین دەبینین کە بنەڕەتەکەی بۆ سێ شت دەگەڕێتەوە، یا ئەوەتا هۆکارەکەی فیکرییە، واتە منداڵ فیکرەیەکی راست و دروستی دەربارەی شتەکە نیەو لەلای خۆیەوە کارەکە دەکات و هەڵە دەکات، یا ئەوەتا هۆکارەکەی کردارییی بێت، بەو واتایەی کە منداڵەکە ناتوانێت کارێك بەچاکی ئەنجام بدات و پەنجەکانی لەسەری رانەهاتووەو هەڵە دەکات، یاخود هۆکارەکەی بۆ خودی منداڵەکە دەگەڕێتەوەو بە ئەنقەست هەڵە دەکات یاخود سروشتی وەك ئەو منداڵانەیە کە لاسارن و سوورن لەسەر هەڵە,, لەبەر ئەمە دیاریکردنی بنەڕەتی هەڵە نەهێشتنی زۆر ئاسان دەکات.

### یەکەم: راستکردنەوەی فیکریی هەڵەی منداڵ:

منداڵیش وەك هەر بوونەوەرێکی زیندوو ئەوەی نایزانێت زیاترە لەوەی دەیزانێت، خۆ گەر بیزانیبایە ئەوا راست و دروست دەڕۆیشت، وە لەبەر ئەوەیە کە مرۆڤ دوژمنی ئەو شتەیە کە نایزانێت، بۆیە دەبێت قۆناغی دروستی فێرکردن لە نادروستەوە یەکەمین هەنگاوی بێت بۆ راستبوونەوەی، پێغەمبەریشﷺ بونیە فیکریەکانی منداڵی راست دەکردەوە گەر هەڵەی بکردایە، لەوەشدا شێوازی هەمەچەشنی خۆشویستراوی دەگرتە بەر کە بە نەرم و نیانی جودا دەکرایەوە، بە مەبەستی بۆ راستکردنەوەی فیکری منداڵ، ئەمەش رونکردنەوەیەتی بۆت:

(ابوداود) لە (عبدالرحمن کوڕی ابو عقبە)ەوە دەگێڕێتەوە -رەحمەتی خوای لێبێ-، ئەویش لە باوکیەوە، کە بەندەیەکی خەڵکی فارس بووە، وتوویەتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بووم لە غەزای (أحد)، دام لە موشریکێك، وتم: بیخۆ ها.. من کوڕێکی فارسیم، پێغەمبەری خواﷺ ئاوڕی لێ دامەوەو فەرمووی: ((هلا قلت: وأنا الغلام الأنصاري؟! إبن أخت القوم منهم)). واتە: (بۆ نەتوت من کوڕێکی ئەنصاریم، خوشکەزای هۆزەکەی ئەوانم).

ئەم فێرکردنە چەند جوانە کە لەناوەڕاستی جەنگدا؟ پاشان چی؟ فێرکردن بە دانانی ڕێسایەك بۆی تا لە ژیانیدا لەسەری بڕوات" ((إبن أخت القوم منهم))، باشە چارەسازیەکە چۆن بوو؟ ئەوەش بەجوانی و نەرم و نیانی و باڵنەرمی بەرامبەری ((**هلا قلت**)) ئای چەند جوانە ئەو خۆ بەکەم زانینە لە فێرکردندا، پێغەمبەری خواﷺ بەو شێوەیە بە کوڕێك دەفەرموێت: (هلا)، دەسا سلاوی خوات لێبێ ئەی گەورەو ڕێنموونیکار و مامۆستا و پێشەنگم.

لەهەردوو (صحیح)ەکەشدا لە (ابوهریرە)ەوەﷺ گێڕاویانەتەوە کە وتوویەتی: (حسن کوڕی علی)م دەنکە خورمایەکی لە خورمای زەکات برد و خستیە دەمیەوە، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((**كخ.. كخ.. ارْمِ بها، أما علمتَ أنّا لا نأكل الصدقة؟!**)). واتە: (قخ.. قخ.. فڕێی دە، ئەی نەتزانیوە کە ئێمە زەکات ناخۆین).

(نووی): دەڵێت:[1] وتنی (كخ.. كخ) بە (سکونی – خ–ەکە) و بە (ژێرەی - خ-ەکە) لەگەڵ (تنوین) دەوترێت، ئەوەش وشەی سەرزەنشتە بۆ منداڵ لەبارەی شتی قێزەونەوە بەکار دێت، (حسن)یش ﷺ لەو کاتەدا منداڵ بوو.

لەم فەرمودەیەدا زیادەیەکی ناسك و جوانی تێدایە کە بریتیە لە سەرزەنشتکردن بەو وشەیە (كخ.. كخ)، پاشان زۆری نەبرد پێغەمبەری خواﷺ هۆکاری نەخواردن و حەلاڵ نەبوونەکەی بۆ شیکردەوە، تا لە هەموو ژیانیدا بۆی ببێتە ڕێسایەکی فیکری گشتی ((**أما علمت أنّا لا تحلُّ الصدقة**))، ئەمەش بە شێوە دەربڕینێکی زۆر جوان: ((**أما علمت**= نەتزانیوە))؟! ئەمەش بۆ ئەوەی کە کاریگەری و شوێنەواری لەسەر دەروونی بەهێزتربێت.

ئەمەش فەرمودەیەکی دیکەیە کە تێیدا بانگی کوڕێك دەکات بە زمانێکی شیرینی جوان و بە وشەی (رويدك)؟:

(بخاری)و (مسلم) لە(انس)ەوەﷺ هێناویانە، کە وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ لە هەندێك لە سەفەرەکانیدا بوو، کوڕێکی ڕەشیش هەبوو پێیان دەوت (أنجشة)، کە هەڵبەستی دەوت تا حوشترەکەی بەخێرایی بڕوات و هەست بە ماندووبوون نەکات، پێغەمبەری خواﷺ پێی فەرموو: ((**ويحك يا أنجشة! رويدك سَوْقَك بالقوارير**)).واتە: (وای بۆ تۆ، ئەی (أنجشة)! لەسەرخۆبە با ئافرەتان گوێیان لێت نەبێ).

---

[1] في رياض الصالحين.

(ابوقلابە) وتوویەتی: مەبەستی ئافرەتان بوو.

هەڵوێستەکەی ڕۆژی عەرەفەش ڕاستکردنەوەی چوارەمە کە پێغەمبەری خواﷺ بە (ابن عباس)ی فەرموو: ((مه يا غلام! فإن هذا يوم من حفظ فيه بصره غُفِر له)). واتە: (نەکەی! ڕۆڵە، ئەمڕۆ ڕۆژێکە هەر کەس چاوی تێدا بپارێزێت خوای گەورە لێی خۆش دەبێت... مەبەستی ڕۆژی عەرەفە بوو)[1].

ئەمەش ڕاستکردنەوەیەکە لەگەڵ ناوهێناندا:

(ترمذی) لە (ام سلمە) م گێڕاویەتەوە کە وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ کوڕێکی ئێمەی بەدی کرد پێیان دەوت: (أفلح)، لە کاتی کڕنوش برندا فووی دەکرد، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((يا أفلح! ترِّب وجهك)) واتە: ئەی (أفلح)! دەم و چاوت لەسەر خۆڵ دانێ.

## شوێنپێ هەڵگرتنی هاوەڵان لە ڕاستکردنەوەی بیروبۆچوونی منداڵاندا:

لە (ابو الحكم الغفاری)ەوە کە وتویەتی: داپیرەم لە مامی (ابو رافع کوڕی عمرو)ەوە بۆی گێڕامەوە کە وتویەتی: مـن منـداڵ بـووم، بەردم لـە دارخورمـای ئەنـصارییەکان دەگـرت و دامدەتەکاند، جا بـە پێغەمبـەری خـواﷺ وتـرا: کـەوا ئـا لێـرەدا کوڕێـك هەیـە بـەرد لـە دارخورماکەمان دەگرێ" یان: بەرد لـە دارخورمـا دەگـرێ، جا بـردرام بـۆ لای پێغەمبـەری خواﷺو فەرمووی: ((يا غلام! لم ترمِ النخل؟)) ڕۆڵە بۆچی بەرد لە دارخورما دەگری؟

وتم: دەیخۆم، فـەرمووی: ((لا ترْمِ النخل، وكل مما سقط في أسفلها)). واتـە: (بـەرد لـە دارخورما مەگرە، ئەو خورمایانە بخۆ کە لێی دەکەوێتە خوارەوە).

وتی: پاشان پێغەمبەری خواﷺ دەستی بەسەرمدا هێنا و فەرمووی: ((اللهم أشبع بطنه)) واتە: (خوایە! سکی تێر بکەی)[2].

جا لەگەڵ ڕاستکردنەوەی فیکری منداڵ ڕێگەیەك بەدی دەکـەین کـە ئاشـنای دەکـات بـۆ گەیشتن بە مەبەستەکەی، منداڵەکە دەیەوێ خورما بخوات، پێغەمبەری خواشﷺ ڕێگەیـەکی شەرعی ڕاست و دروستی پیشاندا، کە بریتییە لەوەی ئەو خورمایە بخوات کـە لـە دارەکـەوە

---

١ رواه الطيالسي.

٢ رواه إبن أبي الدنيا في كتاب العيال (٤١٦/١) قال محققه: قال الترمذي: حديث حسن غريب صحيح، وقال: أخرجه أبوداود وإبن ماجه وأحمد والبيهقي في السنن الكبرى.

دەکەوێتە سەر زەوی، لەجیاتی ئەوەی کە لەدارەکە بدات و بەبێ مۆڵەتی خاوەنەکەی خورما لە دارەکە بێنێتە خوارەوە، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ دوای ئەم فێرکردنە دەستی بەسەریدا هێناو بۆی پاڕایەوە، ئەمەش شێوازێکی تاقانەیە، کە لە چراگەی پێغەمبەرێتی دەرچووە.

جا لە ئیسنادی ئەم فەرموودەیەدا چەند شتێکی جوان دەبینین کە بریتییە لە: گێڕانەوەی داپیرە لە مامەیەوە بۆ کچەزا، ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە لە پێشەوە جەختمان لەسەری کرد، ئەویش ئاوێتەبوونی خێزانی موسڵمانە بە تێکڕایی، و بەشداریکردنیەتی لە پەروەردەکردنی کوڕەزاو کچەزاکان، و برازا و خوشکەزا، ئەوەش چۆنیەتی لەبەرکردنی زانستە، کە وا گێڕەرەوەکە یەکێ لە نەوەکانی داپیرەیە، کە فەرموودەکەی لەو گێڕاوەتەوە، جا خێر و چاکەکە هەمووی بۆ بەشداربوانی گێڕانەوەی فەرموودەیە لە پێغەمبەرەوە ﷺ. ئەوەتا (أنس) ﷺ بیروبۆچوونی کچەکەی ڕاست دەکاتەوە:

(بخاري) و (نسائي) هێناویانە لە (ثابت البناني)ەوە: وتویەتی: لای (أنس) بووم، کچێکی خۆی لابوو، (أنس) وتی: ئافرەتێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و خۆی پێشکەش کرد و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا هیچ پێویستیەکت بەمن هەیە (منت دەوێت)؟ کچەکەی (أنس) وتی: چەند بێشەرم بووە، هاوار لەخۆم.. هاوار لەخۆم.. (أنس) وتی: ئەو ئافرەتە لەتۆ باشترە، پێغەمبەری ﷺ بەلاوە باش بووە بۆیە خۆی پێشکەش کردووە.

ئەوەش جێبەجێکردنی کرداریی ئەمیری باوەڕداران (عمر کوڕی خطاب)ـە بۆ فەرموودەکەی پێشوو:

لە (سنان کوڕی سلمه)وە، کە لە (بحرین) گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: لە مەدینە لەگەڵ چەند منداڵێك بەری خورمامان لێ دەکردەوە کە هێشتا پێنەگەیشتبوو، جا (عمر) ئێمەی بینی، و منداڵەکان هەڵاتن و منیش ڕاوەستام و هەڵنەهاتم، وتم: ئەی ئەمیری باوەڕداران! ئەو خورمایە با فڕێی داوە، (عمر) وتی: پیشانم بدە ببینم، کاتێ پیشانم دا، وتی: بڕۆ. وتم: ئەمیری باوەڕداران! ئەو منداڵانە هەڵاتن، بەڵام هەر تۆ بڕۆیت و ون بی و دیار نەمێنیت ئەو خورمایەی پێمە لێم دەستێنن، دەڵێ: جا لەگەڵم ڕۆیشت هەتا گەیشتمە شوێنی خۆم.[١]

١.رواه إبن أبي الدنيا في كتاب العيال (١/٤١٨).

ئا لێرەدا بایەخ پێدانی خەلیفەی موسڵمانان بە منداڵان و لێکۆڵینەوە لەگەڵیان، و مکوڕبونی لەسەر زانینی حەقیقەت، و داوای وەڵام کردنی لە منداڵەکە بە نەرمی و داناییەوە بەدی دەکەین، وە شارەزایی منداڵەکە بەدی دەکەین، بەڵگەی ئەوە نیشان دەدات کە باوکان حوکمی پێغەمبەری خوایانﷺ گەیاندووە بە منداڵەکانیان دەربارەی هەڵگرتنەوەی بەری ئەو خورمایەی کە لە دارەکەوە دەکەوێتە سەر زەوی.

پاشان بوێری منداڵەکە بەدی دەکەین لە داواکردنی یارمەتی لە ئەمیری باوەڕداران بۆ ئەوەی بە پارێزراوی بگاتەوە ماڵەوەی، تا لەدەست ئازاردانی هاوەڵەکانی رزگاری ببێت.

ئەوەتانێ (ابن عمر)یش هەڵەی منداڵان راست دەکاتەوەو فەرمودەی پێغەمبەری خوایانﷺ پێ رادەگەیەنێت:

لە هەردوو (صحیح)ەکەدا لە (ابن عمر)ەوەﷺ گێڕاویانەتەوە، کە بەلای هەندێك گەنجی قورەیشدا تێپەڕی باڵندەیەکیان کردبووە نیشان و تیریان تێدەگرت، هەر تیرێکیشیان هەڵە بکردایەو نەیپێکایە دەیاندا بە خاوەنی باڵندەکە، کاتێ (ابن عمر)یان بینی بڵاوەیان لێ کرد، (ابن عمر) وتی: کێ ئەمەی کرد؟ نەفرینی خوا لەو کەسەی ئەمەی کرد، پێغەمبەری خواشﷺ نەفرینی لەو کەسە کردووە کە خاوەن گیانێك بکاتە نیشانە.

ئەوەش هاوەڵێکی دیکە سەرنجی نوێژی منداڵەکەی دەدات و بۆی راست دەکاتەوە:

(ترمذی) لە (عبداللە کوڕی مغفل)ْ گێڕاویەتیەوە، کە وتوویەتی: من (بسم اللە الرحمن الرحیم)م دەخوێند، باوکم گوێی لێم بوو، وتی: کوڕی خۆم! زیادت کرد، خۆت دووربگرە لە شت زیادکردن، وتی: کەسم لە هاوەڵانی پێغەمبەری خواﷺ نەبینیوە کە لەو زیاتر رقی لە شت زیادکردن بێت لە ئیسلامدا، وتی: لەگەڵ پێغەمبەری خواﷺ و لەگەڵ (ابوبکر) و لەگەڵ (عمر) و لەگەڵ (عثمان) نوێژم کردووە، گوێم لە هیچیان نەبووە (بسم اللە الرحمن الرحیم) بڵێت، تۆش کە نوێژت کرد ئەوە مەڵێ، بەڵکو بڵێ: (الحمدللە رب العالمین).

پێشتریش لە دەستووری نانخواردندا ئەوەمان خستە روو کە چۆن پێغەمبەری خواﷺ شێوازی نانخواردنی بۆ کوڕێك راستکردەوە بە رێنمایی بیروبۆچوونی، بەمجۆرە بینیمان کە راستکردنەوەی بیروبۆچوونی فیکری و فێرکردنی منداڵ و گفتوگۆکردن لەگەڵیدا و راڤەکردن و شیکردنەوەی کاروبارەکان بۆی، پایەیەکی بەهێزە لە کەم کردنەوەی هەڵەو راستکردنەوەی رێڕەوی منداڵدا.

## دووەم: ڕاستکردنەوەی کرداریی بەشێوەیەکی لەبەرچاو بۆ هەڵەی منداڵ:

زۆرجار داوا لە منداڵ دەکرێت کە هەستێت بە ئەنجامدانی کارێک کە پێشتر پێی هەڵنەستاوە، یان چۆنیەتیەکەی نەبینیوە، لەبەر ئەوە نازانێت، خۆ گەر داوای کاری لێکرا دەکەوێتە چەند هەڵەیەکەوە کە پێویستی بە ڕاستکردنەوە هەیە، جا گەر لەسەر ئەو هەڵەیەشی سزا درا بەراستی ئەوە ستەم و زوڵمە.

پێغەمبەری خواش ﷺ کاتێک ئەو دیمەنانەی بهاتایەتە ڕێ، وازی لێ نەدەهێنا تا منداڵەکەی بەشێوەیەکی کرداریی تێدەگەیاند، دەستەکانی خۆی هەڵدەکرد، و بە منداڵەکەی نیشان دەدا کە چۆن بەچاکی ئەو کارە بکات، ئەمەش فێرکردنە بۆ دایکان و باوکان و پەروەردەکاران، بەڵام چۆن فێرکردنێك:

(ابوداود) گێڕاویەتیەوە لە (ابو سعید الخدری)ەوە ﷺ کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای کوڕێکدا تێپەڕی کە خەریکی کەوڵکردنی بەرانێك بوو، بەچاکی نەیدەزانی کەوڵی بکات، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ((**تنحّ حتى أريك**)) لاچۆ، تاکو پیشانت بدەم (چۆن کەوڵی کەیت)، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی خستە نێوان گۆشت و پێستەکەی و دەستی بردە ناوەوە هەتا دەستی گەیشتە بن باڵی پاشان ڕۆیشت و نوێژی بۆ خەڵکی کرد و دەستنوێژیشی نەگرتەوە.

با دروشمی دایکان و باوکان و پەروەردەکاران لە هەڵس و کەوتیاندا لەگەڵ منداڵەکانیان ئەوەبێت: ((**تنحّ حتى أريك**)) لاچۆ، تاکو پیشانت بدەم چونکە بۆ زانینی ڕاست و دروست و کاری بنیاتنەری ئاڕاستەکار، و ڕێگای گونجاو و بەجێ لە پرۆسەی پەروەردەدا لە پێشترە.

جا دوای ئەمە هاوەڵان ﷺ بەمەشقی کرداریی واقیعی و بینینی هەستیی، پیاو و ئافرەت بە گەورەو بچوکیانەوە فێر دەکرد.

ئیمام (احمد) و (ابن أبی شیبە) لە (أبو مالك الاشعری) ﷺ گێڕاویانەتەوە کە وتوویەتی: ئەی کۆمەڵی ئەشعەرییەکان! کۆ ببنەوەو ئافرەتەکانتان و منداڵەکانتان کۆبکەنەوە، هەتا نوێژی پێغەمبەری خواتان ﷺ پیشان بدەم و فێرتان بکەم. ئەوەبوو کۆبوونەوەو منداڵ و ئافرەتەکانیان کۆکردەوە، پاشان دەستنوێژی گرت و پیشانی دان، کە چۆن دەستنوێژ دەگرێ، پاشان هاتە پێشەوە و پیاوانی ڕیزکرد، ئینجا هاتە ڕیزەوەو منداڵانی لە دوای پیاوانەوە ڕیز

کرد و ئافرەتانیشی لەدوای منداڵان ریزکرد.

ئا بەم جۆرەی بە ناساندن و ئاشناکردنی ئەحکامەکان بەشێوەیەکی کرداریی، وێنەی راست و دروست لە مێشکی منداڵ چەسپ دەبێ، بەتایبەتی گەر بنەڕەتەکەی کارێکی هەستەوەر(حسي) بێت، وەك نوێژ و حەج و عومرە و رۆژوو و شتی تریش.

## بنەمای سێیەم: پلەبەندی لە تەمبێکردنی منداڵدا:

خۆ گەر منداڵ بە راستکردنەوەی فیکریی و کرداریی چاك نەبوو، و چارەسەری نەکرا و سووربوو لەسەر ئەنجامدانی هەڵە، ئەوا تەمبێکردن مافێکی پێویستە لەسەری.. وە بەم هەنگاوانەی خوارەوە سزاکانی بەسەردا جێبەجێ دەکرێت:

## قۆناغی یەکەم: نیشاندانی قامچی بە منداڵ و ترساندنی:

زۆرێك لە منداڵان بە بینینی قامچی و ئامێرەکانی لێدان سڵ دەکەن و دەترسن، بۆیە تەنها بە پیشاندان و دەرخستنی بۆیان خێرا هەوڵی راستکردنەوەی دەدەن، و پێشبڕکێیانە بۆ پابەندبوون، و رەوشت و هەڵس و کەوتیان راست دەکاتەوە.

لەم رووەوە (بخاری) لە (الادب المفرد)دا گێڕاویەتیەوە لە (ابن عباس)ەوە م کە پێغەمبەری خواﷺ فەرمانی کردووە بە هەڵواسینی قامچی لە ماڵدا.[1]

هەروەها (عبدالرزاق) و (طبرانی)یش بە (مرفوع)ی لە (ابن عباس)ەوە م گێڕاویانەتەوە: ((**علّقوا السوط حيث يراه أهل البيت، فإنه آدب لهم**)).[2] واتە: (قامچی هەڵواسن لە ماڵەکانتاندا بەجۆرێك ئەندامانی ماڵەوە ببینن، چونکە بەراستی ئەوە تەمبێیە بۆیان).

لە گێڕانەوەی (طبرانی)یشدا: ((**فإنه لهم أدب**)) واتە چونکە بەراستی ئەوە بۆیان تەمبێیە.

پێغەمبەریشﷺراسپاردەی (معاذ کوڕی جبل)ی کرد، لەو فەرمایشتەی کە ئیمام (احمد) و (ابن ماجه) و (بخاری) لە (الادب المفرد)دا هێناویانە: ((**ولا ترفع عنهم عصاك أدباً**)) واتە: (گۆچانت لەسەریان هەڵمەگرە بۆ تەمبێکردن).

---

١ الأدب المفرد (٢/٦٥٦) ورواه إبن أبي الدنيا في كتاب العيال (١/٤٩٤).

٢ حسن. أنظر صحيح الجامع رقم (٤٠٢٢).

(ابن عمر)یش بە (مرفوع)ی گێڕاویەتیەوە: ((علّقوا السوط حيث يراه أهل البيت)).[١]
واتە: (قامچی هەڵواسن لە ماڵەکانتاندا بەجۆرێك ئەندامانی ماڵەوە ببینن).

بۆیە هەر دەبێ قامچی یان گۆچان لەنێو ماڵدا هەبێت بۆ ئەوەی منداڵ بترسێت لەوەی کە بە ئەنقەست هەڵە و لاساری بکات.

## قۆناغی دووەم: گوێ ڕاکێشان:

ئەمەش یەکەم سزای جەستەیی منداڵە...و بەم قۆناغە ئاشنای ئێش و ئازاری سەرپێچی و سزای کاروکردەوەی ناشیرین و خراپ دەبێت کە ئەنجامی داوەو شایانی گوێ ڕاکێشان بووە.

لەم رووەوە (نووی) لە (الأذكار)دا وتویەتی: لە کتێبی (ابن السنی)دا لە (عبدالله کوڕی بسر المازنی) هاوەڵەوە ﷺ گێڕاومانەتەوە کە وتویەتی: دایکم ناردمی کە هێشووە ترێیەك ببەم بۆ پێغەمبەری خواﷺ، منیش بەرلەوەی بیگەیەنم لێم خوارد، کاتێك پێمدا، گوێی راکێشام و فەرمووی: ((يا غُدر)) ئەی فێڵباز.

## قۆناغی سێیەم: لێدان و ڕێساکانی:

ئەگەر نیشاندانی گۆچان سوودی نەبوو، گوێڕاکێشانیش بێئاکام بوو لەگەڵ منداڵدا، و هەر سوور بوو لەسەر سەرکەشی و لاساریی، ئەوا قۆناغی سێیەم زامنی نەهێشتنی ئەو لاسارییەیە، بەڵام ئایا لێدان هەروا تێدەپەڕێت و دێتە پێش و بەبێ مەرج و بەند و بەست (ضوابط) و هەرچۆن باوك و دایك و پەروەردەکار پێیان خۆش بوو وا دەبێت؟ یان ڕێسای خۆی هەیە و بەجێدەهێنرێت هەتا بەسەر ڕێگای راست و دروستدا بڕوات، جا دەبێت ئەو ڕێسایانە چی بێت؟

## ڕێسای یەکەم: دەستپێکردنی لێدان لە تەمەنی دەساڵیەوە:

لەبەر رۆشنایی ئەو فەرموودەیەدا کە (ابوداود) بە سەنەدی (حسن) گێڕابوویەوە: ((مروا أولادكم بالصلاة وهم أبناء سبع، وأضربوهم عليها وهم أبناء عشر)). واتا: (لە حەوت ساڵان نوێژ بە منداڵەکانتان بکەن و لە دەساڵیش لەسەر نوێژنەکردن لێیان بدەن).

جا سەرەتای لێدان لە تەمەنی دەساڵیەوەیە دەست پێدەکات، چونکە کەمتەرخەمییە لە کۆڵەکەی دین و پایەیەکی بنەڕەتیدا، و یەکەم شتێشە کە مرۆڤ لە رۆژی قیامەتدا

---

١ أخرجه الضياء. صحيح. أنظر صحيح الجامع رقم (٤٠٢١).

لیپێچینەوەی لەگەڵ دەکرێت لەسەری پاش بیروباوەڕ، جا پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی نەداوە پێش تەمەنی دەساڵی لەبەر کەمتەرخەمی لە منداڵ بدرێت، بۆیە لەسەرجەم کاروبارەکانی دیکەی ژیان و هەڵس و کەوت و پەروەردەیدا کە ناگەنە ریزی نوێژ لە گرنگی و بایەخ و پلەو پایەدا لای خوای گەورە هەر دەبێت بەو جۆرە بێت.

بەڵام بەر لە دەساڵی قۆناغەکانی پێشوو بەوپەڕی وردبینی و لەسەرخۆیی و ئارامگری و نەرم و نیانیەوە لەگەڵ منداڵدا بەجێدەهێنرێت، لەمەشدا ئاوڕدانەوەیەکی جوانی پێغەمبەری خوا ﷺ هەیە لە بڕیاردانی تەمەنی لێداندا.

(اسماعیل کوڕی سعید) وتوویەتی: پرسیارم کرد لە (احمد) ئایا دروستە لەسەر نوێژ لە منداڵ بدرێت، وتی: کە گەیشتە دەساڵی، وە وتوویەتی: (ابو عبدالله) وتی: هەتیوو تەمبێدەکرێت و بەشێوەیەکی سووک لێی دەدرێت.

(الأثرم)یش وتوویەتی: پرسیار لە (ابو عبدالله) دەربارەی لێدانی مامۆستا لە منداڵ کرا، ئەویش وتی: بەپێی ئاستی تاوانەکانیان لێیان دەدرێت، و تا بتوانرێت لە لێدانیان دوورکەوێتەوە، خۆ گەر بچووك بوو و عەقڵی پێنەدەشکا ئەوا نابێت لێی بدات.[1]

لەبەر ئەوە دایکان و باوکان و پەروەردەکاران داوایان لێکراوە کە بیروهۆش و نەرم و نیانی بەکاربهێنن لە چارەسەرکردنی هەڵس و کەوتی منداڵدا، خۆ گەر زانیمان کە منداڵ لە قۆناغی گەشەکردنی جەستەییو عەقڵیدایە، ئەوا زۆر لێدانی دەبێتە هۆی زیان پێگەیاندنی ئەندامەکانی.. هەندێجاریش دەبێتە هۆی ئازاردانی دەروونی و فیکری، واتە دەکرێت بوترێت کە لێدان بۆ تەمبێکردنە، وەك خوێ بۆ چێشت.. هەروەك چۆن خوێ بەشێوەیەکی کەم تێی دەکرێت و تامی خواردنەکە دەگۆڕێت و خۆشی دەکات، لێدانی بەسوودی بەرهەمداریش بەو شێوەیە لە پرۆسەی پەروەردەییدا داواکراوە، چونکە هەروەك باسمان کرد ئامانج ئەوەیە کە لێدان پێویستیەکی پەروەردەییە و تۆڵەکردنەوە نیە، یان بۆ خاڵیکردنەوەی تووڕەیی باوکان و دایکان یان پەروەردەکاران نیە.

ئەوەشمان لەیاد نەچێت کە زۆر بەکارهێنانی لێدان هەیبەتی کەم دەکاتەوەو کاریگەرییەکەی لەدەست دەدات، وێڕای ئەو شوێنەوارە خراپانەی کە لە گەشەی دەروونی و فیکری منداڵدا دروستی دەکات.

---

١ عن (الآداب الشرعية والمنح المرعية) تأليف محمد بن مفلح المقدسي الحنبلي (١/٥٠٦).

وە گەر زانیمان کە گێڕانەوەکەی (الدارقطنی)[1] لە (أنس)ەوە ﷺ کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((**مروهم بالصلاة لسبع سنين، وأضربوهم عليها لثلاث عشرة**)).واتە: (لە حەوت ساڵیدا نوێژیان پێبکەن، و لە سێزدە ساڵیدا لەسەر نوێژ لێیان بدەن).

ئەوە بەو مانایەیە کە ماوەی لێنەدان درێژ دەبێتەوە بۆ سێزدە ساڵ لە تەمەنی منداڵدا، کە لە پرۆسەی لێداندا دووپاتی پێویستی لەسەرخۆییو هێمنی و کەمکردنەوەی بەگوێرەی توانا دەکات.

## ڕێسای دووەم: زۆرترین لێدان بۆ تەمبێکردن سێ دارە و بۆ تۆڵەسەندنەوە دە دارە:

زۆرترین لێدان لەهەموو کات و بارودۆخێکی پرۆسەی پەروەردەییدا نابێت لە دە لێدان زیاتر بێت، ئەمەش بەهۆی ئەو فەرموودەیەی کە (بخاری) هێناویەتی لە (ابوهریرە)ەوە ﷺ وتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ((**لايُجلد فوق عشر جلدات الا في حدٍّ من حدود**)). واتە: (لە دە لێدان زیاتری لێ نادرێت مەگەر لە سەر سنوورێك لە سنوورەکانی خودا بێت).

لە (مصنف)[2]ەکەی (عبدالرزاق)یشدا: ((**لا عقوبة فوق عشرة أسواط، الاّ أن يكون في حدّ من حدود الله**)). واتە: (هیچ سزادانێك نابێت لە دە قامچی زیاتر بێت، مەگەر لەسەر بەزاندنی سنوورێك لە سنوورەکانی خوای گەورە بێت).

(بخاری)یش ناونیشانی ئەو فەرموودەیەی بە (التعزير والأدب) داناوە، (ابن حجر)یش لە راڤەی ئەوەدا دەڵێت: مەبەست لە (الادب) تەمبێکردنە، و بەدوای (تعزير)دا هێناویەتی کە سەرزەنشت کردن دەگەیەنێ، و ئەوەش بەهۆی سەرپێچیەوە دەبێت، بەڵام تەمبێکردن گشتیترە وەکو تەمبێکردنی منداڵ، و تەمبێکردنی مامۆستا.[3]

کەواتە فەرموودەکە دیاریکردووەو ڕێگەنادات بە زیاد لە دە لێدان، مەگەر بۆ چەسپاندنی سنورێك لە سنوورەکانی خوای گەورە بێت، منداڵیش کە نەگەیشتبووە تەمەنی باڵغ بوون و ئەرکبارییەوە، ئەوا لەسەر گوناهەکانی سەرزەنشت دەکرێ و تەمبێ دەکرێ، خواش زاناترە.

---

١ ٢٣١/١.
٢ ٤١٣/٧.
٣ فتح الباري (١٩١/١٥).

(شريح)ی قازیش وا دەبینێت کە منداڵ لەسەر قورئان زیاد لەسێ جاری لێی‌نەدرێت، هەروەك (جبريل)× سێ‌جار (محمد)ی ﷺ بەخۆیەوە گوشی.[١]

(عمر کوڕی عبدالعزیز)یش : بۆ شارەکانی دەنووسی: مامۆستا لە سێ دار زیاتر لە قوتابی نەدا، چونکە منداڵ دەترسێنێ.[٢]

لە (ضحاك)ەوە کە وتویەتی: مامۆستا لە سێ‌دار زیاتر لە منداڵ بدات بەڕاستی ئەوە تۆڵەیە.[٣]

دەبێ لە لێدانی منداڵاندا دادگەری جێبەجێ بکرێت، لە (حسن)ەوە کە وتویەتی: گەر مامۆستا لەنێوان منداڵەکان دادگەر نەبێت ئەوا ئەو مامۆستایە لە ریزی ستەمکاران دەنووسرێت.[٤]

کەواتە بۆمان روون بۆوە کە تەمبێکردنی منداڵ بەسێ‌لێدان و کەمتریش دەبێت، تۆڵە سەندنەوەش لە سێ زیاتر هەتا دە لێدان دەبێت، لەسەرووی دە لێدان لە سنوورەکان(حدود) بەکاردەهێنرێ.

لێرەدا پێویستە کە هەڵوەستەیەك بکەین لە ئاست هەڵس و کەوتی هەندێ کەسی گێل و گەوجە لە پرۆسەی لێداندا و زۆر بەکارهێنانی بێبەزەییانەیان بەبێ سۆز و نەرمی، دەبا گوێ لە شێخی پایەبەرز (محمد الخضر حسين) بگرین -رەحمەتی خوای لێبێ- کە باسی دیمەنێکمان بۆ دەکات کە خۆی دیوویەتی:

بۆ بانگی عەسر چووم بۆ مزگەوتی (أزهر) و شوێنێکم هەڵبژارد تا نوێژی سەلامی چوونە مزگەوتی تێدابکەم، شوێنێك کە کەوتبووە نێوان کۆمەڵێکی فێربوونی قورئان، دڵم وەختبوو شەق ببات بەدەست یەکێك لە مامۆستاکانەوە کە گۆچانەکەی بەدەستیەوە داینەدەنا و نەیدەپاراست و بەوپەڕی توانایەوە بەبێ سڵکردن لەملاو ئەولای منداڵەکانی دەدا، کە لەوانەبوو منداڵەکە لەبەر ئازاری لێدانەوە هەڵبەزێتەوە کە نەیدەتوانی خۆی لەبەر بگرێت، ئینجاش خێرا خێرا لێی دەدایەوە، هەتا بە پیاوێکی نێو مزگەوتەکەم وت کە لە تەنیشتمەوە

---

١ الروض الأنف (١/٢٧٢).

٢ رواه إبن أبي الدنيا في كتاب (العيال) ١/٥٣١.

٣ المصدر السابق.

٤ المصدر السابق.

دانیشتبوو: هەرکەس لەلای ئەم بێزارکەرانەدا دابنیشێت ستەم لەخۆی دەکات، ئەوەشم بۆ باسکرد کە کاتێك لە وڵاتی (بنزرت) قازی بوم، لە وتارێکمدا دەربارەی دەستووری فێرکردنی منداڵان، ئەو مەرجانەم هێنایەوە کە خاوەنی کتێبی (المدخل) بڕیاری لەسەرداوە، لە نەرم و نیانی بەرامبەر منداڵ، و لەکاتی پێویستیشدا مامۆستا زیاتر لە سێ قامچی لە منداڵ نەدات، و ئاگادارکردنەوەی لە بەکارهێنانی داری چوالەی وشك و فەلاقەکردن، کاتێك لەبارەی ئەو ئادابانەوە وتارەکەم دا، هەندێك لە مامۆستایان لەرێگەی پۆستەوە نامەیەکیان بۆ ناردم کە تیایدا نارەزاییان دەردەبڕی لەسەر بڵاوکردنەوەی ئەو ئادابانەو دەیانووت: ئەوە دڵی قوتابیان بەئاگادێنێتەوە کە بوێرن بەرامبەرمان زماندرێژی بکەن.[1]

بێئاگایی دایك و باوك و پەروەردەکار لە چۆنیەتی لێدان و ئامێرەکانی و شوێنی لێدانەکەو رێگای لێدان وای لێدەکات کە ببێتە هۆکارێك بۆ زاڵ بوون و تۆڵە سەندنەوە، نەك پەروەردەکردن و راستکردنەوەو بنیاتنان.. لەبەر ئەمە ئێمە پێویستمان بەم خەسڵەتانە هەیە.

## رێسای سێیەم: پابەندبوون بە خەسڵەتەکانی لێدان و چۆنیەتی بەکارهێنان و شوێنی بەکارهێنانیەوە:

پابەندبوون بە خەسڵەتەکان(مواصفات)ی ئامێری لێدان و شوێنی و چۆنیەتی بەکارهێنانی وای لێدەکات کە ببێتە بەندوبەست کەری گێلی هەندێك لە باوکان و دایکان و پەروەردەکاران، بیانخاتە بەرامبەر رووبەڕووبونەوەی راستی لەگەڵ خۆیاندا، کاتێك کە پێوەی پابەند نابن، ئەمەش مانای ئەوە دەگەیەنێ کە ئەو کارەی ئەوان تۆڵەسەندنەوەیە نەك پەروەردەکردن، و تورەییە نەك بەزەیی پێداهاتنەوەو لەسەرخۆیی، جا ئاشنای ئەو خەسڵەتانە دەبین لەرێی ئاشنابوونی خەسڵەتەکانی بەجێهێنانی سنوورێك لە سنوورەکانی خوای گەورە، بەوەش پرۆسەی تەمبێکردن و پەروەردەکردن زۆرزۆر سوکتر دەبێت لە خەسڵەتەکانی جێبەجێکردنی سنوورێکی شەرعی.

دەتوانرێت بوترێت ـ ئەمەش کە دەیبینین- زۆرێك لە باوکان و پەروەردەکاران بەشێوەیەکی زۆر توندوتیژ و توندتر لە جێبەجێکردنی سنورێك لە سنوورەکانی خوای گەورە هەڵدەستن لە لێدانی منداڵ، لەبەر ئەوە زانین و روونکردنەوە پێویست بووە لەسەرمان، تا بزانین ئێمە لە کوێین و پەروەردەی ئیسلامیش لە کوێیە.

---

[1] كتاب الرحلات ص٥١ تأليف الشيخ محمد الخضر حسين، جمع وتحقيق علي الرضا التونسي، ط دار التعاونية.

## یەکەم: سیفەتەکانی ئامێری لێدان (قامچی یان گۆچان):

(ابو الاعلی المودودی) لە (نوعیة السوط في حد الزنا)[١] (چۆنیەتی قامچی لە حەددی زینادا) دەڵێت:

یەکەمین ئاماژە دەربارەی چۆنیەتی لێدانی قامچی، دانایی (فأجلدوا) لەخۆی گرتووە کە لە ئایەتەکەی قورئان خۆیدایە، (الجَلْد) لە (الجِلد)ەوە وەرگیراوە، کە ئەویش بریتیە لە رووکەشی پێستەی ئادەمیزاد، پاشان خاوەن فەرهەنگەکان(معاجم) و زانایانی تەفسیر رێکن لەسەر ئەوەی کە لێدان بە قامچی پێویستە تەنها پێستەکەی دەرەوەی بگرێت و نەگاتە سەر گۆشت، هەموو لێدانێکیش کە گۆشت ببڕێت یان پێستەکەی لاببات و گۆشتەکەی بریندار بکات ئەوا سەرپێچیکردنی فەرمانی قورئانە، پێویست دەکات کە هەموو قامچی یا گۆچانێك کە بۆ لێدان بەکاردەهێنرێت زۆر توند و رەق نەبێت، بەڵکو پێویست دەکات کە لەنێوان نەرمی و رەقی و ئەستوری و باریکیدا بێت، لەم رووەوە (مالك) لە (الموطأ)دا گێڕاویەتیەوە کە لە (زید کوڕی أسلم)ەوە کە پیاوێك لە سەردەمی پێغەمبەری خوداﷺ خۆی دانی بەوەدا نا کە زینای کردووە، پێغەمبەری خواﷺ داوای قامچیەکی کرد، دارێکی نەرمی باریکیان بۆ هێنا، فەرمووی: ((فوق ذلك)) لە سەرووی ئەمەوە بێ، دارێکی نوێیان بۆ هێنا کە هێشتا بەرەکەی لێ نەکرابۆوە، فەرمووی: ((بين هذين)) لەنێوان ئەم دوانەدا بێ، ئەمجا دارێکیان بۆ هێنا لەنێوان نەرم و وشکیدا بوو، ئەوەبوو فەرمانی کرد و بەوە لێیاندا.[٢]

(أبو عثمان النهدی)یش لە (عمر)ەوە گێڕاویەتیەوە کە دارێکیان بۆ هێنا زۆر رەق بوو، وتی لەمە نەرمترم دەوێ، جا دارێکی تریان بۆ هێنا نەرمی تێدابوو، وتی: لەمە توندترم دەوێ، ئەوەبوو دارێکیان بۆ هێنا کە لە نێوان هەردوو دارەکەی کەدا بوو، ئەمجا وتی: لێیدە.[٣]

هەروەها دروست نیە دارێك بۆ لێدان بەکار بهێنرێت کە گرێی تێدابێت یان دوو چڵ یا سێچڵی هەبێت.

---

١ (تفسير سورة النور) للمودودي ص٧٣.

٢ ورواه عبدالرزاق في المصنف ٣٦٩/٧.

٣ أحكام القرآن للجصاص (٣٢٢/٣) ومصنف عبدالرزاق (٣٦٩/٧) وفيه زيادة (وأعط كل حقه)، وأخرجه البيهقي(٣٢٨/٨).

شێخ (شمس الدين الإنبانی)ی فیقهزانیش خەسڵەتەکانی (مواصفات) ئامێری تەمبێکردنی منداڵانی کورت کردۆتەوەو وتوویەتی:

پێویست دەکات کە دارەکە بەم شێوەیە بێت:

١- قەبارەکەی مامناوەندی بێت و لەنێوان تول و گۆچاندا بێت.

٢- تەڕیەکەی مامناوەندی بێت، ئەوەندە تەڕ و شێدار نەبێت کە پێست بقڵیشێنێت بەهۆی قورسییەوە، و زۆر وشکیش نەبێت کە بەهۆی سوکییەوە ئازاری نەبێت.

٣- لەمەشدا جۆرێکی دیاریکراو نیە، بەڵکو رێگە دراوە کە قامچی (قایش)، یان دار و تەختە، یان نەعلی لاستیك، یان چەمکێکی جل و بەرگ پاش لولکردنی تا توند بێت بەکاربهێنرێت.

## دووەم: خەسڵەتەکانی چۆنیەتی لێدان:

هەروەها دەبێت لێدانەکە لەنێوان دوو لێداندا بێت، (عمر) بەو کەسەی کە ئەرکی لێدانی لەسەر بوو دەوت: زۆر باڵت بەرز مەکەرەوە،[1] واتە: بەهەموو هێزێکی خۆت لێی مەدە، هەموو شەرعناسانیش رێکەوتوون لەسەر ئەوەی کە نابێت لێدان زۆر بە ئێش و ئازار بێت.[2]

شێخی فیقهناس(شمس الدين الإنبانی) لە کتێبەکەیدا (رسالة رياضة الصبيان) شێوازی لێدانی تەمبێکردنی منداڵی کورت کردۆتەوە، لەبارەی چۆنیەتی لێدانی منداڵەوە وتویەتی:

١- دەبێت تاك تاك بێت، و بەسەریەکەوە نەبێت، و لەیەك شوێن نەدرێت.

٢- دەبێت لەنێوان دوو لێداندا ماوەیەك هەبێت تا ئازاری لێدانی یەکەمی کەم بێتەوە.

٣- نابێت بابای لێدەر دەستی بەرزبکاتەوە تا قامچیەکە بگوێزێتەوە بۆ باسکی خۆی هەتا سپیاتی بن باڵی دەرکەوێت، با دەستی زۆر بەرز نەکاتەوە تاکو ئێش و ئازارەکەی زۆر نەبێت.[3]

وەك دەبینیت ئەو بەندوبەستانە بۆ ئەوەیە تا لێدانەکە بەرهەمی پەروەردەیی خۆی هەبێت لە پاکخوویکردن و تەمبێکردنداو منداڵ بەرەوپێشتر و چاکبوون بچێت نەك خراپتر، و بەرەو بەرزی بچێت نەك بەرەوخوارتر، و بەرەو کەماڵ و تەواوی نەك کەم و کورتی، و بەرەو لوتکەی رەوشت و هەڵس و کەوت نەك رووەو رەوشت نزمی.

---

١ (تفسير سورة النور) للمودودي.

٢ التربية في الإسلام ص١٣٥.

٣ أحكام القرآن للجصاص (٣/٣٢٢) وأحكام القرآن لإبن العربي(٢/٨٤).

## سێیەم: خەسڵەتەکانی شوێنی لێدان:

نابێ لێدان هەر لە یەك جێگای جەستە بدرێت، بەڵکو دەبێت لەشوێنی جیاوازی هەموو جەستە بدرێت، هەتا هەریەك لە ئەندامەکانی جەستەی مافی خۆی وەرگرێت، جگە لە دەم و چاو و داوێن(الفرج)، لای حەنەفیەکان سەریش دروست نیە لێی بدرێت.

لە (علی)ەوە رضي الله عنه گێڕاویانەتەوە کە کابرایەکی سەرخۆش یان (حەدد)ێکی لەسەر بوو هێنایان بۆ لای، وتی: لێی بدەو هەر ئەندامێکی لەشی مافی خۆی بدەرێ، تەنها دەم و چاو و داوێنی نەبێت.[1]

پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: ((**إذا ضرب أحدكم فليتق الوجه**)).[2] واتە: (ئەگەر لە یەکێکتان دا ئەوا دەست لە دەم و چاوی بپارێزن).

(ابن سحنون)یش وا بە پەسەند دەزانێت کە لە هەردوو قاچ بدرێ، هەروەك (قابسی) لێی وەرگرتووە لە نامەکەیدا (أحوال المعلمين وأحكام المتعلمين) و دەڵێت:

با لە لێداندا لە سەر یان دەم و چاوی منداڵ دوور بکەوێتەوە، (ابن سحنون) لەو بارەوە وتویەتی: دروست نیە کە لەو دووشوێنە بدرێت، و زیانی لێدانیشیان روون و ئاشکرایە، لەوانەیە مێشك بێهێز بکات، یان چاو کز بکات، یاخود شوێنەوارێکی خراپ و ناشیرین بەجێبهێڵێت، کەواتە با لێی دووربکەونەوە، لێدانیش لەهەردوو قاچ بێترس ترە، زیاتر ئازاری پێدەگات و سەلامەتیش دەبێت.[3]

شێخ (شمس الدين الإنبانی) زیاتر لەسەری دەڕوات و دەڵێت: لێدانەکە لە دەم و چاو و ئەو شوێنانە نەبێت کە دەبنە هۆی کوشتنی.

لە (علی کوڕی ابو جملە)ەوە وتویەتی: (سلیمان کوڕی سعد)، (ولید) و (سلیمان) -هەردوو کوڕەکەی عبدالملك-ی تەمبێ دەکرد، خەلیفەی موسڵمانان (عبدالملك) وتی: (سلیمان)! لە دەم و چاوی کوڕەکانم نەدەیت. دیارە سروشتی (سلیمان) توندوتیژ بووە.[4]

---

١ أحكام القرآن للجصاص (٣/٣٢٢).

٢ رواه ابوداود. أحكام القرآن للجصاص (٣/٣٢٢).

٣ التربية في الإسلام ص٢٧٠.

٤ كتاب (العيال) لابن أبي الدنيا (١/٥٢٦).

لە (مروان کوڕی شجاع)ەوە وتویەتی: (ابـراهیم کـوڕی ابـو عبلـه) کـوڕی (ولیـد کـوڕی عبدالملك)ی فێر دەکرد، جا ڕۆژێك (ولید) بۆی چـووە دەرەوە، بینـی کـچێکی سـواری پـشتی کوڕێك کردووە و ئەویش لە کچەکە دەدا، جا (ولید) پێی وت: (ابـراهیم) نەکـەی! کـچان لـە دواوەیان نادرێ بەڵام تۆ لە قاچ و ناودەستیان بدە.[1]

لە میانەی ئەوانەی کە خرانە ڕوو دەبینین چاکترین جێگـای بـۆ لێـدان و کاریگـەر لەسـەر دروست بوون هەردوو دەست و هەردوو قاچە.

## ڕێسای چوارەم: لێدان نابێت لەکاتی توڕەبووندا بێت:

پێغەمبەری خوا ﷺ موسڵمانی ڕاسپاردووە کە توڕە نەبێت، و بـەپێی توانـای خـۆی لێـی دوورکەوێتـەوە، کاتێـك پیاوێـك پرسـیاری لێکـرد کـە ئامۆژگـاری بکـات، فـەرمووی: ((لاتغضب))[2] توڕە مەبە. سێجار لێی دووبارە کردەوە.

نیشانەی توڕەبوونیش پیسی زمانە لە جنێودان و ناووناتۆرەو ناشیرین کردنی منداڵ، لەبەر ئەوەشە (القابسی) لە نامەکەیدا[3] ڕایسپاردووە کە لەوە دووربکەونەوە، لەمبارەیەوە وتویـەتی کاتێك منداڵ هەڵەی زۆر دەبێت (و دوورەپەرێزکردن و قسەپێوتن بەو وتانەی کە ڕێسای تێدایە بەبێ جنێودان و قسە بە ناموس وتن سوودی نابـێ، وەك قـسەی ئـەو کەسـانەی کـە حـەقی منداڵانی موسڵمان نازانن و دەڵێن: ئەی ڕموزن کراو! مەیمون!

ئەوا داوای لێخۆشبوون لە خوا بکات و دووبارەی نەکاتـەوە، ئـەو قـسە ناشـیرینانەش بـە زمانی کەسێکدا دێت کە توڕەیی بەسەر خۆیدا زاڵ کردبێت، ئەوەش جێگـای توڕەبـوون نیـە، پێغەمبەری خواش ﷺ قەدەغەی کردووە کە قازی لەکاتی تووڕەبووندا داوەری بکات،[4] (عمـر کوڕی عبدالعزیز)یش -ڕەحمەتی خوای لێبـێ- فـەرمانی کـرد بـە لێـدانی مرۆڤێـك، کاتێـك ئامادەکرا بۆ لێدان وتی: وازی لێ بێنن، کە لەو بارەیەوە پرسیاری لێکرا، وتـی: لـە دەروونـی خۆمدا بەرامبەری هەستم بە توڕەبوون کرد، بۆیە حەزم نەکرد لەکاتی تووڕەبووندا لێی بدەم.

---

١ کتاب (العیال) لابن أبي الدنیا (١/٥٢٦).

٢ رواه البخاري عن أبي هریرة ﷺ، وفي روایة احمد بسند صحیح (اجتنب الغضب).

٣ التربیة في الإسلام ص٢٧٠.

٤ ((لا یقضین حاکم بین أثنین وهو غضبان)) **واتـە: بـا داوەر لـەکاتی توڕەبووندا داوەری لـەنێوان دووکەسـدا نـەکات.** رواه الجماعة عن أبي بکر ﷺ، ولفظ البخاري (لا یقضي القاضي وهو غـضبان)**واتـە: قازی لەکاتی توڕەبووندا داوەری ناکات..** ورواه مسلم.

(ابو الحسن) وتوویەتی: بەو شێوەیە پێویستە مامۆستای منداڵان چاودێریان بکات، هەتا بەدڵسۆزی ئەدەبیان دابدات تا لێی سوودمەند بن، ئەمەش چارەسەری تورەبوونی مامۆستاکەیان ناکات، و هیچ شتێك دڵی لەو رق لێ بوونەی ناحەسێنێتەوە، ئەوەش گەر تووشی بوو، ئەوا لێدانی منداڵی موسڵمانان بۆ ئاسوودەبوونی دەروونی خۆیەتی، ئەمەش دادگەری نیە.)[1]

## ڕێسای پێنجەم: دەست لە لێدان هەڵگرە گەر منداڵەکە ناوی خوای گەورەی هێنا:

لە کاتێکدا کە تۆ لە منداڵەکەت دەدەیت و تەمبێی دەکەیت، و ئەویش ئازار دەچێژێت، جا ئەگەر ناوی خودای هێنا، ئەوا پێغەمبەری خواﷺ داوات لێدەکات کە واز لە لێدانی بهێنیت و دەستی لێ هەلگریت.. لەمەشدا لالێکردنەوەیەکی جوان هەیە، چونکە ئەو منداڵە گەیشتۆتە قەناعەت کە هەڵەی کردووەو پاشتر راستی دەکاتەوە، یان گەیشتۆتە قۆناغی ئێش و ئازارێك کە توانای بەرگەگرتنی نەبێت، یان گەیشتۆتە قۆناغی دارمانی دەروونی یان ترسێکی زۆر.

بەردەوام بوون لە لێدان و بارودۆخی منداڵیش بەو جۆرە بوو بە تاوان دەژمێردرێت بەرامبەر مافی پەروەردەکردنی منداڵ، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر حەزلێکردنی تۆڵەسەندنەوەو دڵ داکەوتن لەو منداڵە بەستەزمانەدا، کە کەوتۆتە ناو ستەم و باوەشی باوکێکی ستەمکارەوە.

(ترمذی) لە (ابو سعید الخدری)ەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((إذا ضرب أحدكم خادمه، فذكر الله فارفعوا أيديكم)). واتە: (گەر یەکێکتان لە خزمەتکارەکەی خۆیدا، و ئەویش ناوی خوای هێنا، ئەوا دەست لە لێدانی هەڵگرن).

لەوانەیە یەکێك بڵێت: گەر منداڵ بەوەی زانی ئەوا وەك هۆکارێك بەکاری دەهێنێت بۆ هەڵهاتن لە سزادان و راهاتن لەسەر هەڵە، یان بیکاتە فێڵێك بۆ دەربازبوون لە لێدان و بگەڕێتەوە سەر ئەنجامدانی.

وەڵامی ئەمەش وەهایە: دەستگرتن و شوێنکەوتنی فەرموودەی پێغەمبەری خواﷺ، بەهۆی ئەو مەزن راگرتنەی تێیدایە بۆ خوای گەورە لە دەروونی منداڵدا، و چارەسەریشە بۆ

---

١ التربية في الإسلام ص٢٧٠.

ئەو کەسەی بە لێدانەکە هەڵدەستێت کە بارودۆخی تورەبوونەکەی زۆر گەورەیە، ئەوەش وای لە منداڵەکە کردووە کە ناوی خوا بێنێت و هانای بۆ ببات.

ئێمە رووی قسەمان لەوانە نیە کە ئیمانیان لاوازە، ئەوانەی کاتێك شتی وەك ئەم هانابردنانەیان گوێلێ دەبێت، گەوجێتی و کەللەرەقی و ستەم و سزادان و لێدانەکەیان زیاتر دەکەن، بەراستی ئەوانە پێویستیان بەوە هەیە کە تاوان و کەمتەرخەمیەکانیان بەرامبەر پەروەردگاریان لەگەڵ نەرم و نیانی و ئارام گرتنی خوا بەسەریانەوە ئەگەرچی لە هەموو کاتێکدا توانای هەیە بەسەریاندا، بهێننەوە یاد.

خوایە لە تەمبێ‌کردنی منداڵەکانمان بەوشێوەیە سەرکەوتوومان بکە کە خۆت پێی رازیت.

دوای ئەوەی کۆتاییمان بە بەشی ئامادەو سازکردنی هەریەکێك لە پەروەردەکاران و دایك و باوکان هێنا، جا دەست دەکەین بە ئاشنابوونی چۆنیەتی بنیاتنانی کەسایەتی منداڵی موسڵمان لەبەر رۆشنایی فەرموودەکانی پێغەمبەردا ﷺ.

# بەشی دووەم

## دەربارەی بنیاتنانی کەسێتی منداڵ

دەستپێك:

یەکەم – بنیاتنانی بیروباوەڕیی.

دووەم – بنیاتنانی پەرستشیی.

سێیەم – بنیاتنانی کۆمەڵایەتیی.

چوارەم – بنیاتنانی ئاکاریی.

پێنجەم – بنیاتنانی سۆزداریی.

شەشەم – بنیاتنانی زانستیی.

حەوتەم – بنیاتنانی جەستەیی.

هەشتەم – بنیاتنانی تەندروستیی.

نۆیەم – پەروەردەکردنی پاڵنەری جنسیی.

(بخاری) لە (ابوهریرە)ەوەﷺ هێناویەتی کە دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((**ما من مولود یولد الاّ یولد علی الفطرة، فابواه یهودانه أو ینصرانه أو یمجسانه؛ کما تنتج البهیمة بهیمة جمعاء، هل تحسون فیها من جدعاء**)). واتە: (هەر منداڵێك کە لەدایك دەبێت، لەسەر فیترەتی خواپەرستی لەدایك دەبێت، جا باوك و دایکی دەیکەنە جولەکە یان گاور یان ئاگرپەرست، وەك چۆن ئاژەڵ بە تێروتەواوی پەیدا دەبێ، ئایا هیچ دانەیەکی لوتبڕاویان تێدا دەبینن؟!)

ئینجا (ابوهریرە) دەڵێت: فەرمایشتی خوای گەورە بخوێننەوە، کە دەفەرموێ:﴿فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ﴾الروم/٣٠.

## دەستپێك:

کەسێتی هاوسەنگ ئەوەیە کە کاریگەری کارا(فعال)ی لەژیانی تاکەکان و کۆمەڵ هەبێت، ئەم کەسێتیەش کامڵ نابێت مەگەر دوای ئەوەی کە لەهەموو لایەکیەوە رێنمـونی و ئاراسـتە کرابێت، و لەگشت لایەکیەوە پەروەردە بووبێت.

خۆ گەر لە بزاڤی مێژوو رامێنین ئەوا گرنگی بنیاتنان و پێکهێنانی کەسێتی بەهێز بـەدی دەکەین، ئەم واقیعە گەندەڵەو لاڕێ بوو لە بەرنامەو پەیڕەوی خوای گەورە بـەبێ بـوونی هێـز گۆڕانی بەسەردا نایەت، هێزیش بەبێ بنیاتنان بەدەست نایەت، بنیاتنانیش بەدی نایەت بەبێ ئامادەکردن و پێکهێنان و پەروەردەکردن.

لەبارترین بواری بنیاتنانی پەروەردەیش قۆناغی منداڵییە، کە ئـەویش درێـژترین ماوەیـە لەنێوان بوونەوەرە زیندوەکاندا، هەروەها منداڵێتی مرۆڤ بە نـەرمیو بێگـەردیو پـاکی جیـا دەکرێتەوە، و ماوەیەکی درێژ دەخایەنێت کە پەروەردەکار دەتوانێت لەم ماوە درێـژەدا ئـەوەی کە مەبەستیەتی لە ناخی منداڵدا بیچێنێت و بەو جۆرە ئاراسـتەی بکـات کـە نەخـشەی بـۆ کێشاوە، هەروەها ئاشنای تواناکانی دەبێت و بەپێی توانا پێشبینی ئایندەی دەکات، جا چەندە کۆمەکی بنیاتنانی منداڵ بەچاودێریو سەرپەرشتی و رێنمـوونی کـردن بکرێـت، ئەوەنـدە لـە داهاتوودا خۆڕاگر و چەسپاو دەبێت بەرامبەر ئـەو هەژانـە ئاییندەییـەی کـە منـداڵ لـەکاتی لاوێتیدا توشیان دەبێت.

لەبەر ئەوە کاری باوکی کارا لەم بەشەوە دەست پێدەکات کـە بـە فراوانـی ڕاڤـەکراوە، و نمونەی نایاب بۆ هەموو بیرۆکەیـەك هێنراوەتـەوە، تـا ببێتـە توێـشوو بـۆ پـەروەردەکاران، و خۆراکی منداڵان، و لە خستنەڕووی ئەمەشدا بەپێی توانا خۆمان دوور گرتووە لـە فەلـسەفەو قسەئاخنین، تا نمونە زیندوەکان ببنە چاکترین هۆکاری پەنـد لێ وەرگـرتن و پێـشەنگ بـوون، هەروەها پێشکەشکردنی بە منداڵ و جوان خستنەڕوی بۆی -بەویستی خوا- دەرئەنجامی بـاش دەدات بەدەستەوە.

لەبەر ئەوەشە کە (ابن سینا) لە کتێبەکەیدا (السیاسة) بابی (سیاسة الرجل ولده) دەربارەی ماوەی سەرەتای پەروەردە وتوویەتی: (کاتێك منداڵ لەشیر بڕایەوە ئینجـا دەسـت بـە ئـەدەب دادانی و وەرزش پێکردنی ئاکار و رەوشتی دەکرێت، پێش ئەوەی کە خوو رەوشتی نابـەجێ و بەد هێرشی بکەنە سەر).

هەروەها بیرۆکەی بە بچووك دانانی منداڵ و فەرامۆشکردنی ڕێنمونی کردنی (لەبەرئەوەی کە هێشتا منداڵە) قسەیەکی پوچە، بەڵکو هەر لە سەرەتای لەشیر بڕینەوە دەست دەکرێت بە ئاراستەکردن و ڕێنمونی و فەرمان پێکردنی و قەدەغەکردن و مژدە پێدان و ترساندنی، و خۆشەویستکردن و قێزەونکردن لای، وە شتی دی بەو جۆرە.

ئێستاش دەست دەکەین بە ناساندنی بنچینەکانی بنیاتنانی کەسێتی منداڵ، لەپێش هەموویەوە بنیاتنانی بیروباوەڕیی.

## یەکەم: بنیاتنانی بیروباوەڕی

**بنچینەکانی بنیاتنانی بیروباوەڕیی:**

**بنچینەی یەکەم: وشەی یەکخوا پەرستی دان بەگوێی منداڵدا:**

**بنچینەی دووەم: خۆشەویستی خوای بەرز و بێهاوتاو چاودێریکردنی، و کۆمەك لێ خواستنی و بڕوابوون بە قەزاو قەدەر.**

**بنچینەی سێیەم: خۆشەویستی پێغەمبەرﷺ و خانەوادەی بەڕێزی و هاوەڵە بەڕێزەکانی.**

**بنچینەی چوارەم: منداڵ فێری قورئان بکرێت.**

**بنچینەی پێنجەم: پەروەردەکردنی لەسەر دامەزراوی و قوربانیدان لە پێناو بیروباوەڕدا.**

﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنْ بَنِيٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُواْ بَلَىٰ شَهِدْنَآ أَن تَقُولُواْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَٰذَا غَٰفِلِينَ ﴿١٧٢﴾ أَوْ تَقُولُوٓاْ إِنَّمَآ أَشْرَكَ ءَابَآؤُنَا مِن قَبْلُ وَكُنَّا ذُرِّيَّةً مِّنۢ بَعْدِهِمْ أَفَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ ٱلْمُبْطِلُونَ ﴿١٧٣﴾ وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ وَلَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿١٧٤﴾﴾الأعراف/١٧٢-١٧٤.

# دەروازەی یەکەم - بنیاتنانی بیروباوەڕیی

## دەسپێك:

بیروباوەڕی ئیسلامی کە باوەڕ بەخواو بە فریشتەکانی و پەڕاوەکانی و نێردراوەکانی و ڕۆژی دوایی و قەزاو قەدەر بە خۆشی و ناخۆشیەوە لەلای خوای بالادەستە دەگرێتەوە، بەوە جیادەکرێتەوە کە هەرهەمووی شاراوەیە (غیب)ە، لێرەدا مرۆڤ سەرسام دەبێت کە چۆن و بە چ شێوەیەك پێشکەشی منداڵی بکات و چۆن ئەو منداڵە هەڵس و کەوتی لەگەڵدا بکات؟ و چۆن دەکرێ ئاسان بکرێت؟ و چۆن بیخاتەروو؟ جا بەرامبەر هەموو ئەم پرسیارانەو هیدیکەش، دایك و باوك لەم چۆنیەتیانە سەرسام دەبن و پرسیار دەربارەی دەکەن، بەڵام لە میانەی هەڵس و کەوتی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ منداڵاندا بۆ چەسپاندنی ئەم بیروباوەڕە پێنج پایەی بنچینەیی دەبینینەوە:

**بنچینەی یەکەم: وشەی یەکخوا پەرستی دان بەگوێی منداڵدا.**

**بنچینەی دووەم: چەسپاندنی خۆشەویستی خوای گەورە.**

**بنچینەی سێیەم: چەسپاندنی خۆشەویستی پێغەمبەرﷺ و خانەوادە پاکەکانی و هاوەڵە بەڕێزەکانی.**

**بنچینەی چوارەم: منداڵ فێری قورئان بکرێت.**

**بنچینەی پێنجەم: جێگیری و دامەزراوی لەسەر بیروباوەڕ و قوربانیدان لە پێناویدا.**

ئیمامی (غزالی) هانی خەڵکی داوە بۆ گرنگیدان بە بیروباوەڕی منداڵ و بەگوێدادانی لەکاتی بچووکیەوە تا لەسەری پەروەردە بێت جا دەڵێت: (بزانە، ئەوەی پێشتر دەربارەی بیروباوەڕ باسمان کرد پێویستە پێشکەشی منداڵ بکرێت هەر لەسەرەتای پێگەیشتنیەوە، تا لەبەری بکات و دواتر هێدی هێدی لەگەڵ گەورەبوونیدا بەردەوام واتاکەی بۆ دەربکەوێت، سەرەتا دەست پێکردنی بە لەبەرکردن و پاشان تێگەیشتن، دوای ئەوە باوەڕ هێنان و دڵنیایی و بەجێهێنانی، ئەوا بیروباوەڕ لەلای منداڵ بەبێ بەڵگە و سەلماندن دێتە دی لە فەزڵ و چاکەی خوا بەسەر دڵی ئادەمیزادەوە ئەوەیە هەر لەسەرەتای پێگەیشتنی بڕواکەی گوشاد و فروانی کردوە بەبێ بەڵگەو سەلماندن)).[1]

---

[1] الإحياء ١/٩٤.

پاشان ئیمامی غەزالی ڕێبازی چەسپاندنی بیروباوەڕمان نیشان دەدات، و دەڵێت:

(ڕێگای بەهێزکردن و دامەزراویی بەوە نابێت کە پیشەی مشت و مڕ و موجادەلە و قسەزانی فێر بکرێت، بەڵکو منداڵ سەرقاڵ بکرێت بە خوێندنەوەی قورئان و تەفسیر و خوێندنەوەی فەرموودەو واتاکانی، هەروەها بەکاروباری پەرستشەوە سەرقاڵ بکرێت، چونکە بەهۆی بەگوێدادانی بەڵگەکانی قورئان و پیشاندانی گەواهییەکانی فەرموودەکانی پێغەمبەرو سوودەکانی وە بەبڵاوبوونەوەو بەرزبوونەوەی ڕووناکی پەرستشەکان (عبادات) و ئەرکەکانی، بیروباوەڕەکە زیاتر دەچەسپێت و ڕەگ دادەکوتێت).

لەبەر ئەمە هەموو منداڵێك لەسەر فیترەتی بڕواهێنان (فطرة الإيمانية) لەدایك دەبێت، چۆن نا: ﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِيٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ ۖ قَالُوا۟ بَلَىٰ ۛ شَهِدْنَآ ۛ أَن تَقُولُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَٰذَا غَٰفِلِينَ﴾ الأعراف/١٧٢. واتە: (بیهێنەوە بیریان کاتێ کە پەروەردگارت لەنەوەی ئادەم پەیمانی وەرگرت، هەموو نەوەکانی پشتاوپشتی کۆکردەوە – لەجیهانی پەنهان و شاراوەدا، کاتێ کە هاتنە مەیدانی بوون- کردنی بەشایەت بەسەر خۆیانەوەو – پێی فەرموون-: ئایا من پەروەردگاری ئێوە نیم؟ هەموو وتیان: بەڵێ شایەتین، ئەمەش بۆ ئەوەی نەوەکو لەڕۆژی قیامەتدا بڵێن: ئێمە ئاگامان لە شتی وا نەبووە؟!!)

فەرموودەی قودسیش هەیە ڕاڤەی ئەمە دەکات و بەجوانترین شێوە ڕوونی دەکاتەوە ـ وەك (مسلم) گێڕاویەتیەوە- خوای گەورە دەفەرمووێت: ((**إني خلقت عبادي حنفاء، فجاءهم الشياطين فأجتالتهم عن دينهم، وحرمت عليهم ما أحللت لهم**)). واتە: (من بەندەکانی خۆم پاك دروست کردووە، بەڵام شەیتانەکان بۆیان هاتن و لە ئایینەکەیان دەردێنن و ئەوەی من بۆیانم حەڵاڵ کردووە شەیتان بۆیان حەرام دەکات).

شێخ (ملا علی القاری): لەسەر ڕاڤەی (مسند ابو حنیفە) کاتێك فەرموودەی ((**کل مولود یولد علی الفطرة**))ی هێنا، دەڵێت:[1] واتە سروشتی ئیسلام لە یەکخواپەرستی و عیرفاندا و ماناش ئەوەیە کە گەر وازی لێهێنرا چی دەوێت بیکا، ئەوا جگە لە ڕێبازی باوەڕ لەسەرشێوەی چاك هیچی دیکەی هەڵنەدەبژارد، لەبەر ئەوەی سروشتی بە سازکراوی دروست

---

[1] شرح مسند ابي حنيفة. ص٢٢٥.

کراوە کە شەرع قبوڵ بکات، لەسەر ئەو ئیمانە وازی لێ بهێنرێ ئەوا بەردەوام دەبێت لەسەر پەیوەست بونی و، جگە لە ئیمان مەیل بەهیچیتر نادات. وتراویشە ماناکەی: هەموو منداڵێك لەسەر ناسینی خوای گەورە و داننان پێیدا لەدایك دەبێ، هیچ کەسیش نابینێ کە دان نەنێت بەوە کە خوا دروستکارە، ئەمەش یەکدەگرێتەوە لەگەڵ قسەی (ابوحنیفە) لەوەدا کە پێویستە لەسەر هەموو کەسێکی ئەرکبار کە تەنها بە عەقڵی خۆی خوا بناسێت، بەبێ ئەوەی زانستی بە ناردنی پێغەمبەران هەبێت.

ئەگەر لەلاپەڕەکانی قورئان رابمێنین دەبینین کە پەیامبەر و پێغەمبەران گرنگیەکی زۆر گەورەیان داوە بەساغ و دروستی بیروباوەڕی منداڵەکانیان، لەوانە: ﴿ وَوَصَّىٰ بِهَآ إِبْرَٰهِـۧمُ بَنِيهِ وَيَعْقُوبُ يَٰبَنِيَّ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰ لَكُمُ ٱلدِّينَ فَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴾البقرة/١٣٢. واتە: (ئیبراهیم وەسیّتی کرد بۆ نەوەکانی، هەروەها یەعقوبیش، -هەریەك لەوان وتوویەتی:- رۆڵەکانم! بەراستی خوا ئایینی یەکخواپەرستی بۆ ئێوە بڕیارداوەو هەڵی بژاردووە، ئیتر ئێوەش هەوڵ بدەن بە موسڵمانی نەبێت مەمرن).

ئەوەتا (لقمان) چاودێری کوڕەکەی دەکات و وەسیّتی بۆ دەکات: ﴿ يَٰبُنَيَّ إِنَّهَآ إِن تَكُ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ فَتَكُن فِى صَخْرَةٍ أَوْ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَوْ فِى ٱلْأَرْضِ يَأْتِ بِهَا ٱللَّهُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ ﴿١٦﴾ ﴾ لقمان/١٦. واتە: (-لقمان فەرمووی- ئەی کوڕەکەم! ئەگەر بەقەدەر تۆوی خەرتەلەیەك کردەوەی چاك یان خراپ ئەنجام بدەیت، وە لەناو بەردێکدا لە ئاسمانەکان یان لەزەویدا حەشار درابێ، -خوای گەورە- دەیهێنێتە مەیدان، بەڕاستی خوا هیچ شتێکی لێ شاراوە نیەو زۆریش بەئاگایە).

تێبینی ئەوەش دەکەین کە سوورەتی (الاخلاص) کە بیروباوەڕی عەقڵی دەنوێنێت و سوورەتی (الکافرون)یش کە بڕواهێنانی کرداری دەخاتە ڕوو، هەردووەکیشیان لە کورتترین سوورەتەکانی قورئانن، کە لە بواری بیروباوەڕ دەکۆڵێتەوە، و ئەمەش تەنها ئاماژەیە بۆ ئاسان لەبەرکردنیان بەو منداڵانەی کە بەوە جیادەکرێنەوە پشووکورتن و زاکیرەشیان تازە لە گەشەدایە، وە هەر لە گرنگی پێدانی پێغەمبەرەوەﷺ بە منداڵان هەمیشە بانگی دەکردن بۆ لای ئیسلام، هەتا ڕێگەی خۆی کردەوە بۆ بنیاتنانی نەوەیەك کە (علی کوڕی ابو طالب)ی‌رضي الله عنه تێدا بوو کە تەمەنی لە دەساڵ تێنەپەڕیبوو، بڕوای بە بانگەوازەکەی پێغەمبەرﷺ هێنا،

تەنانەت پێغەمبەرﷺ لە سەردانی کردنی بۆ لای منداڵانی نەخۆشیش بە ئامادەبوونی دایك و باوکیان بۆلای ئیسلام بانگی دەکردن.

ئیمام (عبدالرزاق) دەگێڕێتەوە[1] کە پێغەمبەرﷺ دراوسێیەکی جولەکەی هەبوو کە خووڕەوشتی خراپ نەبوو، پێغەمبەری خواﷺ بەیاوەری هاوەڵانی چووە دیدەنیو پێی فەرموو: ((أتشهد أن لا اله الا الله وأني رسول الله)) ئایا شایەتی دەدەی کە تەنها (الله) خوایەو منیش نێردراوی خوام.

منداڵەکە سەیرێکی باوکی کرد، باوکی بێدەنگ بوو، کوڕەکەش بێدەنگ بوو، پێغەمبەرﷺ قسەکەی دوبارەو سێبارە کردەوە، باوکی لە سێیەم جاردا وتی: ئەوەی پێی وتی بیڵێ، کوڕەکەش وتی، پاش ئەوە مرد، جولەکەکان ویستیان بیشارنەوە، پێغەمبەری خواﷺ پێی فەرموون: ئێمە لەپێشترین لەئێوە، پێغەمبەری خواﷺ شۆردی و کفنی کرد و بۆنی لێدا و نوێژی لەسەر کرد.

پێشینانی چاکیش هەر هەمان گرنگیان دەدا بە بانگکردنی منداڵان بۆ ئیسلام، (عمر کوڕی خطاب)ﷺ ڕێگەی نەداوە بەهیچ جولەکە یا گاورێك کە منداڵەکەی بکاتە گاور یا جولەکە کە لەموڵکی عەرەبدا بوبێت.[2]جارێکیان پیاوێك لە (بنی تغلب)ەوە هات بۆ لای (عمر کوڕی خطاب)، (عمر)ﷺ پێی وت: پێشتر لەنەفامیدا پشکێکتان هەبوو، جا وەرن لە ئیسلامیشدا بەشی خۆتان وەرگرن، بەو شێوەیە لەگەڵیان ڕێککەوت کە سەرانەیان لەسەر سووك بکات و منداڵەکانیان نەکەن بە گاور.[3]

(عمر)ﷺ ئەمەی وەك پەیڕەوکردن و شوێنکەوتنی پێغەمبەری خواﷺ ئەنجام دا: لە (علی کوڕی ابوطالب)ﷺ دەگێڕنەوە کە دەڵێت: پێغەمبەری خوامﷺ بینی کاتێك لەگەڵ گاورەکانی (بنی تغلب)دا لەسەر ئەوە پێکهات کە منداڵەکانیان نەکەن بە گاور، خۆ گەر وایان بکردایە (یانی بیانکردبان بەگاور)، ئەوا بێپەیمان دەبوون، (علی) دەڵێت: گەر پەیمانەکەیان بەتاڵ بکردایەتەوە لەگەڵیاندا دەجەنگا. (مجاهد)یش بە خزمەتکارە گاورەکەی دەڵێت: ئەی (جریر) موسڵمان بە، پاشان دەڵێت بەو جۆرە پێیان دەوترا.[4]

---

[1] المصنف: ٣٤/٦

[2] مصنف عبدالرزاق ٤٨/٦.

[3] المصدر السابق ٥٠/٦.

[4] المصدر السابق ١٢٣/٦.

ئەوەی باسکرا تەنها بۆ وریاکردنەوەی نەوەکانی داهاتوو و سەرکردەکان و زاناکانیەتی تا گرنگی بە منداڵان بدەن و بە پشتگوێخراوی وازیان لێ نەهێنن کە ڕەشەبا بیانهێنێت و بیانبات، و پیاوانی بێباوەڕ و بانگەشەکارانیان لە ئامێزیان بگرن.

## بنچینەی یەکەمی بیروباوەڕ: وشەی یەکخوا پەرستی دان بە گوێی منداڵدا:

(حاکم) لە (ابن عباس)ەوە دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەرﷺ دەفەرموویێت: ((**أفتحوا على صبيانكم أول كلمة لا اله الا الله، ولقنوهم عند الموت لا اله الا الله**)). واتە: (یەکەم وشە کە زمانی منداڵەکانتانی پێ دەکەنەوە با (**لا اله الا الله**)بێت، و لەکاتی مردنیشدا (**لا اله الا الله**) بدەن بە گوێیاندا).

(عبدالرزاق)یش گێڕاویەتەوە کە: پێشینەکان حەزیان لەوەبوو یەکەم شت کە زمانی منداڵەکانیانی پێ بکرێتەوە فێری (لا اله الا الله)یان بکەن کە حەوت جار بیڵێن، ئەوەش دەبێتە یەکەم شت کە قسەی پێ دەکات.

(ابن قیم) لە (احكام المولود)دا دەڵێت: ئەگەر کاتی زمان کرانەوەیان هات با پێیان بڵێن (لا اله الا الله محمد رسول الله)، وە با یەکەم شت کە بە گوێیاندا دەدرێت ناسینی خوا و یەکخوایی بێ کە خوای گەورە لەسەر عەرشەکەیەتیو تەماشایان دەکات و گوێی لە قسەکانیانە، لەهەرشوێنێك بن خوا لەگەڵیانە، بەنی ئیسرائیلییەکانیش زۆرجار وشەی (عمانويل) دەدەن بەگوێی منداڵەکانیاندا، ئەم وشەیە واتای (خوامان لەگەڵە)، لەبەر ئەوەشە کە خۆشەویستترین ناو لای خوا (عبدالله) و (عبدالرحمن)ە، بەجۆرێك کە منداڵەکە هۆشی کرایەوەو تێگەیشت بزانێ ئەو بەندەی خوایە و تەنها (الله)ش گەورەو سەروەر و بەدیهێنەریەتی.

(عبدالرزاق)[1] لە (عبدالكريم ابو اميه)ەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خواﷺ منداڵێکی (بنی هاشم)ی لەکاتی زمان کرانەوەیدا فێر دەکرد کە حەوت جار بڵێت: ﴿ وَقُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى لَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ شَرِيكٌ فِى ٱلْمُلْكِ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ وَلِىٌّ مِّنَ ٱلذُّلِّ وَكَبِّرْهُ تَكْبِيرًا ﴾الإسراء/١١١.[2] واتە: (بڵێ سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە کەسی نەکردووە بە کوڕی خۆی و کوڕیشی

---

[1] مصنف عبدالرزاق ٤/٣٣٤.

[2] رواه الإمام احمد في مسنده.

هەر نیە، هەروەها لە موڵك و مەملەكەتیدا كەس شەریك و هاوتای نیە، و هەرگیز بەهۆی بێدەسەڵاتی و كەم توانینەوە كەسی نەكردووە بە یاوەر و یاریدەدەری خۆی، (لەبەر ئەوە هەملشە (الله اكبر) بڵێ و ئەو زاتە بە گەورەو مەزن بزانە).

(ابن ظفر المكي)یش بەسەرهاتێكی خۆش لەبارەی خۆشەویستی منداڵ لە دووبارەكردنەوەی (لا اله الا الله محمد رسول الله) دەگێڕێتەوە و دەڵێت:

پێیان ڕاگەیاندم كە (ابوسلیمان داود كوڕی نصر الطائی) كاتێ تەمەنی گەیشتە پێنج ساڵی، باوكی بردیە لای پەروەردەكارێك و دایە دەستی، و قورئانی بەگوێدادا، ئەویش گوێڕایەڵ بوو، كاتێك كە فێری سوورەتی ﴿هَلۡ أَتَىٰ عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ حِينٞ مِّنَ ٱلدَّهۡرِ لَمۡ يَكُن شَيۡـٔٗا مَّذۡكُورًا﴾الأنسان/١. بوو و لەبەری كرد، لە ڕۆژی هەینیدا دایكی تەماشا دەكات وا ڕووی كردۆتە دیوارەكەو بیر دەكاتەوەو دەستی دەجولێنێ، دایكی ترسا تێك چوبێت، بۆیە بانگی كرد و وتی: (داود) هەستە لەگەڵ منداڵاندا یاری بكە، ئەو هیچ وەڵامی نەدایەوە، دایكی كردیە باوەشی و دەستی كرد بە ڕۆڕۆ، (داود) وتی: دایكە ئەوە چیتە؟ دەڵێی نارەحەتی؟ وتی: كوا هۆش و بیرت؟ وتی: لەگەڵ بەندەكانی خوادایە، وتی: ئەوانە لەكوێن؟ وتی: لەبەهەشت، وتی: خەریكی چین؟ وتی: ﴿مُّتَّكِـِٔينَ فِيهَا عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِۖ لَا يَرَوۡنَ فِيهَا شَمۡسٗا وَلَا زَمۡهَرِيرٗا﴾الأنسان/١٣. واتە: -(ئەو بەختەوەرانە- لەسەر كورسی و قەنەفە ڕازاوەكان شانیان داداوە، نە گەرمایی خۆر بێزاریان دەكات، نە كزەبا و سەرما سەغڵەتیان دەكات).

پاش ئەوە بەسەر سوورەتەكەدا ڕۆیشت، لەكاتێكدا كە حەپەسا بوو وەك ئەوەی كە لە شتێك ڕامابێت، هەتا گەیشتە سەر ئەو ئایەتەی دەفەرمووێت: ﴿وَكَانَ سَعۡيُكُم مَّشۡكُورًا﴾الإنسان/٢٢. واتە: هەوڵ و كۆشش و كاروكردەوەی ئێوە بەڕاستی شایانی سوپاس و ڕێزە، پاشان وتی: دایكە! هەوڵ و كۆششی ئەوانە چیبوو؟ دایكی نەیزانی كە چیی وەڵام بداتەوە، بۆیە بەدایكی وت: هەستە لای من برۆ هەتا ماوەیەك لە خزمەتیاندا دەبم، جا لەلای هەستا و هەواڵی نارد بۆ باوكی و حاڵی كوڕەكەی تێگەیاند، باوكیشی پێی وت: ئەی (داود)! هەوڵ و كۆششی ئەوانە ئەوە بوو كە (لا اله الا الله محمد رسول الله)یان دەوت، ئیدی لەوە بەدوا (داود) زۆربەی كاتەكان ئەوەی دەوتەوە.

هەر لەبەر ئەمەش وەسیێتی پێغەمبەرﷺ بۆ (معاذ) ئەوەبوو کە پێی فەرموو:[1] ((وأنفق علی عیالك من طَوْلك، ولا ترفع عنهم عصاك أدباً، وأخفهم في الله)). واتە: (بەگوێرەی توانای خۆت بۆ ماڵ و منداڵەکانت سەرف بکە، و داریان لەسەر هەڵمەگرە بۆ تەمبێکردن، و لەخوا بیانترسێنە).

کاتێك کە پێغەمبەری خواﷺ پەیامی بۆ هات، رانەوەستا کە منداڵان لە بانگەواز بۆ ئیمان دوور بخاتەوە، بەڵکو لەو ئاسۆ تەسکەی بانگەوازی حزبیەکان تێپەڕی و بەرەو لای (علی کوری ابوطالب)[2] کەوتە رێ، - لەکاتێکدا تەمەنی لە دەساڵ تێپەڕ نەبوو-، داوای لێکرد باوەڕ بهێنێت، ئەویش باوەڕی هێنا و شوێنی کەوت و هاودەمی بوو لەچوونە دەرەوە بۆ نوێژکردن بەنهێنی لە دۆڵی مەککە، تەنانەت بەبێ ئەوەی کەس و کاری و باوکی پێی بزانێ.

جارێکیان باوکی (علی) پێغەمبەرﷺ و (علی) بینی نوێژیان دەکرد، جا بە پێغەمبەری خوایﷺ وت: ئەی برازاکەم! پێم بڵێ ئەمە چ ئایینێکە تۆ بڕوات پێهێناوە؟ پێغەمبەرﷺ وەڵامی دایەوە: مامە! ئەمە ئایینی خودایەو ئایینی فریشتەکانی خوایە، و ئایینی پێغەمبەران و ئایینی ئیبراهیمی باوکمانە، خوای گەورە کردومی بە پێغەمبەر و ناردومی بۆ لای بەندەکانی، تۆش لەهەموو ئەوانە لەپێشتری کە ئامۆژگاریم کردون، وبۆ رێنمایی بانگم کردون، جا تۆ لەوان لەپێشتری وەڵامم بدەیتەوەو لەسەر ئەم ئایینە یارمەتیم بدەی.[3]

بەڵام یەکەمین کەس لە خزمەتکاران کە موسڵمان بوو (زید کوری حارثة) بوو، کە پێشتر مامەی خاتو خەدیجە، (حکیم کوری حزام) لەنێو گیراوەکانی شامدا هێنابووی، و خاتو (خدیجە)ش هەڵیبژارد و کردی بە غولامی خۆی، پاشان پێغەمبەری خواﷺ داوای کرد و رزگاری کرد و کردی بە کوری خۆی و لەماڵی خۆیدا بەخێوی کرد.[4]

ئا بەو جۆرە پێغەمبەری خواﷺ ئەو بانگەوازە نوێیەی دەست پێکرد بە مەبەستی دامەزراندنی کۆمەڵگەیەکی ئیسلامی نوێ کە گرنگی زۆری بە منداڵان داوە، بە چاودێری

---

[1] رواه احمد وابن ماجه والبخاري في الأدب المفرد.

[2] **(ابن صلاح) لە پێشەکیەکەیدا(لا۱۵۰) دەڵێت: جوانتر وایە کە بوترێت یەکەمین کەس لە پیاوانی ئازاد (ابوبکر)، و لە منداڵان یان لاوان (علی)، و لە ئافرەتان (خدیجە)ی بەڕێز، و لەخزمەتکاران (زید کوری ثابت)، و لە بەندەکان (بیلال) موسڵمان بوون.**

[3] سيرة نبي الهدى-تأليف عبدالسلام هاشم حافظ- (ص۸۱) طبع رابطة العالم الإسلامي، مكة المكرمة.

[4] المصدر السابق.

بانگەواز و پاڕانەوە هەتا (علی) شەرەفی پارێزگاری کردنی لەپێغەمبەری خوایﷺ پێبڕا، بەوەی کە لەو شەوەدا پێغەمبەری خواﷺ کۆچیکرد، ئەو لەماڵەکەی خەوت، راستی ئەمەش پەروەردەی پێغەمبەرەﷺ بۆ منداڵانی تازەپێگەیشتوو، تا لە داهاتوودا ببنە سەرکردە، و دامەزرێنەری کۆمەڵگای ئیسلامی تازە لەدایك بوو.

دەبا بەئاگا بێین و لە خاڵی سەرەتاییەوە دەست پێبکەین بۆ دەرپەڕینێکی نوێ لە سەدەی پازدەی کۆچیەدا.

## بنچینەی دووەمی بیروباوەڕ: خۆشەویستی خوای گەورەو داوای یارمەتیکردن لێی و چاودێری خواو بڕوابوون بە قەزاو قەدەر:

هەموو منداڵێك گیروگرفتێکی تایبەتی خۆی هەیە، ئیدی دەروونی بێت یا کۆمەڵایەتی یا ئابووری یا گیروگرفتی قوتابخانە، ئەو گیروگرفتانەش لە منداڵێکەوە بۆ منداڵێکی دی، لە تەوژم و توندی و نەرمیدا جیاوازی هەیە، منداڵیش بەشێوەی هەستی (شعوری) یاخود نەستی (لاشعوری) گوزارشت لەو تەنگ و چەڵەمانەی دەکات، دەبێت بەچ هۆکارێك بتوانرێت لەناوەوە چارەسەر بکرێت؟ وە بەچ رێگەیەك منداڵ دەتوانێت لەئازارەکانی خۆی سووك بکاتەوە گەر هەبوو، وە لە گیروگرفتەکانی رزگار بکات ئەگەر روویدا؟

ئەوەش تەنها بە چەسپاندنی خۆشەویستی خوای گەورەو داوای یارمەتی لیێ کردنی و چاودێریکردنی و بڕواهێنان بە قەزاوقەدەر دەبێت، ئەوەش شێوازی پێغەمبەری خوایەﷺ و داهێنراوی هیچ کەسێکی دیکە نیە.

جا لە قووڵبوونەوەو رۆچوونی ئەو خۆشەویستی و داوای یارمەتیکردنە لە دەروونیداو، بە ریشەداکوتانی ئەم چاودێرییە لە دڵیدا، و بەچاندنی بڕوا بەقەزاو قەدەر لە کرۆك و دڵیدا، منداڵ توانای روبەڕوبوونەوەی ژیانی منداڵێتی ئێستا و داهاتووی پیاوێتی -یاخود دایکێتی- دەبێت لەدواییدا:

## ١- ئەو فەرموودانەی کە منداڵ لەسەر ئەمە هاندەدات:

لە (ابن عمر)ەوەم دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ دەفەرمووێت: ((**لا ترفع العصا على أهلك وأخفهم في الله**)).[1] واتە: (دار لە خێزانت بەرز مەکەوەو لەخوای گەورە بیانترسێنە).

هەروەها (ترمذی) لە (ابن عباس)ەوەم هێناویەتی، کە دەڵێت: رۆژێك لەپشت پێغەمبەری خواوەﷺ بووم، فەرمووی: ((**يا غلام! إني أعلمك كلمات: أحفظ الله يحفظك، أحفظ الله تَجدْهُ تُجاهكَ؛ إذا سألت فأسأل الله، وإذا أستعنت فاستعن بالله؛ وأعلم أن الأمة لو أجتمعت على أن ينفعوك بشيء، لم ينفعوك الا بشئ قد كتبه الله لك، وإن أجتمعوا على أن يضروك بشيء لم يضروك الا بشيء قد كتبه الله عليك، رُفعت الأقلام و جفت الصحف**)). واتە: (رۆڵە! چەند وشە و قسەیەکی بەسوودت فێر دەکەم، ئاکات لە خوا بێ (فەرمانی جێبەجێ بکە و قەدەغەی مەشکێنە) خوداش دەتپارێزێ (بەچاوی رەحمەت ئاگای لە ماڵ و منداڵ و ئاینت دەبێ)، خوا بپارێزە (لە ئاگاداری خوا غافڵ مەبە)، دەبینیت خوا لەگەڵتایە (لە تەنگانەدا فریات دەکەوێ)، هەرکاتێك ویستت شتێك داوا بکەی ئەوا لەخودای داوا بکە، هەرکاتێك ویستت داوای یارمەتی بکەیت، ئەوا هەر لە خودای داوا بکەو پشت تەنها بەو ببەستە، ئەوەش بزانە گەر هەموو خەڵك کۆ ببنەوە بۆ ئەوەی سوودێکت پێ بگەیەنن، سوودیان نابێت مەگەر ئەو سوودەی کە خوا بۆی نووسیویت، وە گەر هەموو خەڵك کۆببنەوە بۆ ئەوەی زیانێکت توش بکەن، ناتوانن مەگەر ئەو زیانەی کە خوای گەورە لەسەری نووسیوی، قەڵەمەکان هەڵگیران و نووسراوەکان وشك بوونەوە (واتە: قەزا و بڕیاری خوا بەسەر هەموو دروستکراوەکانیدا تەواوبوو).

لەگێڕانەوەی کەسانی تردا (جگە لە ترمذی) ئەم زیادەیە هەیە: ((**أحفظ الله تجده أمامك، تَعَرَّف الى الله في الرخاء، يعرفك في الشدة؛ وأعلم أن ما أخطأك لم يكن ليصيبك، أن ما أصابك لم يكن ليخطئك؛ وأعلم أن النصر مع الصبر، وأن الفرج مع الكرب وأن مع العسر يسراً**))[2]، واتە: (ئاگاداری خودا بە، خودا ئاگادارت دەبێ، لەکاتی خۆشی و هەبوونیو

---

[1] رواه الطبراني في الصغير والأوسط وأسناده جيد كذا قاله الهيثمي في المجمع ١٠٦/٨.

[2] صحيح ورواه احمد والحاكم والطبراني وابن السني والآجري والضياء. أنظر صحيح الجامع رقم ٧٩٥٧.

شادیدا خودات لە یاد بێ (خۆت بەخوا بناسێنە)، خوداش لە تەنگانەدا دەتناسێت و دێت بە هاناتەوە، باش بزانە ئەوەی کە بۆ تۆ نابێ لە چاکەو لە خراپە هەر لەیەکەم رۆژەوە بۆ تۆ دانەنراوە، و ئەوەی پێت دەگات لە چاکە و خراپە، هەر لە یەکەم رۆژەوە بۆ تۆ دیاریکراوەو نادرێ بە یەکێکی تر، چاك بزانە سەرکەوتن لەهەموو کارێکدا لەگەڵ خۆڕاگرتنا بەیەکەوە بەستراون، و دەرو لێکردنەوەش لەگەڵ مەینەت و ناخۆشیدایە، دیسان بزانە لەگەڵ هەموو سەختیەکدا ئاسانیەك هەیە).

خۆ گەر منداڵ ئەو فەرموودەیە لەبەر بکات و بەچاکی تێی بگات، هیچ کۆسپێك خۆی لەبەردەمیدا ناگرێت، و هیچ تەگەرەیەك بەدرێژایی ژیانی نایەتە رێی، چ پەروەردە کردنێك -لە کۆن و ئێستاشدا- دەتوانێت لە دەروونی منداڵدا بگاتە ئەو ئاستەی کە ئەم فەرموودەیە پێی گەیشتوە.

هەر بۆیە ئەم فەرموودەیە هێزێکی زۆر گەورەی هەیە بۆ سەر چارەسەر کردنی گیروگرفتەکانی منداڵ، بەهۆی کاریگەرییەکەی و رۆحیانیەتەکەیەوە، هەروەها ئەو توانایەی تێدایە کە منداڵ بەرەو پێش ببات بەهۆی داوای یارمەتی کردنی لەخوا و چاودێریکردنی بۆیو باوەڕهێنانی بە قەزاوقەدەر، لە راستیدا منداڵانی هاوەڵانی پێغەمبەریش ئەم رێنماییەی پێغەمبەریانﷺ فێرکرابوو، پشتیان بە خوا دەبەست و داوای یارمەتیان لەو دەکرد لەو قەدەرانەدا کە تووشیان دەبوو، لەکاتی هاتنی بەلآ و نارەحەتیش بەسەریاندا تەنها داوایان لە خودا دەکرد و باوەڕیان وەهابوو کە (لا حول ولا قوة الا بالله) هیچ هەوڵ و توانایاك نیە تەنها بەخوا نەبێت، لەو باوەڕەشدا بوون کە دەروو لێکردنەوە لەگەڵ مەینەت و ناخۆشیدایەو هەموو سەختی و نارەحەتیەکیش ئاسانی لەگەڵدایە.

فەرموو ئەوەش روونکردنەوەی کرداریی لەو رووەوە، نەك تەنها قسەیەکی زارەکی:

(ابن رجب الحنبلی) لە کتێبەکەیدا[1] هێناویەتی و دەگێڕێتەوە کە (ادم کوڕی ابو ایاس) لە تەفسیرەکەیدا لە (محمد کوڕی اسحاق)ەوە، دەڵێت: (مالك الاشجعی) هات بۆ لای پێغەمبەرﷺ و وتی: (عوف)ی کوڕم دیل کراوە، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: وەلامی بۆ بنێرن کە پێغەمبەری خواﷺ فەرمانت پێدەکات زۆر (لا حول ولا قوة الا بالله) بلێتەوە، نێردراوەکە

[1] جامع العلوم والحکم ص١٨٧.

ڕۆیشتە لای و ئەوەی پێوت، (عوف)یش دەستی دایە وتنی (لا حول ولا قوة الا باللە)، لەکاتێکدا بەدارێکەوە بەستبویانەوە، زنجیرەکە لێی بویەوەو کەوت، جا ڕۆیشتە دەرەوە، حوشترێکیان لەوێدا بوو، سواری بوو و کەوتە ڕێ، مێگەلە حوشترێکی ئەو هۆزەی بینی کە بەندیان کردبوو، هاواری لێ کردن، هەموو حوشترەکان بەرودوا هاتن بەشوێنیا، باوك و دایکی ئەوەندەیان زانی وا لە دەرگاوە بانگیان دەکات، باوکی وتی: سوێند بە پەروەردگاری کەعبە ئەوە (عوف)ـە، دایکیشی وتی: دەك ماڵیان خرابێ، (عوف) بەهۆی بەستنەوەوە ئازاری هەیەو دڵتەنگە، باوك و خزمەتکارەکە بەپەلە چوون بۆ لای، دیتیان کە (عوف) حەوشەکەی پڕ لە حوشتر کردووە، (عوف) بەسەرهاتەکەی و مەسەلەی حوشترەکانی بۆ باوکی گێڕایەوە، ئەویش هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ و هەواڵی (عوف) و حوشترەکانی پێدا، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((أصنع بها ما أحببت، وما كنت صانعاً بأبلك)). واتە: چۆنت پێ خۆشە ئاوای لێ بکە، هەروەك هی خۆت بێت.

ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا ۝٢ وَيَرۡزُقۡهُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَحۡتَسِبُۚ وَمَن يَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسۡبُهُۥٓ﴾الطلاق/٢-٣. واتە: (ئەوەی لە خوا بترسێت و پارێزکار بێت، خوا دەرووی لێ دەکاتەوەو لە شوێنێکەوە رزق و ڕۆزی پێدەبەخشێت کە حیسابی بۆ نەکردبێت و بەخەیاڵیدا نەهاتبێت، جا ئەوەی پشت بەخوا دەبەستێت، ئەو زاتەی بەسە بۆ ئەوەی کە یاریدەدەری بێت.

لە(سهل کوڕی سعد)یش دەگێڕنەوە کە کوڕێکی ئەنصاری ترسی ئاگر چووبووە دڵیەوە، هەر بۆیە لەکاتی باسکردنی ئاگردا دەگریا، تا وای لێ هات بەهۆی ئەوەوە لەماڵ نەیەتە دەر، ئەوەیان بۆ پێغەمبەرﷺ گێڕایەوە، ئەویش هاتە لای لەماڵەوەدا، کاتێك چویە ژورەوە بۆ لای، کوڕەکە دەستی کردە ملی پێغەمبەر و گیانی دەرچوو، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((جهزوا صاحبكم، فإن الفرق فلذ كبده))[1]. واتە: (هاوڕێکەتان ئامادە بکەن، ترس جەرگی بڕیوە).

ئەمەش نمونەیەکی دیکەیە لەبارەی گرنگی پێدانی پێشینانی چاك بە چەسپاندنی ئیمان و چێژ لێ وەرگرتنی، و تەواو بڕوابوون بەقەزاو قەدەریش ڕێگەی گەیشتنە بەوە، تێبینی ئەوەش

[1] رواه الحاكم في مستدركه ٢/٤٩٤ وقال: صحيح الأسناد و لم يخرجاه وقال الذهبي: صحيح ورواه ابن ابي الدنيا.

دەکری کە پێشینانی چاك لە سەختترین کاتەکانی پێش مردن، چەند سوور بوون لەسەر ڕێنمونی و ئاراستەکردنی منداڵەکانیان:

ئیمام (احمد) لە (ولید کوڕی عمارە)ەوە دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: (عبادە) نەخۆش بوو، چووم بۆ لای،لەخەیاڵمدا مردنم تێدا بەدی دەکرد، وتم: باوکە! ئامۆژگاریم بکە و کۆششم بۆ بکە، وتی: لام دانیشە، کاتێك لای دانیشتم، وتی: کوڕم! تۆ چێژی ئیمانت نەچەشتووەو ناشگەیت بە حەقیقەتی خواناسیت هەتا باوەڕت نەبێ بە قەزاو قەدەر، بەخۆشی و ناخۆشی یەوە، وتم: باوکە! باشە چۆن بزانم کە کامەیە قەدەری چاك یا خراپ؟ وتی: باش بزانە ئەوەی کە بۆتۆ نابێ لە چاکە و خراپە لەیەکەم ڕۆژەوە بۆ تۆ دانەنراوە، و ئەوەی کە پێت دەگات لە چاکەو خراپە، هەر لە یەکەم ڕۆژەوە بۆ تۆ دیاریکراوەو نادرێ بە یەکێکیتر، کوڕە ئازیزەکەم! گوێم لە پێغەمبەری خواﷺ بوو دەیفەرموو: **((إن أول ما خلقه الله القلم، ثم قال له: أكتب، فجرى في تلك الساعة بما هو كائن الى يوم القيامة))**. واتە: (یەکەم شت کە خوا دروستی کرد قەڵەم بوو، پاشان پێی فەرموو: بنووسە، لەو کاتەدا هەرچی هەیە و ڕوودەدات هەتا ڕۆژی قیامەت هەرهەمووی نووسی).

کوڕەکەم! گەر مردیت و باوەڕت بەوە نەبوو ئەوا دەخرێیتە ئاگرەوە.

## * چەند نمونەیەکی کرداریی لەژیانی پێشینانی چاك:

١- (عمر کوڕی خطاب)ﷺ لەو کاتەدا کە ئەمیری باوەڕداران بوو، ڕۆژێکیان بەڕێگادا دەڕۆیشت، لە ڕێگەکەیدا کۆمەڵێك منداڵ یاریان دەکرد، کاتێك ئیمامی (عمر)یان بینی هەموویان ڕایان کرد جگە لە (عبدالله کوڕی زبیر)، (عمر) ئەوەی پێ سەیر بوو و پرسیاری لێی کرد کە بۆچی ڕای نەکرد، لە وەڵامدا وتی: هیچ تاوانێکم نەبوو تا بەهۆیەوە ڕابکەم، و لێت نەدەترسام تا ڕێگەت بۆ فراوان بکەم.[1]

٢- (ابن عمر)ﷺ لەسەفەردا بوو، شوانێکی بینی مەڕی دەلەوەڕاند، بە شوانەکەی وت: لەو مەڕانە دانەیەکم پێ نافرۆشیت؟ وتی: ئەوانە هی من نین، (ابن عمر) پێی وت: بە خاوەنەکەیان بڵێ گورگ دانەیەکی خوارد، شوانەکە وتی: ئەی خوا لەکوێیە؟ پاش ئەوە تا ماوەیەکی زۆریش (ابن عمر) قسەی ئەو شوانەی دەوتەوە (فاين الله = خوا لەکوێیە؟)[2]

---

[1] كتاب (تذكرة الآباء وتسلية الأبناء) لأبن العديمك المتوفي ٦٦٠هـ. ص٦١.

[2] الرسالة القشيرية ص١٤٧.

هەندێك لە زانایان قوتابیان هەبوو، كە لەنێویاندا یەكێكیانی دیاری كردبوو لەوانی دی زیاتر رووی پێدەدا، لەو بارەیەوە پرسیاریان لێ كرد، لە وەڵامدا وتی: بۆتانی روون دەكەمەوە، جا هەر یەكەیان باڵندەیەكی دایە دەست، و وتی: برۆ لە جێگایەكدا سەری ببڕە كە كەس نەیبینێ، بەو قوتابیەشی دابوو كە زیاتر روی پێدەدا، جا رۆیشتن و دوای ماوەیەك گەڕانەوە، هەریەكەیان باڵندەكەی خۆی سەربڕیبوو، تەنها ئەوەیان نەبێت كە زاناكە زیاتر گرنگی پێ دەدا، كە باڵندەكەی بە زیندویی هێنابوەوە، زاناكە پێی وت: بۆ سەرت نەبڕیوە؟ وتی: تۆ فەرمانت پێكردبووم لەجێگایەكدا سەری ببڕم كە كەس نەیبینێ، منیش هیچ شوێنێكم نەدۆزیەوە كە كەس نەیبینێ، زاناكە وتی: لەبەر ئەمەیە زیاتر رووی پێدەدەم و جێگای گرنگیپێدانمە.[1]

٣- ئیمامی غەزالی لە كتێبی (احیاء)دا[2] سەرگوزشتەیەكی خۆشی هێناوەتەوەو، دەڵێت: (سهل كوڕی عبدالله تستری) وتوویەتی: كاتێك كە تەمەنم سێساڵان بوو بەشەو هەڵدەستام و، سەیری نوێژكردنی (محمد كوڕی سوار)ی خاڵم دەكرد، رۆژێكیان پێی وتم: ئایا یادی ئەو خودایە ناكەیت كە دروستی كردویت؟ وتم: چۆن یادی بكەم؟ وتی: لەنێو جێگەی نووستنندا كاتێك ئەم دیو ئەودیو دەكەیت بەبێ ئەوەی زمانت بجولێنی سێ جار لەدڵی خۆتدا بڵێ: (الله معي، الله ناظري، الله شاهدي) واتە: (خوا لەگەڵمایە، خوا سەیركەرمە، خوا دەمبینێ و شایەتمە). منیش چەند شەوێك ئەوەم وت و، پاشان پێم ڕاگەیاند، ئەمجارەیان پێی وتم: هەموو شەوێك حەوت جار بیڵێ، منیش وام كرد، پاشان چوومەوە لای و پێم ڕاگەیاند كە وام كردوە، ئەمجارەیان پێی وتم: شەوی یازدەجار بیڵێ، منیش وتم، چێژ و شیرینی ئەوە كەوتە دڵم، پاش تێپەڕبوونی ساڵێك بەسەر ئەوەدا خاڵم پێی وتم: بەردەوام بە لەسەر وتنی ئەوە هەتا دەچیتە نێو گۆڕ، چونكە ئەوە سوودی دنیاو قیامەتی تێدایە، جا ئەوە ساڵانێكە لەسەر ئەوە بەردەوامم، چێژ و شیرینیەكم لە پەنهاندا بەدی كرد لەو كارەمدا، پاش ئەوە رۆژێكیان خاڵم پێی وتم: ئەی (سهل)! هەركەسێك خودای لەگەڵدا بێت و ئەو سەیری بكات و شایەتی بێت، ئایا سەرپێچی فەرمانی دەكات؟ ئاگاداربە لە سەرپێچی كردن، ئیدی من تەنیا دەبووم و لە خەڵوەتدا بووم، ناردمیان بۆ مەكتەب، وتم: دەترسم كە ئەو خولیایەم لێم جودا بێتەوە، هەر بۆیە مەرجیان بۆ

---

[1] المصدر السابق.

[2] وانظر كتاب (أنباء نجباء الأبناء) ص٤٤، لأبن ظفر المكي.

مامۆستا دانا کە من ڕۆژی ماوەیەك دەچوومە لای بۆ فێربوون و پاشان دەگەڕامەوە، پاشان ڕۆشتم بۆ لای نووسەران (مامۆستای فەقێکان)، لەوێدا فێری قورئان بووم و لەبەرم کرد، لەکاتێکدا تەمەنم شەش یان حەوت ساڵان دەبوو، وە هەموو ڕۆژەکان بەرۆژو دەبووم، و بۆ ماوەی دوانزە ساڵ خۆراکم نانی جۆ بوو.

٤- (ابن ظفر المکی) دەگێڕێتەوە[1] کە: (حارث المحاسبی) لەکاتی منداڵیدا بەلای هەندێك منداڵدا تێپەڕی کە لەبەردەم ماڵی خورمافرۆشێك یارییان دەکرد، ئەویش ڕاوەستا و سەیری دەکردن، خاوەن ماڵ هاتە دەرەوەو هەندێ خورمای پێبوو، بە (حارث)ی وت: ئەم خورمایانە بخۆ، (حارث) وتی: باشە بۆ، ئەوانە چین؟ وتی: من خورمام لە پیاوێك کڕی، هەندێك لە خورماکەی کەوتنە خوارەوە، (حارث) وتی: ئایا دەیناسیتەوە؟ وتی بەڵێ، (حارث) کە گوێی لەوە بوو سەیری منداڵەکانی کرد کە یاریان دەکرد، و وتی: ئایا ئەم پیاوە پیرە موسڵمانە؟ منداڵەکان وتیان: بەڵێ، (حارث) ڕۆشت و بەجێی هێشت، کابرای خورمافرۆش کەوتە شوێنی هەتا گرتی، و پێی وت: بەخوا لەدەستم دەرناچیت هەتا ئەوەی کە لە ناختدایە بەرامبەرم پێم نەڵێیت، (حارث) وتی: مامەپیرە! ئەگەر تۆ موسڵمانی داوا لە خاوەنی ئەو خورمایانە بکە بیانباتەوە تا ڕزگارت بی لە زیان و خراپەکەی، هەروەك چۆن لەکاتێکدا کە زۆر تینووتە و داوای ئاو دەکەیت، ئاواش داوا لەو کابرایە بکە، مامەپیرە! خۆت بە موسڵمان دەزانیت و حەرامیش دەرخواردی منداڵی موسڵمانان دەدەیت؟ پیاوەپیرەکە وتی: سوێند بەخوا تا ماوم بازرگانی بۆ دنیا ناکەم.

هەروەها دەگێڕێتەوە[2]: بیستم کە (ابو حسین احمد کوڕی محمد نوری) کاتێك دەستی دایە قورئان خوێندن، بەپێویستی دەزانی کە لە دوکانەکەیشیدا پێی بێت، هەر بۆیە کە ڕۆژ دەبوویەوە کەلوپەلی نووسینی هەڵدەگرت و دەڕۆیشت، هەر شتێك دەربارەی هەرشتێك لەقورئان کە شارەزای نەبوایە پرسیاری دەکرد و ئەوەی پێی دەوترا دەینووسیەوە، پاش ئەوە دەگەڕایەوە بۆ لای باوکی، باوکی لەدواکەوتنەکەی توڕە دەبوو و هەڕەشەی لێ دەکرد و لەوانەیە لێشی دابێ لەسەر ئەوەی کە بۆ نەهاتوە، وە ئەگەر باوکی بۆ پێویستیەك بیناردبایە ئەوا کاغەزەکانی لەگەڵ خۆی دەبرد و هەرکەسێکی زاناو خاوەن زانیاری بەلادا تێپەڕ ببوایە پرسیاری لێ دەکردن، لەسەر ئەوە لەوانەیە هەندێ جاریش باوکی لێی دابێ، ڕۆژێکیان باوکی

[1] کتاب (أنباء نجباء الأبناء) ص١٤٨، لأبن ظفر المکي.
[2] کتاب (أنباء نجباء الأبناء) ص١٥٦، لأبن ظفر المکي.

پێی وت: خۆزگە بمزانیایە بەم زانستە چیت دەوێ؟ وتی: دەمەوێ خوای گەورە بناسم و خۆمی پێ بناسێنم، وتی: چۆنی دەناسیت؟ وتی: بە تێگەیشتن لەو شتانەی کە فەرمانی کردووە بیکەم و ئەوانەی قەدەغەی کردووە لێم دەیناسم، وتی: ئەی باشە چۆن خۆتی پێدەناسێنی؟ وتی: بە ئەنجام دانی ئەو کارانەی فێری کردووم خۆمی پێدەناسێنم، باوکی پێی وت: ئیدی تاماوم رێگری لەبەردەمتدا دروست ناکەم.

٥- بە وەرعی ئیمام (احمد کوڕی حنبل) لەکاتی منداڵیدا کۆتایی بەم نمونانە دەهێنین:

مامەی ئیمام (احمد) نامەی دەنارد بۆ هەندێك لە والیەکان دەربارەی بارودۆخی بەغدا، تا خەلیفە لێی ئاگادار بێت، جارێکیان بە (احمد)ی برازایدا ناردی، بەڵام ئەو پارێزی کرد لەوەو فرێی دایە نێو ئاو نەوەك قسەی پاشملەی تێدا بێ و ببێتە هۆی شتێك کە لەوانەیە زیانی موسڵمانانی تێدابێ، ئەم چاکێتیەی جێگای سەرنجی زۆر لە زانایان و کەسانی خاوەن فیراسەت بوو، تەنانەت (هیثم کوڕی حنبل) وتوویەتی: ئەگەر ئەم کوڕە بمێنێت دەبێتە بەڵگە بەسەر خەڵکی سەردەمەکەیەوە.[1]

## بنچینەی سێیەمی بیروباوەڕ: چەسپاندنی خۆشەویستی پێغەمبەرﷺ و خانەوادە پاکەکەی و هاوەڵە بەڕێزەکانی:

بەهۆی ئەمەشەوە نیوەی دووەمی شایەتی دان دێتە دی، شایەتی ئەوەی کە (لا الە الله محمد رسول الله)، پێشینانی چاك و خەڵکی دوای ئەوان هەوڵیان داوە بۆ داکوتان و جێگیرکردنی لە دەروونی منداڵدا، چونکە بەو هۆیەوە هەست و تێگەیشتنی منداڵ دەجوڵێت و هەستی ئیسلامی تێیدا بەتین تر دەبێت، و پاڵی پێوە دەنێت بۆ لای هەموو چاکەیەك و چارەسەری هەموو تەنگ و چەڵەمەکانی دەکات، و هەموو ناڕەحەتیەکی لەسەر سووك دەکات.

ئەوەی تێبینی کراوە لەسەر دەروونی مرۆڤ بەشێوەیەکی گشتی، ئەوەیە کە لە قۆناغی پەروەردەو گەشەیدا هەوڵ دەدات کە خۆی بچوێنێت بە بەهێزترین کەسی دەوروبەری بۆ ئەوەی ببێتە شوێنکەوتەی، و لەسەر رێنمونیەکانی بڕوات، و لاسایی بکاتەوە لەهەموو جوڵەیەکیدا، پەروەردەی ئیسلامیش داوای کردووە کە منداڵی ساواو پیاوی بەتەمەن سەرنج بدەنە پێغەمبەرﷺ کە ئەو پێشەنگی جێگیر و دامەزراویانە، و بەهیچ شێوەیەك ناگۆڕێت، و کامڵترین مرۆڤە بەڕەهایی و باشترین نێردراوی خوایە لەنێو هەموو نێردراواندا.

[1] عن –رجال الفكر والدعوة– لأبي الحسن الندوي ص١٠٥.

وە ئەو سزایەی کە تووشی دەروونی مرۆڤایەتی دەبێت، و هەموو ئەو نەخۆشیە دەروونی‌و دەماخیەی لێرەو لەوێ بڵاو بۆتەوە، هەرهەموویان لە شوێنەوارەکانی دوورکەوتنەوە لە پێشەنگی سەرڕاست و شوێن نەکەوتن و خۆنەچواندنە بە پێغەمبەری خواﷺ، بەڵکو تێبینی ئەوە دەکەین کە ئەو نەوە سەر لێ شێواوە لە بۆشایی کەسێتیدا دەژی و هانکەهانك بەدوای مۆدە گۆڕاوەکاندا دەڕوات لەنێوان وەرزێك و وەرزێکی دیکەی ساڵدا، و بەدوای ئەو ئەکتەرە لاڕێ بوانەدا رادەکات کە دوورن لەهەموو بەرنامەیەکی پەروەردگار، بەکاوەخۆ لەدووی هەندێك لەوانەوە دەڕوات کە خۆیان بە بیریاری سەردەم دادەنێن، پێشڕەوانی رۆشنبیریش ئەوانەن کە شەیتان فوی بە سەریاندا کردوەو وا دەزانن بیریان رووناکە، بەم جۆرە گرنگی کەسێتیەکی زیندوومان بۆ دەردەکەوێت تا منداڵی تازەپێگەیشتوو شوێنی بکەوێت، جا ئایا لەمبارەوە کەسێ لە پێغەمبەری خواﷺ چاکتر هەیە بۆ ئەوەی شوێنی بکەون.

## ١- ئەوەی دەربارەی چەسپاندنی خۆشەویستی پێغەمبەرﷺ و خانەوادە پاکەکەی هاتووە:

(طبرانی) و (ابن النجار) و (دیلمی) هێناویانە لە (علی)ەوەﷺ کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:((أدبوا أولادكم على ثلاث خصال: حب نبيكم وحب آل بيته وتلاوة القرآن)).[1] واتە: (منداڵەکانتان لەسەر سێ شت پەروەردە بکەن: خۆشەویستی پێغەمبەرەکەتان و خۆشەویستی خانەوادەی پێغەمبەر و خوێندنەوەی قورئان).

ئیمام (احمد) و (بخاری) و (مسلم) لە (انس)ەوەﷺ دەگێڕنەوە کە پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەری خواﷺ کرد: کەی قیامەت دادێ؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((ما أعددت لها)) چیت بۆ ئامادەکردوە؟ وتی: هیچ، تەنها خۆشەویستی خواو پێغەمبەرەکەی دەستمایەمە، پێغەمبەرﷺ پێی فەرموو: ((أنت مع من أحببت)) تۆ لەگەڵ ئەو کەسەدایت کە خۆشت ویستووە.

(انس)ﷺ دەڵێت: من پێغەمبەرﷺ و (ابوبکر) و (عمر)م خۆش دەوێت، و ئومێدەوارم کە بەهۆی ئەو خۆشەویستیەمەوە بۆیان لەگەڵ ئەواندا بم.

وەکو زانراویشە (انس) لەکاتێکدا منداڵێکی بچووکی دەساڵان بووە خزمەتی پێغەمبەریﷺ کردوە و بۆ ماوەی دەساڵ لە خزمەتیدا بوە.

---

[1] وقال المناوي: ضعيف.

## ٢- چۆن خۆشەویستی پێغەمبەرﷺ لە مندالآندا دەچەسپێنرێت:

گەر لە ژیانی مندالآنی هاوەڵانی پێغەمبەر رابمێنین، کە چۆن خۆشەویستی پێغەمبەریانﷺ بەدەست هێناوە، وە چۆن پێغەمبەرەکەیان بۆتە یەکەم شت لە ژیانیاندا، و بەنرختر لەهەموو شتێکی سەرزەوی، دەبینی کە ئەم خورەوشتانەیان تێدابوو:

١) پەلەکردن لە وەلآمدانەی بانگەوازەکەی پێغەمبەر و بەجێهێنانی فەرمانەکانی:

لەراستیدا زۆر پەلەکردن لە وەلآم دانەوە خۆشەویستی زۆرتر دەکات، و بەڵگەی ئەو خۆشەویستیەیە، ئەوەتا (علی کوڕی ابوطالب)ﷺ خێرا دەڕوات بەدەم بانگەوازەکەی پێغەمبەرەوەﷺ بەرەو لای ئیسلام، بەبێ راوێژکردن بەهیچ کەس، چونکە کارەکە کاری بیروباوەڕ و رێبیر(مبداء)ە، هەر یەکێك روگەیەك هەیە کە روی تێبکات، بۆ هەموو کەسێکیش بیروباوەڕێك هەیە کە هەڵی دەبژێرێت، بەوجۆرە (علی) لەکاتێکدا کە تەمەنی هەشت سالآنە لەگەڵ بانگەوازی ئیسلامی یەکەم لەهەردوو قۆناغەکەیدا ئاشکراو نهێنی بەبێ ترس و بیم ژیاوەو بەشدار بووە، و بەنهێنی لەگەڵ پێغەمبەرﷺ و خەدیجەی خێزانی لە دۆڵەکانی مەککەدا نوێژی دەکرد، (ابوطالب)ی باوکیشی دەیبینێ، بەلآم (علی) نەدەترسا و دەمی تەتەڵەی نەدەکرد.

پاشان ئەوەش (انس) کە مندالێکی بچکۆلەیە هەستا بە خزمەتکردنی پێغەمبەرﷺ بۆ ماوەی دەساڵ، کە تێیدا وازی لە خۆشەویسترین شت لای مندالآن هێنابوو، و وەلآمی بانگەوازی ئەوی دەدایەوەو بەخێرایی فەرمانی پێغەمبەری جێبەجێ دەکرد و یاری بەجێدەهێشت و گوێڕایەڵی فەرمانی دەبوو.

(احمد)و (بخاری)و (مسلم) لە (ثابت)و ئەویش لە (انس)ەوە هێناویانە کە دەڵێت: لەگەڵ مندالآندا یاریم دەکرد، پێغەمبەری خواﷺ هاتە لام و سلآوی لێمان کرد و ناردمی بۆ پێویستیەکی خۆی... فەرموودەکە.

نەك هەر ئەوە، بەڵکو کار لەوە تێپەڕیکردبوو کە تەنها چاوەڕوانی فەرمانەکان بکرێت و، مندالآنی هاوەڵان دەگوازرێنەوە بۆ قۆناغێکی بەرزتر لە خۆشەویستی راستەقینە، ئەمەش بەچاودێری کردنی پێداویستی خۆشەویستیەکەیان، تا خێرا بەدەمیەوە بڕۆن و بیهێننە بەردەستی، بەبێ ئەوەی کە قسە بکات یاخود فەرمانێك لێی ببیستن، ئەمەش لە پتەوی ئەو خۆشەویستیە نەمرەدایە.

(بخاري) لە (ابن عباس)ەوەم هێناویەتی کە پێغەمبەری خواﷺ چوو بۆ سەر ئاو، منیش لەو شوێنەدا ئاوم بۆ دانا، فەرمووی: کێ ئەمەی داناوە؟ هەواڵی پێدرا کە من بۆم داناوە، ئەویش فەرمووی: ((اللهم فقهه في الدين)) خوایە لە ئایین شارەزای بکە.

هەروەها (بخاري) و (مسلم) و (بيهقي) لە (عطاء کوڕی ابوميمونە)ەوە دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: گوێم لێبوو (انس) دەیوت: پێغەمبەری خواﷺ دەهات بۆ سەرئاو، من و کوڕێکی ئەنصاری بەدۆلکەیەك ئاوەوە شوێنی دەکەوتین تارەتی پێبگرێت.

لەجۆرەکانی بەپەلە وەڵامدانەوەدا: بەیعەتدانی منداڵانی هاوەڵان بە پێغەمبەرەﷺ:

(مسلم) لە (عروه کوڕی زبير) و (فاطمة کچی المنذر کوڕی زبیر)ەوە هێناویەتی، کە وتوویانە: (اسماء کچی ابوبکر) کاتێ کۆچی بۆ مەدینە کرد (عبدالله کوڕی زبیر)ی لە سکدا بو، کە گەیشتە (قباء) لەدایك بوو، پاش لەدایکبوونی بردی بۆ لای پێغەمبەرﷺ تا شیرینی لەدەم وەردات، پێغەمبەری خواﷺ لێی وەرگرت و خستیە کۆشیەوەو پاشان داوای دەنکە خورمایەکی کرد، دەڵێت: عائیشە وتی: ماوەیەکی زۆر گەڕاین هەتا پەیدامان کرد، لەدەمیدا نەرم و شلی کردەوە، پاشان هەسویە دەمی، لەبەر ئەوە یەکەم شت کە چویە سکیەوە لیکی دەمی پێغەمبەری خواﷺ بوو، پاشان (اسماء) وتی: دەستی بەسەریدا هێناو بۆی پاڕایەوەو ناوی نا (عبدالله)، پاش ئەوە کاتێك تەمەنی گەشتە حەوت یاخود هەشت ساڵان لەسەر فەرمانی (زبیر) هات بۆ لای پێغەمبەری خواﷺ تا بەیعەتی پێبدات، پێغەمبەری خواﷺ کاتێ بینی بەرەوڕووی دێت زەردەخەنە گرتی و پاشان بەیعەتی پێدا.

بەوجۆرە منداڵانی هاوەڵان لەسەر خۆشویستنی پێغەمبەرەکەیان پەروەردەبوون، لەمبارەیەوە باوکان و دایکان هاندەریان بوون، ئەو کەسەیش کە لەسەر شتێك راهات، لەسەر ئەو شتە گەورە دەبێت.

ئیمامی (نووی) لە شیکردنەوەی ئەم فەرموودەیەدا دەڵێت: (ئەم بەیعەت پێدانە بۆ بەرەکەت و رێز و پیرۆزی بووە نەك بەیعەتی ئەرکباری، چونکە ئەوانە نەگەیشتبوونە تەمەنی ئەرکباری).[١]

١ شرح صحيح مسلم باب استحباب تحنيك المولود عند الولادة.

هەروەها دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خواﷺ بەیعەتی بەهیچ منداڵێك نەداوە جگە لە (حسن)و (حسين) و (عبدالله کوڕی عباس) و (عبدالله کوڕی زبير)ﷺ.

٢) شەڕکردنی منداڵان دژی هەرکەسێك ئازاری پێغەمبەریﷺ دابێت:

(عبدالرحمن کوڕی عوف) بۆمان باس دەکات، هەروەك (بخاری) دەیگێڕێتەوە، کە ئەو لە جەرگەی غەزای بەدردا بوو، دەڵێت: کوڕێك لەلای راستمەوە وەستاو لێی پرسیم: مامە (ابوجهل)م نیشان بدە، پێی دەڵێت: رۆڵە! چیت داوە لە (ابوجهل)؟ کوڕەکە دەڵێت: سوێند بەخوا، گەر بیبینم لەدەستم دەرناچێت، ئەو پێشتر ئازاری پێغەمبەری خوایﷺ داوە، پاشان کوڕێکی دیکە هاتە لای چەپمەوەو هەمان پرسیاری یەکەمی لێ کردم، ئینجا جەنگەکە گەرم بوو، تا دەهات بەهێزتر دەبوو، (عبدالرحمن) ئاوڕ دەداتەوە بۆ لای دوو کوڕەکەو پێیان دەڵێ: ئەوە ئەو کەسەیە کە ئێوە بەدوایدا دەگەڕێن، ئەوە (ابوجهل)ـە، زۆر بەخێرایی بە شمشێری بچووکیانەوە بەرەو لای دەردەچن، هەریەك لەو دوانە دەیویست ئەو رێزەی دەست بکەوێت کە پێشتر لە دوژمنی خواو پێغەمبەرەکەی بکات، هەردووکیان بەلێدانێکی بەهێز لێی دەدەن، (ابوجهل) دەکەوێتە سەر زەوی، هەردوکیان پێشبڕکێ دەکەن لە گەیاندنی مزگێنی بۆ پێغەمبەری خواﷺ و هەریەك لەوان دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا! من کوشتم،ئەویش دەفەرموێت: شمشێرەکانتانم پیشان بدەن، لەسەر هەردووکیان شوێنەواری خوێن بەدی دەکات، بۆیە پێیان دەفەرموێت: هەردووکتان کوشتووتانە.

ئا لەم روانگەیەوە منداڵانی پێشین دەڕۆیشتن بۆ جەنگ دژی هەرکەسێك ئازاری پێغەمبەری خوایﷺ دابێت، ئیدی بە ئاماژەکردن بێت یان بە قسەو دەربڕین بووبێت بۆ نارەحەت کردنی پێغەمبەری خواﷺ.

(شهاب الدين الابشهمی)یش لە کتێبەکەیدا (المستطرف في كل فن مستظرف) چیرۆکێکی خۆش لە واتا و بوونیاندا دەگێڕێتەوە کە ئەوەیە چەند منداڵێك لە خەڵکی (بحرين) یاری (قاشوانێ)[1]یان دەکرد، (اسقف)[2]ی بەحرەینی لەوێ دانیشتبوو، تۆپێك بەر سینگی کەوت، تۆپەکەی هەڵگرتەوە، داوایان لێی کرد کە بیانداتەوە، نەیدانەوە، یەکێك لە کوڕەکان وتی:

[1] یارییەکە بەعەرەبی پێی دەوترێت (صولجة) و بریتییە لە لێدانی تۆپ بە دار یان گۆچان. —وەرگێڕ—

[2] أسقف: لە پلەی قەشە گەورەترە و نەگەیشتۆتە پلەی مەطران. —وەرگێڕ—

داوات لێ دەکەم لەبەر خاتری (محمد)ﷺ بماندەرەوە، بەڵام ئەو نەیدانەوەو -نەفرینی خوای لێبێ- جنێویشی بە پێغەمبەر ﷺ دا، منداڵەکان بە گۆچانەکانیان کەوتنە سەری و لێیان دان هەتا مرد-نەفرینی خوای لێبێ-، ئەوە بەرزکرایەوە بۆ لای (عمر کوڕی خطاب)ﷺ، سوێند بەخوا هیچ رزگارکردن و دەستکەوتێك هێندەی کوشتنی ئەو (اسقف)ە لەلایەن ئەو منداڵانەوە (عمر)ی دڵخۆش نەکردوە، بۆیە وتی: ئێستا ئیسلام سەربەرز و سەرفرازە، کە منداڵانێکی بچووك قسە بە پێغەمبەرەکەیان وترا، تورە بوون و سەرکەوتنیان بەدەست هێنا، پاشان خوێنی (اسقف)ەکەی بەزایە دا و هیچ هەقێکی بۆ دانەنا. خوای گەورەش زاناترە.[1]

ئەگەر منداڵی موسڵمان نەتوانێ تۆڵە لەو پیاوانە بکاتەوە کە خراپە بەرامبەر پێغەمبەری خواﷺ دەکەن، ئەوا ئەو هەواڵەو ئەوەی بیستوویەتی لە قسەی فاسق و دووڕووەکان دەیگەیەنێت بە پێغەمبەری خواﷺ و بۆ بڕواداران لەدوای ئەو.

پەرتوکەکانی تەفسیر هێناویانە لەبارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی: ﴿لَيُخْرِجَنَّ الْأَعَزُّ مِنْهَا الْأَذَلَّ﴾المنفقون/٨. لەو بارەیەوە هاتووە: (ابن سعد)و (ابن اسحاق) دەڵێن: -پاش تەواوبوونی غەزای (بنی مصطلق) و خۆئامادەکردن بۆ گەڕانەوە بۆ مەدینە- پێغەمبەرﷺ لەسەر ئاوەکە بوو، خەڵك کۆمەڵ کۆمەڵ دەهاتن، (عمر کوڕی خطاب)یشﷺ کرێگرتەیەکی لەگەڵدا بوو لەهۆزی (غفار) کە پێیان دەوت: (جهجاه کوڕی مسعود) جڵەوی ئەسپەکەی رادەکێشا، (جهجاه) لەگەڵ (سنان کوڕی وبر)ی هاوپەیمانی (بنوعوف کوڕی خزرج) لەسەر ئاوەکە پێك گەیشتن و بووە شەڕیان، (جهنی) هاواری کرد: ئەی خەڵکی ئەنصار! (جهجاه)یش هاواری کرد: ئەی خەڵکی موهاجیر! (عبدالله کوڕی ابوسلول) تورەبوو، و لەوکاتەدا کۆمەڵێك لە هۆزەکەی لەلابوو، لەنێویاندا (زید کوڕی ارقم) کە کوڕێکی تازەپێگەیشتو بوو، (عبدالله) وتی: ئاوایان کرد؟ لەناو وڵاتی خۆمان بەسەرماندا زاڵ بوون و لە ئێمە زۆرتر بوون؟ سوێند بەخوا! ئەم پاشکۆیانەی قورەیش وەك ئەوەیان لێهاتوە کە وتوویانە (سمن کلبك یأکلك = سەگەکەت تێر بکەی دەتخوات)، بەڵام بەخوا کە گەڕاینەوە بۆ مەدینە، دەبێ ئەوانەی کە لەهەموان بەڕێزتر و گەورەترن ئەوانە دەربکەن کە لە هەموان سووکتر و بێنرختر و زەلیلترن. پاشان ئاوڕی دایەوە

---

[1] (٣٤/٢)- وراجع حاشية ابن عابدين ٢١٣/٤ ط٢ -مطلب في حكم سبّ الذمي النبيﷺ.

لەوانەی لە دەوروبەری بوون و پێی وتن: ئەمە خۆتان بەخۆتانتان کرد، وڵاتتان بۆ حەڵاڵ کردن، ماڵتان لەگەڵدا بەشکردن، بەڵام سوێند بەخوا ئەگەر ئەوەی لەدەستاندا بوو لێتان بگرتنایەتەوە، ئەوا دەڕۆیشتن بۆ شوێنێکی کە.

(زید کوڕی ارقم) گوێی لەمانە بوو، ڕۆشت بۆ لای پێغەمبەری خواﷺ، -ئەمە لەکاتێکدا کە پێغەمبەرﷺ سەرقاڵی دوژمنەکەی نەبوو، و هەواڵەکەی پێدا.

**۳) خۆشەویستی منداڵانی هاوەڵان بۆ ئەو شتەی کە پێغەمبەری خواﷺ خۆشی دەویست و حەزنەکردنیان بە کاری نەفامی:**

(انس)ﷺ دەڵێت:[1] لەگەڵ پێغەمبەرداﷺ چوینە لای کوڕێکی بەرگدروو، ئەویش قاپێکی خستە بەردەستی کە تێگوشەی تێدا بوو و کولەکەی بەسەرەوە بوو، کوڕەکە چوویەوە سەر کاری خۆی، دەڵێ: پێغەمبەری خواﷺ بەدوای کولەکەدا دەگەڕا، منیش دەگەڕام بۆی و دەمخستە بەردەستی، (انس) دەڵێ: لە دوای ئەوەوەو تا ئێستاش حەز بە کولەکە دەکەم.

**٤) لەبەرکردنی فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺ لەلایەن منداڵانی هاوەڵان و پێشینانەوە:**

(بخاری) لە (محمود کوڕی ربیع)ەوە هێناویەتی کە دەڵێت: ئەوەم لە پێغەمبەرﷺ لەبەر کردووە کە کاتێك تەمەنم پێنج ساڵان بوو بەدەمی ئاوی بە دەم و چاومدا پرژاند.

هەروەها (ترمذی) لە (ابوالحوراء السعدی ربیعة کوڕی شیبان)ەوە هێناویەتی کە دەڵێت: بە (حەسەن کوڕی علی)مﷺ وت: چیت لە پێغەمبەرەوەﷺ وەرگرتوەو لەبەر کردووە؟ وتی: ئەو فەرموودەیەم لەوەوە لەبەر کردووە کە دەفەرمووێ: ((**دع ما يريبك الا ما لا يريبك، فإن الصدق طمأنينة والكذب ريبة**)).[2] واتە: (وازبێنە لەوەی گومانی تێدایە بۆ ئەوەی کە گومانی تێدا نیە، چونکە ڕاستی دڵنیاییەو درۆش گومانە).

---

[1] أخرجه البخاري ومسلم والترمذي والنسائي وابوداود، واللفظ للبخاري،

[2] رواه النسائي وأحمد وغيره واسناده صحيح: أنظر جامع الأصول ٤٤٣/٦ ت.الأرناؤوط. ورواه الحاكم في مستدركه ١٣/٢-٩٩/٤ بلفظ: فإن الشر ريبة والخير طمأنينة، وقال الذهبي صحيح، ورواه ابن خزيمة في صحيحه ١٠٣/٣.

(بخاری)و (مسلم) لە(سمرە کوڕی جندب)ەوە هێناویانە کە دەڵێت: لەسەردەمی پێغەمبەری خواﷺ کوڕێژگە بووم، و شتم لە پێغەمبەری خوا دەبیست و لەبەرم دەکرد، بەڵام لەبەر ئەوەی کەسی لەخۆم بەتەمەنتر لەوێ بوو لە خزمەتیدا قسەم نەدەکرد.

وە لە (ابن عباس)ەوەم دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: شەو لەلای (میمونە)ی پورم مامەوە، بانگدەر هات وبۆ نوێژ دەرچوو، و دەیفەرموو: ((**اللهم أجعل في قلبي نوراً، وأجعل في لساني نوراً، وأجعل في سمعي نوراً، وأجعل في بصري نوراً، وأجعل في خلفي نوراً، ومن أمامي نوراً، وأجعل من فوقي نوراً، ومن تحتي نوراً، اللهم أعظم لي نوراً**)).[1] واتە: (خوایە رووناکی بخەرە دڵمەوە، زمانم رووناك بکە، گوێم رووناك بکە، چاوم رووناك بکە، پشتەوەم رووناك بکە، پێشم رووناك بکە، سەرەوەم رووناك بکە، خوارەوەم رووناك بکە، خودایا رووناکیەکی مەزنم پێ‌ببەخشە).

لە (ابو جحیفە)یشەوە (کە لە هاوەڵە بچووکەکان بوو، کاتێك پێغەمبەرﷺ وەفاتی کرد ئەو هەرزەکار بوو) دەگێڕنەوە کە وتویەتی: هاتم بۆ لای پێغەمبەری خواﷺ لە مەککە، ئەویش لە (ابطح) لەژێر رەشماڵێکی سووری لەپێست دروستکراودا بوو، جا دەڵێ: بیلال بە ئاوی دەستنوێژی پێغەمبەرەوەﷺ هاتە دەرەوەو بەسەر خەڵکیدا دەپرژاند و لێیان دەبرد، جا گوتی: پێغەمبەری خواﷺ کە هاتەدەرەوە پۆشاکێکی سووری لەبەردابوو، سپیایەتی قاچەکانی لەبەرچاومە، دەڵێ: پێغەمبەرﷺ دەستنوێژی شۆری و بیلال بانگی خوێند، دەڵێ: منیش لەم لاو لەولا چاودێریم دەکرد، کە دەیوت (حي على الصلاة، حي على الفلاح) تەماشای راست و چەپی دەکرد، ئینجا رمێکی کورتی بۆ چەقێنرا و پێغەمبەرﷺ هەستا و دوو رکعاتی عەسری کرد، ئینجا گوێدرێژ و سەگ بە پێشیدا تێپەڕ دەبوون و قەدەغەی نەدەکرد، پاش ئەوە نوێژەکانی هەر بە دوو رکعات دەکرد هەتا گەڕایەوە مەدینە.[2]

لە گێڕانەوەی (احمد) و (بخاری) وا هاتووە، کە (ابوجحیفە) باسی ئەوەی کرد کە پێغەمبەریﷺ بینیوە لە گەرمای نیوەڕۆدا دەستنوێژی گرتووە، خەڵکیش لە ئاوی دەستنوێژەکەیان دەبرد، پاشان نوێژی نیوەڕۆی بە دوو رکعات کرد، و عەصری بە دوو رکعات کرد، و رمێکی کورت لەپێشی چەقێنرابوو.

---

[1] رواه ابن خزيمة في صحيحه ٢٢٩/١ بسندين أحدهما صحيح.

[2] رواه أبو يعلى في مسنده ١٨٨/٢ بأسناد صحيح ورواه مسلم وصححه ابن حبان ورواه احمد والبخاري

ئێستاش فەرموون لەگەڵ بەسەرهاتێکی سەیر و زاکیرەیەکی مەزن کە خوا بەخشیویەتی بە گەنجێکی پایەبەرزو زانایەکی تێگەیشتووی سەرکردەو تێکۆشەری گەورە (احمد کوڕی تیمیە)[١] -رەحمەتی خوای لێبێ-، (محمد بن احمد عبدالهادی) لە (العقود الدریة من مناقب شیخ الإسلام ابن تیمیة)دا دەڵێت:

خەڵکی دیمەشق سەرسام بووبوون لەبەر زیادە بیرتیژی و بەخوری بیری و بەهێزی توانای لەبەرکردنی، و خێرا تێگەیشتنی، وا ڕێکەوت کە هەندێك لە زانایانی (حەلەب) هاتن بۆ دیمەشق و وتی: بیستومە کە لەم شارەدا منداڵێك هەیە پێی دەڵێن (احمد کوڕی تیمیە)، و زۆر خێرایە لە شت لەبەرکردندا، منیش هاتووم بەڵکو ببینم، بەرگدرویەك پێی وت: ئەمە ڕێگەی چوونیەتی بۆ لای مامۆستاکانی، تا ئێستاش نەهاتوە، ماوەیەك لەلامان دانیشە تا دێت و بەلاماندا تێپەڕ دەبێت بەرەو لای مامۆستاکانی، زاناکەی خەڵکی (حەلەب) کەمێك دانیشت، منداڵان بەوێدا تێپەڕین، بەرگدروەکە وتی: ئەو منداڵەی تەختە گەورەکەی پێیە ئەوە (احمد کوڕی تیمیە)یە، زاناکە بانگی کرد و تەختەکەی لەدەست وەرگرت و سەیرێکی کرد، پاشان پێی وت: کوڕم ئەوانە بسڕەوە، هەتا من شتێکت پێ بڵێم بینووسیت، جا سڕییەوەو زاناکەش مەتنی یازدە یاخود سیازدە فەرموودەی پێوت، ئینجا وتی: ئەمانەم بۆ بخوێنەرەوە، تەنها یەك جار لێی ڕاما و پاشان دایەوە دەستی، وتی: دەمەوی ئەوانەت لێ ببیستم، ئەویش بەجوانترین شێوە بۆی وتەوە، ئەمجارەش پێی وت: کوڕم ئەوانەش بسڕەوە، سڕییەوە، چەند سەنەدێکی هەڵبژارد و پێی نووسی، پاشان پێی وت: ئەمە بخوێنەرەوە، وەکو جاری یەکەم تەماشای کرد و بەهەمان شێوە بۆی وتەوە، زاناکە هەستا و وتی:گەر ئەم گەنجە بمێنێت پلەوپایەی مەزنی دەبێت، نمونەی وەك ئەم کوڕە نەبینراوە.

أ/ پاداشت بەخشین بە منداڵ لەسەر لەبەرکردنی فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺ:

(خطیب بغدادی) لە کتێبەکەیدا (شرف أصحاب الحدیث) لاپەڕە(١٠) دەگێڕێتەوە[٢] لە (نضر کوڕی حارث)ەوە کە وتوویەتی: گوێم لێبوو (ابراهیم کوڕی ادهم) دەیوت: باوکم پێی وتم: کوڕم بەدوای فەرموودەدا بگەڕێ، هەر فەرموودەیەکت بیست و لەبەرت کرد، درهەمێکت دەدەمێ،[٣] منیش لەبەر ئەوە بەشوێن فەرموودەدا دەگەڕام.

---

[١] عن مقدمة تحقیق کتاب -اقتضاء الصراط المستقیم- لأبن تیمیة، تحقیق محمد حامد الفقي.

٢ عن اصول الحدیث -ص١٠٠ د.العجاج الخطیب.

٣ باوکم -بەرەحمەت بێ- بەهەمان شێوە لەسەر لەبەرکردنی هەر فەرموودەیەکی (الأربعین

ب/ خزمەتکردنی منداڵانی پێشین بە زانایان لەپێناوی بەدەستهێنانی فەرموودە لێیانەوە:

خاوەنی کتێبی (المحدث الفاضل) باس دەکات، (سفیان کوڕی عیینـه) دەگێڕێتـەوەو دەڵێـت: باوکم لەکوفە کاری پارەگۆڕینەوە بوو، و قەرزاری بەسەردا هات، بۆیە بردینـی بـۆ مەککـە، بـۆ نوێژی نیوەڕۆ گەڕاینەوە بۆ مزگەوت، ڕۆیشتم بۆ بەر دەرگـای مزگەوتەکـە، پیـاوێکی بەتەمـەن بەسواری گوێدرێژێك هات و پێی وتم: کوڕە وەرە ئەم گوێدرێژەم بۆ بگرە تـا دەچـمە مزگـەوت و نوێژدەکەم، وتم: ئەو کارەت بۆ ناکەم هەتا فـەرموودەم بـۆ نەگێڕیتـەوە، وتـی: جـا تـۆ چـی لـە فەرمووده دەکەیت؟ بە بچووکی دانام، پێم وت: بۆم باس بکە، وتی: (جابر) لە (عبـدالله)وە بـۆی باسکردم و (ابن عباس) بۆی باسکردم.. هەشت فەرموودەی بۆ گێرامەوە، منیش گوێدرێژەکـەیم گرت، و دەستم کرد بە لەبەرکردنی ئەوەی بۆی گێڕامەوە، کە لە نوێژ بویەوەو هاتە دەرێ، وتـی: ئەوەی بـۆم باسـکردیت و بەهۆیـەوە ڕاتگـرتم چ سـوودێکی پـێ گەیانـدیت؟، وتم: ئـەوەت بـۆ گێڕامەوە، وئەوەت بۆ گێڕامەوە، تا هەموو فەرموودەکانم بۆ وتەوە کە پێی وتبـووم، وتـی: خـوا بەرەکەتت بەسەردا ببارێنێ، سبەینێ وەرە بۆ کۆڕەکەمان، بینیم ئەو پیاوە (عمـر کـوڕی دینـار) بوو.[1]

ج/ کۆچکردنی منداڵانی پێشینی چاك و گەڕانیان بەشوێن وەرگرتنی فەرموودەدا:

(خطیب بغدادی) باسی داواکاری باوکی (علی کوڕی عاصم) دەکات و(علی) دەڵێت: باوکم سەدهەزاری پێدام و وتی: بڕۆ چاوم بەچاوت نەکەوێتەوە تا سـەدهەزار فـەرمووده فێـر دەبیـت.[2] (علی کوڕی عاصم) ڕاڤەی گەشتەکەی خۆی بۆ وەرگرتنی فەرموودە دەکـات و دەڵێـت:[3] لەگـەڵ (هشیم)دا لە (واسط)ەوە دەرچووین بۆ (کوفە) تا چاومان بە (منصور) بکەوێت، کاتێـك چـومە دەرەوە، چەند فەرسەخێکم برییبوو، (معاویە) یان یەکێکی ترم بینی و پێم وت: بۆ کوێ دەڕۆیـت؟ وتی: قەرزێکم لەسەرە هەوڵی دانەوەی دەدەم، دەڵێـت: منـیش پـێم وت: بگـەڕێرەوە لەگـەڵما، چوارهەزار درهەمم پێیە، لێـی بەشـت دەدەم، ئـەویش لەگـەڵما گەڕایـەوەو منیش دوو هـەزار درهەمم پێدا، پاشان بەڕێکەوتم، (هشیم) دەمەویەیانی گەیشتە (کوفە) و منـیش کـاتی شـێوان چومە ئەوێ، (هشیم) چوبوە خزمەت (منصور) و چل فەرمودەی لێ وەرگرتبوو، منیش چوومە

---

النوویة) دە قرۆشی سووری دەدامێ.

[1] عن اصول الحديث –ص١٦ د.العجاج الخطيب.

[2] في كتابه –الرحلة في طلب الحديث– تحقيق د.نورالدين عتر ط١.

[3] المصدر السابق ص١٧٣.

گەرماو، کە رۆژ بوویەوە چوومە دەرێ بەرەو لای ماڵی (منصور) کەوتمە رێ، بینیم تەرم(جنازة)یەك لەوێیە، وتم: ئەوە چیە؟ وتیان: ئەوە تەرمی (منصور)ە، منیش دانیشتم و دەستم کرد بە گریان، پیاوێکی پیر لەوێبوو پێی وتم: کورم بۆ دەگریت؟ دەڵێ: وتم: هاتم تا لەم زانایە شت ببیستم، ئەوا ئەویش مرد، وتی: کەسێکت پیشان بدەم کە زەماوەندی دایکی ئەوی بینیبێت؟ وتم: بەڵێ، وتی: بنووسە" (عکرمە) بۆی باسکردم لە (ابن عباس)ەوەم، دەڵێ: بۆ ماوەی یەك مانگ من لە خزمەتیدا فەرموودەم دەنووسیەوە، رۆژێکیان پێم وت: تۆ کێی -خوا رەحمتان پێبکات-؟ وتی: ئەوە مانگێکە تۆ لەلام شت دەنووسیت تا ئێستا نەتناسیوم؟! من (حصین کوری عبدالرحمن)م، ماوەی نێوان من و گەیشتن بە (ابن عباس) تەنها حەوت یان نۆ درهەم بوو. (عکرمە) لەوی دەبیست و پاشان دەهات بۆی دەگێرامەوە.

جا سەرنج بدە - خوا چاودێریت بکات- لە قوربانیدانی ئەم گەنجە کە نیوەی ماڵەکەی بەخشیوەو لەکاتی خۆی بەفیرۆ داوەو نیشتمانی خۆی بەجێهێشتووە، بەڵام لە دیداری مامۆستای زانا (منصور) دوا کەوت، ئەوەبوو خوای گەورە زانایەك کە لەراستیدا گەورەی زانایان و مامۆستایانی ئەو کاتە بوو بۆی دەستەبەر کرد، کە ئەویش (حصین کوری عبدالرحمن) بوو، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر دڵسۆزی زۆر لە داواکردنی فێربوون و زانستدا، و راستگۆیی لە خۆشویستنی پێغەمبەری خوادا ﷺ.

د/ نووسینەوەی فەرمودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ و دڵنیابوون لە راستی و دروستی نووسینەکە:

لە(هشام کوری عروە)ەوە کە وتوویەتی: باوکم پێی وتم: فەرموودەت نووسیوەوە؟ دەڵێ: وتم: بەڵێ نووسیومە، وتی: خستە روو تا بزانرێ راستە یان نا؟ وتی: نەخێر، باوکی وتی: کەواتە بۆچی دەینووسیەوە.[1]

ئەم بەرنامەو پەیڕەوە زانستیەی خستنەڕووی نووسینەوەو بەراورد پێکردنی لەسەر بنەڕەت(اصل)ەکەی و دڵنیاکردنەوە لە ساغی و راستی نووسینەوە" دووپاتی ئەوە دەکاتەوە کە زۆر سووربن لەسەر شکۆمەندی رێزگرتنی کەلەپووری گەورەمان و بەئاگاهێنان و وریاکردنەوەی دایك و باوکان بۆ بەرنامەو پەیڕەوی زانستی راست و بەهێز، وە راهێنانی منداڵ لەسەر ئەو بەرنامەیە تا بەهەموو متمانەو شانازیەکەوە لەگەڵی گەورە ببێ.

---

[1] رواه ابن ابي شيبة في مصنفه ٩/١١١.

ه/ کچان و لەبەرکردنی فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺ:

(زبیدی) دەڵێت:[١] (مالك کوڕی انس) کچێکی هەبوو زانست و زانیارییەکانی ئەوی لەبەر دەکرد، واتە (الموطأ)، لەپشت دەرگاوە رادەوەستا، کاتێك قوتابییەك هەڵەی بکردایە کچەکە لە دەرگای دەدا و مالیکیش تێدەگەیشت و پێی دووبارە دەکردەوە.

و/ منداڵان گرنگی بە گێڕانەوەی فەرموودەو شارەزابوونی دەدەن:

(خطیب بغدادی)باس دەکات[٢] کە دایکی بڕواداران (عائشە)ل بە (عروە کوڕی زبیر)ی خوشکەزای وت: کوڕم! زانیوومە کە تۆ فەرموودە لەمنەوە دەنووسیت، پاش ئەوە دەینووسیتەوە، وتی: بەشێوەیەك لەتۆی دەبیستم، و دوایی بەشێوەیەکی دیکە دەیبیستمەوە، وتی: ئایا لە ماناداهیچ جیاوازییان هەیە؟ وتی: نەخێر، وتی: ئەوە قەیناکات.[٣]

٥) منداڵان و توێژینەوە لە ژیاننامەی پێغەمبەرﷺ و رادەی کاریگەری بەسەریاندا:

هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ و پێشینانی چاك ﷺ سووربوون لەسەر توێژینەوە لە ژیانی پێغەمبەرﷺ و وتنەوەی بە منداڵەکانیان، هەتا گەیشتبووە ئەوەی کە لەگەڵ فێرکردنی قورئاندا دەیانخوێندەوە، چونکە نیشاندەری واتاکانی قورئانە، لەگەڵ ئەوەی کە وروژاندنی سۆزو دیمەنی واقیعی ئیسلامی تێدایە، و بەهۆی ئەو کاریگەرییە سەرسوڕهێنەرەی هەیەتی لەسەر دەروون، هەروەها ئەو هەموو واتای خۆشەویستیو تێکۆشانەی کە لە هەگبەیدایە بۆ درەبازکردنی مرۆڤایەتی لە سەرلێشێوانەوە بەرەو رێنموونی، و لە ناڕاست و پوچەڵەوە بۆ لای راست و دروست، لە تاریکیەکانی نەفامی یەوە بۆ لای رۆشنایی ئیسلام.

لە (اسماعیل کوڕی سعد کوڕی ابی وقاص)ەوەﷺ دەگێڕنەوە کە دەڵێت: باوکم فێری غەزاکردن و شەڕی مەفرەزە[٤]ی دەکردین و دەیوت: کوڕم! ئەمە رێز و سەربەرزی باوباپیرتانە لە یادی مەکەن.[١]

---

[١] عن كتاب الديباج المذهب في معرفة أعيان علماء المذهب، لأبن فرحون المالكي، تحقيق د.محمود الأحمدي.

[٢] في كتاب الكفاية في علم الرواية ص٢٠٥.

[٣] عن اصول الحديث –ص٨٦/١/١٦٢ د.العجاج الخطيب.

[٤] السرايا: **تاکەکەی (السرية) واتە ئەو شەڕ و هێرشانەی کە بەشێك لە سوپا بە نهێنی پێی هەڵدەستێت. –وەرگێڕ–**

(زين العابدين کوڕی حسين کوڕی علی)یش ﷺ دەڵێت: ئێمە فێری غەزاکانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکراین هەروەك چۆن فێری سوورەتێکی قورئان دەکراین.[٢]

سەمعانی وتوویەتی: پێویستە لەسەر دایکان و باوکان فێری منداڵەکانیان بکەن کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەککەوە ناردراوە بۆ ئادەمیزاد و جنۆکە، و لە مەدینە بە خاك سپێردراوە، و پێویستە فەرمانبەری بکرێ و خۆش بویسترێ.[٣]

ئێستاش لەگەڵ بانگخوازی خۆ بەکەم زان (ابوحسن الندوی) دەدوێین، کە لە کتێبەکەیدا (الطريق الى الجنة) چیرۆکێکمان بۆ دەگێڕێتەوە بە ناونیشانی (كتاب الذي لا أنسى فضله – رحلة مع السيرة أيام طفولتي)، بزانە چۆن دەروونە بێگەردەکەی بە روداوەکانی ژیانی پێغەمبەر ﷺ دەهەژێت و چۆن کتێبێك لەبارەی ژیانی پێغەمبەر ﷺ ئەم زانا مەزن و بانگخوازە تێکۆشەرەی دروست کرد:

(ئەمڕۆ باسی کتێبێك دەکەم ـ تا ئێستاش- چاکەی زۆر گەورەی لەسەرم هەیە، و منیشە هەمیشە داوای بەزەیی بۆ خاوەنە مەزنەکەی دەکەم کە لە ڕێگای ئەم کتێبەوە بەنرخترین شتی لەپاش ئیمان بەدیاری پێدام، بەڵکو ئەوەش بەشێکە لە بەشەکانی ئیمان، کە ئەویش کتێبی (سيرة رحمة للعالمين)ە لە دانانی (القاضی محمد سليمان المنصور فوری)یە:، ئەم کتێبە سەرگوزشتەیەکی سەیری هەیە:

براگەورەکەم :کە پاش مردنی باوکم ئەرکی پەروەردەکردن و رۆشنبیرکردنی لەئەستۆ گرتبوو، کاتێك باوکم مرد تەمەنم نۆ ساڵان بوو، ئەو برایەم سەرکەوتوو بوو لە هەڵبژاردنی ئەو کتێبانەی کە دەبوو لە منداڵیمدا بیخوێنمەوە، یەکەمجار کتێبی (سيرة خير البشر)ی دانەرێکی هیندی پێدام، وە زۆر سوور بوو لەسەر ئەوەی کە کتێبی ژیانی پێغەمبەر ﷺ بخوێنمەوە، چونکە ئەو دەیزانی کە کاریگەری زۆر گەورەی هەیە لە پێکهێنانی ژیان و بیروباوەڕ و رەوشت و چاندنی باوەڕدا، هەر بۆیە منیش لەسەر خۆشەویستی کتێبەکانی (سيرة) و سووربوون لەسەر لەخۆگرتنیان و خوێندنەوەیان پەروەردە بووم، زۆر سەیری پێرست و ئاگادارییەکانی کتێبم دەکرد، جارێکیان چاوم بە کتێبی (رحمة للعالمين) کەوت، بەنامە داوای ئەو کتێبەم کرد، کە

---

[١] عن كتاب محمد رسول الله –تأليف الشيخ محمد رضا ص١٥١.

[٢] المصدر السابق.

[٣] فيض القدير للمناوي (٢٢٦/١).

دوو بەشی لیّ چاپ کرابوو، لەو کاتەدا کە تەمەنم دە یان یازدە ساڵ دەبوو، بودجەکەم کورتی هێنا لە کڕینی ئەو کتێبەدا، بەڵام منداڵان -بەتایبەتی ئەو سەردەمەی کە من باسی دەکەم- ملکەچ نەبوون بۆ یاساکانی بودجە و ئابووریزانی، بەڵکو لەگەڵ حەز و ئارەزوەکاندا دەڕۆیشتن، پۆستەچی هات و لەگەڵ پۆستەی گوندە بچووکەکەماندا کتێبەکەی هێنابوو، بینیم کە ئەو توانایەم نیە ئەو کتێبە وەربگرم و پارەکەی بدەم، دایکم: وێڕای سووربوونی لەسەر رازیکردنی منداڵە هەتیوەکەی، داوای لێبوردنی کرد چونکە لەو کاتەدا نەیبوو، بینیم هیچ یارمەتیدەر و تکاکارێکم نیە لەو کارەدا تەنها ئەو تکاکارە نەبێت کە سەروەرمان (عمیر کوڕی ابو وقاص)ی منداڵ پەنای بۆ برد و پێغەمبەری خواشﷺ تکاکەی قبوڵ کرد و رێگەیدا کە بچێت بۆ شەڕکردن لە غەزای (بدر)دا کە ئەویش فرمێسك و گریانی بێتاوانانە بوو، ئەو گریانەی هەردەم لای خوا نزیك و بیستراوە، و هەرواش بووە لەلای بەندە چاکەکانی، ئەوەبوو دایکی بەسۆزم دڵی نەرم بوو، و هەوڵیدا نرخی کتێبەکە بدات و پەیدای بکات، و کتێبەکەم وەرگرت.

دەستم کرد بە خوێندنەوەی کتێبەکە، و ئەویش دەستی کرد بە هەژاندنی دڵم، هەژاندنێکی توند و بێزارکەر تا، بەڵکو هەژانێکی ناسك، دڵیشم بۆی دەهەژایەوەو خۆشحاڵ دەبوو، بەوێنەی هەژانی لقەداری تەڕ لەبەر بای سارددا.

لەراستیدا ئەمەیە جیاوازی نێوان ئەو کتێبانەی کە دەربارەی ژیانی پاڵەوانان و گەورە رزگارکەران، و ئەو کتێبانەی لەبارەی ژیانی پێغەمبەرﷺ دانراون، یەکەمیان دڵ دەگوشێت و بێزاری دەکات، و دوەمیان هەژانێك لە ناخدا دروست دەکات و دەیحەسێنێتەوە.

هێدی هێدی دەروونم بۆ ئەم کتێبە کرایەوە و لەخۆی گرت، هەروەك ئەوەی وادەو بەڵێنی لەگەڵدا هەبووبێت، و لەکات و ساتی خوێندنەوەی ئەم کتێبەشدا هەستم بە چێژێکی سەیر دەکرد، چێژێك کە جودایە لە هەموو ئەو چێژانەی ئاشنایان بووم لە تەمەنی منداڵیمدا.. هەتا ئێستاش هەست ناسك و بەهێزم، ئەوە چێژی خواردنێکی خۆش نیە لە رۆژێکی برسێتیدا، چێژی پشوو و دەستبەتاڵی نیە پاش خوێندنێکی بەردەوام و سەرقاڵییەکی ماندوکەر، وە چێژ و خۆشی جل و بەرگێکی نوێ نیە لە رۆژی جەژندا، و چێژی یاریکردنێك نیە لەکاتی تامەزرۆییدا، وە چێژی چاوەڕوانی و بردنەوەی یاری نیە، وە چێژی سەردانی دۆستێکی کۆن یان میوانێکی چاك نیە، ئەو چێژە لە هیچ کام لەمانە ناکات، ئەوە چێژێکە تامەکەی دەزانم و ناتوانم وەسفی بکەم، و دانی پێدا دەنێم کە تا ئەمڕۆش ناتوانم بە وردی باسی بکەم یان بە

وشەیەك دەری ببڕم، ئەوپەڕی توانام ئەوەندەیە کە بڵێم: ئەوە چێژی ڕۆحە، ئایا منداڵ ڕۆحیان نیە، و هەست بە چێژی ڕۆحی ناکەن، با بەخوا، منداڵان ڕۆحیان ناسکتر و هەستیان تەواوترە، ئەگەریش نەتوانن دەری ببڕن.

لەم کتێبە خۆش و سەرسوڕهێنەرەدا کە هەواڵی ئەو قورەیشیانەم دەخوێندەوە کە موسڵمان دەبوون و بەو هۆیەوە جۆرەها سزایان بەسەردادەباری، ئەوانیش بە خۆڕاگری و ئارامەوە بەرگەی هەموو ئەوانەیان دەگرت، نەك هەر ئەوە بەڵکو بەچێژ و خۆشییشەوە، وام هەست دەکرد، کە تام وخۆشیەك هەیە کە دەوڵەمەند و بەهێزەکان ئاشنای نین، وە زۆر لەوانەی کە لەژیانـدا بـە بەختەوەر دادەنرێن و بەختەوەریش لەوەدایە کە لەسەر حەق لێت بدرێت و بەهۆی بیروباوەڕەوە بچەوسێیتەوە، و لەپێناو بانگەوازدا سووکایەتیت پێ بکرێت، ئەو چێژەش چێژی هێـز و زاڵ بوون نایگاتێ، هەستم کرد کە ئومێدەوارە دەروونم بەو چێژە شاد بێت، و بەو ڕێز و کەرامەتـە بگات گەر بۆ جارێکیش بێت لە تەمەندا.

هەروەها چیرۆکی کۆچی پێغەمبەرمﷺ خوێندەوە، چیرۆکێك کە شك نابەم هیچ چیرۆکێکم خوێندبێتەوە لەو زیاتر کاریگەریو وێنـای جـوانی تێـدا بوبێـت کـە دانـەر بـە راسـتگۆیی و ساکاریەوە دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خواﷺ دەچێتە شاری مەدینە لەکاتێکدا پێشتر دڵەکان وابەستەی بوبوون و چاویان تێبڕیبـوو و هۆزەکـان یـەك یـەك دەچـوونە پێـشەوە، و بەوپـەڕی دڵسۆزیو راستگۆییەوە دەیانوت: ئەی پێغەمبەری خواﷺ وەرە بـۆ لای ئێمـە، بـۆ لای زۆری ژمارەو هێز و چاکەکاری، ئەویش =دایك و باوکم بەقوربانی بێ-دەیفەرموو: ((**خلوا سـبيلها فإنها مأمورة**)) ڕێگەی حوشترەکە چۆڵ بکەن چونکە ئەو فەرمان پێکـراوە، حوشـترەکەش لـەو شوێنەدا کە ئێستا پێش مزگەوتەکەیە دادەنیشێت و رازی نابێت هەسـتێتەوە، خـوای گـەورە دەیەوێت ئەو ڕێـزەی کـە هـیچ ڕێزێکـی تـری پـێ ناگـات بـۆ (ابـو ایـوب انـصاری) بێـت، (ابوایوب)یش کەل وپەلەکانی هەڵدەگرێت و دەیباتە مـاڵی خۆیـان، و شـادی و خۆشـی (ابـو ایوب)م دەخوێندەوە بەهۆی ئەم ڕێزلێنانەوە کە خوای گەورە بۆی نارد لەگەڵ دڵسۆزی ئـەو لـە میوانداریکردنیدا، کە هەموو ئەوانەم دەخوێندەوە دەمبینی دڵم لـێم جودابۆتـەوەو کەوتۆتـە شوێن حوشترەکەی پێغەمبەری خواﷺ کە بە سوارییەوە دەچێتە ناو شاری مەدینە، و خـۆم وا دەهاتە پێش چاو کە هەموو ئەوانە بەچاوی خۆم دەبینم.

هەستم دەکرد کە ئەوەی خوێندومەتەوە یا بیستوومە دەربارەی چوونی پادشاکان و رزگارکەران و پیاوە مەزنەکان و دەوڵەمەنەکان بچووك بۆتەوەو تواوەتەوە، و هەموو ئەو خۆشەویستی و دڵسۆزیەی لە کەسێکدا بەرامبەر کەسێکی دیکە بەدیم کردبێت بەسەر چووەو نەماوەو لە خەیاڵ و دەروونمدا ئەم دیمەنە نەخشی داناوە.

هەروەها چیرۆکی (اُحُد)م خوێندەوە، کە چیرۆکێکە مێژوو چیرۆکی لەوە مەزنتر و سەیرتر و جوانتری بەخۆوە نەدیوە.. لە وەفاداریی و دڵسۆزی و پاڵەوانێتی و بڕواو دڵنیایی و رەوشت جوانیدا، وە قسەی (انس کوڕی نضر) هەژاندمی کە بەوانەی دەستەوئەژنۆ دانیشتبوون و چەکیان فڕی دابوو و دەیانوت: پێغەمبەری خوا ﷺ کوژراوە، پێی وتن: کەواتە دوای ئەو ژیانتان بۆ چیە؟ بمرن لەسەر ئەو رێیەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەری مردووە، یاخود قسەی ئەو کەسەی وتی: من لەودیو (اُحُد)ەوە بۆنی بەهەشت دەکەم، یان ئەوەی دوا ئاواتی ئەوەبوو کە لەدواساتەکانی ژیانیدا بگاتە بەر پێیەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەوەبوو لەو کاتەی لە گیان بەخشیندا بوو هەڵیانگرت و بردیانە خزمەتی، و لەبەر پێی پێغەمبەر ﷺ دوا هەناسەیدا، یان چۆن(ابودجانە) خۆی کردە قەڵغان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ و تیرەکان بە پشتی دەکەوتن و ئەویش خۆی بەسەریدا چەماندبۆوە، بۆ زۆری تر لە فەرموودەکانی خۆشەویستیو قوربانیدان درێژەم بە خوێندنەوەکەم دا، جاری وا هەبوو گریان بەسەرمدا زاڵ دەبوو و دەگریام، جاریش هەبوو لەخۆشی و شادیدا کەیف خۆش دەبووم.[1]

٦) سووربوونی دایکان لەسەر شوێنەواری پێغەمبەر ﷺ تا ببێتە فەڕ و پیت بەسەر منداڵەکانیانەوە:

(مسلم) لە (انس)ەوە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ دەچووە ماڵی (ام سلیم) ئەگەر ئەو لەوێ نەبوایە لەسەر نوێنەکەی دەنووست،[2] دەڵێ: رۆژێکیان هات و لە نوێنەکەی ئەودا نووست، کە هاتەوە پێیان وت: پێغەمبەر ﷺ لەماڵی تۆ و لەسەر نوێنەکەی تۆ نووستووە، دەڵێ: چووە لای و بینی ئارەقی کردووە، و ئارەقەکەی لەسەر پارچە پێستێك لەسەر نوێنەکە گۆمی بەستووە، (ام سلیم) باوڵەکەی -وەك سندوقێکی بچووك وایە ژن کەلوپەلە بەنرخ و لەدڵاشیرینەکانی لەناو دادەنێ- خۆی کردەوە و دەستی کرد بە سڕینەوەی ئارەقەکە و

---

[1] بانگخواز (ابوالحسن الندوی) زنجیرەیەکی چیرۆکی پێغەمبەران بۆ منداڵان و کتێبی ژیاننامەی پێغەمبەری ﷺ دەرکردوە.

[2] مەحرەمی بوو، چونکە خوشکی دایکە شیرییەکەی بووە.

گوشینی ئەو ئارەقەو دەیگوشیە ناو شوشەکانی، پێغەمبەرﷺ راچڵەکی و فەرمووی: ئەی (ام سلیم) ئەوە چی دەکەیت؟ وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ، فەڕ و بەرەکەتمان دەوێت بۆ منداڵەکانمان، فەرمووی: پێکاوتەو ڕاست دەڵێی.

بەم گیانە پاکە و بەو خۆشەویستیە بڵندەی پێغەمبەری خواوەﷺ و بەو وابەستەبوونە بەتینە پێوەی و بەو شێوە سووربوونە راستگۆیەوە دایکی ژیر و بەفام پەلەی دەکرد تا سوود بە ساواکەی بگەیەنێت بە شوێنەواری پێغەمبەرﷺ، ئەوەش بڕیاردانە کە دەفەرمووێت: (اصبت – پێکاوتە) و بڕیار لەسەر ئەو کارەی دەدات.

## بنچینەی چوارەمی بیروباوەڕ: منداڵ فێری قورئانی پیرۆز بکرێت:

پێویستە لەسەر سەرپەرشتیاری منداڵ (کوڕ یان کچ) لە منداڵییەوە فێری قورئانیان بکەن، ئەمەش بۆ ئەوەی بگاتە ئەو باوەڕەی کە خوای گەورە پەروەردگاری هەموانە، ئەمەش فەرمایشتی خوای گەورە خۆیەتی، و تا رۆحی قورئان لە دڵیاندا بڵاوبێتەوەو رۆشناییەکەی بگاتە فیکر و تێگەیشتن و هەستیان، و تا بیروباوەڕەکانی قورئان هەر لە منداڵیەوە بدرێت بە گوێیاندا و تا لەسەر خۆشویستنی قورئان و وابەستە بوون پێوەی و بەجێهێنانی فەرمانەکانی وازهێنان لە قەدەغەکراوەکانی پەروەردە ببن و پێبگەن، و خوڕەوشتیان لەوەوە سەرچاوە بگرێت و لەسەر پەیڕەوی ئەویش بڕۆن بەڕێوە.

(السیوطی) دەڵێت: قورئان فێرکردن بە منداڵان یەکێکە لە بنچینەکانی ئیسلام و بەو هۆیەوە لەسەر فیترەت پەروەردە دەبن و رووناکیەکانی دانایی دەگاتە دڵیان بەرلەوەی کە ئارەزوو پێی بگات و پەڵەی سەرپێچی و گومڕایی رەشی بکاتەوە.[1]

(ابن خلدون)یش دووپاتی ئەو تێگەیشتنەی کردۆتەوەو دەڵێت:[2] قورئان فێرکردن بە منداڵان دروشمێکە لە دروشمەکانی ئایین، خەڵکیش پەیڕەویان کردووە، و لەهەموو شارەکاندا لەسەری رۆیشتوون بەهۆی ئەو گرنگیەی کە هەیەتی لە پتەوکردنی ئیمان و بیروباوەڕی بەهۆی ئایەتەکانی قورئان و وتەی فەرموودەکانەوە، و قورئان بووە بنەمای سەرەکی ئەو فێربوونەی کە ئەوەی لەوەودوا روو دەدات لەسەری بنیات دەنرێت.

---

[1] نقلا عن (تلاوة القرآن المجید) للشیخ عبدالله سراج الدین.

[2] في مقدمته ص٣٩٧.

هەروا (ابن سینا)ش دەڵێت:[١] ئەگەر منداڵ بۆ شت وەرگرتن ئامادە بوو و گوێی کرایەوە، ئەوا فێری قورئانی دەکرێت و وێنەی پیتەکانی (هجاء)ی فێر دەکرێت و دروشمەکانی ئایینی بۆ باس دەکرێت.

**١- ئەوەی دەربارەی قورئان فێرکردنی منداڵان هاتووە:**

(طبرانی) و (ابن نجار) هێناویانە لە (علی)ەوەﷺ کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((**أدبوا أولادکم علی ثلاث خصال: حب نبیکم، وحب آل بیته، وتلاوة القرآن، فإن حملة القرآن في ظل عرش الله یوم لا ظل الاّ ظله مع أنبیائه وأصفیائه**)).[٢] واتە: (منداڵەکانتان لەسەر سێ خەسڵەت پەروەردە بکەن: خوشەویستی پێغەمبەرەکەتان و، خۆشەویستی ئال و بەیتی پێغەمبەر و، خوێندنەوەی قورئان، چونکە بەراستی هەڵگرانی قورئان لەژێر سێبەری عەرشی خوادان لە رۆژێکدا کە هیچ سێبەرێك نیە تەنها سێبەری ئەو نەبێت، لەگەڵ پێغەمبەران و هەڵبژێردراوەکانیدا).

هەروەها (ابن عساکر)یش باسی کردووەو سەنەدەکەی داوتە پاڵ - هەروەك لە تەفسیری (ابن کثیر)دا هەیە- (ابوظبیة) کە دەڵێت: (عبدالله) لەنەخۆشی سەرەمەرگیدا بوو (عثمان کوڕی عفان) سەری لێدا و پێی وت: کوێت ئازارت دەدات؟ وتی: گوناهەکانم، وتی: ئێستا حەزت لە چیە؟ وتی: بەزەیی پەروەردگارم، وتی: فەرمان بکەم پزیشك بێنن؟ وتی: پزیشك نەخۆشی کردوم، وتی: فەرمان بکەم شتێکت پێ ببەخشن؟ وتی: هیچ پێویستم پێی نیە، وتی: بەڵکو دوای خۆت بۆ کچەکانت بێت، وتی: ئایا ترسی ئەوەت هەیە کچەکانم هەژار بکەون؟! من فەرمانم بە کچەکانم کردووە کە هەموو شەوێك سوورەتی (الواقعة) بخوێنن، من بیستوومە لە پێغەمبەری خواﷺ کە دەیفەرموو: ((**من قرأ سوورة الواقعة کل لیلة لم تصبه فاقة أبداً**))[٣] واتە: هەرکەسێك هەموو شەوێك سوورەتی (الواقعة) بخوێنێ، هەرگیز تووشی هەژاری و نەداری نابێت.

هاوەڵان لە سووربوونیانەوە بۆ رێنمونیکردنی منداڵەکانیان زۆر وردبوون لە سەرنجدان و چاودێری کردنی کرداری منداڵەکانیان لەگەڵ قورئانی پیرۆز، پاشان باس کردنی ئەوە بۆ پێغەمبەرﷺ تا ئاشنای ئەو شتانە بن کە سوود بە منداڵەکانیان دەگەیەنێت:

---

[١] في کتاب السیاسة، باب سیاسة الرجل ولده.

[٢] رمز السیوطي لضعفه في الجامع الصغیر. انظر فیض القدیر للمناوي: ١/٢٢٥.

[٣] ورواه ابن السني في عمل الیوم واللیلة برقم٦٨٥.

(احمد) لە (عبداللە کوڕی زبیر)ەوە ﷺ هێناویەتی کە پیاوێك کوڕێکی خۆی هێنا بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! کوڕەکەم بەرۆژ قورئان دەخوێنێ و بە شەو دەنووێت؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((**ما تنقم من ابنك، يظل ذاكراً، ويبيت سالماً**))[1] واتە: (بۆ پێت ناخۆشە کوڕەکەت بەرۆژ لە یادکردنەوەدا بێت و شەویش بە ساغ و دروستی بنووێت).

هاوەڵان بە مەبەستی بەدەمەوەچوونی ڕێنموونیەکانی پێغەمبەر ﷺ دەستیان دایە فێرکردنی قورئان بە منداڵەکانیان:

لە (مصعب کوڕی سعد کوڕی ابووقاص) ﷺ دەگێڕنەوە و ئەویش لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((**خيارکم من تعلم القرآن و علمه**)). واتە: (چاکترینتان ئەو کەسەیە کە قورئان فێر دەبێت و فێری خەڵکیشی دەکات).

دەڵێت: دەستی گرتم و لەم شوێنەی خۆمدا دایانم و وتی بخوێنە.[2]

هەر بۆیە دەبینین هاوەڵان بەم قورئانە ئامۆژگاری خەڵکیان دەکرد و منداڵەکانی خۆشیان لەسەر خۆشویستن و خوێندنەوەی پەروەردە دەکرد، لەو بارەیەوە (ابن کثیر) لە تەفسیرەکەیدا باس دەکات کە (ابن عباس) ﷺ بە پیاوێکی وت: ئایا فەرموودەیەکت بۆ بکەمە دیاری کە دڵت پێی خۆش بێت؟ وتی: بەڵێ، (ابن عباس) وتی: سوورەتی ﴿تَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ﴾ بخوێنەو فێری خاوخێزان و هەموو منداڵەکانت (گەورەو بچووك) و هی دراوسێکانتی بکە، چونکە بەراستی ڕزگارکەرە، و سوورەتی (المجادلة)ش پاڵپشتی خاوەنەکەی دەکات و لەڕۆژی قیامەتدا لای پەروەردگاری لەسەری دێتە وەڵام، و داوا دەکات کە لە سزای ئاگری دۆزەخ ڕزگاری بێت و بەهۆیەوە لە سزای گۆڕ ڕزگار دەبێت، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((**لوددت أنها في قلب كل انسان من امتي**))[3] واتە: (پێم خۆش بوو لەنێو دڵی هەموو مرۆڤێکی ئوممەتەکەمدا بوایە).

[1] قال الهيثمي في مجمع الزوائد (٢/٢٧٠): وفيه ابن لهيعة، وفيه كلام.

[2] رواه ابو يعلى في مسنده ٢/١٣٦ بسند ضعيف، الا أن متن الحديث صحيح رواه احمد والبخاري وابوداود والترمذي وابن ماجه والدارمي.

[3] وروى ابو الشيخ بأسناد حسن مرفوعاً: (سورة تبارك هي المانع من عذاب القبر) وفي رواية الترمذي وقال حديث حسن صحيح: (هي المنجية تنجيه من عذاب القبر) انظر سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم١١٤٠.

هەروەها هاوەڵان لە زۆر سووربوونیان لەسەر وابەستەبوونی منداڵەکانیان بە قورئانەوە، وە بەدەستهێنانی فەڕ و بەرەکەتی قورئان بۆ منداڵەکانیان، کاتی هاتنەخوارەوەی ئەو فەڕ و بەرەکەتانەی قورئانی دیاری دەکرد تا منداڵەکانیان ئامادەی بن.

لەم بارەیەوە (طبرانی) لە (انس کوڕی مالك)ﷺ دەگێڕێتەوە کە کاتێك خەتمی قورئانی بکردایەتەوە خاوخێزان و منداڵەکانی کۆدەکردەوەو بۆیان دەپاڕایەوە.[1]

(ابن عباس)یش‍ﷺ شانازی بەوەوە دەکات کە لەسەردەمی پێغەمبەرداﷺ قورئانی خوێندۆتەوە کە لەو کاتەدا منداڵێکی بچووك بووە، (ابن کثیر) لە (فضائل القرآن)دا باسی کردووە، لە (ابن عباس)ەوەﷺ دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: کاتێ پێغەمبەری خواﷺ وەفاتی کرد من تەمەنم دەساڵان بوو و قورئانم تەواو خوێندبۆوە.

قورئان خوێندنی منداڵانیش هۆیەکە بۆ لابردنی بەڵا و سزا لەسەر خێزان و کۆمەڵگا، لە (حذیفة کوڕی یمان)ەوە دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((إن القوم **ليبعث الله عليهم العذاب حكماً مقضياً؛ فيقرأ الصبي من صبيانهم في المكتب [الحمد لله رب العالمين] فيسمعه الله تعالى فيرفع عنهم بسببه العذاب اربعين سنة**)).[2] واتە: (خوای گەورە بە بڕیارێکی جێبەجێکراو سزا بۆ گەلێك دەنێرێت، بەڵام منداڵێك لە منداڵەکانیان لە فێرگەدا (الحمدلله رب العالمین) دەخوێنێتەوە و، خوای گەورە ئەوە دەبیستێت و، بەو هۆیەوە بۆ ماوەی چل ساڵ سزایان لەسەر لادەبات).

پێشینانی چاکیش ﷺ لەسەر هەمان ڕێگا دەڕۆیشتن و هەمان ڕێبازیان گرتە بەر، لە پێشەکی کتێبی (المعلمین) ی (ابن سحنون)یشدا هاتووە کە قازی پارێزکار (عیسا کوڕی مسکین) قورئانی بە کچ و نەوەکانی دەخوێند، (عیاض) دەڵێت: کە کاتی دوای عەسر هاتبا هەردوو کچەکەی و کچەکانی براکەی بانگ دەکرد تا فێری قورئان و زانستیان بکات، پێش ئەویش رزگارکەری -صقلیە- (اسد کوڕی فرات) هەمان شتی لەگەڵ (اسماء)ی کچی دەکرد کە پلەیەکی بەرزی لەزانست و زانیاریدا بەدەست هێنا.[3]

---

[1] ورجال الحديث ثقات، قاله الهيثمي في المجمع ١٧٢/٧.

[2] التفسير الكبير للرازي ١٧٨/١.

[3] من تربية الأولاد، ط.١٦٧/٢.

## ٢- پاداشتی دایك و باوك لەسەر قورئان فێركردنی منداڵەكانیان:

(حاكم) گێڕاویەتەوە لە گێڕانەوەی (بریده)وە كە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((**من قرأ القرآن وتعلمه، وعمل به، ألبس والداه يوم القيامة تاجاً من نور، ضوؤه مثل الشمس، ويكسى والداه حليتين، لا تقوم لهما الدنيا، فيقولان: بم كسبنا هذا؟ فيقال: بأخذ ولدكما القرآن**)).
واتە: (هەركەسێ قورئانی خوێند و فێری بوو و كاری پێكرد، لەرۆژی قیامەتدا دایك و باوكی تاجێكیان لەسەر دەكرێت كە پرشنگ و ڕووناكیەكەی وەك خۆر وەهایە، و بە جل و بەرگێك دەپۆشرێن كە هەموو دنیا هاوسەنگی ناكات، دەڵێن: بەهۆی چیەوە ئەمەمان بەدەست هێنا؟ دەڵێن: بەهۆی ئەوەی كە منداڵەكەتان قورئانی وەرگرتووە (فێری بووەو كاری پێكردووە)).

(ابوداود)یش لە (سهل كوڕی معاذ)ەوەﷺ هێناویەتی كە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((**من قرأ القرآن وعمل به، ألبس الله والديه تاجاً يوم القيامة، ضوؤه أحسن من ضوء الشمس**))[1] واتە: (هەر كەسێ قورئان بخوێنێ و كاری پێ بكات، خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا تاجێك دەكاتە سەر دایك و باوكی كە تیشكیان چاكترە لە تیشكی خۆر).

## ٣- منداڵ تێگەیاندن لە قورئان:

پێویستە پەروەردەكار ـ یاخود دایك و باوك- كە لەكاتی قورئان خوێندن بە منداڵەكانیان گرنگی بدەن بە ڕاڤەیەكی پوخت و ئاسانی قورئان تا بەهۆیەوە واتاكانی قورئان دڵ و عەقڵی ئەو منداڵە بكاتەوە، هەروەها با كەس وا گومان نەبات كە منداڵ بچووكە، ئەو منداڵە زۆر لە خەڵكی وای دادەنێن كە لەبەر منداڵیەكەی پێویستی بە ڕاڤەكردن نیە، و پێویست ناكات گرنگی بە عەقڵی بدرێت لەبەر منداڵێتی، بەڵام لە ڕاستیدا ئەو منداڵە سەیرە دەتوانێت ئەوەندە زانیاری لای خۆی هەڵبگرێت كە كۆمپیۆتەرێكی ئەم سەردەمە پێی هەڵدەگیرێت، فەرموو ئەوەش بەڵگە لەو بارەیەوە:

(حاكم) لە (ابن عباس)ەوەﷺ هێناویەتی كە دەڵێ: پرسیارم لێ بكەن دەربارەی سوورەتی (النساء)، چونكە كاتێك كە منالْ بووم خوێندوومە.[2]

---

[1] ورواه احمد (٣/٤٤٠) من طريق حسن، ورواه أبو يعلى (٣/٦٥) بسند ضعيف.
[2] أخرجه الحاكم ثم قال: صحيح على شرط الشيخين و لم يخرجاه،

(ابن جرير)يش گێڕاويەتيەوە و سەنەدەكەی دەرهێناوە كە: كوڕێكی قورەيشی لە (سعيد كوڕی جبير)ی پرسی: وتی باوكی عبدالله، پێمان بڵێ ئەم پيتە چۆنە؟ من كە دەگەمە سەری، حەزدەكەم ئەو سوورەتە نەخوێنمەوە: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا ٱسۡتَيۡـَٔسَ ٱلرُّسُلُ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ قَدۡ كُذِبُواْ جَآءَهُمۡ نَصۡرُنَا﴾يوسف/١١٠. وتی: بەڵێ: هەتا پێغەمبەرانيش تووشی نائومێدی بوون بەرامبەر هۆز و گەلەكەيان كە باوەڕيان پێبهێنن و بەراستيان بزانن، ئەوانەی نێردراويان بۆ هاتووە وايان گومان برد كە نێردراوان درۆيان كردووە.[1]

(ابن عبدالبر)يش[2] لە (معاويە)وە دەگێڕێتەوە كە وتوويەتی: فريودارترين گومڕايی بۆ پياو ئەوەيە كە قورئان بخوێنێتەوەو لێی شارەزا نەبێت، تا فێری منداڵ و كۆيلە و ئافرەت و جاريەی بكات و ئەوانيش دەمەقاڵی زانايانی پێبكەن.[3]

هەروەها (ابويعلی)[4]يش لە (مصعب كوڕی سعد كوڕی ابووقاص)ەوەﷺ گێڕاويەتەوە، كە دەڵێت: بە باوكم وت: باوكە ئەو فەرمايشتەی خوای گەورەت بيستووە كە دەفەرمووێت ﴿الَّذِينَ هُمْ عَنْ صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ﴾الماعون:٥.[5]؟ باشە كێ لە ئێمە هەيە سەهو نەكات؟ كامە لە ئێمە دەروونی خۆی لەناو نوێژدا نادوێنێت؟ وتی: ئەو واتايە ناگەيەنێ، بەڵكو مەبەست لێی بەفيڕۆدانی كاتە، خۆی بە شتی پووچەوە خەريك دەكات تا كاتەكەی لەكيس دەچێت.

ئەمەش نمونەيەكە بۆت دەربارەی ورد تێگەيشتنی منداڵان لە قورئان و سووربوونيان لەسەر تێگەيشتنی:

هەروەك گێڕاويانەتەوە (مأمون) بە منداڵی لای (كسائی)ی مامۆستای دەيخوێند، (كسائی)ش كردبوويە پيشە كە لەكاتی قورئان خوێندنی (مأمون)دا سەری نەوی دەكرد، ئەگەر هەڵەی بكردايە سەری بەرز دەكردەوە، ئەويش دەگەڕايەوە و هەڵەكەی ڕاست دەكردەوە.. ڕۆژێكيان سوورەتی (الصف)ی دەخوێند، كاتێ گەيشتە ئەو فەرمايشتەی خوای گەورە كە

---

[1] تفسير ابن كثير ٢/٤٩٧.

[2] في جامع العلوم والحكم ٢/١٩٤.

[3] عن حياة الصحابة ٣/٢٠٦.

[4] رواه ابو يعلى في مسنده ٢/٦٣ بسند حسن.

[5] **واتە: ئەو نوێژكەرانەی هۆش بە نوێژەكانيان نادەن و كاريگەريی نيە لەسەريان.**

دەفەرمووێ: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِمَ تَقُولُونَ مَا لاَ تَفْعَلُونَ﴾الصف/٢.[١] (کسائی) سەری بەرز کردەوە، (مـأمون)یش سەیرێکی کرد و ئایەتەکەی دووبارە کردەوەو بۆ هەڵەی خۆی گـەڕا لەو ئایەتەدا، بینی تەواوو راست و دروستە بۆیە لەسەر خوێندنەوەکەی بەردەوام بـوو، کاتێـك (کسائی) رۆشت، (مأمون) چووە لای باوکی و وتی: ئایا پەیمانی هیچ شـتێکت بـە (کـسائی) داوە؟ وتی: کوڕم چۆن ئەوەت زانی؟ ئەویش باسەکەی بۆ گێڕایەوە، (هارون رشید)یـش کـەیف خۆش بوو بە ژیری و زۆر زیرەکی کوڕەکەی.

## ٤- قورئان چۆن کاریگەریی لەسەر دەروونی منداڵدا دەبێت؟

قورئـانی پـیرۆز کاریگەرییـەکی مـەزنی هەیـە لەسـەر دەروونـی مرۆڤایـەتی بەگـشتی، دەیهەژێنێت و کەمەندکێشی دەکات و لە ژێیەکانی دەدات، وە چەندە دەروون بێخەوش و پاك بێت ئەوەندە کاریگەرییەکەی زیاتر دەبێت، منداڵیش بەهێزترین کەسە لە بێخەوشیو پاکیدا، فیترەکەشی هێشتا بێگەردە، و شەیتانیش هێشتا بۆی لە مەیدانـە تـا بێگەردیيەکـەی لـێڵ بکات، خۆ گەر لە ئایەتە مەکییەکان رابمێنین دەبینین کورتن و لەگەڵ دەروونی کورتی منداڵـدا دەگونجێن، وێڕای ئەو کورتـە سـوورەتانەی کـە بەچـەند دێڕێکـی کـەم بابـەتێکی زۆر تـەواو پێشکەش بە منداڵ دەکەن، کە ئاسانە بۆ لەبەر کردن و کاریگەری بەهێزی هەیـە، نووسـەر و ئەدیب (مصطفی صادق الرفـاعی): ئەم روونکردنەوەیەی بەشێوەیەکی فراوانتر درێـژە پێـداوەو دەڵێت:[٢]

ئەم سوورەتە کورتیلانە فەرمانێکیان هەیە، لە قورئانیشدا حیکمەتێکیان هەیە کە ئەوەیە سەیرترین شتە کە هیوا خواستنی مرۆڤ پێی دەگات هـەتا لـە دەروونیـدا شـوێن بـۆ بەڵگـەی خودایی خاوەن معجزە بکاتەوە، ئەو سوورەتانە بەیەك پێودانگ نەهاتونەتـە خـوارەوە لەسـەر ئەو شێوەیەی کە ئێستا لە قورئاندا دەیبینین، واتە ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّـــاسِ﴾ نـە یەکـەم سوورەت بوو و نە دوا سوورەت کە لە قورئان هاتبێتە خوارەوە، پاشان بە کۆی هەموو سوورەتە کورتەکانیشەوە زیاتر لە جوزئێکی قورئان نابێت، لەکاتێکدا کە قورئان هەمووی سی جوزئـەو لەپاش ئەو جوزئە کورتە فراوانتر دەبێت، کـەم و زۆر هـەتا لـە درێـژترین سـوورەتدا کۆتـایی پێدێت، خوای گەورە زانیویەتی کـە کتێبەکـەی لەسـەر ئـەو رێزبەندییـە بـاوەی ئێـستا بـۆ

---

[١] واتا: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! بۆ ئەوەی دەیڵێن بە کردەوە نایکەن.

[٢] في كتابه تأريخ آداب العرب ٢/٢٠٦.

لەبەرکردن رۆژگار دەیسەلمێنێ بەهۆی چەند هۆیەکەوە دەریخستووە لە سوودمەندیدا کە یەکەمینیان لە جێگەی ئەم سوورەتە کورتانەدایە کە بەهۆی چەند وشەیەکی کەمەوە دەردەبڕدرێت بەرەو ئایەتی کەم کە لەگەڵ ئەوەشدا بەزۆری ئایەتەکانی وەستانی کورتی تێدەکەوێت لە نێوان وەستان و وەستانێکی دیکە، هەموو ئایەتێکی لە وەسفدا وەکو سوورەتێکی کە لەچەند وشەیەکی کەم پێکهاتبێت:

- دەروونی منداڵی بچووکی پی تەنگ نابێت.

- بەم وەستانانە لە مێشکیدا خۆی دەنووێنێت کە بە پیتێك یاخود دوو پیت یا چەند پیتێکی کەم و لێك نزیك دێت.

- منداڵ توانای دەربڕینی هەندێك لەو سوورەتانەی نیە هەتاوەکو رانەیەت لەسەر شێوازی خوێندنەوەی قورئان لەسەر زمانی و کاریگەریەکی جێگیر ببێت لە دەروونیدا، ئیدی پاش ئەوە دەتوانێ کە خێرا بەسەریدا بڕوات.

- ئەو منداڵە هەتا بەرەو پێشەوە بڕوات دەبینێت ئاسانترە بۆی، و ئەو تایبەتمەندییانەی بەدی دەکات کە یارمەتی دەرن لەسەر لەبەرکردنی و جێگیرکردنی ئەوەی لەبەری دەکات، ئەم واتایەش لەم فەرمایشتەی خوای گەورە بەدی دەکرێت: ﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا ﴾الإسراء/٨٢. واتە: (ئێمە لە قورئان و ئایەت و سوورەتێك دادەبەزێنین کە ببێتە هۆی شیفا و چارەسەر (بۆ نەخۆشیە دەروونی و جەستەییەکان) و هەروەها رەحمەت و میهرەبانیش بۆ ئیمانداران، بەڵام بۆ ستەمکار و خوانەناسان جگە لەوەی کە دەبێتە مایەی زەرەر و زیان بۆیان (هیچ بەهرەو سوودێکی لێ نابینن)).

ئەمەش -بەخوا- بەزەیی و میهرەبانیە، بەڵام چ رەحمەت و بەزەییەك، خۆ گەر ویستت لەم واتایە بگەیت ئەوا لە سوورەتێکی قورئان رابمێنە، یەکەم شتیش کە منداڵان لەبەری دەکەن سوورەتی ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ﴾ـە، بڕوانە لە داڕشتنیدا چۆن هاتووە:

چۆن وەستان تێیدا دوبارە بۆتەوە کە واژە(لفظ)ی (الناس)،ە.

چۆن لە وەستانەکانیدا جگە لە پیتی (س) بەدی ناکرێت.

کە ئەویش لە هەموو پیتەکان زیاتر درێژبوونەوەی تێدایە.

و لەهەموویان خۆش ئاوازترە بۆ گوێی منداڵی بچووك.

و چاکترینیانە بۆ چالاکی و کۆبوونەوەی.

بزانە چۆن بڕگەکانی سوورەتەکە گونجاوەو لەکاتی دەربڕینیدا دەروونی بچووکترین منداڵ کە توانای قسەکردنی هەبێت دەروونی دەهەژێت، هەروەك ئەوەی لەگەڵیدا بڕوات و وەك ئەوەی بەپێی بڕو توانای ئەو دانرابێت.

هەروەها بڕوانە چۆن هەموو فەرمانەکە لە گشت روویەکەوە هاوچەشنە" لە پیتەکانی و شێوەی رێکخستنیدا ... و واتاکانیدا.

پاشان بڕوانە چۆن لەوسەرتر دێنێت بەوشێوەیەی کە ئاماژەمان بۆ کرد. وە چۆن دانایی لەو رێکردنە سەیرەدا تەواو بەدی هاتووە.

ئەمەش چەند نمونەیەکی کردارییە لە کاریگەری قورئان لەسەر منداڵان:

لە (ابن عباس)ەوەم دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: کاتێ خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاندە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەرەکەیﷺ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا﴾التحريم/٦. واتە: (ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە، خۆتان و کەس و کارتان بپارێزن لە ئاگرێك..)

پێغەمبەری خواﷺ شەوێکیان یان رۆژێکیان بۆ هاوەڵەکانی خوێندیەوە، گەنجێك لە ترساندا بورایەوە، پێغەمبەرﷺ دەستی خستە سەر دڵی و هەستی کرد لێ دەدا، فەرمووی: ((**یا فتی! قل لا اله الاّ الله**)) ئەی لاو! بڵێ (لا اله الا الله)، ئەویش وتی، جا مزگێنی بەهەشتی دایێ. هاوەڵانی فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خواﷺ تەنها ئەو لەنێومانەدا؟ پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ئایا ئەو فەرمایشتەی خوای گەورەتان نەبیستووە: ﴿ذَٰلِكَ لِمَنۡ خَافَ مَقَامِي وَخَافَ وَعِيدِ﴾ابراهيم/١٤. واتە: (ئەوە بۆ کەسانێکە کە لە پایەی خوا دەترسن و لە رۆژی قیامەت دەترسن).[1]

هەر لە کاریگەرییەکانی قورئان بۆ سەر دەروونی منداڵ لە کاتێکدا بەخوێندنەوەو تێگەیشتنەوە لەگەڵیدا دەژی، ئەو منداڵە دەتوانێت زۆر لە گیروگرفتە دەروونی و

[1] رواه الحاكم في مستدركه ٣٥١/٢ وقال صحيح الأسناد و لم يخرجاه واقره الذهبي.

بیروباوەڕییەکانی چارەسەر بکات، و رەفتاری راست بکاتەوە، و لە هەڵچوونە دەمارییەکانی هێور بکاتەوە، و زاکیرەی فراوان بکات، بۆ نمونەش ئەم چیرۆکە خۆش و ناسکە دەگێڕینەوە لەو بارەیەوە کە هی زانای فرەزان (عبدالوهاب الشعرانی)یە :کە دەڵێت:[1]

کاتێك کە منداڵ بووم شتێکی وام بەسەر هات، کە بیرم لە خوای گەورە دەکردەوەو، بە پێی عەقڵی خۆم پێوانەم بۆ کرد، پاش ئەوە بەم ئایەتە وازم لەم بیرکردنەوەیە هێنا: ﴿ لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴾الشوری/١١. واتە(هیچ شتێك وەك ئەو زاتە نیە و لەو ناچێت، لەهەمان کاتدا زاتێکی بیسەرو بینایە).[2]

**٥- چەند نمونەیەکی قورئان لەبەرکردنی منداڵان:**

ئەمە چەند نمونەیەکە دەیخەینە بەر دەستی دایکان و باوکان تا ببێتە هۆکارێك بۆ هەستانەوەی هیممەت و تاودانەوەی دەروونەکان بە مەبەستی گرنگیدان بە لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز و تا ببێتە ئامرازێکی کارا لە چالاککردنی عەقڵەکان و جوڵاندنیان بۆ بەهرەمەند بوون لەو کانیاوە سازگارەو تێرخواردنەوە لێی.

١/ ئیمامی شافیعی: دەڵێت: تەمەنم حەوت ساڵان بوو کە قورئانم لەبەر کرد، و لە دەساڵیشدا (الموطأ)م لەبەر کرد.[3]

٢/ (سهل کوڕی عبدالله التستری)یش دەڵێت: لەسەر خوێندن ڕۆیشتم و فێری قورئان بوم و لە بەرم کرد، لەکاتێکدا تەمەنم شەش یان حەوت ساڵ بوو.[4]

٣/ بەڵام (ابن سینا) کە تەمەنی گەیشتە دەساڵی، شارەزای قورئانی پیرۆز بوو.[5]

٤/ ئیمامی (نووی)یش: شێخ (یاسین کوڕی یوسف المراکشی) لەبارەیەوە دەڵێت: شێخم بینی لە تەمەنی دەساڵیدا لە (نوا)[6] بوو، منداڵان بەزۆر دەیانویست یاریان لەگەڵدا بکات، ئەویش

---

[1] في كتابه المنن الكبرى.

[2] **بۆ زیاتر شارەزا بوون بگەڕێوە بۆ** (الأهداء في تصوير الفني في القرآن) و (مشاهد القيامة في القرآن) **دانراوی شەهید** سيد قطب.

[3] طبقات الحفاظ للسيوطي ص١٥٤.

[4] الإحياء للإمام الغزالي ٣/٧٢.

[5] وفقات الأعيان لأبن خلكان، نقلاً عن صفحات من صبر العلماء ١/١٥٢.

[6] **گوندێکە لە جۆلانی سەر بە دیمشق.**

هەڵدەهات لەدەستیان و دەگریا بۆ ئەو زۆرکردنەیان و لەو حاڵەتەدا قورئانیشی دەخوێند، جا خۆشەویستی ئەو چووە دڵمەوە، لەو کاتەشدا باوکی لەسەر دوکان دایىنابوو، وای لێهاتبوو کڕین و فرۆشتن سەرقاڵی نەدەکرد و لە خوێندنی قورئان دووری نەدەخستەوە، چوومە لای مامۆستاکەی و لەو بارەیەوە رامسپارد و پێم وت: ئومێد هەیە کە ببێتە زاناترین و زاهیدترین کەسی سەردەمەکەی، وخەڵکیش بەهۆیەوە سوودمەند بن، پێی وتم: تۆ ئەستێرەناسیت؟ وتم: نەخێر، بەڵکو خوای گەورە ئەوەی بەزمانیدا هێنام، ئەوەی بۆ باوکی گێڕایەوە، ئەویش سوور بوو لەسەری هەتا قورئانی خەتم کرد کە لەتەمەنی باڵغبووندا بوو.[١]

٥/ ئێستاش فەرموون لەگەڵ کوڕێکی تەمەن حەڤدە ساڵ کە هەر حەوت جۆرە خوێندنەوەکەی لەبەر کردووە:

دکتۆر (عبدالحی الفرماوی) لە پێشەکی لێکۆڵینەوەیدا بۆ کتێبی (منجد المقرئين ومرشد الطالبين) کە لە دانانی (محمد کوڕی الجزري)یە دەربارەی ژیانی دانەر دەڵێت:

مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە کە باوکی بازرگان بووە، پاش ئەوەی کە خوای گەورە وەڵامی پاڕانەوەکەی داوەتەوە سوور بووە لەسەر پەروەردەکردنی کوڕەکەی بە پەروەردەیەکی ئایینی، وە بە چاکی پێی گەیاندووە، لەبەر ئەوە (ابن الجزري) لە ماڵێکدا پەروەردە بوو کە رێزی زانست و خاوەن زانستی تێدابوو، ئەوەش یارمەتیدەری بوو کە لە تەمەنی سیازدە ساڵاندا قورئانی پیرۆز تەواو لەبەر بکات، و گوێی لە فەرموودە بێت و خوێندنەوەکان بە تاك تاكی بخوێنێتەوە، بەڵکو خوێندنەوەی هەرحەوت ئیمامەکە پێکەوە کۆبکاتەوە، هەروەها خوێندنەوەکانی کۆکردەوە لەسەر زاناترین کەسی وڵاتی شام لە خوێندنەوەکاندا کە شێخ (ابن اللبان) بوو، ئەوەش لەکاتێکدا بوو کە لە تەمەنی حەڤدە ساڵیدا بوو.[٢]

ئەمەش نمونەیەکی دیکەیە لە بارەی داواکردنی منداڵان بۆ فێربوونی خوێندنەوەکان لە زانایانی سەردەمانی دوایی، لەم رووەوە (شێخ علاء الدين عابدين): دەربارەی ژیانی باوکی، (محمدامین)ی ناسراو بە (ابن عابدين) خاوەنی کتێبی (الحاشية في الفقه الحنفي) دەڵێت:

هێشتا زۆر منداڵ بوو قورئانی پیرۆزی بەدڵ لەبەر کرد، لە شوێنکار(محل)ی بازرگانی باوکیدا دادەنیشت تا ئالودەی بازرگانی بێت و فێری کڕین و فرۆشتن ببێت، جارێکیان

---

[١] الطبقات الكبرى لأبن السبكي ٨/٣٩٦.
[٢] طبقات القرىء ٢/٢٤٧.

دانیشتبوو قورئانی دەخوێند، پیاوێك بەوێدا گوزەری کرد کە نەیدەناسی، کە خوێندنەوەکەی گوێ لێبوو لۆمەی کرد و خوێندنەوەکەی بەلاوە خراپ بوو، بۆیە پێی وت: بۆت نیە بەو جۆرە خوێندنەوەیە بیخوێنیتەوە، یەکەم چونکە ئێرە شوێنی بازرگانییە و خەڵك گوێ لە خوێندنەوەکەت ناگرن و بەهۆی تۆوە خراپە دەکەن و تۆش دەبیتە خراپەکار. دووەم خوێندنەوەکەت هەڵەیە، دەست بەجێ هەستا و دربارەی بەتواناترین کەسی سەردەمەکەی پرسیاری کرد، جا کەسێك گەورەی قورئان خوێنانی سەردەمەکەی پیشاندا کە (شیخ سعید الحموی) بوو، رۆیشت بۆ حوجرەکەیو داوای لێ کرد کە حوکمەکانی قورئان خوێندن و تەجویدی فێر بکات، لەو کاتەدا نەگەیشتبووە تەمەنی بالّغ بوون، (المیدانیة) و (الجزریة) و (الشاطبیة)ی لەبەر کرد و بە خوێندنەوەیەکی زۆر شارەزایانە و قوڵ دەیخوێندنەوە هەتاوەکو شارەزایی هونەری خوێندنەوە بەهەموو رێگە و شێوەکانیەوە بوو.[1]

### ٦- منداڵێتیەکی سەرسوڕهێنەر لە لەبەرکردنی قورئاندا:

(ابراهیم کوڕی سعید الجوهری) دەڵێت: منداڵێکی تەمەن چوار ساڵانم بینی کە هێنابوویان بۆ لای (مأمون) قورئانی خوێندبوو و راوبۆچوونی هەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا کە برسی بوایە دەگریا.[2]

(ابو محمد عبدالله کوڕی محمد کوڕی عبدالرحمن الاصبهانی) دەڵێت:[3] تەمەنم پێنج ساڵان بوو قورئانم لەبەر کرد، کاتێکیش بردمیان بۆ لای (ابوبکر المقرئ) تا گوێی لێ بگرم چوارساڵان بووم، هەندێك لە ئامادەبوان وتیان: گوێی لێ مەگرن لەوەی دەیخوێنێتەوە، چونکە بچکۆلەیە، (ابن المقرئ)یش پێی وتم: سوورەتی (التکویر) بخوێنەرەوە، منیش خوێندمەوە، یەکێکی دیکەش وتی: سوورەتی (المرسلات) بخوێنەرەوە، خوێندمەوەو هیچ هەڵەم تێدا نەکرد، (ابن المقرئ) وتی: گوێی لێ بگرن و با لەگەردنی من بێت.

### ٧- کەی منداڵ دەست بە فێربوونی قورئان دەکات:

(ابوعاصم) دەڵێت:[4] کوڕەکەم تەمەنی لە سێ ساڵ کەمتر بوو لەگەڵ خۆم بردم بۆ لای (ابن جریج) تا فەرموودەو قورئانی پێ بڵێت، (ابو عاصم) دەڵێت: هیچی تێدا نیەو قەیناکات کە منداڵ لەو تەمەنەو هاوشێوەی ئەودا فێری قورئان و فەرموودە بکرێت.

---

[1] حاشية ابن عابدين ط٢ ص٧.

[2] الكفاية في علم الرواية –للخطيب البغدادي ص١١٦-١١٧ طبع مصر.

[3] الكفاية في علم الرواية –للخطيب البغدادي ص١١٦-١١٧ طبع مصر.

[4] المصدر السابق.

### ٨- پاداشت و دەستخۆشانە بۆ قورئان پێخوێن و منداڵ:

کاتێك (حماد کوڕی ابو حنیفه) سوورەتی (الفاتحه) چاك فێربوو و شارەزا بوو، (ابو حنیفه) پێنج سەد درهەمی بە مامۆستاکەی بەخشی، -کە لەو کاتەدا بەرانێك بە یەك درهەم دەکڕدرا-، مامۆستاکە ئەم بەخشینەی بەزۆر زانی چونکە تەنها سوورەتی (الفاتحه)ی فێرکردبوو، (ابوحنیفه) پێی وت: ئەوەی فێری کوڕەکەمت کردووە بەکەمی مەزانە، گەر پارەی لەوە زیاترمان لەدەستدا بوایە دەمانداییێ لەبەر ڕێزگرتن و بەگەورەزانینی قورئان.[١]

لەبارەی پاداشت و دەستخۆشانە دان بە منداڵیش، ئەوەتا (صلاح الدین الایوبی) لە گەرمەی شەڕدا بەناو سەربازگەکەیدا دەهات و دەچوو، بەلای منداڵێکدا تێپەڕی کە لەبەردەستی باوکیدا قورئانی دەخوێند، و خوێندنەوەکەشی بەلاوە چاك بوو، بۆیە لەخۆی نزیك کردەوەو پشکێکی تایبەتی لە خواردنی خۆی بۆ تەرخان کرد، و بەشێکی کێڵگەکەی خۆی لەسەر کوڕ و باوکەکە وەقف کرد.[٢]

### ٩- قوتابخانە قورئانیەکان لە وڵاتی ئیسلامیدا:

### ا/ بەدەمەوەچوونی منداڵان بۆ قوتابخانە قورئانیەکان:

مزگەوتەکان پڕ بوون لە منداڵان هەتا وای لێهات (ضحاك کوڕی مزاحم)ی مامۆستاو پەروەردەکاری منداڵان ناچار بوو کە بەسواری گوێدرێژێکەوە بەناو قوتابییەکانی خوێندنگەکەیدا بسووڕێتەوە تا سەرپەرشتیان بکات کە ژمارەیان گەیشتبووە سێهەزار منداڵ، بەرامبەر ئەو کارەش هیچ کرێی وەرنەدەگرت.[٣]

### ب/ ئایا منداڵ لەگەڵ قورئاندا زانستێکی دیکەدا فێر دەبێت؟

ڕێچکەو ڕێبازەکانی ناوچە ئیسلامییەکان بیروڕای جیاوازیان لەمەدا هەیە، هەروەك (ابن خلدون) دەڵێت،[٤] وڵاتی وا هەیە هیچ زانستێکی دیکە لەگەڵ فێرکردنی قورئاندا بەشدار ناکات، وڵاتی دیکەی وەهاش هەیە بەشداری پێدەکات بەو پێیەی کە زانستەکانی دیکە

---

[١] فتح باب العناية ص١٩.
[٢] النوادر السلطانية ص٩.
[٣] عن اصول الحديث لعجاج الخطيب ص١٤٥.
[٤] في مقدمته ص٣٩٧.

لاوەکی(فرعی)یە، لەم نێوەندەشدا وڵات هەیە بە یەکسانی بەشداری پێدەکات و دەیلێتەوە، لەبارەی هەر یەك لە وڵاتەکان دەڵێت:

١- خەڵکی مەغریب: ڕێبازیان لە خوێندنی منداڵاندا وایە کە تەنها فێری قورئان بکرێن لەگەڵ گرنگی دان بە ڕەسمی قورئان و جیاوازی هەڵگرانی قورئان تێیدا، وە لە کۆڕەکانی فێربوونیاندا فەرموودەو فیقه و شیعر و قسەی عەرەب لەگەڵ قورئان تێکەڵ ناکەن.

٢- خەڵکی ئەفریقیا: لە فێرکردنی منداڵەکانیاندا بەزۆری قورئان و فەرموودە تێکەڵ دەکەن، لەگەڵ توێژینەوەی یاساکانی زانستە ئایینیەکان و وتنەوەی هەندێ لە مەسەلەکانی، بەڵام گرنگیدانیان بە قورئان و لەبەرکردنی بە منداڵەکان و.. هەڵوێستەکردن لەسەر جیاوازی گێڕانەوەو خوێندنەوەکانی زۆرترە، بایەخدانیشیان بە جواننووسی شوێنکەوتەی ئەو ڕێبازەیە.

٣- خەڵکی ئەندەلوس: ڕێبازیان فێرکردنی قورئان و نووسینەوەیە بەو جۆرەی کە هەیە، و ئەمەش لە فێرکردندا ڕەچاو دەکەن، بۆیە تەنها بەفێرکردنی قورئان وازناهێنن، بەڵکو لەفێرکردنی منداڵەکانیاندا گێڕانەوەی شیعر و نامەناردن و وەرگرتنی یاسا عەرەبیەکان و باشکردنی جواننووسی تێکەڵ دەکەن، وە بایەخی تایبەتی بە فێرکردنی قورئان نادەن جیا لەوانی تر، بەڵکو بایەخدانیان بە جواننووسی لەهەموویان زیاترە.

٤- خەڵکی ڕۆژهەڵات: ئەمانیش بەهەمان شێوە لەفێرکردندا تێکەڵی دەکەن.

گەر لە واقیعی ئێستامان رامێنین کە تێیدا دەگوزەرێنین دەبینین -خواش چاکتر دەزانێ- هیچی تێدا نیە گەر فێربوونی قورئان و زانستەکانی دیکە پێکەوە بێت، چونکە زاکیرەی عەقڵ بەهەموو زانستەکان پێوەند دەکرێت، ئەوەش یارمەتی دەدات لەسەر کرانەوەو وردبوونەو تێگەیشتن، ئەمەش بۆ ئەو قوتابیەیە کە زانستی دیکەی دەوێت، بەڵام قوتابی زانستە شەرعییەکان یەکەمین شت کە دەست بە لەبەرکردنی بکات قورئانی پیرۆزە تا بێتە خۆراك پێدەری ڕۆح و عەقڵ و ڕۆشن کردنەوەی چاوی ـ خواش چاکتر دەزانێ-.

## بنچینەی پێنجەمی بیروباوەڕ - پەروەردەکردن لەسەر دامەزراوی بیروباوەڕ و قوربانیدان لە پێناویدا:

بیروباوەڕ بە قوربانیدان بەرز و پتەو دەبێت هەتا بازنەی قوربانیدانیش فراوانتر بێت دەروون لەسەر دامەزراوی بەهێزتر دەبێت، ئەمەش مانای راستگۆیی دەگەیەنێت، و کە ئەویش چاوگەی راوەستاوی و دامەزراوی راستەقینەیە.

منداڵی موسڵمانیش ئەمڕۆ بۆ بەرەنگاربوونەوەی هەڕەشە زۆرەکانی سەردەم و نەخشە و پلانەکان و توێژینەوەکان لەدژی رێك دەخرێت تا لە ئایینی خوای گەورەو بەرنامەکەی لاڕێ بکات، پێویستی بە قوربانیدان هەیە لە رێی خواو دامەزراوی لەسەر پەیڕەوو بەرنامەکەی، ئا لەو کاتەدا شیرینی باوەڕ تام دەکات، و پلەی هێزی باوەڕ لە دەروونیدا بەرز دەبێتەوە.

لە قورئان و ژیاننامەی پێغەمبەری خواﷺ بە قوربانیدانی بڕواداران ئاشنا دەبێت، با قوربانیدانەکە قوربانیدانی گیانی خۆی بێت لە رێی خوادا، جا ئەم قوربانیدانە لە قورئان و ژیاننامەی پێغەمبەری خواﷺ فێر دەبێت. ئەو چیرۆکانەی کە پێغەمبەرﷺ گێراویەتەوە بۆ منداڵان دەربارەی منداڵێتی بڕواداران و قوربانیدانیان لەپێناوی ئایینی خوادا پێشەنگ و پێشەوایە بۆ منداڵێ موسڵمانی ئەمڕۆ، و ئەوەی کە منداڵانی هاوەڵان پێی هەستاون پێشەنگە کە لەسەر رێگای باوەڕ دەڕوات و لەبەر خوا لەلۆمەی لۆمەکاران ناترسێت.

### ١- کوڕەکەی هاوەڵانی چاڵەکە (الاخدود) پێشەنگە بۆ منداڵان:

(مسلم) لە (صهیب)ەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:

بەر لەئێوە پادشایەك هەبوو، جادوگەرێکی هەبوو، کە پیر بوو بە پادشای وت: ئەوا من پیر بووم، کوڕێکی منداڵم بۆ بنێرە تا جادووی فێر بکەم، پادشاش کوڕێکی بۆ نارد تا فێری بکات، لە رێگای چوونی بۆ لای جادوگەرەکە راهیبێك هەبوو، لەلای دانیشت و گوێی لە قسەکانی بوو و بەدڵی بوو، لەوەودوا هەرچەند بچوایە بۆ لای جادوگەرەکە بەلای راهیبەکەدا تێدەپەڕی و لەلای دادەنیشت، کە دەچووە لای جادوگەرەکە لێی دەدا، سکاڵای ئەمەی بۆ راهیبەکە کرد، ئەویش وتی: ئەگەر لە جادوگەرەکە ترسایت بڵێ کەس و کارەکەم دوایان خستم، و ئەگەر لە ماڵەوە ترسایت بڵێ جادوگەرەکە دوایخستم، کە ئەو لەم حاڵەدا بوو

رۆژێك گەیشت بە ئاژەڵێکی گەورە[1] کە رێگەی خەڵکی گرتبوو، وتی: ئەمڕۆ دەزانم کە جادوگەرەکە باشترە یان راهیبەکە، جا بەردێکی هەڵگرت و وتی: خوایە ئەگەر کاری راهیبەکەت پێباشترە لە کاری جادوگەرەکە ئەوا ئەم ئاژەڵە بکوژە تا خەڵك تێپەڕن، بەردەکەی تێگرت و کوشتی و خەڵکەکە رۆیشتن،[2] چووە لای راهیبەکەو ئەمەی بۆ گێڕایەوە، ئەویش پێی وت: کوڕەکەم! ئەمڕۆ تۆ لەمن چاکتریت، ئەوەتا گەیشتویتە ئەم پایە، وە تۆ تاقی دەکرێیتەوەو تووشی دەردەسەری دەبیت، ئەگەر تووشی دەردەسەری بووی راستی مەڵێ و منیان نیشان مەدە.

کوڕەکە وای لێهات کوێر(ئەوەی بەکوێری لەدایك بووبێ) و بەڵەك (ئەوەی پەڵەی سپی بە جەستەوەیەتی)ی چاك دەکردەوە، و گشت دەردێکی چارەسەر دەکرد، هاودەمێکی پادشا هەبوو کوێر بووبوو، ئەوەی بیست، بە دیارییەکی زۆرەوە هات بۆ لای‌و وتی: ئەگەر چاکم بکەیتەوەو شیفام بدەیت هەرچی لێرەیە بۆ تۆ بێت، ئەویش دەڵێت: من کەس چاك ناکەمەوە، بەڵکو تەنها خوا چارەسەر دەکات و شیفا دەدات، ئەگەر باوەڕ بێنیت بە خوای گەورە ئەوا لەخوا دەپاڕێمەوە کە شیفات بدات، ئەویش باوەڕی هێنا بەخوای گەورەو خوای گەورەش شیفای دا، پاشان وەکو جاران چووەوە کۆڕ و مەجلیسی پادشا و دانیشت، پادشا وتی: کێ چاوتی چاك کردەوە؟ وتی: پەروەردگارم، وتی: بۆ تۆ جگە لەمن پەروەردگاری ترت هەیە؟ وتی: پەروەردگاری من و تۆ (الله)یە، پادشا پیاوەکەی گرت و ئازار و ئەشکەنجەی‌دا هەتا کوڕەکەی نیشان دا، کوڕەکەیان هێنا و پادشا پێی وت: ئەی کوڕم! جادوەکەت وای لێهاتووە کە کوێر و بەڵەك چاك بکەیتەوە و ئاوا بکەیت و ئاوا بکەیت؟ کوڕەکەش وتی: من چاکی ناکەمەوە، بەڵکو خوای گەورە چاکی دەکاتەوە، گرتیان و ئازار و ئەشکەنجەیان دا هەتا راهیبەکەی پێ نیشان دان، راهیبەکەیان هێناو پێیان وت: لە ئایینەکەت پەشیمان بەرەوە، رازی نەبوو، جا مشاریان هێناو لەسەر تەوقی سەری دایاننا و کردیان بە دوو لەتەوە هەتا هەردوو کەرتەکانی کەوتن بەملاو بەولادا، ئینجا هاودەمەکەی پادشایان هێنا و پێیان وت: لە ئایینەکەت پەشیمان بەرەوە، رازی نەبوو، جا مشاریان هێناو لەسەر تەوقی سەری دایاننا و کردیان بە دوو لەتەوە هەتا هەردوو کەرتەکانی کەوتن بەملاو بەولادا، ئینجا کوڕەکەیان هێنا و پێیان وت: لە ئایینەکەت پەشیمان بەرەوە،

[1] لە گێڕانەوەی (عبدالرزق)دا: شێر بوو
[2] لەگێڕانەوەی (عبدالرزاق)دا: خەڵکەکە وتیان: ئەو منداڵە زانستێکی زانیوە کەس نەیزانیوە

رازی نەبوو، جا دایە دەست چەند کەسێك و پێی وتن: بیبەن بۆ چیایەکی ئاوا و ئاوا، لە چیایەکە سەری خەن، کە گەیشتنە لوتکە ئەگەر پاشگەز نەبۆوە لەوێوە فڕێی بدەنە خوارەوە، بردیان و بە چیایەکدا بەسەریان خست، کوڕەکە وتی: خوایە بەوەی ویستت لەسەرە ئەمانەم لەکۆڵ کەرەوە، ئیدی چیایەکە لەرزی و کەوتن، کوڕەکەش بە ڕۆیشتن هاتەوە بۆ لای پادشا، پادشا پێی وت: هاوەڵەکانت کوان و لەکوێن؟ وتی: خوای گەورە لەکۆڵمی کردنەوە، دیسان دایە دەست تاقمێکی تر لە دەست و پێوەندەکەی وتی: بە بەلەم بیبەن تا دەیگەیەننە ناوەڕاستی دەریا، ئەگەر پاشگەز نەبۆوە هەڵی بدەنە ناو دەریاوە، بردیان و کوڕەکەش وتی: خوایە بەوەی ویستت لەسەرە ئەمانەم لەکۆڵ کەرەوە، ئیدی بەلەمەکە وەرگەڕا و هەموویان نوقم بوون و کوڕەکەش بە ڕۆیشتن هاتەوە بۆ لای پادشا، پادشا پێی وت: هاوەڵەکانت کوان و لەکوێن؟ وتی: خوای گەورە لەکۆڵمی کردنەوە، ئینجا بە پادشای وت: تۆ ناتوانی بمکوژیت هەتا بەم شێوەیە نەکەیت: خەڵك لە گۆڕەپانێکدا کۆ بکەرەوەو من بە قەدی دارێکەوە ببەستەوەو تیرێك لە تیردانەکەم دەربهێنەو لەناو کەوانەکەدا دایبنێ و بڵێ بە ناوی خوای پەروەردگاری ئەو منداڵە، پاشان تیرەکەم تێبگرە، ئەگەر ئەمە بکەیت دەمکوژیت، ئەویش خەڵکی لە گۆڕەپانێکدا کۆکردەوەو کوڕەکەی لە قەدی دارێك بەستەوەو تیرێکی لە تیردانی کوڕەکە دەرهێنا و لەناو کەوانەکەی دانا، ئینجا وتی: بەناوی خوا پەروەردگاری ئەو منداڵە، و تیرەکەی تێگرت و بە بناگوێی کەوت، ئەویش دەستی لە سەر بناگوێی لەشوێنی برینەکە دانا و مرد، خەڵکەکە وتیان: بڕوامان هێنا بە پەروەردگاری ئەم منداڵە، چوونە لای پادشا و پێیان وت: بەخوا ئەوەی تۆ لێی دەترسای روویدا، ئەوا خەڵکەکە بڕوایان هێنا، پادشاش فەرمانی دەرکرد کە لەسەر ڕێگاکان چاڵیان هەڵکەند و ئاگریان تێدا کردەوە، پادشاش وتی: ئەوەی لە ئایینەکەی پەشیمان نەبێتەوە بیخەنە ناو ئەم ئاگرانەوە، یان پێی وترا: خۆت بخەرە ئاگرەکەوە، ئاوایان کرد، هەتا سەرە هاتە سەر ئافرەتێك کوڕێکی ساوای پێبوو، ئافرەتەکە خۆی دواخست لە کەوتنە ناو ئاگرەکە، منداڵەکە پێی وت: دایەگیان! ئارام بگرە، تۆ لەسەر حەقی.[1]

---

[1] شێخی پایەبەرز (عبدالعزیز عیون السود) شێخی قورئان خوێنان، کاتێك ئەم لێکۆڵینەوەیەم خستە بەردەستی تا سەیری بکات، لەسەر هەڵوێستی ئەم دایکە ئەم پاراوێزەی دانا (پێشخستنی فەرمانی خوا بەسەر بەزەیی هاتنەوە بە منداڵدا).

لەگێڕانەوەی (عبدالرزاق)دا دەفەرمووێت:[١] ئەوەیە فەرمایشتی خوای گـەورە: ﴿ قُتِلَ أَصْحَٰبُ ٱلْأُخْدُودِ ﴿٤﴾ ٱلنَّارِ ذَاتِ ٱلْوَقُودِ ﴾البروج/٤-٨.

دەفەرمووێت: بەڵام منداڵەکە نێژرا.

دەڵێ: باس دەکەن کە لەسەردەمی (عمر کوڕی خطاب)دا منداڵەکە دەرکەوتووەو پەنجەکانی هەر لەسەر بناگوێی بووە، هەروەك دواساتەکانی ژیانی.

## ٢- چەند نمونەیەك لە قوربانیدان و جیهادی منداڵانی هاوەڵان و پێشینانی چاك:

أ/ دایکان هانی منداڵەکانیان دەدەن لەسەر تێکۆشان و جیهاد:

(ابن ابوشیبه) لە (الشعبی)ەوە دەگێڕێتەوە: ئافرەتێك لە رۆژی غەزای (احد)دا شمشێرێکی دایە دەست کوڕەکەی، بەڵام نەیتوانی هەڵیگرێت، بۆیـە بـە قایـشێکی درێـژ بـە باسـکیەوە بەست، ئینجا هێنای بۆ لای پێغەمبەرﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەمە کوڕمە، کـاری پێ بسپێرە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: کوڕم ئەمە لێرە هەڵگرە، ئەی کوڕم ئەمە لێرە هـەڵگرە، جا برینداربوو، هێنایان بۆ خزمەت پێغەمبەرﷺ، فەرمووی: کـوڕم! وابـزانم ترسـایت؟ وتـی: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا.

ب/ دایکان خۆشحاڵ دەبن بە شەهیدبونی منداڵەکانیان:

(احمد) و (بخاری) لە (انس)ەوەﷺ هێناویانە کە (حارثة کـوڕی ربیـع) منـداڵ بـوو لـە رۆژی (بدر) هات بۆ سەیرکردن، تیرێك بەر خوار قوڕگی کەوت و شەهیدی کرد، (ربیع)ی دایکی هات و وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ! تۆ دەزانی پایەو خۆشەویستی (حارثـة) لای من چەند بووە، ئەگەر لە ئەهلی بەهەشتە ئەوا ئارام دەگرم، ئەگینا خوا دەزانێ کە چـی دەکـەم، فـەرمووی: ((یـا ام حارثة! إنها لیست بجنة واحدة، ولکنها جنات کثیرة، وإنه في الفردوس الأعلـى)).[٢] واتـە: (ئەی دایکی (حارثـة)! تەنها یەك بەهەشت نیە، بەڵکو چەندین بەهەشت هەیە، و کوڕەکەشـت لە فیردەوسی باڵایە).

ج/ منداڵان تاغوتانی دوژمنی پێغەمبەری خواﷺ دەکوژن:

---

[١] قال حبیب الرحمن الأعظمي معلقاً على مصنف عبدالرزاق وأخرجه الترمذي وأحمد ومسلم.
[٢] ورواه سعد وابن خزیمة والطبراني: أنظر صحیح الجامع رقم ٧٨٥٣.

لە (عبدالرحمن کوڕی عوف) دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: لەرۆژی بەدردا لەجەنگدا بووم، تەماشای راست و چەپی خۆم کرد لەنێوان دوو کوڕی تازەپێگەیشتووی ئەنصاریدام، خۆزگەم دەخواست لەنێوان پەراسووەکانی ئەواندابوایەم، یەکێکیان چاوی لێ کردم و وتی: مامە! (ابوجهل) دەناسیت؟ دەڵێ: وتم: کوڕی برام! بۆ چیتە؟ وتی: بیستوومە جوێنی بە پێغەمبەری خواﷺ داوە، سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر بیبینم لێی جودانابمەوە هەتا نەمرێت، دەڵێ: سەرم سوورما، ئەویدیکەش سەیرێکی کردم و وەك ئەوی وتەوە، زۆری نەبرد (ابوجهل)م دی لەناو خەڵکەکەدا دێت و دەچێت، پێم وتن: نابینن؟ ئا ئەوەیە کە ئێوە پرسیاری لەبارەوە دەکەن، پەلاماریان داو بەشمشێرەکانیان لێیان دا هەتا کوشتیان، ئینجا رۆیشتن بۆ لای پێغەمبەرﷺ و هەواڵی ئەوەیان پێدا، فەرمووی: کامتان کوشتتان؟ هەریەکێکیان دەیوت: من کوشتم، فەرمووی: شمشێرەکانتان سڕیوەتەوە؟ وتیان: نەخێر، جا سەیری هەردوو شمشێرەکەی کرد و فەرمووی: هەردووکتان کوشتوتانە، تالانیەکەیشی دا بە (معاذ کوڕی عمرو کوڕی جموح) و ئەویتریش ناوی (معاذ کوری عفراء) بوو.[١]

د/ منداڵان دەگریان و خۆیان دەشاردەوە تا بۆ جیهاد دەربچن:

(ابن عساکر) لە (سعد کوڕی ابووقاص)ەوەﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خواﷺ لە دەرچوونەکەی بۆ (بدر) (عمیر کوڕی ابووقاص)ی گێڕایەوە و بەبچووکی دانا، (عمیر) گریا، پێغەمبەریش رێگەی پێدا.. (سعد) دەڵێت: هەڵگری شمشێرەکەیم بۆ گرێدا، بەشداری (بدر)م کرد و لەو کاتەدا تەنها یەك تاڵە موو لە دەموچاوم هەبوو دەستم پێدا دەهێنا.[٢]

هەروەها (ابن سعد) لە (سعد) دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: لەرۆژی (بدر) پێش ئەوەی پێغەمبەرﷺ بەناوماندا بگەڕێ، (عمیر کوڕی ابووقاص)ی برام دیت خۆی دەشاردەوە، پێم وت: برام ئەوە چیتە؟ وتی: دەترسم کە پێغەمبەری خواﷺ ببینێ و بە بچووکم بزانێ و بمگێڕێتەوە، لەکاتێکدا کە منیش حەز دەکەم دەربچم، بەڵکو خوا شەهیدبوونم پێببەخشێت، (سعد) دەڵێت: لەبەر بچووکی قایشی شمشێرەکەیم بۆ گرێدەدا، کاتێ کوژرا تەمەنی شانزەساڵ بوو.[٣]

---

[١] رواه البخاري ومسلم وأبو يعلى في مسنده ٢/١٧٠ بسند صحيح.

[٢] كتر العمال ٥/٢٧٠ والحاكم ٣/٨٨.

[٣] الإصابة ١٣٥.

(حاکم)یش لە (زید کوڕی حارثة)ەوەﷺ گێڕاویەتیەوە[1] کە پێغەمبەری خواﷺ لەرۆژی (احد)دا چەند کەسێکی بە بچووك دانا، لەوانە (زید کوڕی حارثة) -واتە خۆی-، و (براء کوڕی عازب)، و (زید کوڕی ارقم) و (سعد) و (ابوسعید الخدری)، و (عبدالله کوڕی عمر) و باسی (جابر کوڕی عبدالله)ی کرد.

ه/ منداڵان داوادەکەن کە بۆ جیهاد ساز و ئامادە بکرێن:

(مسلم) و (ابوداود) لە (انس)ەوەﷺ هێناویانە کە کوڕێك لە (اسلم) وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ! من دەمەوێت بچمە غەزاو هیچ شتێکم پێ‌نیە تا خۆمی پێ چەکدار و ساز و ئامادە بکەم؟ فەرمووی: بڕۆ لای فلان، ئەو خۆی ئامادەو ساز کردبوو، بەڵام نەخۆش کەوت، چوو بۆ لای و پێی وت: پێغەمبەری خواﷺ سەلامت لێ دەکات و دەفەرمووێ ئەوەی خۆتت پی ساز و ئامادە کردبوو بمدەرێ، وتی: ئافرەت! ئەوەی خۆمم پێ ساز و ئامادەکردبوو بیدەرێ و هیچی لێ گل نەدەیتەوە، سوێند بەخوا هەرچی لێ گل دەیتەوە خوا فەڕ و بەرەکەت ناخاتە ناویەوە.

لە (سمرە کوڕی جندب)یشەوە دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: پێغەمبەرﷺ بەسەر ئێمەی ئەنصارییەکاندا دەگەڕاو ئەوەی پێ‌گەیشتبوایە دەری دەهێنا، ساڵێکیان منیش لەناو ئەوانەدا بووم کە بەسەریاندا دەگەڕا، جا کوڕێکی دەرهێنا و منی ڕەت کردەوە، وتم: ئەی پێغەمبەری خواﷺ! ئەوت دەرهێنا و منیشت ڕەت کردەوە، ئەگەر زۆرانبازی لەگەڵ بکەم دەیبەزێنم، دەڵێ: زۆرانبازیم لەگەڵ کرد و بەزاندم، پاشان منیشی دەرهێنا.[2]

و/ باوکان منداڵەکانیان لەگەڵ خۆیان دەبرد بۆ جەنگ:

(بخاری) لە (عروە کوڕی زبیر)ەوە هێناویەتی و دەڵێت: (زبیر) سێ شوێنی لێدراوی هەبوو، یەکێکیان لەسەر شانی بوو، منیش کە منداڵ بووم پەنجەم لەناوی دەگێڕا و یاریم پێ‌دەکرد، لە رۆژی (یرموك)دا هاوەڵانی پێغەمبەری خواﷺ وتیان: هەڵمەت نابەیت تا ئێمەش لەگەڵتدا هەڵمەت بەرین؟ وتی: ئەگەر پەلامار بدەم ئێوە درۆ دەکەن، وتیان: مەیکە، ئەویش هەڵمەتی بردە سەریان هەتا ریزەکانیانی شەق کرد و لێیان تێپەڕی و کەسی لەگەڵدا نەبوو، پاشان بەرەورووویان گەڕایەوە و جڵەوی ولاخەکەی گرتبوو، دوو لێدانیان لەسەر شانی دا، لەنێوانیاندا لێدانێك هەبوو لە رۆژی (بدر) پێی کەوتبوو، (عروە) دەڵێ: لە رۆژی یەرموکدا (عبدالله کوڕی

---

[1] رواه حاکم في مستدركه (٢/٥٩) وقال صحيح الأسناد واقره الذهبي.

[2] قال الحاکم صحيح الأسناد.أنظر عقود الجواهر المنيفة ٢/٩٧.

زبیر)ی لەگەڵدابوو کە تەمەنی دەساڵان بوو، خستیە سەر پشتی ئەسپێك و پیاوێکی پێ ڕاسپارد.

(ابن جریر)یش[١] لە (عبدالله کوڕی زبیر) دەگێڕێتەوەو دەڵێت: لەڕۆژی (خندق)دا من و (عمر کوڕی ابو سلمه) لە کۆشکێکی بەرزی مەدینە بووین، ئەو خۆی دادەنەواندەوەو منی بەرز دەکردەوەو سەیری جەنگەکەم دەکرد، و منیش خۆم دادەنەواندەوەو ئەوم بەرز دەکردەوە و سەیری جەنگەکەی دەکرد. باوکم بینی بەناو ئەو لیتاوەدا هاتوچۆی دەکرد و هەرجارەی بەسەر کۆمەڵێکیدا دەدا، پێم وت: باوکە! تۆم بینی لە ناو لیتاودا هەرجارەی دەچوویە سەر کۆمەڵێك، وتی: ئەمڕۆ پێغەمبەری خواﷺ دایك و باوکی خۆی بۆم کۆکردەوە.[٢]

لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا هاتووە: وتی کوڕم تۆ منت بینی؟ وتی: بەڵێ، وتی: لەوکاتەدا پێغەمبەری خواﷺ دایك و باوکی بۆ باوکت کۆدەکردەوەو دەیفەرموو: ((**أحمل فداك أبي وأمي**)) هەڵمەت بەرە، دایك و باوکم بەقوربانت بن.

بەم شێوە تێکۆشان و جیهادە هاوەڵان منداڵانی خۆیان پەروەردە کردووە، و تەمبەڵیو خۆدان بە زەوییان نەناسیوە، بەڵکو هەموو جۆرە شێوازێکیان بەکاردەهێنا تا پێغەمبەرﷺ بە منداڵیان دانەنێ و بیانگێڕێتەوە، جاری وا هەبوو دەگریان، جاری دیکەش هەبووە خۆیان پەنا دەداو جاری کەش لەسەر نوکی پەنجە دەوەستان تا گەورە دیار بن، هەموو ئەوانە بۆ ئەوە بوو تا بڕۆن بۆ جیهادکردن لەپێناوی خوادا، و بڕوانامەی ڕۆژی دوایی بەدەست بهێنن، کە هەرگیز هیچ بڕوانامەیەکی دونیا پێی ناگات، و ئەوانە ئایندەیەکی گەشی پڕ ڕێزی نەمر و هەمیشەییان بنیاتنا لەو بەهەشتەدا کە فراوانیەکەی هێندەی ئاسمانەکان و زەوی یە.

پەروەردگارا! لە گوناه و زیادەڕەویەکانمان ببوورە و پێمان جێگیر کە و بەسەر هۆزی بێباوەڕاندا سەرمان بخە.

---

[١] رواه ابن جرير في تهذيب الآثار (٩٤/١) بسنده.

[٢] رواه ابن جرير في تهذيب الآثار ٩٤/١ بسنده، والبخاري فضائل باب ١٣ ومسلم ١٨٨٠/٤ ومسند احمد ١٦٤/١ مع اختلاف في اللفظ وأنظر طبقات ابن سعد ١٠٦/٣ والبداية ١٠٧/٤، ورواه ابويعلى في مسنده ٣٥/٢ بسند صحيح.

# دەروازەی دووەم

# بنیاتنانی پەرستش

دەستپێك

بنچینەی یەکەم: نوێژکردن

١ــ قۆناغی فەرمان بەنوێژکردن

٢ ــ قۆناغی نوێژفێرکردنی منداڵ

٣ــ قۆناغی فەرمان بەنوێژکردن و لێدان لەسەر نەکردنی.

٤ ــ مەشق پێکردنی منداڵان لەسەر ئامادەبوونی نوێژی بەکۆمەڵ.

٥ــ نمونەیەك دەربارەی شەونوێژ بۆ منداڵان.

٦ــ راهێنانی منداڵ لەسەر نوێژی ئیستخارە.

٧ــ هێنانی منداڵ بۆ نوێژی جەژن.

بنچینەی دووەم: منداڵ و مزگەوت:

١ــ بردنی منداڵ بۆ مزگەوت.

٢ــ پەیوەست کردنی منداڵ بە مزگەوتەوە.

بنچینەی سێیەم: رۆژوو گرتن.

بنچینەی چوارەم: حەج کردن.

بنچینەی پێنجەم: زەکات دان.

## خوای گەورە دەفەرمووێ:

﴿وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلَوٰةِ وَاصْطَبِرْ عَلَيْهَا ۖ لَا نَسْأَلُكَ رِزْقًا ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُكَ ۗ وَالْعَٰقِبَةُ لِلتَّقْوَىٰ﴾طه/١٣٢واتە: (فەرمان بدە بەهەموو تاکەکانی خێزانت تا نوێژەکانیان بکەن و بەردەوام بن و کۆڵنەدەرو خۆڕاگر بە لەسەری، ئێمە داوای رزق و رۆزی لە تۆ ناکەین، بەڵکو ئێمە رزق و رۆزی بەتۆ دەبەخشین، سەرەنجام هەر بۆ خواناسی و پارێزکارییە.

## دەستپێك:

بنیاتنانی پەرستش بەتەواوکاری بنیاتنانی بیروباوەڕ دەژمێردرێت، چونکە پەرستش رۆحی بیروباوەڕ تێردەکات، هەروەها دەرخەرێکە کە شێوەی بیروباوەڕ بەرجەستە دەکات و دەیخاتە روو، منداڵیش کاتێك دەچێت بەدەم بانگەوازی خوای گەورەوە، و وەڵامی فەرمانەکانی دەداتەوە، ئەوا بەو هۆیەوە ئەو لە دەروونیا وەڵامی غەریزەیەکی سروشتی خۆی دەداتەوە و تێری دەکات و ئاودێری دەکات.

لەم بارەیەوە (د. سعید رمضان البوطی) ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە: بۆ ئەوەی چاندنی بیروباوەڕ لەدەروونذا بەهێز بێت دەبێت پەرستش بەهەموو جۆر و شێوەکانی ئاودرابێت، بەو جۆرە بیروباوەڕە لەدڵدا گەشە دەکات و پەل و پۆ لێدەدات و خۆڕاگردەبێت بەرامبەر گێژەڵوکەی ژیان و شڵەژانی.[١]

منداڵێتیش قۆناغی ئەرکباری نیە، بەڵکو قۆناغی ئامادەکردن و مەشق و راهێنانە بۆ گەیشتن بە قۆناغی ئەرکباری لەکاتی باڵغ بووندا، تا بەجێهێنانی ئەرك و فەرزەکانی لا ئاسان بێت، و بۆ ئەوەی لەوپەڕی ئامادەباشیدا بێت بۆ چوونە ناو ناخۆشیەکانی ژیان بەوپەڕی متمانەو ئازاد بوونەوە، پەرستشی خوای گەورەش کارێکی سەرسوورهێنەر و مەزن دەکاتە سەر دەروونی منداڵ، بەهۆی ئەوەوەیە کە هەست بە پەیوەندی خۆی دەکات بە خوای گەورەو بەرز و بێهاوتاوە، هەر ئەویشە هەڵچوونەکانی ناخی هێوردەکاتەوە، و بەهۆی ئەویشەوەیە هەڵچوونەکانی تورەیی لغاو دەکات و جڵەوی دەگرێ، و دەیکاتە کەسێکی راست و دروست، چونکە چڕی ئارەزووەکانی لەو ماوەیەدا کەمە، بەو هۆیەشەوە وای لێدێت کە گیانی زیاتر وەڵام بداتەوەو بێت بە پیرییەوە، بە موناجات لەگەڵ خوادا، و ملکەچبوون پانتاییەکی فراوان لە جەستەی دەگرێت لەکاتێکدا کە ئایەتێك دەخوێنێتەوە یان گوێی لێ دەبێت، یاخود کاتێ کە راوەستاوەو نوێژدەکات یان لە کڕنوشدایە یان گوێی لە بانگی بەربانگ کردنەوەیە تا دەست بە خواردن و خواردنەوە بکات پاش ئەوەی کە ئەو رۆژە بەرۆژوو بووە، پەرستشیش نهێنی زۆری تێدایە کە لەژماردن نایەت و کاردەکاتە سەر منداڵ و بەهۆیەوە هێز و چالاکی زیاد دەکات، هەر ئەمەشە وایکردوە لە پەروەردەکانی دیکە چاکتر و بەرزتر بێت.

---

١ تجربة التربية الإسلامية – د. سعید رمضان البوطي – ص٤٠

پێغەمبەری خواﷺ مژدەی زۆر گەورەی دەدایە ئەو منداڵانەی کە لەسەر خواپەرستی پەروەردە بوون، لەم بارەیەشەوە (طبرانی) لە (ابوامامە)ەوەﷺ گێڕاویەتەوە کە دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ دەفەرمووێت: ((**ما من ناشئ ينشأ في العبادة حتى يدركه الموت، الاّ أعطاه الله أجر تسعة وتسعين صديقاً**)). واتە: (هەر منداڵێك لەخواپەرستیدا پەروەردە بێت و بەردەوام بێت تا مردن، خوای گەورە پاداشتی نەوەد و نۆ چاکەکاری راستگۆی دەداتەوە).

هەروەها (ابن عبدالبر) لە (التمهيد)دا بە سەنەدی خۆی دەگێڕێتەوە کە (عمر کوڕی خطاب)ﷺ فەرموویەتی: منداڵ چاکەکانی بۆ دەنووسرێت و خراپەکانی لەسەر نانووسرێت.[١]

لە رێنمایی یەکانی پێغەمبەرداﷺ تێبینی ئەوە دەکەین کە جەختی لەسەر پێنج پایە کردووە کە ئەمانەیە:

## بنچینەی یەکەمی پەرستش - نوێژکردن:

ئەمەش بە چەند قۆناغێکدا تێپەڕ دەبێت:

**١ـ قۆناغی فەرمان بەنوێژکردن:** باوك و دایك دەست دەکەن بە فەرمانکردن بە منداڵەکەیان کە لە نوێژدا لەگەڵیان بوەستێت، ئەمەش لە سەرەتای هۆشکردنەوەی منداڵدا کە راست و چەپی خۆی لێك جیابکاتەوە، هەروەك (طبرانی) لە (عبدالله کوڕی حبیب)ەوە گێڕاویەتەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((**اذا عرف الغلام يمينه من شماله فمروه بالصلاة**)) واتە: (ئەگەر منداڵ راست و چەپی خۆی زانی و لێکی جوداکردنەوە، فەرمانی پێبکەن نوێژ بکات).

(ابوداود)یش لە (معاذ کوڕی عبدالله کوڕی حبیب الجهنی)ەوە هێناویەتی کە (هشام کوڕی سعد) گێڕاویەتەوەو دەڵێت: چووینە لای، بەخێزانەکەی وت: کەی منداڵ نوێژ دەکات؟ وتی: بەڵێ، پیاوێك لە ئێمە دەیگێڕایەوە لە پێغەمبەری خواوەﷺ کە پرسیاری لەو بارەوە لێ کراوە، فەرموویەتی: ((**اذا عرف يمينه من شماله فمروه بالصلاة**))[٢]. واتە: (ئەگەر راست و چەپی خۆی زانی و لێکی جوداکردنەوە، فەرمانی پێبکەن نوێژ بکات).

---

١ فتح العلي المالك في الفتوى على مذهب الإمام مالك لأبن فرحون المالكي -١/٨٨.
٢ ضعيف، أنظر ضعيف الجامع رقم ٦٠٣ للألباني.

**٢- قۆناغی نوێژ فێرکردن:** دایك و باوك لەم قۆناغەدا دەست دەکەن بە فێرکردنی پایەکانی نوێژ و پێویستیەکانیو ئەوشتانەی کە نوێژ بەتاڵ دەکەنەوە بە منداڵەکەیان، پێغەمبەرﷺ لەم رووەوە تەمەنی حەوت ساڵی دیاری کردووە وەك سەرەتای قۆناغی فێرکردن:

(ابوداود) لە (سبرە کوڕی معبد الجهنی) دەگێڕێتەوە کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((**مروا الصبي بالصلاة اذا بلغ سبع سنين، فإذا بلغ عشر سنين فاضربوه عليها**)). واتە: (لە حەوت ساڵیدا منداڵەکانتان فێری نوێژ بکەن، کە گەیشتنە دە ساڵی لەسەر نوێژنەکردن لێیان بدەن).

لە گێڕانەوەی (ترمذی)شدا هاتووە کە وتویەتی: ((**علموا الصبي الصلاة ابن سبع سنين وأضربوه عليها ابن عشر**))[1] واتە: (منداڵی حەوت ساڵیدا فێری نوێژ بکەن و لە دەساڵیشدا لەسەر نوێژنەکردن لێیان بدەن).

لە گێڕانەوەی (احمد)یشدا (٣/٤٠٤) بەم شێوەیە هاتووە: ((**إذا بلغ الغلام سبع سنين أمر بالصلاة، فإذا بلغ عشراً ضرب عليها**)). واتە: (کە منداڵ گەیشتە تەمەنی حەوت ساڵی فەرمانی پێدەکرێت نوێژ بکات، کە گەیشتە دەساڵیەوە لەسەر نەکردنی لێی دەدرێت).

لەگێڕانەوەی (دار القطنی)شدا (١/٢٣٠) بەم جۆرەیە: ((**مروا صبيانكم بالصلاة لسبع، وأضربوهم عليها لعشر**)). واتە: (لە حەوت ساڵان نوێژ بە منداڵەکانتان بکەن و لە دەساڵیش لەسەر نوێژنەکردن لێیان بدەن).

پێغەمبەری خواﷺ خۆی راستەوخۆ منداڵانی فێری ئەو شتانە دەکرد کە لەنوێژدا پێویستیان پێی بووە:

(ابوداود) و (ترمذی) و (نسائی) لە (حسن کوڕی علی) هێناویانە کە دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ هەندێ وشەی فێرکردم کە لە نوێژی (ویتر)دا بیڵێم: ((**اللهم اهدني فيمن هديت، وعافني فيمن عافيت، وتولني فيمن توليت، وبارك لي فيما أعطيت، وقني شرّ ما قضيت، فإنك تقضي ولا يقضى عليك، وإنه لا يذل من واليت، تباركت ربنا وتعاليت**)).[2] واتە:

---

١ ابوداود برقم ٤٩٤ والترمذي برقم ٤٠٧ واسناده حسن. انظر جامع الأصول ٥/١٨٧ ت.الأرناؤوط. ورواه البيهقي في سننه ٣/٨٤ ورواه الحاكم في مستدركه ١/٢٥٨ وقال صحيح على شرط مسلم ورواه ابن خزيمة في صحيحه ٢/١٠٢.

٢ ورواه ابن خزيمة في صحيحه ٢/١٥٢ قال المحقق مصطفى الأعظمي اسناده صحيح ورواه احمد

(خوایە رێڕوونیم بکە لەگەڵ ئەوانەدا کە رێڕوونیت کردوون، وە سەلامەت و بێبەڵام بکە لەگەڵ ئەوانەدا کە سەلامەتت کردوون، مشورم لێ بخۆ و سەرپەرشتیم بکە لەگەڵ ئەوانەدا کە مشورت لێ خواردوون، پیت و پیێزم بۆ بخە ناو ئەوەوە کە پێت بەخشیوم، لە زیان و خراپەی ئەوەی کە بڕیارت داوە بمپارێزە، چونکە هەرتۆ بڕیاردەدەی و بڕیارت بەسەردا نادرێ، بێگومان هەرکەسێك تۆ پشتی بگری زەبوون نابێ، هەرکەسێك تۆ دژایەتی بکەی زاڵ نابێ، هەرتۆی پایەدار و بەرز ئەی پەروەردگارمان).

پێغەمبەرﷺ هەڵەکانیشی بۆ راست دەکردنەوە:

(ترمذی) لە (ام سلمە)وە م دەگێڕێتەوە کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ منداڵێکی ئێمەی بینی کە پێیان دەوت (أفلح)، ئەم منداڵە لەکاتی کڕنوش بردندا فوی دەکرد، پێغەمبەرﷺ پێی فەرموو: ((**یا أفلح! ترّب وجهك**))[1] واتە: ئەی (افلح) دەم و چاوت بەخۆڵ کە (مەبەستی ئەوەبوو کە کڕنوشەکەی بەتەواوی ببات و دەموچاوی باش دانێتە سەر زەوی).

فێری بانگدانیشی دەکردن:

(ابومحذورة) دەڵێت: کۆمەڵە گەنجێك بووین لەگەڵ پێغەمبەرﷺ دەرچووین، لەوکاتەشدا لەهەمووکەس زیاتر رقمان لێی بوو، بانگیان دا، ئێمەش دەستمان کرد بەبانگ دان و گاڵتەمان پێدەکردن، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەو گەنجانەم بۆ بێنن، فەرمووی: بانگ بدەن، منیش یەکێك بووم لەوانە، فەرمووی: بەڵێ ئەوە بوو گوێم لەدەنگی بوو، بڕۆ بۆ خەڵکی مەککە بانگ بدە، جا دەستی بەنێوچەوانیدا هێنا و فەرمووی بڵێ:

(**الله أکبر ألله أکبر، الله أکبر الله أکبر**)

(**أشهد أن لا اله الا الله**) دووجار

(**وأشهد أن محمداً رسول الله**) دووجار

(**حي علی الصلاة، حي علی الصلاة**) دووجار

(**حي علی الفلاح، حي علی الفلاح**) دووجار

(**الله أکبر ألله أکبر، لا اله الا الله**).

---

٢٠٠/١ من طريق شعبة.

١ اسناده ضعيف، انظر جامع الأصول. ت.الأرناؤوط ٥٠١/٥.

وە ئەگەر بانگی یەکەمی بەیانیت دا بڵێ: (**الصلاة خير من النوم، الصلاة خير من النوم**).

وە ئەگەر قامەتت کرد دووجار بڵێ: (**قد قامت الصلاة، قد قامت الصلاة**)، گوێت لێبوو.[١]

دەڵێ: (ابومحذورة) دوای ئەوە قژی ناوچەوانی نەدەبڕی و لای نەدەبرد لەبەرئەوەی پێغەمبەری خواﷺ دەستی پێدا هێنابوو.[٢]

وە پێغەمبەری خواﷺ بەر لە دەست پێکردنی هەموو نوێژێك وتارێکی ئاراستەی منداڵان دەکرد و لەریزی دواوەی ریز دەکردن:

(مسلم) لە (ابن مسعود)ەوەﷺ دەگێڕێتەوە کە دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ لەکاتی ریزبوون بۆ نوێژ دەستی بەسەر شانماندا دەهێنا و دەیفەرموو: ((**استووا؛ ولا تختلفوا؛ فتختلف قلوبكم، ليليني منكم الو الأحلام والنُّهى -هم الرجال البالغون- ثم الذين يلونهم، ثم الذين يلونهم**)). واتە: (ریك بوەستن و، جیاواز مەبن لەگەڵ یەکتری ئەگینا دڵەکانتان لەگەڵ یەکتر ناکۆك دەبێت، با کەسە پێگەیشتووە عاقڵمەندەکان -پیاوە باڵغبووەکان- لە پشتەوەی من نوێژ بکەن، و پاش ئەوان ئەوانەی لەوانەوە نزیکن، دوای ئەوانیش ئەوانەی لەوانەوە نزیکن.

پێغەمبەریشﷺ بانگەوازەکەی ئاراستەی منداڵان دەکات کە لەکاتی نوێژدا ئاوڕ بەلای راست و چەپدا نەدەنەوە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر بایەخدانی بەچۆنیەتی نوێژ فێرکردن بە منداڵ:

(ترمذی) لە (انس)ەوەﷺ هێناویەتی کە دەڵێ: پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((**يا بني.. إياك والألتفات في الصلاة، فإن الألتفات في الصلاة هلكة، فإن كان لابدّ ففي التطوع لا في الفريضة**)).[٣] واتە: (کوڕەکەم.. ئاگاداربە لەئاوڕدانەوە لە نوێژدا، چونکە ئاوڕدانەوە لەنوێژدا تیاچوونە، بەڵام ئەگەر هەر ناچار بووی ئەوا لەنوێژی سوننەتدا نەك لە نوێژی فەرزدا).

---

**١ گێڕانەوەی (ابومحذورة) بە چەند گێڕانەوەیەکی جیاجیا گێڕراوەتەوە، جا ئەوەی کە گونجاوترە بۆ ئاراستەی پەروەردەیی ئەوەمان هەڵبژاردووە، و یاساکانی فیقهی لە پەرتووکەکانی فیقهی ئیسلامی وەردەگیرێت، جا فەرموودەکە رەنگە لە لایەنی فیقهیەوە سڕابێتەوە (منسوخ)، بەڵام لەلایەنی پەروەردەییەوە نەسڕاوەتەوەو (منسوخ) نەبۆتەوە.**

٢ رواه الدارقطني ١/٢٣٥ ورواه احمد ٣/٤٠٨.

٣ رواه الترمذي برقم ٥٨٩ في الصلاة وفيه علي بن زيد بن جدعان ضعيف. أنظر جامع الأصول ٥/٤٩٧. ت.الأرناؤوط. وأنظر شرح السنة ٣/٢٥٣.

هاوەڵانیش لەسەر هەمان پەیڕەوی پێغەمبەرﷺ ڕۆشتوون، خۆیان دەستیان کردووە بە فێرکردنی منداڵەکانیان، ئەوەتا (علی)ﷺ (حسین) بانگ دەکات و فێری چۆنیەتی دەستنوێژ گرتنی دەکات، و وەڵامی پرسیارەکانی دەداتەوە:

(ابوداود) لە (حسین کوڕی علی)ﷺ هێناویەتی کە دەڵێت: (علی)باوکم بانگی کردم کە پێویستی دەستنوێژگرتنی بۆ ببەم، منیش نزیکم کردەوە بۆی، ئەویش سەرەتا سێجار دەستی شۆرد پێش ئەوەی کە دەست بکاتە ناو ئاوەکەوە، پاشان سێجار ئاوی لە دەمی وەرداو سێجاریش ئاوی لە لوتی وەردا، پاشان سێجار دەم و چاوی شۆرد، پاش ئەوە سێجار دەستی ڕاستی تا ئانیشکی و دەستی چەپیشی تا ئانیشکی شۆرد، پاشان یەك جار دەستی تەڕی بەسەریدا هێنا و (مسح)ی کرد، پاش ئەوە سێجار قاچی ڕاستی تا قولەپێی شۆرد و قاچی چەپیشی بەهەمان شێوە، پاشان هەستایەوەو وتی: بیدە دەستم، منیش ئەو دەفرەی ئاوەکەی تێدابوو دامە دەستی، ئەویش لەو ئاوەی کە لە دەستنوێژەکەی مابویەوە بە ڕاوەستانەوە خواردیەوە، منیش سەیرم لێ هات، کە بینیمی وتی: بەلاتەوە سەیر نەبێت، چونکە من پێغەمبەری باوکتمﷺ بینیوە ئاوای کرد کە من کردم، بۆ دەستنوێژگرتنەکەی بەو شێوەیەی وت، و بەرماوەی دەستنوێژەکەی بەپێوە خواردەوە.

بینین و وردبوونەوەی منداڵ لە دەستنوێژگرتنی گەورە کاریگەرییەکی زۆری دەبێت لەسەر فێربوون و جێبەجێکردنی بەشێوەیەکی کرداریی ڕاست و دروست، لەم بارەیەوە (عبدالرزاق) لە(مصنف)[1]ەکەیدا هێناویەتی لە (مالك کوڕی نافع) و دەڵێت: کاتێ منداڵ بووم (صفیە کچی ابو عبید)م بینی دەست نوێژی دەگرت، کاتێ بیویستبایە دەستی تەڕ بەسەریدا بهێنێ و (مسح) بکات سەرپۆشەکەی لادەدا.

ئەمەش (سعد کوڕی ابووقاص)ﷺ منداڵەکانی فێری ئەو نزاو دوعایانە دەکرد کە لە پێغەمبەرەوەﷺ وەرگیراوە، هەروەك (مصعب)ی کوڕی دەیگێڕێتەوەو دەڵێت: (سعد) پێنج نزای فێرکردین کە لە پێغەمبەرەوە هێناویەتی: ((**اللهم إني أعوذ بك من البخل، وأعوذ بك من الجبن، وأعوذ بك أن ارد الى أرذل العمر، وأعوذ بك من فتنة الدنيا، وأعوذ بك من عذاب القبر**))[2]. واتە: (خوایە پەنات پێدەگرم لە چاوچنۆکیو ڕەزیلی، پەنات پێدەگرم لە ترسنۆکی، پەنات پێدەگرم لە گەیشتنە تەمەنی زۆر پیری، و پەنات پێدەگرم لە ئاشوبی دنیا، و پەنات پێدەگرم لە سزای نێوگۆڕ).

---

١ المصنف: ١٨/١.

٢ رواه ابويعلى في مسنده ٧٢/٢ بسند صحيح.

بە ئامۆژگارییەکی هاوەڵی پایەبەرز (عبداللە کوڕی مسعود)ﷺ کە ئاڕاستەی باوکان و دایکانی کردووە کۆتایی بەم قۆناغە دەهێنین، کەهەروەك (طبرانـی) هێناویەتی دەڵێت: ئاگاتان لە نوێژکردنی منداڵەکانتان بێ، و لەسەر چاکە رایان بهێنن چونکە چاکە بە راهاتنە.

## ٣- قۆناغی فەرمان بەنوێژکردن و لێدان لەسەر وازلێهێنانی:

ئەم قۆناغە لە تەمەنی دەساڵیەوە دەست پێدەکات، گەر هاتوو کەمتەرخەمی کرد یاخود سست بوو یان تەمبەڵی کرد لە ئەنجامدانی نوێژەکانیدا، ئا لەو کاتەدا رێگە دراوە بە دایك و باوك کە بۆ تەمبێ کردن لە منداڵەکەیان بدەن لەسەر ئەو کەمتەرخەمیەی بەرامبەر خۆی کردویەتیو لەسەر ئەو ستەمەی کە لەخۆی کردووە بەهۆی شوێن کەوتنی رێگاکانی شەیتان، چونکە پێویست وایە کە لەم قۆناغەدا گوێڕایەڵی فەرمانی خوا بێت لەکاتێکدا کە هێشتا لە قۆناغی فیترەتیدایەو شەیتانیش لەو کاتەدا کاریگەریی لەسەری لاوازە، نوێژنەکردنیش بەڵگەیە لەسەر هێدی هێدی دەست بەسەراگیرانی لەلایەن شەیتانەوە، لەبەر ئەوە پێویستی بە چارەسازی پێغەمبەرانە هەیە کە ئەویش لێدانە،[1] خراپ نیە و هیچی تێدا نیە منداڵ تێبگەیەنرێت کە هۆی چیە لێی دەدرێت و فەرمودەی پێغەمبەری خوایﷺ بۆ بخوێندرێتەوە:

لە(عبداللە کوڕی عمرو کوڕی عاص)ﷺ دەگێڕنەوە کە دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ دەفەرمووێت: ((**مروا أولادكم بالصلاة وهم أبناء سبع، وأضربوهم عليها وهم أبناء عشر، وفرقوا بينهم في المضاجع**)).[2] واتە: (منداڵەکانتان لە حەوتساڵیدا فێری نوێژ بکەن، و لە دەساڵیدا لەسەر نوێژنەکردن لێیان بدەن، و جێگای خەوتنیان لەیەك جیابکەنەوە (با لەژێر یەك نوێندا پێکەوە نەخەون).

شێخ (ولی الله الدهلوی) لە لێکدانەوەی ئەم فەرموودەیەدا دەڵێت:

پێگەیشتنی منداڵ لەدوو رووەوە دەبێت: پێگەیشتنی دەروونی لە چاك و تەواوی نەخۆشیە دەروونیەکان و دروستیی دەروونی. ئەمانەش تەنها بە عەقڵ دەستەبەر دەکرێن، وە نیشانەی دەرکەوتنی عەقڵیش حەوت ساڵیە، هەموو منداڵێکی تەمەن حەوت ساڵە بەئاشکرا لە حاڵەتێکەوە بۆ حاڵەتێکی تر دەچێت، وە نیشانەی تەواوی عەقڵ دەساڵییە، منداڵی دەساڵان ئەگەر میزاجی تەواو بێت عاقڵەو سوود و زیانی خۆی لێك جیادەکاتەوە، و شارەزاو زۆرزان

---

١ لەبەشی پێنجەمدا درێژە بەباسی لێدان دەدرێت.

٢ رواه ابوداود ٤٩٥ و٤٩٦ في الصلاة واسناده حسن. انظر جامع الأصول ١٨٧/٥، ورواه الحاكم.

دەبێت لە بازرگانی و هاوشێوەکانی‌دا، وە گەیشتن بە توانای جیهاد کردن و پاراستنی سنوورە شەرعیەکان و لێپێچانەوە لەسەری و بوون بە یەکێك لەو پیاوانەی کە تووشی ناخۆشی و تەنگوچەڵەمە دێن و لە سیاسەتی شارستانی و سزاداندا حیسابی بۆ دەکرێت، و بەزۆر ناچاردەکرێن کە لەسەر ڕێگای راست بڕۆن، و پشت بەتەواوی عەقڵ دەبەسترێت، ئەمانە ئەوپەڕی لە تەمەنی پازدەساڵیدا دەبێت، و لە نیشانەکانی ئەم باڵغبوونە (ئیحتلام) و دەرهاتنی موی بەر(عانة)یە، نوێژیش دوو گرنگی و بایەخی هەیە: بەو پێیەی کە هۆکارێکە لەنێوان خۆی و خوای گەورەدا، و لەچوونە نێو نزمترین شوێنی دۆزەخ رزگاری دەکات، بۆیە لەکاتی باڵغبوونی یەکەمدا فەرمان بە ئەنجام دانی دەکرێت، وە بەو پێیەی کە دروشمێکە لە دروشمەکانی ئیسلام پێویستە دەستی پێوە بگرن و کاری پێبکەن و ناچاربکرێن لەسەری، ئیدی بیانەوێت یان نەیانەوێت حوکمەکەی وەك هەموو حوکمەکانی دیکەیە، چونکە تەمەنی دەساڵی پەردەیەکە لەنێوان ئەو دوو سنوورەدا و کۆکەرەوەی هەردوولایە بۆیە بەشی لەهەردووکیان تێدایە.[1]

## ٤- راهێنانی منداڵ لەسەر ئامادەبوونی لە نوێژی هەینیدا:

لە (جابر کوڕی عبداللە)وەﷺ دەگێڕنەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: **((من كان يؤمن بالله واليوم الآخر فعليه الجمعة، الاّ مسافراً؛ أو مملوكاً؛ أو صبياً؛ أو إمرأة؛ أو مريضاً، فمن أستغنى عنها بلهو أو تجارة أستغنى الله عنه والله غني حميد)).**[2] واتە: (ئەو کەسەی بڕوای بەخواو ڕۆژی دوایی هەیە، نوێژی هەینی لەسەر پێویستە، جگە لە کەسێك لەسەفەردا بێت یاخود بەندە بێت یان ئافرەت یان منداڵ یا نەخۆش، ئەوەی بەهۆی شتێکی پڕوپوچ یاخود لەبەر بازرگانی وازی لێ هێنا، خواش واز لەو دەهێنێت، خوای گەورە بێ‌پێویست و سوپاسگوزارە).

(ئیمام (الكاسانی)یش لە (البدائع)دا دەربارەی ئەم فەرموودەیە دەڵێت: نوێژی منداڵ وەك سوننەت وەردەگیرێت.

---

١ حجة الله البالغة –للدهلوي ١/١٨٦.

٢ الحديث رواه ابوداود عن طارق بن شهاب، قال: قال رسول اللهﷺ: ((الجمعة حق واجب على كل مسلم في جماعة الاّ على أربعة: عبد مملوك، أو إمرأة، أو صبي، أو مريض)) ورواه الدارقطني ٢/٣. واتە: **نوێژی هەینی حەقێکی واجبە لەسەر هەموان جگە لە چوار چین: بەندەی ژێردەست، یان ئافرەت، یان منداڵ، یان نەخۆش.**

ڕاهێنانی منداڵیش لەسەر نوێژی هەینی کۆمەڵە سوودێکی زۆری لێ بەدەست دەهێنرێ، لەوانە:

۱- کاتێ گەورە دەبێت ڕاهاتووە لەسەر ئەنجام دانی.

۲- کاریگەریی بوون لەسەری بەهۆی گوێگرتن لە وتاری هەینی، چونکە سروشتی پاکی زۆر هەستیارە بۆ وەرگرتنی فەرموودەکانی ئیمان و ژیانی پێغەمبەرﷺ، هەروەها مەشق و ڕاهێنانە بۆی بۆ گوێگرتن لە زانست و زانیاری.

۳- ئولفەت دەگرێت لەگەڵ کۆبوونەوەی موسڵمانان و هەست بە چوونە نێو کۆمەڵگا دەکات، چونکە هەر دەبێت ئاشنایەتی لەگەڵ ئەو کەسانەدا پەیدا بکات کە باوکی دەیانناسێت.

٤- لەسەر ئەو بیروبۆچوونەی کە دەڵێت کاتی گیرابوونی دوعا لە ڕۆژی هەینیدا کاتی وتاردانە، ئەویش لە ئامادەبوانی ئەو کاتی گیرابوونی نزایە دەبێت، کە پێغەمبەرﷺ لەبارەیەوە دواوە.

۵- دەبێتە توێشوویەکی ئیمانی و بووژێنەرەوەیەکی ڕۆحی بۆی لەسەر بەجێهێنانی هەرپێنج نوێژەکەو گوێڕایەڵی خوا لەنێوان هەینیەك بۆ هەینیەکی دیکە.

٦- لەو ڕێیەوە ئاشنایی زانایانی ئوممەت و بانگخوازانی دەبێت، کە ئەوەش کاریگەریی گەورەی دەبێت لەسەری بۆ کاتی گەورەبوونی، وێڕای سوودی بۆ کاتی بچووکی.

۷- بەهۆی نوێژی هەینییەوە بنیاتنانی کەسێتی بۆ دروست دەبێت بەهەموو ڕەگەزەکانیەوە (بیروباوەڕی و پەرستشی و کۆمەڵایەتی و سۆزداری و جەستەیی و تەندروستی و پەروەردەی زایەندی (جنسی) ...) خواش زاناترە.

## ۵- نمونەیەك دەربارەی شەونوێژ بۆ منداڵان:

منداڵانی هاوەڵان تەنها بە ئەنجام دانی پێنج نوێژە فەرزەکە وازیان نەدەهێنا، بەڵکو پەلیان دەهاوێشت بۆ ئەنجامدانی سوننەتی شەونوێژکردن، هەروەك (ابن عباس)ﷺ کردوویەتی:

(بخاری) لە (ابن عباس)ەوەﷺ هێناویەتی کە دەڵێت: شەو لەلای پورم (میمونە کچی حارث)ی خێزانی پێغەمبەرﷺ مامەوە، ئەو شەوە پێغەمبەرﷺ لەلای ئەوبوو، نوێژی عیشای کرد پاشان هاتەوە بۆ ماڵ و چوار ڕکعات نوێژی کرد و ئینجا نووست، پاشان لەخەو هەستا، و فەرمووی: ((نام غليم)) کوڕیژگەکە نووست؟ یان وشەیەکی هاوشێوەی وت، ئینجا هەستا بۆ

نوێژ، منیش هەستام و لەلای چەپیەوە راوەستام، ئەویش خستمیە لای راستیەوە، و پێنج رکعاتی کرد، و پاشان دوو رکعاتی کرد، ئینجا نووست، هەتا گوێم لە پرخەپرخی بوو، ئیدی هەستا و چوو بۆ نوێژ.

لەگێڕانەوەی (ابن خزیمە) لە (صحیح)ەکەیدا (١٧/٣) لە (ابن عباس)ەوە کە دەڵێ: شەو لەماڵی (میمونە)ی پورم مامەوە، چاودێریم دەکرد کە پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن نوێژ دەکات، ئینجا هەستا بۆ نوێژ، منیش هەستام و چوومە تەنیشتیەوە، لەلای چەپیەوە وەستابوم، بردمی و لەلای راستیەوە وەستاندمی.[١]

سەیری ئەو منداڵێتیە بکە کە گرنگی دەدات بە چۆنیەتی جوڵانەوەی پێغەمبەری خۆشەویستﷺ و پاش خەوتن لە شەودا نوێژی لەگەڵدا دەکات، پاشان ئەو گرنگییەی کە پێغەمبەرﷺ داویەتی بۆ نوێژکردنی منداڵی بچووك لەپاڵ خۆیدا و هەڵەکانی بۆ راست دەکاتەوە و دەیخاتە لای شانی راستی، بەڵکو رەفتاری ئەو لەگەڵ گەورەو بچووك، و پیاوو ژندا، هەر بەو شێوەیە بووە، و خۆشی دەخستە نێو ماڵی موسڵمانانەوە، لەم بارەیەوە ئیمام (احمد) لە (أنس)ەوەﷺ هێناویەتی کە ئەوو پێغەمبەری خواﷺ و دایکی و پوری پێکەوە بوون، پێغەمبەری خواﷺ نوێژی پێ‌کردن، (أنس)ی لە لای راستیەوە دانا و دایکی و پوریشی خستە پشتی ئەوەوە.[٢]

لەو چیرۆکە نایاب و خۆشانەی کە مرۆڤ لە ئاستیدا سەرسام دەبێت بەهۆی هۆشیاری خاوەنەکەیان، ئەم گفتوگۆیەی نێوان (ابو یزید طیفور کوڕی عیسی البسطامی)یە کاتی منداڵی لەگەڵ باوکیدا نمونەیەکە لەو بارەیەوە:

شێخ (ابن ظفر المکی)[٣] دەڵێت: بیستم کە (ابو یزید طیفور کوڕی عیسی البسطامی) کاتێ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُزَّمِّلُ ۝١ قُمِ ٱلَّيۡلَ إِلَّا قَلِيلٗا﴾ی لەبەر کرد، بەباوکی وت: باوکە! ئەوە کێیە کە خوای گەورە وای پێ دەفەرموێت؟ وتی: کوڕم! ئەوە پێغەمبەر محمدەﷺ، ئەمجا وتی: ئەی باوکە! تۆش بۆ وەك پێغەمبەرﷺ ناکەیت؟ وتی: کوڕم! هەستانی شەونوێژ تایبەتکرابوو بەو و لەسەر ئوممەتەکەی فەرز نەکراوە. جا لێی بێ‌دەنگ بوو، کاتێك گەیشتە ئەو ئایەتەی کە

---

١ قال المحقق مصطفى الأعظمي: ورواه مسلم من طريق بندار.

٢ رواه الشافعي في مسنده.

٣ في كتابه أنباء نجباء الأبناء ص١٥٠.

دەفـــەرموویت:﴿إِنَّ رَبَّكَ يَعْلَمُ أَنَّكَ تَقُومُ أَدْنَىٰ مِن ثُلُثَيِ ٱلَّيْلِ وَنِصْفَهُۥ وَثُلُثَهُۥ وَطَآئِفَةٌ مِّنَ ٱلَّذِينَ مَعَكَ﴾، وتی: باوکە! من دەبیستم کە کۆمەڵێك هەبوون شەونوێژیان دەکرد، ئەو کۆمەڵە کێبوون؟ وتی: کوڕم! ئەوانە هاوەڵان بوون ﷺ، وتی: باوکەگیان! چ خێر و چاکەیەك لەوەدایە کە واز لەو کـارە بێنی کە پێغەمبەرﷺ و هاوەڵانی کردوویانە؟! وتی: راست دەکەی کوڕم.. دەڵێت: پاش ئـەوە باوکی شەوان هەڵدەستاوەو نوێژی دەکرد.. شەوێکیان (ابو یزید) خەبـەری بـۆوە بینـی بـاوکی نوێژ دەکات، وتی: باوکەگیان! فێرم کە چۆن خۆم پاك بکەمەوەو نوێژت لەگەڵدا بکەم؟ بـاوکی وتی: کوڕم! بنو، تۆ هێشتا منداڵی، وتی: باوکی خۆشەویـستم! کـە ئـەو رۆژە هـات خـەڵکی دەستە دەستە بەرەو گۆڕەپانی لێپرسینەوە دەچوون کاروکردەوەی خۆیان ببینن، ئا لـەو کاتـەدا بە پەروەردگارم دەڵێم کە من وتم بەباوکم کە چۆن خۆم پاك بکەمەوەو نوێژت لەگەڵـدا بکـەم، ئەو رازی نەبوو و وتی تۆ هێشتا بچووکی، ئایا ئەمەت پێخۆشە؟

باوکی وتی: نە بەخوا کوڕم! هەرگیز ئەوەم پێخۆش نیە، ئـەویش فێـری کـرد و لەوەبـەدوا لەگەڵیدا نوێژی دەکرد.

## ٦- راهێنانی منداڵ لەسەر نوێژی ئیستخارە:

(ابن السنی)[1] دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویـەتی: ((**یا أنس! إذا هممـت بأمر فاستخر ربك فيه سبع مرات، ثم أنظر الى الذي يسبق الى قلبك فإن الخير فيه**)). واتە: (ئەی (انس)! ئەگەر ویستت کارێك بکەیت، ئەوا حەوت جار نوێژی ئیستخارەی بۆ بکە، پاشان بڕوانەو بزانە چی لە دڵتدایە، خێر لەوەیاندایە).

## ۷- هێنانی منداڵ بۆ نوێژی جەژن:

لە (عبداللە کوڕی عمر)ەوەم دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خواﷺ هەردوو جەژنەکە لـە گـەڵ (فـضل کوڕی عباس)و (عبداللە کوڕی عباس)و (عباس)و (علی)و (جعفر)و (حسن)و (حسین)و (اسامە کوڕی زیـد)و (زیـد کـوڕی حارثـة)و (ایـمن کـوڕی ام ایـمن)داﷺ دەچـوویە دەرەوە، و بەدەنگی بەرز (لاالە الا اللە و اللە اکبر)ی دەکرد، و بەگوزەری ئاسنگەراندا دەچوو تا دەگەشتە شوێنی نوێژکردن، پاش تـەواوکردنی نوێـژیش بـە رێگـەی (پێڵاودروەکـان)دا دەگەڕایـەوە تـا دەگەیشتەوە ماڵ.[2]

---

١ رقم ٦٠٣ كتاب عمل اليوم والليلة لأبن السني.

٢ رواه ابن خزيمة في صحيحه ٣٤٣/٢ قال المحقق مصطفى الأعظمي اسناد ضعيف.

## بنچینەی دووەمی پەرستش - منداڵ و مزگەوت:

### ١- بردنی منداڵ بۆ مزگەوت:

مزگەوت ئەو کۆشك و تەلارەیە کە نەوە لەدوای نەوە پێدەگەیەنێت، لە کۆنەوەو تا ئێستاش چاوگەی ئەو نەوانە بووە کە گیانی خۆی بەخشیوە بەخواو لەسەر بەرنامەو پەیڕەوەکەی رۆشتوون، و شوێنکەوتەی پێغەمبەرەکەیان بوون، لەبەر ئەمەشە کە منداڵانی هاوەڵان گرنگی و بایەخیان داوە بە نوێژکردن لەگەڵ پێغەمبەری خوا لە مزگەوتدا، ئەوەتا (جابر کوڕی سمرە) ﷺ دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا نوێژی یەکەم (واتە نیوەڕۆ)م کرد، پاش ئەوە چوویە دەرەوە بۆ لای خاوخێزانی، منیش لەگەڵیدا چوومە دەرێ، منداڵان هاتن بە پیرییەوە، پێغەمبەریش ﷺ یەك یەك دەستی بە رومەتیاندا دەهێنا، (جابر) دەڵێت: بەڵام کە دەستی هێنا بە رومەتمدا هەستم کرد دەستی سارد و بۆنخۆشە وەکو ئەوەی لەهەگبەی گوڵاوفرۆش دەریهێنابێت.

لەم رووەوە لەکاتێکدا منداڵ دەبردرێت بۆ مزگەوت کە بتوانێت خۆی بچێتە سەر ئاوو خۆی پاکژ بکاتەوەو میز و پیسایی نەکاتە ژێر خۆی، بەڵکو خۆی بچێتە سەر ئاو و پێشتریش چۆنیەتی هەڵس و کەوتکردنی ناو مزگەوتی فێر کرابێت لە بەهێمنی چوونەژوورەو پێڵاودانان لەشوێنی دیاریکراودا، و رێکوپێك هەنگاو بنێت لەکاتی رۆشتندا و لەنێو مزگەوتدا رانەکات و خۆ دوور بگرێت لە نۆرەبڕینی گەورەکان، و وریاو بێدار بێت لەکانی وتار و وانە و نوێژەکاندا و خۆی بێهودەو بێئاگا نەکات...هتد.

لەم روەوە پرسیار لە ئیمام (مالك) کرا دەربارەی پیاوێك کە منداڵێکی خۆی لەگەڵ خۆیدا بهێنێ بۆ مزگەوت، ئایا ئەوەت پێ خۆشە؟ فەرمووی: ئەگەر گەیشتبێتە رادەی (ئەدەب و رێزگرتن) و بیزانێ و جوڵەجوڵی زۆر نەکات، بە خراپی نازانم، بەڵام گەر منداڵ بێت و تیایدا ئارام نەگرێت و جوڵەجوڵی زۆر بکات ئەوەم پێ خۆش نیە.[١]

پێغەمبەری خواش ﷺ داوای لە ئیمامی مزگەوتەکان کردووە کە نوێژیان سووك و کورت بکەنەوە لەبەر خاتری منداڵان، کە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر جائیزبوونی نوێژی منداڵان و بردنیان بۆ مزگەوت.

---

١ انظر التربية في الإسلام تحقيق د.احمد الأهواني ـص٢٨٢.

(بخاري) و (مسلم) لە (عقبە کوڕی عمرو البدري)ەوە ﷺ هێناویەتی کە دەڵێت: پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەرﷺ وتی: من لە نوێژی بەیانیان دوادەکەوم بەهۆی فلانەوە چونکە نوێژەکەی درێژ دەکاتەوە، جا دەڵێ هەرگیز پێغەمبەرمﷺ نەدیوە لە ئامۆژگاری کردندا بەو شێوەیە تورە بێت، کە لەو جارەدا تورە بوو، وە فەرمووی: ((**يأأيها الناس! إن منكم منفرون، فأيكم أمّ الناس فليوجز فإن من ورائه الكبير والصغير وذا الحاجة.**)). واتە: (ئەی خەڵکینە! ئێوە تیاتاندا هەیە خەڵك دەتەکێننەوە، هەر یەکێك لە ئێوە پێشنوێژی بۆ خەڵك کرد با کورتی بکاتەوە، چونکە لەدوایەوە پیر و منداڵ و خاوەن ئیش و کار هەیە).

بەهۆی ئامادەبوونی منداڵیشەوە بۆ نوێژ کردن لە مزگەوت بەشداری موسڵمانان دەکات لە لەبەرکردنی ژمارەی رکاتەکان:

لە (ابراهيم کوڕی سويد)ەوە دەگێڕنەوە کە دەڵێت: (علقمە) نوێژی نیوەڕۆی پێکردین و پێنج رکعاتی کرد، کاتێ سەلامی دایەوە خەڵکەکە پێیان وت: ئەی (ابوشبل) پێنج رکعاتت کرد، وتی: نەخێر، وانەبوو، وتیان: بەڵێ وات کرد، دەڵێت: منیش لەو کاتەدا منداڵ بووم و لەلای خەڵکەکەوە بووم، وتم: تۆ پێنج رکعاتت کرد، پێی وتم: کوێرە! تۆش وا دەڵێیت؟ وتم: بەڵێ، جا دانەویەوەو دوو کڕنووشی برد و پاشان سەلامی دایەوە، ئینجا (عبدالله) وتی: جارێکیان پێغەمبەری خواﷺ پێنج رکعات نوێژی پێ‌کردین، کاتێ لای کردەوە خەڵکەکە مقۆمقۆیان بوو، فەرمووی: ئەوە چیتانە؟ وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! ئایا نوێژ زیادی تیاکراوە؟ فەرمووی: نەخێر، وتیان: تۆ پێنج رکعاتت کرد، روی وەرگێرا و دوو کڕنووشی برد و پاشان سەلامی دایەوە، و فەرمووی: ((**إنما أنا بشر أنسى كما تنسون**)).[1] واتە: (منیش مرۆڤم، شتم لەبیر دەچێ هەروەك چۆن ئێوە لەبیرتان دەچێتەوە).

## بەڵام چۆن منداڵان لەگەڵ پیاواندا ریز بکەین بۆ نوێژی جەماعەت؟

لە (عبدالله کوڕی غنم) ئەویش لە (ابومالك الاشعري)یەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خواﷺ یەکسانی پێکدەهێنا لەنێوان چوار رکعاتەکەدا لە قورئان خوێندن و راوەستاندا، و رکعاتی یەکەمی لەهەموویان زیاتر درێژە پێدەدا تاوەکو خەڵکی پێی بگەن، و پیاوەکانی دەخستە پێشەوە، و منداڵەکانیش لە دوای ئەوان، و ئافرەتانیش لەپاش منداڵەکانەوە.[2]

---

١ رواه ابن خزيمة في صحيحه ١٣٣/٢ قال المحقق ومصطفى الأعظمي ورواه مسلم.

٢ رواه احمد.

(ابوداود)یش هەر لەوەوە دەگێڕێتەوە کە دەڵێت: ئایا باسی نوێژی پێغەمبەرتانﷺ بۆ نەکەم؟ نوێژەکەی دادەمەزراند، پیاوەکانی ریز دەکرد، پاش ئەوان منداڵەکان، ئینجا نوێژی پێدەکردن، پاشان باسی نوێژەکەی کرد.

لە (انس)ەوە ﷺ دەگێڕنەوە کە دەڵێت: پێغەمبەرﷺ لەماڵی ئێمە نوێژی کرد، من و منداڵێکی هەتیوو لەدوایەوە نوێژمان کرد، و دایکم و (ام سليم)یش لەدوای ئێمەوە.[1]

لە(عبدالله کوڕی مسعود)ەوەﷺ دەگێڕنەوە کە دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ دەفەرمووێت:((**ليليني منكم اولو الأحلام والنهى ثم الذين يلونهم ثم الذين يلونهم ولا تختلفوا فتختلف قلوبكم وإياكم وهيشات الأسواق**)).[2] واتە: با خاوەن عەقڵ و باڵغەکان لە پشت من نوێژ بکەن، ئینجا دوای ئەوان با ئەوانە کە لە سیفەتدا لەوان نزیکن، دوای ئەوانیش ئەوانەی سیفەتیان لەوان نزیکە، ریزەکان رێك بکەن و جیامەبنەوە تا دڵەکانتان جیا نەبێت، ئاگاداری فیتنەی بازاڕەکان بن.

لە(ابن عباس) م دەگێڕنەوە کە دەڵێت: نوێژم لە تەنیشت پێغەمبەرەوە کرد و (عائیشە)مان لەگەڵدا بوو و لەدواوە وەستابوو، منیش شان بەشانی پێغەمبەرﷺ لەگەڵیدا نوێژم دەکرد.[3]

## ٢- پەیوەست کردنی منداڵ بە مزگەوتەوە:

دید و تێڕوانینی[4] بەستنەوەی منداڵ بە مزگەوتەوە تێڕوانینێکی راست و دروستە، و هیچ هاوتایەکی نیە بە مەبەستی دەربازکردنی ئەو خونچە تازە پێگەیشتوانە لە خراپ بوون و گەندەڵی.

بۆ پەیوەست کردنی بە مێژووەوە باسی تونس و بەشەکانی تری باکووری ئەفریقیا دەکەین کە تووشی بەڵای بیرۆکەی فەرمانڕەوایی بوو وە خاوەنەکەی داوای خوایەتی دەکرد، گەر بۆیان

---

١ رواه البخاري؛ ورواه ابن خزيمة في صحيحه ٣/١٩.

٢ رواه الحاكم في مستدركه ٢/٨ وقال صحيح على شرط الشيخين و لم يخرجه البخاري وأقره الذهبي، ورواه ابن خزيمة في صحيحه ٣/٣٢.

٣ رواه ابن خزيمة في صحيحه ٣/٦٧ بسند حسن.

٤ من كلمة (الشيخ محمد الشاذلي) في مؤتمر رسالة المسجد بمكة ١٣٩٥هـ/١٩٧٥م عن كتاب (مؤتمر بحوث رسالة المسجد) ص٤٤٦.

بلوایە ئەوا وڵاتی ئیسلام دەبوو بە وێرانە، خوای گەورە بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەم بەڵایە پشتیوانی لە پەروەردەکاری چاك (محرز کوڕی خلف الصدیقی) کرد کە لەساڵی ٤١٣ کۆچی دوایی کردووە، ئەم پەروەردەکارە هەستا بە فێرکردنی منداڵان لە هەندێ لە مزگەوتەکاندا، وەك فێرکردنی ئەو فێرکەرانە نا کە ئامانجیان چاکسازی نەبوو، بەڵکو فێرکردنی پەروەردەکارێکی چاك کە بە تێڕوانینێکی قوڵەوە لێیان دەڕوانێ و هیچ مەرامێکی نیە تەنها پێگەیاندنی منداڵ بە پێگەیشتنێکی ئیسلامی نەبێ، هەروەك (ابو عبدالله محمد کوڕی ابو زید القیروانی) لەنامە بەناوبانگەکەیدا (رسالة ابن ابي زید القیروانی١/٢٣) ئاماژەی بەم مانایە کردووە کە خۆشەویست کردنی ئیسلامە لە دڵی منداڵاندا، کە خوای گەورە بەم کتێبە سوودێکی گشتی و تەواوی بە ئیسلام گەیاند، لە سەرەتاکەیدا دەڵێ:

پاشان خوا یارمەتی ئێمەو ئێوەش بدات بۆ چاودێری‌کردنی ئەو سپاردانەی بۆی ناردووین کە یاساو شەریعەتەکانیەتی، تۆ داوات لێ کردم کە رستەیەکی کورتت بۆ بنووسم دەربارەی ئەرکی دینداری لەوانەی زمان دەریدەبڕێت و دڵ بڕوای پێیەتی، و جەستە کاری پێ‌دەکات، وە هەرچی پەیوەستی بە ئەرکەوە هەبێت، چونکە ئارەزوو دەکەم ئەوانە فێری منداڵان بکەم هەروەك چۆن پیتەکانی قورئانیان فێر دەکرێت، تا ئایینی خواو شەریعەتەکانی بگاتە دڵیان بەڵکو فەڕ و بەرەکەتەکەیان پێ بگات و ئەنجامەکەی چاك بێت، منیش بەدەمتەوە هاتم بەهۆی ئەو خێر و پاداشتەی بۆ خۆم و خۆتی دەخوازم لە فێرکردنی ئایینی خواو بانگەوازکردن بۆی.

بزانە کە چاکترین دڵ و بەئاگاترینیان بۆ چاکە و ئەوەی زیاتر ئومێدی چاکەی لێ دەکرێت، ئەو دڵەیە کە هێشتا خراپەی پێ نەگەیشتووە، وە ئەو دڵانەی کە یەکەم جار ئامۆژگاریکاران گرنگیان پێداوە و ئەوانەی پاداشتیان دەوێت هەوڵیان بۆداوە گەیاندنی چاکەیە بۆ دڵی منداڵانی بڕواداران تاکو تیایدا رەگ دابکوتێ و ئاگاداریان بکاتەوە لە دروشمەکانی ئایینداری و سنووری شەریعەت، بۆ ئەوەی کە پێی رازی بن، وە ئەگەر زانیمان کە فێرکردنی منداڵ (لەمزگەوت) رێگە پێدراوە ئەگەر کرێی لەسەر وەرنەگرێت، هەروەکو (شیخ انور کشمیری) دەڵێت[١] ، ئەوا دەڵێین ئەو مزگەوتەی منداڵانی هاوەڵان و پێشینانی چاکی لێوە دەرچووە، دەتوانێ هاووێنەی ئەوان دەربهێنێت ئەگەر باوکان و دایکان رووی منداڵەکانیان بکەنە مزگەوت بە ئارەزووی خۆی نەك بە زۆرەملێ، بە خۆشەویست کردن نەك بە ناشیرین کردن، بە هاندان نەك بە ناچار کردن.

---

١ فیض الباري علی شرح صحیح البخاري ١/٢٣٠.

هەروا ئەگەر گەورەکان ڕۆڵی خۆیان لەمزگەوتدا بزانن بەرامبەر ئەو منداڵانەی دێن بۆ مزگەوت، کە ئەرکیان بریتیە لە ئامۆژگاری جوان و پەندی چاك و نەرم و نیانی و ئامێز بۆکردنەوەو خۆ بەکەم زانی، و بەجۆرێك بن کە منداڵەکان هەست بە سۆز و بەزەیی بکەن تاکو دوبارە بێتەوە بۆ سەردانی مزگەوت و نوێژی تێدا بکات و ئامادەی وانەکان بێت، چەندین کەسانی بەتەمەنمان بینی کە خەڵکیان دەتەکاندەوەو بوونە هۆی لارێبوونی زۆر لە منداڵان بەهۆی هات وهاوار و دەرکردنیان لە مزگەوتەکان، و ئەمەش لە بەڵاکانی ئوممەتە، پێویستە ئیمامی مزگەوتەکان ئامۆژگاری ئەوانە بکەنەوەو بەئاگایان بهێننەوە.

## بنچینەی سێیەمی بیروباوەڕ - ڕۆژووگرتن:

پەرستشی ڕۆژوو ڕۆحی و جەستەییە، منداڵ لێوەی فێری دڵسۆزی ڕاستەقینە بۆ خوای گەورە و چاودێریی لە پەنهاندا دەبێت، هەروەها ویستی منداڵ پەروەردە دەکات بە دوورکەوتنەوە لە خواردن با برسیشی بێت و بە دوورکەوتنەوە لە ئاو با تینووشی بێت. هەروەك توانای جڵەوگرتنی ئارەزووەکانی دەبێت، و لەسەر ئارام گرتن و خۆڕاگری ڕادێت، هاوەڵان منداڵەکانیان لەسەر پەرستشی ڕۆژووگرتن پەروەردە دەکرد، ئیمام (بخاري) لە (صحيح)ەکەیدا (باب صوم الصبيان)ی داناوەو فەرموودەکەی (عمر)ی هێناوەتەوە کە لەرەمەزاندا بە سەرخۆشێك دەڵێت: واوەیلا بۆ تۆ، کە منداڵەکانمان بەرۆژوون –تۆش بەرۆژوو نیت- جا لێی دا.

(ابن حجر) دەربارەی ئەو فەرموودەیە دەڵێت: کە دەڵێ (باب صيام الصبيان) مەبەستی ئەوەیە کە ئایا دروستە یان نا، هەموو زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە ڕۆژوو لەسەر کەسی باڵغ نەبوو پێویست نیە، کۆمەڵێك لە پێشین، لەوانە (ابن سيرين) و (الزهري) پێیان باشە، و (شافعي)یش دەڵێت ئەگەر توانایان هەبوو ئەوا فەرمانیان پێدەکرێت بۆ ڕاهاتن لەسەری، وە سنوورەکەی وەك نوێژ حەوت ساڵان و دەساڵییە، (اسحاق)یش بە دوازدە ساڵی داناوە، (احمد)یش لەگێڕانەوەیەکیدا بە دەساڵی داناوە، و (اوزاعي) دەڵێ: ئەگەر توانای گرتنی سێ ڕۆژی ڕۆژووی لەسەر یەك هەبوو و بێهێزی نەدەکردن، ئەوا دەبێ بەڕۆژوو بێت، یەکەمیان وتەی زۆربەی زانایانە، لای مالیکیەکانیش وا بەناوبانگە کە لەسەر منداڵان نیە، دانەری کتێبیش –واتە ئیمام بخاري- لە بەدواداچوونەکەیدا نەرمی نواندوە بەوەی کە شوێنەواری (عمر)ی هێناوەتەوە لەبەر ئەوەی ڕەفتاری خەڵکی مەدینە بە پێچەوانەی فەرموودەیەك ئەوپەڕی بەڵگەیە کە پشتی پێ ببەسترێت لە ڕەتکردنەوەی فەرموودەدا، هیچ کردەوەیەك نیە کە پشتی پێ ببەسترێت بەهێزتر

لەو کردەوەیەی لەسەردەمی (عمر)ﷺ کراوە سەرەڕای توندی بەدواداچوون و لێکۆڵینەوەی و زۆری هاوەڵان لەسەردەمی ئەودا، کەچی وەك لۆمەکردن بەو کەسەی وت کە لە رەمەزاندا بەرۆژوو نەبووە: چۆن بەرۆژوو نابێ و منداڵەکانمان بەرۆژوون؟! (ابن الماشجون) کە لە مالکیەکانە شتێکی سەیری هێناوەو دەڵێ: ئەگەر منداڵ توانای رۆژووگرتنیان هەبوو ئەوا لەسەریەتی بیگرێت، خۆ ئەگەر بەبێ هۆی شەرعی شکاندنی ئەوا پێویستە لەسەری بیگرێتەوە.[1]

هەر لە گرنگی پێدانی هاوەڵان بە رۆژووگرتنی منداڵەکانیان، لەکاتی بەرۆژووبوونیاندا یاریان بۆ ساز دەکردن تا بەهۆیەوە سەرگەرم بن و هەست بە درێژی رۆژەکە نەکەن:

(بخاری) و (مسلم) لە (رُبَیِّع کچی مُعَوِّذ) هێناویانە کە وتویەتی: بەیانی رۆژی (عاشوراء) هەواڵی نارد بۆ گوندەکانی دەوروبەری مەدینە کە هەرکەسێك رۆژی کردۆتەوەو بەرۆژوو بووە با رۆژووەکەی تەواو بکات، و هەرکەسێك بەرۆژوو نەبووە با ئەوەی لە رۆژەکە ماوەتەوە بەرۆژوو بێت، ئیتر ئێمەش ئەو رۆژە بەرۆژوو دەبووین، و منداڵە بچووکەکانیشمان بەرۆژوو دەبوون، و دەچووینە مزگەوت و لە خوری یاریمان بۆ دروست دەکردن، ئەگەر یەکێکیان لەبرسا بگریابان دەماندایە دەستی هەتا کاتی بەربانگ کردنەوە دادەهات.

(ابن حجر) لەو بارەیەوە دەڵێ:[2] ئەم فەرموودەیە بەڵگەی رێگە پێدانی راهێنانی منداڵە لەسەر رۆژووگرتن بەوشێوەی باسکرا، چونکە ئەوەی لەو تەمەنەدا بێت کە لە فەرموودەکەدا باسکراوە ئەرکبار(مکلف) نیە، بەڵکو بەمەبەستی راهاتن ئەوەیان بۆ کراوە.

هاوەڵان لەساتی بەربانگ کردنەوەدا منداڵەکانی خۆیان کۆدەکردەوەو لە خوای باڵادەست دەپاڕانەوە بە ئومێدی گیرابوونی لەو چرکەساتە پڕ فەڕ و پیرۆزەدا:

(ابوداود طیالیسی) لە (عبداللە کوڕی عمر)ەوە دەگێڕێتەوە کە دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خواﷺ بوو دەیفەرموو: ((**للصائم عند افطاره دعوة مستجابة**))[3] واتە: (رۆژووەوان لەکاتی بەربانگدا پاڕانەوەکانی گیرایە).

(عبداللە)ش کە بەربانگی دەکردەوە خاوخێزانی و کوڕەکەی کۆدەکردەوەو دەپاڕایەوە.

---

١ فتح الباري في شرح صحيح البخاري ٥/١٠٣.

٢ المصدر السابق ٥/١٠٤-١٠٥.

٣ ورواه البيهقي في شعب الإيمان وهو حديث ضعيف: أنظر ضعيف الجامع رقم ٤٧٥٠/ ت.الألباني.

هیچی تێدا نیە منداڵان لە دە ڕۆژی کۆتایی ڕەمەزاندا لە مزگەوت بمێننەوە (ئیعتکاف بکەن)، وچونکە باڵغ بوون مەرج نیە لە ساغ و دروستی ئیعتکافدا، بۆیە بۆ منداڵی عاقڵ دروستە، چونکە ئەویش لە ئەهلی خواپەرستی یە، هەروەك ڕۆژووی سوننەتی بۆ دروستە، هەروەك (کاسانی) لە (البدائع)دا وتویەتی.[1]

## بنچینەی چوارەمی بیروباوەڕ - حەجکردن:

(ابن حجر) دەڵێت: (ابن بطال) وتویەتی: پێشەوایانی فەتوا یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە فەرز ناکەوێتە سەر منداڵ هەتا باڵغ دەبێت، بەڵام ئەگەر حەجی پێکرا ئەوا بەرای جەماوەری زانایان بۆی بە سوونەت دادەنرێت.[2]

حەجیش هەروەك نوێژ و ڕۆژوو منداڵ لەسەر ئەو پەرستشانە رادەهێنرێت هەتا رابێت لەسەر وابەستەبوون بەخوای گەورەو موناجات کردنی و بەدەمەوەچوونی فەرمانەکانی، و تا ئامادەو ساز بێت بۆ ئەو ئەرکبارییەی چاوەڕوانی دەکات لەکاتی باڵغ بوونیدا، و ئەو کاتە لەسەری زەحمەت و نارەحەت نەبێت، بەڵکو لەلای ئاسایی بێت.

حەجیش -وەك زانراوە- گرانی و زەحمەتیەکانی هەموو پەرستشەکانی تێدا کۆدەبێتەوە سەرەڕای ئەوەی کە چێژی هەمووشیانی تێدا کۆدەبێتەوە، بۆیە گەر منداڵ حەجی کرد ئەوا ئەوە مزگێنیە لەسەر ئەوەی کە لە ئایندەدا ڕێگای گوێڕایەڵی خوای گەورە دەگرێت -إن شاء الله-.

لە (اسامە کوڕی زید)ەوەﷺ کە دەڵێت: لە عەرەفەدا لەدوای پێغەمبەرەوەﷺ بوم.[3]

خۆ ئەگەر منداڵ گەیشتە تەمەنی باڵغ بوون، ئەوا حەجێکی ئیسلامیانەی لەسەرە چونکە حەج لەسەر منداڵ نیە، لەبەر ئەوەی داوای لێ نەکراوە و ئەوەی بەر لەباڵغ بوون ئەنجامی داوە بۆی بە سوننەت دادەنرێت، هەروەك لە پێغەمبەرەوەﷺ دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: ((أيما صبي حج عشر حجج ثم بلغ فعليه حجة الإسلام)).[4] واتە: (هەر منداڵێك ئەگەر دە حەجیشی کردبێت، کە باڵغ بوو حەجێکی ئیسلامی هەر لەسەرە).

---

١ البدائع ٢/٤٤٢٢ وأنظر المستدرك ٤٨١/١.
٢ الفتح ٤٤٢/٤ وأنظر بذل المجهود ٣١٩/٨.
٣ رواه الحاكم في مستدركه ٥٩٧/٣ وسكت عنه.
٤ ١٢٠/٢ بدائع الصنائع للكاساني.

هەروەها (حاکم)یش لە(ابن عباس)ەوەم دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((**إذا حج الصبي فهي له حجة حتى يعقل، وإذا عقل فعليه حجة أخرى**)).[١] واتە: (ئەگەر منداڵ حەجی کرد ئەوا بە حەجێك بۆی دەنووسرێت تا ئەو کاتەی عاقڵ دەبێت، کە عاقڵ بوو حەجێکی دیکەی لەسەرە).

(الخطيب) لە (التأريخ) و (الضياء المقدسی) لە (المختارة) لە (ابن عباس)ەوەم دەگێڕنەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((**أيما صبي حجّ ثم بلغ الحنث فعليه أن يَحُج حجة أخرى**)).[٢] واتە: (هەر منداڵێك حەجی کرد، پاشان گەیشتە باڵغ بوون، ئەوا لەسەریەتی حەجێکی دیکە بکات).

(ابن عدی) لە(الكامل)و (بيهقی) لە (جمع الجوامع)دا لە (جابر)ەوە ﷺ دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((**لو حج صغير حجة كانت عليه حجّةٌ اذا بلغ إن استطاع اليه سبيلاً**))[٣] واتە: (گەر منداڵێك حەجی کرد، کە باڵغ بو لەسەریەتی حەج بکات ئەگەر لەتوانایدا هەبوو).

پێغەمبەریش ﷺ لەکاتی حەجدا بە وتاری پڕ سۆز و کاریگەر منداڵانی ئاگادار دەکردەوەو دەربارەی گرنگی و بایەخی ڕۆژی عەرەفە فێری دەکردن و ڕێنموونی دەکردن، لەکاتێکدا کە ئەوان پەرستشەکانی حەجیان ئەنجام دەدا.

ئیمام (احمد) لە(مسند)ەکەیدا لە (ابن عباس)ەوە م دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرمووی:((**ابن أخي! إن هذا اليوم من مَلَكَ فيه سمعه؛ وبصره؛ ولسانه؛ غفر له، يعني: يوم عرفة**)).[٤] واتە: (ئەی برازاکەم! ئەمڕۆ هەرکەس گوێ و چاوو زمانی خۆی بگرێ و ئاگاداری بکات خوا لێی خۆش دەبێت ـ واتە ڕۆژی عەرەفە-).

١ رواه الحاكم في مستدركه، وقال صحيح على شرط الشيخين ووافقه الذهبي على التصحيح.
٢ كنز العمال ٩٩/٥. حديث صحيح، أنظر صحيح الجامع رقم ٢٧٢٩. ت.الألباني.
٣ الكنز ٤٥/٥.
٤ الكنز ٦٨/٥.

## دیاردەیەکی فیقهی:

۱- ئیمامی (کاسانی) ـ حەنەفی مەزهەب- لە (البدائع)دا دەڵێ:

ئەگەر منداڵ ئیحرامی بەست و بەر لە وەستانی عەرەفە بالغ بوو، ئەگەر لەسەر ئیحرامەکەی رۆیشت ئەوا لای ئێمە دەبێتە حەجێکی سوننەت و لای (شافیعی) ئەگەر کاتی راوەستانی لە عەرەفە بالغ بوو ئەوا دەبێتە حەجێکی ئیسلام، ئەمەش لەسەر ئەو بنەمایەی کە لای ئێمە ئەو کەسەی حەجی ئیسلامی لەسەرە ئەگەر نیەتی سوننەت بهێنێت بەسوننەت دادەنرێت، بەڵام لای شافیعی بە فەرز دادەنرێت.

وە ئەگەر ئیحرامەکەی نوێکردەوەو (لبيك اللهم)ی وت یان نیەتی حەجی ئیسلامی هێنا و لە عەرەفە راوەستا و تەوافی زیارەتی کرد، ئەوا لەبری حەجی ئیسلام بۆی دادەنرێت بەبێ هیچ جیاوازیەك.[1]

۲- ئیمامی (شافعی)یش لە (مناسك الحج)دا دەڵێت:

خوای گەورەو باڵادەست بەهۆی نیعمەتی خۆیەوە پاداشتی خەڵك لەسەر کاروکردەوەیان چەندقات دەداتەوە، و منەت لەسەر ئیمانداران دەکات بەوەی کە نەوەکانیان بەوان دەگەیەنی و کارو کردەوەکانیشیانی بۆ زۆر کردوون، و دەفەرمووێ: ﴿أَلْحَقْنَا بِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَمَآ أَلَتْنَٰهُم مِّنْ عَمَلِهِم مِّن شَيْءٍ﴾الطور/۲۱، لەکاتێکدا منەت بەسەر نەوەکاندا بکات بەوەی بیانخاتە بەهەشتەکەیەوە بەبێ کارو کردەوە، ئەوا ئەو منەتەش لەسەریان دەکات بەوەی کە کاری چاکەیان لە حەجدا بۆ بنووسێت ئەگەریش بەو مانایە لەسەریان نەنووسرابێ.[2]

## ئەو فەرموودانەی دەربارەی حەجی مناڵانی هاوەڵان هاتووە:

لە (ابن عباس)ەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەرﷺ لە (الروحاء)[3] کۆمەڵەسوارێکی بینی، فەرمووی: ئێوە کێن؟ وتیان: موسڵمانین، وتیان: ئەی تۆ کێی؟ فەرمووی: منیش پێغەمبەری خوام، ئافرەتێك منداڵێکی بەرزکردەوەو وتی: ئایا ئەم منداڵە حەجی بۆ هەیە؟ فەرمووی: ((نعم ولك الأجر)) بەڵێ، بۆتۆش پاداشت هەیە.[4]

---

۱ ۲/۱۲۱ البدائع.

۲ أنظر كتاب الأعتقاد للبيهقي ص۷٦.

۳ شوێنێکە لەنزیك مەدینە.

٤ رواه مسلم و مالك وابوداود والنسائي.

لە (سائب کوڕی یزید)ەوە ﷺ دەگێڕنەوە دەڵێ: لە حەجیماڵئاواییدا لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ حەجم پێکرا و تەمەنم حەوت ساڵان بوو.[١]

(نسائی) لە (ابوهریرە)ەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت:((**جهاد الكبير؛ والصغير؛ والضعيف؛ والمرأة: الحج والعمرة**)).واتە: جیهادی پیرو منداڵ و لاواز و ئافرەت: حەج و عومرەیە.

هەروەها (ابن سنی)ش لە (ابن عمر)ەوەش دەگێڕێتەوە کە وتویەتی: کوڕێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و وتی: من دەمەوێت حەج بکەم، پێغەمبەریش ﷺ لەگەڵیدا ڕۆیشت و پێی فەرموو: ((**یا غلام! زودك الله التقوى، ووجهك في الخير وكفاك الهم**)). واتە: (ئەی لاو! خوا پارێزکاری و لەخواترسانت زیاد بکات، و ڕوت بکاتە خێر، و غەم و پەژارەت لەسەر لاببات).

کاتێك کوڕەکە گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، پێی فەرموو: ((**یا غلام! قبل الله حجك، وغفر ذنبك، وأخلف نفقتك**)). واتە: (ئەی کوڕ! خوا حەجەکەت قبوڵ بکات، و لە گوناهت خۆش بێت، و جێی خەرجیە سەرف کراوەکەت بۆ بگرێتەوە).

ئەمەش ئەگەر بەڵگەبێت لەمەڕ شتێك ئەوا گرنگی پێدانی پێغەمبەر ﷺ دەگەینێت بەو پایەی پەرستش بە نیسبەت منداڵانەوە کە لەگەڵیاندا دەڕوات و بۆیان دەپاڕێتەوە لە هاتن و ڕۆیشتندا.

تەنها پرسیاری کۆتایی ماوەتەوە: ئەگەر منداڵ هەڵەی کرد لەکاروباری حەجدا، ئایا کەفارەتی لەسەرە؟

(یحیی کوڕی محمد) دەڵێت: واتای قسەی (ابوحنیفە) لەسەر ئەوەی کە هاوەڵەکانی باسیان کردووە، ئەوا نابێت و هیچ شتێکی (صحیح) نیە کە پەیوەندی هەبێت بە پێویست بوونی کەفارەت لەسەری گەر کاری قەدەغەکراوی ئیحرامی کرد، ئەمەش لە زیاتر نەرم و نیانیە بەرامبەری، بەڵام ئەوەندە هەیە پاداشتی حەجەکەی بۆ نابێت.

---

١ رواه احمد والبخاري والترمذي وصححه.

## بنچینەی پێنجەمی بیروباوەڕ - زەکات:[1]

(ابوداود) لە (عمرو کوڕی شعیب)ەوە -رەحمەتی خوای لێبێ- هێناویەتی، ئەویش لە باوکیەوە، باوکیشی لە باپیریەوە، دەگێڕنەوە کە ئافرەتێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و کیژێکی خۆی پێبوو، کچەکەی دوو بازنگی ئاڵتونی زۆر ئەستووری لەدەستدا بوو (لە ئەندازە بەدەربوون)، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ((**أتعطين زكاة هذا؟**)) ئایا زەکاتی ئەمە دەدەیت؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: ((**أيسرك أن يسوورك الله بهما يوم القيامة سوارين من النار؟**)). واتە: (پێت خۆشە لە رۆژی قیامەتدا خوای گەورە دوو بازنگ لە ئاگر بکاتە دەستت؟)

جا بازنگەکەی داکەند و دایە دەست پێغەمبەر ﷺ و وتی: هەردووکیان بۆ خواو پێغەمبەرەکەی بێت.

### دەربارەی زەکاتی سەرفیترە:

لە (عبدالله کوڕی عمر)ەوەم هێناویانە کە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ زەکاتی سەرفیترەی رەمەزانی واجب کرد (صاع)[2]ێك لە خورما یاخود (صاع)ێك لە جۆ لەسەر هەموو کەسێکی بەندە و ئازاد، منداڵ بێت یان گەورە.[3]

تێبینی ئەوە دەکەین کە ئەم پەرستشە فەرزە نەك سوننەت، ئا لێرەوە سووربوونی ئیسلامان لەسەر مانەوەی سامان و ماڵ بە پاکی و زەکات لێدراوی بۆ دەردەکەوێت: ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا﴾التوبة/١٠٣. واتە: (لە ماڵ و سامانی (ئەو ئیمانداارانە) زەکات وەرگرە، چونکە دەبێتە هۆی خاوێنکردنەوەی دڵ و دەروونیان).

---

١ شافیعیەکان دەڵێن زەکات لەسەر منداڵ فەرزە، حەنەفیەکانیش دەڵێت وتوویانە فەرز نیە. بڕوانە (بداءع الصنائع)٢/٤—٥

٢ صاع: پێوانەیە بەگوێرەی مەزهەبی حەنەفی (٣٦٣٠) گرامە و لە مەزهەبی ئیمام شافیعی دەکاتە (٢٤٢٠ گرام، کە نزیکەی دوو کیلۆو نیوە. —وەرگێڕ—

٣ أخرجه البخاري ومسلم ومالك والنسائي، ورواه الدارقطني عن ابن عباس.

# دەروازەی سێیەم

# بنیاتنانی کۆمەڵایەتی

بوخاری و مسلم لە (انس)ەوە ﷺ هێناویانە: کە (انس) بەلای منداڵاندا تێپەڕی سڵاوی لێ کردن و وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوەهای دەکرد.

**دەستپێك:**

**بنەماکانی بنیاتنانی کۆمەڵایەتی.**

**بنەمای یەکەم: بردنی منداڵ بۆ کۆڕ و دانیشتنی گەورەکان.**

**بنەمای دووەم: ناردنی منداڵ بۆ جێبەجێکردنی پێداویستیەکان.**

**بنەمای سێیەم: راهێنانی منداڵ لەسەر سوننەتی سەلام کردن.**

**بنەمای چوارەم: سەردانی منداڵ لەکاتی نەخۆش کەوتنیدا.**

**بنەمای پێنجەم: منداڵ و هاوڕێگرتن لەنێو منداڵاندا.**

**بنەمای شەشەم: راهێنانی منداڵ لەسەر کڕین و فرۆشتن.**

**بنەمای حەوتەم: ئامادەبوونی منداڵ لە ئاهەنگە شەرعیەکان.**

**بنەمای هەشتەم: شەو مانەوەی منداڵ لای خزمە چاکەکانی.**

**کۆتایی: نمونەیەکی کرداری دەربارەی تێکەڵبوونی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ منداڵاندا.**

## دەستپێك :

مەبەستمان لە بنیاتنانی منداڵ لە رووی کۆمەڵایەتییەوە ئەوەیە کە لەگەڵ ناوەندە کۆمەڵایەتیەکەی بسازێ و بگونجێ، ئیدی لەگەڵ گەورەکاندا بێت یاخود لەگەڵ هاورێکانی و ئەوانەی کە هاوتەمەنی خۆین، و کەسێکی کارامەو چاك بێت، دوورێکی زۆر دوورەپەرێز بێت لە گۆشەگیری و شەرمنیەکی حەزپێنەکراو، و بەئەدەب و رێزەوە شت وەربگرێت و بیداتەوە، بکرێت و بفرۆشێت، و تێکەڵی خەڵك بکات و هەڵس و کەوتیان لەگەڵدا بکات، بە رامان لە فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺ بۆمان دەردەکەوێت کە کارو فرمانی وا هەیە پێغەمبەر تایبەتی کردووە بۆ پێکهێنانی منداڵ لەرووی کۆمەڵایەتیەوە، کە ئەویش بریتیە لە:

## بنەمای یەکەمی کۆمەڵایەتی: بردنی منداڵ بۆ کۆڕ و مەجلیسی گەورەکان :

سەردەمانی پێشوو منداڵان ئامادەی کۆڕ و دانیشتنی پێغەمبەرﷺ دەبوون و باوکانیان لەگەڵ خۆیان دەیانبردن بۆ ئەو کۆڕ و دانیشتنە باش و بێگەردانە، ئەوەتانێ (عمر) کورەکەی لەگەڵ خۆی دێنێ بۆ کۆڕ و دانیشتنی پێغەمبەرﷺ، بوخاری و (مسلم) لە (ابن عمر)م هێناویانە کە دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ دەفەرمووێ: ((أخبروني بشجرة مثلها مثل المسلم تؤتي اكلها كل حين بأذن ربها ولا تحتّ ورقها)). واتە: (دارێکم پێ بڵێن کە وەك موسڵمان وەهابێت، هەموو کاتێك بە ویستی پەروەردگار بەروبومی هەیەو گەڵاکەی هەمیشە سەوزەو ناوەرێ).

منیش دارخورمام هات بە دڵدا، بەڵام پێم خۆش نەبوو قسە بکەم لەبەردەم (ابوبکر) و (عمر)دا، کە ئەوان قسەیان نەکرد، پێغەمبەری خواﷺ: فەرمووی ئەو دارە دارخورمایە..

دەڵێت: کاتێ: هاتینە دەرەوە، وتم: باوکە! دارخورمام هات بە دڵدا، عومەر وتی: ئەی چی وای لێکردی نەیڵێیت؟ ئەگەر تۆ بتوتایە ئەوە لەوەو لەوەم زیاتر پێخۆش بوو، وتم: هیچ شتێك رێگر نەبوو، بەڵام کە بینیم تۆ و (ابوبکر) قسەتان نەکرد، منیش پێم خۆش نەبوو بیڵێم..

لەگێرانەوەیەکی دیکەدا: من بچووکترین کەسی خەڵکەکە بووم بۆیە بێدەنگ بووم.

هەروەها پێغەمبەرﷺ هەڵس و کەوتی لەگەڵ منداڵاندا دەکرد و تێکەڵیان دەبوو، هەروەك (انس) ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ تێکەڵمان دەبوو هەتاوەکو بە برایەکی بچووکی منی دەفەرموو: ئەی (ابو عمیر)، چۆلەکەکەت چی کرد؟(باڵندەیەك بوو یاری پێدەکرد)، رایەخەکەی ژێرمان تەکان و نوێژی لەسەر کرد و ئێمەش لەدوایەوە ریز بوین.[١]

---

١ رواه احمد ٣/١١٩.

لە بردنی منداڵ بۆ کۆڕ و دانیشتنی گەورەکان کەم و کورتی و پێویستیەکان دەردەکەوێت، ئەوجا پەروەردەکار دەتوانێت لەو کاتەدا بەرەو کامڵ بوون ئاراستەی بکات و هانی بدات لەسەر وەڵامدانەوە کاتێك کە پرسیارێك دێتە ئارا، ئەویش پاش مۆڵەت خواستن قسە دەکات ئەمەش بە رێز و سەنگینیەوە، هەر بۆیە قسەیان لەگەڵدا دەکات و عەقڵی گەشە دەکات و دەروونی پەروەردە دەبێت، و ئاشنای قسەی گەورەکان دەبێت، هێواش هێواش بەوەش ساز و ئامادە دەبێت بۆ چوونە نێو کۆمەڵ، بەجۆرە بەهۆی مەشق پێکردنی باوکیەوە وردەوردە گەشە دەکات.. جا ئەوەی دەربارەی کوڕ باسمان کرد لەگەڵ باوکیدا، ئەوا کچیش بەهەمان شێوەیە لەگەڵ دایکیدا.

(لە (ابن عباس)ەوەش دەگێڕنەوە کە دەفەرمووێت: (عمر) لەگەڵ پیاوماقوڵانی بەدردا دەیبردمە ژوورەوە، (عبدالرحمن کوڕی عوف) پێی وت: بۆچی ئەم کوڕە لەگەڵمانا دێنیتە ژوورەوە؟ لەکاتێکدا کە ئێمە منداڵی وەك ئەومان هەیە.

ئەویش وتی: ئەمە لەو کەسانەیە کە شت فێر بوون، رۆژێکیان بانگی کردن و منیشی بانگ کرد، وا دەزانم ئەورۆژە بەس بۆ ئەوە بانگی کردبوون کە توانای منیان نیشان بدا، وتی: چی دەڵێن دەربارەی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: ﴿إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ﴾ هەتا گەیشتە کۆتایی سورەتەکە، هەندێکیان وتیان: خوای گەورە فەرمانمان پێدەکات کە سوپاسی خوا بکەین و داوای لێخۆشبوونی لێ بکەین کاتێ سەرکەوتنی خوا هات و دەرووی لێ کردینەوە، هەندێکی دیکە وتیان: نازانین، و هەندێکیش هیچیان نەوت، وتی پێم: ئەی (ابن عباس) ئایا تۆش وا دەڵێیت؟ وتم: ئەوە ئاکام(ئەجەل)ی پێغەمبەری خوایەﷺ، خوای گەورە پێی راگەیاندووە کە کاتێ خوا سەرکەوتنی خۆی پێبەخشی و لەگەڵ رزگارکردندا و خەڵکی بینی دەهاتن و موسڵمان دەبوون، رزگارکردنەکە رزگارکردنی شاری مەککەیەو ئەوەش نیشانەی ئەجەلی تۆیە، بۆیە ستایشی پەروەردگارت بکەو داوای لێخۆشبوونی لێ بکە، بەراستی خوا زۆر چاوپۆشی دەکات و تۆبەوەرگرە، (عمر)ﷺ وتی: منیش هەر ئەوەندەی تۆی لێ دەزانم.[1]

---

١ رواه ابن سعد وابن جرير وابن المنذر والطبراني وابن مردوية وابو نعيم.

لەگێڕانەوەی (حاكم)یشدا[١] وا هاتووە: موهاجیرەكان بە (عمر كوڕی خطاب)یانﷺ وت: منداڵەكانی ئێمەش بانگ بكە هەروەك (ابن عباس) بانگ دەكەی، وتی: ئەمە منداڵێكی گەورەو پێگەیشتووەو زمانێكی وای هەیە كە وەڵامی پرسیار دەداتەوەو دڵێكی ژیری هەیە.

(ابو جحیفە)ەش ﷺ (كە لە هاوەڵە بچووكەكانە) دەڵێت: لای پێغەمبەرﷺ بووم بە پیاوێكی فەرموو كە لەلای بوو: ((**لا آكل متكئاً**)) بە پاڵكەوتنەوە شت ناخۆم.[٢] ئا بەم جۆرە منداڵی هاوەڵی پێغەمبەرﷺ لە كۆڕی پێغەمبەری خواﷺدا ئامادە دەبوون و پاشان فەرموودەیان لێی دەگێڕایەوە.

هەروەها پێغەمبەرﷺ منداڵانی لەگەڵ خۆی دەبرد بەڕێگادا، و بەسواری ئاژەڵیش لەگەڵ خۆیدا بردونی، بەبێ ئاخ هەڵكێشان و رق لێبوون، بەڵكو بە سۆز و خۆشەویستیەوە، وە ئەو فەرموودەیەی كە (ابن عباس) م گێڕاویەتەوە كاتێ دەڵێت: رۆژێكیان بەسواری وڵاخ لەگەڵ پێغەمبەرداﷺ بووم، فەرمووی: ئەی كوڕ.. هەتا كۆتایی فەرموودەكە، بەڵگەیەكی تەواو دڵنیاكەرە لەسەر ئەوەی كە خرایە روو.

پێغەمبەرﷺ باسی خۆی كردووە كە ئامادەی كۆڕ و دانیشتن و كۆبوونەوەكانی پیاوماقوڵ و گەورەكان بووە لەكاتێكدا كە كوڕ بووەو دەفەرمووێت: ((**شهدت وأنا غلام حلفاً مع عمومتي المطيبين فما أُحب أن لي حمر النعم وأني أنكثه**))[٣] واتە: (كاتێ كە كوڕ بووم لەگەڵ مامە بەڕێزەكانمدا ئامادەی پەیمانێك بووم، ئەگەر ئێستاش حوشتری سورم هەبێت حەزناكەم بیشكێنم).

وەك دەبینین كە پێغەمبەری خواﷺ پیاوان ئاگادار دەكاتەوە لە ئەدەبی كۆڕ و دانیشتنەكان كاتێ كە منداڵی تێدا ئامادە بێت، (طبرانی) لە (سهیل كوڕی سعد)ەوە دەگێڕێتەوە كە دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ دەفەرمووێت: ((**لا يُجلس بين الرجل وابنه في المجلس**)). واتە: (لە كاتی كۆڕ و دانیشتندا لەنێوان پیاو و منداڵەكەی دامەنیشن).

هەر لە شێوەكانی تێكەڵبوونی منداڵ لەگەڵ گەورەدا چوونە نێو كۆڕ و دانیشتەكانیان- لەمەشدا كوڕ و كچ وەك یەكە-، دەبینین كە (عمر) ﷺ دەربارەی سوودی ئەو تێكەڵبوونە كاتی

---

١ في مستدركه (٣/٥٤٠).

٢ رواه البخاري وأحمد وابوداود وابن ماجة والترمذي وأبو يعلى في مسنده ١٨٦/٣ بسند صحيح.

٣ رواه ابويعلى بسند صحيح في مسنده ١٥٧/٢، ورواه احمد ١٩٠/١.

گەورەبوون ئاگادارمان دەکات، کە خەڵکی بەو هۆیەوە دەزانن فلانەکەس کچی هەیە بۆ خواستنی کە ئەو لە منداڵیدا ناسیویەتی، پێی خۆشە کە بیخوازێت بۆ کورەکەی هەر بۆیە دەچێتە خوازبێنی، یاخود کوڕێك لە منداڵیدا ئەو کیژەی دەچێتە دڵەوەو خۆی ئامادە دەکات کە گەورەبوو بیخوازێت.

لەم روەوە ئیمام (عبدالرزاق)[1] لە (ابن جریج)ەوە گێڕاویەتەوە کە دەڵێت: بیستم کە (عمر کوڕی خطاب) ﷺ وتوویەتی: ئەو کچانەتان کە هێشتا باڵغ نەبوون دەربخەن، بەڵکو لە گەورەییدا ئامۆزاکانی ئارەزویان لێی بێت (حەز بەخواستنی بکەن).

لەشێوەکانی دیکەی تێکەڵاوی و راهاتنی منداڵ لەگەڵ گەورەکاندا بەوە دەبێت کە گەورەکان لەگەڵیاندا دابنیشن و قسەیان بۆ بکەن و ئامۆژگاریان بکەن و رێنمونیان بکەن.

لەم بارەیەوە (عبدالرزاق)[2] دەگێڕێتەوە کە (ابن سیرین) وتوویەتی: کاتێ کە منداڵ بووین پیاوێك لامان دانیشت و وتی (عمر کوڕی خطاب)ﷺ فلانە سەردەم بۆمانی نووسی کە دەرپێی درێژ لەبەر بکەن، نەعل لەپێ‌کەن، شوێنی پەنجەگیربوون بۆ نەعلەکانتان بکەن، و با ژیانێکی سازتان هەبێت، و واز لە خۆشگوزەرانی و جل و بەرگی بێگانە بهێنن.

پێشینانی چاك بەو جۆرە دادەنیشتن لەگەڵ منداڵاندا و رێنمونیو ئەزموونە بەسوودەکانی تەمەنیان پێ دەگەیاندن تا لە ئاییندەی ژیانیاندا کەسێتیەکی نمونەییان لێ دەربچێت.

## بنەمای دووەمی کۆمەڵایەتی: ناردنی منداڵ بۆ جێبەجێکردنی پێداویستیەکان:

ئەمەش هۆکارێکی گرنگە لە پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی منداڵدا، چونکە بەجێهێنانی پێداویستی بۆ ماڵ یاخود بۆ دایك یان باوك کاریگەری کاراو باش و بەسوودی دەبێت لەژیانی منداڵدا، لە منداڵێتیەکەدا کارا(فعال)یە چونکە ئەو ئاشنای گۆشە نادیارەکانی ژیان دەبێت بەو هۆیەوەو هەست بە شادی چەکەرەکردنی زانین و زانیاری دەکات، لەگەڵ متمانە بەخۆبوون لەروبەڕوبوونەوەی کاروباردا، هەروەها کارایە لە ئاییندەدا چونکە ئەو پێشتر لەکاتی منداڵێتیدا لێهاتوویی و شارەزاییەکی بەدەست هێناوە کە بەهۆیەوە دەتوانێت ژیانی بە هەنگاوی جێگیر و پوخت و بێ‌خەوش و تەنگ و چەڵەمە بباتە سەر.

١ المصنف:٦/١٥٦. باب ابراز الجواري والنظر عند النكاح.
٢ المصنف: ١١/٨٤.

لە (ثابت البنانی)یەوە، ئەویش لە (انس)ەوەﷺ کە وتوویەتی: رۆژێکیان خزمەتی پێغەمبەری خوامﷺ دەکرد، کە سەیرم کرد ئیش و کارەکەم تەواو بووە، وتم: پێغەمبەری خواﷺ دوای نیوەڕۆیەو دەخەوێت، چومە دەرەوە بۆ لای منداڵان یاریان دەکرد، دەڵێت: منیش سەیری یاریەکەیانم دەکرد، پێغەمبەری خواﷺ هات بە لاماندا و سەلامی لە منداڵەکان کرد کە یاریان دەکرد، و بانگی کردم و ناردمی بۆ کارێکی خۆی، و پێغەمبەری خواﷺ لەبەر سێبەرێك دانیشت تا گەڕامەوە، درەنگ کەوتم لەو کاتەی دەگەڕامەوە بۆلای دایکم، کە گەڕامەوە لای وتی: چی درەنگی خستی؟ وتم: پێغەمبەری خواﷺ ناردمی بۆ کارێکی خۆی، وتی: ئەو کارە چیبوو؟ وتم: نهێنی پێغەمبەرەﷺ، وتی: نهێنی پێغەمبەری خواﷺ بپارێزەو لای کەس مەیلێ، (ثابت) دەڵێ: (انس) پێی وتم: ئەگەر بۆ کەسێکم بگێڕایەتەوە یا باسم بکردایە، ئەوا ئەی (ثابت) بۆ تۆم باس دەکرد.[1]

لە جۆری ئەو خزمەتەی کە منداڵ مەشقی پێدەکرێ کە ئەنجامی بدات، دانانی خوانی نانخواردنە، ئەمەش بۆ ئەوەی بەشداری کارکردنی خێزان بکات و لە ئامادەکردنی خواردندا بەشداری بکات وە بە شوێنی شتەکان و ناوەکانیان ئاشنا بێت.

(نسائی) لە(انس)ەوەﷺ وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ لەکاتی پارشێودا فەرمووی: ((یا أنس! إني أريد الصيام؛ فأطعمني شيئاً)). واتە: (ئەی (انس)! من بەڕۆژوو دەبم، شتێکم بدەنێ بیخۆم).

(انس) دەڵێ: ئاوو خورمام بۆ هێنا و، ئەوەش دوای ئەوەی (بیلال) بانگی خوێند (واتە: بانگی یەکەمی بەیانی).

پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((یا أنس! أنظر رجلاً يأكل معي)). واتە: ((انس) تەماشاکە بەڵکو پیاوێك هەبێ لەگەڵم بخوات).

دەڵێ: (زید کوڕی ثابت)م بانگ کرد، جا هات و وتی: ئاردەوا دەخۆم و دەمەوێ بەڕۆژو بم، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((وأنا اريد الصيام)) منیش دەمەوێ بەڕۆژو بم، جا پارشێوی لەگەڵ کرد، پاشان هەستا و دوو رکعات نوێژی کرد و ئینجا بۆ نوێژ دەرچوو.

---

١ أخرجه الإمام احمد والبخاري ومسلم واللفظ لآحمد (ئەم گێڕانەوەیەمان بۆیە هێنایەوە چونکە زیادەی بەسوودی تێدابوو).

ئا ئەم پەروەردە کردەییەیە کە وا لە منداڵ دەکات لەبیری نەکات و لەگەورەبوونیدا باسی بکات، و شارەزایی زیاد دەکات، جا بەهۆی ئاوێتەبوون لەگەڵ ژیان و خەڵکدا کەسێتیە کۆمەڵایەتیەکەی پێك دێت و شەرمنی بوغزێنراوی بەسەردا نایەت و ناشلەژێ، بەڵکە ئەو شارەزاییە کە لەگەڵ دایك و باوکی بەدەستی هێناوە دەبێتە پاڵپشتی بەشێوەیەك کە دەبێتە متمانە بەخۆ بوونی، کەوا هەڵوێستە کۆمەڵایەتیەکان نایهەژێنێ، هەرچەندی ئەو هەڵوێستە کۆمەڵایەتیان توندوتیژ بێت.

## بنەمای سێیەمی کۆمەڵایەتی – راهێنانی منداڵ لەسەر سوننەتی سەلامکردن:

سەلام کردن بریتیە لە سڵاوکردنی ئیسلامیانەی نێوان موسڵمانان، منداڵیش دەچێتە ناو خەڵك بەجیاوازی ئاستیانەوە، هەر بۆیە پێویستی بە ئاشنابوون و ناسینی کلیلی کردنەوەی قسە لەگەڵیاندا هەیە.

لێرەدا شێوازێکی ناسك و جوان لە پێغەمبەرﷺ و هاوەڵە بەڕێزەکانیدا بەدی دەکەین بۆ چاندنی سڵاوکردن لە دەروونی منداڵدا:

(بخاری) و (مسلم) لە (انس)ەوەﷺ هێناویانە کە جارێکیان (انس) بەلای منداڵاندا تێپەڕی کرد، سڵاوی لێ کردن و وتی: پێغەمبەری خواﷺ ئاوەهای دەکرد (واتە کە بەلای منداڵاندا تێپەڕی بکردایە سڵاوی لێیان دەکرد).

وەك کەمێك پێشتریش ئەو فەرموودەیەی (انس) خرایە روو کە دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ هات و سڵاوی لەو منداڵانە کرد کە یارییان دەکرد.

(ابن حجر)[1] لەو بارەیەوە وتوویەتی:

هەروەها (نسائی) فەرموودەی ئەم دەروازەی لە رێگای (جعفر کوڕی سلیمان) لە (ثابت)ەوە هێناوە کە واژە(لفظ) و سیاقەکەی تەواوترە، پێغەمبەری خواﷺ دەچووە سەردانی ئەنصاریەکان و سڵاوی لە منداڵەکانیان دەکرد و دەستی دەهێنا بەسەریانداو بۆیان دەپاڕایەوە،[2] ئەمەش ئەوە دەدات بەدەستەوە کە زیاد لەجارێك ئەمە روویداوە، بەپێچەوانەی

---

١ في الفتح: ١٣/٢٧٠.

٢ صحيح، أنظر صحيح الجامع رقم ٤٩٤٧ ورواه ابن حبان في صحيحه، وأبو نعيم في الحلية، والخطيب في التاريخ.

ئەوەی لە (باب)ەکەدا هاتووە کە دەڵێ: (بەلای منداڵاندا تێپەڕی و سڵاوی لێ کردن)، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەوە خوی هەموو کاتێکی بووە، و من نەگەیشتوم بەناوی ئەو منداڵانـەی کە باسکراون.

هەروەخا (مسلم) و (نسائی) و (ابوداود) هێناویانە لەڕێگـەی (سـلیمان کـوڕی مغـیرە) و ئەویش لە(ثابت)ەوە بە واژەی (غلمان) لەبری (صبيان)، و (ابن السنی) و (ابو نعیم) لە (عمل اليوم والليلـة)دا لەڕێگەی (عثمـان کـوڕی مطـر) لـە (ثابـت)ەوە پێـی گەیـشتووە بـە واژەی: فەرمووی ((السلام عليكم يا صبيان)) و (عثمان) لاوازە لە گێڕانەوەدا.

(ابوداود)یش لە ڕێی (حميد) لە (أنـس)ەوە ﷺ گێڕاویەتـەوە، پێغەمبـەری خـواﷺ گەیـشتە لامان –کە منیش لەناو منداڵەکاندا بـووم- سـڵاوی لێ کـردین و نـاردمی بـۆ پێداویـستیەك و لەڕێگاکەدا دانیشت و چاوەڕوانی کـرد هـەتا گەڕامـەوە، (ابـن بطـال) دەربـارەی سـڵاوکردن لـە منداڵان وتوویەتی: راهێنانیانە لەسەر ڕێوشوێنی شەریعەت، و گەورەکان بەرگی خۆبەگـەورەزانین فڕەبدەن و خووڕەوشتی خۆبەکەم زانـین بگرنـەخۆ، و نـەرم و نیـان بـن. پاشـان (حـافظ) دەڵـێ: سڵاوکردن تەنها لەو منداڵە ناکرێت کە جوان بێت و لەوە بترسێت کە بـە سـڵاوکردنەکەی توشـی فیتنە ببێت، ئەوا شەرعی نیە، بەتایبەت گەر هەرزەکارێکی تەنیا بوو کەسی لەگەڵدا نەبوو.

بەڵام سڵاوکردنی منداڵ لە دایك و باوکی یاخود لە گەورەکان ئەوا دەبێت رابهێنرێت لەسەر ئەوەی کە سڵاو بکات بەتایبەتی کاتێ دەچێتەوە ماڵ:

(بخـاری) و (مـسلم) لـە (ابـوهريرە)ەوە ﷺ گێڕاویانەتـەوە کـە پێغەمبـەری خـواﷺ دەفـەرموێت: ((يسلم الراكب على الماشي، والماشي على القاعد، والقليل على الكـثير)) لەگێڕانـەوەی (بخـاری)دا ((والصغير على الكبير)). واتـە: (سـوار سـڵاو لـە پیـادە دەکـات، ڕێبواریش سڵاو لە دانیشتوو دەکات، کەسانێکی کـەم سـڵاو لـە کەسـانێکی زۆر دەکـەن، وە بچووك سڵاو لەگەورە دەکات).

(ترمذی) لە (انس)ەوەﷺ دەگێڕێتەوە کە دەڵێ: پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: ((يا بـنيَّ! إذا دخلت على أهلك فسلم، يكن بركة عليك وعلى أهل بيتك)).[1] واتـە: (ڕۆڵەکـەم! کاتـێ دەچیتەوە بۆ ماڵی خۆتان، سڵاو لە کەس و کارەکەت بکە، ئەو سڵاوە دەبێت بەمایەی فـەڕ و بەرەکەت بۆ خۆت و کەس و کارەکەشت).

---

١ رواه الترمذي وقال حديث حسن صحيح.

## بنەمای چوارەمی کۆمەڵایەتی - سەردانی منداڵ لەکاتی نەخۆش کەوتنیدا :

ئەوەی دەبێتە یارمەتیدەری بنیاتنانی پەیوەندی کۆمەڵایەتیی منداڵان سەردانیکردنیانە لەکاتی نەخۆش بوونیاندا، منداڵ کە هێشتا لە قۆناغی فیترەت پاکی و بێگەردیدایە کە دەبینێت خەڵکانی گەورەو بەتەمەن دێن بۆ لای لەسەر ئەم خووە چاك و پەسەندە رادێت، هەروەها بەو هۆیەوە ئازار و نەخۆشیەکەی سووك دەبێت، خۆ ئەگەر ئەو سەردانەت دەوڵەمەند کرد بە بانگکردنی ئەو منداڵە بۆ لای ئیسلام و دامەزران و چەسپانی لەسەر باوەڕ و، داواکردنی تۆبەو لێخۆشبوون لە خوای گەورە، ئەوا سەردانەکە بەرهەمی خۆی بەتەواوی فەراهەم دێنێت، و پاداشتی چەندقاتی دەبێت، پێغەمبەریش ﷺ بەو جۆرەی دەکرد، ئەمەش رونکردنەوەیەتی بۆت:

(بخاري) لە (انس)ەوەﷺ هێناویەتی کە دەڵێت: کوڕە جولەکەیەك خزمەتی پێغەمبەری ﷺ دەکرد، نەخۆش کەوت، پێغەمبەرﷺ چوو بۆ سەردانیو لەلای سەریەوە دانیشت و پێی فەرموو: موسڵمان بە، کوڕەکەش سەیری باوکی کرد، کە لەلایدا بوو، باوکیشی پێی وت: بەقسەی (ابوقاسم) بکە، جا ئەویش موسڵمان بوو، پێغەمبەرﷺ کە هەڵسا فەرمووی: ((الحمدلله الذي أنقذه من النار)) سوپاس بۆ خوا کە لە ئاگری دۆزەخ رزگاری کرد.

بەمجۆرە دەبینین کە پێغەمبەرﷺ هەموو هەلێکی دەقۆستەوە بۆ ئەوەی شتێك لە دەروونی منداڵدا بچێنێت، و لە هەموو پێکگەیشتنێکدا زانستێکی بەسوودی فێر بکات، و لە هەموو بینینێکدا لەسەر چاکە ڕای بهێنێت.

## بنەمای پێنجەمی کۆمەڵایەتی- منداڵ هاوڕێی خۆی لەمنداڵان هەڵبژێرێت:

لەو خوڕەوشتە کۆمەڵایەتیە جێگیرانەی کە لەناو خەڵکدا دەمێکە باوە" هاوەڵێتی و هاوڕێیەتی یە.. سروشتی دەروونی مرۆڤ وەهایە کە تێکەڵی خەڵك ببێت و بیانناسێت و لەنێویاندا کۆمەڵێك هەڵبژێرێت و لێیان نزیك ببێتەوە، و بە برایەتی و خۆشەویستی لەگەڵیاندا ژیان بەسەر ببات.

خۆ گەر دایك و باوك سەرکەوتوو بوون لە هەڵبژاردنی هاوڕێیەکی چاك بۆ منداڵەکەیان ئەوا بەو هۆیەوە دەروازەیەکی پەروەردەییان کردۆتەوە بۆ چاککردن و گەشەی ئەو منداڵە،

ئەگەر زانیشمان کە منداڵ هەر منداڵێکی دیکە هەڵدەبژێرێت بەهاوڕێی خۆی، چونکە ئێمە ناتوانین پێچەوانەی سروشتی دەروونی ئەو بین، لەبەر ئەوە وا چاکترە کە هەوڵی یارمەتیدانی ئەو منداڵە بدرێت لەکاری هەڵبژاردنی هاوڕێیەکی چاکدا کە یارمەتی بدات لەسەر گوێڕایەڵی خوا، و زیاتر پابەندبوون بە خووڕەوشتی ئیسلامی راست و دروستەوە، هەر لەبەر ئەمەشە کە دەبینین پێغەمبەری خواﷺ لەکاتی منداڵێتیدا لەگەڵ منداڵاندا یاری دەکرد، کاتێکیش بووە پێغەمبەری سەرکردە بەلایاندا تێدەپەڕی کە یاریان دەکرد و سڵاوی لێ دەکردن، و کە دەیبینی بەکۆمەڵ یاری دەکەن توندوتیژی بەرامبەر نەدەنواندن، و دەری نەدەکردن، بەڵکو داوای دەکرد سڵاوو بەزەیی لای خواوە بەسەریاندا دابەزێت، هەروەك لە فەرموودەکەی (انس)دا خرایە ڕوو، پێغەمبەری خواﷺ هات و سڵاوی لە منداڵەکان کرد کە یاریان دەکرد، ئەمەش ئەگەر شتێ بگەیەنێ ئەوا بەڵگەیە لەسەر گرنگیدان و سووربوونی پێغەمبەرﷺ لەسەر ئەوەی منداڵ لە کەشێکی بەکۆمەڵی نێو منداڵاندا و دوور لە تەریك بوون و گۆشەگیری پەروەردە بێت.

## بنەمای شەشەمی کۆمەڵایەتی - راهێنانی منداڵ لەسەر کڕین و فرۆشتن:

گرنگی پێدانی پێغەمبەرﷺ بە دروستبوونی منداڵ لە رووی کۆمەڵایەتی و ئابوورییەوە لە ئاڕاستەکردنیدا بۆ هەموو بوارەکانی ژیانی دەردەکەوێت، لەگەڵ ئاوێتەبوونی منداڵ لەگەڵ واقیعی نوێ و کۆمەڵی نوێ کە تێیدا پەروەردە دەبێت و پێدەگات، پرۆسەی کڕین و فرۆشتنیش جوڵەیەکی کۆمەڵایەتی بەهێزی دەداتێ، کە هەڵس و کەوت لەگەڵ منداڵی هاوتەمەنیدا دەکات، و رادێت لەسەر چۆنیەتی پێگەیشتنی لەم ژیانەدا، لە کاتەکەی خۆی بە شتێکی بە کەڵکەوە سوودمەند دەبێت، هەروەها متمانەیەکی دەروونی و کۆمەڵایەتی دەداتێ، دەبێتە مرۆڤێکی ئاسایی و رێك و پێك، و وردەوردە فێری هەوڵ و کۆشش دەبێت لەژیاندا، دوور لە گاڵتەجاڕی و رادێت لەسەر وەرگرتن و پێدان و بەشێوەیەکی چاك و دروست لەژیان تێدەگات، و دوور لە نازی ئەندازەبەدەری بوغزێنراو کە منداڵ دەکوژێت لە هەر کوێیەك بێت.

نەك هەر ئەوە، بەڵکو پێغەمبەری خواﷺ دوعا بۆ ئەو منداڵە دەکات، کە خوای گەورە فەڕ و بەرەکەت بخاتە ئەزموونی کارو کاسبیەکەی:

(ابویعلی) و (طبرانی) لە (عمرو کوڕی حریث)ەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خواﷺ لەلای (عبداللە کوڕی جعفر)دا تێپەڕی کرد کە شتی منداڵانەی دەفرۆشت، و فەرمووی: ((**اللهم بارك في بيعته -یان فەرمووی- صفقته**)). واتە: (خوایە بەرەکەت بخەرە فرۆشتنەکەیەوە -یان- پارەکەیەوە).

ئەو منداڵە خانەدانەی کوڕی خانەدان و ئامۆزای پێغەمبەرەﷺ شتی دەکڕی و دەفرۆشت و پێغەمبەری خواﷺ شەرمی لەکارەکەی نەبوو، بەڵکو بۆی پاڕایەوە، خۆزگە هۆزەکەی منیش بیانزانیایە.

## بنەمای حەوتەمی کۆمەڵایەتی - ئامادەبوونی منداڵ لە ئاهەنگ و زەماوەندە شەرعیەکان:

ئەوەش شوێنێکی کۆبوونەوەی دیکەیە کە منداڵان بۆی دەچن و تێیدا ئاشنای ئەو ئاهەنگە بەرێزە دەبن.. کە ئەوانیش رۆژێك دادێ یەکێك بن لە ئەندامە سەرەکیەکانی، لەوێشدا گەورەو بچووك دەبینن، گوێیان لە قسەو گفتوگۆی خۆشەویستیو خۆشی جوان دەبێت، بەوەش دەروونیان گەش دەبێتەوەو هەستیان دەجولێت، و تێکەڵی کردنی خەڵکیان باشتر دەبێت.

ئەوەتا پێغەمبەری خواﷺ منداڵان دەبینێت لە ئاهەنگی ژنهێنانداو بڕیار لەسەر هاتنیان و بەدەمەچوونی ئامادەبوونیان دەدات و، رێگریان ناکات و بانگهێشتی هەموو ئامادەبوان دەکات و بانگهێشتەکەش بۆ ئەو خەڵکە" منداڵانیش دەگرێتەوە.

ئیمام (احمد)[١] لە(عبدالعزیز کوڕی صهیب)ەوە هێناویەتی، ئەویش لە (انس)ەوە رضي الله عنه کە دەڵێت: پێغەمبەرﷺ چاوی بەچەند منداڵ و ژنێ کەوت کە دەگەڕانەوە، (عبدالعزیز) دەڵێت: وابزانم وتی لە زەماوەند، پێغەمبەرﷺهەڵساو بەپێوە وەستا و فەرمووی: **((اللهم أنتم من أحب الناس اليّ، اللهم أنتم من أحب الناس اليّ، اللهم أنتم من أحب الناس اليّ))**. واتە: (خوایە (شایەدبە)من ئێوەم لەهەموو کەس لەلا خۆشەویستترە، (مەبەستی ئەنصاریەکان بوو).

بەمەشدا گرنگیدانی پێغەمبەرتﷺ بۆ دەردەکەوێت لە پێکهێنانی منداڵدا لەرووی کۆمەڵایەتیەوەو بردنی بۆ دانیشتن و کۆبوونەوەکان.. و بۆ شوێنی خۆشی، هەروەها هیچیشی تێدا نیە کە لەگەڵ خۆدا ببرێن بۆ شوێنی تازیە و پرسە.

---

١ ورواه البخاري في باب النكاح: باب ذهاب النساء والصبيان الى العرس.

## بنەمای هەشتەمی کۆمەڵایەتی - شەومانەوەی منداڵ لای خزمە چاکەکانی:

چوونە دەرەوەی منداڵ لەماڵی خۆیانەوە بۆ ماڵی یەکێك لە خزمە چاکەکانی و خەوتنی لەلایاندا مەشقی بۆی تێدایە کەوا خێزانێکی کە دەبینێ، بەوەش رادێت لەسەر هەڵس و کەوت کردن لەگەڵ خزمانیدا، و لە رووی زانین و تێگەیشتن و خواپەرستیو چاکبوونەوە لێیان سوودمەند دەبێت، هەروەها مەشق و راهێنانی لەسەر بەجێهێنانی پەیوەندی خزمایەتی و زیاتر بەجێهێنانی خۆشەویستی لەگەڵ خزمەکانی تێدایە، وێڕای بەجێهێشتنی شوێنەواری چاك بۆ کاتی گەورەبوونی، کاتی شەومانەوە و سەردانی منداڵێتی دێتەوە یاد و دەیگێڕێتەوەو شانازی پێوە دەکات، هەروەها یارمەتیدەری چاکی پەیوەندی کۆمەڵایەتیە تێیدا، خۆ گەر دایك و باوك منداڵیان ئاگادار کرد لە سوودی شەو مانەوە لای خزمان بۆ سوودوەرگرتن لە زانست و پارێزکاری(تقوی)یان ئەوا زۆر زۆر چاکتر دەبو، ئەوەتانێ (ابن عباس)ش هەموو منداڵان فێری سوربوون لەسەر سەردانی خزمانی چاك و سوودمەند بوون لێیان دەکات:

(بخاری) لە (ابن عباس)ەوەهێناویەتی کە دەڵێت: شەو لەماڵی پورم (میمونە کچی حارث)ی خێزانی پێغەمبەرﷺ مامەوە، لە گێڕانەوەی جگە لە (بخاری)دا وا هاتووە: چاودێری نوێژکردنی پێغەمبەری خوامﷺ دەکرد ...فەرمووده.

لە گێڕانەوەی (ابن خزیمە)ش لە (صحیح)ەکەیدا (٨٩/٣) وا هاتووە:

(ابن عباس) لەلای (میمونە)ی دایکی باوەڕداران کە پوریەتی مایەوەو لەسەر پشت راکشاو سەری بە پانایی سەرینەکە کردووە، و پێغەمبەری خواﷺ و خێزانەکەی راکشان و سەریان بە درێژایی سەرینەکە کرد و نووست، هەتا نیوەشەو یاخود کەمێك لە نیوەشەو کەمتر یان تۆزێك دوای لەنیوەشەو نوست، پاشان پێغەمبەری خواﷺ لەخەو هەستا و بەدانیشتنەوە دەستی بە دەم و چاویدا هێنا، ئینجا دە ئایەتی کۆتایی سورەتی (آل عمران)ی خوێند، پاشان هەستا بۆ لای کوندەیەکی هەڵواسراو، و بەباشترین شێوە دەستنوێژی پێ‌گرت و پاشان دەستی کرد بە نوێژ کردن، (ابن عباس دەڵێ): منیش هەستام لەتەنیشتیەوە نوێژ بکەم، پێغەمبەرﷺ دەستی راستی خستە سەرسەرم، و گوێی راستمی بادا و دوو رکعات نوێژی کرد، پاشان دوو رکعاتی سووکی کرد، ئینجا چووەدەرەوە و نوێژی بەیانی کرد.

## کۆتایی: نمونەیەکی کرداریی لەبارەی تێکەڵبوونی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ منداڵان:

ئێستا و لەکۆتایی ئەم دەروازەیەدا نمونەیەکی کرداریی‌و پێشەنگێکی چاك لە تێکەڵاوبوونی پێغەمبەری خواﷺ دەخەینە بەردەست، تا لەم شوێن پایەدا ببێتە کۆتایی.

لە (انس)ەوەﷺ هێناویانە کە دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ لەهەموو کەس زیاتر رەوشتی جوان بوو، برایەکم هەبوو پێیان دەوت (ابوعمیر) ــ لەشیر برابوویەوە ــ، پێغەمبەرﷺ کە دەهاتە ماڵمان پێی دەفەرموو: ((یا أبا عمیر، ما فعل النغیر[1])) ئەی (ابوعمیر) باڵندەکە چیکرد؟ بەهۆی ئەوەی کە (نُغر = باڵندە)ێکی هەبوو یاری پێ‌دەکرد، لەوانە بوو کاتی نوێژ داهتبێت و پێغەمبەرﷺ لەماڵمان بوو، فەرمانی کرد ئەو رایەخەی ژێرمان بماڵرێت و بتەکێنرێت، پاشان هەڵدەستاو ئێمەش لەدوایەوە هەڵدەستاین و نوێژی پێ‌دەکرین.

خوێنەری بەڕێز! فەرموو ئەوەش شیکردنەوەی گرانبەهاو لێکدانەوەی ناسکی یەکێك لەگەورەشیکەرەوەکانی فەرمودە، کە ئەویش (ابن حجر العسقلانی)یە کە لەسەر ئەم فەرموودەیەوە هەڵوێستەیەکی جوان و تێر و تەواو دەکات - تا ببینیت کە پەروەردەی پێغەمبەرﷺ بۆ منداڵان دەتوانرێت شتی سەرسوڕهێنەری لێ دەربهێنرێت، وە ئومەتی ئیسلامیش ئەوکاتە شکستی هێنا لە بنەما پەروەردەییەکانیدا کە دەستی دایە بڕواکردن بە (جورج) و (انطون) و لە (محمد کوڕی عبداللە)ﷺ دوورکەوتەوە، (ابن حجر) دەڵێت:[2]

لەم فەرموودەیەدا چەند سوودێك هەیە کە (ابوعباس احمد کوڕی ابو احمد الطبری) ناسراو بە (ابن القاص) زانای شافیعی و خاوەنی (التصانیف في جزء مفرد)، (ابن القاص) لە سەرەتای کتێبەکەیدا باسی کردووە کە هەندێ خەڵکی ئەوەیان دەکردە نەنگی بەسەر ئەهلی فەرموودەوە کە هەندێك شت دەگێڕنەوە کە هیچ سوودی نیە، لە نێویشیاندا ئەو فەرموودەیەی (ابوعمیر)، دەڵێت: بەبێ ئەوەی بزانن کە لەم فەرموودەیەدا لەرووی فیقهی و هونەری خوڕەوشت جوانی و سوودگەیاندن شەست رووی هەیە، پاشان بەسانایی رێکی خستووەو پوختەی مەبەستەکانی نووسیوەو ئەوەی توانرابێت زیادی کردووە بۆسەری‌و دەڵێت:[3]

١- ڕێگەپێدانی تەوقەکردن تێیدا، بەهۆی گوتەی (انس)ەوە کە دەڵێت: دەستم بەدەستی

---

١ (نغیر) بچووککراوەی (نغر)ە، کە ئەویش باڵندەیەکی بچووکی وەك چۆلەکەیە.

٢ الفتح: ١٣/٢٠٥-٢٠٨.

٣ لێرەدا تەنها سوودە پەروەردەییەکان باس دەکەین.

هیچ کەسێك نەکەوتووە کە لە دەستی پێغەمبەرﷺ نەرمتر بوبێت، تەوقەکردنەکەش تەنها تایبەتە بە پیاوان و ژنان ناگرێتەوە.

٢- رێگەدان بە گاڵتەوگەپ و دووبارەکردنەوەی سوعبەتەکەی تێدایەو ئەوەش رێگەپێدانێکی سوننەتە نەك روخسەت پێدان، و گاڵتەکردنیش لەگەڵ منداڵێك کە چاکەو خراپەی خۆی نازانێ دروستەو جائیزە، هەروەها دووبارە سەردانی کردنی سوعبەت لەگەڵداکراو جائیزە.

٣- وازهێنان لە خۆ بەگەورەزانین و لوتبەرزی و جیاوازی کردنی تێدایە، وە لەبەر ئەوەی کە پیاوە کە لەرێگا دەڕوات، خۆی بە مەند پیشان دەدات لەماڵەوەش سوعبەت دەکات.

٤-هەروەها جوانیو ناسکی نواندنی تێدایە بەرانبەر هاوڕێ" بچووك بێت یان گەورە، و پرسیار کردن دەربارەی بارودۆخی، وە ئەوەی دەربارەی دوورخستنەوەی گریانی منداڵ بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە بە هۆیەك بگریێ، یان بەناهەق ئازار درابێ.

٥- رێگەپێدانی نازناو لێنانی تێدایە بە (باوکی فلان) بەبێ ئەوەی منداڵی هەبێت.

٦- رێگەپێدانی یاریکردنی منداڵ بە باڵندەی تێدایە.

٧- هەروەها رێگەپێدانی باوك و دایکی تێدایە کە واز لە منداڵە بچووکەکەیان بهێنن یاری بکات بەو شتەی کە گونجاوو رێپێدراوە.

٨- سەرفکردنی ماڵ و سامان بۆ ئەو شتە رێگەپێدراوانەی کە منداڵ خۆی پێوە خەریك دەکات.

٩- مۆڵەت پێدانی گرتنی باڵندەو کردنە نێوقەفەز و شتی دیکەی هاوشێوەی تێدایە، لەگەڵ کردنی باڵی باڵندەکە، چونکە حاڵی باڵندەکەی (ابوعمیر) یەکێك بووە لەوانە، و هەرکامێکیشیان واقع بێت ئەوا لەحوکمدا ئەوی دیکە شوێنی دەکەوێت.

١٠- رووبەڕوو بوونەوەی منداڵی بچووك بە دواندن شیاوە بەپێچەوانەی ئەوەی کە دەڵێت: پیاوی داناو زانا قسەی تەنها ئاڕاستەی کەسانێك دەکات کە تێی بگەن و عاقڵ بن.

١١- بچووککردنەوەی ناوی تێدا شیاوە با ناوی گیاندارانیش بێت.

١٢- هەڵس و کەوتکردن لەگەڵ خەڵك بەپێی ئاستی عەقڵیانی تێدایە.

١٣- ئەوەشی تێدایە کە گەورەیەك گەر سەردانی ماڵێکی کرد، ئەوا یارمەتیدەری نێوانیانە، چونکە پێغەمبەرﷺ تەوقەی لەگەڵ (انس) کرد و گاڵتەی لەگەڵ (ابوعمیر) کرد و لەماڵێ خۆیاندا و لەسەر جێگاکەی (ام سلیم) نوێژی پێکردن هەتا هەموو لە فەڕ و بەرەکەتەکەی بەهرەمەند بوون.

هەروەها (ابن بطال)یش لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە باسی کردووە، لەمەشدا سوودە پەروەردەییەکانی باس دەکەین و درێژە بە ژمارەبەندییەکە دەدەین:

١٤- دەست هێنان بەسەر منداڵی تێدایە بۆ نەرمی و بەزەیی نواندن.

١٥- بانگکردنی خەڵکی تێدایە بە بچووککردنەوەی ناوەکەی بەڵام بەبێ ئازاردانی.

١٦- پرسیارکردن لە شتێك کە خۆت بیزانی تێدایە، لەبەر ئەوەی کە فەرمووی (ما فعل نغیر) لەکاتێکدا ئەو دەیزانی کە مرداربۆتەوە.

(ابن حجر) لەسەر قسەکانی بەردەوام دەبێت و دەڵێت: کەسانێك ئەو قسەیەی (ابن القاص)یان رەت کردۆتەوە کە ئەم فەرموودەیە بەڵگە بێت لەسەر ئەوەی کە یاریکردنی منداڵ بە باڵندە بەرەهایی رێگە پێدراوە، ئەوەتا (ابو عبدالملك) دەڵێت: دەگونجێت کە ئەمە بەوەی لەبارەی سزاو ئەشکەنجەدانی گیانداران هاتووە (نەسخ) کرابێتەوە، (قرطبی)ش دەڵێ: راستیەکەی ئەوەیە کە (نەسخ) نەکراوە، بەڵکو ئەوەی روخسەتی پێدراوە ئەوەیە کە منداڵ بیگرێت تا گەمەی پێبکات، بەڵام بۆ ئەوەی بتوانێت ئازاری بدات هەتا دەیکوژێت، ئەوە هەرگیز حەڵاڵ نەکراوە.

(ابن حجر) درێژەی پێدەدا: لەو سوودانەی کە (ابن القاص) و کەسانی دیکە باسیان نەکردوە لە چیرۆکی (ابوعمیر)دا، (احمد) لە گێڕانەوەی (عمارە کوڕی زادان) کە لە (ثابت)ەوەو ئەویش لە (انس)ەوەﷺ گێڕاویەتەوە کە دەڵێت: (منداڵەکە نەخۆش کەوت و مرد)، ئینجا باسی ئەو فەرموودەیەی کرد لە چیرۆکی مردنەکەیو ئەوەی لە (ام سلیم) رویدا لە شاردنەوەی ئەمە لە (ابوطلحة) هەتا لەگەڵی نووست، بۆ بەیانی هەواڵەکەی پێدا، ئەویش ئەوەی بۆ پێغەمبەرﷺ گێڕایەوە، پێغەمبەریشﷺ بۆیان پاڕایەوە، پاش ئەوە (ام سلیم) سکی پڕ بوو، کە منداڵەکە لەدایك بوو (انس) هێنایە خزمەت پێغەمبەرﷺ و ئەویش شیرینی لەدەم وەردا و ناوی نا (عبداللە).

بەوجۆرەی بینیمان کە پرۆسەی بنیاتنانی کۆمەڵایەتی منداڵ پایەکی گرنگی لە بنیاتنانی کەسێتی و راستکردنەوەیو پەورەردەکردنیو راستاڵیدا هەیەو هەر بەوەش متمانەی دەروونی کۆمەڵایەتی بۆ منداڵ دێتە دی.

# دەروازەی چوارەم

## بنیاتنانی خووڕەوشتی

(هەرکەسێك منداڵەکەی ئەدەب بدات ئەوا بەچاکی لوتی دوژمنەکەی شکاندووە).[١]

-پەند-

**دەستپێك.**

**بنچینەی یەکەم - ڕەوشتی ئەدەب:**

**ئەوەی لەبارەی چاندنی ئەدەب لە منداڵاندا هاتووە.**

**چەند نمونەیەك لە ژیانی پێشینانی چاك.**

**جۆرەکانی ئادابی پێغەمبەرﷺ بۆ منداڵان.**

**١- ئەدەب لەگەڵ دایك و باوك.**

**- ئەدەبی گفتوگۆ لەگەڵ دایك و باوکدا.**

**- ئەدەبی سەیرکردنی دایك و باوك.**

**٢- ئەدەب لەگەڵ زانایاندا.**

**- ئەوەی دەربارەی ئەدەب لەگەڵ زانایاندا هاتووە.**

**- چەند نمونەیەك لە بارەی ئەدەبی منداڵان لەگەڵ زانایاندا.**

**٣- ئەدەبی ڕێز و قەدرگرتن.**

**٤- ئەدەبی برایەتی.**

**٥- ئەدەبی دراوسێیەتی.**

---

١ نصيحة الملوك ص١٧٢.

٦- ئەدەبی مۆڵە تخواستن.

٧- ئەدەبی نا نخواردن.

٨- ئەدەبی رواڵەتی منداڵ (ئەدەبی قژتاشین، ئەدەبی جل و بەرگ).

٩- ئەدەبی گوێگرتن لە قورئان.

بنچینەی دووەم - رەوشتی راستگۆیی.

بنچینەی سێیەم - رەوشتی نهێنی پاراستن.

بنچینەی چوارەم - رەوشتی راسپاردەیی.

بنچینەی پێنجەم - رەوشتی ساغ و سەلامەتی سینگ لە رق و کینە.

کۆتایی: نمونەیەکی کرداریی لە رەوشتی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ منداڵان.

## دەستپێك:

(الخُلُق) بە بوونی (بۆرە = ضمة) لەسەر لامەکە و (زەنە = سکون) ی قافەکە: بە واتای خورەوشتە، لە (صحاح)دا بەو جۆرەیە، (قرطبی)یش لە تەفسیرەکەیدا باسی کردووە کە (الخلق) لە زمانەوانیدا بریتیە لەو ئادابانەی کە مرۆڤ بۆ خۆی وەردەگرێت، چونکە وەك سروشتێکی لێ دێ تێیدا، بەڵام ئەو ئەدەبەی کە لەسەری دروست بووە ئەوە (خیم)ە، (خلق = خوورەوشت) سروشتێکی دروستکراوە(طبع متکلف)، و (خیم)یش سروشتێکی غەریزەییە.[١]

لەبەر رۆشنایی پێناسەکەی (قرطبی)دا بۆ (خلق = خوورەوشت)، ئەوا منداڵ پێویستی بەو بنیاتنانە رەوشتیە هەیە، ئەمەش بۆ ئەوەی کە جوڵەی کۆمەڵایەتی منداڵ کە لە دەروازەی سێیەمدا باسمان کرد ساغ و دروست بێت، ئەم هەوڵەش هەردەبێت بدرێت چونکە پرۆسەی گوێزانەوە لە سروشتی دروستکراو(الطبع المتکلف)ەوە بۆ راهاتنی غەریزەیی کارێکی گرانە، ماوەکەشی لەگەڵ تەمەنی مرۆڤدا درێژە دەکێشێ و مرۆڤ رەوشتی خۆی بەهێزدەکات و بەوەش هەوڵی دایك و باوك و پەروەردەکاران پێویست دەبێت لەم قۆناغەی منداڵێتیدا هەروەك باسمان کرد کە بە فیترەت و بێخەوشی و خێرایی وەرگرتن و وەڵامدانەوە جیادەکرێتەوە.

گەورە زانایانیش ئاماژەیان بەم واتایە داوە، لەنێویاندا (ابوحامد الغزالی) هەروەك لەسەرەتای ئەم کتێبەدا خرایە روو، هەروەها (ابن القیم)یش لە کتێبی (احکام المولود)دا وتوویەتی:

ئەوەی کە منداڵ زیاد لەهەموو شتێك پێویستی پێیەتی بەتەنگەوەبوونی رەوشتیەتی، چونکە لەسەر ئەوە پێدەگات و گەورە دەبێت کە بەخێوکارەکەی کاتی منداڵی لەسەری رایهێناوە، لە گۆشەگیری و تورەیی و کەللەرەقی و پەلەکردن و نەرمی لەگەڵ هەواو ئارەزووەکانی و هەڵەشەیی و توندوتیژی و تێرنەبوون، ئەوا لەکاتی گەورەبوونیدا زۆر لەسەری زەحمەت دەبێ کە نەیهێڵێت، و ئەو رەوشتانە دەبنە سیفات و روخساری چەسپاوی ئەو، خۆ گەر لەخۆی دانەماڵێت تا ئەوپەری داماڵین ئەوا رۆژێك لە رۆژان ریسوای دەکات، لەبەر ئەمەشە کە دەبینین زۆرێك لە خەڵکی خوورەوشتیان تێکچووە، ئەمەش بەهۆی ئەو پەروەردەیەوەیە کە لەسەری گەورە بوون.

---

١ عن فتح الغفار بشرح المنار (١/٧ لأبن نجيم الحنفي وهو كتاب أصول فقه في مذهب الحنفي.

زانای گەورە (شيخ محمد الخضر حسين) -شێخی پێشووی ئەزهەر- هانی گرنگی قۆستنەوەی ماوەی منداڵێتی دەدا بۆ چاندنی خوورەوشتی جوان و دەڵێت: منداڵ لەسەر فیترەتێکی بێگەرد و سروشتی سادە لەدایك دەبێت، خۆ ئەگەر دەروونی سادەو ساکاری بەرەورووی هەر رەوشتێکی جوان بویەوە ئەوا وێنەکەی لەسەری نەخشە دەکێشرێت، پاشان ئەو وێنەیە بەردەوام وردەوردە زیاد دەکات، تا وای لێدێت کە هەموو لایەکانی دەروون دەگرێتەوە، و دەبێتە چۆنیەتیەکی پتەو تیایدا و بەربەست دەبێت بۆی لە کارکردن بە دژەکەی، ئەمەش پشتگیری ئەوە دەکات کە ئێمە لەناو کەسانێکی نەناسراودا یەکێك بەدی بکەین کە وتاری ناسك و باش بێت، و دیدار جوان و خۆش رەفتار بێت، دوودڵ نابین لەوەی کە بڵێین ئەمە لەو کەسانەیە کە خوای گەورە لە ماڵە بەرێز و چاکەکان و بەشێوەیەکی چاك پێی گەیاندووە.[1]

پرسیارێك ماوەتەوە کە خۆی دەسەپێنێت، ئەویش ئەوەیە کە" رەگەزەکانی بنیاتنانی رەوشتی منداڵان چی یە؟ و کامەیە پایەکانی ئەو پەروەردە بەرزە؟ لەمیانەی چاوگێڕان بە فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺ و پۆلێن کردنی دەبینین کە لەسەر پێنج پایە راوەستاوە کە لێرەبەدوا بەدرێژی دەیخەینە روو:

## بنچینەی رەوشتی یەکەم - رەوشتی ئەدەب:

(ابن حجر) دەڵێ: ئەدەب بریتییە لە بەکارهێنانی ئەو کردار و گوفتارەی بەباش بزانرێ، و بە وەرگرتنی رەوشتە جوانەکان گوزارش لێکراوە، و وتراوە هەڵوێستەکردنە لەئاست شتە چاکەکان، هەروەها وتراویشە: قەدرو رێزگرتنی کەسانی سەرەوەی خۆتە لەگەڵ نەرم و نیانی نواندن بەرامبەر کەسانی بچووکتر لەخۆت، ئەوەش وتراوە کە (ادب) لە (مأدبة =سفرەو خوان)ەوە وەرگیراوە، کە ئەوەش بانگهێشت کردنە بۆ نانخواردن لەبەرئەوەش بەوجۆرە ناونراوە چونکە بۆلای بانگ دەکرێت.[2]

پرسیار لە (جنيد) کرا دەربارەی ئەدەب[3]، وتی: جوان هەڵس و کەوت کردنە.

لەبەر ئەوە گرنگی ئەدەب لە مامەڵەو هەڵس و کەوتدا زیاتر دەرکەوت هەتا وای لێهات بووە روخساری دەرەوە کە گوزارشت لە گەورەو بچووك دەکات، هەر بۆیە منداڵ لەسەری

---

١ في كتابه السعادة العظمى ص٦٠.

٢ الفتح الباري ١٣/٣.

٣ عن تنبيه المغترين – للإمام الشعراني ص٤١.

پێویست کراوەو زۆری لێ دەکرێت بۆ لەبەرکردنی کاڵای ئەدەب، ئەوە لەکارە هەرەپێشینەکانی پەروەردەیی رەوشتی بووە.

هەروەك (صالح کوڕی عبدالقدوس)ی شاعیر دەڵێت:[١]

وإن من أدبته في زمن الصبا ... كالعود يسقي الماء في غرسه
حتى تراه مورقا ناضراً ... بعد الذي أبصرت من يبسه
والشيخ لا يترك أخلاقه ... حتى يواري في الثرى رمسه
إذا أرعوى عاد الى جهله ... كذا الضنا عاد الى نكسه

واتە:

ئەوەی کات و ساتی ساوایی ئەدەبی درابێ
وەك نەمامێکە کاتی چاندنی ئاودرابێ
هەتا بە گەڵاکردویی و گەشاوەیی دەیبینی
پاش ئەوەی کە بینیبوت بەوشکی
پیریش توانای وازهێنانی خوڕەوشتی نابێ
هەتا دادەپۆشرێ لە خۆڵا لەشی
کاتی لەوەڕاندن دەگەڕێتەوە بۆ نەفامیەکەی
هەروەك بێهێزێ کە دەچێتەوە سەر شکستیەکەی

١ عن جامع بيان العلم وفضله: ٨٦/١ لأبن البرّ.

## ١- ئەوەی دەربارەی چاندنی ئەدەب لە منداڵاندا هاتووە:

گرنگی ئەدەب و چاندنی و پێدانی بە منداڵ زیاتر و زۆرتر دەردەکەوێت کاتێك کە دەبینین پێغەمبەرﷺ مەزنترین بایەخی پێداوە لە پەروەردەکردنی خووڕەوشتدا، هەتا چاندنی لە منداڵدا و راهێنانی لەسەری بۆئەوەی ببێتە یەکێك لە سروشتە رەوشتیەکانی و خویەك لە خووە سروشتیەکانی، بەچاکتر داناوە لەکاری خێرکردن کە هەڵەو خراپەی پێ دەسڕێتەوە، ئەمە لەکاتێکدا کە وەك دەزانین خێر و بەخشین چ گرنگیەکی هەیە لە ئیسلامدا.

(ترمذی) لە (جابر کوڕی سمرە)ەوەﷺ گێڕاویەتیەوە کە دەڵێ: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((لأن یؤدب الرجل ولده خیر من أن یتصدق بصاع)).[١] واتە: (پیاو منداڵەکەی فێری ئەدەب و ڕێز بکات چاکترە لەوەی کە صاعێك بکاتە خێر).

هەروەها پێغەمبەری خواﷺ روونی دەکاتەوە بۆ دایك و باوکان کە فێرکردنی ئەدەب و ڕێز مەزنترین دیارییە بۆ منداڵ، و باشترین میراتیش بۆی خووڕەوشتی پەسند و چاکە.

(ترمذی) لە (سعید کوڕی عاص)ەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خواﷺ دەفەرمووێت: ((ما نحل والد ولداً من نَحْلٍ أفضل من أدب الحسن)).[٢] واتە: (هیچ باوکێك شتێکی چاکتر لە ئەدەبی جوان بە منداڵەکەی نەبەخشیوە).

هەر لەبەر ئەوە بوو (علی المدینی): دەیوت: میرات و بەجێهێشتنی ئەدەب بۆ منداڵ چاکترە لە میرات و بەجێهێشتنی سامان بۆی، چونکە بەهۆی رەوشت پەسندیەوە سامان و سەرداریی‌و خۆشەویستی براکانی بەدەست دەهێنێت و چاکەو خێری دونیاو قیامەتیان بۆ کۆدەکاتەوە.[٣]

لەوانەیە زۆرکەس بی ئاگا بێت لە گرنگی خووڕەوشت، و لەو کاروبارە ئاسانانەی دابنێت کە دەکرێت ئاسانکاری تێدا بکرێت، یاخود دەگونجێت لەیاد بکرێت، دیارە ئەوە نازانێت کە

---

١ ضعیف، أنظر ضعیف الجامع رقم ٤٦٤٥ والأحادیث الضعیفة ١٨٨٧ للألباني، وهو عند الترمذي برقم ١٩٥٢ في البر والصلة وقال: هذا حدیث غریب، وناصح بن علاء الكوفي أحد رواته لیس عند أهل الحدیث بالقوي ولا یعرف هذا الحدیث الاّ من هذا الوجه. أنظر جامع الأصول ٤١٦/١ ت.الأرناؤوط.

٢ في سنده مجهول وضعیف وصححه الحاكم ورده الذهبي علیه بقوله: بل مرسل ضعیف وقال الترمذي: غریب مرسل أي لأن عمرو بن سعید بن العاص لم یدرك النبيﷺ فهو تابعي.

٣ عن تنبیه المغترین ص٤١ للإمام الشعراني.

بەوە منداڵەکەی بۆ لاساری ساز دەکات و ئەو بەستەزمانە نەیزانیوە کە چاندنی خووڕەوشت مافێکی منداڵە لەسەر باوکی و هەروەك پێویستی خواردن و خواردنەوە وەهایە.

(ابن ماجه) دەگێڕێتەوە لە (ابن عباس)ەوەم کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((**أكرموا أولادكم وأحسنوا أدبهم**)). واتە: (ڕێز لە منداڵەکانتان بگرن و بەچاکی پەروەردەیان بکەن).

پێشینانی چاکیش ئاگایان لە گرنگی ئەدەب و ڕێز و پایەو شکۆدارییەکەی بووە، هەر بۆیە منداڵەکانی خۆیان بێدار کردۆتەوە لەسەری، و لەسەر ئەوە پەروەردەو گەورە بوون، و ئامۆژگاری خەڵکیشیان پێ‌کردوە، ئەوەتانێ هاوەڵی پایەبەرز (عبدالله کوڕی عمر) م[1] بانگەوازەکەی ئاڕاستەی باوکان و دایکان دەکات و بە وتارێکی نەرم و نیان هاوکێشەیەکی بیرکاری و یەکسانیەکی ژمێریاری دەخاتە بەردەمیان و دەڵێت: ئەدەبی منداڵەکەت بدە چونکە تۆ بەرپرسی لێی کە چیت ئەدەب داداوە؟ و چیت فێرکردووە؟ ئەویش بەرپرسیارە لە چاکبوون و گوێڕایەڵی بەرامبەر تۆ.

بەڵام با بزانین ئەم هەموو گرنگیو بایەخە گەورەیە بە ئەدەب دان بۆ؟ کە ببێتە خویەکی سروشتی لە دەروونی منداڵدا، دیارە ئەوەش لەبەر ئەوەیە کە:

لە ئەدەبی چاکدا ئەمانە بەدەست دەهێنێت: عەقڵێکی فراوان و تەواو، و لەعەقڵی فراوان و تەواویش جوانی نەریت، لە جوانی نەریتیش خووە باش و پەسەند کراوەکان، و لە خووە باش و پەسەندکراوەکانیش کاروکردەوەی چاك، لە کاروکردەوەی چاکیش ڕەزامەندی پەروەردگار، و لە ڕەزامەندی پەروەردگاریش موڵکی هەمیشەیی، لە ئەدەبی خراپیش خراپبوونی عەقڵ، و لە خراپبوونی عەقڵیش نەریتی خراپ، و لە نەریتی خراپیش خوی ناپەسەند، و لە خوی ناپەسەندیش کاری خراپ، و لە کاری خراپیش خەشم و توڕەیی خوای گەورە، لە خەشم و توڕەیی خوای گەورەش سەرشۆڕی هەمیشەیی بەدەست دەهێنێ.[2]

پێشینانی چاك بەو جۆرە ڕێنمونی منداڵەکانیان کردووە بۆ لای گرنگی و بایەخی ئەدەب و وەك میرات بۆیان بەجێ‌دەهێشتن، جا با پێکەوە بچینە خزمەت ژیانی ئەوانە و پێکەوە هەستمان ڕابگرین و گوێبیستیان بین و لێیانەوە فێر بین:

---

١ عن أحكام المولود –ص٢٢٥.

٢ نصيحة الملوك: ص١٧٣ للماوردي.

## ٢- چەند نموونەیەك لە ژیانی پێشینانی چاك:

(ڕُوَیـم كوڕی احمد بغدادی) بەكوڕەكەی دەڵێ: كوڕی خۆم! كردەوەكانت وەك خوێ لێ بكە و ئەدەبیشت وەك ئارد، واتە ئەدەبت زۆر بكە تا ڕێژەكەی لە ڕەفتارتدا وەك ڕێژەی ئارد بێت بـۆ ئەو خوێیەی تێی دەكرێت، ئەدەبێكی زۆر لەگەڵ كەمێك كرداری چاك، باشترە لـە كردارێكـی زۆر و ئەدەبێكی كەم.[1]

(ابراهیم كوڕی حبیب كوڕی شهید) دەڵێ: باوكم پێی وتم: بڕۆ خزمەت شارەزایان و زانایـان لێیانەوە فێرببەو لە ئەدەب و خووڕەوشت و ڕێنمونیەكانیان بەهرەمەند ببە، بەراستی ئەوە لای من خۆشەویستترە لە زۆر وەرگرتنی زۆری فەرموودە.[2]

هەندێك لە پێشین بە كـوڕی خۆیـان دەوت: كـوڕم فێـری دەروازەیـەكی ئـەدەب ببیـت لام خۆشەویسترە لەوەی كە فێری حەفتا دەروازە لە دەروازەكانی زانین ببیت.

(ابو زكریا العنبری) وتوویەتی:[3] زانست بەبێ ئەدەب وەك ئاگری بێدار وەهایە، ئـەدەبیش بەبێ زانین وەك گیانی بێلاشە وەهایە.بـەڵام ئایـە گـرنگترین سـیفەتەكانی ئـەدەب چـیە كـە پێغەمبەری خواﷺ تایبەتی كردووە تا منداڵانی بەرەو لای ئاراستە بكرێت و لـە دەروونیانـدا بچێنرێت، و پێیان ببەخشێت؟ جا لە ڕێی خوێندنەوەی فەرموودە پیرۆزەكانـەوە، نـۆ ڕێوشـوێن بەدەست هاتووە كە بریتیە لە:

## ٣- جۆرەكانی ئادابی پێغەمبەرﷺ بۆ منداڵان:[4]

### ١- ئەدەبی یەكەم لەگەڵ دایك و باوك:

(نووی) لە (الأذكار)دا دەروازەی (نهي الولد والمتعلم والتلميذ ينادي أبـاه ومعلمـه وشيخه بأسـه = قەدەغـەكردنی منـداڵ و فێرخـواز و قوتـابی كـە بـانگی بـاوكی و مامۆسـتاكەی و

---

١ ذكره الإمام القرافي في كتابه الفروق ٩٦/٣: عن رسالة المسترشدين للمحاسبي، تحقيق الشيخ عبـدالفتاح ابي غـدة ص٣١ ط٢

٢ الجامع الأخلاق الراوي وآداب السامع للخطيب البغدادي ص١/١٧.

٣ عن أدب الإملاء والأستملاء، للإمام السمعاني، وكتاب الجامع –للخطيب البغدادي ١٧/١.

٤ ئیمام (نووی) لە كتێبی (رياض الصالحين)دا بەشێكی تایبەتی ناونـاوە (كتـاب الادب) كە تێیدا ئـادابی زۆری باس كردووە كە تاكی موسڵمان پێویستی پێیانە، وە لەبەر ئەوە كە لێكۆڵینەوەكەی ئێمـە دەربـارەی منداڵان و ڕێنمونیەكانی پێغەمبەرەﷺ بۆیان، تەنها ئەوەمان خستەڕوو كە لەبارەی ئەوانەوە هـاتووە تـا لـەم قۆناغەدا بیبێتە بنچینە.

شەیخەکەی بەناوی خۆی بانگ بکات) هێناویەتەوە کە: لە کتێبی (ابن السنی) لە (ابوهریرە)ەوە ﷺ گێڕامانەوە کە پێغەمبەرﷺ پیاوێکی بینی کوڕێکی لەگەڵدا بوو، بەکوڕەکەی فەرموو: ئەوە کێیە؟ وتی ئەوە باوکمە، فەرمووی:((**فلا تمش أمامه ولا تستسب ولا تجلس قبله ولا تدعه بأسمه**)) واتە: (لەڕێگادا لەپێشیەوە مەڕۆ، و مەبە هۆی جنێودانی، و لەپێش ئەو دامەنیشە، و بەناوی خۆی بانگی مەکە).

نەوەوی لە راڤەی (تستسب لە = مەبە هۆی جنێودانی)دا دەڵێت: واتا کارێك مەکە کە باوکت تووشی ئەوە بێت جنێوت پێبدات وەك خۆتورەکردن و ئەدەب دادانت لەسەر کارە ناشیرینەکەت.

(ابن حجر الهیثمی)یش[1] چیرۆکێکی هاوشێوەی ئەو فەرموودەیەی هێناوە، بەلأم لەسەر (ابوهریرە) راوەستاوە (موقوف)، و سوودی باشی تێدایە کە لێرەدا بۆ سوودمەند بوون لێی باسی دەکەین:

لە (ابوغسان الضبی)ەوە دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: نیوەڕۆیەکی گەرم لەگەڵ باوکمدا دەڕۆیشتم، (ابوهریرە) پێم گەیشت و وتی: ئەوە کێیە؟ وتم: باوکمە، وتی: لەبەردەم باوکتەوە مەڕۆ، بەڵکو لە پشتیەوە یان تەنیشتیەوە بڕۆ، و رێگە بەکەس مەدە کە بکەوێتە نێوانتانەوە، و بەسەر خانوی باوکتدا بەشێوەیەك مەڕۆ بیترسێنی، و ئەو ئێسکە گۆشتە[2] مەخۆ کە باوکت تەماشای کردووە لەوانەیە حەزی لێی بێ.

### ئەدەبی قسەکردن لەگەڵ دایك و باوك:

(قرطبی) لە تەفسیرەکەیدا هێناویەتی کە (ابو البدّاح التجیبی) دەڵێ: بە (سعید کوڕی مسیب)م وت: هەموو ئەو شتانەی دەربارەی چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك هاتووە لە قورئاندا دەیزانم، تەنها ئەم فەرمایشتە نەبێت: ﴿وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا ﴾الأسراء/٢٣. ئەو قسە باش و بەڕێزە چی یە؟ (ابن المسیب) وتی: وتەی بەندەی تاوانبارە بەرامبەر گەورەو سەرکارە دلڕەقەکەی.[3] (عمر کوڕی خطاب)ﷺ لە راڤەی (القول الکریم)دا دەڵێت: ئەوەیە کە پێیان

---

١ في مجمع الزائد ١٣٦/٨.

٢ ئێسکە گۆشت کە لە دەقە عەرەبیەکەدا بە (عــرْق) هاتووە ئەو ئێسکەیە کە زۆربەی گۆشتەکەی لێکراوەتەوە. -وەرگێڕ-

٣ تفسیر القرطبي ٢٤٣/١٠ وتفسیر الرازي ١٩٠/٢٠.

بڵێت باوکەگیان (یاأبتاه) و دایکەگیان (یا أماه).[١]

(تاج الدین السبکی)یش دەڵێ: لە هەیوانی ماڵەکەماندا دانیشتبووم، سەگێك هات، منیش وتم: سەگی کوڕی سەگ، باوکم وتی: بە مەرجێ دروستە ئەم قسەیە بڵێی کە مەبەستت پێی سووك سەیرکردن نەبێت، وتم: ئەمەش سوودێکە.[٢]

با دروشمی منداڵانیش لەکاتی فێربوونی شتێك لە دایك و باوکیانەوە یاخود سوودمەندبوون لێیان ئەوەبێت کە بڵێن (ئەمەش سوودێکە) بۆ خۆشی و شادی خستنە دڵیان، و راهێنانی دەروونیان لەسەر خۆ بەکەم زانی، خوای گەورە من و تۆش سەرکەوتوو بکات بۆ ئەو کارە.

## ئەدەبی سەیرکردنی دایك و باوك:

(طبرانی) لە (ابن عباس)ەوەم گێڕاویەتیەوە کە دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ دەفەرمووێ:

((إذا نظر الوالد الی ولده فسرّه کان للولد عتق نسمة)) واتە: (ئەگەر باوك تەماشای منداڵەکەی کرد و دڵی پێی گەشایەوە، ئەوا وەك پاداشتی ئازادکردنی بەندەیەکە بۆ کوڕەکە.

وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەی ئەگەر سێسەد و شەست جار سەیری کرد؟)

فەرمووی: ((الله أکبر))[٣] خوا گەورەترە.

(مناوی)یش لە (فیض القدیر)دا لە (ابن عباس)ەوەم دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: هەر پیاوێك بەچاوی بەزەییەوە سەیری دایك و باوکی بکات خوای گەورە بەهۆی ئەوەوە حەجێکی وەرگیراوو دروستی بۆ دەنووسێت.[٤]

لە کۆتاییشدا ئەم بانگەوازەی یەکێك لە زانا چاکەکان دەخەینە ڕوو کە تێیدا رێگایەکی ئاشکرا دادەنێت بۆ ئەوەی وا لە منداڵ بکرێت واتای ئەدەب بەدەست بهێنێت، ئەویش بە

---

١ تفسیر الرازي ٢٠/١٩٠.
٢ عن رسالة المسترشدین ص١٢٥ ط٢ تحقیق الشیخ عبدالفتاح أبي غدة. أنظر التحقیق.
٣ اسناده حسن قاله الهیثمي ٨/١٥٦.
٤ فیض القدیر ٥/٤٨٣.

ڕەفتاری بەئەدەبانەی دایك و باوك لەگەڵیدا:

(بخاري) لە (ادب المفرد)[١]دا لە (ولید کوڕی نمیر)ەوە دەگێڕێتەوە کە گوێی لەباوکی بووە دەیوت: پێشان دەیانوت چاکبوون لە خواوەیەو ئەدەب دادانیش لە دایك و باوکانەوەیە.

بۆ ئەوەی منداڵیش زیاتر بەئەدەب و بەرز بێت ئەوا گوێت لە ئامۆژگاری باوکان بوو لە ڕاسپاردنی منداڵەکانیان لە پابەندبوون بە زانایانی چاك و بەدەستهێنانی ئەدەب لێیانەوە بەر لە وەرگرتنی زانین لێیان. منداڵ پێویستی بەوە هەیە کە فێری ئەدەبی هەڵس و کەوت کردن بێت لەگەڵ زانایاندا هەتا تەواو و بەشێوەیەکی چاك سوودمەند بێت.

## ٢- ئەدەبی دووەم لەگەڵ زانایاندا:

ئەنجامگیریەکەی ئیمامی (نووی)مان دەربارەی ئەو فەرموودەیەی کە (ابن سنی) گێراویەتیەوە باسکرد، و لە (کتاب الأذکار)دا لەژێر سەردێڕی (باب نهي الولد والمتعلم والتلميذ أن ينادي أباه ومعلمه وشيخه بأسمه) هێناویەتی، و دەڵێت: ئەوەی کە باسمان کرد دەربارەی ئەدەب لەگەڵ دایك و باوکدا، ئەدەب لەگەڵ زانایانیشدا بەهەمان شێوەیە، بەڵکو زیاتریش، چونکە زانایان میراتگری پێغەمبەرانن، هەر بۆیە ڕێزگرتنیان و قەدر زانینیان و ملکەچ کردن بۆیان و خێراچوون بۆ خزمەتکردنیان و دەنگ بەرزنەکردنەوە لە کۆڕ و دانیشتنیاندا، و هەڵس و کەوتی بەسۆز لەگەڵیاندا، و نەرم و نیان بوون بۆیان، هەموو ئەوانە پێویستی بەوە هەیە کە منداڵ لەسەری ڕابێت.

ئیمامی (غزالی)یش[٢] ئەو وتەیەی (یحیی کوڕی معاذ)ی دەربارەی پایەو ڕێزی زانایان هێناوەتەوە کە دەڵێ: زانایان لە دایك و باوك بەبەزەیترن بۆ ئوممەتی (محمد)ﷺ، وتیان: چۆن؟ وتی: چونکە باوکان و دایکان لە ئاگری دونیا دەیانپارێزن، بەڵام زاناکان لە ئاگری قیامەت دەیانپارێزن.

بەم جۆرە گرنگی و بایەخی ئەدەبمان لە خزمەت زانایان و قەدر زانینیان بۆ دەرکەوت، چەندین کتێب لەو بارەیەوە دانراوە، لەوانە کتێبی (أدب الأملاء والأستملاء)ی ئیمام (السمعانی)، وە کتێبی (أدب العالم والمتعلم)ی (ابن قتیبە).

---

١ الأدب المفرد ٧٣١/١.

٢ الإحياء ١١/١.

## أ- ئەو فەرموودانەی لەبارەی ئەدەب لەگەڵ زانایاندا هاتووە:

(طبرانی) لە (ابوامامە)ەوەﷺ گێڕاویەتیەوە کە دەڵێ: پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((**إن لقمان قال لأبنه: يا بني! عليك بمجالسة العلماء وأسمع كلام الحكماء، فإن الله يحيي القلب الميت، بنور الحكمة؛ كما يحيي الأرض الميتة، بوابل المطر**)).واتە: ((لقمان) بە کوڕەکەی فەرموو: کوڕەکەم! لە کۆڕ و مەجلیسی زانایاندا دابنیشە و گوێ لە قسەی دانایان بگرە، چونکە بەراستی خوای گەورە بە روناکی حیکمەت دڵی مردو زیندو دەکاتەوە هەروەك چۆن لێزمەباران زەوی وشك و رەقەڵان دەبوژێنێتەوە).

هەروەها ئیمامی (احمد) و (طبرانی) لە (عبادە کوڕی صامت)ەوە دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت: ((**ليس من أمتي من لم يجلّ كبيرنا ويرحم صغيرنا، ويعرف لعالمنا حقه**)). واتە: (ئەو کەسە لە ئێمە نیە کە قەدری گەورەکانمان نەگرێت و بەزەیی بە بچووکەکانمان نەیەتەوەو پایە و قەدری زاناکانمان نەزانێت).

هەروەها (طبرانی) لە (ابو امامە)ەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت: ((**ثلاثة لا سيتخف بهم الاّ منافق: ذو الشيبة في الإسلام، وذو العلم، وإمام مقسط**)). واتە: (سێ چین کەس هەن تەنها مرۆڤی دەغەڵ و دوڕو بە سووك سەیریان دەکات: ئەوکەسەی لە ئیسلامدا مووی پسی دەبێ، زانا، پێشەوای دادپەروەر).

## چەند نمونەیەك دەربارەی ئەدەبی منداڵانی پێشین بەرامبەر زانایان:

(سعید کوڕی مسیب) دوو رکعات نوێژی دەکرد پاشان دادەنیشت و منداڵانی هاوەڵانی پێغەمبەری خواﷺ بە موهاجیر و ئەنصارەوە لێی کۆدەبوونەوە، هیچ یەکێکیان نەیدەوێرا کە پرسیاری لێ بکات تا ئەو دەستی بە قسەکردن نەکردایە، یاخود کەسێك بۆ پرسیارکردن بهاتبایە و ئەمانیش گوێبیستی دەبوون،[١] پێشتریش فەرموودەیەکمان لەبارەی (ابن عمر) و بێدەنگ بوونی لە کۆڕ و مەجلیسی پێغەمبەری خواداﷺ خستە روو کاتێك کە پێغەمبەرﷺ پرسیارێکی ئاڕاستەکردن و ئەویش وەڵامی نەدایەوە بەهۆی ئامادەبوونی (ابوبکر) و (عمر) ﷺ لەو دانیشتنەدا، ئەمەش نمونەیەکە دەربارەی زانای ئوممەت (ابن عباس) م لەکاتی منداڵیدا،

١ أدب الأملاء والأستملاء ص٣٦.

کە داوای فێربوون و زانینی لە هاوەڵان کرد، بزانە ئەدەبی چۆن بووە:

(ابن کثیر) لە (بیهقی)ەوە دەگێڕێتەوە کە (عکرمـە) دەڵـێ: (ابـن عبـاس) م وتوویـەتی: کاتێك پێغەمبەری خواﷺ وەفاتی کرد، [1] بەپیاوێکی ئەنصاریم وت: وەرە با بڕۆین پرسـیار لـە هاوەڵانی پێغەمبەری خواﷺ بکـەین، چـونکە ئـەوان ئـەمڕۆ زۆرن، وتـی: سـەرم لـەتۆ سـوڕ دەمێنێت ئەی (ابن عباس)، لەو باوەڕەدای کە خەڵك پێویستیان بە تۆ هـەبێت، لـە کاتێکـدا ئەو هەموو هاوەڵانەی پێغەمبەری خواﷺ لەناو خەڵکدا هەن؟ دەڵێ: ئینجا وازی هێنا، بـەڵام من دەستم کرد بە پرسیار کردن لە هـاوەڵانی پێغەمبـەری خـواﷺ، هـەر فەرموودەیـەکم لـە پیاوێکەوە پێ دەگەیشت دەچوومە بەردەرگاکەی، خۆ ئەگەر لە نووستنی دوای نیوەڕۆدا بوایە، ئەوا لەسەر جل و بەرگەکانی خۆم لەبەر دەگاکەی پاڵم دەدایـەوە و ڕەشـەبا خـوڵی بەسـەرمدا دەکرد، کە دەهاتە دەرەوە و دەیدیتم و دەیوت: ئەی ئامۆزای پێغەمبەری خـواﷺ، چـی تـۆی گەیاندۆتە ئێرە؟ هەواڵت بناردبایە دەهاتم بۆ لات، دەموت: نەخێر، من شایانترم کـە بـێم بـۆ لات، دەڵێ: ئینجا پرسیاری فەرموودەکەم لێ دەکرد.. دەڵێ: ئەو پیاوە ئەنـصاریە ژیـا هـەتا چاوی پێم کەوتەوە، و دیتی کە خەڵکی لە دەورم کۆبوونەتەوەو پرسیارم لێ دەکەن، وتـی: ئـەم کوڕە لە من عاقڵ تر بوو. [2]

ئەوەش (حسن البصری) ڕێنمونی کوڕەکەی دەکات سەبارەت بە بەئەدەب بوون لـە کـۆڕ و دانیشتنی زاناياندا و دەڵێت: کوڕەکـەم! گـەر لای زانایـان دانیـشتیت زیـاتر سـووربە لەسـەر گوێگرتن نەك قسەکردن، فێری چاك گوێگرتن ببە هەروەك چۆن فێری جوان قسەکردن دەبیـت، قسە بەهیچ کەس مەبڕە با درێژە بکێشێت تا خۆی دەوەستێت.

لە کۆتایی گەڕانەکەمانـدا ئاکـاری هـاوەڵی منـداڵ (سمـرە کـوڕی جنـدب) لـە خزمـەت پێغەمبەری خواداﷺ و ئاکاری لە کۆڕ و مەجلیسەکەیدا دەخەینە ڕوو:

(بخاری) و (مسلم) لـە (ابوسـعد سمـرە کـوڕی جنـدب)ەوە گێڕاویانەتـەوە کـە وتوویـەتی: لەسەردەمی پێغەمبەرﷺ کوڕێك بووم، و شتم لە پێغەمبەرەوە دەبیست و لەبەرم دەکرد، بەڵام لەبەرئەوەی کە خەڵکی لەخۆم بەتەمەنتری لێبوو لەخزمەتیدا قسەم نەدەکرد.

---

[1] پێشتر وتەکەی (ابن عباس)مان هێنایەوە کە تەمەنی دەساڵان بـووە کاتێ پێغەمبـەری خـواﷺ وەفاتی کردووە.

[2] صفحات من صبر العلماء ط٢ ص٣٧.

## ٣- ئەدەبی سێیەم ئەدەبی ڕێز و قەدرگرتن:

(ترمذی) لە (انس کوڕی مالك)ەوەﷺ هێناویەتی کە وتوویەتی: پیاوێکی پیر هات و پێغەمبەری خوایﷺ دەویست، خەڵکەکەش سست بوون لە کردنەوەی جێگا بۆی، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((ليس منا من لم يرحم صغيرنا ويوقر كبيرنا))[١] واتە: (لەئێمە نیە ئەوکەسەی بەزەیی بە بچووکمانا نەیەتەوەو ڕێز و قەدری گەورەمان نەگرێت).

لە گێڕانەوەی (احمد) و (ترمذی) و (حاکم)دا کە لە (ابن عمر)ەوەیەم بە (مرفوع)ی وا هاتووە: ((ليس منا من لم يرحم صغيرنا ويعرف شرف كبيرنا))[٢] واتە: (لەئێمە نیە ئەو کەسەی بەزەیی بە بچووکمانا نەیەتەوەو ڕێزی گەورەمان نەزانێ).

وە لە گێڕانەوەی (احمد) و (حاکم)یش لە (عبادە کوڕی صامت)ەوە بە (مرفوع)ی وا هاتووە: ((ليس منا من لم يُجلّ كبيرنا ويرحم صغيرنا، ويعرف لعالمنا حقه)).[٣] واتە: (ئەو کەسە لە ئێمە نیە کە قەدری گەورەکانمان نەگرێت و بەزەیی بە بچووکەکانمان نەیەتەوەو شوێن و پایەی زاناکانمان نەزانێت).

(ابوداود)یش لە (ابوموسا)ەوەﷺ دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ دەفەرمووێت: ((إن من إجلال الله تعالى؛ إكرام ذي الشيبة المسلم، وحامل القرآن؛ غير الغالي فيه والجافي عنه، وإكرام ذي السلطان المقسط)). واتە: (لەبەرز و بڵند گرتنی خوای گەوریە، ڕێز و قەدرگرتنی موسڵمانی سەر و ریش سپی، و هەڵگری قورئانێك کە نەزیادەڕۆیی تیابکا و نە پشتی تێبکا، هەروەها ڕێزگرتنی دەسەڵاتدارێکی دادوەر).

لە (ابن عمر)ەوەﷺ دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خواﷺ دەفەرمووێت: ((أراني في المنام أتسوك بسواك فجاءني رجلان أحدهما أكبر من الآخر، فناولت السواك الآصغر، فقيل لي: كَبِّر، فدفعته الى الأكبر منهما)).[٤] واتە: (لەخەومدا سیواکم بە ددانەکانمدا دەهێنا، دوو پیاو هاتنە لام، یەکێکیان لەویتریان گەورەتر بوو، سیواکەکەم دا بە بچووکەکەیان، پێیان وتم: بەگەورە دەست پێبکە، ئیتر منیش دام بە گەورەکەیان).

---

١ صحيح. أنظر صحيح الجامع رقم ٥٤٤٥ ورواه احمد والطبراني عن ابن عباس.
٢ صحيح. أنظر صحيح الجامع رقم ٥٤٤٤.
٣ حسن. أنظر صحيح الجامع رقم ٥٤٤٣.
٤ رواه مسلم مسنداً والبخاري تعليقاً.

(بخاری) و (مسلم)یش لە (ابویحیی الانصاری)ەوە دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: (عبدالله کوڕی سهل) و (محیصە کوڕی مسعود) دەچن بۆ خەیبەر، لەو کاتەشدا خەیبەر لە (صلح)دا بوون، جا لێك جودا بوونەوە، پاشان (محیصە)یان بەکوژراوی هێنا بۆ لای (عبدالله) کە خەڵتانی خوێن ببوو، ئینجا گەڕایەوە (مدینە)، جا (عبدالرحمن کوڕی سهل) و (حویصە) هەردوو کوڕەکەی (مسعود) چوون بۆ لای پێغەمبەرﷺ، (عبدالرحمن) هات قسە بکات، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((کَبّر کَبّر)) واتە: (گەورە لەپێشا، گەورە لە پێشا)، مەبەستی ئەوەبوو کە با ئەوەی بەتەمەن گەورەترە یەکەمجار قسەبکات، (عبدالرحمن)یش لەهەموویان تەمەنی بچووکتر بوو.

جا براکەم! خوشکەکەم! ئا بەم شێوەیە گرنگیی و بایەخی ئەدەب و ڕێز و قەدرزانینی گەورەو زانایانمان بۆ دەرکەوت، و پێشخستنی گەورە بۆ قسەکردن مەگەر گەورەکە خۆی داوا لە بچووك بکات کە قسە بکات یاخود شوێنەکە شوێنی پرسیار کردن بێت.

## ٤- ئەدەبی چوارەم - ئەدەبی برایەتی:

ئەدەبی ڕێزگرتنی بچووك بۆ گەورەو قەدرزانینی، و بەزەیی هاتنەوەی گەورە بە بچووکدا خرایە ڕوو، پێغەمبەری خواﷺ ڕێگەی نەدەدا بەهیچ برایەك ئیدی بچووك بێت یان گەورە، کە بە هیچ جۆرە چەکێك ڕوو بکاتە براکەی بەمەبەستی ترساندنی، و ترس و لەرز خستنە دڵی:

(مسلم) لە (ابوهریرە)ەوەﷺ هێناویەتی کە دەفەرمووێت: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((من أشار الى أخيه بحديدة، فإن الملائكة تلعنه؛ حتى يدعه، وإن كان أخاه لأبيه وأمه)). واتە: (هەرکەسێك بە پارچەئاسنێ بەمەبەستی ترساندنی ئاماژە بۆ برای خۆی بکات، ئەوا فریشتەکان نەفرینی لێ دەکەن هەتا ئەوکاتەی وازی لێدێنێ، با ئەو کەسە برای دایك و باوکیشی بێت).

هەروەها پێغەمبەرﷺ بۆ منداڵانی دوویات کردۆتەوە کە برای گەورە ڕێز و پایەکی تایبەتی هەیە لە ئیسلامدا، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە بارگرانی خێزان و بەرپرسیارێتی پەروەردەکردنی خوشك و برابچووکەکانیو چاودێریکردنیانی لەئەستۆدایە: (طبرانی) لە (کلیب الجهنی)ەوەﷺ دەگێڕێتەوە -کە هاوەڵێتی کردووە- وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((الأكبر من الأخوة بمترلة الأب))[1] واتە: (برای گەورە لە پایەی باوکدایە).

---

١ قال الهيثمي: رواه الطبراني وفيه الواقدي وهو ضعيف. انظر المجمع ١٤٩/٨.

ئەگەر دایك و باوك سۆز و خۆشەویستی لە دڵی کوڕی گەورە بۆ خوشك و برا بچووکەکانی بچێنن، و ڕێز و قەدرزانینی براگەورەش لە دڵی بچووکەکاندا بچێنن، ئەوا خێزان بەشێوەیەکی هاوسەنگ دەڕوات بەڕێوەو هەموو یەکێکیان ئەرکی خۆی بەرامبەر ئەوی دی دەزانێت پێش ئەوەی مافی خۆی لەسەر ئەو بزانێت.

## ٥- ئەدەبی پێنجەم - ئەدەب لەگەڵ دراوسێ:

دراوسێ لە شەریعەتی ئیسلامدا زۆر مافی گەورەی هەیە، ئەوەش تەنها بۆ بەهێزکردنی پەیوەندیەکانی کۆمەڵگای ئیسلامییە، لەم نێوەندەدا منداڵ چەند خووڕەوشتێکی بۆ دیاریکراوە بەرامبەر منداڵی دراوسێی کە پێغەمبەرﷺ بانگەشەی باوکان و دایکانی کردووە تا منداڵەکانیان لەسەری رابهێنن، ئەمەش لەڕێی چاك هەستکرن بە ژان و ئازارەکانیو دورکەوتنەوە لە زیان پێگەیاندنی بەهەرشێوەیەك بێت لە شێوەکانی ئازاردان، لەپێش هەموویانەوە ڕێگە نەدان بە منداڵ کە لەدەرەوە شت بخوات، یاخود میوەیەکی بەدەستەوە بێت تا منداڵی دراوسێکانی پێی زویر بکات کە لەوانەیە دایك و باوکی توانای کڕینی ئەو شتەیان نەبێت، یاخود دراوسێکە لەو کاتەدا پارەیان نەبێت کە خێرا بۆی بکڕن، هەر بەهۆی ڕێگەنەدان بە منداڵ کە لە دەرەوەی ماڵ شت بخوات رادێن لەسەر ئەوەی کە لە ڕێگاوبان شت نەخۆن، بەڵکو لەماڵەوە بیخۆن، تا ئەوەش ببێتە ڕێگایەکی چاکتری پابەندبوون بە ئادابی گشتییەوە، هەروەك لەم رووەوە (الخرائطی) و (طبرانی) لە (عمر کوڕی شعیب)ەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((**وإن اشتريت فاكهة فأهد له، فإن لم تفعل فأدخلها سراً، ولا يخرج ولدك ليغيظ بها ولده**)). واتە: (ئەگەر میوەیەکت کڕی بەشی دراوسێکەتی لێ بدە، ئەگەر وات نەکرد ئەوا بەنهێنی و شاراوەیی بیبە ژوورەوە، با منداڵەکەشت نەیباتە دەرەوە تا منداڵی دراوسێکەتی پێ زویر بکات).

ئیسلام چەند مەزنە بەم ئادابانەوە کاتێ موسڵمانان پێوەی پابەند دەبن و کاری پێدەکەن، خوای گەورە یارمەتی من و ئێوەش بدات بۆ بەجێهێنانی ئەو کارە.

## ٦- ئەدەبی شەشەم - ئەدەبی مۆڵەت خواستن( الأستئذان ):

ئەدەبی مۆڵەت خواستن ئەرکی سەرشانی گەورەو بچووکە و، جێگایەکی تایبەتی هەیە لە شەریعەتی ئیسلامدا بەشێوەیەك که خوای گەورە ئایەتی بۆ تەرخان کردوە کە بەسەر هەموو نەوەکاندا بخوێندرێتەوە، بۆ هەموو سەردەمەکانیش و، گرنگی و بایەخێکی گەورەشی هەیە لە ژیانی کۆمەڵایەتیو خێزانیدا، لەبەر ئەوەش بوو کە منداڵانی هاوەڵان دەیانزانی، وەك (ابو سعید الخدری)ﷺ ئەمە وێرای گەورەکانیان.

(بخاری) لە (ادب المفرد)دا لە (عبید کوڕی عمیر)ەوە گێڕاویەتیەوە کە (ابوموسا الاشعری) مۆڵەتی خواست لە (عمر کوڕی خطاب)ﷺ بۆ چوونە ژوورەوە، ئەویش مۆڵەتی نەدا وەك ئەوەی سەرقاڵ بێت، (ابوموسا) گەڕایەوەو (عمر)یش کارەکەی تەواو کردو وتی: ئەرێ ئەوە دەنگی (عبدالله کوڕی قیس) نەبوو هاتە بەرگوێم؟ مۆڵەتی بدەن. وتیان:گەڕاوەتەوە، بانگی کرد، ئەویش وتی: ئێمە بەو جۆرە فەرمانمان پێدەکرا، (عمر) وتی: دەبێت لەسەر ئەوە بەڵگەم بۆ بێنیت، (ابوموسا) ڕۆشت بۆ لای کۆڕی ئەنصاریەکان و پرسیاری لێ کردن، وتیان: کەس شایەتیت بۆ نادات لەسەر ئەوە تەنها (ابوسعید الخدری)ﷺ نەبێت، کە بچووکترین کەسمانە، ئەویش (ابو سعید)ی لەگەڵ خۆی برد، (عمر) وتی: ئەو فەرمانەی پێغەمبەری خوامﷺ لەیاد چووبوو، کاروباری بازرگانی سەرقاڵی کردم.

(عمر)ی ئەمیری بڕواداران ﷺ لەبیری چووبوو کە کاتێ ڕێگەی چوونەژوورەوە نادرێت بەکەسێ پێویستە لەسەری کە بەبێ هیچ توڕەبوون و ڕق هەستانێك لە کوێوە هاتووە بۆ ئەوێ بگەڕێتەوە، ئەو شاهیدەش کە ناوی هێنرابوو بە شاهێد لەسەر سوننەتی پێغەمبەری خواﷺ (ابوسعدی الخدری)ﷺ بوو.

قورئانی پیرۆزیش منداڵ رادەهێنێت لەسەر مۆڵەت خواستن و فەرمان بەدایك و باوکان دەکات کە دەستوری مۆڵەتخواستن فێری منداڵەکانیان بکەن، لە یاسای مۆڵەتخواستنیشدا پلەبەندی بەکارهێناوە، جا پێش بالغ بوون" لە سێ‌کاتی ناوەخت لە ژیانی ژن و مێردایەتی دایك و باوکدا منداڵ مۆڵەت دەخوازێت، ئەوانیش پێش نوێژی بەیانی، دوای نیوەڕۆ، دوای نوێژی خەوتنان، واتە لەو کاتانەدا کە دایك و باوك تەنها دەبن و دەخەون و هەریەکەشیان جلی تایبەتی خۆی لەبەردایە، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لِيَسْتَـْٔذِنكُمُ ٱلَّذِينَ

مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ وَٱلَّذِينَ لَمْ يَبْلُغُوا۟ ٱلْحُلُمَ مِنكُمْ ثَلَٰثَ مَرَّٰتٍ ۚ مِّن قَبْلِ صَلَوٰةِ ٱلْفَجْرِ وَحِينَ تَضَعُونَ ثِيَابَكُم مِّنَ ٱلظَّهِيرَةِ وَمِنۢ بَعْدِ صَلَوٰةِ ٱلْعِشَآءِ ۚ ثَلَٰثُ عَوْرَٰتٍ لَّكُمْ ۚ لَيْسَ عَلَيْكُمْ وَلَا عَلَيْهِمْ جُنَاحٌۢ بَعْدَهُنَّ ۚ طَوَّٰفُونَ عَلَيْكُم بَعْضُكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴾النور/٥٨. واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، با ئەو خزمەتکارو منداڵانەتان کە نەگەیشتونەتە تەمەنی باڵغ بوون، لەسێ کاتدا مۆڵەت بخوازن –لەچوونە ژووری نووستنی دایك و باوك-: پێش نوێژی بەیانی، کاتی نیوەڕۆ کە لەبەر گەرما و بۆ حەوانەوە پۆشاك دادەنێن، لەدوای نوێژی خەوتنان، ئەم سێ کاتە عەورەتن بۆ ئێوە، لەدوای ئەو سێ کاتە ئیتر تاوان لەسەر ئێوە و ئەوان نیە بگەڕێن بەسەر یەکتردا و بچن بۆلای یەکتر، ئا بەم شێوەیە خوا ئایەتەکانتان بۆ رون دەکاتەوە، خوای گەورە زانا و دانایە).

هەتا گەر منداڵەکە باڵغ دەبێت و لە باڵغ بوون نزیك دەبێتەوە، و دەگاتە تەمەنی ئەرکباریەوە فەرمانی پێکراوە بە مۆڵەت خواستن لە هەموو کاتێکدا، لە ماڵەوە و شوێنی دیکە وهەرجێگایەکی دی کە دەرگای داخراوی هاتە پێش، ئایەتەکەش ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە: ﴿ وَإِذَا بَلَغَ ٱلْأَطْفَٰلُ مِنكُمُ ٱلْحُلُمَ فَلْيَسْتَـْٔذِنُوا۟ كَمَا ٱسْتَـْٔذَنَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴾النور/٥٩. واتە: (هەرکاتێك منداڵەکانتان گەیشتنە تەمەنی باڵغ بوون با مۆڵەت بخوازن، هەروەکو ئەوانەی پێش خۆیان مۆڵەتیان دەخواست، بەم شێوەیە خوا ئایەتەکانی خۆیتان بۆ روون دەکاتەوە، بەراستی ئەو خوایە زاناو دانایە).

## پێغەمبەری خواﷺ چۆن مۆڵەتی دەخواست؟

مرۆڤ پرسیار دەکات کە ئایا کاتێ لە دەرگا دەدات دەبێت چۆن بوەستێت؟ ئایا روبەڕوی دەرگا بوەستێت، یاخود لەپشتی دەرگاوە یان لە ناوەڕاستیدا.. بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارەش ئەم فەرموودەیەی خوارەوە دەهێنین:

ئیمام (احمد) و (ابوداود) لە (عبدالله کوڕی بسر)ەوە هێناویانە کە پێغەمبەرﷺ ئەگەر بچوایەتە بەر دەرگایەك و بیویستایە مۆڵەت بخوازێت، بەرامبەر دەرگاکە نەدەوەستا، لەلای راست یان چەپیەوە دەوەستا، ئەگەر مۆڵەتی پێبدرایە دەچووە ژوورەوەو ئەگینا دەڕۆیشت.

## پێغەمبەری پێشەنگ مۆڵەت لە منداڵان دەخوازێت:

لە راستیدا رەوا هەر رەوایە، گەورەو بچووکی بۆ نیە، شوێنکەوتنی سوننەتیش لەسەر هەموان پێویستە، پلەو پایەیان هەرچەند بەرز بێت، ئەوەتا پێغەمبەرﷺ کە پێشەواو مامۆستای ئوممەتە، رێنمایی گەورەو بچووکی ئوممەت هەموو دەکات و مافی منداڵیان ئاشنا دەکات:

(بخاری) و (مسلم) لە(سهل کوری سعد)ەوە هێناویانە کە پێغەمبەری خواﷺ خواردنەوەیەکیان بۆ هێنا، ئەویش لێی خواردەوە، لەلای راستیەوە منداڵێك هەبوو، لەلای چەپیشیەوە چەند پیاوێکی پیر، جا بە منداڵەکەی فەرموو: ((**أتأذن لي أن أعطي هؤلاء**))واتە: (ئایە مۆڵەتم پێدەدەیت کە بیدەم بەوانە؟ (واتە پیاوە پیرەکانی لای چەپ) منداڵەکە[1] وتی: نەبەخوا ئەی پێغەمبەری خوا! کەس پێش خۆم ناخەم لەوەی کە تۆ بۆ منت داناوە، ئەویش پێیدا).

## ٧- ئەدەبی حەوتەم - ئەدەبی نانخواردن:

لە(عمرکوری ابوسلمه)ەوەﷺ هێناویانە کە دەڵێت:[2] منداڵ بووم لە کۆشی پێغەمبەری خواﷺ بووم، دەستم رادەکێشا بۆ ناو قاپەکان، پێغەمبەرﷺ پێی فەرمووم: ((**یا غلام! سم الله تعالی، وکل بیمینك، وکل مما یلیك**))[3] واتە: (ئەی منداڵ! ناوی خوای گەورە بهێنە و، بەدەستی راست بخۆ، و لەبەردەم خۆتەوە بخۆ).

هەتا ئێستاش هەر بەوشێوەیە نان دەخۆم.

ئیمام (احمد)یش لە (انس)ەوەﷺ دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: (ام سلیم) زەمبیلێکی پێدا ناردم بۆ پێغەمبەری خواﷺ کە خورمای تەڕی تێدا بوو، لەماڵی خۆی نەمدۆزیەوەو لەوکاتەدا چووبوو بۆ ماڵی خزمەتکارێکی کە بانگهێشتی کردبوو و خواردنی بۆ دروست کردبوو، دەڵێ: منیش چووم بۆ خزمەتی خەریکی خواردن بوو، بانگی کردم نانی لەگەڵ بخۆم، دەڵێ: تێکۆشەی

---

١ لە ریوایەتێکی دیکەدا وا هاتووە کە (ابن عباس) بووە، و لای چەپیشی (ابوبکر) بووە.

٢ أخرجه البخاري ومسلم ومالك وابوداود والترمذي.

٣ شت خواردن لەبەردەمی خۆت، ئەوە بۆ ئەو خواردنەیە کە شلە بێت، بەڵام گەر خواردنەکە دانەدانە بوو دەژمێردرا، وەك میوەو شتیتر، ئەوا دروستە لەبەردەمی خۆت نەخۆیت" چونکە وادەبێ چەند دانەیەکی گەورە لە خواردنەکە هەبێت و ئەوکەسەش دانەی بچووکی دەوێت، یان لەبەردەمیدا سێو هەیە ئەو پرتەقاڵی دەوێت، جا ئەو کاتە هەڵبژاردن زیانی نیە گەر خواردنەکە وشك و ژمارەدار بوو، خواش زاناترە.

گۆشت و کولەکەی بۆ دروست کردبوو، دەڵێ: ئەو زۆر حەزی لە کولەکە دەکرد، منیش کۆمدەکردەوەو دەمخستە بەردەمی، دەڵێ: کە نانی خوارد گەڕایەوە بۆ ماڵی خۆی، دەڵێ: زەمبیلەکەم لەبەر دەستی دانا، دەڵێ: دەستی کرد بە خواردن و دابەش کردنی هەتا کۆتایی پێهێنا.

## ئەگەر منداڵێك لەکاتی نانخواردندا هات بۆ لات چی دەکەیت؟

(طبرانی) لە (اسحاق کوڕی یحیی کوڕی طلحة)ەوە دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: لەمزگەوت لەگەڵ (عیسی کوڕی طلحة)دا بووم، (سائب کوڕی یزید) هاتە ژوورەوە، ناردمی بۆ لای و وتی: برۆ بۆ لای ئەو پیاوەپیرەو پێی بڵێ: (إبن طلحة)ی مامم پێت دەڵێ ئایا پێغەمبەری خوات ﷺ بینیوە؟ منیش چوم بۆ لای و پێم وت: ئایا پێغەمبەری خوات ﷺ بینیوە؟ وتی: بەڵێ، پێغەمبەری خوام ﷺ بینیوە، من و چەند منداڵێکی دیکە چوین بۆ خزمەتی، بینیمان خورمای دەخوارد کە لەناو دەفرێکدا بوو و خەڵکانێك لە هاوەڵانی لەگەڵدا بوو، هەریەکەو مشتێکی لەو خورمایە پێدەداین و دەستی بەسەرماندا دەهێنا.

ئیمام (غزالی) لە کتێبی (الإحیاء)دا بەرگی سێیەم لەوبارەیەوە بەئاگامان دێنێت دەربارەی دەستوری نانخواردن کە منداڵ پێویستی پێیەتی، کە لە تێکڕای دەستورە ئیسلامیەکانی دەرهێناوە، لێرەدا دەیخەینە بەردەستت:

یەکەم سیفەت لە سیفەتەکان کە بەسەر منداڵدا زاڵ بێت نانخواردنی خێرایە، پێویستە لەو بارەوە فێربکرێت، وەك:

١- تەنها بەدەستی راست خواردن بخوات و بڵێت (بسم الله).

٢- لەبەردەمی خۆیەوە بخوات.

٣- پێش کەسانی تر دەست بۆ خواردنەکە نەبات.

٤- سەرنجی خواردنەکە و ئەوکەسانەی نان دەخۆن نەدات.

٥- بە پەلە نان نەخوات.

٦- خواردنەکە باش بجوێت.

٧- پاروەکانی بەسەر یەکدا نەکا بە دەمیدا.

٨- دەست و جلەکانی پیس نەکات.

٩- رابهێنرێت لەسەر ئەوەی جارجار خواردنی باش و جارجاریش تەنها نانی وشك بخوات، بەجۆرێك وا نەزانێت ئەمە بەردەوام دەبێت.

١٠- زۆرخواردنی لا ناشیرین بکرێت و زۆرخۆر بە ئاژەڵ بچوێنرێت.

١١- لەبەرچاوی سەرزەنشتی زۆرخواردن بکرێت و مەدحی ئەو منداڵە بکات کە بەئەدەب و کەم خۆرە، و ئەوەی لا خۆشەویست بکرێت کە حەز بکات خەڵکیتر پێش ئەو خواردنەکە بخوات و زۆر گوێشی پێنەدات.

١٢- رازی بوون و قەناعەت بە خواردنی زبر.

## ٨- ئەدەبی هەشتەم - ئەدەبی رواڵەتی منداڵ:

پێغەمبەرﷺ گرنگی و بایەخی داوە بە روکەشی منداڵ، ئیدی لە پرچ و سەرتاشیندا بێت یاخود لە رەنگی جل و بەرگ و چوونەدەرەوە بێت پێوەی.

### ١) ئەدەبی پرچ و سەرتاشین:

لە (ابن عمر)ەوە م دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ کورێکی بینی هەندێك لە پرچی سەری تاشرابوو و هەندێکیشی نەتاشرابوو، جا قەدەغەی ئەم جۆرە پرچ تاشینەی کرد و فەرمووی: ((أحلقوه كلّه أو اتركوه كلّه))[1] واتە: یان هەمووی بتاشن یان هەموی مەتاشن.

هەروەها لە (ابن عمر)ەوە م هاتووە کە وتوویەتی: پێغەمبەرﷺ رێگری لە قۆچکە تاش (قزع) کردووە.[2]

(ابن قیم) لە (احکام المولود)دا دەربارەی ئەم فەرموودەیە دەڵێ: قۆچکەتاش(القزع) ئەوەیە کە بەشێکی سەر بتاشرێت و هەندێکی بهێڵرێتەوە.

قۆچکەتاش چوار جۆرە:

---

١ رواه ابوداود بأسناد صحيح على شرط البخاري ومسلم.

٢ في الصحيحين عنه، ورواه ابوحنيفة وأخرجه الستة الا الترمذي. قاله الزبيدي في كتاب (عقود الجواهر المنيفة)٢/١٥٦.

یەکەمیان: لەم لاو لەو لاوە هەندێکی سەر بتاشرێت، (القزع) لە (تَقَزُّع السحاب) هاتووە بەمانای پارچەپارچەبوونی هەور.

دووەمیان: ناوەڕاستی سەر بتاشرێت و لاکانی بەجێ بهێڵرێت، هەروەکو (شماسە)[1]ی گاورەکان دەیکەن.

سێیەمیان: لایەکانی دەتاشرێت و ناوەڕاستەکەی دەهێڵرێتەوە، هەروەك گەمژەو عەقڵ سووکەکان دەیکەن.

چوارەمیان: پێشی سەر بتاشرێت و دواوەی بەجێبهێڵرێت.

جا ئەمانە هەمووی قوچکەتاشەو خواش زاناترە.

پێغەمبەرﷺ خودی خۆی سەرپەرشتی سەرتاشینی مندالآنی دەکرد:

لە (عبدالله کوڕی جعفر)ەوەم دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خواﷺ سێ ڕۆژ مۆڵەتی خاوخێزانەکەی (جعفر) دا کە بۆی بگرین، پاشان هاتە لایان و فەرمووی: ((**لا تبكوا على أخي بعد اليوم**)) لەمڕۆ بەدواوە بۆ (جعفر)ی برام مەگرین.

ئینجا فەرمووی: برازاکانم بۆ بانگ بکەن، جا ئێمەیان هێنا بۆ خزمەتی دەتگوت بێچووە(فرخە) مەلین، فەرمووی: ئادەی سەرتاشەکەم بۆ بانگ بکەن، کە هات فەرمانی پێکردو سەرمانی تاشی.[2]

بەڵام سەبارەت بە پرچی کچان، ئەوانیش لە ڕێنمونیەکانی پێغەمبەرﷺ بەشی خۆیان هەیە:

لە هەردوو (صحيح)ەکەدا دەگێڕنەوە لە (اسماء)ەوەڵ کە ژنێك پرسیاری لە پێغەمبەرﷺ کرد و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، کچەکەم سورێژەی گرت و قژەکەی روتاوەتەوەو داویشمە بەشوو، ئایا دەبێت قژی تر بدەمە دەم قژەکەی؟

---

۱ (شماسة) کۆی (شمامسة)یە ئەو کەسەیە کە خزمەتی کەنیسە دەکات و پلەکەی لەخوار (قەشە)وەیە. —وەرگێڕ—

۲ رواه ابوداود بأسناد صحيح على شرط البخاري ومسلم.

فەرمووی: ((لعن الله الواصلة والموصلة))[1] واتە: (نەفرینی خوا لەو ژنەی قـژ دەداتـە دەم قژی خۆی یان قژی ژنێکی تر، وە لەو ژنەی کە دەیەوێت قژ بدەنە دەم قژی).

بەمجۆرە دەبینین کە قژی منداڵی موسڵمان جیاوازە لە منداڵێ دیکە، و بەدوای شێوەو باوە گۆڕاوەکاندا راکەراك ناکات و شوێن ئەکتەرە بۆش و بەتاڵەکانیش ناکەوێت، و دوورن لەهەموو رێنموونیەك کە پێچەوانەی خۆشەویستەکەی و پێغەمبەرەکەیﷺ بێت.

## ٢) دەستووری رەنگی جل و بەرگ

(مـسلم) لـە (عبـدالله کـوڕی عمـرو کـوڕی عـاص)ەوەش دەگێڕێتـەوە کـە وتوویـەتی: پێغەمبەرﷺ دوو کراسی رەنگکراو بەرەنگی زەردی لەبەرمدا بینی، فـەرمووی: ئایـا دایکـت فەرمانی ئەوەی پێکردیت؟ وتم: بیانشۆم؟ فەرمووی: نەخێر بیانسووتێنە.

لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا هاتووە: ((إن هذه من ثياب الكفار فلا تلبسها)). واتـە: (ئـەوە لە جل و بەرگی کافرانە، بۆیە لەبەری مەکە).

ئیمام (غزالی)یش لە بەرگی سـێیەمی (الإحیـاء)دا دەربـارەی دەسـتووری جـل و بـەرگی منداڵی کوڕ چەند رێنموونیەکی باشی هێناوە کە دەڵێت: واباشە منـداڵی کـوڕ جـل و بـەرگی سپی لا خۆشەویست بکەن لەبری رەنگاو رەنـگ و ئاوریـشم، و وای پێـشان بـدرێت کـە ئـەو رەنگانە جلی ئـافرەت و نێرەمووکەکانـە و، پیـاوان خۆیـان لێ دوور دەگـرن و بۆیـان بـەباش نازانرێت، و هەرکاتێك پۆشاکێکی ئاوریشم یان رەنگـاو رەنـگ لەبـەر کـوڕدا ببینرێـت ئـەوا پێویستە ناڕەزایی لە ئاستیدا دەرببڕدرێت و سەرزەنشتی بکرێت.

وە پێویستە منداڵ بپارێزرێت لەو منداڵانەی کە لەسەر خۆشـگوزەرانی و پۆشـینی جـل و بەرگی گرانبەها راهاتوون.

## حەرامکردنی لەبەرکردنی ئاوریشم:

لە سەر ئەو بنەمایەی کە پێغەمبەری خواﷺ دایناوە لە لاسایی نەکردنـەوەی بێبـاوەڕ لـە جل و بەرگدا، هەروەك لە فەرموودەکەی پێشودا باسکرا ((ئەوە لە جل و بەرگی کافرانە، بۆیە لەبەری مەکە))، لەوکاتەوەی کە منداڵ چاوی دەکاتـەوە، جـا ڕادەهێنرێـت لەسـەر سـوننەتی

---

[1] بەڵام قژی دەستکرد واتە قژی زیندەوەر نەبێت رێپێدراوە هـەروەك لـە حاشیەی (ابـن عابـدین) هاتووە.

پێغەمبەری خواﷺ و دوور دەخرێتەوە لە جل و بەرگی قەدەغەکراو، هەر ئەوەشە کە هاوەڵی پایەبەرز بەوپەڕی لێبڕاویو توندوتۆڵیەوە پەیڕەوی کردووە:

(طبراني) لە (عبدالله کوڕی یزید)ەوە گێڕاویەتیەوە کە وتوویەتی: لەلای (عبدالله) بووین - واتە (ابن مسعود)ﷺ-، کوڕێکی هات کراسێکی ئاوریشمی لەبەردا بوو، وتی: کێ کردیە بەرت؟ وتی: دایکم، دەڵێ: جا دڕاندی و وتی: بە دایکت بڵێ پۆشاکێکی دیکەت لەبەر بکات.[1]

ئیمام (کاسانی) لە (بدائع الصنائع)دا[2] کە باسی قەدەغەکردنی پۆشینی ئاوریشم بۆ پیاوان دەکات دەڵێت:

لە حەرامی ئاوریشمدا جیاوازی نیە لەنێوان گەورەو بچووك کە نێر بێت، چونکە پێغەمبەرﷺ مەبەستی لەو حوکمەی نێرینە بووە، هەروەك لەم فەرموودەیەیدا هاتووە کە دەفەرمووێت: ((**هذان حرامان على ذكور امتي**)) واتە: (ئەم دوانە لەسەر نێرینەکانی ئوممەتەکەم حەرام کراون، بەڵام ئەو کەسەی پۆشاکەکەی لەبەر دەکرێت، گەر منداڵ بوو ئەوا تاوانەکەی لەسەر ئەوکەسەیە کە لەبەری کردووە نەك خۆی، چونکە لەو کەسانە نیە کە لە ئەهلی حەرامکردن بێت، وەك ئەو منداڵەی کە عارەقی پێدەدرێ و دەیخواتەوە، ئەوا گوناهەکەی لەسەر ئەو کەسەیە کە پێی داوە نەك لەسەر خۆی، ئەوەی ئێرەش بەهەمان شێوەیە).

(ابن القیم) دەڵێت: حەرامە لەسەر بەخێوکەر کە جل و بەرگی ئاوریشم بکاتە بەر کوڕ، بەهۆی ئەوەی لەسەر ئەو سیفەتە مێیینەییە پەروەردە دەبێت.

## ٩- ئەدەبی نۆیەم - ئەدەبی گوێگرتن و بێدەنگی لەکاتی خوێندنەوەی قورئاندا:

(ابن جبیر) گێڕاویەتیەوەو سەنەدەکەی داوەتە پاڵ (زهری)، هەروەك (ابن کثیر) لە تەفسیرەکەیدا (٢/٢٨٠) باسی کردووە، وتوویەتی: ئەم ئایەتە لەسەر گەنجێکی ئەنصاری دابەزی کە کاتێك پێغەمبەری خواﷺ چەن ئایەتێکی لە قورئان بخوێندایەتەوە ئەویش لەگەڵی دەخوێندەوە، جا ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥ وَأَنصِتُوا۟ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾الأعراف/٢٠٤. واتە: (هەرکاتێ قورئان خوێنرا، گوێی بۆ بگرن و بێدەنگ بن بەڵکو خوای میهرەبان بەزەیی پێتاندا بێتەوە).

---

١ رواه الطبراني بأسنادين ورجال أحدهما رجال صحيح. قاله الهيثمي في المجمع ٥/١٤٤.
٢ بدائع الصنائع ٥/١٣١.

## بنەمای رەوشتی دووەم - رەوشتی راستگۆیی :

رەوشتی راستگۆیی بنەمایەکی گرنگە لە بنەماکانی خوورەوشتی ئیسلامی، کە پێویستی بە هەوڵ و کۆشش هەیە بۆ چەسپاندن و دامەزراندنی، پێغەمبەری خواشﷺ گرنگی داوە بە چەسپاندنی ئەم رەوشتە لە منداڵدا، کەوا چاودێری هەڵس و کەوتی دایك و باوك دەکات لەگەڵ منداڵەکەدا، ئەمەش بۆ دوورکەوتنەوەی دایك و باوك لە کەوتنە ناو کاری ناپەسەندی درۆ لەگەڵ منداڵدا، جا بنەمایەکی گشتی دادەنێت کە منداڵ مرۆڤەو مافی ئەوەی هەیە کە مرۆڤانە هەڵس و کەوتی لەگەڵدا بکرێت و رێگە نەدرێت بە دایك و باوك بەهیچ شێوەیەك هەلی بخەڵەتێنن و پشتگوێی بخەن لە هەڵس و کەوتیان لەگەڵیدا.

(ابوداود) لە (عبدالله کوڕی عامر)ەوە دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: رۆژێکیان دایکم بانگی کردم و پێغەمبەری خواشﷺ لە ماڵمان دانیشتبوو، دایکم وتی: وەرە شتێکت دەدەمێ، پێغەمبەری خواشﷺ پێی فەرموو: دەتویست چی بدەیتێ؟ وتی: دەمویست خورمای بدەمێ، فەرمووی: ((**أما إنك لو لم تعطه شيئاً كتب عليك كذبة**)). واتە: (خۆ ئەگەر هیچت پێنەدایە ئەوا بە درۆ لەسەرت دەنووسرا).

ئیمام (احمد)یش لە (ابوهریرە)ەوەﷺ دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((**من قال لصبي تعال هاكَ أعطيكَ ولم يعطه كُتب كذبة**)) واتە: (هەرکەسێ منداڵێك بانگ بکات و بڵێ وەرە ئەوەت بدەمێ و نەیداتێ بەدرۆ بۆی دەنووسرێت).

(ترمذی)ش لە (ابوحوراء السعدی کوڕی ربیعە کوڕی شیبان)ەوە هێناویەتی کە وتوویەتی: بە(حسین کوڕی علی)م م وت: چیت لە پێغەمبەری خواوەﷺ لەبەر کردووە، وتی: ئەم فەرموودەیەم لەوەوە لەبەر کردووە: ((**دع ما يريبك الا ما لا يريبك، فإن الصدق طمأنينة والكذب ريبة**)). واتە: (وازبێنە لەوەی گومانی تێدایە بۆ ئەوەی کە گومانی تێدا نیە، چونکە راستی دڵنیاییەو درۆش گومانە).

پێشینانی چاکیش بایەخیان بە چەسپاندنی ئەم رەوشتە دەدا، کە یەکێك لە لقەکانی راستگۆیی وادەو پەیمانە، ئیدی وادەو پەیمانی گەورەکان بێت لەگەڵ منداڵان، یاخود وادەو بەڵێنی منداڵان بێت لەنێوخۆیاندا.

ئیمام (سمعانی)[١] لە (ابواسحاق) و ئەویش لە (ابو احوص) و ئەویش لە (عبدالله)ەوە

---

١ أدب الإملاء والإستملاء ص٤٠.

دەگێڕنەوە کە وتوویەتی:خۆ دوور بگرن لە گێڕانەوە، گێڕانەوەی درۆ، چونکە درۆ بۆ گاڵتەوگەپ ناگونجێت، وە کەستان پەیمان بە منداڵێکی نەدات و پاشان بۆی جێبەجێ نەکات.

هەروەها لە (يحيى)ەوە گێڕاویەتیەوە کە (سليمان کوڕی داود) بە کوڕەکەی فەرموو: کوڕی ئازیزم! ئەگەر بەڵێنت دا بیبە سەر، چونکە گەر وا نەکەیت ئەوا خۆشەویستی بە رق و کینە دەگۆڕێتەوە.

## بنەمای رەوشتی سێیەم - رەوشتی نهێنی پاراستن:

پێغەمبەری خواﷺ گرنگی داوە بە پەروەردەکردنی منداڵ لەسەر نهێنی پۆشی، چونکە نهێنی پۆشی واتا چاکبوونی منداڵ لە ئێستا و دوارۆژی و سەلامەتی خێزان و بەرەوپێش چونی، و پاراستنی کۆمەڵگەو بنیاتەکەی.

ئەو منداڵەی لەسەر شاردنەوەی نهێنیەکان رادێت لەسەر ئیرادەیەکی بەهێز و ورەبەرزی و زمان پاراستن پێ‌دەگات، بەمەش متمانەی کۆمەڵایەتی لەنێوان خەڵکدا دروست دەبێت بە پاراستنی نهێنیەکانی یەکدی.

(مسلم) لە (عبدالله کوڕی جعفر)ەوە م هێناویەتی کە وتوویەتی: رۆژێکیان پێغەمبەری خواﷺ لەدوای خۆی داینام و نهێنی یەکی پێ وتم کە بۆ هیچ کەسی نەگێڕمەوە، و چاکترین شتێك کە پێغەمبەرﷺ خۆی پێ پەنادابێت بۆ دەست بەئاو گەیاندن بەردی گەورەو پەلکی دارخورما بووە.

پێشتریش ئەو فەرموودەیەی (انس)ﷺ و خزمەتکردنی پێغەمبەرﷺ و دواکەوتنی لە دایکی باسکرا، کە دایکی وتی: بۆ دواکەوتیت؟ وتم: پێغەمبەرﷺ ناردمی بۆ کارێکی پێویستی خۆی، ئەویش وتی: ئەو کارە چی یە؟ وتم: ئەوە نهێنیە، ئەو دایکە بڕوادارە هۆشیارە زیرەك و بینایە بۆ ئەوەی پەند و وانەیەك بە دایکان بدات کە منداڵەکانیان فێری نهێنی پارێزی بکەن، ئەوەبوو وتی: نهێنی پێغەمبەری خواﷺ بۆ کەس باس مەکە.

## بنەمای خووڕەوشتی چوارەم: ڕەوشتی دەستپاکی:

دەستپاکی(الأمانة) ڕەوشتێکی ڕەسەنە و سەروەرمان محمد ﷺ لەسەردەمی منداڵێتیەوە پێی ناسرابوو تا کاتی هاتنە خوارەوەی قورئان بۆی، تەنانەت موشریکەکانیش بە (صادق الامین = ڕاستگۆی دەستپاك) وەسفیان دەکرد، ئەمەش پەندی تێدایە بۆ منداڵی موسڵمان تا ڕێوشوێنی ئەو هەڵبگرن تا لەوەودوا یارمەتیدەری بێت لەسەر بانگەواز بۆ لای خوای بەرز و بێهاوتا.

پێغەمبەریش ﷺ بەرپرسیارێتی منداڵی لە سامانی باوکیدا دیاری کردووە کە دەست پاك بێت لە کارپێکردنیدا بەبێ زیادەڕۆیی و دەست بڵاوی، هەروەك لە فەرموودەی (صحیح)دا هاتووە:((الولد راعٍ في مال أبيه، وهو مسؤول عن رعيته))[1] واتە: (کوڕ شوان و بەرپرسە لەماڵی باوکی و لەسەر ئەوەی لەبەردەستیدا بووە لێی دەپرسرێتەوە).

زیاتریش تێبینی گرنگیو بایەخی پێغەمبەر ﷺ بە ڕەوشتی دەستپاکی و ریشەداکوتینی لە منداڵدا دەکەین بەوەی کە هیچ هەڵەیەکی لەم ڕووەوە لە منداڵ قبوڵ نەکردووە، بەڵکو کاتێ پێی زانیبێت سزای داوە و گوێی منداڵەکەی باداوە.

(نووی) لە کتێبی (الأذکار)دا وتوویەتی: لە کتێبی (ابن السنی)ەوە گێڕامانەوە لە (عبدالله کوڕی بسر)ی هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ، دەڵێت: دایکم ناردمی بۆ لای پێغەمبەر ﷺ بە هێشووە ترێیەکەوە، منیش پێش ئەوەی بیگەیەنم لێم خوارد، کاتێ بۆم برد گوێی راکێشام و فەرمووی: ((يا غُدَرْ!)) ئەی ستەمکار.

## بنەمای ڕەوشتی پێنجەم - ڕەوشتی سینە پاکی لە رق و کینە:

سینەپاکی لە رق و کینە هاوسەنگی یەکی دەروونی لای مرۆڤ دروست دەکات و ڕای دێنێت لەسەر خۆشەویستی چاکە بۆ کۆمەڵگا و جڵەوی هێزی چاکە لە دەروونی مرۆڤایەتی بەرەو بەرزترین لوتکەکانی بەرەڵا دەکات.

پێغەمبەر ﷺ ڕێنموونی و بانگەشەی خۆی ئاڕاستەی منداڵی تازەپێگەیشتوو (أنس کوڕی مالك) دەکات کە بەیانیان و ئێواران چڵکی دەروونی بشوات بەوەی کە لەوانە ببورێت کە خراپەیان بەرامبەر کردووە، و دڵی خاڵی بکاتەوە لە هەر پاشماوەیەکی وەسوەسەکانی شەیتان و ئەو فوانەی کە شەیتان دەیکاتە سەر و دەروونەوە، با پێکەوە گوێبیستی ئەم بانگەشە سەرسوڕهێنەرە مەزنە بین..

---

[1] أنظر السياسة الشرعية لأبن تيمية رحمه الله.

(ترمذي) لە (انس)ەوەﷺ هێناویەتی کە وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ پێی وتم: ((یا بُنيّ! إن قدرت أن تصبح وتمسي وليس في قلبك غش لأحد فأفعل))، ئینجا فەرمووی: ((یا بُـنيّ! وذلك من سنتي ومن أحيا سنتي فقد أحياني، ومن أحياني كان معي في الجنة)). واتە: (کوڕەکەم! گەر دەتوانی شەووڕۆژ بکەیتەوە و دڵت هیچ گەردی بەرامبەر کەس تێدا نەبێت، ئەوا بیکـە.. کوڕەکەم! ئەوەش لە سوننەتی منە، و هەرکەس سوننەتی من زیندوو بکاتەوە ئـەوا وەك ئـەوە وایە کە من زیندوو بکاتەوە، ئەو کەسەش زیندووم بکاتەوە لەگەڵ مندایە لە بەهەشتدا).

بەهەشت و هاوەڵێتی لەگەڵ پێغەمبەری خواﷺ بۆئەو کەسەیە کە بتوانێ سینەی پاك و بێگەرد بێت لە هەموو گزی و کینە و دڵپیسییەك.

## کۆتایی- چەند نموونەیەکی کرداری لە ڕەوشتی پێغەمبەری خواﷺ لەگەڵ منداڵاندا:

لە کۆتایی ئەم گەشتەدا هەموو نمونەکانی سەرکردەی پێشەنگی ئوممەت پێغەمبەری خواﷺ دەخەینە بەردەستت کە چۆن لەگەڵ منداڵاندا هەڵس و کەوتی دەکرد و فەرمانی پێدەکردن و ڕێگری لێ دەکردن، گاڵتەی لەگەڵ دەکردن، بەدوایاندا دەچوو، لەپشت منداڵەوە دەوەستا و زەردەخەنەی بۆ دەکرد.. لەرووباندا توڕە نابێ، سەرزەنشتیان ناکات.. بیروباوەڕی قەزاو قەدەری بەکرداری لە دەروونیاندا پتەو دەکرد، جا دێینە سەر گێڕانەوەی فەرموودەکە بە هەموو شێوەو ڕێگاکانی گێڕانەوەی بەهۆی ئەو زیادە بەسوودەی کە لە هەر گێڕانەوەیەکیاندا هەیە.

ئیمام (احمد) و (بخاري) و(مسلم) و(ابوداود) لە (انس کوڕی مالك)ەوەﷺ هێناویانە کە وتوویەتی: دەساڵ خزمەتی پێغەمبەرمﷺ کرد، سوێند بەخوا هەرگیز پێی نەوتوم ئۆف، وە بۆ شتێك نەیفەرمووە بۆ ئاوات کرد و دەبو وات بکردایە.

لە گێڕانەوەی (مسلم)یشدا هاتووە: پێغەمبەرﷺ لەهەموو کەس ڕەوشت جوانتر بوو، ڕۆژێکیان ناردمی بۆ پێویستیەك، وتم: بەخوا ناچم، لە دەروونیشمدا وام دانابوو کە بچم بۆ ئەو کارەی پێغەمبەرﷺ فەرمانی پێکردم، چومە دەرەوە تا بەلای ئەو منداڵانەدا تێپەڕ ببم کە لەبازاڕ یاریان دەکرد، ئەوەندەم زانی پێغەمبەری خواﷺ لەدواوە پشت ملی گرتم، کە تەماشایم کرد پێدەکەنی، فەرمووی: (انس) بۆ ئەو شوێنە ڕۆیشتی کە فەرمانم پێکردی؟ دەڵێ: وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خواﷺ ئێستا دەچم.. (انس) دەڵێ: وەڵاهی نۆ ساڵ خزمەتی پێغەمبەرم کردووە نەمزانیوە ڕۆژێك شتێکم کردبێ و فەرموبێتی ئاواو ئاوات بۆ کرد؟ یاخود شتێك کە وازم لێ هێنابێت: دەبو ئاوا وئاوات بکردایە.

لە گێڕانەوەی (احمد)یشدا (انس)ﷺ دەڵێت: دەساڵ خزمەتی پێغەمبەرمﷺ کرد، لەسەر هیچ فەرمانێکی کە پێی کردوم و دوام خستبێت یان نەمکردبێت سەرزەنشتی نەکردوم، خۆ ئەگەر یەکێکیش لە خاوخێزانەکەی سەرزەنشتیان کردبام دەیفەرموو: ((**دعوه فلو قُدر؛ أو قال لو قُضي أن یکون کان**)) وازی لێ بێنن، ئەگەر قەدەر وابوایە کە ببێ دەبوو.

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر گرنگی و بایەخ پێدانی پێغەمبەرﷺ بە بنیاتنانی خووڕەوشتی منداڵان بە شێوەیەکی کرداریی و پێشەنگی چاك بۆیان تا لەسەر پتەوترین خووڕەوشت گەورە

بن، ونەمامێکی خۆڕاگر بن لەبەرامبەر ئەو هەڕەشە مادییانەی کە لە واقیعی کۆمەڵگا و لە ژیانی خەڵکیدا چاوەڕوانیانە، کەم دەست نەبن لە رەوشتی ئیسلامیانەدا بەرامبەر گێژەڵۆوکەی رەوتە لاڕێبووەکان کە کۆمەڵگای نەفامی لەسەر دەروونە باوەڕدارەکانی سەردەمی ئێستاماندا دەیانکات.

خوای گەورە من و ئێوەش سەرکەوتوو بکات بۆ رەوشت جوانی و ئارامگری جوان و لەسەرخۆیی گەورە و سینە فراوانی و لێبوردەیی، چونکە بەراستی ئەو زاتە بیسەر و وەڵامدەرەوەیە.

# دەروازەی پێنجەم

## بنیاتنانی سۆزداریی و دەروونی

**دەستپێك**

**بنچینەکانی بنیاتنانی سۆزداریی (العاطفي)**

**بنچینەی یەکەم - ماچ کردن و سۆز و بەزەیی بەرامبەر منداڵان.**

**بنچینەی دووەم - یاری و گاڵتەوگەپ کردن لەگەڵ منداڵان.**

**بنچینەی سێیەم - دیاری و بەخشین بە منداڵان.**

**بنچینەی چوارەم - دەست هێنان بەسەری منداڵدا.**

**بنچینەی پێنجەم - چاك پێشوازیکردنی منداڵان.**

**بنچینەی شەشەم - هەواڵپرسینی بارودۆخی منداڵ و پرسیارلێ کردنی.**

**بنچینەی حەوتەم - چاودێریکردنی تایبەتی کچ و هەتیوو.**

**١- پەروەردە کردنی کچ:**

**ڕێسای یەکەم: قەدەغەکردنی رق لێبوونی کچان.**

**ڕێسای دووەم: یەکسانی لەنێوان نێرو مێدا و جیاوازی نەکردن لەنێوانیاندا.**

**ڕێسای سێیەم: پاداشتی پەروەردەکردن و چاکبوون و ئارامگرتن لەسەر کچان و بەشودانیان.**

**٢- پەروەردەکردنی کوڕ و کچی هەتیوو:**

**ڕێسای یەکەم: پاداشتی چاودێری هەتیوو و پەروەردەکردنی.**

**ڕێسای دووەم: پاراستنی سامانی هەتیوو و بازرگانی کردن بۆی.**

**ڕێسای سێیەم: پاداشتی ئەو دایکەی چاودێری منداڵە هەتیووەکانی دەکات و شوو ناکاتەوە.**

**بنچینەی هەشتەم: هاوسەنگی لە خۆشەویستی منداڵ بەبێ زیادەڕەویو کەمتەرخەمی.**

**ڕێسای یەکەم: دەبێت خۆت و منداڵەکەت پابەندی شەرعی خوای گەورە بن.**

**ڕێسای دووەم: پێویستە میواندۆستێکی بەڕێز و بەخشندە و ئازا و زانستخواز بیت.**

**ڕێسای سێیەم: ئامگرتن لەسەر نەخۆشی و مردنی منداڵ و چاوەڕوانی پاداشتیان لای خوای گەورە.**

## دەستپێك:

سۆز رووبەرێکی فراوانی دڵی منداڵی تازەپێگەیشتوو پێك دێنێت، هەر ئەویش دەروونی گەشە پێدەکات و کەسێتی بنیات دەنێ، خۆ گەر بەشێوەیەکی هاوسەنگ وەریگرت ئەوا مرۆڤێکی رێکی لێ دەردەچێت لە دوارۆژ و لە هەموو ژیانیدا، بەڵام گەر بەشێوەیەکی دیکە وەریگرت ئیدی بەزیادەوە بێت یان کەم گرێیەکی لا دروست دەکات کە چارەنووسی باشی نابێت، زیادبوونی سۆز نازداری دەکات بەجۆرێك کە پێویستی و ئەرکەکانی ژیان بە چوست و چالاکیەوە ئەنجام نەدات، کەم بوونیشی دەیکاتە مرۆڤێکی دڵڕەقی توندوتیژ بەرامبەر تێکڕای کەسانی دەوروبەری، لەبەر ئەوە بنیاتنانی سۆزداریی گرنگی بایەخێکی تایبەتی هەیە لە بنیاتنانی دەروونی منداڵ و پێکهاتنیدا، ئەو بنیاتنانەش دایك و باوك رۆڵی گەورەیان هەیە تێیدا، هەر ئەوانن چاوگەی بنەڕەتی ئەو تیشکی سۆزەی کە دەروونی بنیات دەنێت، هەر ئەوانیش پایەی تەواو پتەون کە منداڵ هانای بۆ دەبات تا بەهرەمەند بێت لە سۆزی بەتینیان، و بەخششی باوکایەتی و دایکایەتیان، لەبەر ئەوە لە کۆتایی ئەم بەشەدا گرنگیو بایەخێکی گەورەی دوو پێڕ لە منداڵان دەبینین کە دایك و باوك هەردووکیان یاخود یەکێکیان کەمتر سۆزیان هەیە بەرامبەری ئەوانیش بریتیە لە کچ و هەتیوو، وە بەهۆی بایەخ پێدانی پێغەمبەرﷺ بە منداڵان دەبینین کە گرنگیەکی تایبەتی پێداون، و پلەوپایەی تایبەتیان هەیە، خۆزگە کۆمەڵگەی موسڵمانانیش هەڵبستایە بە رۆڵی باوك بەرامبەر بە هەتیوو و خۆزگە دایك و باوك گرنگیان دەدا بە پەروەردەکردنی کچ و چاودێری کردنی و بە یەکچاو سەیرکردنی لەگەڵ براکەیدا.

تەنها پرسیارێك ماوەتەوە ئەویش ئەوەیە چۆن سۆزی منداڵ بنیات بنێین؟ و مافی خۆی بدەینێ تا لە ئایندەیدا ببێتە مرۆڤێکی رێك و پێك؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارەش ئەم گەشتەمان بوو بەنێو فەرموودە پیرۆزەکانی پێغەمبەرداﷺ و ئەو شەش بنچینەیەمان لێ فەراهەم هێنا کە بەهۆی بەجێهێنانیانەوە لەسەر رێنموونی و رووناکیەکی دیار و روون دەڕۆین:

## بنچینەی یەكەمی سۆزداریی - ماچ كردن و سۆز و بەزەیی بەرامبەر منداڵ:

ماچ كردن رۆڵێكی كارای هەیە لە جوڵاندنی هەست و سۆزی منداڵدا، هەروەها رۆڵێكی گەورەی هەیە لە دامركاندنەوەی هەڵچوون و تورەییدا، سەرەڕای هەستكردن بە پەیوەندی پتەو لە قایمكردنی پەیوەندی خۆشەویستی نێوان گەورەو بچووك، و هەر ئەویش بەڵگەی بەزەیی دڵ و دەروونە بەرامبەر ئەو منداڵە تازە پێگەیشتووە، و بەڵگەشە لەسەر خۆ بەكەم زانینی گەورە بەرامبەر بچووك، و ئەو رووناكیە پرشنگدارەشە كە لە دڵی منداڵ دەگەشێنێتەوە، و دەروونی دەكاتەوە، و ئاوێتەبوونی لەگەڵ دەوروبەریدا زیاتر دەكات، پاشان هەر ماچ كردنی منداڵە كە لە سەرەتاو كۆتاییەوە لە سوننەتی پێغەمبەرەﷺ و چەسپاوە كە منداڵانی ماچ كردووە.

(بخاری) و (مسلم) لە (عائشە)وە م هێناویانە كە دەفەرمووێت: هەندێك خەڵكی دەشتەكی هاتنە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ و وتیان ئێوە منداڵەكانتان ماچ دەكەن؟ فەرمووی: بەڵێ، وتیان: وەڵاهی ماچیان ناكەین، فەرمووی: ((**أَوَ أملِكُ إن كان الله نزع من قلوبكم الرحمة**))[1]. واتە: (دەستەڵاتم چی یە كە خوای گەورە سۆز و خۆشەویستی لەدڵتاندا هەڵكێشاوە).

هەروەها (بخاری) و (مسلم) لە (ابوهریرە)وەرضي الله عنه هێناویانە كە دەفەرمووێت: پێغەمبەری خواﷺ (حسن كوڕی علی) م ماچ كرد، (اقرع كوڕی حابس) وتی: من دە منداڵم هەیە تا ئێستا هیچ كامیانم ماچ نەكردووە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((**من لا يرحم لا يُرحم**)). واتە: (ئەوەی بەرەحم و بەزەیی نەبێت، رەحم و بەزەییشی پێ ناكرێت).

(ابن عساكر)یش لە (انس)ەوەرضي الله عنه گێراویەتیەوە كە وتوویەتی: پێغەمبەرﷺ بەبەزەییترین كەس بووە بەرامبەر كەس و كاری و منداڵان.[2]

بەزەیی هاتنەوە بە منداڵانداو دڵنەوایی كردنیان سیفەتێكە لە سیفەتەكانی پێغەمبەرێتی محمدﷺ و رێگای چوونە بەهەشت و بەدەستهێنانی رەزامەندی خوای گەورەیە.

(بخاری) لە (انس)ەوەرضي الله عنه دەگێڕێتەوە كە وتوویەتی: ئافرەتێك هاتە خزمەت (عائیشە)رضي الله عنها ئەویش سێ دەنكە خورمای پێدا، ئافرەتەكە دوو منداڵی پێبوو هەریەكەیان دەنكە خورمایەكی

---

١ ورواه احمد في المسند ٦/٧٠.

٢ صحيح. أنظر صحيح الجامع رقم٤٧٩٧ ورواه مسلم وأبوالشيخ.

پێدان و دانەیەکیشی بۆ خۆی هەڵگرت، دوو منداڵەکە خورماکەیان خوارد و سەیری دایکیان کرد، ئەویش دەنکە خورماکەی خۆی بۆ کردن بە دوو لەتەوەو هەریەکەو لەتێکی پێدان، پێغەمبەرﷺ هاتەوەو (عائیشە) ئەوەی بۆ باسکرد، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((وما يعجبك من ذلك؛ لقد رحمها الله برحمتها صبيّيها)). واتە: (بۆچی سەرت لەوە سوڕدەمێنێ، ئەوە بەهۆی بەزەیی هاتنەوەی بە دوومنداڵەکەیدا خوای گەورەش روحمی پێ‌کردووە).

هەر لە نمونەی بەزەیی هاتنەوەی پێغەمبەرﷺ بە منداڵاندا وەك ئەو فەرموودەیەی کە (بخاری) لە (انس)ەوەﷺ هێناویەتی کە پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت: ((إني لأدخل في الصلاة، وأنا أريد أن أطيلها، فأسمع بكاء صبي فاتجوز في صلاتي؛ لما أعلم من وجد أمه من بكائه))[1] واتە: (کاتێ کە دەچمە نوێژەوەو دەمەوێت نوێژەکەم درێژ بکەمەوە، بەڵام کە گوێبیستی گریانی منداڵێك دەبم نوێژەکەم کورت دەکەمەوە، چونکە دەزانم بەگریانی منداڵەکە دایکەکەی دڵی ئازار دەخوات).

لە (ابوقتادە)ەشەوەﷺ گێڕاویانەتەوە کە وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ نوێژی بۆ خەڵك دەکرد و (امامە کچی زینب کچی پێغەمبەرﷺ)ی هەڵگرتبوو، کاتێ کڕنووشی دەبرد دایدەناو کە هەڵدەستایەوە هەڵی دەگرتەوە.[2]

بەراستی دڵ دەحەپەسێت کاتێك دەبینێت یاخود دەبیستێت منداڵان باوکان و دایکانیان فێری بەزەیی هاتنەوە بە گیانلەبەراندا دەکەن و بەزەیی خوای گەورەیان دەهێننەوە یاد، لەم رووەوە (الفخر الرازي) لە تەفسیرەکەیدا[3] باس دەکات کە راوچیەك راوی ماسی دەکرد، ماسیەکی گرت، ماسیگرەکە کچێکی هەبوو، ئەو کچەی ماسیەکەی هەڵگرت و خستیە ئاوەوە، و وتی: ئەمە تەنها لەبەر بێ ئاگایی بووە بە تۆڕەکەوە. (فخر الرازي) لەوبارەیەوە دەڵێت:

خوایە! ئەو کیژۆڵەیە بەزەیی بە بێ‌ئاگایی ئەو ماسیەدا هاتەوەو جارێکی دیکە خستیەوە نێو دەریا، ئێمەش وەسوەسەی شەیتان راوی کردووین و لەدەریای بەزەیی تۆ دەریهێناوین، تۆش بەزەییت بێتەوە پێمانداو دەربازمان بکە لێی و جارێکی دی بمانخەرەوە دەریاکانی بەزەییت.

---

١ رواه الخمسة الا أباداود.

٢ أخرجه الستة الا الترمذي. ورواه ابن خزيمة في صحيحه ١/٣٨٣ و ٢/٤١.

٣ ١٣/٢٢.

دەربارەی بەزەیی دایکانیش بە منداڵەکانیان لەوەی کە پێغەمبەری خواﷺ بۆی باسکردوین ئەم نمونە سەرسوڕهێنەرەیە کە ماناو ئاماژەی تەقینەوەی بەزەیی دڵی دایکی بەرامبەر منداڵەکەی تێدایە.

خۆزگە هەموو دایکێك بەوجۆرە لێشاوی رەحمەت و بەزەیی بەسەر منداڵەکەیدا بڕژاندبایە:

ئیمام(احمد) و (بخاری) و (مسلم) لە (صحیح)ەکانیانداو (نسائی)یش لە (ابوهریرە)وەﷺ هێناویانە کە وتوویەتی: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((**بینما امرأتان، معهما أبنان لهما، إذ جاء الذئب، فأخذ أحد الأبنين، فتحاكمتا الى داود، فقضى به للكبرى، فخرجتا، فدعاهما سليمان، فقال: هاتوا السكين أشقه بينكما، فقالت الصغرى: يرحمك الله، هو أبنها لا تشقه، فقضى به للصغرى**)). واتە: (دوو ئافرەت دوو کوڕی خۆیان پێبوو، گورگ هات و کوڕێکیانی برد، لەسەر ئەو کوڕەی مابوویەوە بوویە مشت و مڕیان و داوەری خۆیان بردە لای (داود)، ئەویش کوڕەکەی دا بە گەورەکەیان، و چوونە دەرەوە، (سلیمان) بانگی کردنەوە و فەرمووی: چەقۆم بۆ بهێنن لەنێوانتاندا لەتی دەکەم، بچووکەکەیان وتی: خوا رەحمت پێبکا، کوڕی ئەوەو لەتی مەکە، ئەویش منداڵەکەی دا بە بچووکەکەیان).

خوای گەورە دەربارەی حەزرەتی (سلیمان) راستی فەرمووە: ﴿وَءَاتَيْنَـٰهُ ٱلْحِكْمَةَ وَفَصْلَ ٱلْخِطَابِ﴾ص/٢٠. واتە: (زانست و حیکمەت و زمان پاراوی لە قسەکردن و داوەری دادگەرانەمان پێدا).

لەم چیرۆکەدا تێبینی دڵڕەقی ئافرەتە گەورەکەیان دەکەیت، کە گورگ منداڵەکەی بردووەو هیچ غەمباری خۆی دەرنابڕێت، بەڵکو دڵڕەقیەکی نواند کە بە عەقڵی پیاودا نەیەت چ جای دڵی ئافرەت، ئەوەبوو پەنای بردە بەر دزینی کوڕی ئافرەتەکەی هاوەڵی چونکە رێی تێناچێت کە هەردووکیان بە تەواوەتی هاوشێوەی یەکدی بووبن، هەروەها ماقوڵ نیە کە دایك کوڕی خۆی لە دوو منداڵدا بۆ جودا نەکرێتەوە، ئەو فەرمودەیە بەڵگەیە لەسەر دڵڕەقی دایکە گەورەکەو بەزەیی دڵی بچووکەکەیان.

## بنچینەی دووەمی سۆزداری - یاری و گاڵتەوگەپ لەگەڵ منداڵاندا:

وا پێکەوە لەگەڵ کۆمەڵێك فەرموودەی پیرۆزی پێغەمبەردا ﷺ دەگوزەرێین، کە پەند و وانەی کرداریی لێیانەوەو لە پێغەمبەلای خواﷺ وەردەگرین لە یاریکردن لەگەڵ منداڵان جارێك بە راکردن، و جارێکی دیکە بە هەڵگرتن، و جاری کەش بە بچووككردنەوەی ناوی و جاری چوارەمیش بە پێکەنین و...شتی دیکە.

ئەم کارانە گەر دایکان و باوکان پێی هەڵستان لەبەر ئەوەی کە ئەرکێکی پەروەردەییە، ئەوا خۆ ئەوان داوایان لێکراوە کە شوێنی پێغەمبەری خواﷺ بکەون:

(طبرانی) لە (جابر)ەوەﷺ دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: لەگەڵ پێغەمبەری خواداﷺ بووین، بانگکراین بۆ نانخواردن، لەرێگا (حسین)مان دیت لەگەڵ منداڵان یاری دەکرد، پێغەمبەرﷺ بەبەرچاوی خەڵکەوە خێرا بەرەو لای رۆشت و دەستی بۆ کردەوە و ئەویش بەم لاو بەولادا رای دەکرد و پێغەمبەریشﷺ لەگەڵی پێدەکەنی، هەتا گرتی، دەستێکی خستە لاملی و ئەویدیکەشی خستە نێوان سەر و گوێی‌و دەستی کردە ملی و ماچی کرد، پاشان فەرمووی:((حسين مني، وأنا منه، أحب الله من أحبه، الحسن والحسين سبطان من الأسباط)).[1] واتە: ((حسین) لە منە و منیش لەوم، خوا ئەو کەسەی خۆش بوێ کە ئەوی خۆشی دەوێ، (حسن) و (حسین) دوو کچەزان لە کچەزاکان).[2]

هەروەها (بخاری) لە (الادب المفرد) و (طبرانی) لە (ابوهریرە)ەوەﷺ هێناویانە کە وتوویەتی: بەم دوو گوێیەم بیستم، بەم دوو چاوەشم بینیم، کە پێغەمبەری خواﷺ بەهەردوو دەستی هەردوو لەپی (حسن) یان (حسین)ی گرتبوو، ئەویش هەردوو پێی لەسەر پێی پێغەمبەرﷺ دانابوو، دەیفەرموو: ((أرقه)) سەرکەوە، دەڵێ: کوڕەکەش سەرکەوت هەتا هەردوو پێی خستە سەر سینگی پێغەمبەری خواﷺ، پاشان پێی فەرموو: دەمت بکەرەوە، و ئینجا ماچی کرد و فەرمووی: ((اللهم أحبه فإني أحبه)) واتە: (خوایە خۆشت بوێ چونکە من خۆشم دەوێ).

---

١ حسن ورواه البخاري في الأدب والترمذي وابن ماجه والحاكم. أنظر صحيح الجامع رقم٣١٤٦.
٢ بە منداڵی کچ دەوترێت (سبط)، و بە منداڵی کوڕیش دەوترێت (حفید).

لە (الإصابة) و (زاد)دا هاتووە ((**حُزُقَّةٌ حُزُقَّةٌ، تَرَقَّ عَينَ بَقَّهْ**)) واتە: (سستە سستە، چاوبچووك سەركەوە).

لە (النهايە)ی (ابن أثير)دا هاتووە كە پێغەمبەرﷺ سەمای بە (حسن) یان (حسين) دەكرد و دەيفەرموو: ((**حُزُقَّةٌ حُزُقَّةٌ، تَرَقَّ عَينَ بَقَّهْ**)) واتە: (سستە سستە، چاوبچووك سەركەوە).

كوڕەكەش سەردەكەوت تا پێی دەخستە سەر سينگی.

(**الحُزُقَّة**) واتە: لاوازی هەنگاو كورت بەهۆی لاوازيەكەيەوە، وە وتراوە: كورتەباڵای زگ زل، لەوێدا وەكو ياریكردن و گاڵتەوگەپ لەگەڵی هێناويەتی، (**تَرَقَّ**) بە واتای سەركەوە، (**عَينَ بَقَّهْ**)ەش كينايەيە بۆ بچووكی چاو.[1]

هەروەها (بخاری) و (مسلم) و (ترمذی) و (ابوداود) لە (انس)ەوەﷺ هێناويانە كە وتوويەتی: پێغەمبەرﷺ باشترين كەس بوو لە خووڕەوشتدا، برايەكم هەبوو پێيان دەوت (ابوعمير)- كە لەشير براپۆوە-، پێغەمبەرﷺ كە دەهات بۆ ماڵمان دەيفەرموو: ((**يا أبا عمير، ما فعل النُغير؟!**)) واتا: ئەی (ابوعمير) چۆلەكەكە چی كرد؟!

چونكە چۆلەكەيەكی هەبوو كەپێی دەوترێت (نغير) و ياری پێدەكرد.

وە لەگێڕانەوەيەكی (احمد)دا لە (انس)ەوەﷺ گێراويەتيەوە كە پێغەمبەرﷺ دەچێتە ماڵی (ام سليم)، ئەويش كوڕێكی هەبوو لە (ابوطلحة) كە بە (ابوعمير) ناسرابوو، پێغەمبەرﷺ گاڵتەی لەگەڵ دەكرد، و فەرمووی: ((**ما لي أرى أبا عمير حزيناً؟**)) واتە: چیيە (ابوعمير) غەمبار دەبينم؟ وتيان چۆلەكەكەی كە ياری پێدەكرد مرداربۆتەوە، دەڵێ: ئيدی پێغەمبەرﷺ دەيفەرموو: ((**يا أبا عمير، ما فعل نغير**)) واتا: (ئەی (ابوعمير) چۆلەكەكە چی كرد؟)

پێشتريش ئەو قسەيەی (ابن حجر) كە لە (الفتح)دا نووسيويەتی خستمانە روو كە ئەم فەرموودەيە رێپێدانی گاڵتەو ياری و دوبارەكردنەوەی ياری و گاڵتەو گەپ موباحێكی سوننەتە نەك روخسەت، وە گاڵتەو گەپ كردن لەگەڵ منداڵدا كە هێشتا شت لێك جودا ناكاتەوە رێگەپێدراوە، لەگەڵ دوبارەكردنەوەی سەردانی ئەو منداڵەش ياری و گەڵتەی لەگەڵ دەكەيت، هەروەها وازهێنان لە خۆ بەگەورەزانين و لوتبەرزی و جياوازی كردنی تێدايە، وە لەبەر ئەوەی كە پياوە كە لەرێگا دەڕوات يان لە ماڵەوە خۆی بە مەند پيشان دەدا، بەڵكو سوعبەت بكات.

---

[1] أنظر كتاب (سيدنا محمد رسول الله) للشيخ عبدالله سراج الدين ص١٥٧.

(ترمذی) و (ابوداود) لە (انس کوڕی مالك)ەوەﷺ هێناویانە کە دەگێڕنەوە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((يا ذا الأذنين)) واتە: ئەی خاوەن دوو گوێ، واتا گاڵتەی لەگەڵ دەکرد.

هەروەها (انس)ﷺ وتوویەتی: پێغەمبەرﷺ نازناوی (پاقلە)ی لێنابووم چونکە پاقڵەم لێ دەکردەوە.[1]

(بخاری) لە (ابن عباس)ەوە م هێناویەتی کە وتوویەتی: کاتێك پێغەمبەری خواﷺ گەیشتەوە مەککە، چەند منداڵێکی (بنی مطلب) بەپیریەوە هاتن، ئەویش یەکێکیانی لەپێش خۆی هەڵگرت و ئەوی دیکەیان لە پشتی.

هەر (بخاری) لە (ابن عباس)ەوە م هێناویەتی کە وتوویەتی: (اسامە) لە (عەرەفە)وە تا (مزدلقە) لە پشت پێغەمبەرەوە بوو، پاشان (فضل) لە (مزدلفە)وە تا (منی) لە پشتیەوە بوو، هەردووکیان وتیان: پێغەمبەرﷺ بەردەوام (لبيك اللهم لبيك)ی دەوت تا ڕەجمی (عقبە)ی کرد.

لە (عبدالله کوڕی شداد)ەوە دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: لەکاتێکدا کە پێغەمبەری خواﷺ نوێژی بە خەڵکی دەکرد، (حسین) هات بۆ لای و لە کڕنووشدا بوو چووە سەر ملی، ئەویش کڕنووشەکەی بە خەڵکەکە درێژ کردەوە هەتا وایان گومان برد کە شتێك ڕویداوە، کاتێ لە نوێژەکەی بویەوە وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! کڕنووشەکەت درێژ کردەوە هەتا وامان گومان برد کە شتێك ڕوویداوە، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((**إن ابني قد ارتحلني، فكرهت أن أعجله حتى يقضي حاجته**)). واتە: (کوڕەکەم چووبووە سەر ملم، منیش حەزم نەکرد پەلەی لێ بکەم هەتا کارەکەی خۆی جێبەجێ دەکات).[2]

هاوەڵانیش ﷺ شوێن پێی پێغەمبەری خوایانﷺ هەڵدەگرت و هەر بۆیە خێرا چوون بەدەم یاری و گاڵتەو گەپ کردن لەگەڵ منداڵەکانیاندا و خۆیان دەبردە ڕیزی ئەوان و خۆیان وەکو منداڵان لێ دەکرد و یاریان لەگەڵ دەکردن.

---

١ رواه الترمذي وقال (حديث غريب)، اسناده ضعيف. انظر جامع الأصول ٩/٩١ ت.الأرناؤوط.

٢ قال العراقي: رواه النسائي ورواه الحاكم وقال صحيح على شرط الشيخين.

(دیلمی) و (ابن عساكر)یش لە (ابوسفیان)ەوە گێڕاویانەتەوە كە وتوویەتی: چووم بۆ لای (معاویە)، لەسەر پشت ڕاكشابوو، منداڵێكی (كوڕ یان كچ) لەسەر سینگی بوو یاری بۆ دەكرد، منیش وتم: ئەی ئەمیری باوەڕداران، لەلای خۆتی لابە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خواﷺ بوو دەیفەرموو: ((من كان له صبي فليتصاب له))[1] واتە: (هەركەسێك منداڵێكی هەبوو با خۆی وەكو منداڵەكە لێ بكات و یاری لەگەڵدا بكات).

(عمر)یشرضي الله عنه دەڵێت:[2] پێویستە پیاو لەگەڵ خاووخێزانیدا وەك منداڵ وابێت -واتا لە هاودەمی و مژدەبەخشی و ڕەفتاری نەرم ویاری كردن لەگەڵ منداڵەكانی- ئەگەر ئەوەی تێدا بەدی هات پیاوە.

تەنانەت (عمر)رضي الله عنه یەكێك لە پیاوەكانی لەسەر كارەكەی لادەبات لەبەر ئەوەی بەڵگەیەكی روونی لەسەر دڵڕەقی بەرامبەر منداڵەكانی لێ بینی، لە (محمد كوڕی سلام) دەگێڕنەوە كە وتوویەتی: (عمر كوڕی خطاب) پیاوێكی لەسەر كارێك دانا، پیاوەكە بینی كە (عمر) منداڵێكی خۆی ماچ دەكات، پێی وت: ئەوە ماچی دەكەیت لەكاتێكدا تۆ ئەمیری باوەڕدارانی، من لەجێگای تۆ بوومایە وام نەدەكرد، (عمر) وتی: گوناهی من چیە كە دڵی تۆ بەزەیی تێدا داماڵرابێت! خوای گەورە تەنها بەزەیی بە بەندە خاوەن بەزەییەكاندا دێتەوە، و لەسەر كارەكەی لایبرد و وتی: تۆ بەزەییت بۆ منداڵەكەی خۆت نەبێت ئیدی چۆن بۆ خەڵكیت دەتبێت.[3]

بەم یاریو گاڵتەكردن و خۆ وەك منداڵ لێكردن و لاسایی كردنەوەی منداڵە، پێغەمبەری خواﷺ هەڵس و كەوتی لەگەڵ منداڵاندا دەكرد و بەو سۆزە راستگۆو باشە دەروونیانی تێر دەكرد، بەدەر لە وشكی و دڵڕەقی و نەدانی مافی منداڵ.

---

١ ضعيف، أنظر ضعيف الجامع رقم ٥٨١٢.

٢ كتر العمال ١٦/٥٧٣ رواه ابن أبي الدنيا والدينوری وعبدالرزاق في الجامع.

٣ كتر العمال ١٦/٥٨٣ رواه الدينوری.

## بنچینەی سێیەمی سۆزداری - دیاری و بەخشش بۆ منداڵان:

دیاری کاریگەری باشی هەیە لەسەر دەروونی مرۆڤایەتی بەگشتی، و لەسەر دەروونی منداڵان بەتایبەتی کاریگەریەکەی زیاترە و شوێنەواری گەورەترە، پێغەمبەری خواش ﷺ ڕێسایەکی داناوە بۆ خۆشەویستی نێوان خەڵك و ئامۆژگاری ئوممەتی کردووە و فەرموویەتی: ((**تهادوا تحابوا**))[١] واتە: (دیاری ببەخشن بە یەکدی لای یەکدی خۆشەویست دەبن. ئەمەش یاسایەکی گشتی یە).

پێغەمبەر ﷺ بەکردەوە ئەم پایە بەهێزەی بنیاتنانی سۆزداریی منداڵ و بزواندنیو ڕێنموونی کردنی و پەروەردەکردنی بۆ ڕوون کردوینەتەوە:

(مسلم) لە (ابوهریرە)ەوە ﷺ هێناویەتی کە دەڵێت: یەکەم بەری بەروبوومیان دەهێنایە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش دەیفەرموو: ((**اللهم بارك لنا في مدينتنا؛ وفي ثمارنسا؛ وفي مُدِّنا؛ وفي صاعنا، بركة مع بركة**)). واتە: (خوایە پیت و فەڕ بخەرە شارەکەمان و بەروبوومەکانمان و کێش و پێوانەکانمان، پیت و فەڕ لەسەر پیت و فەڕ).

ئینجا دەیدا بە بچووکترین منداڵ لەنێو ئامادەبواندا.

هەروەها (طبرانی) لە (اسحاق کوڕی یحیی کوڕی طلحة)ەوە دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: لەمزگەوت لەگەڵ (عیسی کوڕی طلحة)ی مامما بووم، (سائب کوڕی یزید) هاتە ژوورەوە، ناردمی بۆ لای و وتی: بڕۆ بۆ لای ئەو پیاوەپیرەو پێی بڵێ: (بن طلحة)ی مامم پێت دەڵێ ئایا پێغەمبەری خوات ﷺ بینیوە؟ منیش چووم بۆ لایو پێم وت: ئایا پێغەمبەری خوات ﷺ بینیوە؟ وتی: بەڵێ، پێغەمبەری خوام ﷺ بینیوە، من و چەند منداڵێکی دیکە چوین بۆ خزمەتی، بینیمان خورمای دەخوارد کە لەناو دەفرێکدا بوو و خەڵکانێك لە هاوەڵانی لەگەڵدا بوو، هەریەکەو مشتێکی لەو خورمایە پێدەداین و دەستی بەسەرماندا دەهێنا.

(ابن ابو دنیا) لە (حسن) یان (جابر کوڕی عبدالله)ەوە گێڕاویەتیەوە کە وتویەتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ نوێژی نیوەڕۆ یان عەسرمان ئەنجام دا، کاتێ پێغەمبەر ﷺ سەلامی دایەوە، پێی فەرموویین: لەشوێنی خۆتان بمێننەوە، جا دەڵێ: گۆزەیەکیان هێنا کە حەڵوای

---

١ رواه الطبراني في الأوسط، والحربي في الهدايا، والعسكري في الأمثال. أنظر المقاصد الحسنة رقم الحديث ٣٥٢.

تێدابوو، جا گێڕای بەسەر یەکەکەی ئەو پیاوانەی لەوێ بوون، و ئەنگوستی تێدەهاویشت و دیدانێ، تا سەرە گەیشتە من کە ئەو کاتە منداڵ بووم، ئەنگوستێك لەو حەڵوایەی پێدام، پاشان فەرمووی: هی تریشت بدەمێ؟ وتم: بەڵێ، ئەنگوستێکی تری دامێ، پاشان فەرمووی: هی تریشت بدەمێ؟ وتم: بەڵێ: دیسان ئەنگوستێکی تری پێدام، ئەمە لەبەر ئەوەی بچووك بووم، جا پێغەمبەرﷺ بەردەوام ئەم حەڵوایەی گێڕا هەتا دوا کەس کە لەوێ بوو.[1]

(ابوداود) لە (عائشە)وەرضي الله عنها دەگێڕێتەوە کە دەڵێت: دیاریەك لە (نەجاشی)یەوە هات بۆ پێغەمبەرﷺ، لەنێویاندا ئەنگوستیلەیەکی حەبەشی تیدابوو، پێغەمبەری خواﷺ بەدارێك یاخود بە سەری پەنجە دوور لەخۆی گرتیو بانگی (امامە کچی ابوعاص)ی کرد کە کچی (زینب کچی پێغەمبەرﷺ) بوو، فەرمووی: ((تحلّيْ بهذا يا بنية)) واتە: کچەکەم! خۆت بەمە برازێنەوە.

## بنچینەی چوارەمی سۆزداری - دەست هێنان بەسەری منداڵدا.

لە فەرموودەی دووەمی پێش کۆتاییدا بینیت کە چۆن پێغەمبەرﷺ یاری لەگەڵ سۆزی منداڵاندا دەکرد بەوەی کە دەستی دەهێنا بە سەریاندا، بەمەش هەستیان بە چێژی بەزەیی و سۆز و خۆشەویستی و سۆزداری دەکرد، کە بەهۆی ئەوەشەوە منداڵ هەست بە بوونی خۆی و خۆشەویستی گەورەکان بەرامبەری و گرنگیدانیان پێی دەکات.

لە (الزوائد)ی (ابن حبان)دا لە (انس)ەوەرضي الله عنه گێڕاویەتیەوە کە دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ سەردانی ئەنصاریەکانی دەکرد و سڵاوی لە منداڵەکانیان دەکرد و دەستی بەسەریاندا دەهێنا.[2]

لە (مصعب کوڕی عبدالله)ەوە دەگێڕنەوە کە دەڵێت: (عبدالله کوڕی ثعلبة) چوار ساڵ پێش کوچ لەدایك بوو، لەساڵی رزگارکردنی مەککەدا بردیانە لای پێغەمبەرﷺ، ئەویش دەستی هێنا بەروویداو داوای بەرەکەتی بۆ کرد، کە پێغەمبەری خواﷺ وەفاتی کرد ئەو تەمەنی چواردەساڵ بوو.[3]

---

١ حديث مرسل، رجاله رجال الصحيح، قاله محققه، وقال أخرجه أبو الشيخ في (اخلاق النبي ﷺ) ص٢٣٥.

٢ صحيح ورواه النسائي. أنظر صحيح الجامع رقم٤٩٤٧.

٣ رواه الحاكم في مستدركه ٣٧٩/٣.

لە (عبدالله کوڕی جعفر)یشەوە دەگێڕنەوە کە دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ دەستی بەسەرمدا هێناو - وابزانم وتی سێجار دەستی بەسەرمدا هێنا- و فەرمووی: **((اللهم أخلف جعفراً في ولده))**[1] واتا: (خوایا بەم کوڕەی جێگای (جعفر) پڕ بکەرەوە).

پێغەمبەری خواﷺ لەگەڵ دەستهێنان بەسەری منداڵدا دەستی پیرۆزیشی دەهێنا بە رووومەتیدا، ئەمەش لە زیاتر گرنگی و بایەخ پێدانیەوە بوو بۆ خۆشی خستنە دڵی منداڵەکەوە.

لەم رووەوە (مسلم) لە (جابر کوڕی سمرە)وە -کە لە منداڵانی هاوەڵان بووە- دەگێڕێتەوە و دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا نوێژی یەکەم (واتە نیوەڕۆ)م کرد، پاش ئەوە چوویە دەرەوە بۆ لای خاوخێزانی، منیش لەگەڵیدا چوومە دەرێ، منداڵان هاتن بە پیرییەوە، پێغەمبەریش ﷺ یەك یەك دەستی بە رووومەتیاندا دەهێنا، (جابر) دەڵێت: بەڵام کە دەستی هێنا بە رووومەتمدا هەستم کرد دەستی سارد و بۆنخۆشە وەکو ئەوەی لەهەگبەی گوڵاوفرۆش[2] دەریهێنابێت.

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە دەستهێنان بە رووی منداڵدا گەر زیاد لە یەکێك بوون، دادوەری لە هەڵس و کەوت کردن لەگەڵ هەموویاندا، و جیاوازی نەکردن لە نێوانیاندا، ئەمەش لە وردبینیە هەرە جوانەکانی پێغەمبەرەﷺ لە هەڵس و کەوت کردنی لەگەڵ منداڵاندا بە یەکسانی کردن لە نێوانیاندا لە هەموو شتێکدا.

## بنچینەی پێنجەمی سۆزداری - چاك پێشوازیکردنی منداڵ:

بەیەك گەیشتن لەگەڵ منداڵدا کارێکە هەر روودەدات و گرنگترین شت کە لە بەیەك گەیشتندایە ساتەکانی یەکەمیەتی، خۆ گەر بەیەك گەیشتنەکە باش بوو ئەوا منداڵ دەتوانێت درێژە بە قسە بدات و دەرگای گفتوگۆ بکاتەوەو وەڵامی بەرامبەرەکەی بداتەوە، بەوەش دڵی دەکاتەوە لەگەڵ ئەوەی کە بە خەیاڵیدا دێت و گیروگرفتەکانی دەخاتە روو و دەربارەی خۆزگەکانی دەدوێت، هەموو ئەوانە رودەدات گەر بەچاکی پێشوازی منداڵ کرا بەشادی و خۆشەویستی و یارییەوە. هەر ئەمەش بوو کە پێغەمبەرﷺ خەڵکی بۆ ئەنجام دانی ئاراستە دەکرد:

---

[1] رواه الحاكم في مستدركه ٣٧٢/١ وسكت عنه.

[2] **هەگبەی گوڵاو فرۆش (جونة العطار) سەبەتەیەکی بچووکی خڕی داپۆشراوە، گوڵاوفرۆش بۆنەکانی لەناو دەپارێزێت.**

(ابن عساكر) لە (عبدالله كوڕی جعفر)ەوەش گێڕاویەتیەوە كە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ كە لەسەفەر دەگەڕایەوە بە منداڵانی خاوخێزانی دەگەیشت، جارێكیان لەسەفەر گەڕایەوە منیان بۆ لای بردە پێشەوە، ئەویش هەڵی گرتم و خستمیە بەردەمی خۆی و پاشان یەكێك لە كوڕەكانی (فاطمة)" (حسن) یان (حسین)یان بۆ هێنا و لەپشت خۆیەوە داینا، كە چوینە ناو مەدینە سێكەس بوین لەسەر یەك ولاخ.[١]

## بنچینەی شەشەمی سۆزداری- هەواڵپرسینی بارودۆخی منداڵ و پرسیار لێ كردنی:

زۆر جار منداڵ بە تەنها بە ڕێگادا دەڕوات و ڕێگای لێ تێك دەچێت و لەسەر شەقام ون دەبێت، گەر دایك و باوك گرنگیان بە بارودۆخی منداڵەكە دابوایە ئەوا بەخێرایی ئاگاداری ونبوونەكەی دەبوون، و شوێن پێی منداڵەكەیان هەڵدەگرت و بەزووترین كات دەیاندۆزیەوە،بەپێچەوانەشەوە درەنگ دەیدۆزنەوە، ئەو خێرایی كردنەش ڕۆڵێكی گەورەی هەیە لەسەر دەروونی منداڵ، چونكە بە دواكەوتن لە گەیشتن بە منداڵەكە ترس و ئازار و گریانی زیاتر دەكات وچەند ماوەی دواكەوتنەكەو گەیشتنی یەكێك لە دایك و باوكی پێی زیاتر بێت ئەوەندە ئەشكەنجەی دەروونی توندتر دەبێت، لەبەر ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ پەلەی كرد و فەرمانی بە هاوەڵانی كرد كە هاوكاری بكەن و بەرێگاكاندا بڵاو ببنەوە تاكو (حسن) و (حسین) بدۆزنەوە:

(طبرانی) لە (سلمان)ەوە رضي الله عنه گێڕاویەتیەوە كە دەڵێت: لە دەوری پێغەمبەری خوا ﷺ بووین، (ام ایمن) هات و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، (حسن) و (حسین) ون بوون، دەڵێ: كاتەكە كاتی نیوەڕۆ بوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((قوموا فأطلبوا ابني)) هەستن بەدوای كوڕەكانمدا بگەڕێن، هەركەسەو بەلایەكدا ڕۆشت، منیش بەرەو لای پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشتم، ئەوەندەی پێ نەچوو هەتا گەیشتە بناری چیاكە، دیتمان (حسن) و (حسین) لەترساندا خۆیان لەیەك ئالاندبوو، و نێرەمارێكیش لەسەر كلكی ڕاوەستابوو، بڵێسەی ئاگری لەدەم دەردەچوو، پێغەمبەری خوا ﷺ بەپەلە چوو بۆ لای، مارەكەش سەرنجی پێغەمبەری خوای ﷺ دا و پاشان ڕۆشت و خۆی كرد بە كونەكاندا، ئینجا پێغەمبەر ﷺ چوو بۆ لایان و لێكی كردنەوەو دەستی بەرویاندا هێناو فەرمووی: ((بأبي وأمي أنتما! ما أكرمكما على الله)). واتە: (دایك و باوكم بە قوربانتان بێت، چەند بەرێزن لەلای خوا).

---

١ صحيح ورواه احمد ومسلم وابوداود. انظر صحيح الجامع رقم ٤٧٦٥.

پاشان یەکێکیانی خستە سەر شانی ڕاستی و ئەوی دیکەیانی خستە سەر شانی چەپی، منیش وتم: خۆشی لەخۆتان، سواری چاکترین شان بوون. پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی:((ونعم الراكبان هما، وأبوهما خير منهما)). واتە: (ئەوان چاکترین سوارن، و باوکیشیان لەخۆیان چاکترە).

جا تێبینی ئەو ترسە دەکەیت کە (حسن) و (حسين) تێی کەوتبوون و بەجۆرێك کە لەترسی ئەو مارە باوەشیان بە یەکدیدا کردبوو، هەروەها چۆن پێغەمبەر ﷺ پەلەی کرد بۆ لابردنی ئەو ترسە، و پاشان جوداکردنەوەیان لە یەك، پاش ئەوە دەستی هێنا بە ڕویاندا، پاشان پاڕایەوە بۆیان، دوای ئەوەش ڕێزی لێنان بەوەی کە خستنیە سەر شانی خۆی، ئینجا پیاهەڵدان بەوەی کە فەرمووی ((ونعم الراكبان هما))، ئەمەش لە زۆر سووربوون و گرنگی و بایەخی پێغەمبەرەوە بوو بە سۆزی منداڵ تاکو ڕێك و دروست و هاوسەنگ بێنێتەوە.

## بنچینەی حەوتەمی سۆزداری- چاودێری کردنی تایبەتی کچ و هەتیوو:

ئەمانە دوو نمونەی نێو منداڵانن کە لە منداڵانی دیکە زیاتر پێویستیان بە بنیاتنانی سۆزداری لە بەزەیی و دڵنەرمی و چاودێری هەیە، بەهۆی ئەوەی کە زیاتر هەست بە لاوازی و نەبوونی ڕەگەزەکانی هێز دەکەن... وە لەبەر ئەوەی لای خەڵکی سووکتر لە خەڵکانی دیکە سەیر دەکرێن و، کۆمەڵگا نەفامیەکان لە کۆن و نوێدا مافەکانیان پێشێل کردووە، هەر کات و سەردەمێ گەلێك لە گەلەکان یاخود کۆمەڵگەیەك لە کۆمەڵگەکان یان خێزانێك لە خێزانەکان دوور بکەوێتەوە لەبەرنامەی خواو شەریعەتەکەی لە بەجێهێنان و کارپێکردندا، زوڵم و ستەم بەرامبەر کچ و هەتیووی لاواز زیاتر بووە... نەفامیش هەر نەفامیە و دووبارە دەبێتەوە، بەڵام بەجل و بەرگی جیاوە، نەفامی کۆن بەئاشکراو بەرۆژی نیوەڕۆ ئاڵای ستەمکاری بەرز کردبۆوە، خستبوویە بەرچاوی هەموو خەڵك بەبێ هیچ شەرم و تەریق بوونەوەو مەردایەتی و پیاوەتیەك. بەڵام نەفامی نوێ ستەمەکەی خۆی بە هەندێ ماددەی دەستوری سەرکەش ئارایشت کردووە و، دەروازەی سەربەستی ئەنجامدانی ڕابواردن و کاری نابەجێی کردۆتەوە، جا هەر شێوەو پلەیەکی خراپەکاری بێت، بەمجۆرەش ئەو دوو پێڕە لاوازە لەم جۆرە کۆمەڵگاو خێزانانەدا لەدەست چوون و، تەنها ئیسلام لە مەیداندا وەك تاکە دەربازکەریان مایەوە، کە بەرگری لێ دەکردن و، هێرشی دەکردە سەر هەرکەسێك کە هەر ستەم و زوڵمێکیان لێ بکات، هەتا گەر جۆرێك لە

ستەمیش ڕووی دابێت هەڕەشەی کردووەو بەڵێنی داوەو دەروونی بڕوادارەکانی بێدار کردۆتەوەو، هێناویەتیە جۆش و گریاندویەتی، هەتا ستەمەکەی لەسەر هەڵدەگرێت و، دادوەری بەدی دێت و، زوڵم لەناو دەچێت و، یەکسانی بەرز دەبێتەوەو ناڕەوا تێك دەشکێت و، ڕاستی دەچەسپێت.

هەموو ئەو ئایەتە قورئانی و فەرموودانەی پێغەمبەریشﷺ کە لەبارەی ئەو دوو جۆرە منداڵە بێدەسەلاتەوە هاتووە کە ئێستا باسی لێوە دەکەین، بەڵگەن لەسەر ئەوەی وتمان و، ڕوونکردنەوەیەکی تێر و تەسەلە لەسەر ئەوەی خستمانە ڕوو، چونکە خوای گەورە بەدیهێنەری مرۆڤایەتی یە ئاگاداری ئەو زوڵمەی سەریانە کاتێ کە پابەندی شەرعەکەی ئەو نابن و، تێیدا بەهێز بێدەستەڵاتەکان دەخوات.

لەبەر ئەمە پێغەمبەرﷺ لەبارەی ئەو دوو بێدەستەڵاتە ئاگاداری کردوینەتەوەو دەفەرمووێت: ((إني أحرِّجُ عليكم حق الضعيفين: اليتيم والمرأة))[1] واتە: (لەسەرتان حەرام دەکەم کە مافی ئەو دوو بێدەستەڵاتە پێشێل بکەن: هەتیوو و ئافرەت).

ماوەتەوە بپرسین کە ئەو ڕێسا و بنەمایانە چین کە داوامان لێکراوە جێبەجێی بکەین تا لەگەڵ ئەم دوو چینە بێدەستەڵاتەدا باش بین؟

## یەکەم: چاودێری پەروەردەکردنی کچ:

((گرنگترین هۆکار لە چاکسازی ماڵدا بەرزکردنەوەی ئاستی فێربوونی ئافرەتانمانەو بەپێی پێویست ئایین و خووڕەوشتیان پێ بدرێت و بواریان بۆ فراوان بکرێت لە بەرنامەکانی خوێندنی کچان بۆ توێژینەوەی ماڵداری.

سەربردەی ئەو ئافرەتە پایەبەرزانەی کە نمونەی ئەوانەی خاوەن خووڕەوشتی جوان و بەرز بوون زۆرە، وەك (نسیبە کچی کعب) و (اسماء کچی ابوبکر) و (صفیە کچی عبدالمطلب) و (خولە کچی ازور) و (سکینە کچی حسین) و زۆری دیکەش هەیە، لەبەر ئەوەی:

الأم مدرسة إن أعددتها    أعددت شعباً طيب الأعراق

واتە: دایك قوتابخانەیەکە گەر ئامادەی کەی گەلێکی خاوەن ڕەوشتی باشت ئامادە کردووە.

---

[1] حسن، رواه الحاكم والبيهقي في الشعب عن أبي هريرة وابن ماجه والإمام أحمد وابن حبان وصححه. أنظر صحيح الجامع رقم٢٤٤٧.

بەڵام گەر بەرنامەی خوێندنی کچان هەر وەك ئەمەی ئێستای لای ئێمە بمێنێتەوەو گرنگی بەجوانکاری و شتی زیانبەخش بدات و واز لە شتە پێویست و بەسوودەکانی بهێنێت، ئەوا ئەمە موژدەدەری ژیانێکی خۆش نیە بۆ تازەپێگەیشتوانی ئیسلام.

کچانمان لە قوتابخانەکاندا وانەی مۆسیقا و زمانی بیگانەو ئەندازەی بۆشایی و یاسا دەخوێنن، پاشان هیچ شتێك لەبارەی پەروەردەکردنی منداڵ و دابینکردنی تەندروستی و زانستی دەروونی و ئایین و رەوشت و رێکخستنی ناوماڵ نازانێت، باشە ئەمە چ بەرنامەو پەیڕەوێکەو بە چ ئامانجێك دەگات!

من لي بتربية البنات فإنها في الشرق علة ذلك الإخفاق

واتە: کێ پەروەردەی کیژانمان بکات، ئەوا ئەو لە رۆژهەڵاتدا دەردی ئەو شکستیە.

دایك ئەگەر چاك بێت ئەوا لە کوڕەکەی چاوەڕوان بە بە هەموو مانایەکی پیاوەتی پیاوی لێ دەربچێت، وە ئەگەر مێژووی زانایان بخوێنێتەوە، دەبینیت کە نهێنی مەزنێتی زۆرێکیان ئەو بنەما چاکە بە بەهایەیە کە بە حوکمی شیردان و فێرکردن دایك تێیدا چاندویەتی:

خۆشویستنی حەق و غیرەتی لەسەری و سەرخستن و پشتگرتنی پێغەمبەری خواﷺ لەلایەن (علی کوڕی ابو طالب)ﷺ، و نەرم و نیانیو ژیرمەندیەکەی (معاویە)، وئازایەتیەکەی (عبداللە کوڕی زبیر) و (زبیر) خۆشی، ئەمانە نهێنیەك بوون لە نهێنیەکانی (فاطمة کچی اسد)و (صفیە کچی عبدالمطلب) و (اسماء کچی ابوبکر) و (هند کچی عتبە).

ئەگەر کوڕ لەسەر رێو شوێنی باوکی بڕوات، و هەموو جامێکیش ئەوەی لێ دەچۆڕێ کە تێیدایە، و ئەو کەسەی کە لەسەرەتای ژیانیەوە گوێبیستی لایلایە و سرودی دایکی دەبێت کە هانی دەدات لەسەر ئازایەتی و رەوشتی چاك، بێگومان دەبێتە گەورەیەك کە دانایی لێ دەبارێ، و سەروەرێتی لەژێر باڵەکانیا دەبێت، هەروەك (عبداللە کوڕی عباس)ش لەژێر کاریگەری دایکی (ام فضل کچی حارث الهلالي)دا بوو.

بەڵام ئەو کەسەش بۆ یەکەمجار گوێبیستی ئەو گۆرانیە بێپەردەو ئاوازە پیس و پووچانە بێت کە دایکانی ئەم سەردەمە منداڵەکانیانی پێ دەلاوێننەوە، بێگومان شایستەیەتی کە سەرخۆش و بێشەرم و چەقاوەسوو و بێهیممەت و دەروون لاوازی لێ دەرچێت.

دایك مامۆستای جیهانەو ئەو ئافرەتەیە کە بەدەستی ڕاستی بێشکە ڕادەژەنێت و بە دەستی چەپیشی جیهان، جا بۆ ئەوەی ماڵ چاك بکەین پێویست دەکات کە دایك چاك بکەین چونکە گیان و کۆڵەگەی ماڵە)).[١]

لەپاش ئەم سەرەتایە ماوەتەوە بزانین ڕێسا سەرەکیەکانی پەروەردەکردنی کچ چیە؟ لێرەدا سێ ڕێسا هەیە:

## ڕێسای یەکەم: ڕێگری لە ڕق لێبوونی کچ:

قورئانی پیرۆز یەکەمجار دید و تێڕوانینی سەبارەت بە کچان ڕاست کردەوە کە لە کۆنەوەو تا ئێستاش لە کۆمەڵگا نەفامەکاندا هەر بڵاوە، قورئان هات عەقڵەکانی ئاڕاستە کرد بۆ ڕاستکردنەوەی تێڕوانینی بۆی، و ڕاستکردنەوەی بۆچوون لەبارەیەوە، و وای نیشاندا کە کچیش بەدیهێنراوێکەو خوای گەورە وەك تەواوکاری پیاو لە ژیاندا بەدیهێناوە، و ئەویش مافی خۆی هەیەو ئەرکی خۆیشی لەسەر شانە.

بەهۆی ڕاستکردنەوەی تێڕوانینیشەوە دەروونی مرۆڤایەتی لەسەرەتای ڕێگادا ساز و ئامادەکرد بۆ چاك هەڵس و کەوت کردن لەگەڵیدا و هەستان بە ئەرکی خۆی بەرامبەری، لەبەر ئەوەشە ئەم ئایەتە قورئانیە هات کە وێنای مێشکە گەنیووەکان، و دەروونە نەخۆشەکانی کێشاوە تا چارەسەریان بکات، هەر ئەوەش بووە هۆی کودەتایەکی نوێ لە ژیانی مرۆڤانەی ئافرەتانداو سەرەتا سەردەمی ڕووناکی بۆیان: ﴿ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِٱلْأُنثَىٰ ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴿٥٨﴾ يَتَوَٰرَىٰ مِنَ ٱلْقَوْمِ مِن سُوٓءِ مَا بُشِّرَ بِهِۦٓ ۚ أَيُمْسِكُهُۥ عَلَىٰ هُونٍ أَمْ يَدُسُّهُۥ فِى ٱلتُّرَابِ ۗ أَلَا سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴾النحل/٥٨-٥٩. واتە: (خۆ ئەگەر موژدەی بوونی کچ بدرێت بە یەکێك -لەو نەفامانە- ڕووی گرژ و تاڵ دەبێت و ڕەش دادەگیرسێت و سینەی پڕ دەبێت لە غەم و پەژارە، لە داخ و خەفەتی ئەو مژدە ناخۆشە خۆی لە خەڵکی دەدزێتەوەو و بەتەنها -بیردەکاتەوە- ئایا بیهێڵێتەوەو بە زەلیلی و سووکی و بێنرخی، یاخود -زیندەبەچاڵی بکا و- بیخانە تویی خاکەوە، ئای کە چەند بڕیارێکی ناڕێك و ستەمکارانەیە!!)

---

١ رسالة: أنجح الوسائل.

پاشان دەروونی مرۆڤایەتی هەژان و لێی پرسی و پرسیاری لە ویژدانی کرد، تا لەو نەفامیەی بێدار بێتەوە: ﴿وَإِذَا ٱلْمَوْءُۥدَةُ سُئِلَتْ ﴿٨﴾ بِأَىِّ ذَنۢبٍ قُتِلَتْ﴾التکویر/٨-٩. واتە: (کاتێ کچی زیندەبەچاڵ کراو پرسیاری لێ کرا، بە چ گوناهێك و بە چ تۆمەتێك کوژراوە؟)

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((**إن الله كره لكم ثلاثاً: عقوق الأمهات ووأد البنات ومنع وهات**)).[1] واتە: (خوای گەورە سێ کاری لێ قەدەغە کردوون و، حەز ناکات بیکەن: دڵ ڕەنجاندنی دایکان و، زیندەبەچاڵ کردنی کچان و، داواکردنی بەناحەق و نەدانی حەق).

(بخاری)یش[2] گێڕاویەتیەوە لە (ابن عمر)ەوە پیاوێکی لەلا بوو کە چەند کچێکی هەبوو، مردنیانی بە ئاوات دەخواست، (ابن عمر) توڕە بوو، وتی: تۆ رزق و ڕۆزیان دەدەیت؟! ئەمەش وتارێکی پێغەمبەرانەیە بۆ دایکان و باوکان تا دید و تێڕوانینیان سەبارەت بە کچان ڕاست بکەنەوەو رقیان لێ نەبێت و هۆگر و دڵنەوایان بن:

ئیمامی (احمد) و (طبرانی) لە (عقبە کوڕی عامر)ەوە گێڕاویانەوە کە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((**لا تكرهوا البنات فإنهن المؤنسات الغاليات**))[3] واتە: (رقتان لە کچان نەبێت، چونکە ئەوان هاودەم و دڵنەوای بەنرخ و خاوەن بەهان).

لە کۆتایی ئەم ڕێسایەشدا لەگەڵ شیکردنەوەکانی (ابن قیم)دا دەبین تا تەفسیر و ڕاڤەو ڕوونکردنەوەی ئەو فەرمایشتەی خوای گەورەمان بۆ بخاتەڕوو: ﴿لِّلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ۚ يَهَبُ لِمَن يَشَآءُ إِنَٰثًا وَيَهَبُ لِمَن يَشَآءُ ٱلذُّكُورَ ﴿٤٩﴾ أَوْ يُزَوِّجُهُمْ ذُكْرَانًا وَإِنَٰثًا ۖ وَيَجْعَلُ مَن يَشَآءُ عَقِيمًا ۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌ قَدِيرٌ﴾الشوری/٤٩-٥٠.[4]

---

١ رواه الطبراني ورجاله رجال الصحيح عن معقل بن يسار قاله الهيثمي في المجمع ١٤٧/٨.

٢ الأدب المفرد ١٥٨/١٠.

٣ قال الهيثمي في المجمع ١٥٦/٨ وفيه ابن لهيعة وحديثه حسن وبقية رجاله ثقات.

٤ **لەو ئاسمانانەو زەمینە فەرمانڕەوا هەر خودایەو چی بخوازێ دروست دەکات، بە یەکێ کچ دەبەخشێت و بە یەکێ کوڕ" ئیتر بە مەیلی خۆیەتی، یان دوانەی کوڕ و کچانیان دەداتێ، هێندێکانیش نەزۆك دەکات. هەر خۆی زاناو توانایە.**

(ابن قيم): دەڵێت:[١] خوای گەورە حاڵ و باری ژن و مێردی بۆ چوار بەش دابەش کردووە کە لە بووندا هەیە، و هەواڵیشی داوە کە ئەو منداڵەی لە نێوانیاندا پەیدا بووە ئەو پێی داون، ئەوەندەش بەسە بۆ بەندە کە بەر خەشم و قینی خوای گەورە بکەوێت کە ناڕازی بێت بەوەی پێی دراوە، خوای گەورە بەباس کردنی کچان دەستی پێکردووە: گوتراوە بۆ قەرەبووکردنەوەی کچانەیان تا دایك و باوك پایەیان بەرێز و قورس بگرن. وتراویشە -ئەو قسەیەش باشترە- لەبەر ئەوە کچانی پێش خستوون چونکە رووکاری قسەکردن بەو جۆرەیە کە خوا بکەری ئەو شتەیە کە دەیەوێ نەك ئەوەی کە دایك و باوك ئارەزوویانە، دایك و باوکیش بەزۆری تەنها کوڕیان دەوێت، خوای گەورەش هەواڵی داوە، کە ئەو هەرچی بوێت بەدی دەهێنێ، وبۆیە بە باسکردنی ئەو پێڕەی کە دەیەوێ دەستی پێکردووە کە دایك و باوك نایانەوێت.

من بۆچوونێکی دیکەم هەیە - قسەکەش هی (ابن القيم)ـە- ئەویش ئەوەیە کە خوای گەورە ئەوەی پێش خستووە کە نەفامەکان دوایان دەخست لەکاروباری کچان، هەتا زیندەبەچاڵیشیان دەکردن، واتا: ئەو جۆرەی کە لای ئێوە دواخراوە لای من پێش خراوە لەباسکردندا، جا را بمێنە کە چۆن خوای گەورە کچانی بە (نکرة=نەناسراو) داناو نێرینەشی بە (معرفـة= ناسراو) دانا، جا بە پێشخستن کەم و کورتی مێیینەی قەرەبوو کردۆتەوەو کەم و کورتی دواخستنەکەشی بە (تعریف=ناسین) قەرەبوو کردۆتەوە، کە بۆ ئاگادارکردنەوەیە.

وەك ئەوەی بفەرموێت: بۆ هەر کەسێك کە بیەوێ ئەو سوارچاکە ناودارانەی کە باس کراون پێی دەبەخشێت کە لای ئێوە شاردراوە نین، پاشان کە باسی هەردوو بێدەستەڵاتەکە پێکەوە دەکات نێرینەی پێشخستووە تا هەر رەگەزێکیان مافی خۆی پێبدات لە پێشخستن و دواخستنی-خوای گەورەش زاناترە کە چ مەبەستێکی لەوەدا هەبووە-.

(ابن القيم) درێژە بە قسەکانی دەدات و دەڵێت: خوای گەورە لەبارەی مافی ئافرەتانەوە دەفەرموێت: ﴿فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُوا۟ شَيْـًٔا وَيَجْعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا﴾ النساء /١٩.[٢]

---

١ أحكام المولود ص٢٠.

٢ ئەگەر رقتان لێیان بوەوە، شتی وا هەن ئێوە حەزی لێنەکەن و چاکەی زۆری لەخواوە بۆ ئێوە تێدابێ.

بەو جۆرە کچان بۆ مرۆڤەکان خێری دنیا و قیامەتیان تێدایە، ئەوەش بەسە بۆ قێزەون کردنی رق لێ بوونیان کە مرۆڤ رقی لە شتێك بێت کە خوای گەورە پێی رازیەو بەبەندەی خۆی بەخشیوە.

(صالح کوڕی احمد)یش دەڵێت: باوکم گەر کچێکی بوایە دەیوت: پێغەمبەران باوکی کچان بوون، وە دەیوت: لە کچاندا ئەوەندە هاتووە کە من پێی دەزانم، و (یعقوب کوڕی بختان) دەڵێ: حەوت کچم بوو، هەر جارێك کە کچێکم بوایە دەچوومە لای (احمد کوڕی حنبل) و ئەویش پێی دەوتم: ئەی (ابو یوسف)، پێغەمبەران باوکی کچ بوون، بەهۆی ئەو قسەیەیەوە خەم و پەژارەم دەڕەویەوە.

کەواتە رێسای یەکەم کورت دەبێتەوە لە لابردنی دید و تێڕوانینی خراپ و گەندەڵ سەبارەت بە کچان و رق لێ نەبوونەوەیان، لەگەڵ خۆشەویستی دەربڕین بەرامبەر ئەوەی کە خوای گەورە خۆشی ویستووەو بەخشیوویەتی بە دایکان و باوکان و خێریش لەوەدایە کە خوای گەورە هەڵی بژێرێت بۆ بەندەکەی نەك ئەوەی کە بەندە بۆ خۆی هەڵبژێرێت.

## رێسای دووەم: یەکسانی لەنێوان نێر و مێدا و جیاوازی نەکردن لەنێوانیاندا:

هەتا گەر خوای گەورە منداڵی کوڕ و کچیشی دا بە دایکان و باوکان، دید و تێڕوانینی ئیسلامیانە هاتووە کە چۆنیەتی هەڵس و کەوت کردن لەگەڵیاندا فێردەکات، ئەوەش بە بەدیهێنانی یەکسانی لە نێوانیاندا. هەتا پێغەمبەرﷺ کردویەتیە یەکێك لەهۆکارەکانی چوونە بەهەشت، ئەویش بەزاڵ نەکردنی کوڕ بەسەر کچدا، بەڵکو دەبێت لە خۆشەویستی پێدان و بەخشین پێیاندا یەکسان بن، وە لە ماڵ و دیاری بەخشین پێیان وەك یەك بن، لە رۆشنبیرکردن و داواکردنی زانست و زانیاریدا وەك یەك بن، لە هەڵس و کەوتدا وەك یەك بن، هەتا لە ماچکردنیشدا هەر وەك یەك ماچ بکرێن.

(ابو داود) لە (ابن عباس)ەوە م گێڕاویەتیەوە کە دەڵێت: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:((من کانت له أنثی، فلم یئدها، ولم یهنها، ولم یؤثر ولده یعني: الذکور علیها، أدخله الله الجنة)). واتە: (هەرکەسێك لە ئێوە کچی هەبوو، زیندەبەچاڵی نەکرد، سووکایەتی پێ‌نەکرد، کوڕەکەی بەسەردا زاڵ نەکرد، خوای گەورە دەیخاتە بەهەشتەوە).

(بزار)یش لە (انس)ەوەﷺ گێڕاویەتیەوە کە پیاوێك لەخزمەت پێغەمبەری خواﷺ دانیشتبوو، کوڕێکی هات لەسەر رانی داینا، پاشان کچێکی هات لەبەردەم خۆیدا داینا، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((ألا سويت بينهم))[1] واتە: (بۆ یەکسانیت لە نێوانیاندا نەنواند؟)

ئەم وردبینیەی پێغەمبەرﷺ لە هەڵس و کەوتکردن لەگەڵ منداڵی کوڕ و کچدا کە هەموو کۆمەڵگاکانی مرۆڤایەتی ئاشنای نین، و پەرتووکە رۆژئاواییەکان لە پەروەردەکردنی منداڵدا نایزانن و بە عەقڵی هیچ کام لەوانەی خۆیان بە زانای دەروونی پەروەردەیی ناو دەبەن نەهاتووە.

## رێسای سێیەم: پاداشتی پەروەردەکردن و چاکەو ئارامگرتن لەسەر کچان و بەشوودانیان:

شەریعەتی ئیسلام تەنها بە رووبەڕووبوونەوەی دەروونی مرۆڤایەتی نەوەستا تا بیگۆڕێت و بەس، بەڵکو تا پەروەردەی بکات و لەبەرامبەر پەروەردەکردنی کچانیشدا پاداشتی گەورە هەیە، بەرامبەر ئارامگرتنیش لەسەریان پاداشتی زۆر مەزن هەیە، ئەمەش بۆ ئەوەی ئازاری دایك و باوك کەم بکاتەوەو خاتریان بگرێت تا هەست بە گرنگی کارەکەیان و رۆڵیان لەم پەروەردەو چاودێری کردنەدا بکەن.

(مسلم)یش لەم بارەیەوە لە (انس)ەوەﷺ گێڕاویەتیەوە لە پێغەمبەرﷺ کە دەفەرموویێت:

((**من عال جاريتين -أي بنتين- حتى تبلغا، جاء يوم القيامة أنا وهو كهاتين**)). واتە: (هەرکەسێك دوو کچ بەخێو بکات و پەروەردەیان بکات هەتا باڵغ دەبن، ئەوا ئەو کەسە لە رۆژی قیامەتدا دێت، من و ئەو پێکەوە ئاواین... پەنجەکانی پێکەوە نووساند).

(بخاری) و مسلم) و (ترمذی)یش لە (عائشە)ەوە ڵ دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: ئافرەتێك دوو کچی پێبوو هاتە لام سواڵی دەکرد، لە دەنکە خورمایەك زیاتر هیچی دیکەی لای من بەدی نەکرد، دەنکە خورماکەم پێدا، ئەویش لەنێوان هەردوو کچەکەی دابەشی کرد و خۆی هیچی لێ نەخوارد، پاشان هەستا و رۆشت، کە پێغەمبەرﷺ هاتەوە لامان و بۆم گێڕایەوە، فەرمووی: ((**من ابتلي من هذه البنات بشيء فاحسن اليهن، كنَّ له ستراً من النار**)).واتە: (هەرکەسێ دووچاری ئەم کچانە بێت و چاك بێت بۆیان ئەوا دەبنە پەرژین بۆی و لە ئاگری دوزەخ دەیپارێزن).

---

[1] قال الهيثمي في المجمع ٨/١٥٦: رواه البزار فقال حدثنا بعض أصحاب و لم يسمه وبقية رجاله ثقات.

لە گێڕانەوەی (مسلم)یشدا دەفەرمووێت: ((إن الله قد أوجب الجنة، أو أعتقها بها من النار)). واتە: (خوای گەورە بەهەشتی بۆ پێویست کردووە، یاخود بەهۆیەوە لەئاگر رزگاری دەکات).

(ابوداود) و (ترمذی)یش لە (ابوسعید الخدری)یەوەﷺ گێڕاویانەتەوە کە دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ دەفەرمووێت: ((من کان له ثلاث بنات أو ثلاث أخوات، أو بنتان أو أختان، فأحسن صحبتهن وأتقى الله فيهن فله الجنة)). واتە: (هەرکەسێك سێ کچ یاخود سێ خوشکی هەبێت، یان دوو کچ یاخود دوو خوشکی هەبێت، و بەجوانی بەخێویان بکات و لەبارەیانەوە پارێزکار بێت و لەخوا بترسێت، بەهەشتی بۆ هەیە).

لەگێڕانەوەی (ابوداود)یشدا دەفەرمووێت: ((من عال ثلاث بنات أو ثلاث أخوات أو أختين أو بنتين، فأدبهن، وأحسن اليهن، وزوجهن فله الجنة)). واتە: (هەرکەسێك سێ کچ یاخود سێ خوشك یاخود دوو خوشك یاخود دوو کچی هەبێت، بەجوانی ئەدەبیان دابدات و فێریان بکات و بۆیان باش بێت و پاشان بەشوویان بدات، ئەوە بەهەشتی بۆ هەیە).

لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا: ((من کان له ثلاث بنات أو أخوات، أو بنتان أو أختان، فأحسن صحبتهن وصبر عليهن وأتقى الله فيهن دخل الجنة)). واتە: (هەرکەسێك سێ کچ یاخود سێ خوشکی یان دوو کچ یاخود دوو خوشکی هەبێت، باش بێت لەگەڵیاندا و ئارام بگرێت لەسەریان و لەبارەیانەوە پارێزکار بێت و لەخوا بترسێت، دەچێتە بەهەشتەوە).

ئیمام (احمد)یش لە (ابوهریرە)وەﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:((من کان له ثلاث بنات فصبر على لأوائهن وعلى ضرائهن دخل الجنة)). واتە: (هەر کەسێ سێ کچی هەبێت و ئارام بگرێت لەسەر میحنەت و ناخۆشیان و لەسەر زیانەکانیان دەچێتە بەهەشتەوە).

لە گێڕانەوەیەکی کەدا پیاوێك وتی: ئەی دوان؟ فەرمووی: دوانیش، وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ! ئەی یەك، فەرمووی: یەکیش.

امام (احمد) لە (عقبە کوڕی عامر الجهنی)وەﷺ گێڕاویەتیەوە کە دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خواﷺ بوو دەیفەرموو: ((من کانت له ثلاث بنات، فصبر عليهن، فأطعمهن،

وسقاهن، وكساهن من جدته، كنَّ له حجاباً من النار يوم القيامة.[١])) واته: (هەركەسێك سێ كچی هەبێت، ئارام بگرێت لەسەریان و لەدەستكەوتی خۆی بەپێی توانا نان و ئاویان بداتێ و پۆشتەیان بكات، ئەوا لە ڕۆژی قیامەتدا دەبنە پەرژین بۆی و لەئاگر دەیپارێزن).

گرنگی ڕۆڵی پەروەردەكردنی كچ پێشتر باس كرا، چونكە دایكی ئایندەو دامەزرێنەری كۆمەڵگایە لە سبەینەیەكی نزیكدا، و دروستكەری پاڵەوانانە، و بزوێنەری مێژووە لە ساتێكی زۆر نزیكدا، ئایا بۆت هەیە بەشداری لە چاكسازی كۆمەڵگا بكەیت؟ ئەوە بە پەروەردەكردنی كچەكەت و خوشكەكەت بەدی دێت.

## دووەم: پەروەردەكردنی كوڕ و كچی هەتیوو:

پێغەمبەرﷺ قۆناغی هەتیوێتی بە پێش تەمەنی پێگەیشتن (باڵغ بوون) پێناسە دەكات، گەر باڵغ بوو ئەوا سیفەتی هەتیووێتی لەسەر ئەو منداڵە لادەچێت.

(ابو حنیفه) لە (مسند)ەكەیدا لە (انس)ەوەﷺ گێڕاویتەیەوە كە وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((لا يُتْمَ بعد حلم))[٢] واتە: (دوای باڵغ بوون هەتیوو نابێت).

(ابوداود)یش لە (علی)ەوەﷺ گێڕاویەتیەوە كە دەڵێت: لە پێغەمبەری خواوەﷺ لەبەرم كرد كە: ((لا يُتْمَ بعد إحتلام))[٣] واتە: (دوای باڵغ بوون هەتیوو نابێت).

پەروەدەكردنی هەتیوو لە سێ ڕێسادا كورت دەبێتەوە:

## ڕێسای یەكەم: پاداشتی چاودێریكردنی هەتیوو و پەروەردەكردنی و دڵڕاگرتنی:

ئێستاش لەگەڵ چەند فەرموودەیەكی پێغەمبەرداﷺ دەبین كە دەروون دەهێنێتە جۆش و خرۆش و بانگی لێ دەكەن بۆ بایەخ پێدانی چاودێری كردنی ئەو هەتیووەی كە باوكی لەدەست داوە بەر لە تەمەنی باڵغ بوون، ئەمەش بەپێی فەرموودەی پێغەمبەرﷺ هەروەك (ابوداود) گێڕاویەتیەوە: ((لا يُتْمَ بعد الأحتلام))، ئەمەش شایستەی ئەوەیە كە بە پەروەردەكردنی هەستن، چونكە یەكێك لە پایە سەرەكیەكانی پەروەردە وەرگرتنی لەدەست داوە.

---

١ صحيح، أنظر صحيح الجامع رقم ٦٤٨٨ ورواه ابن ماجه.

٢ أنظر عقود الجواهر المنيفة ٩٤/٢ للزبيدي.

٣ صحيح ورواه احمد وابوداود والترمذي.

(بخاری) لە (سهل)ەوە هێناویەتی کە دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموویت: ((أنا وكافل –القائم بأمور– اليتيم في الجنة هكذا)). واتە: (من و سەرپەرشتکاری هەتیوو لەبەهەشتدا ئاواین).

ئاماژەی بەهەردوو پەنجەی شایەتمان و پەنجەی ناوەڕاست کرد و لێکی کردنەوە.[1]

(بیهقی)یش لە (عمر)ەوەﷺ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((أحب بيوتكم الى الله بيت فيه يتيم مكرم)).[2] واتە: (خۆشەویستترینی ماڵەکانتان لای خوا ماڵێکە کە هەتیووێکی ڕێزلێگیراوی تێدایە).

(ابن ماجە)ش لە (ابوهریرە)ەوەﷺ گێڕاویەتیەوە کە دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((خير بيت في المسلمين بيت فيه يتيم يحسن اليه، وشرّ بيت في المسلمين بيت فيه يتيم يساء اليه، أنا وكافل اليتيم في الجنة كهاتين)). واتە: (باشترین ماڵی نێو موسڵمانان ئەو ماڵەیە کە هەتیووێکی تێدایەو چاکن لەگەڵیدا، خراپترین ماڵی نێو موسڵمانانیش ماڵێکە کە هەتیووێکی تێدایەو خراپن لەگەڵیدا، من و سەرپەرشتیاری هەتیوو لە بەهەشتدا ئاوەهاین.... ئاماژەی بە هەردوو پەنجەکەی کرد).

پێغەمبەرﷺ ڕێسایەکیش بۆ دڵڕەقان دادەنێت تا هەست بە بەخششەکانی خوای گەورە بەسەریانەوە بکەن، وەك دەرمان و چارەسەرێکی بەسوود کە بیهەژێنێت.

(طبرانی) لە (ابودرداء)ەوەﷺ گێڕاویەتیەوە کە پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەرﷺ و سکاڵای دڵڕەقی خۆی کرد، پێغەمبەریشﷺ پێی فەرموو: ((أتحب أن يلين قلبك وتدرك حاجتك؟! أرحم اليتيم وأمسح رأسه وأطعمه من طعامك يَلِنْ قلبك وتدرك حاجتك))[3] واتە: (حەز دەکەیت کە دڵت نەرم بێت و بەپێویستی خۆت بگەیت؟ بەزەییت بە هەتیوودا بێتەوەو دەست بهێنە بەسەریدا و لەخواردنی خۆتی دەرخوارد بدە، بەوە دڵت نەرم دەبێت و بە پێویستیەکانی خۆت دەگەیت).

پیغەمبەری خواﷺ ئەو منداڵانەی دەلاواندەوە کە باوکیان شەهید بوبوو، و هەتیوو کەوتبوون، لە (اسماء کچی عمیس)ەوە م دەگێڕنەوە کە دەڵێت: کاتێك کە (جعفر) و

١ الحديث حسن بشواهده، قاله الأرناؤوط في جامع الأصول ٦٤٢/١١.
٢ ورواه ابن ابي الدنيا في كتاب العيال (٨٠٩/٢) بلفظ (يكرم).
٣ صحيح. أنظر صحيح الجامع رقم ٨٠.

هاوڕێکانی شەهید بوون، چوم بۆ لای پێغەمبەری خواﷺ و چل پێستەم خۆشە کردبوو، دوو هەویرم شێلابوو، منداڵەکانم شۆردبوو و بۆنخۆشم کردبوون و پاکم کردبوونەوە، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: منداڵەکانی (جعفر)م بۆ بێنە، دەڵێ: منیش بۆم برد، بۆنی کردن و پاشان فرمێسک بە چاوەکانیدا هاتە خوارەوە، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خواﷺ! دایك و باوکم بە قوربانت بێ! چی دەتگرییێنێ؟هیچت دەربارەی (جعفر) و هاوەڵەکانی بیستووە؟ فەرمووی: بەڵێ! ئەمڕۆ شەهید بوون.[1]

## ڕێسای دووەم: پاراستنی سامانی هەتیوو و بازرگانی کردن بەسامانەکەی:

لە (ابوشریح خویلد کوڕی عمرو الخزاعی)ەوەﷺ دەگێڕنەوە کە دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((اللهم اني أُحرجُ حق الضعيفين: اليتيم والمرأة)).[2] واتە: (خوایە پێشێل کردنی مافی ئەو دوو بێدەستەڵاتە بە گوناه دادەنێم: هەتیوو و ئافرەت).

(نووی) دەڵێ: (أُحرجُ) واتە بەگوناهی دادەنێم کە مافیان بەزایە بدرێ، ولەمەشدا ئەوپەڕی ئاگاداری دەدەم و سەرزەنشتێکی بێگومان دەکەم.

لە (عائشە)ەوەڵ هێناویانە کە دەڵێت:[3] پیاوێك کچێکی هەتیووی لابوو مارەی کرد، دارخورمایەکی هەبوو، لە دارخورماکەو لە ماڵەکەشیدا کچە لەگەڵی شەریك بوو، لەبەر ئەوە خواستی ئەگینا دڵی بۆی نەدەچوو، جا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَىٰ فَانكِحُوا مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاءِ مَثْنَىٰ وَثُلَاثَ وَرُبَاعَ ۖ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَلَّا تَعُولُوا﴾النساء/٣. واتە: (ئەگەر ترسان لە ئەنجامی نەدانی دادپەروەری لەگەڵ کچە هەتیووەکاندا (ئەگەر بیانکەنە هاوسەرتان، ئەوا واز لەوان بێنن)، لە ئافرەتانی تر چۆن بۆتان دەلوێت ژن مارەبکەن دوان یا سیان یا چوار، خۆ ئەگەر ترسان لەوەی کە نەتوانن دادپەروەر بن با هەر یەك هاوسەرتان هەبێت یان ئەو کەنیزەکانەی هەتانە، ئەمە دواچارەیە بۆ ئەوەی تووشی ستەم نەبن لە خەرجی و مافەکانی تردا).

---

١ رواه أحمد ٦/٣٧٠.

٢ حديث حسن، رواه النسائي.

٣ أخرجه مسلم والبخاري والترمذي والنسائي عنها.

لەگێڕانەوەیەکی دیکەدا هاتووە کە (عروە) دەربارەی ئەو فەرمایشتەی خوای گەورە کە لەسەرەوە هاتووە پرسیاری لێی کرد، فەرمووی: ئەی خوشکەزام! ئەو هەتیووەیە کە لەلای بەخێوکارەکەی بێت، ئەویش ئارەزووی لە جوانی و سامانەکەی بێت و بیەوێت مارەیی کەم بداتێ، ئەوا قەدەغە کراوە بۆی کە مارەی کات، هەتا هەموو مارەیی نەداتێ، فەرمان کراوە کە لە کەسی دیکە مارە بکرێ.

(عائشە)ڵ دەڵێت: خەڵکی پاش ئەوە لەو بارەیەوە پرسیاریان لە پێغەمبەرﷺ کرد، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي ٱلنِّسَآءِ ﴾ هەتا ﴿وَتَرْغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ ﴾النساء/١٢٧. کە خوای گەورە تێیدا روونی کردۆتەوە کە کچی هەتیوو ئەگەر جوان و خاوەن سامان بوو ئارەزوویان لێبوو مارەی بکەن و مارەیی تەواوی نەدەنێ، و ئەگەر ئارەزووی بۆ نەدەچوو و لەبەر کەمی ماڵ و سامان و جوانی ئەوا وازی لێ بێنن و بەدوای ئافرەتی دیکەدا بگەڕێن، هەروەك چۆن کە ئارەزوویان لێی نیە وازی لێ دێنن، ئاواش کە ئارەزوویان لێی هەیە پێویستە لەگەڵی چاك بن و مافی تەواوی خۆی لەمارەیی پێ بدەن.

(بخاری) و (مسلم)یش هەر لە (عائشە)وەش گێڕاویانەتەوە لەبارەی ئایەتی: ﴿وَمَن كَانَ غَنِيًّا فَلْيَسْتَعْفِفْ وَمَن كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِٱلْمَعْرُوفِ ﴾النساء/٦.

دەڵێ: ئەم ئایەتە لەسەر بەخێوکەری هەتیوو هاتە خوارەوە گەر هەژار و نەدار بێت، دەتوانێت لە سامانی هەتیووەکە بخوات، و پێویستە لەسەری کە بەچاکی بەسەرپەرشتی هەڵسێت.

لە (ابن عباس)ەوە م دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: کاتێ خوای گەورە ئەم ئایەتانەی ناردە خوارەوە: ﴿ وَلَا تَقْرَبُوا۟ مَالَ ٱلْيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ حَتَّىٰ يَبْلُغَ أَشُدَّهُۥ ﴾الإسراء/٣٤. واتە: (نەچن توخون ماڵی هەتیوان بکەون، مەگین جۆرێ کە باشتر بێ، هەتا پێدەگا و تێدەگا).

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَٰلَ ٱلْيَتَٰمَىٰ ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِى بُطُونِهِمْ نَارًا وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا ﴾النساء/١٠. واتە: (ئەو کەسانەی بەناڕەوا دارایی هەتیوان دەخۆن با بزانن کە ئاگرێ دەخەنە هەناویانەوەو تووشی ئاگرێکی بە هەڵپەو گڕ دەبن).

دەڵێ: هەموو ئەوانەی هەتیوویان لابوو رۆشتن خواردن و خواردنەوەی هەتیووەکانیان جیا کردەوە لەهی خۆیان، و ئەو بەشەی لە خواردنەکەی هەتیووەکان دەمایەوە بۆیان هەڵدەگرت تا دەیخوارد و تەواوی دەکرد یاخود خراپ دەبوو، ئەمەش لەسەریان گران بوو، هەر بۆیە چوونە خزمەت پێغەمبەرﷺ و بۆیان باسکرد، ئەوەبوو خوای گەورە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْيَتَـٰمَىٰ ۖ قُلْ إِصْلَاحٌ لَّهُمْ خَيْرٌ ۖ وَإِن تُخَالِطُوهُمْ فَإِخْوَٰنُكُمْ﴾البقرة/٢٢٠. واتە: (لێت دەپرسن دەربارەی هەتیوان چۆن بین؟ بڵێ: ئەگەر بە دڵسۆزی ئاگاتان لێ بن کاری چاکە، ئەگەر دەگەڵ ئێوە دەژین، وەك براو خۆشکی خۆتان بن).

ئیدی خواردن و خواردنەوەیان تێکەڵ بەهی خۆیان کردەوە.[1]

بەڵام بۆ بازرگانی کردن بەماڵی هەتیوو، ئەمە رێنمایی پێغەمبەرەﷺ:

(مالك) لە (الموطأ) لە (مالك کوڕی انس)ەوە رضي الله عنه هێناویەتی کە (عمر کوڕی خطاب) رضي الله عنه وتوویەتی: بازرگانی بکەن بە ماڵ و سامانی هەتیووەوە، تا زەکات نەیخوات.

(ترمذی)یش لە (عمر کوڕی شیب)ەوە : دەگێڕێتەوە لە باوکی و لە باپیریەوە کە پێغەمبەرﷺ وتاری بۆ خەڵك دەدا و فەرمووی: ((**ألا من وَلِيَ يتيماً له مال فليتجر فيه، ولا يتركه حتى تأكله الصدقة**))[2] واتە: (هەرکەسێك بەخێوکردنی هەتیووێکی کەوتە لا کە سامانی هەبوو، با بازرگانی پێوە بکات، و نەیهێڵێتەوە زەکات بیخوات).

---

١ رواه الحاكم في مستدركه ٢/٣٠٣ وقال صحيح الأسناد و لم يخرجاه وسكت عنه الذهبي.

٢ ضعيف: أنظر ضعيف الجامع رقم٢١٧٨.

## ڕێسای سێیەم: پاداشتی ئەو دایکەی هەتیووەکانی پەروەردە دەکات و شوو ناکاتەوە:

(ابـوداود) و (ابـویعلی)[١] لـە (عـوف کـوڕی مالـك)ەوە و ئـەویش لـە پێغەمبـەرەوەﷺ گێڕاویانەتەوە کە فەرموویەتی: ((أنا وامرأة سفعاء الخدين، آمت من زوجها فصبرت علـى ولدها كهاتين في الجنة)). واتە: (من و ئەو ئافرەتەی لەبەر زەحمەت و ناخۆشـی ڕومەتـەکانی ڕەش داگەڕاوە و بێوەژن کەوتووەو شوو ناکاتەوە و ئارام دەگرێت لەسەر منداڵەکەی، وەك ئـەم دوو پەنجەیەیە واین لە بەهەشتدا).

(ابو داود) ئەوەشی بۆ زیـاد کـردووە: ((ذات منصب وجمال، حَبَست نفسها على يتاماها حتى بانوا، أو ماتوا))[٢] واتە: (ژنەکە خاوەن پایەو جوانیـە، و نەفـسی خـۆی دەگرێـت لەسـەر منداڵە هەتیووەکانی هەتا گەورە دەبن یا دەمرن).

بەم جۆرە گرنگـی و بایـەخی پێغەمبـەری خوامـانﷺ بینـی بەرامبـەر کـچ و هـەتیووی بێدەستەڵات، و خەڵکی ئاڕاستەکرد بۆ زیاتر گرنگی دان پێیان و ئاگاداربوونیان و چـاك بـوون بۆیان، چونکە ئەوە ڕێزلێگیراوە، بەڵام چۆن ڕێزێك.

## بنچینەی هەشتەمی سـۆزداری - هاوسـەنگی لـە خۆشەویـستی منداڵ بەبێ زیادڕۆیی و بەزایەدان:

شێخی پایەبەرز (محمد الخضر حسين) لەکاتێکـدا کـە دەربـارەی پێویـست هاوسـەنگی لـە خۆشەویستی منداڵدا ئاگادارمان دەکاتەوە، دەڵێت:[٣] لەنێو خەڵکیدا کەسـانی وا هـەن کـە وا دەزانن گۆشکردنی منداڵ بە مەمکی پەروەردە کاریگەریەکی وای هەیە کە دەروونیان زۆر چاك بکات، بەڵام زیادەڕۆیی بـەزەیی کـە بـەهۆی ڕۆچـوون لـە خۆشەویـستیاندا دروسـت دەبێـت، بەشێکی زۆری توندی باوکان دەشکێنێت، وە دووریان دەخاتەوە لە قەڵاچۆکردنی خووڕەوشـتە خراپەکانی منداڵەکانیان و بەرگریکردنی بە تەمبێکردن، ئـەم پشتگوێخـستنەش دەیانبـات بەرەو تێرکردنی ئارەزووە پۆخڵەکان، نەخێر ئەم بەزەییە حیکمەتی تێدا نیە، لەگەڵ ئەوەی کـە گەڕان بە شـوێن تێرکردنـی ئارەزووەکانـدا ئـەنجامی خراپـی لێ دەکەوێتـەوە و دەبێتـە هـۆی

---

١ كما في الأدب المفرد ١/٢٢٨.

٢ في سنده النهاس بن فهم وهو ضعيف. أنظر جامع الأصول ١/٤١٤.

٣ السعادة العظمى ص١٠.

جیابوونەوە و دوورکەوتنەوەی باوك و کوڕ بەقەد ئەو سۆز و نزیکیەی پێشتر لە نێوانیاندا هەبوو، و دەیانبات هەتا ئەو کاتەی دەکەونە بەر کەڵبەکانی چەوساندنەوەو پێیەکانی سووکایەتی پانیان دەکاتەوە، نامانەوێت بە ناپەسەندکردنی ئەو بەزەییە زیادەڕۆیە هەموو ویستەکانی مندالْ بفەوتێت و هەموو عەزیمەتەکانی دابمالْرێت، هەروەك نەفامەکان بە شێوازەکانی چاکسازیو پەروەردەکردن دەیکەن، کە ئەمەش دەبێتە هۆی دروست نەبوونی نەفس بەرزی و شوێنکەوتەکانی لە خۆڕاگری و ڕەسەنایەتی لە بیروبۆچووندا و دەستپێشخەری لە وتنی حەق لە کاتی پێویستدا، بەڵکو دەبێتە یاری بەدەست هاودەمەکانیەوەو وەکو تۆپی ناو گۆڕەپان هەرجارەی یەکێك دەیگرێتەوە، یان دەیکەنە ئامێرێك و بۆ شتانەی ئارەزوویان لێیەتی بەکاری دەهێنن.. پەروەردەی سوودبەخش هەرگیز شوێنەواری خۆشەویستیەك نەبووە کە هیچ گەرمیەکی ترس نەهێڵێت و خامۆشی بکات، یان توندوتیژییەك کە سۆز و بەزەیی تێدا بزربێت، ئەوەیە کە وا پێویست دەکات مندالْ بپاڕێنەوەو بڵێن: ﴿رَّبِّ ارْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرًا﴾ خوایە بەزەییت پێیاندا بێتەوە هەروەك بەبچووکی پەروەردەیان کردم.

جا لەسەر قسەکانی بەردەوام دەبێ و دەڵێ: هەتا ئێستاش هەندێ لە خاوەن ماڵەکان و ئەوانەی هەوڵ دەدەن پێیان بگەن لە گرنگی پەروەردە شارەزا نەبوون، هەر بۆیە زیادەڕەوی دەکەن لە ڕۆیشتن لەگەڵ هەموو ئارەزووەکانی مندالْ، و وازی لێ دێنن کە چی ئارەزووی لێیە بیکات، لەوانەشە لەناو کۆمەڵی زۆر قەرەباڵغدا پیایدا هەڵبدەن و شتی وای لەبارەوە بڵێن کە لەگەڵ ئەنجامەکەی یەك ناگرێتەوە، بەراستی خراپیان بەسەر هێناوە گەر بیزانن، بەوە داوێکیان بۆ ئەو بەستەزمانە داناوە کە بەربەستە لەبەردەم دەروازەکانی ئادابی جواندا، و پەردەیەکی ئەستوور دەخاتە نێوان خۆی و بەختەوەری.[1]

بەم جۆرە دەبینین کە بەزەیی و سۆز و بنیاتنانی سۆزداری هەرکاتێك هاوسەنگ بێت لەو بنیاتنانە نزیك دەبێتەوە کە هەموو کاتێك بە ئیزنی پەروەردگاری بەرهەمدار دەبێت، دەتوانین بەزەیی و میهر و سۆز بچوێنین بە ژەمە ناخواردنێك، هەروەك چۆن زۆر خواردن دەبێتە هۆی ورگ پڕی و نەخۆشی، ئاوەهاش بەزەیی و سۆزی زیاد دەبێتە هۆی نەخۆشی نازداری کە بەهۆی ئەویشەوە تووشی خاویو لێ نەبڕانی دەکات.

بەڵام پرسیارێك دەمێنێتەوە، ئایا ئەو بەند و بەست(الضوابط)انە چیە، کە ئەو خۆشەویستی و سۆزە هاوسەنگ دەکات؟

---

١ السعادة العظمی ص١٠.

## بۆ وەڵامدانەوەی ئەوەش سێ ڕێسا بەدی دەکەین:

## ڕێسای یەکەم: خۆت و منداڵەکەت پابەندی شەرعی خوا بکەیت:

خۆشویستنی منداڵ سنووری هەیە.. خۆشەویستی دایك و باوکیش بەهەمان شێوە سنووریان هەیە.

خۆشویستنی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ پێش هەر خۆشەویستیەکی دیکە خراوە، و ئەو خۆشەویستیە بەندوبەست دەبێت کاتێك کە فەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ یەك نەگرێتەوە لەگەڵ ئارەزووەکانی منداڵ یان دایك و باوك یەك ناگرێتەوە، ئا لێرەدا باوەڕدار خێرا بەرەو لای خۆشویستنی خواو پێغەمبەر ﷺ دەڕوات، و پەلەیەتی بۆ بەجێهێنانی فەرمانەکانی و دوورکەوتنەوە لەوەی قەدەغەی کردووە.

(بخاری) و (مسلم) و (نسائی) لە (انس)ەوە ﷺ هێناویانە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((**والذي نفسي بيده! لا يؤمن أحدكم حتى أكون أحب اليه من والده وولده والناس أجمعين**)). واتە: (سوێند بەوەی نەفسی منی بەدەستە! باوەڕی کەستان تەواو دانامەزرێ تا منی لە دایك و باوك و منداڵەکانی و گشت خەڵك زیاتر خۆش نەوێت).

(ترمذی)یش لە (سلیمان کوڕی عمرو کوڕی احوص)ەوە -ڕەحمەتی خوای لێبێ- گێڕاویەتیەوە کە دەڵێت: باوکم بۆی باس کردم کە لە حەجی ماڵئاوایی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ ئامادە بووە، سوپاسی خوای کرد و بەیادی هێنایەوەو ئامۆژگاری کردین، پاشان فەرمووی: ((**ولا يجني والد على ولده ولا يجني ولد على والده**)). واتە: (با هیچ باوکێك تاوان بەرامبەر منداڵەکەی نەکات و هیچ منداڵێکیش تاوان بەرامبەر باوکی نەکات).

لە کاتێکدا کە پێغەمبەر ﷺ لەسەر مینبەرەکەی بوو، (حسن) کەوت، ئەویش هاتە خوارەوەو هەڵی گرت و ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿إِنَّمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَأَوۡلَٰدُكُمۡ فِتۡنَةٞ﴾التغابن/١٥.[1]
واتە: (بێگومان ماڵ و منداڵەکانتان مایەی فیتنەن بۆتان).

سەروەریشمان (ابراهیم) بە پێشخستنی فەرمانی خوا لە سەربڕینی کوڕەکەی و بەدەمەوەچوونی کوڕەکەشی، نمونەیەو پێشەنگێکی چاکە بۆ هەرکەسێك پەندی لێ وەربگرێت.

---

١ أخرجه أصحاب السنن من حديث بريدة في الحسن والحسين معا يمشيان و يعثران قال الترمذي حسن غريب.

## ڕێسای دووەم: پێویستە میواندۆستێکی بەڕێز و بەخشندە و ئازا و زانستخواز بێت:

(حاكم) لە (اسود کوڕی خلف)ەوە و (طبرانـی) لە (خولە کچی حکیم)ەوە گێڕاویانەتەوە کە دەڵێت: پێغەمبەرﷺ (حسن)ی گرت و ماچی کرد و فەرمووی: ((**إن الولد مبخلة مجبنة، مجهلة محزنة**))[1]. واتە: (منداڵ هۆی ڕژدی و ترسنۆکی و نەفامی و غەمگینی یە).

امام (احمد) و (ترمذی)یش لە (خولە کچی حکیم)ەوە گێڕاویانەتەوە کە پێغەمبەری خواﷺ هاتە دەرەوەو یەکێك لە کوڕەکانی کچەکەی لەباوەش کردبوو، و دەیفەرموو: ((**والله! إنكم لتبخلون، وتجبنون، وتجهلون، وإنكم لمن ريحان الله**)). واتە: (وەڵاهی ئێوە هـۆی ڕژدی و ترسنۆکی و نەزانین، و هەر ئێوەش لە ڕێحانەکانی خودان).

(زمخشری) دەڵێ:[2] مانای ئەوەیە کە منداڵ بـاوکی توشـی ڕژدی دەکـات تـا سـامانەکەی بمێنێتەوە بۆ ئەو، وە نەزانیشی دەکات بەهۆی سەرقاڵ بوونیەوە بە ئەوەوە لەبری زانستخوازی، و ترسنۆکیشی دەکات لەترسی ئەوەی کە نەوەك بکوژرێت و دوای خۆی منداڵەکەی بفەوتێن، و دەیخاتە غەمگینیشەوە چونکە بۆ ئیش و کارەکانی ئەو غەم دایدەگرێت، وە وتنـی (**وإنكم لمن ريحان الله**) واتا ئەوان بۆن دەکرێن و ماچ دەکرێن، کەواتە ئەوان لە کـۆی ئـەو ڕێحانانـەن کـە خوای گەورە شینی کردوون.

جا لەبەر ئەوەی منداڵ ڕژدکەرەو چاوچنۆکی و ڕژدی لـە دەروونـی دایـك و باوکـدا پەیـدا دەکات، ئەوەش بەهۆی زۆر خۆشویستنی منداڵـەکانیـان و کۆکردنـەوەی مـاڵ و سـامانەکەیان بۆیان، چارەسەری ئەوەش بە ڕێزگرتنی میوان دەبێت، هەروەك هاوەڵان دەیانکرد و پێغەمبەری خواﷺ دڵخۆش بوو پێیان و خوای گەورەش بەو ڕێزگرتنەیان ڕازی بوو:

(بخاری) و (مسلم) لە (ابوهریرە)ەوەرضي الله عنه هێناویانـە کـە دەڵێـت: پیاوێـك هاتـە خزمـەت پێغەمبەری خواﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا! برسیمە، پێغەمبەرﷺ ناردی بۆ لای هەندێك لە خێزانەکانی، یەکێکیان وتی: سوێند بەوەی تۆی بە حەق نـاردووە! جگـە لـە ئـاو هیـچم لا دەست ناکەوێت، پاشان ناردی بۆ لای یەکێکی دیکە ئـەویش هـەمان شـتی وت، بـەو جـۆرە هەموو خێزانەکانی هەمان وەڵامیان هەبوو، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((**من يضيفه يرحمه**

---

١ صحيح، أنظر صحيح الجامع رقم ١٩٠.

٢ الفائق ١٨٥: نقلاً عن (العلماء العزاب).

الله)) کێ میوانداری دەکات خوا رەحمی پێ بکات)، پیاوێکی ئەنصاری هەستایەوە کە پێیان دەوت(ابوطلحة) وتی: من میوانداری دەکەم ئەی پێغەمبەری خوا، جا بردیەوە بۆ ماڵەوەو بە خێزانەکەی وت: هیچت لا دەست دەکەوێت؟ وتی: نەخێر، تەنها خواردنی منداڵەکانمان هەیە، (ابوطلحة) وتی: بە شتێکەوە بیانخافڵێنە تا دەیانخەوێنیت، ئەگەر میوانەکەمان هاتە ژوورەوە وا دەردەخەین کە ئێمە نان دەخۆین، کە دەستی برد نان بخوات هەستە بۆ لای چراکە بەو نیازەی چاکی بکەیتەوە، بیکوژێنەرەوە، ئەویش وای کرد، پاشان میوانەکەیان دانا و نانەکەی خوارد و خۆیان بێ شێو سەریان نایەوە، کاتێك رۆژ بویەوە چوە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ، پێغەمبەری خواﷺ پێی فەرموو: ((**لقد عجب الله أو ضحك الله من فلان و فلانة**)). واتە: (خوای گەورە رازی بوو یاخود پێکەنی بە کردەوەی فلان پیاو و فلان ژن).

دوای ئەوە خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ﴾الحشر/٩. واتە: (خەڵکی تر لە خۆیان لە پێشتر دەزنن، هەرچەندە دەست تەنگیشیان هەیە).

لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا بەم شێوەیەیە: ((**قد عجب الله من صنیعکما بضیفکما اللیلة**)).واتە: (خوای گەورە لە کاری ئەمشەوتان لەگەڵ میوانەکەتان رازی بوو).

سەیری ئەم هاوسەنگیە.. و جوانی ئەو نەخشەکێشانە لە رێزگرتنی میوان بکە، هەرچەندە منداڵەکانیان پێویستیان بەو خواردنە هەبوو.. کەواتە پەروەردەی رۆژئاوایی لەکوێ و ئەو جوانیە لەکوێ؟!

لە (عمر کوڕی خطاب)یشەوەﷺ دەگێڕنەوە کە دەڵێت: رۆژێکیان پێغەمبەری خواﷺ فەرمانی پێکردین کە خێر بکەین، لەو کاتەشدا پارەم لابوو، وتم: ئەمڕۆ پێش (ابوبکر) دەکەوم، کە هیچ رۆژێك پێشی نەکەوتووم، هەستام نیوەی سامانەکەم هێنا، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: چیت بۆ خاوخێزانت هێشتۆتەوە؟ وتم: ئەوەندەی ئەمەم بۆ هێشتونەتەوە، پاشان (ابوبکر) هات و هەرچی هەبوو هێنابووی، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: چیت بۆ خاووخێزانت هێشتۆتەوە؟ وتی: خوا و پێغەمبەرەکەیم بۆ هێشتونەتەوە، (عمر) دەڵێت: منیش وتم: لە هیچ شتێك پێشت ناکەومەوە.[1]

---

١ رواه الحاكم في مستدركه ٤١٤/١ وقال صحيح على شرط مسلم ووافقه الذهبي.

## ڕێسای سێیەم: ئارامگرتن لەسەر نەخۆشکەوتن و مردنی منداڵ و چاوەڕوانی پاداشتەکەی لای خوای گەورە:

### ١- ئارامگرتن لەسەر نەخۆشکەوتنی منداڵ:

(ترمذی) لە (ابوهریرە)ەوەﷺ گێڕاویەتیەوە کە دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((ما يزال البلاء ينزل بالمؤمن والمؤمنة في نفسه وولده وماله حتى يلقى الله وما عليه من خطيئة)).[١] واتە: (بەردەوام بەڵاو مەینەت دادەبارێتە سەر پیاو و ئافرەتی بڕوادار لە خۆی و منداڵی و سامان و ماڵیدا، هەتا کە دەگەڕێتەوە بۆ لای خودا هیچ گوناهێکی لەسەر نەماوە).

لە گێڕانەوەی (مالك)یشدا هاتووە: ((ما يزال المؤمن يضارّ في ولده وحامته - أي خاصته وقرابته- حتى يلقى الله وليست له خطيئة)). واتا: (بەردەوام باوەڕدار زیان لە منداڵ و ماڵ و سامان و کەس و کاری نزیکی دەکەوێت هەتا دەگاتەوە بەر بارەگای خودا و هیچ گوناهێکی نەماوە).

(ابوداود)یش لە (محمد کوڕی خالد السلمی)ەوە -ڕەحمەتی خوای لێبێ- دەگێڕێتەوە، ئەویش لە باوکی و باپیریەوە، کە هاوەڵێتی پێغەمبەریﷺ کردووە، دەڵێت: لە پێغەمبەری خوامﷺ بیست کە دەیفەرموو: ((إن العبد اذا سبقت له من الله منزلة، فلم يبلغها، ابتلاه الله تعالى في جسده، أو في ماله، او في ولده)). واتە: (ئەگەر بەندەیەکی خوا ڕێز و پایەیەکی لای خوا بۆ نووسرابێت و پێی نەگەیشتبێت، خوای گەورە بەڵاو مەینەتی لە خۆی و ماڵی و منداڵی بەسەر دەهێنێت).

لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا ئەو زیادەیەی لەسەرە: ((ثم صبّره على ذلك حتى يبلغه المنزلة التي سبقت له من الله عز وجل)).[٢] واتا: (پاشان ئارامی پێ دەگرێت لەسەر ئەو بەڵایە هەتا دەگاتە ئەو پلەیەی کە خوای گەورە بۆی داناوە).

---

١ صحيح. أنظر صحيح الجامع رقم ٥٨١٥. ورواه احمد والحاكم وابن ابي الدنيا وابو نعيم في (الحلية).

٢ وفي سنده محمد بن خالد وهو مجهول ولكن يشهد لمعناه الحديث الذي قبله. انظر جامع الأصول٩/٥٨٥. ت.الأرناؤوط.

## ٢- پاداشتی ئارامگرتن لەسەر مردنی منداڵ:

خوای گەورە دەفـەرموویت: ﴿ وَأَمَّا ٱلْغُلَـٰمُ فَكَانَ أَبَوَاهُ مُؤْمِنَيْنِ فَخَشِينَآ أَن يُرْهِقَهُمَا طُغْيَـٰنًا وَكُفْرًا ﴿٨٠﴾ فَأَرَدْنَآ أَن يُبْدِلَهُمَا رَبُّهُمَا خَيْرًا مِّنْهُ زَكَوٰةً وَأَقْرَبَ رُحْمًا ﴾الكهف/٨٠-٨١. واتە: (منداڵەکەش -کەکوشتم- دایك و باوکێکی ئیمانداری هەبو، ترساین لەوەی کە بەسەرکەشی و بێدینی و خوانەناسی هیلاك و ماندویان بکات -چونکە هەرلە ئێستاوە سەرکەشـی و لاساری پێوە دیارە-، - بەو کارەمان- ویستمان کە پەروەردگاریان -لەجیاتی ئەو- پـاکتر و چـاکتریان پێببەخشێ وە لە منداڵێکی خاوەن بـەزەیی و میهرەبـان بکـات -و کوژراوەکـەش بەهەشـتی بێت-.

(ابن کثیر) لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: واتا خۆشەویستیەکەیان وای لێ دەکرد بەردەوام بێـت لەسەر بێباوەڕی. (قتادە)ش دەڵێت: کاتی لەدایك بوونی دایك و باوکی دڵیان پێی خۆش بـوو، کاتێ کوژرا بۆی دڵگران بوون، خۆ گەر بمابایە ناڕەحەتیو تیاچوونی ئەوانی تێدابوو، هەر بۆیـە با مرۆڤ ملکەچ و رازی بێت بە قەزای خودا و گەر خوای گەورە بڕواداری تووشی ئەوە کرد کـە بەلایەوە خۆش نەبوو چاکترە بۆی لەوەی کە ئەوەی خۆی حەزی پێیەتی تووشی بهاتایە.

(ترمذی)یش گێڕاویەتیەوە[١] لە (ابو موسی)ەوەﷺ (و دەڵێ فەرموودەیەکی (حسن)ە)، کـە وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموویت: ((**إذا مات ولد عبد قال الله لملائكته: قبضتم ولد عبدي؟ فيقولون: نعم، فيقول: قبضتم ثمرة فؤاده؟ فيقولون: نعم، فيقول: فماذا فعل عبدي؟ فيقولون: حمدك واسترجعك، أي قال: إنا لله وإنا اليه راجعون-، فيقول الله تعـالى: ابنـوا لعبدي بيتاً في الجنة وسموه بيت الحمد**)). واتە: (کاتێك منداڵی کەسێك دەمرێت، خوای گەورە بە فریشتەکانی دەفەرموویت: گیانی رۆڵەی بەندەکەمتان کێشا؟ دەڵـێن: بـەڵێ، دەفـەرمووێ: بەروبوومی دڵێتان کێشا؟ دەڵـێن: بـەڵێ، ئـەمجا دەفـەرموویت: بەندەکـەم چـی وت؟ دەڵـێن: سوپاسی تۆی کرد و (إنا لله وإنا اليه راجعون)ی کرد، خوای گەورە دەفەرموویت: لە بەهەشتدا خانوویەك بۆ بەندەکەم دروست بکەن و ناوی بنێن خانووی سوپاسگوزاری).

(بخاری) و (مسلم)یش بەشێکیان لە (انس)ەوەﷺ گێڕاوەتەوە کە پێغەمبەری خواﷺ چوویە بۆ لای (ابراهیم)ی کوڕی لە کاتێکدا کە گیانی دەدا، چاوەکانی پێغەمبەری خواﷺ هۆن هـۆن

---

١ أنظر سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم ١٠٤٨.

فرمێسکیان پێدا دەهاتە خوارەوە، (عبدالرحمن کوڕی عوف) پێی گوت: ئای! ئەوە تۆش دەگریت ئەی پێغەمبەری خوا؟! فەرمووی: ((يا ابن عوف! إنها رحمة -ثم أتبعها أخرى فقال-: إن العين تدمع والقلب يحزن ولا نقول الاّ ما يرضي ربنا، وإنا بفراقك يا ابراهيم لمحزونون)). واتە: (ئەی (ابن عوف)! ئەمە نیشانەی رەحم و میهرەبانییە، -ئینجا فەرمووی-: چاو پڕدەبێت لە ئەسرین و دڵیش خەفەتبار دەبێت، بەڵام بەزمان ئەوەی رازی خودای پەروەردگارمانی لەسەر نەبێت نایڵێین، لە راستیدا ئەی (ابراهيم)! ئێمە لە دووری و جیابوونەوەی تۆ غەمگین و غەمبارین).

(ابن الحجر) لە لێکدانەوەی ئەم فەرموودەیەدا دەڵێت: (ابن بطال) و کەسانی دیکەش وتوویانە ئەم فەرموودەیە راڤەی گریانی رێگەپێدراو(مباح) و غەمگینی رێگەپێدراو دەکات، ئەوەیە کە فرمێسکی چاوو نەرمی دڵی لەگەڵدا بێ بەبێ توڕەبوون و خەشم لە فەرمانی خوا، ئەوە دیارترین لەم واتایە دا شتە بێتەدی، هەروەها مەشروعیەتی ماچکردنی منداڵ و بۆنکردنی و مەشروعیەتی شیرپێدان و سەردانی منداڵی ساوا و ئامادەبوون لای لەکاتی گیانەڵادا و سۆز و بەزەیی بەرامبەر منداڵان، لەگەڵ رێگەدان بە باسکردنی خەم و خەفەت هەرچەندە شاردنەوەی لەپێشتر و چاکترە، وە ئەوەشی تێدایە کە قسە لەگەڵ کەسێك بکەیت و مەبەستت کەسێکی دیکە بێت، ئەمانەش هەردووکیان لەو گفتوگۆیەی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ کوڕەکەی وەرگیراوە، هەرچەند کوڕەکەی لەو بارودۆخەدا لە دوو لاوە لەو گفتوگۆیە نەدەگەیشت: یەکەمیان بچووکی تەمەنی، دووەمیش کاتی گیانکێشانی، بەڵکو مەبەستی پێغەمبەری خواﷺ لەو گفتوگۆیەی کەسانی تر بوو کە لەوێ ئامادە بوون، و ئاماژەیەکیشە بەوەی کە ئەمە ناکەوێتە ناو ئەو رێگری(نهي)ـەکەی پێشتری.

لە (صحيح)ی (بخاری) و (مسلم)یشدا هاتووە لە (انس)ەوەﷺ دەگێڕنەوە کە دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ دەفەرمووێت: ((ما من مسلم يموت له ثلاثة لم يبلغوا الحنث، الاّ أدخله الله الجنة بفضل رحمته إياهم)).[1] واتە: (هەر موسڵمانێك سێ منداڵی بمرێت کە نەگەیشتبنە تەمەنی بلوغ، ئەوا خوای بەخشندە بە فەزڵی رەحمەتی خۆی لەبەر ئەو منداڵانە دەیخاتە بەهەشتەوە).

---

١ الأحاديث الواردة في موت ثلاثة أولاد أو ولدين أو ولد واحد حجاب من النار. أخرجها البخاري كتاب ٣ الباب ٣٦ وكتاب ٢٣ باب ٩٢ وكتاب ٩٦ باب ٩ ومسلم كتاب ٤٥ حديث ١٥٠-١٥٦ والترمذي كتاب ٨ باب ٣٦ و ٦٤ والنسائي كتاب ٢١ باب ٢٤-٢٦ وابن ماجه كتاب ٦ باب ٥٦ والموطأ كتاب ١٦ حديث ٣٨-٤٠، وابن سعد جزء ٤ قسم ١ ص٧٢ وأحمد جزء ٣٧٥/١ و٤٤١ و٤٢٩ و٢٥١ و٢٣٩/٢ و٢٤٦ و٢٧٦. والطيالسي حديث ٨٠٨ و٢٦٢ و٢٣٠٤.

لە هەردوو (صحیح)ەکەشدا هاتووە لە (ابوهریرە)ەوە ﷺ کە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: ((لا یموت لأحد من المسلمین ثلاثة من الولد لا تمسه النار الا تحلة القسم)). واتە: (هەر موسڵمانێك سێ منداڵی بمرن ئاگریان بەرناکەوێت تەنها بۆ بەجێگەیاندنی سوێندەکە نەبێت).

بەجێگەیاندنی سوێند (تحلة القسم) لەم فەرموودەیەدا مەبەست ئەو سوێندەیە کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَإِنْ مِنْكُمْ إِلاَّ وَارِدُهَا﴾ واتە: (کەس نیە لە ئێوە کە پێیدا نەڕوات).

(واردها) مەبەستی پەڕینەوەیە بەسەر پردی (صیراط)دا، کە پردێکە لەسەر پشتی دۆزەخ دامەزراوە.

(ابن حجر) لە لێکۆڵینەوەی ئەو دوو فەرموودەیەدا دەڵێت:[1] واتا نەگەیشتوونەتە تەمەنی باڵغ بوون تا گوناهیان لەسەر بنووسرێ. (خلیل) دەڵێت: منداڵ کە شتی لەسەر نووسرا کەواتە گەیشتۆتە تەمەنی (حنث)، (حنث)یش بە مانای گوناه دێت، خوای گەورە دەفەرمووێت﴿ وَكَانُواْ يُصِرُّونَ عَلَى ٱلۡحِنثِ ٱلۡعَظِيمِ ﴾الواقعة/٤٦. لەسەر گوناهی مەزن بەردەوام دەبوون.

وتراویشە مەبەست پێی ئەوەیە ئەگەر بگاتە تەمەنێك گەر سوێندی شکاند کەفارەتی سوێندی دەکەوێتە سەر، (راغب)یش دەڵێت: مەبەستی لە (حنث) باڵغ بوون بووە چونکە لەو کاتەدا مرۆڤ هەرچی کرد لەسەری دەنووسرێت و حیسابی لەگەڵ دەکرێت، بە پێچەوانەی پێشتر، بەتایبەتیش ناوی گوناهی بردووە چونکە گوناه لە دوای باڵغ بوون دەنووسرێت، لەبەر ئەوەی منداڵ پاداشتی وەردەگرێت، و منداڵی بچووکیشی تایبەت کردووە بەوە چونکە بەزەیی هاتنەوە پێیدا مەزنتر و خۆشویستنیشی توندترەو رەحمەت پێکردنیشی زۆرترە و لەبەر ئەوە ئەوەی منداڵی باڵغبووی مرد ئەو پاداشتانەی دەست ناکەوێت کە باسکرا، ئەگەریش بەگشتی لەدەستدانی منداڵ پاداشتی خۆی هەیە، و منداڵانی موسڵمانیش لە بەهەشتدان و زۆر دووریشە کە خوای گەورە بەهۆی بەزەیی هاتنەوەیان بە منداڵەکانیان بەزەیی بە باوکیاندا بێتەوەو بەزەیی نەیەتەوە بە منداڵانیاندا.

---

١ فتح الباري الجزء الثالث /٣٦٧.

(المهلب)یش دەڵێت: بوونی منداڵانی موسڵمانیش لە بەهەشتدا کۆی زانایان وتوویانە و تەنها دەستەیەکی کەم قسەیان لەسەر نەکردووە.[1]

(بیهقی) لە کتێبی (الاعتقاد) بەشی (الأطفال- یولدون علی فطرة الإسلام) دەڵێت: پاشان خوای گەورە رێزی لە ئوممەتەکەی گرتووە بەوەی کە وەچەی باوەڕدار دەگەیەنێت پێی با هیچ کردەوەشیان وەك ئەوان نەبێت، هەواڵی چوونە بەهەشتیان هاتووەو زانیمان کە قەڵەم بەختەوەری بۆ نووسیون، لەوانە فەرموودەی (ابوهریرە)ﷺ کە لە پێغەمبەرەوەﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((صغارهم دعامیص[2] الجنة)) واتە: (منداڵەکانیان چۆلەکەی بەهەشتن).

هەر لە فەرموودەی (ابوهریرە)وەﷺ کە لە پێغەمبەرەوەﷺ گێڕاویەتیەوە کە دەفەرمووێت: ((أولاد المسلمین في جبل في الجنة یکفلهم ابراهیم وسارة علیهما السلام، فإذا کان یوم القیامة دفعوا الی آبائهم)). واتە: (منداڵانی موسڵمانان لە شاخێکی بەهەشتدان، (ابراهیم) و (سارە) -سەلامی خوایان لێبێ- سەرپەرشتیان دەکەن، کە رۆژی قیامەت هات دەدرێنەوە بە دایك و باوکیان).

لە فەرموودەی (معاویە کوڕی قرە)شدا کە لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە لە پێغەمبەرەوەﷺ لە سەرگوزشتەی ئەو پیاوەی کوڕێکی مردبوو دەڵێت: پێغەمبەرﷺ سەرەخۆشی لێ کرد و فەرمووی:((یا فلان! أیما أحب الیك، أن تمتع به عمرك أو لا تأتي غداً بابا من أبواب الجنة إلا وجدته قد سبقك إلیه یفتحه الك؟)). واتە: (ئەی فلان! کامیانت بەلاوە چاکترە" ئەوەی کە تەمەنت لەگەڵدا بەسەر ببردایە، یاخود ئەوەی کە سبەینێ بچیتە هەر دەرگایەك لە دەرگاکانی بەهەشت، ئەو منداڵە پێش تۆ بیگاتێ و بۆتی بکاتەوە؟)

وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ! ئەوەیانم لا خۆشترە کە پێش خۆم بگاتە دەروازەکانی بەهەشت.

فەرمووی: ((فذاك لك)) کەواتە ئەوەت بۆ هەیە.

---

١ فتح الباري ٣/٤١٨.

٢ (دعامیص) تاکەکەی (دعمص): زیندەوەرێکی بچووکە لەناو زۆنگاوەداندا دەبێت. هەروەها (دعمص) ئەوانەن کە دەچنە ناو هەموو کارێکەوە، واتە بەناو بەهەشتدا هاتوچۆ دەکەن و دەچنە هەموو ماڵەکانەوەو لەهیچ شوێنێك قەدەغە ناکرێن، هەروەك چۆن لە دنیا منداڵان قەدەغە ناکرێن کە بچنە لای نامەحرەم و کەس خۆیان لێداناپۆشێ.. (النهایە/٣).

پیاوێکی ئەنصاری هەستایەوەو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا! خوا بمکات بە قوربانت! ئایا ئەمە تایبەتە تەنها بەو پیاوە؟ یاخود هەرکەس لە موسڵمانان منداڵێکی بمرێت ئەوەی بۆ هەیە؟

فەرمووی: ((**من هلك له طفلٌ من المسلمين كان ذاك لـه**)). واتە: (هەر موسڵمانێك منداڵێکی بمرێت ئەوا ئەوەی بۆ هەیە).

ئیمام (شافعی) دەڵێت: دەربارەی منداڵانی موسڵمان فەرمووده هاتووە کە دەچنە بەهەشتەوە.

لە (ام حبيبه)شەوە دەگێڕنەوە کە ئەو لای (عائشه) م بوو، پێغەمبەرﷺ هاتە ژوورەوە بۆ لای، و فەرمووی: ((**ما من مسلمين يموت لهما ثلاثة من الولد لم يبلغوا الحنث، الاّ جيء بهم يوم القيامة حتى يوقفوا على باب الجنة، فيقال لهم: أدخلوا الجنة، فيقولون: حتى يدخل آباؤنا، فيقال لهم: أدخلوا الجنة أنتم وآبائكم**)).[1] واتە: (هەر موسڵمانێك سێ منداڵی بمرێت کە نەگەیشتبنە تەمەنی باڵغ بوون، ئەوا لە ڕۆژی قیامەتدا دەهێنرێن هەتا لەبەر دەگای بەهەشت بوەستن و پێیان دەڵێن: بچنە بەهەشتەوە، ئەوانیش دەڵێن: ناچین تا دایك و باوکمان نەچن، پێیان دەوترێت: ئێوە و دایك و باوکیشتان بچنە بەهەشتەوە).

(عقبە کوڕی عامر) لە پێغەمبەری خواوەﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((**من أثكل ثلاثة من صلبه فأحتسبهم على الله في سبيل الله عز وجل وجبت لـه الجنـة**)).[2] واتە: (هەرکەسێك سێ منداڵی خۆی بمرێت و وایان دابنێت کە پاداشتی لای خوایە و لەپێناوی خوای گەورەدایە، بەهەشتی بۆ هەیە).

لە هەردوو (صحیح)ەکەشدا هاتووە لە (ابوزید اسامە کوڕی زید کوڕی حارثة)ەوە کە خزمەتکاری پێغەمبەری خواﷺ بووە، و خۆشەویستی بووەو کوڕی خۆشەویستی بووە، دەڵێت: کچێکی پێغەمبەرﷺ ناردی بە شوێن باوکیا کەوا کوڕەکەم گیان دەدات، تەشریفت بێنە بۆ لامان، پێغەمبەریشﷺ سڵاوی بۆ ناردن و فەرمووی: ((**إن لله ما أخذ وله ما أعطى وكل شيء عنده بأجل مسمّى فلتصبر ولتحتسب**)). واتە: (ئەوەی کە خوا دەیدا بە بەندەی هەر بۆ

---

١ رواه الطبراني في الكبير بأسناد حسن جيد.

٢ رواه احمد والطبراني ورواته ثقات.

خۆیەتی و هەموو شتێك لای خوا کاتێکی دیاری کراوی هەیە - کە ئاکامی هات ئیتر پاش و پێش ناخرێت- با ئەویش ئارام بگرێت ولەلای خوا حیسابی بکات).

دیسان کچەکەی ناردیەوە بە شوێنیا و سوێندی لێ خوارد کە دەبێ هەر تەشریفی بێنێت بۆ لای، پێغەمبەریش ﷺ هەستا لەگەڵ (سعد کوڕی عبادە) و (معاذ کوڕی جبل) و (ابو کعب زید کوڕی ثابت) و چەند پیاوێکی تردا ﷺ چوون بۆ لای، جا منداڵەکەی بەرز کردەوە بۆ پێغەمبەری خواﷺ، ئەویش لە کۆشیدا داینا، منداڵەکە هەناسەی سوار بووبوو، پێغەمبەرﷺ هۆن هۆن فرمێسك بە چاویدا هاتە خوارەوە، (سعد) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەم گریانە چی یە؟ فەرمووی: ((**هذه رحمة جعلها الله تعالى في قلوب عباده**)). واتە: (ئەوە سۆز و رەحمەتە خوای گەورە دەیخاتە دڵی بەندەکانی خۆیەوە).

لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا: ((**في قلوب من شاء من عباده وإنما يرحم الله من عباده الرحماء**)). واتە: (دەیخاتە دڵی ئەو بەندانەی کە خۆی ئارەزووی لێیەتی، وە خوای گەورەش تەنها رەحم بەو بەندانەی دەکات کە بە رەحم و میهرەبانن).

(مسلم)یش گێڕاویەتیەوە لە (ابوهریرە)وەﷺ کە ئافرەتێك بە منداڵێکەوە هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ بۆی بپاڕێرەوە لای خوا، من پێشتر سێ منداڵم مردووە، فەرمووی: ((**لقد أحتظرت بحظار شديد من النار، دعاميص الجنة، يلقى أحدهم اباه فيأخذ بناحية ثوبه فلا يفارقه حتى يدخل الجنة**)). واتە: (بە دیواربەندێکی ئەستور پارێزراوی لە ئاگر، ئەوانە چۆلەکەی بەهەشتن، هەر یەکێکیان سووچێکی کراسەکەی باوکی دەگرێت و لێی جیانابێتەوە هەتا دەچێتە بەهەشتەوە).

هەر لە(مسلم) لە (ابوهریرە)وەﷺ گێڕاویەتیەوە کە دەڵێت: ئافرەتێك هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئێمە ناتوانین لە کۆڕ و مەجلیست دانیشین، وادەی رۆژێکمان بۆ دابنێ پرسیارت لێ دەکەین، فەرمووی: وادەتان ماڵی فلان بێت، لەو وادەیەشدا پێغەمبەرﷺ چوو بۆ لایان، لەنێو ئەو قسانەدا پێی فەرموون: (( **ما منكن أمرأة يموت لها ثلاث من الولد، فتحتسبهم الا دخلت الجنة**)). واتە: (هەر ئافرەتێك لەئێوە سێ منداڵی بمرێت و چاوەڕوانی پاداشتیان بێت لای خوا، مسۆگەر دەچێتە بەهەشت).

ئافرەتێك وتی: ئەی دوان؟ فەرمووی دوانیش.

(نسائی)یش لە (ام قیسی کچی محصن)ەوە گێڕاویەتیەوە کە دەڵێت: کوڕەکەم مرد، زۆر بۆی پەرۆش بووم و خەمم دەخوارد، بە مردووشۆرەکەم وت کوڕەکەم بە ئاوی سارد نەشۆیت و بیکوژیت، (عکاشە کوڕی محصن) چوو بۆ لای پێغەمبەری خواﷺ و بۆی گێڕایەوە، پێغەمبەری خواﷺ زەردەخەنە گرتیو فەرمووی: ((**طال عمرها**)) تەمەن درێژ بێت.. دەڵێت: شك نابەم هیچ ئافرەتێك هێندەی ئەو تەمەن درێژ بووبێت.

(مالك)یش لە (سعید کوڕی مسیب)ەوە گێڕاویەتیەوە کە دەڵێت: لە پشت (ابوهریرە)ەوە‌ رضي الله عنه نوێژم لەسەر منداڵێك دەکرد هەرگیز هیچ گوناهێکی نەکردبوو، گوێم لێ دەبوو (ابوهریرە) دەیفەرموو: خوایە پەنای بدە لە سزای گۆڕ.

(بخاری)یش لە (حسن کوڕی علی)ەوەم دەگێڕێتەوە کە دەڵێت: سورەتی (الفاتحە) لەسەر منداڵ دەخوێندرێتەوەو دەوترێت: ((**اللهم أجعله سلفاً وفرطاً وذخراً وأجراً**)). واتە: (خودایە ئەم منداڵە بکە بە پێشینەی پاداشت و زەخیرەی پاداشت).

(عبدالرزاق)[1] لە (مکحول)ەوە گێڕاویتیەوە کە دەڵێت: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((**إن ذراري المؤمنين في شجرة عماد الجنة يكفلهم أبوهم ابراهيم عليه السلام**)). واتە: (منداڵەکانی باوەڕداران لە درەختێکی کۆڵەکەی بەهەشتدان و (ابراهیم)ی باوکیان ‎ سەرپەرشتیان دەکات).

هەروەها (عبدالرزاق)[2] لە (محمد کوڕی سیرین)ەوە گێڕاویانەتەوە کە دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((**دعوا الحسناء العاقرة وتزوجوا السوداء الولود، فإني أكاثر بكم الأمم يوم القيامة، حتى السِّقط يظل محبنطئاً، فيقال: أدخل أنت وأبواك**)). واتە: (واز لە ئافرەتی نەزۆك بێنن با جوانیش بێت و ئافرەتێك بێنن منداڵی ببێت با رەشیش بێت، چونکە من لە رۆژی قیامەتدا شانازی بە زۆریتانەوە دەکەم، هەتا منداڵی لەبارچوو تورە دەبێ و ناچێتە بەهەشت لەبەر دایك و باوکی، ئینجا پێی دەوترێت: تۆ و باوکت بچنە ژوورەوە).

هەروەها گێڕاویەتیەوە[3] لە (عبدالملك کوڕی عمیر) و (عاصم کوڕی بهدلە)ەوە کە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((**وأن أطفال الأمم المسلمين يقال لهم يوم القيامة أدخلوا**

١ مصنف ٦/١٥٩.
٢ مصنف ٦/١٦٠.
٣ مصنف ٦/١٦٠.

**الجنة، فيتعلقون بأحقاء آبائهم وأمهاتهم فيقولون ربنا آباءنا وأمهاتنا، قال: فيقال لهم: أدخلوا الجنة أنتم وآباؤكم وأمهاتكم، قال: ثم يجيء السقط فيقال له أدخل الجنة، قال: فيظل محبنطئاً -أي متقعساً- فيقول: أي ربي أبي وأمي، حتى يلحق به أبوه))**. واتە: (منداڵانی موسڵمانەكان لە ڕۆژی قیامەتدا پێیان دەوترێت: بچنە بەهەشتەوە، ئەوانیش خۆیان بەكەمەری باوك و دایكیانەوە هەڵدەواسن و دەڵێن: ئەی پەروەردگار! باوكان و دایكانمان، دەڵێ: پێیان دەوترێت: ئێوەش و باوكان و دایكانیشتان بچنە بەهەشتەوە، دەڵێ: پاشان منداڵی لەبارچوو دەهێنرێت و پێی دەوترێت: بچۆرە بەهەشتەوە، ئەویش بە توڕەییەوە ڕادەوەستێت و دەڵێت: ئەی پەروەردگارم! باوكم و دایكم، ئینجا باوك و دایكیی لەگەڵیدا دەچن).

امام (احمد) و مسلم)یش لە (انس)ەوەﷺ بە (مرفوع)ی گێڕاویانەتەوە: ((**إن ابراهيم أبني، وإنه مات في الثدي، وإنه له ظئيرين يكملان رضاعه في الجنة**)). واتە: (ئیبراهیم كوڕمە و كاتێ مرد شیرەخۆر بوو، لە بەهەشتدا دوو دایەن و شیردەری هەیە ماوەی شیرەخۆریەكەی بۆ تەواو دەكەن).

وە لە هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەری خواﷺ ەوە دەگێڕنەوە كە گوێیان لێ بووە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((**إنه يقال للوالدين يوم القيامة أدخلوا الجنة، فيقولون: يا رب! حتى تُدخل آبائنا وأمهاتنا، قال: فيأبوون، قال: فيقول الله عز وجل: ما لي أراهم محبنطئين؟! ادخلوا الجنة، قال: فيقولون: يارب! آبائنا؟ فيقول: أدخلوا الجنة أنتم وآبائكم**)).[1] واتە: (لە ڕۆژی قیامەتدا بەدایك و باوك دەوترێت بچنە بەهەشتەوە، ئەوانیش دەڵێن: ئەی پەروەردگار! ناچین تا دایك و باوكمان نەچێت، دەڵێ: ناڕۆن، دەڵێ: خوای گەورە و باڵادەست دەفەرمووێت: چییە دەیانبینم بەتوڕەیی وەستاون و ناچنە بەهەشت، دەڵێ: ئەوانیش دەڵێن: ئەی پەروەردگار! باوكان و دایكانمان. خوای گەورە دەفەرمووێت: خۆتان و دایكان و باوكانیشتان بچنە بەهەشتەوە).

ئافرەتی چاك ڕۆڵی گرنگی هەیە لە ئارامگرتن لەسەر مردنی منداڵ و دڵدانەوەی مێردەكەی و سەردەكەوێت بەسەر سۆزداریی دایكایەتیدا لە پێناو شادی خستنە دڵی مێردەكەیەوە، ڕوداوێكیشمان لەبەردەمدایە كە ئەوە دووپات دەكاتەوەو پێشەنگە بۆ هەموو ئافرەتێكی چاكی پاش خۆی:

---

١ رواه احمد ورجاله ثقات كذا قاله الهيثمي في المجمع ٣/١١ و ١٠/٣٨٣.

(بخاری) لە (انس)ەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە دەڵێت: کوڕێکی (ابوطلحة) مرد و لەوکاتەدا (ابوطلحة) لەماڵ نەبوو، کاتێك ژنەکەی دەبینێت منداڵەکەی مردووە شتێکی بۆ ئامادە دەکات و لە سووچێکی ماڵەکەدا دەیپێچێتەوە، کاتێ (ابوطلحة) دێتەوە پرسیار دەکات: کوڕەکەم چۆنە؟ دەڵێت: دەروونی ئارام بۆتەوە و ئاواتەخوازم حەسابێتەوە جا خەوت، بەیانی کە هەستا خۆی بشوات، کە دەیەوێت بچێتە دەرەوە ئەنجا پێی دەڵێ: منداڵەکەت مردووە، ئەویش لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی کرد و پاشان هەواڵی بەسەرهاتەکەی پێدا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((**لعل الله تعالى أن يبارك لكما في ليلتكما**)). واتە: (بەڵکو خوای گەورەو باڵادەست ئەو شەوەتان لێ پیرۆز بکات).

پیاوێکی ئەنصاری دەڵێت: پاشتر نۆ منداڵیم بینی کە هەموویان قورئانیان خوێندبوو.

لەگێڕانەوەی (احمد)یشدا[1] درێژەپێدانێکی ناسکی تێدایە، لە (انس)ەوە ﷺ دەگێڕنەوە کە (ابوطلحة) کوڕێکی مرد، (ام سلیم)ی خێزانی وتی: کەس هەواڵی ئەوە بە (ابوطلحة) نەدات، من خۆم بۆی باس دەکەم، جا بە پۆشاکێك دایپۆشی، کاتێ کە (ابوطلحة) گەڕایەوە، خواردنی خستە بەردەمی، ئەویش خواردی، پاشان خۆی بۆ دەڕازێنێتەوەو خۆی بۆنخۆش دەکات و لەگەڵی جووت دەبێ، پاشان وتی: ئەی (ابوطلحة)! گەر کۆمەڵێك سپاردەو ئەمانەتی ماڵێکیان لەلا بێ و ماڵەکە داوای سپاردەی خۆیان بکەنەوە، ئایا ئەو ماڵە مافی ئەوەیان هەیە نەیدەنەوە، وتی: نەخێر دەبێت ئەمانەت بگەڕێنرێتەوە بۆ لای خاوەنەکەی، دەڵێت: کوڕەکەی تۆش ئەمانەت و سپاردەیەکی خوای باڵادەست بوو لەلامان و خوای گەورە ئێستا گیانی کێشاوەو بردویەتیەوە بۆ لای خۆی، (ابوطلحة) وتی: (إنا لله وإنا اله راجعون)، (انس) دەڵێ: هەواڵی ئەوە درایە پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش فەرمووی: ((**بارك الله لهما في ليلتهما**)) خوای گەورە فەڕ و بەرەکەت بخاتەوە ئەوە شەوەتان و پیرۆزی بکات.

ئەوە بوو بەرهەمی ئەو شەوە کوڕێك بوو... تا کۆتایی فەرموودەکە.

ئیمام(نووی) لە کتێبەکەیدا - بستان العارفين- سەرگوزشتەیەکی ناسك دەربارەی سەرەخۆشی و پرسەی باوکان لەکاتی لەدەستدانی منداڵەکانیاندا دەگێڕێتەوە، دەڵێت:

ئیمامی (شافعی) دەڵێت: کاتێك کوڕێکی (حسین کوڕی علی) م مرد، هیچ دڵگرانی و

---

[1] في مسنده ٣/٢٨٧.

خەمباری پێوە دیار نەبوو، لەسەر ئەوە لۆمەیان کرد، ئەو وتی: ئێمەی (اهل البیت) داوا لە خوای گەورە دەکەین ئەویش پێمان دەبەخشێت، ئەگەر ویستی خوا لە شتێك بوو کە ئێمە حەزمان لێی نەبێت پێی رازی دەبین.

دەڵێت: پیاوێك نامەی دەنووسی بۆ برایەکی و سەرخۆشی مردنی کوڕەکەی لێ دەکات، پاشتر دەڵێت: منداڵ ئەوەندەی لە ژیاندایە غەم و فیتنەیە بۆ دایك و باوکی، ئەگەریش پێش تۆ مرد دوعا و رەحمەتە، کەواتە تۆش دڵتەنگ مەبە لەسەر ئەو غەمباری و ئاشووبەی کە لەدەستت چووەو دوعا و رەحمەتەش بەفیڕۆ مەدە کە خوای گەورە بۆی قەرەبوو کردیەوە.[1]

برام! بەم جۆرە بینیت کە منداڵی چاك هەمووی هەر باشەیە، ئیدی پاش دایك و باوکی بژی ئەوا پلەو پایەی دایك و باوکی بەرز دەکاتەوە بە پاڕانەوەو داوای لێخۆشبوونی بۆ یان، خۆ گەر پێش ئەوانیش مرد ئەوا دەبێتە هۆی چوونە بەهەشتیان، لەبەر ئەمەشە کە (ابن القیم) لە بارەی منداڵەوە وتوویەتی: پاش دایك و باوکی بژی سوودیان پێ دەگەیەنێت، پێش دایك و باوکیشی بمرێت هەر سوودیان پێ دەگەیەنێت.[2]

•

١ بستان العالفین ص٥٥/٥٦.

٢ في أحكام المولود ص١٤.

# دەروازەی شەشەم

# بنیاتنانی جەستەیی

**دەستپێك**

**بنچینەکانی بنیاتنانی جەستەیی:**

**بنچینەی یەکەم: مافی منداڵ لە فێربوونی مەلەوانی و تیرهاوێژی و ئەسپ سواری.**

**بنچینەی دووەم: سازدانی پێشبڕکێی وەرزشی لەنێوان منداڵاندا.**

**بنچینەی سێیەم: یاریکردنی گەورە لەگەڵ منداڵان.**

**بنچینەی چوارەم: یاریکردنی منداڵان لەگەڵ یەکتری.**

**کۆتایی: سودەکانی وەرزش بۆ منداڵان.**

(أُمِرنا أن نُعلّم أولادنا الرمي، والقرآن)[1]

فەرمانمان پێکراوە کە منداڵەکانمان فێری تیرهاوێژی و قورئان بکەین.

خالد کوڕی ولید

---

١ كنز العمال ١٦/٥٨٥ رواه الطبراني.

## دەستپێك:

یاری کردن سروشتێکی خوارسکە لە منداڵدا و خوای گەورە کردوویەتی بە غەریزەیەك لە دەروونیدا، ئەمەش بۆ ئەوەی جەستەی بەشێوەیەکی سروشتی و بەهێز گەشە بکات، لەکاتێکدا کەماوەی منداڵێتی مرۆڤ درێژترین ماوەی منداڵێتییە لەنێو هەموو بوونەوەرە زیندووەکاندا، لە کاتێکدا کە گەشەی ماسولکەو گەشەی جەستە هەموو لەو ماوەیەدا روو دەدات، و پاش ئەوە سەخت دەبێت لەسەر جەستە کە زیاتر گەشە بکات یاخود بەشێوەیەکی جوانتر بەهێزتر بێت یا بەشێوەکانی دیکەی گەشەکردنی ماسولکەکان، و ئێسکەکان، و سینگ، و سی یەکان، بەشەکانی دیکە. گەر وردبینەوە دەبینین مرۆڤ پاش ئەو ماوەیە ناتوانێت بەشێوەیەکی کارامە ببێتە وەرزشەوان، و پاش تێپەڕبوونی قۆناغی منداڵێتی بەبێ وەرزش بڵێت دەمەوێت جەستەم بنیات بنێم.. چونکە رێژەی سەرکەوتنی ئەو وتەیەش لاوازە، بەو هۆیەشەوە بنیاتنانی جەستەیی منداڵ دەبێت لە قۆناغی منداڵێتیدا مافی تەواوی خۆی پێبدرێت بە پێچەوانەی دەروازەکانی پێشتر کە گەر دایك و باوك یاخود پەروەردەکاران شتێکیان تێیدا لەدەست دا دەتوانن دواتر دەرکی پێبکەن و پێی بگەن.

زانایانی پێشین بە بایەخدانی یاریکردنی منداڵ و بنیاتنانی جەستەیی ئاشنابوون، ئەوەتا ئیمام (غزالی) وتوویەتی:

پێویستە پاش لێ بوونەوە لە ئەرکی خوێندنگەکەی ـ خوێندنی قورئان- مۆڵەتی بدرێت کە یاری بکات، یارییەکی زۆر جوان کە بەهۆیەوە ماندوێتی خوێندنی بڕەوێتەوە بەجۆرێك کە لە یاریکردن ماندوو نەبێت، چونکە رێگری کردن لە یاریکردنی منداڵ و بێزارکردنی بە فێربوون بەبەردەوامی دڵی دەمرێنێت و زیرەکی سست دەکات و ژیانی لێ تاریك دەکات، هەتا بەشوێن فێڵێکدا دەگەڕێت تا بەتەواوی لێی دەرباز ببێت.[١]

لەبەر ئەوە ئەنجام نەدانی وەرزش لەلایەن منداڵەوە هەندێك جار دەبێتە هۆی مەترسی زۆر کە زۆر ناخایەنێت گەشە دەکات و گەورەدەبێت هەتا لە ئێستا و داهاتوویدا دەردەکەوێت بە هەر شێوەیەك لە شێوەکانی لاوازی جەستەیی یاخود دارمانی ناوەکی و دەروونی.

خۆ گەر زانیمان کە ئەو ئەرکە شەرعیانەی بۆ منداڵ دانراوە کە گەیشتە تەمەنی باڵغ بوون و ماڵئاوایی کرد لە قۆناغی منداڵێتی و پێشوازی قۆناغێکی نوێی کرد لە ژیانیدا، و لەو قۆناغەدا

---

١ الإحياء، الجزء الثالث.

لەسەر گەورەو بچووکی کردەوەکانی لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکرێت و قەڵەم دەست دەکات بە تۆمارکردنی کردارو گفتارەکانی، خۆ گەر ئەوەشمان زانی کە ئەو ئەرکانە پێویستی بە ژێرخانێکی بەهێز و جەستەیەکی مەشق پێکراوی وەرزشی هەیە، نوێژ و رۆژوو و حەج و جیهادیش کۆڵەکەی بنەڕەتی ئەم ئایینەیە کە پێویستی بە مرۆڤی بڕواداری بەهێز و کارا هەیە..

لەبەر ئەوە لەسەرمانە کە بیر بکەینەوەو لەخۆمان بپرسین: ئەو رێگا و رێسایانە چین کە بەهۆیانەوە دەتوانین جەستەی منداڵ پێك بهێنین؟ و پایەکانی ئەو بنیاتنانە چیە؟ بە سەرنجدان لە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ و ژیاننامەی پیرۆزی و شێوازی مامەڵەکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ منداڵاندا بۆ رێنمایی کردنیان و بنیاتنانی جەستەییان چوار پایە بەدی دەکەین، بە بەجێهێنانیان پێکهاتەیەکی جەستەی بەهێزمان بۆ منداڵ دەست دەکەوێت، جا دەبێت ئەو پایانە چی بن؟

## بنچینەی جەستەیی یەکەم: مافی منداڵ لە فێربوونی مەلەوانی و تیرهاوێژی و ئەسپ سواریدا:

لە (عمر کوڕی خطاب)ەوە رضي الله عنه دەگێڕنەوە کە وتویەتی: منداڵەکانتان فێری مەلەوانی و تیرهاوێژی بکەن و بە سواری ئەسپەوە بازبازێن بکەن.

لەمەوە مافی منداڵ لە فێربوونی وەرزشی دیاریکراودا روون دەبێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ تایبەتی کردووەو جگە لەهیدیکە وە ناوی بردووە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو یاریانە رۆڵی تایبەتیان هەیە لە ئێستا و داهاتووی ژیانی منداڵدا.. هەروەها رۆڵی هەرەگەورەیان هەیە کە متمانە بە خۆ بوونی بەهۆی فێربوونی ئەو وەرزشانەوە مەترسی دەروونی تێدایە بۆ منداڵ، کاتێك کە گەورەدەبێت و فێری ئەو وەرزشانە نەبووە بەپێچەوانەی وەرزشەکانی دیکەوە کە کاتی گەورەبوونی دەتوانێت فێریان ببێت و شارەزایان بێت بەهەر شێوەیەك بێت با تەمەنی منداڵیشی تێپەڕ بووبێت وە فێریان نەبووبێت.

ئەمەش گەر بەڵگەبێت لەسەر شتێك، ئەوا بەڵگەیە لەسەر سووربوونی پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر وەرزشی منداڵان، چونکە خۆیشی کە لای (بنو نجار)ی خاڵوانی بوو لە ناو باخەکەیاندا مەلەی کردووەو یاری لەگەڵ منداڵاندا کردووە،[1] هەر لەو بارەیەشەوە پێغەمبەری خوا ﷺ هانی منداڵانی داوە لەسەر تیرهاوێژی:

---

١ رواه احمد عن أنس ثم ساق حادثة شق صدر النبي ﷺ في طفولته.

(ابن جرير) بەسەنەدی خۆی لە (علی)ەوەرضي الله عنه گێڕاویەتیەوە[1] کە دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ دایك و باوکی بەقوربانی کەس نەکردووە (سعد) نەبێت، کە فەرمووی: ((أرم! فداك أبي وأمي، أيها الغلام الحزور)). واتە: (تیر بهاوێژە، دایك و باوکم بەقوربانت بن، ئەی گەرمەکوڕ).

لە (ابو عاليە)ەشەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خواﷺ بەلای کۆمەڵێك گەنجدا تێپەڕی، کە نیشانەیان نابۆوەو تیریان دەهاوێشت، فەرمووی: ((أرموا يا بني اسماعيل، فإن أباكم كان راميا)).[2] بیهاوێژن ئەی نەوەی ئیسماعیل، بەراستی باوکتان - اسماعیل کوڕی ابراهیم- تیرهاوێژ بووە.

## بنچینەی جەستەیی دووەم: سازدانی پێشبڕکێی وەرزشی لەنێو منداڵاندا:

سازدانی پێشبڕکێی وەرزشی لەنێوان منداڵاندا بنچینەیەکی کارایە لە پێکهێنانی جەستەی منداڵدا، و یارمەتی دەدات لەسەر بایەخدان بە وەرزش و یاری.. و زیاتر بەتەنگەوەهاتنی جەستەیە، پێغەمبەری خواﷺ پێشبڕکێی راکردنی لەنێوان منداڵانی نەوەی (عباس)ی مامیدا ساز کردووەو پێشوازی لەسەرکەوتوو دەکرد و بە سینگیەوە دەنووساندن یەك لەدوای یەك و بەمجۆرە.

ئیمام (احمد) لە (عبدالله کوڕی حارث)ەوە هێناویەتی کە وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ (عبدالله) و (عبيدالله) و (کثیر)ی نەوەکانی (عباس)ی ریز دەکرد و دەیفەرموو: ((من سبق اليَّ فله كذا وكذا)) واتە: ئەوەی پێشتر بگاتە لام ئەوەو ئەوەی پێدەدەم.

دەڵێت: ئەوانیش رایان دەکرد بۆ لای و دەکەوتن بەسەر پشت و سینگیدا، پێغەمبەری خواﷺ ماچی دەکردن و بەخۆیەوە دەگرتن.

بڕوانە دەبینیت کە پێغەمبەری خواﷺ خۆشەویستیەکەی بەسەر هەموویاندا بەش دەکات.. هەمووشیان ماچ دەکات.. تەنها بەسەرکەوتوو وازناهێنێت و بەس، بەڵکو رەچاوی هەموویان دەکات نەبادا غیرەو ئیرەیی بکەوێتە نێوانیان، وە تا بنیاتنانیش بۆ هەموویان بێت بەبێ جیاکردنەوە.

---

[1] الآثار ٩٢/١. وهو في سنن الترمذي ٣١٤/٥. ومنتحب كتر العمال ٧٢/٥.

[2] رواه سعيد بن منصور: آثار ٢:٥٩ وهو صحيح، أنظر صحيح الجامع رقم ٣٥٢٠. وقال المحقق حبيب الرحمن، ورواه البخاري من حديث سلمة بن الأكوع.

## بنچینەی چەستەیی سێیەم: یاریکردنی گەورە لەگەڵ منداڵان:

ئێستاش لەگەڵ چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوادا ﷺ دەبین کە یاریکردنی پێغەمبەری خوا ﷺمان نیشان دەدات کە پێغەمبەری نێردراو و سەرکردەی ئوممەت یاری لەگەڵ منداڵاندا کردوە.. ئەمەش تەنها بۆ ئەوەیە تا باوکان و دایکانی پێ پەروەردە بکات، و شوێنی ئەو بکەون و یاری لەگەڵ منداڵەکانیانا بکەن:

(طبرانی) لە (ابوایوب الانصاری)ەوە دەگێڕێتەوە کە وتویەتی: چوومە ژوورەوە بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، (حسن) و (حسین) لەبەردەمیدا یاخود لە کۆشیدا یاریان دەکرد، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆشت دەوێن؟ فەرمووی: ((**وكيف لا أحبهما؟! وهما ريحانتاي من الدنيا أشمهما**)). واتە: (چۆن خۆشم ناوێن کە ئەم دوانە ڕێحانەی منن لە دنیادا و بۆنیان دەکەم؟!)

(بزار)یش لە (سعد کوڕی ابو وقاص)ەوە گێڕاویەتیەوە کە وتوویەتی: چوومە ژوورەوە بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، (حسن) و (حسین)م بینی لەسەر سکی یارییان دەکرد، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆشت دەوێن؟ فەرمووی: ((**وما لي لا أحبهما وهما ريحانتاي**)) واتە: ئەی بۆ خۆشم ناوێن کە هەردووکیان ڕێحانەی منن.

(ابو یعلی)یش لە (عمر کوڕی خطاب)ەوە رضي الله عنه گێڕاویەتیەوە کە وتوویەتی: (حسن) و (حسین)م رضي الله عنهما بینی لەسەر ملی پێغەمبەری خوا ﷺ بوون، وتم: باشترین سواریتان لەژێردایە، پێغەمبەری خوا ﷺش فەرمووی: ((**ونِعْمَ الفارسان هما**)) ئەوانیش باشترین سوارچاکن.[1]

(طبرانی)یش لە (براء کوڕی عازب) گێڕاویەتیەوە کە وتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی دەکرد، (حسن) و (حسین) هەردووکیان یاخود یەکێکیان هات و چوویە سەر پشتی، ئەویش کە سەری بەرزکردەوە و بەدەست یەکێکیان یان هەردووکیانی دەگرت و دەیفەرموو:

---

١ كذا في الكنز ١٠٦/٧ والمجمع ١٨٢/٩، ورجاله رجال الصحيح كما في مجمع الزوائد وقال: رواه البزار باسناد ضعيف وأخرجه ابن شاهين كما في الكنز.

((نعم المطية مطيتكما))[١] باشترین سواری ئەوەیە کە ئێوە سواری پشتی بوون.

هەر (طبرانی) لە (جابر)ەوە گێڕاویەتیەوە کە وتوویەتی: چوومە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، بە گاگۆڵکە دەڕۆیشت و (حسن) و (حسین)ی لەسەر پشت بوو، دەیفەرموو: ((**نعم الجمل جملكما، ونعم العدلان أنتما**)). واتە: (باشترین وشتر وشترەکەی ئێوەیە و ئێوەش باشترین دوو تای بارن).

(بخاری) و (مسلم)یش لە (عائشە)وەگێڕاویانەتەوە کە وتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺم بینی بە عەباکەی داپۆشیم لەکاتێکدا سەیری ئەو کوڕە حەبەشیانەم دەکرد کە لە مزگەوتدا یارییان دەکرد، هەتا بێزار بووم لەسەیر کردن، جا ڕێزی ئەو کچە تازەپێگەیشتووە بگرن کە حەزی لە یاری کردنە.

(نسائی)ش لێوەی دەگێڕێتەوە کە وتویەتی: لەڕۆژی جەژندا ڕەش پێست هاتبوون لەبەردەم پێغەمبەری خوا ﷺدا یاریان دەکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کردم، منیش لەسەر شانیەوە سەیرم دەکرد هەتا خۆم وازم هێنا و ڕۆیشتم.

جا تۆ یاری جۆراوجۆری پێغەمبەری خوا ﷺت بینی لەگەڵ (حسن) و (حسین)دا ئەوەش تەنها بۆ ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بیرۆکەی هەموجۆریت نیشان بدات بۆ یاریکردن لەگەڵ منداڵان، هەروەها تۆش سەرنجی ئەوەت دا کە پێغەمبەر ستایش و مەدحی دەکردن لە یاریکردندا ئەمەش بۆ ئەوەی کە لە چوست و چالاکی دەروونیان زیاد بکات لە یاریکردندا و بەردەوام دەبن بەبێ بێزاری و ماندووبوون و بەخۆشەویستی و شادییەوە درێژەیان بە یاریەکەیان بدەن تا ببێتە خۆراکێکی جەستەیی و دەروونی لە یەك کاتدا.

## بنچینەی جەستەیی چوارەم: یاریکردنی منداڵان پێکەوە:

زۆرجار وا دەبێت کە دایك و باوك سەرقاڵن بە کاروباری جۆراوجۆرەوە، ئا لەو کاتانەدا بوار دەڕەخسێنن بۆ منداڵ کە یاری بکات لەگەڵ براو خوشکەکانیدا یاخود لەگەڵ منداڵانی دراوسێکەیدا، یاخود منداڵانی گەڕەکدا، یان منداڵانی خزمی، جا دایك و باوك منداڵی پەروەردەکراو و بەئەدەب هەڵدەبژێرن تا منداڵەکەیان یاری لەگەڵدا بکات لەترسی ئەوەی نەبادا منداڵەکەیان زمان پیسی یاخود ڕەوشتێکی خراپی لە توڕەبوون و هەڵچوونی کاتی یاریکردنەوە لێ فێر ببێت.

---

١ قال الهيثمي في مجمع الزائد ١٨٢/٩ واسناده حسن.

پێغەمبەری خواﷺش لەچەند شوێنێکدا یاریکردنی منداڵانی بینیوەو لێی قەدەغە نەکردوون، (طبرانی) لە (جابر)ەوە گێراویەتیەوە کە دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەری خواﷺدا بووین، بانگکراین بۆ نانخواردن، لەرێگا (حسین)مان دیت لەگەڵ منداڵان یاری دەکرد، پێغەمبەرﷺ بەبەرچاوی خەڵکەکەوە خێرا بەرەو لای رۆشت و دەستی بۆ کردەوە و ئەویش بەم لاو بەولادا رای دەکرد و پێغەمبەریشﷺ لەگەڵی پێ‌دەکەنی، هەتا گرتی، دەستێکی خستە لاملی و ئەویدیکەشی خستە نێوان سەر و گوێی و دەستی کردە ملی و ماچی کرد، پاشان فەرمووی: ((**حسين مني وأنا منه، أحب الله من أحبهما، الحسن والحسين سبطان من الأسباط**)).[1] واتە: ((حسین) لە منە و منیش لەوم، هەرکەسێ خۆشی بوێ خوای خۆش ویستووە، (حسن) و (حسین) دوو کچەزان لە کچەزاکان).

پێشتریش ئەو فەرموودەیەی لە هەردوو (صحیح)ەکە وەرگیرابوو خرایەڕوو کە لە (انس)ەوە گێڕابویانەوە کە وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ هات و ناردمی بۆ پێویستیەکی خۆی و ...تاکۆتایی فەرموودەکە.

لە (ابن عباس)یشەوە م دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: لەگەڵ منداڵاندا یاریم دەکرد کە پێغەمبەری خواﷺ بەلامدا تێپەڕی، منیش لەپشت دەرگا خۆم لێی حەشاردا، بانگی کردم و بە شانی پاڵێکی پێمەوە نا و پاشان ناردمی بۆ لای (معاویە)، منیش کە گەڕامەوە وتم نان دەخوات.[2]

پێغەمبەری خواﷺ لەسەردەمی منداڵێتیشدا یاری لەگەڵ منداڵاندا کردووە، و (جبریل) هاتووە بۆ لای لەکاتێکدا کە لەگەڵ منداڵاندا یاری دەکرد و بردی و سینگی شەق کرد و ...فەرموودەکە.[3]

هەروەها پێغەمبەری خواﷺ زۆرانبازی دوو گەنجی بینیوە بەر لە غەزای (احد) کاتێك یەکێکیان بەهانەی لەوی دیکە گرت کە پێغەمبەری خواﷺ قبوڵی کردووە بەشداری غەزا بکات لە کاتیکدا کە بەهانەگری قبوڵ نەکردووە، لەو قسانەدا کە کردی وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ چۆن ئەو قبوڵ دەکەی و بەمن رازی نیت و ئەگەر زۆرانبازی لەگەڵدا بکەم لێی دەبەمەوە، بەبەرچاوی پێغەمبەرەوە زۆرانبازییان کرد و لێی بردەوە، پێغەمبەری خواﷺش هەردووکیانی قبوڵ کرد کە بچنە جەنگەوە.

---

١ حسن ورواه البخاري في الأدب والترمذي وابن ماجة والحاكم. أنظر صحيح الجامع رقم٣١٤٦.
٢ رواه احمد في مسنده ٣٣٨/١.
٣ رواه أحمد في مسنده ٢٨٨/٣.

سەبارەت بە یاریکردنی کچانیش، ئەوا جیاوازی هەیە لە یاریکردنی کوڕان، زانایان ڕێگەیان داوە بە کچان یاری بە بوکەڵانە بکەن، ئەمەش بەپێی ئەو فەرموودەیە:

لە (عائشه) دەگێڕنەوە[١] کە وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ لە غەزای (تبوك) یاخود (حنین) گەڕایەوە و لە ژوورەکەیدا جێگایەکی هەبوو پەردەی پێدا دابوو، با لایەکی پەردەکەی هەڵدایەوەو چەند بوکەڵەی یاری عائشه دەرکەوتن، فەرمووی: عائیشە ئەوە چییە؟ وتی: ئەوانە بوکەکانمن، پێغەمبەری خواﷺ لەنێویاندا ئەسپێکی باڵداری بەدی کرد کە دوو باڵی لە قوماش دروستکراوی هەبوو، فەرمووی: ئەوە چییە کە لە ناوەڕاستیاندا دەیبینم؟ وتی: ئەسپ، فەرمووی: ئەوە چییە بەسەریەوە؟ وتی: باڵەکانیەتی، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ئەسپ و باڵی هەبێت، خاتو عائشه وتی: ئەی نەتبیستووە کە (سلیمان) ئەسپی باڵداری هەبووە، دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ ئەوەندە پێکەنی هەتا ددانەکانی دەرکەوتن.

(بخاری) و (مسلم) و (ابوداود)یش هەر لە خاتو (عائشه)ەوە م گێڕاویانەتەوە کە وتوویەتی: لەلای پێغەمبەری خواﷺ یاریم بە بوکەکانم دەکرد و هاوڕێکانیشم دەهاتن بۆ لام، ئەوان خۆیان دەشاردەوە لە پێغەمبەری خواﷺ، ئەویش دایدەنانەوە لەلام و یاریان لەگەڵ دەکردم.

## لەو یارییانەی کە ڕێگرییان لێکراوە (گیانلەبەر بکرێتە نیشانە):

لە (سعید کوڕی جبیر)ەوە گێڕاویانەتەوە کە وتوویەتی: لەگەڵ (ابن عمر) و (ابن عباس)داش بە ڕێگایەك لە ڕێگاکانی (مدینە)دا دەڕۆیشتین، بینیمان چەند گەنجێك مریشکێکیان دانابوو کردبوویانە نیشانە، کامەیان بیپێکابایە ئەو کەسە دەیبردەوە، وتوویەتی: تووڕە بوو وتی: کێ ئەمەی کردووە؟ دەڵێ: گەنجەکان بڵاوەیان لێ کرد و (ابن عمر) وتی: پێغەمبەری خواﷺ نەفرینی کردووە لەو کەسەی سوکایەتی بە گیاندارێك بکات، واتە قاچی ببڕێت یان چاوی کوێر بکات.[٢]

---

١ رواه ابوداود واسناده صحيح.

٢ رواه احمد في مسنده. ورواه الدارمي بلفظ (فإذا أنا بغلمة).

## ئاگاداری و وریاکردنەوە:

هەردەبێ و پێویستە وریایی ئەوە بدەین کە بەر لە رۆژئاوابوون منداڵان بێنەوە ماڵەوەو کۆتایی بە یارییەکانیان بهێنن، ئەمەش لەبەر ئەوەی لە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوادا ﷺ هاتووە کە هەواڵیان دەداتێ دەربارەی بڵاوبوونەوەی شەیتانەکان لە شەقامەکان لەو کاتەدا، هیچیشی تێدا نیە گەر منداڵ ئەو فەرموودانەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەر بکات تا بزانێت کە ئەوە فەرمانی پێغەمبەری خوایە ﷺ.

(حاکم) لە (جابر)ەوە بە (مرفوع)ی گێراویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت:((**أحبسوا صبيانكم حتى تذهب فَوْعة العشاء، فإنها ساعة تخترق فيها الشياطين**))[1] واتە: (رێگە لە منداڵەکانتان بگرن و مەهێڵن بێنە دەرەوە هەتا سەرەتا هاتنی شەو تێدەپەڕێت، چونکە شەیتانەکان بە پانایی رێگا دەڕۆن).

لەگێڕانەوەیەکی دیکەدا: ((**إذا كان جنح الليل فكفوا صبيانكم، فإن الشياطين تنتشر حينئذ، فإذا ذهب ساعة من الليل فخلوهم**)).[2] واتە: (کە شەو داهات منداڵەکانتان مەهێڵن بچنە دەرەوە، چونکە شەیتانەکان لەو کاتەدا بڵاو دەبنەوە، کاتێ کە ماوەیەك لەشەو تێپەڕی ئیدی وازیان لێ بهێنن).

لە گێڕانەوەی (بخاری)یشدا: ((**فإذا ذهب ساعة من العشاء فخلوهم**)). واتە: (گەر ماوەیەك لەشەو بەسەر چوو وازیان لێ بهێنن).

---

١ صحيح، أنظر سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم ٩٠٥ ورواه احمد.

٢ رواه احمد والبخاري ومسلم وأبوداود والنسائي عن جابر مرفوعا: أنظر سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم ٤٠.

## کۆتایی: سوودەکانی وەرزش بۆ منداڵان:

هەرچەندە کە گەمەو یاریکردن لەلای کەسانی گەورە و پێگەیشتوو بۆ پڕکردنەوەی کاتی بێکارییە، بەڵام بەلای منداڵانەوە کارێکی زۆر گرنگە، بەڕۆچوون لە یاریکردندا عەقڵ و جەستەی منداڵ گەشە دەکات، و تەواوێتی (تکامل) لەنێوان ئەرکە کۆمەڵایەتیەکان و هەڵچوونەکانی و عەقڵی دێتە دی، کە بیرکردنەوەو لێپرسینەوەی عەقڵی لەخۆ گرتووە، لەگەڵ چارەسەری گرفتەکان و خێرایی بیرکردنەوە، هەروەها ژینگەی سروشتی و ڕێنموونی باوکان و دایکان بۆیان بەهۆی یاریکردنەوە ڕۆڵی گرنگ و بەرچاو دەگێڕێت لە گەشەکردنی منداڵدا.

قۆناغی پێش چوونە قوتابخانە ماوەیەکی زۆر گرنگە بۆ گەشەسەندنی عەقڵی منداڵ لە میانەی یاریکردنەوە کە تێیدا منداڵ دەگاتە ئەوپەڕی وزە و توانای پێگەیشتن بۆ گەمەو یاریکردن.

هەر لەمیانەی یاریکردنەوە منداڵ شارەزاییەکانی پێشووی خۆی دووبارە دەکاتەوە، هەتا دەتوانێت وەریبگرێت و ببێتە بەشێك لە کەسێتی ئەو، هەروەها گەمەو یاریکردن منداڵ ئامادە دەکات بۆ ڕاهاتن و گونجاندن لە ئایندەدا لە میانەی وەڵامدانەوە نوێیەکانەوە کە لەکاتی یاریکردن پێی هەڵدەستێت، لەبەر ئەوە ئێستا بەو چاوەوە سەیری گەمەو یاری ناکرێت کە بۆ بەفیڕۆدانی کات بێت بەڵکو بەو جۆرە لێی دەڕوانرێت کە پێویستە بۆ گەشەی منداڵ بێت، ئەو باوك و دایکانەش کە منداڵەکانیان بێبەش دەکەن لەماڵەوە یاخود لەگەڵ منداڵانی دراوسێ یاری بکەن، بەو کارەیان منداڵ لە پێویستیە سەرەکیەکانی گەشەکردن بێبەش دەکەن..!!

یاریکردنیش چەند سوود و بەهایەکی هەیە:

١- بەهای جەستەیی: یاری چوست و چالاك پێویستە بۆ گەشەکردنی ماسولکەکانی منداڵ جا لە میانەی گەمەو یاریکردنەوە لێهاتوویی دۆزینەوەو کۆکردنەوەی شتەکان فێر دەبێت.

٢- بەهای پەروەردەیی: یاری بوار دەڕەخسێنێت لەبەردەم منداڵدا تا شتی زۆر فێر ببێت لە میانەی کەرەستە جۆراوجۆرەکانی یاریکردنەوە وەك ئاشنابوونی منداڵ بە شێوەکاری و ڕەنگ و قەبارە و جل و بەرگە جیاوازەکان.. لە زۆر کاتیشدا منداڵ لە میانەی یاریکردنەوە زانیاری دەست دەکەوێت کە لەسەرچاوەی دیکەوە توانای وەرگرتنیانی نیە.

٣- بەهای کۆمەڵایەتی: منداڵ لەمیانەی یاریکردنەوە فێردەبێت کە چۆن پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکانی لەگەڵ خەڵکانی دیکەدا بنیات بنێ و چۆنیەتی هەڵس و کەوت کردنیش

بەچاکی لەگەڵیاندا فێر دەبێت، هەروەها لەمیانەی یاریکردنی هاریکارییەوە و بە یاریکردن لەگەڵ کەسانی گەورەدا فێری شت وەرگرتن و بەخشین دەبێت.

٤- بەهای رەوشتی: منداڵ لە میانەی یاریکردنەوە سەرەتاکانی چەمکی راست و هەڵە فێر دەبێت، هەروەها بەشێوەیەکی (مبدئي) فێری هەندێك پێوەری رەوشتی وەك دادپەروەری و راستگۆیی و دەستپاکی و بەندوبەست کردنی نەفس و گیانی وەرزشی دەبێت.

٥- بەهای داهێنان: منداڵ دەتوانێت بەرێگەی یاریکردن گوزارشت لە توانا داهێنەرەکانی بکات و ئەو بیرۆکانەی کە لە مێشکیایەتی بەجێیان بگەیەنێت.

٦- بەهای خۆیەتی: منداڵ لەرێگەی یاریکردنەوە شتی زۆر دەربارەی خودی خۆی بۆ ئاشکرا دەبێت وەك ئاشنابوونی تواناو لێهاتوویی لە میانەی هەڵس و کەوت کردنی لەگەڵ هاوەڵەکانیداو بەراورد کردنی خۆی لەگەڵ ئەوان، هەروەها گیروگرفتەکانی خۆی و چۆنیەتی رووبەڕووبوونەوەیان فێر دەبێت.

٧- بەهای چارەسازی: منداڵ لەرێی یاریکردنەوە لە شڵەژان(تـوتر) رزگاری دەبێت کە بەهۆی سەپاندنی کۆت و بەندی جۆراوجۆرەوە بەسەریدا پەیدا دەبێت، هەر لەبەر ئەوەیە کە دەبینین ئەو منداڵانەی لە ماڵانێکەوە هاتوون کە کۆت و بەندی و فەرمان و رێگری زۆری تێدایە زیاتر لە منداڵانی دیکە یاری دەکەن، هەروەها گەمەو یاری هۆکارێکە لە چاکترین هۆکارەکانی لابردنی دژایەتی خەفەکراو (العدوان المكبوت).[1]

---

١ مجلة العربي عدد ٢٣٤ من مقالة الدكتور محي الدين توق.

# دەروازەی حەوتەم

## بنیاتنانی زانستی و فیکریی

فەرمان بە منداڵەکانتان بکەن فێری زانست بن.[١]

علی کوڕی ابوطالب رضي الله عنه

**دەستپێک:**

**بنەماکانی بنیاتنانی زانستی و فیکریی.**

**بنەمای یەکەم: مافی منداڵ لەفێربوون وچاندنی خۆشەویستی زانست وئادابەکانی لەمنداڵدا.**

**بنەمای دووەم: لەبەرکردنی بەشێك لەقورئان وفەرمووده لەلایەن منداڵ ونیەت پاکی لەبەرکردنیان.**

**بنەمای سێیەم: هەڵبژاردنی مامۆستای چاك و قوتابخانەی باش بۆ منداڵ.**

**بنەمای چوارەم: بەباشی شارەزاکردنی منداڵ لە زمانی عەرەبی.**

**بنەمای پێنجەم: بەباشی شارەزاکردنی منداڵ لە زمانی بێگانە.**

**بنەمای شەشەم: ئاراستە کردنی منداڵ بە پێی حەزە زانستیەکانی.**

**بنەمای حەوتەم: کتێبخانەی چاك لەماڵەوە و کاریگەریی لە بنیاتنانی منداڵدا.**

**بنەمای هەشتەم: گێڕانەوەو سەربردەی منداڵێتی زانایانی پێشینی چاك بۆ بەدەستهێنانی زانست لەبەردەم منداڵاندا.**

---

١ كنز العمال ١٦/٥٨٤.

﴿وَٱللَّهُ أَخۡرَجَكُم مِّنۢ بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ وَٱلۡأَفۡـِٔدَةَ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ﴾النحل/٧٨. واتە: (خوا ئێوە لە سکی دایکتان دەردێنێت بی ئەوەی هیچ شتێك بزانن، ئینجا دەزگای بیستن و بینین و تێگەیشتنی بۆ دابین کردوون، بەڵکو سوپاسگوزاری بن).

لە (ابن عباس)ەوە گێڕاویانەتەوە کە وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: ((**علموا؛ ويسروا ولا تعسروا؛ وبشروا ولا تنفروا؛ وإذا غضب أحدكم فليسكت**)).[1] واتە: (زانست فێر ببن و کارئاسان بکەن، نەك گران و نارەحەتی بکەن، و مژدەی خۆشی بدەن بە خەڵکی و خەڵك لەدین مەڕەوێننەوە، ئەگەر یەکێکتان تورەبوو با بێدەنگ بێت).

---

١ رواه البخاري في الأدب المفرد، وأحمد وابن عدي والقضاعي وابن شاهين والحديث صحيح بشواهده، أنظر سلسلة الأحاديث الصحيحة ١٣٧٥.

## دەستپێك:

لە مێژوودا هیچ ئایینێك نیە وەك ئیسلام جەختی لەسەر فێربوونی رۆڵەكانی كردبێت و هیچ فیكرەیەكیش وەك فیكرەی ئیسلامی لە جیهاندا نیە سوور بێت لەسەر فێركردنی فێرخوازەكانی، ئەمەش لەلایەن دوژمنانی ئیسلامەوە بەر لە كەسانی دیكە دانی پێدا نراوە. ئەوەتانێ دكتۆر (آرثر رآربري) مامۆستای توێژینەوەی ئیسلامی لە زانكۆی (كمبردج) وتوویەتی:[١]

ئیسلام شوێنەواری وای لەسەر رەگەزی مرۆڤایەتی هەیە كە جێگای سەرسوڕمانەو شایانی سوپاسگوزاریە و ئێمە دانراوی زۆرمان لەلایە كە باسی بەشداریكردنی موسڵمانان دەكات لە بەرەوپێش چوونی هونەرەكان و ئاداب و زانستەكان و سیاسەت، روون و ئاشكراشە كە موسڵمانان نەیاندەتوانی ئەو ئامانجە زانستیە بەرزانە بەدی بهێنن گەر زۆر سوور نەبوونایە لەسەر فێربوون و فێركردن، ئەو سووربوونەی كە گەلانی ئیسلامی پێی ناسراوە بەدرێژایی مێژووی، جا ژنان و پیاوانی دەچوون بەدەم بانگەوازەكەی پێغەمبەری خواﷺوە: **((أطلبوا العلم ولو في الصين))**[٢] داوای زانست بكەن و بڕۆن فێری بن با لە (چین)یش بێت.

لە پرۆسەی بنیاتنانی زانستی و فیكریدا دەبێت ئەو پایەو بنەمایانەی كە دایك و باوك لەسەری دەڕۆن روون ئاشكرا بكرێت تا بەهۆیەوە بنیاتی ساغ و دروست و زانینی زۆر و ئەفكاری راست و رەوان بۆ منداڵەكەیان مسۆگەر بكەن، وە ئەم بنیاتنانە گرنگترین شتە كە منداڵ پێك دەهێنێت چونكە بنیاتنانی عەقڵە، گەر عەقڵیش ساغ و دروست بوو ئەوا چاكەو مژدەیە بۆ دایك و باوك، خۆ گەر واش نەبوو ئەوا دوژمنێكیان بۆ خۆیان خستۆتەوە لەناوەخۆیانەوە شەڕیان لەگەڵ دەكا و بەرەو چاڵەئاگری دۆزەخیان دەبا -پەنا بەخوا-.

لەم بنەمایانەی بنیاتنانی زانستیش كە دواتر بەپشتیوانی خوا باسی دەكەین، تێبینی ئەوە دەكەین كە لە ناوەوەیدا چارەسازی منداڵ دەكات تا رووبكاتە زانین و فێربوون، و خۆشویستنی زانایان، هەروەها بایەخی رۆڵی دایك و باوك دەخاتە روو لە هەڵبژاردنی مامۆستای سەركەوتوو چاكدا كە ئاوێنەیە بۆ دڵ و عەقڵی منداڵ، چونكە ئەوەی مامۆستا بەچاكی بزانێت منداڵیش بەچاكی دادەنێت، لەبەر ئەوە دەبێت ئاشنای ئەو بنەمایانە ببین كە دایك و باوك پێویستیان پێی هەیە، جا دەبێت ئەو بنەمایانە چی بن؟

---

١ عن مقدمة كتاب تأريخ التربية الإسلامية، د.احمد شلبي.

٢ قال السخاوي في المقاصد الحسنة: رواه البيهقي في الشعب، والخطيب في الرحلة وغيرها، وابن عبدالبر في جامع العلم والديلمي. ثم قال: قال ابن حبان: إنه باطل لا أصل له، وذكره ابن الجوزي في الموضوعات. والله أعلم.

## بنەمای زانستی یەکەم: مافی منداڵ لـە فێربـوون و چـاندنی خۆشەویستی زانست و ئادابەکانی لەمنداڵدا:

پێغەمبەری خواﷺ رێسایەکی رەسەنی داناوە بۆ دەستەبەرکردنی قۆناغی منـداڵێتی لـە فێربوون و داواکردنی زانستدا کە نەوە لەدوای نەوە گواسـتوویانەتەوەو وای لێهـات هیممـەتی باوکان بێـدار بکاتـەوە بـە مەبەسـتی هانـدانی منداڵـەکانیان لەسـەر داواکردنـی زانـست و خۆشویستنی، چـونکە ((**طلب العلم فريضة على كل مسلم**))[1] داواکردنـی زانیـاری لەسـەر هەموو موسڵمانێك فەرزە، ئیدی گەورەبێت یان بچووك، پیاو بێت یاخود ئافرەت، کوڕ بێت یا کچ، هەروەها لە چاکترینی ئەو پەرستشانەیە کە بەندە لە پەروەردگاری نزیك دەکاتەوە، لەبـەر ئەوە ماوەی منداڵێتی بەپیت ترین ماوەیە لە بنیاتنانی زانستی و فیکری لە منداڵ.

(طبرانـی)[2] لـە (ابـودرداء)ەوەﷺ گێڕاویەتیـەوە کـە وتوویـەتی: پێغەمبـەری خـواﷺ فەرمویەتی: ((**مثل الذي يتعلم العلم في صغره كالنقش على الحجر، ومثل الذي يتعلم العلم في كبره كالذي يكتب على الماء**)). واتە: (نمونەی ئەو کەسەی کـە بەمنـداڵی فێـری زانـست دەبێت وەك نەقشی سەر بەرد وەهایە، ئەو کەسەش بـە گـەورەیی فێـری زانـست دەبێـت وەك کەسێ وایە کە لەسەر ئاو بنووسێت).

---

١ رواه ابن ماجة عن أنس مرفوعاً. أنظر المقاصد الحسنة برقم ٦٦٠ حيث قال العراقي: صـحح بعـض الأئمة بعض طرقه وقال المزي: إن طرقه تبلغ به رتبة الحسن.

٢ بسند ضعيف قاله السخاوي في المقاصد الحسنة. وانظر ضعيف الجامع بلفظ (حفظ الغـلام الـصغير كالنقش في الحجر) برقم٢٧٢٦ وأشار الى ضعفه.

(ابن عابدين) لە (حاشية)كەيدا[١] باسی كردووەو پاشان وتوويەتی: لەوەی (نِفطُوية) بۆ خۆی هۆنيويەتيەوە:

| | |
|---|---|
| أرانـي نـسيت مـا تعلمـت في الكـبر | ولـست بنـاس مـا تعلمـت في الـصغر |
| ومـا العلـم الاّ بـالتعلم في الـصبا | ومـا الحلـم الاّ بـالتحلم في الكـبر |
| ومـا العلـم بعـد الـشيب الاّ تعـسف | إذا كـلّ قلـب المـرء والـسمع والبـصر |
| ولـو فلـق القلـب المعلـم في الـصبا | لأَبـصَرَ فيـه العلـم كـالنقش في الحجـر |

(سخاوی)یش لە (المقاصد الحسنه)دا چەند فەرموودەیەكی هێنـاوە كـە پـشتگیری ئـەو مانایـە دەكات: ئەوەی كە (ابوهريره)ﷺ بە (مرفوع)ی گێڕاويەتيەوە: ((**من تعلم القرآن في شـبيبته أختلط القرآن بلحمه و دمه، ومن تعلمه في كبره فهو يفلت منه ولا يتركه، فلـه أجـر مرتين**))[٢] واتە: (هەركەسێك لە لاويدا قورئان فێر ببێت تێكەڵ بە گۆشت و خوێنی دەبێت، ئەو كەسەش بە پيری فێری ببێت لە دەستی دەردەچێت و وازی لێ ناهێنێ، دوو پاداشتی هەيە).

(ابن عباس)يش م وتوويەتی: ئەو كەسەی بەرلەوەی بگاتە تەمەنی بلوغ قورئان بخوێنێـت، ئەوە لەو كەسانەيە كە بە منداڵی دانايی و حيكمەتيان پێدراوە.

هاوەڵان و شوێنەكەوتوان و فەرموودەناسان هۆشيار و ئاگاداری ئەوەبوون كە فێركردنی منـداڵی بچووك شوێنەواری گەورەی دەبێت لە پەروەردەكردنی زانستی منداڵدا و زياتر خۆڕاگر و دامـەزراوی دەكات و پتەوتری دەكات لە يادكردنەوەدا تا ئەو كەسەی كە بەگەورەيی فێری دەبێت.

(خطيب البغدادی)يش[٣] كۆمەڵێك لـە ژيـانی پێـشينی چـاك و بايەخدانيان بـە منـداڵان هێناوە" ئەوەتانێ (حسن) وتوويەتی: گەنج و تازەپێگەيشتووان بنێرنە لامان چونكە بەراسـتی ئەوانە دڵيان بەتاڵترەو ئەوەی گوێبيستی دەبن باشتر لەبەری دەكەن.

---

١ حاشية ابن عابدين ط٢-١/١٥٧. وانظر المقاصد الحسنة ص٤٦١.
٢ رواه ابن ماجه عن أنس مرفوعاً، وانظر المقاصد الحسنة ص٦٦٠ ورواه البيهقي والديلمي والحاكم.
٣ ١/٢٤٥ -كتاب الجامع لأخلاق الراوي وآداب السامع- تحقيق الدكتور محمد رأفت سعيد.

ئەوەش (سعید کوڕی رحمه الاصبحی) وتوویەتی: شەوان زوو دەچوومە کۆڕی (عبدالله کوڕی مبارك) لەگەڵ هاوەڵانمدا، هیچ کەس پێشم نەدەکەوت، ئەویش لەگەڵ کەسانی بەساڵاچوودا دەهات، پێیان وت: ئەو منداڵانە لەئێمە زیاتر دێنە لات، ئەویش وتی: ئەوان لەئێوە زیاتر جێی ئومێدمن، ئێوە چەند دەژین؟! و ئەوانەش بەڵکو خوای گەورە پێیان بگەیەنێ. (سعید) وتی: جگە لەمن کەسی دیکە نەمایەوە.

ئەوەش (اعمش) کە دەگێڕێتەوەو وتوویەتی: (اسماعیل کوڕی رجاء)م بینی دەهاتە لای منداڵانی فێرخواز و فەرموودەی بۆ باس دەکردن تا خۆی لەبیری نەچێتەوە.

(یحیی کوڕی حمید الطویل) یا یەکێکی دیکە دەڵێ: چووینە لای (حماد کوڕی سلمه)، چەند منداڵێکی لەبەردەستدا بوو قسەی بۆ دەکردن، ئێمە لەلای دانیشتین هەتا لێ بوویەوە، وتمان پێی: ئەی (ابوسلمه) ئێمە گەورەپیاوانی خزمتین، هاتووین بۆ لات، وازت لێ هێناین لەبەر ئەو منداڵانە، ئەویش وتی: لە خەودا بینیم وەك ئەوەی لەسەر کەناری رووبارێك بم و دۆڵکەیەکم پێ بێت و ئاوم دەبەخشیەوەو دامە دەست ئەو منداڵانە و خواردیانەوە.[1]

(یحیی کوڕی یمان)یش ئەگەر کوڕێکی موو لێ نەهاتووی بهاتایە لا حەفتا ئایەتی سەرەتای سورەتی (الاعراف) و حەفتا ئایەتی سەرەتای سورەتی (یوسف)ی پێ دەخوێندەوە، ئەگەر بیتوانیایە بیخوێنێتەوە ئەوا دەرسی پێ دەوت، خۆ ئەگەر نەیزانیایە پێی نەدەگوت.[2]

(حسن کوڕی علی)ش م بە کوڕەکانی و خوشکەزاکانی دەوت: فێر ببن ئێوە کە ئەمڕۆ بچووکی هۆزن، سبەینێ دەبنە گەورەیان، با ئەو کەسەشتان شتی لەبەر نەکرد با بنووسێت.[3]

(عطاء کوڕی ابورباح)یش بە منداڵانی دەوت: بنووسن، ئەوەی بەباشی نایزانێت بۆی دەنووسین، ئەو کەسەیش کەل و پەلی نووسینی نیە خۆمان پێی دەدەین.[4]

(بدیع الزمان الهمدانی)ش بۆ خوشکەزایەکی خۆی دەنووسێت و هانی دەدات بۆ مکوڕبوون لەسەر داواکردنی زانست و وتوویەتی: تۆ کوڕمی هەتا بەردەوام بیت و زانین کارت بێ و

---

١ رواها ابن أبي الدنيا في كتاب العيال ٢/٨٠٤.

٢ المرجع السابق ١/٤٢.

٣ عن الكفاية في علم الرواية للخطيب البغدادي ص٢٩.

٤ المحدث الفاضل ص٣.

قوتابخانە شوێنت بێ و پێنووس هاورێت بێت و دەفتەرو پەڕاو هاودەمت بێت، خۆ گەر کەمتەرخەمیت کرد ئەوا من خاڵۆت نیم و برۆ کەسی تر خاڵۆت بێ و سەلام.[1]

(ابن عبدالبر) باس دەکات و وتوویەتی:[2]

(لقمان) بە کوڕەکەی وت: کوڕەکەم! لەداناییدا گەیشتوویە کوێ؟ وتی: کارێك ناکەم کە پەیوەندی بە منەوە نەبێت، وتی: کوڕەکەم شتێکی دیکە ماوە" لەکۆڕی زانایاندا دابنیشە و ئەژنۆت بنووسێنە بە ئەژنۆیانەوە، خوای گەورە بە حیکمەت و دانایی دڵی مردوو زیندوو دەکاتەوە هەرچۆن بە ڕێژنە باران زەوی ڕەقەڵان و مردوو دەبوژێنێتەوە.[3] کوڕەکەم! لەبەر سێ شت زانست فێر مەبە، و لەبەر سێ شتیش دەستی لێ هەڵمەگرە: فێری مەبە بۆ دەمەقاڵێ پێکردن و خۆ پێهەڵکێشان و ڕوپامایی کردن.

دەستیشی لێ هەڵمەگرە لەبەر پێویستی نەبوون پێی یان لەخەڵك شەرم کردن یان ڕازیبوون بە نەزانی.

کوڕە شیرینەکەم: دەمەقاڵێ لەگەڵ زانایاندا مەکە لایان سووك دەبیت و پێت ڕازی نابن، و دەمەدەمیش لەگەڵ کەم عەقڵ و گێلدا مەکە چونکە نەفامیت بەسەردا دەنوێنن و جنێوت پێدەدەن، بەڵکو خۆت بگرەو بەئارام بە بۆ ئەوانەی کە لەسەر خۆتەوەن و بۆ ئەوانەی لە خوار خۆتەوەن، بەراستی هەر ئەو کەسانە دەگەن بە زانایان کە ئارام دەگرن بۆیان و هەمیشە لەگەڵیاندان وبە هاوڕێیەتی زانیاریەکانیان لێ وەردەگرن.

کوڕەکەم! دانایی شوێنی بۆ هەژاران لە کۆڕی پادشایاندا کردۆتەوە.[4]

(يحيى كوڕی خالد)یش بە کوڕەکەی خۆی وتوە: پێویستە لەسەرت کە فێری هەموو جۆرە زانستێك ببیت و لێی بەهرەمەند بیت، چونکە مرۆڤ دوژمنی ئەو شتەیە کە نایزانێت، وە من پێم خۆش نیە کە دوژمنی کەمە زانستێکیش بیت.

---

١ عن الهداية الإسلامية للشيخ محمد الخضر حسين ص٢٢٨.

٢ في كتابه جامع بيان العلم وفضله ١٠٣/١.

٣ رواه امام ملك في الموطأ (١٦١/٢) تنوير الحوالط بشرح موطأ مالك للسيوطي.

٤ عن (اللب في الإسلام والطب) د.شوكت الشطي ط١ جامعة دمشق ص٣٨.

ئینجا ئەم هۆنراوەی وت:

تفــنَّنْ وخــذ مــن كــل عــالم، فإنمــا ... يفــوق امــرؤ في كــل فــن لــه علــم
فأنــت عــدو للــذي أنــت جاهــل ... وأنــت لمــا أتقنتــه ابــداً سِــلْم

(عبدالملك كوری مروان) بە كوڕەكانی وت: كوڕەكانم! فێری زانـست بـن، ئەگـەر لەچـینی ناوەند بوون ئەوا دەبنە سەروەری خەڵك، وە ئەگەر لەگەڵ تێكڕای خـەڵك بوونـە رەعیـە ئـەوا دەتوانن بەسەربەرزی بژین.[1]

لــەپاش ئەمــە ئــەدیبان و نووســەران و دانایــان و زانایــان هــەموویان دەســتیان دایــە ئامۆژگاریكردنی نەوەكانیان و منداڵەكانیان رێنموونی دەكرد كە ماوەی منداڵێتی بەزانست و زانیاری ئاودێری بكەن.

ئەوەتانێ (احمد شوقی) بانگەشەی پەروەردەكاری خەڵك و چاكسازان دەكات تا بایەخ بـدەن بە فێركردنی منداڵان و گرنگی پێدانیان، بەڵكو لە نێویاندا نەوەیەك هەڵكەوێ كە سـەیری زۆر سەرسوڕهێنەر ئەنجام بدات و ئوممەت لەو خەوەی تێیدایە دەرباز بكات:

فــرب صــغير قــوم علمــوه ... سما وحمــى المسمومة العرابــا
وكــان لقومــه نفعــاً وفخــراً ... ولــو تركــوه كــان أذى وعابــا
فَعلّــم مــا اســتطعت لعــل جيــلاً ... ســيأتي يحدث العجب العجابــا

هەتا گەر خۆشەویستی و خواستنی زانست لە دەروون و عەقڵی منداڵدا زیاتر بـچەسپێت خۆی زیاتر دەردەپەڕێت بۆ داواكردنی و لە پێناویدا بەرگەی ناڕەحەتی و هیلاكی دەگرێت، و بۆ بەدەستهێنانیشی شەوخونی دەكێشێت، بەبێ پێداگرتنی دایك و باوكی لەسەر ئەو كارە.

---

١ المصدر السابق.

## بنەمای زانستی دووەم: لەبەرکردنی بەشێك لە قورئان و فەرمودە لەلایەن منداڵەوە و نیەت پاکی لەبەرکردنیان:

پێشتر لە بنیاتنانی بیروباوەڕی منداڵدا بایەخ و گرنگی قورئان و فەرموودەمان لە دروستکردنی عەقڵی منداڵدا خستە روو.. کە هەردووکیان سەرچاوەی تیشکدانەوەی زانستن و عەقڵ رۆشن و بەهێز دەکەن.. بەلایەنی کەمەوە منداڵ با سییەمین جوزئی قورئان کە (جزئی عمّ)یە لەبەر بکات و بەلانی کەمەوە لە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ چل فەرموودە لەبەر بکات.. لەکۆتایی ئەم کتێبەشدا چل فەرموودەی پەروەردەییمان داناوە بۆ منداڵ کە رێگری و رێنوێنی تێدایە بۆی، هیچی تێدا نیە کە بە منداڵ بوترێت و پێیان لەبەر بکرێت.

کارو پیشەی هاوەڵان و پێشین وەهابوو کە یەکەم شت دەیاندا بە گوێی منداڵدا قورئان و فەرموودە بوو، چونکە هەردووکیان دوو پایەی سەرەکین لە بنیاتنانی زانستی منداڵدا، لەبەر ئەمەشە (ابن سینا) لە کتێبی -السیاسة-دا وتوویەتی: کە منداڵ ساز و ئامادە بوو بۆ فێربوون و چاوو گوێی کرایەوە، دەست دەکرێ بە قورئان فێرکردنی و وێنەی پیتەکانی هیجائی بۆ دەکێشرێ و شتە دیارەکانی ئایینی بەگوێدا دەدرێ.

ئەمەش نموونەیەك دەربارەی پەرۆشی منداڵان بۆ لەبەرکردنی فەرمودە وەك بنەمایەکی زانستی کە لێوەی دەردەچوون:

(بخاري) وتوویەتی:[1] کاتێ کە هێشتا قورئانم دەخوێند بە دڵمدا هات و حەزم کرد فەرموودە لەبەر بکەم، وتیان پێی: ئەو کاتە تەمەنت چەند بوو؟ وتی: دەساڵ، یا کەمتر، پاشان قورئان خوێندنم تەواوکرد، ئەوەبوو لەلای (الداخلي) و کەسانی دیکەش دەمخوێند، رۆژێکیان لەناو ئەوانەی بۆ خەڵکی دەخوێندەوە وتی: (سفیان) لە (ابو زبیر) لە (ابراهیم)ەوە گێڕاویەتیەوە، منیش وتم: (ابوزبیر) لە (ابراهیم)ی نەگێڕاوەتەوە، خۆی لێم تورە کرد، پێم وت: بگەڕێوە بۆ ئەسڵەکەی ئەگەر لاتە، چوویە ژوورەوە، تەماشای کرد، پاشان گەڕایەوەو وتی: رۆڵە، ئەوە چۆنە؟ وتم: ئەوە (زبیر)ە و کوڕی (عدی)یە لە (ابراهیم)ی گێڕاوەتەوە، جا قەڵەمی هەڵگرت و کتێبەکەی خۆی راست کردەوە، و پێی وتم: راستت کرد.

---

١ أنظر فيض الباري شرح صحيح البخاري، للعلامة الشيخ محمد أنور الكشميری ٣٣/١.

(بخاري) لەو کاتەدا تەمەنی یازدە ساڵ دەبوو، کە تەمەنی گەیشتە شازدە ساڵان کتێبی (ابن مبارك) و (وكيع)ی لەبەر کرد، دووساڵ پاش ئەوە کتێبێکی بەناوی (قضايا الصحابة والتابعين)ی دانا، پاشان لە شاری مەدینە و لای گۆڕی پێغەمبەری خواﷺ کتێبی (التأريخ)ی دانا، (حاشد کوڕی اسماعيل) وتوویەتی: (بخاري) هێشتا منداڵ بوو لەگەڵ ئێمە لەلای زانایانی بەصرە دەیخوێند، هیچی نەدەنووسیەوە، هەتا چەند ڕۆژێك تێپەڕی، پاش شازدە ڕۆژ لەسەر ئەوە سەرزەنشتمان کرد، وتی: زۆرتان لەسەرم وت، ئەوەی نووسیوتانە بیخەنە بەردەستم، جا هێنامان، زیاتر لە پازدە هەزار فەرموودە دەبوو، هەرهەمووی بە لەبەر خوێندەوە، تا وامان لێهات کتێبەکانمان وەك لەبەرکردنەکەی ئەو ڕاست دەکردەوە.

## بنچینەی زانستی سێیەم: هەڵبژاردنی مامۆستای چاك و قوتابخانەی باش بۆ منداڵ:

هاوەڵان و پێشینان زۆر سووربوون لەسەر هەڵبژاردنی مامۆستای چاك بۆ منداڵەکانیان و گرنگی زۆریان پێدەدا، و زۆر بەتوندی خوویان پێوە گرتبوو، چونکە ئەو ئاوێنەیەیە کە منداڵ دەیبینێت و لەسەر دەروون و عەقڵی دەنەخشێت، و سەرچاوەی وەرگرتنی منداڵە.. هەر لە زۆر گرنگی پێدانیانەوە ئامۆژگاری منداڵەکانیان دەکرد کە ئەدەب بەر لە زانین فێر بن، پێشتریش لە بنیاتنانی ڕەوشتی منداڵدا ئەوەمان خستە ڕوو لەبابەتی (بنچینەی ئەدەب لەگەڵ زانایاندا).. خۆ گەر کارەکە گەشت و سەردانی پێویست بوو تا بگاتە لای مامۆستای چاك ئەویان بە سنگ فراوانی و بەبێ ناڕەحەتی و هیچ گرانیەك وەر دەگرت، ڕوون و ئاشکراشە کە گەشت و سەفەرکردن بارگرانی دارایی لەسەر دایك و باوك هەیە، بەڵام لەپێناوی بنیاتنانی زانستی لە منداڵدا بەشێوەیەکی ساغ و دروست هەموو سامان و شتێکی گران بەها و بەنرخیان لا سووك دەبێ، لەبەر ئەمەیە کە (ابن سينا) لە کتێبی (السياسه) دەروازەی -سياسة الرجل ولده- وتوویەتی: پێویستە منداڵ پەروەردەکارێکی عاقڵ و خاوەن ئایینی هەبێت، ئاگاداری وەرزشی ڕەوشت بێت، شارەزایی بەرهەمهێنانی منداڵان بێت، و مەند و سەنگین بێت و دوور بێت لە سووکیو بیزاری و دەست بڵاو نەبێت، و لەبەردەم منداڵەکە کەم شت خەرج بکات، زۆر وشك و ڕەقیش نەبێت، زمان شیرین و ڕووخۆش و خاوەن جوامێری و خاوێنی و پاکێتی بێت.

لەبەر ئەمەش بوو سەرکردە موسڵمانەکان دەچوون بۆ بەدەستهێنانی مامۆستای چاك تا منداڵەکانیان فێر بکات.

(ابوبکر کوڕی جابر) خزمەتکاری (ابوداود) وتوویەتی: لەشاری بەغدا بووم، نوێژی مەغریبمان کرد، لە دەرگادرا، منیش کردمەوە، خزمەتکارێ بوو وتی: ئەوە ئەمیر (ابواحمد موفق)ە و داوای مۆڵەت دەکات، منیش چووم بۆ لای (ابوداود) و دەربارەی پلەو پایەی هەواڵم پێدا، مۆڵەتی دایەو هاتە ژوورەوە، دانیشت، (ابوداود) پێشوازی لێکرد و وتی: چی وای کردووە ئەمیر لەم کاتەدا بێت؟ وتی: بۆ سێ مەبەست، وتی: ئەوانە چین؟ وتی: بگوێزیتەوە بۆ بەصرە و بیکەیتە شوێنی نشتنگەی خۆت تا فێرخوازان لە هەموو شوێنێکی سەر زەوییەوە بۆ لات بێت، وتی: ئەمە یەکێکیان، دووەم بڵێ، ئەویش وتی: کتێبی (سنن) بۆ منداڵەکانم باس بکەیت، وتی: بەڵێ، سێیەم بڵێ، وتی: بەتەنها دەرسیان پێ بڵێیت، چونکە منداڵی خەلیفەکان لەگەڵ منداڵی خەڵکی دانانیشن. (ابوداود) وتی: ئەمەیان ناکرێت، چونکە ئەو خەڵکە خانەدان و گەدایان لەزانستدا وەك یەکە..

(جابر) وتوویەتی: پاش ئەوە منداڵەکان ئامادە دەبوون و دادەنیشتن، لەنێوان ئەوان و خەڵکەکە پەردەی کردبوو، جا ئەوانیش لەگەڵ خەڵکەکەدا گوێیان رادەگرت.[١]

دەگێڕنەوە کە (عتبە کوڕی ابوسفیان) بە پەروەردەکاری کوڕەکەی وت: ئەی (عبدالصمد) با یەکەمین شت کە دەستی پێدەکەیت چاکسازی دەروونی خۆت بێت، چونکە چاویان بڕیوەتە چاوت، چاکە لەلایان ئەوەیە کە تۆ بەچاکی دەزانیت، قێزەونیش لایان ئەو شتەیە کە لای تۆ قێزەون بێت، قورئانی پیرۆزیان فێربکە و زۆریان لێ مەکە بابێزار نەبن و فەرمامۆشیان مەکە وازی لێ بێنن، شیعری پاکیان بۆ بخوێنەرەوە، لە فەرموودەش بەرێزترینیان، وە لە زانستێکەوە مەیانبە بۆ زانستێکی دیکە هەتا بەچاکی فێری نەبووبن، قەرەباڵغی قسە لە گوێدا مایەی چاك تێگەیشتنی نیە، بەمن هەڕەشەیان لێ بکە و بەبێ من تەمبێیان بکە، وەك پزیشکێکی نەرم و نیان وابە بۆیان کە تا ئاشنای دەردەکە نەبێت دەرمان دانانێت، هەروەها ژیاننامەی پادشاکانیان بۆ باس بکەو دووریان بخەرەوە لە قسەکردن لەگەڵ ئافرەتان، وە پشت بە بەهانەی من مەبەستە، چونکە من پشتم بە بێکەموکوڕی تۆ بەستووە، زیاتریان فێر بکە و بۆت زیاد دەکەم -إنشاء الله-.[٢]

١ كتاب الإمام ابوداود ومكانة كتابة السنن تقي الدين الندوي.
٢ نصيحة الملوك للماوردي ص١٧٢.

پاشان (ماردی) پێویستی و بایەخی هەڵبژاردنی مامۆستا دووپات دەکاتەوە و وتوویەتی:[١]

...پاشان پێویستە هەوڵبدات بۆ هەڵبژاردنی مامۆستاو پەروەردەکارێك بۆی وەك هەوڵ و تێکۆشانی وا بێت لە هەڵبژاردنی دایك و دایەن، بەڵکو لەوەش زیاتر" چونکە منداڵ لە پەروەردەکارەکەیەوە ئاکار و خووڕەوشت و ئاداب و نەریت وەردەگرێت، زیاتر لەوەی کە لای دایکی فێری دەبێت، چونکە دانیشتنی لای ئەو زیاترە، و ماوەی وانە پێوتنەوەشی لەگەڵیدا درێژترە، کاتێکیش کە منداڵی دەدرێتە دەست فەرمانی پێکراوە کە بەتەواوی شوێن پێی مامۆستاکەی هەڵگرێت، و فەرمانەکانی جێبەجێ بکات، گەر بەو شێوەیە بوو پێویستە تەمێکار تەنها بەوە نەوەستێت کە قورئان خوێن و زمان زان بێت، یاخود شیعر گێڕانەوە بزانێت، بەڵکو دەبێت لەخواترس و پارێزکار و پاکژ و ئاییپەروەر و ڕەوشت بەرز و دەروون چاك و گیرفان پاك و ئاشنا بە خووڕەوشت و ئادابی پاشایان و شارەزا لەهەموو بنەڕەتەکانی ئایین و فیقهـ بێت، و ئەمانەی کە باس کرا پێویستە تێیدا بێت و پێویستیش دەکات کە بەرێکوپێکی بەکاری بهێنێت، خۆ گەر شتێك لەوەی باسمان کرد لەدەستی چوو، ئەوا دەبێت لەخواترسی و ئایین و فیقهی لەدەست نەچێت.

(ترمذی) دانا: وتوویەتی: چاکسازی منداڵ لە خوێندنگەیە، چاکسازی چەتەو ڕێگر لە بەندیخانەیە، چاکسازی ئافرەتان لەماڵەکاندایە.[٢]

بەڵام ئەمڕۆ دوژمنانی ئیسلام شاڵاوێکی دوژمنکارانەیان دەست پێکردووە، و ئاڵای گومڕایی بەدیان بەرز کردۆتەوە بۆ داڕوخاندنی منداڵی موسڵمان.. هەر بۆیە مامۆستای بێباوەڕ و لەئاین دەرچوویان بۆ هەڵبژاردووەو قوتابخانەیەکی هاوچەرخیان بۆی سازکردووە کە دووری دەخاتەوە لە بەرنامەو شەرعی خوای گەورە، ئەمەش تەنها بەهۆی نەزانی موسڵمانانەوەیە، و بەڵگەیەکی تەواویشە لەسەر بێئاگاییان، ئەمەی کە دەیڵێین تەنها قسەیەکی سەرپێی نیە، بەڵکو ئەو واقیعەیە کە ئەمڕۆ تێیدا دەگوزەرێین، ئەوەیش کە داگیرکەرە دەستدرێژکەرە تاوانبارەکان ڕایانگەیاندووە چاکترین بەڵگەیە، فەرموو ئەوەش نەخشەو پلانەکەیان:

---

١ نصيحة الملوك للماوردي ص١٧٠.

٢ الطبقات الكبرى للإمام الشعراني(ص٩١).

ئەوەتانێ قەشە (صموئیل زویمر) لە کتێبەکەیدا (مهد الإسلام) بۆ فریودانی منداڵانی موسڵمان تێیدا نووسیویەتی و وتوویەتی:

(فێربوون لە قوتابخانە، و پەروەردەی خوورەوشتی رۆژئاوایی دەرئەنجامی باشی لێدەکەوێتەوە، و بەرهەمی بەسوودی لەمنداڵان و هەرزەکاراندا بەیەکسانی فەراهەم هێناوە، توانیم جارێك قوتابییانی موسڵمان کۆبکەمەوە، و تۆپێك بخەمە بەردەم کە گۆی زەوی دەنوێنێت، پاشان رووناکیەکی بەتینم خستە سەر، و قەناعەتم پێکردن کە فەرمانکردن بە رۆژووگرتنی مانگی رەمەزان لەلای خواوە نیە، چونکە لەهەندێ وڵاتدا ناتوانرێت ئەم فەرزە بەجێ بهێنرێت).[1]

ئەم تاوانبارە داخ لەدڵە تەنها بەوە وازی نەهێناوە، -لەویش تاوانبارتر ئەو باوکانەیە کە منداڵەکانیان بۆ لای کەسی وا دەنێرن- بەڵکو کۆنگرەیەکی مژدەدەرانی ناو وڵاتە ئیسلامیەکانی سازدا لەشاری (قدس) ساڵی ١٩٣٥ لە (جبل زیتون)، پاش ئەوەی کە گوێبیستی ئەو گیروگرفتانەیان بوو کە لە وڵاتە ئیسلامیەکاندا دێتە رێیان، و ناڕەحەتی ئەو کارە قورسەیان لەبەرامبەر بیروباوەڕی ئیسلامیدا، جا دەستیکرد بە روونکردنەوەی ئامانجەکانیان لە شێواندنی هۆش و بیری منداڵی موسڵماندا و وتی:

(ئێوە نەوەیەکتان ئامادە کردووە لەناو موسڵماناندا کە ئاشنای پەیوەندی لەگەڵ خوادا نیە، و نایشیەوێت ئاشنای بێت، و موسڵمانتان لە ئیسلام وەدەرنا، و نەتانهێنایە نێو ئایینی گاوریەوە، بەو شێوەیە نەوەی ئیسلامی تەواو بەو جۆرە دەرچوو کە داگیرکەر دەیویست، کە گرنگی نادات بە شتە گەورەو مەزنەکان، و حەزی لە حەوانەوەو تەمبەڵیە، و لە دنیاشدا خەمی تەنها بۆ لای ئارەزووەکانی سەرف دەکات، کە فێریش دەبێت لەبەر ئارەزووەکانیەتی، کە سامان کۆ دەکاتەوە هەر بۆ ئارەزووەکانیەتی، گەر بشگاتە بەرزترین پلەوپایەش هەر لەپێناوی ئارەزووەکانیدایە، بۆیە هەموو شتێك دەبەخشێت بۆ گەیشتن بە ئارەزووەکانی).[2]

خۆ ئەگەر زانیت قسەی ئەم قەشەیە لە ساڵی (١٩٣٥)دا کراوە، دەبێت ئێستا پاش تێپەڕبوونی پەنجا ساڵ بەڕای تۆ چی بێت؟!

---

١ عن كتاب الغارة على العالم الإسلامي.

٢ جذور البلاء –لعبدالله التل ص٢٧٥.

(جیب)ی رۆژهەڵاتناسی دڵ پڕ کینەش، کە ئەندامی کۆڕی زمانی عەرەبییە لە قاهیرە، ئەمە لە شتە سەیروسەرسوڕهێنەرەکانی ئیسلامی بێئاگای نەزانە، (جیب) لە پێشەکی کتێبەکەیدا (الى أين يسير الإسلام؟) دەڵێت:

(چالاکی زانستی لە رێگەی قوتابخانە هاوچەرخەکان و رۆژنامەگەرییەوە توانیوویەتی کە شوێنەوارێك تێیاندا بەجێ بهێڵێت -با لە نائاگاییشیانەوە بێت- کە لە روخساری دەرەوەیاندا بەگشتی بەرادەیەکی زۆر وەك بێئاینی(لادینی) دەرکەون، گومانی تێدا نیە کە ئەوە بەتایبەت کرۆکی بەرهەمدارە لەهەموو ئەوەی کە هەوڵەکانی رۆژئاوا بەجێی هێشتووە، تا شوێنەوار لەسەر شارستانێتی جیهانی ئیسلامی بەجێ بهێڵێت.. لە راستیدا ئیسلام وەك عەقیدە با تەنها کەمێکیشی لە بایەخ و دەستەڵاتی لەدەست دابێ، بەڵام ئیسلام وەك هێزێکی باڵادەست بەسەر ژیانی کۆمەڵایەتیدا پلەو شوێنی خۆی لەدەست داوە).[1]

ئەوەتانێ لەمبارەیەوە فەرزان (شێخ محمد خضر حسين) شێخی پێشووی ئەزهەر: ئوممەتی ئیسلامی بەئاگا دێنێتەوەو دەیانترسێنێ و ئامۆژگاریان دەکات و مەترسی ئەو قوتابخانانە بۆ باوکان روون دەکاتەوە لە بەشێکدا بەناونیشانی (أبناء المسلمين في مدارس التبشير)ە کە بەتەواوەتی لێرەدا دەیخەمە بەردەستت، بەڵکو ئەمە یادهێنانەوە بێت بۆ کەسێ کە خاوەنی دڵ بێت، یاخود گوێی هەبێت و ببێتە شاهێد:

(کێ لەتوانایدا هەیە ژیانێکی پڕ رەزامەندی بۆ کوڕەکەی ساز بکات، و رۆڵەیەکی چاکی لێ دەربچێت، کە بەجۆرێك گەورەبێت دڵی ساغ و دروست، و زمانی پاك، و دۆستی خێزانەکە بێت، و کار بکات بۆ بەرزکردنەوەی پلەو پایەی گەلەکەی؟! بەڵام ئەو رازی نابێت کە ئەوە ئەنجام بدات کە ئامۆژگاری کوڕەکەی خۆی پێکردووە، و لە دواڕۆژیشدا بەرهەمی سوپاسگوزاری بچنێتەوە، بەڵکو لە کاتێکدا کە دەروونی پاك و بێگەردە دێتە لای، ئەویش فرێی دەداتە ژینگەیەك و کەسانێك بەرێوەی دەبەن کە نە خزمایەتی دەزانن، نە پەیمان، هەتا ئێستاش شتی قەڵبی پێدەدەن، و خراپە لەدەروونیدا دەچێنن، ئەو کەسەش پیس و خراپ بوو بەدبەختی لێ دەردەچێت.

ئەمە نمونەی موسڵمانە کە خوای گەورە منداڵی پێدەبەخشێت تا رێگەی هیدایەتی پێ بگرێت، و بەجۆرێك گەورەی بکات کە ببێتە کەسێك ئاسوودە بێت بە بەختەوەری گەلەکەی،

---

[1] عن كتاب -تجربة التربية الإسلامية -د.سعيد رمضان البوطي.

دڵتەنگ بێت بە نەهامەتیەکانیان، لەکاتێکدا کە ئەو بنێردرێت بۆ ئەو قوتابخانەیەی کە بۆ دژایەتیکردنی ئایینی بێگەرد، و کوشتنی سۆزداریی ئیسلامی دامەزراوە، ئەمەش ئەو قوتابخانانەیە کە ئەو رێکخراو و کۆمەڵانە دروستی دەکەن کە پێیان دەوترێت کۆمەڵە مژدەدەرەکان (جمعيات التبشير).

ئەو کەسەی کوڕەکەی فڕێ دەداتە نێو دیوارەکانی ئەو قوتابخانەیە، تاوانەکەی زۆر دوور نیە لە تاوانی ئەو کەسانەی لەترسی برسێتی منداڵەکانی خۆیان دەکوژن، ئایا ئەوە باشترین بەڵگە نیە کە ئەوانەی هەڵدەستن بەکارو فرمانی فێرکردن بیروباوەڕی ئاینەکانی دیکە -جگە لەئیسلام- دەدەن بەگوێی منداڵانی موسڵماناندا، لەسەر داب و نەریتەکانی رای دەهێنن، و تووشی تانەو تەشەردان لە ئیسلام دەبن بەرێگای وا کە کاریگەری هەبێت لەسەر منداڵان، کێن ئەوانەی لە ریزی منداڵاندان لە تێنەگەیشتنی راستیەکانی ئایین بە شێوەیەك کە بیانپارێزێت لە خراپەی ئەو دەستخەرۆکردنە؟!

ئەوکەسەش منداڵەکەی دەخاتە قوتابخانەیەکی مژدەدەرانەوە، وەك ئەو کەسە نیە کە یەکێك بکوژێت، بەڵکو کەسانێکی زۆر دەکوژێت، و پاش ئەو کارەی تاوانێك بەرامبەر هەموو میللەت ئەنجام دەدات، ئەمەی دەیلێم زیادەڕۆیی نیە، ئەو منداڵە پاشتر دەبێتە مامۆستا، و کاروباری ئایینی ژمارەیەکی زۆری نەوەی موسڵمانان، و نیشتمانپەروەرێتیان خراپ دەکات، هەروەك چۆن ئەو قەشانە کاروباری ئایینەکەو نیشتمانپەروەرێتی ئەویان خراپ کردووە، شەوەکان پیشانی داوین کە لە دەرچوانی ئەو قوتابخانانە هەرکامێکیان کە دەستەڵاتی هەبێت لەسەر موسڵمانان، دڵڕەقی و فێڵ و تەڵەکەو رێزنەگرتنی ئایینی تێدا بەدی کراوە، کە لەو کەسانەدا بەدی ناکرێت کە لەسەر بێجگە لەئیسلام پەروەردە کرابێ.

فێرخواز لەو قوتابخانانەدا زانست وەردەگرێت، بەڵام ئەو زانستە لەگەڵ ئەو زەرەرەی لە ئایینەکەی دەیکات و ئەوەی لە دڵسۆزی بۆ گەلەکەی لەدەستی دەچێت، ئەو زانستە نیە کە سەنگی قورس بکات، بەڵکو هەواو ئارەزووەکانە کە دڵەکانی گرتووە. وای لێهاتووە پیاو دەستی کوڕەکەی بگرێت لەکاتێکدا وەك فریشتە چاك و بێگەرد و پاکە، و دەیبات بۆ ئەو جێگایەی کە بە سوك سەیرکردنی گەلەکەی تێدا بەدی دەکات، و تانەو تەشەر لە پاکژێتی و لێبوردەیی ئایینەکەی دەدرێت، زۆری پێناچێت ئەو پاکێتیە دەگۆڕدرێت بۆ پیسی، ئەو باشێتیە دەبێتە خراپە، سەرئەنجامیشی ئەوەیە کە گوێبیستی دەبین دەربارەی زۆرێك لە دەرچوانی ئەو قوتابخانانە و ئەوەیش کە دەیبینین.

لەو چەند رۆژەی لە دیمەشق بووم، زانیم کە کەسێکی خاوەن پلەو ئاستی بەرزی سەربازی کوڕەکەی خۆی بردووە بۆ لای خاوەن قوتابخانەیەکی (پەروەردەی ئیسلامی)، و باسی ئەوەی کردووە کە کوڕەکەی خستۆتە قوتابخانە بیانیەکان و عەقیدەیان شێواندووە، کار بەوە گەیشتووە کە بانگەشەی من و دایکیشی دەکات کە ببین بە گاور، پاشان ئەوەی لە مامۆستاکە خواست -لەکاتێکدا کە دڵی پڕ لە پەشیمانی و خەم بوو- کە چارەسازی دڵی ئەم کوڕەی بکات و رەوشتە بەرزو جوانەکانی ئیسلامی پێ بڵێ بەڵکو پاك ببێتەوە.

خوێنەرانی ئەمڕۆش هەواڵی ئەو قەشەیەیان زانی کە لە رۆژنامەکانی ئەم مانگە (مانگی رەمەزان) بلاوکرایەوە، کە پڕ بوو لە ئینکاری کردنی ئەوەی کە لە وانەیەکی یەکێك لەو قوتابخانانەدا وەك تانەوتەشەر لە ئیسلام وتبووی، دەمی پڕ بوو لە جنێو و تانەدان لە ئایین بەبێ ئەوەی کە رێزی هەستی هەندێك لەو منداڵە موسڵمانانە بگرێت کە پێشتر هاتوونەتە بەردەمی، لەنێو قوتابیەکاندا یەکێك لەوان کە هێشتا بەشێك لە ئیمانیان تێدا ماوە غیرەت دەیگرێت و بەرپەرچی قسەکەی دەداتەوەو کارەکەی ریسوا دەکات، ئەوەش پەند و وانەی تێدایە بۆ کەسانێك کە بڕواداربن.

ئێمەش زۆر گیرنین لەسەر ئەو قەشەیەو لەسەر ئەوانەش کە سەرکارێتی ئەو قوتابخانانە دەکەن، چونکە ئەوان پێویستی دەروونی خۆیان بەجێ دێنن، یاخود نەخشەیەك جێبەجێ دەکەن کە بۆیان کێشراوە، بەڵکو نارەزاییمان، بەڵکو ئامۆژگاریمان ئاراستەی ئەو برا موسڵمانانەمانە کە منداڵەکانیان فڕێ دەدەنە نێو ژینگەیەك کە لێی دەرناچن هەتا دەروونیان سەرلێشێوان لەسەر سەرلێشێوان داینەپۆشێت، لەسەرووی ئەوەیشەوە کۆمەڵە رەوشتێکی ناشیرین و چەند تاریکیەك هەیە کە هەندێکیان لەسەر هەندێکی ترەوەیە، بەڵام تاریکیەکانی رۆژی دوایش تووند و نەبڕاوەترە)[1].

١ الهداية الإسلامية: ص١٥١.

## بنەمای زانستی چوارەم: منداڵ شارەزای زمانی عەرەبی بکرێت:

زمانی عەرەبی کلیلی هەموو زانستەکانە.. و هەرکاتێ منداڵ لە زماندا شارەزا بوو ئەوە دەبێتە هۆی بەهێزبوونی لە هەر زانستێك لە زاستەکان کە لەوەبەدوا ئارەزووی فێربوونی هەبێت، و حەز بکات کە بەدەستی بهێنێت، زمانی عەرەبیش زمانی قورئانی پیرۆز و فەرموودە بەرێزەکانی پێغەمبەری خوایە ﷺ و ئەویش حەزی بە فێرکردنی دەکرد و بایەخی داوە بە پێگەیاندنی منداڵان و شارەزابوونی زمانی عەرەبی.

جا لەبەر زۆر گرنگیدانی بە زمانی عەرەبی رازی بوو کە دیلەکانی غەزای (بدر)[1] نووسین و خوێندنەوەی زمانی عەرەبی فێری منداڵانی موسڵمانان بکەن رزگاریان بکات. ئەوە بوو هەر دیلێك خۆی ئازاددەکرد بەوەی کە دە منداڵ لەمنداڵانی هاوەڵان فێری زمانی عەرەبی بکات و، شارەزایان بکات.

لە(ابن عباس)ەوە م دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: کەسانێك لە دیلەکانی رۆژی بەدر هیچیان نەبوو بیدەن لەبری ئازادکردنی خۆیان، پێغەمبەری خوا ﷺ فێرکردنی نووسین بە منداڵانی ئەنصاری کردە مایەی ئازادکردنیان، وتوویەتی: منداڵێکی ئەنصاری هات بۆ لای باوکی، باوکی وتی: ئەوە چیتە؟ وتی: مامۆستاکەم لێی دام، باوکی وتی: ئەو پیسە داوای پارەی بەدریش دەکات، وەڵاهی هەرگیز ناچیتەوە لای.[2]

ئەگەر منداڵ هەڵەیەکی بکردایە... ئەوا ئەو هەڵەیە لە دڵیاندا دەبووە گرێ:

ئەوەتانێ (عمر کوڕی خطاب) ﷺ بەلای چەند منداڵێکدا تێدەپەڕێ کە تیریان دەهاویشت،[3] یەکێکیان لە میانەی قسەکردندا هەڵەی کرد و (مرفوع)ی کرد بە (منصوب) و دەڵێت: (یاأمیر المؤمنین إنا قوم متعلمین)[4]، (عمر) لەبەر ئەو هەڵەیە پەستی دایگرت و وتی: وەڵاهی هەڵەکردنتان لە تیرهاویشتنەکەتاندا پێم خۆشترە لە هەڵەکردنتان لە زمانەکەتاندا.

---

١ كما في الروض الأنف ٩٢/٢ وطبقات ابن سعد ص١٤ قسم ١ ج٢. والتراتيب الادارية للكتاني (١٢٧/١، ٤٩، ٢٩٧/٢، ٢٩٦).

٢ رواه الحاكم في مستدركه ١٤٠/٢ وقال: صحيح الإسناد و لم يخرجاه وأقره الذهبي.

٣ عن: أصول النحو، لسعيد الأفغاني، ورواه العسكري في شرح المواهب.

٤ **راستەکەی (إننا قوم متعلمون) بە (مرفوع) نەك بە (منصوب) وەك ئەو وتی.**

کاتێ منداڵانی موسڵمانان لە ڕێزمانی عەرەبی هەڵەیان زیادی کرد، (علی کوڕی ابوطالب)ﷺ هەستی پێکرد و داوای لە زانایان کرد کە ڕێزمان دابڕێژن و فێری منداڵانی بکەن لەترسی ئەوەی نەبادا زمانی بێگانە بەسەر زمانەکەیاندا زاڵ بێت:

دەگێڕنەوە کە ڕۆژێکیان کچەکەی (ابو أسود الدؤلی) بە باوکی وت: (ما أحسنُ السماء؟) وتی: (نجومها)، کچەکە وتی: ئەوەم نەدەویست، بەڵکو مەبەستم لێی سەرسوڕمان بوو لە مەزنی ئاسمان نەك پرسیارکردن دەربارەی ئەوەی تێیدایە، کچەکە دەبوو بیوتایە (ما أحسنَ).. باوکی چوو بۆ لای ئیمام (علی) و هەواڵی ئەوەی پێدا، ئەویش چەند کاغەزێکی بۆ بەرزکردەوەو داوای لێ کرد کە ڕێزمانی (نحو) دابڕێژێت.[1]

پێشینانی چاکیش دەستیان دابووە ئامۆژگاریکردنی منداڵەکانیان -فێرخوازانی زانست- کە بایەخ بە زمانی عەرەبی بدەن، چونکە کلیلی هەموو زانستەکانی دیکەیە:

(ابن عبدالبر) لە (عبدالملك کوڕی عبدالعزیز کوڕی ابو سلمە الماجشون)ەوە هێناویەتی کە وتوویەتی: لەکاتێکدا کە تازەپێگەیشتووبووم، چوومە لای (منذر کوڕی عبدالله الحزامی)، کاتێ کە قسەم کرد قسەکانی من لەقسەی خەڵکانی تر زیاتر کاری تێ کرد چونکە زمان پاراوی تێدا بەدی کرد، پێی وتم: تۆ کێیت؟ وتم: (عبدالله کوڕی عبدالعزیز کوڕی ابو سلمە)، وتی: داوای زانست بکە، چونکە تۆ بەراستی پێڵاو و ئاوی خۆت پێیە.[2]

پێگەیشتنی ئیمام (شافعی)یش : لەکاتی منداڵیدا وابوو، لە هۆزە عەرەبەکانەوە فێر دەبوو، ئەوەبوو گەشتی کرد بۆ نێویان و لەگەڵیاندا ژیا و بەهۆی ئەوەوە بووە زمان پاراو و ڕاگری زمانی عەرەبی لەنێو زانایاندا.

(ابن سینا) لە کتێبەکەیدا (السیاسە) دەروازەی - سیاسة الرجل ولده- ئەمەی ڕاسپاردووە کە:

(دەبێ لە پێشدا شیعر لەبەر بکات، پاشان عەقیدە، چونکە گێڕانەوەی شیعر و لەبەرکردنی ئاسانترە، لەبەر ئەوەی کۆپلەکانی کورتترەو کێشیشی سوکترە، بەڵام با لە شیعر ئەوانە هەڵبژێرێت کە لەبارەی فەزڵی ئەدەب و پیاهەڵدانی زانین و لۆمەی نەزانی و ئەوەی هاندانی لەسەر چاك بوون بۆ دایك و باوك و چاکەکردن و خۆشویستنی میوانی تێدایە، کاتێ کە منداڵ

---

[1] شرح زيني دحلان لمتن الأجرومية.

[2] جامع بيان العلم وفضله- ٨٦/١.

لە لەبەرکردنی قورئان بوویەوەو بایەخی دا بە بنەڕەتەکانی زمان، ئەو کاتە سەیر دەکات بزانێت کە چی لەگەڵ سروشت و ئامادەیی ئەودا گونجاوە).

(ابوالحسن الماوردی) دەربارەی بایەخی گرنگی زمانی عەرەبی فێرکردن بە منداڵ و ڕەوانکردنی ئاگادارمان دەکاتەوەو دەڵێت:

(ئەگەر منداڵ گەیشتە کاتی تەمبێکردن و فێربوون، واباشە کە بە فێربوونی قورئان لەگەڵ زمانی عەرەبیدا دەست پێ بکات، چونکە ئەو زمانەیە کە خوای گەورە کتێبەکەی خۆی پێ ناردۆتە خوارەوەو بانگەوازی خەڵکی پێ کردووە لە یاساگەریەکانی ئایینەکەی و فەرزەکانی بۆ ئەو کەسانەی شوێنی دەکەون، پێغەمبەری خواﷺش بەو زمانە سوننەتی خۆی ڕاگەیاندوە، و بەو زمانەش کتێبە ئاایینیو دانایی و جددیەت و گاڵتەئامێزەکان دانراوە، عەرەبیش نامەکانیان و ئەو کتێبانەیان نووسیوە کە خوای گەورە کردوویەتیە بەڵگەنامە لە نێوانیاندا، بۆیە هەر دەبێ خونچەکانی شوێنکەوتەی ئەم ئایینە فێری بن، ئەگینا لەبارەی ئایینەوە نەزان دەبن و کەم و کورتییان دەبێت لە ڕێباز و شەریعەتدا).

(لەپاڵ ئەوەشدا ئەم زمانە فەزڵ و گەورەییەکی وای هەیە کە هیچ زمانێك لە زمانەکان وەك ئەو نیە لە پاراوی و ئاشکرایی و ئاسانی لەسەر زمان و خۆشی لە بیستن و گوێلێبوندا، و زۆری گۆڕینی کردار و گریمانەی پێوەری ڕێزمانیو فراوانی واژەکان و ناوەندێتی پیتەکان لەنێوان زۆر و کەمی و وێکچوونی ئەو خەسڵەتانە گەر بەجوانی نەیزانیت و بە ئەدەبەوە سودت لێ وەرگرتبێت، ئەوا شوێنی خۆی هەبوو، لەبەر ئەمەش بوو کە پادشاکانی غەیری عەرەب خۆیان فێری دەکرد، زۆرێکیشیان بەکاریان دەهێنا لە کاتی ئاهەنگ گێڕان و کۆڕی ڕازێنراویدا).

(ماوردی) هەمان بیروبۆچوونی (ابن سینا)ی دووپات کردۆتەوە کە لە فێرکردندا لە هەرە ئاسانی زمانەوە دەست پێ بکرێت، هەروەك دەڵێت:

(واباشە لە فێرکردنی زماندا کە لە سوکەوە دەست پێ بکات، سوکترین کتێبی، و ئاسانترینیان و لە دانراوەکانی و منداڵان سەرقاڵ نەکات بە شتی نامۆی کێوی و دەگمەنی بێگانەوە، هەروەها بە وردەکاریەکانی ڕێزمان(نحو) و دیوانەکانی کێشی هەڵبەست(عروض)ەوە سەرقاڵیان نەکات، چونکە ئەوانە لە واتاکانی دوور دەخاتەوە، بەڵکو وتەکان بە مەبەستی واتاکانیان فێر بکرێت، خۆ گەر مرۆڤ تەمەنی خۆی تەواو کرد لە فێربوونی وتنەکاندا، ئەوا

واتاکانی لەدەست دەچێت، مەگەر ئەوە بۆ یەکێك بێت کە بیکاتە پیشە، وەك ئەدیبەکان و تەمبێکاران و مامۆستایانی ڕێزمان، کە لە خواستندا بۆ فێربوونی زمان پێویستی بە گێڕانەوەی شیعرەکانی عەرەب و ڕۆژەکانیو هەواڵەکانی هەبێت، ڕاست و دروستیش لە چارەسازی ئەوەدا بەو جۆرەیە کە بۆی بگێڕێتەوەو فێری ببێت و ئەو شیعرانە لەبەر بکات کە دانایی تێدایەو پەند و دانایی و یەکخواپەرستی و ئایین و هاندان لەسەر زانین و دنیانەویستیو ئازایەتیو سەخییێتی و ڕەوشت بەرزی لەخۆگرتووە.. تا لەسەر ئاشنابوونی ڕەوشتە باشەکان و خۆشەویستی بەدەستهێنانی پیاهەڵدراو پەروەردەبێت، و وەك خوو لەسەری ڕابێت، و لەوەدا سوودی زمان پاراوی و جوان خستنەڕوو و ناسینی قسەی زۆر پەرپووت و زۆر نامۆی بۆ کۆبێتەوە، و هەڵوێستە بکات لە ئاستی واتا باشەکانیان.)[1]

## بنەمای زانستی پێنجەم: منداڵ شارەزای زمانی بێگانە بکرێت:

پاش ئەوەی کە منداڵ بەشێوەیەکی چاك شارەزای زمانی عەرەبی بوو و کەمێك لە قورئان و فەرموودەی لەبەر کرد، خراپ نیە گەر فێری زمانێکی بڵاوی بێگانە ببێت، ئەمەش بۆ پێگەیاندنی نەوەیەکی موسڵمان کە بتوانێت نەخشەو پلانەکانی دوژمنان ئاشکرا بکات و لە فێڵ و تەڵەکەیان خۆی بپارێزێت.. و زانستە ماددییە رووتەکان بگوێزێتەوە بۆ موسڵمانان.. پێغەمبەری خواﷺش لە مەککەوە بەرەو مەدینەی پیرۆز کۆچی کرد، لەوێ یەکەم کاری ئەوە بوو:

(ابو یعلی) و (ابن عساکر) لە (زید کوڕی ثابت)ەوەﷺ دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: کاتێك پێغەمبەری خواﷺ هاتە مەدینە، بردمیانە خزمەتی، وتیان: ئەی پێغەمبەری خواﷺ! ئەم منداڵە لە هۆزی (بنی نجار)ەو حەڤدە سورەتی لەوەی بۆ تۆ دابەزیوە خوێندوە، منیش بۆ پێغەمبەری خوامﷺ خوێندنەوە، زۆری بەلاوە چاك بوو، فەرمووی: **((یا زید! تعلم لي کتاب الیهود، فإني والله ما آمن یهود علی کتابي))**. واتە: (ئەی زید! خۆت بۆم فێری زمانی جولەکە بکە، چونکە بەخوا بۆ نامەکانم لە جولەکەکان دڵنیا نیم).

دەڵێ: منیش فێری بووم و نیومانگ تێنەپەڕی کە تەواو شارەزا بووم، جا ئەگەر پێغەمبەری خواﷺ نامەی بنووسیایە من بۆم دەنووسی، و نامەیان بۆ بنووسیایە من دەمخوێندەوە.[2]

---

١ نصیحة الملوك – ص١٦٨.

٢ رواه أبوداود والترمذي والحاكم وصححه وأحمد والفاكهي. أنظر سلسلة الأحادیث الصحیحة

هەر ئەو دوانە لەگەڵ (ابوداود) لە (زیـد)ەوە گێڕاویانەتـەوە کـە وتوویـەتی: پێغەمبـەری خواﷺ پێی فەرمووم: ((أتحسن السريانية؟ فإنها تأتيني كتـب؟)) واتـە: ئایـا سـریانی بـاش دەزانی، چونکە نامەم بەو زمانە بۆ دێت؟ منیش وتم: نەخێر، فـەرمووی: ((فتعلمها))[1] فێـری ببە. منیش لەماوەی حەڤدە ڕۆژدا فێری بووم.

پێشینانی چاکیش لە فێرکردنی منداڵەکانیاندا پەیڕەوی ئەمـەیان کـردووە، کـە سـەرەڕای عەرەبی زمانێکی دیکەی بیانیان فێرکردوون:

لە (عمر کوڕی قیس) دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: (ابن زبیر)ﷺ سەد غـولامی هـەبوو، کـە هەر یەکەیان بە زمانێکی دیکە قسەی دەکرد، و ئەویش لەگەڵ هەر یەکێکیاندا بەزمانی خۆی قسەی دەکرد، منیش هەرکاتێ سەیرم بکردایە لـە کاروبـاری دنیایـدا، دەمـوت: ئـەم پیـاوە چاوتروکانێکیشی بۆ خوا نەبووە، وە کە سەیری کاروباری دواڕۆژیم دەکرد دەموت: ئـەم پیـاوە چاوتروکانێکیشی بۆ دنیا نەبووە.

## بنەمای زانستی شەشەم: ئاراستەکردنی منداڵ بـە پێی حـەزە زانستیەکانی:

پێش کـەمێك فێربـوونی زمـانی سـریانی (زیـد کـوڕی ثابـت) خرایـە ڕوو، کـە هـاوەڵان هەڵیانبژارد و بردیانە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ و دەستنیشانیان کرد بەهۆی ئاشنا بوونیان بە تواناکانی.. و حەزە زمانەوانیەکانی، و توانای بەجێهێنانی داواکاری پێغەمبەری خواﷺ لە فێربوونی زمانی سـریانیدا، ئەمـەش بەڵگەیـە لەسـەر ئاڕاسـتەکردنی منـداڵ بـەپێی حـەزە زانـستیەکانی، و ئـارەزووە دەروونیـەکانی، چـونکە ئـەو دەروون و دانایـەتی خـۆی و زیـاتر سەرکەوتنی بەسەر هاوڕێکانیدا دەزانێـت، زانایـانی پێـشینیش بڕیاریـان لەسـەر ئـەوە داوە، ئەوەتانێ (ابن سینا) وا دەبینێت کە هەموو پیشەیەك کە منداڵ دەیکات مەرج نیە کـە بێـت بە دەستیەوە و بۆی بچێتە سەر، بەڵام دەکرێت بگونجێنرێت لەگەڵ شێوەی سروشت و حەزیدا.

---

رقم١٨٧.

١ ورواه احمد والحاكم. أنظر سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم١٨٧.

دەگێڕنەوە کە (یونس کوڕی حبیب) زۆری لە (خلیل کوڕی احمد الفراهیدی) دووبارەی دەکردەوە کە فێری (عروض)و شیعری بکات، ئەوەش لەسەری گران دەبێت، ڕۆژێکیان (خلیل) پێی دەڵێت: ئەم شیعرە لە چ (بحر)ێکە؟

إذا لم تستطع شيئاً فَدَعْه وجاوزه الى ما تستطيع

واتە: گەر نەتتوانی کارێك بکەیت وازی لێ بێنەو بەسەریدا بڕۆ بۆ ئەو کارەی لە توانا تدایە.

کاتێ کە (یونس کوڕی حبیب) نەیتوانی وەڵام بداتەوە، (خلیل کوڕی احمد) داوای لێ کرد نیوەدێری دووەمی شیعرەکە لەبری پرسیارەکە جێبەجێ بکات.

ئیمام (بخاری)یش هەوڵی دەدا کە یەکەمجار فێری فیقه بێت و تێیدا ڕۆبچێت، (محمد کوڕی حسن) پێی وت: بڕۆ خۆت سەرقاڵی فەرموودەناسی بکە، کاتێ کە بینی لەگەڵ تواناکانیدا گونجاوە و لایەقترە بەو و نزیکترە لێی، (بخاری)یش گوێڕایەڵ بوو، ئەوەبوو پاشتر بووە سەردەستەی ئەهلی فەرموودە، بەڵکو بووە پێشەوایان.[1]

ئەوەش (عمر کوڕی عبدالعزیز) باسی منداڵی خۆیمان بۆ دەکات کە چۆن بە عەزیمەت و هێزو ویستەوە هیواو ئاوات و حەز و ئارەزووەکانی بەجێ هێناوە.

## بنەمای زانستی حەوتەم: کتێبخانەیەکی چاکی ماڵەوەو کاریگەریی لە بنیاتنانی منداڵدا:

بۆ ئەوەی منداڵ فێری قورئان و فەرموودەو زمان بێت پێویستە ماڵ کتێبخانەیەکی ئیسلامی تێدا بێت تا پەنای بۆ بات و لێی سوودمەند بێت.

لە (عبدالله کوڕی سلمە) لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە کە وتویەتی: (ابوبدیل کوڕی ورقاء) نووسراوێکی دایە دەستم، و وتی: کوڕەکەم! ئەمە نووسراوی پێغەمبەری خوا ﷺ یە دەستی پێوە بگرن بەچاك دەمێننەوە هەتا ئەوەتان لەنێودا بێت. جا باسی فەرموودەکەی کرد، ئەو نوسراوەش بە خەتی (علی کوڕی ابوطالب) ﷺ نووسرابوو.[2]

---

١ عن مجلة الوعي العربي سنة الأولى عدد١ عام١٣٥٧هـ/١٩٧٧ ص٣٣.

٢ الإصابة في تمييز الصحابة لأبن حجر. ترجمة بديل بن ورقاء.

(سمرە کوڕی جندب): فەرموودەی زۆری لە پەڕاوێکدا کۆکردبووەوە و بۆ (سلیمان)ی کوڕی بەجێی هێشت، ئەویش لەوەوە گێڕایەوە، وە وا گومان دەبرێت کە ئەو نامەیە بێت (سمرە) بۆ کوڕەکانی ناردووە، و (ابن سیرین) لە بارەیەوە دەڵێت: لەنامەکەی (سمرە)دا بۆ کوڕەکانی زانستی زۆر هەیە.[1] ئەمەش بەڵگەیە لەسەر بایەخی هەبوونی کتێبخانەیەکی زانستی بەسوود بۆ بنیاتنانی زانستی منداڵ بەشێوەیەکی پتەو لەنێو ماڵدا، لەبەر ئەمە (جاحظ) وتوویەتی: هەرکاتێ ئەدیبێك لێهاتووبوو و میراتیەکانیشی کتێبی چاك و کۆکەرەوەی ئادابەکان (آداباً جامعة) بوو، ئەوە شایانترە بە فێربوون بەختداربێ، وە لەبارترە کە فێربوون خێراتر بۆ لای بێت، واز لێهێنانی بە هەڵە بزانێت، وە لە پێشترە کە لەسەر ئەو ڕێگەیەی ئەدەب بڕوات کە بۆی دانراوەو ئەو پەیڕەوەی بۆی خۆش کراوە، هەروەها شایانترە کە لەبری کاروکاسبی کردن سەیری کتێب بکات و هاتوچۆی گوێگرتن لە زانست بکات، ئەوا ئەو کەسە گەیشتۆتە ئاستی بەس بوون و ئەوپەڕی پێویستی.[2]

ئیمامی شەهید (حسن البنا)ش لە پەیامەکەیدا - أنجع الوسائل في تربية النشء تربية اسلامية خالصة- (بەسوودترین هۆکار لە پەروەردەکردنی تازەپێگەیشتواندا بە پەروەردەیەکی ئیسلامی پوخت) لەبارەی گرنگی ڕۆڵی کتێبخانەی ماڵەوە وتوویەتی:

هەروەها بوونی کتێبخانە لەنێو ماڵدا زۆر پێویستە هەرچەندە بچووکیش بێت، بەڵام دەبێت کتێبەکانی مێژووی ئیسلامی، و سەربردەی پێشینانی چاك، و کتێبی خووڕەوشت، و پەند، و گەشتە ئیسلامیەکان، و ڕزگارکردنەکان، و هاوشێوەی ئەوانەی بۆ هەڵبژێرێت، هەرچۆن دەرمانخانەی نێو ماڵ پێویستە بۆ چارەسەرکردنی جەستەکان، بەهەمان شێوە کتێبخانەی ئیسلامی پێویستە بۆ چاکسازی عەقڵەکان، دەبێت دایك و باوك ئاگاداری ئەوەش بن کە کتێبی نزم و ڕۆژنامەی خراپ نەگاتە دەست کوڕەکان، ئەمەش بە قەدەغەکردن و هەڕەشەلێکردن نا، چونکە بەمە زیاتر حەزی پێدەکات و ڕووی تێدەکات، بەڵکو بە بردنی بۆ لای کتێبی بەسوود و سەرنج ڕاکێش و ورووژاندنی ئارەزووکردنی بۆ لای ئەو لایەنە چاکە.

---

١ تهذيب التهذيب: ٣٢٦/٤ رقم ٤٠٢ للحافظ ابن حجر.

٢ كتاب الحيوان –للجاحظ– طبع سلسلة المختار من التراث العربي رقم ٣٦٤/١١.

## بنچینەی زانستی هەشتەم: گێڕانەوەی سەربردەی منداڵێتی زانایانی پێشین و هەوڵدانیان بۆ بەدەست هێنانی زانست لەبەردەم منداڵدا:

بەهۆی ئەو رۆڵەی چیرۆك دەیگێڕێت لە سەرنج راکێشانی منداڵ و هەست جولاندنی، و وروژاندنی بێداری فیکری لە هۆشیدا، لەکاتێکدا کە شێوازی چیرۆك یەکێك بووە لە هۆکارەکانی پێغەمبەری خواﷺ لە پەروەردەکردنی منداڵدا، کە پاشتر لە بەشی پێنجەمدا بە پشتیوانی خوا دێینە سەر باسکردنی، هەروەها چیرۆك یەکێکە لە پایە بەهێزەکانی تیژکردنی هیممەت و روانینیان بەرەو ئاییندەیەکی زانستی پێشکەوتو، لەبەر ئەمە ئەم نموونانە خراوەتە بەردەستت تا ببێتە ناوکێك کە ئاراستە و رێنمایی منداڵان و بەرزکردنەوەی حەز و هەوڵیان لێوەی وەربگیرێت.

پێشتریش سەربردەی منداڵێتی سەرسوڕهێنەرمان لە لەبەرکردنی قورئان و فەرموودەدا خستە روو، و روداوی (ابن عباس) و چۆنیەتی داواکردنی زانستی گێڕایەوە، جا ئەم چیرۆکانەشی بۆ زیاد دەکەین:

١) منداڵیی (سفیان کوڕی عیینە) لە داواکردنی زانستدا:

(خطیب البغدادی) لە (احمد کوڕی نصر الهلالی)یەوە باسی کردووە دەڵێت: گوێم لە باوکم بوو دەیوت: لە کۆڕی (سفیان کوڕی عیینە)دا دانیشتبووم، سەرنجی منداڵێکی دا هاتە مزگەوت، دانیشتووانی نێو کۆڕەکە بەهۆی بچووکی تەمەنیەوە بە سووك سەیریان کرد، (سفیان) گوتی: ﴿كَذَٰلِكَ كُنتُم مِّن قَبْلُ فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْكُمْ﴾النساء/٩٤. واتە: (کاتی خۆی ئێوەش وەهابوون، هەتا خوای گەورە چاکەی بەسەرتان کرد).

پاشان وتی: ئەی (نضر)! ئەگەر بە دەساڵی منت دەبینی، بالآم پێنج بست دەبوو، دەم و چاوم وەك دینار وابوو، وەك تیشکی ئاگر وەهابووم، جلەکانم بچووك، و سەردەستەکانم کورت، شۆڕی جلەکانم بە ئەندازە، و نەعلەکانیشم وەك گوێی مشك بوون. چوومە لای زانای شارەکان" وەك (زهری) و (عمرو کوڕی دینار)و لەنێویاندا وەك بزمار دادەنیشتم، مەرەکەبدانەکەم وەك گوێز، و چاوم وەك مۆز، وقەڵەمەکەیشم وەك چوالە وابوو، کە دەچوومە کۆڕیانەوە دەیانوت: رێگە بکەنەوە بۆ زانای بچکۆلە.

دەڵێ : پاشان(ابن عیینه) زەردەخەنە گرتی و پێکەنی، (احمد) دەڵێت: باوکیشم زەردەخەنە گرتی و پێکەنی.[1]

٢) منداڵیی (مالك کوڕی انس):

(مطرف) وتوویەتی: (مالك) وتی: بە دایکم وت: دەڕۆم زانست وەردەگرم؟ وتی: وەرە، لەپێشدا کاڵای زانین بپۆشە، جا پۆشاکێکی تایبەت بە زانستی لەبەر کردم و کڵاوێکی درێژی لەسەرنام و بەمێزەر پێچایەوە، پاشان وتی: ئێستا بڕۆ داوای زانین بکە، وە هەموو جارێ دەیوت: بڕۆ لای (ربیعه) ئەدەبەکەی فێر بە بەر لە زانستەکەی.[2]

(ابن وهب) وتوویەتی: مالك بۆی گێڕامەوەو وتی: من کوڕێك بووم نەوتەمەن بووم دەچوومە لای (نافع) قسەی بۆ دەکردم کە لە مزگەوت دادەنیشت دوای نوێژی بەیانی کە کەم کەس دەهاتنە لای.[3]

٣) منداڵیی ئیمام (شافعی) و داواکردنی زانست:

ئیمام (شافعی) وتوویەتی: هیچ پارەو سامانم نەبوو، لە منداڵیشەوە بەدوای زانستدا دەگەڕام، (واتە لە سەرەتای تەمەنیەوە کە ئەو کاتە تەمەنی سیازدە ساڵان بووە) دەچوومە دیوان و ئەو کاغەزانەی دیوێکی لەسەری نووسرابوە هەڵمدەگرتەوەو لەسەرم دەنووسی.[4]

(بویطی)یش دەربارەی ئیمام (شافعی): ێراویەتیەوە کە لە کۆڕی (مالك کوڕی انس)دا بوو، لەو کاتەدا منداڵ بوو، پیاوێك هات بۆ لای (مالك) و داوای فەتوای لێ کرد و پێی وت: سێ جار سوێندم بە تەڵاق خواردووە کە ئەو بولبولە لە بەیانیەوە نەیبڕیوەتەوە، (مالك) پێی وت: سوێندەکەت کەوتوە، پیاوەکە ڕۆشت، (شافعی) ئاوڕی دایەوە بۆ لای هەندێك لە هاوەڵانی (مالك) و وتی: ئەم فتوایە هەڵە بوو، هەواڵی ئەوەیان بە (مالك) دا، ئەویش بە هەیبەت بوو، کەس نەیدەوێرا قسەی ڕەت کاتەوە، لەوانەبوو ئەگەر بەرپرسی پاسەوانانیش (صاحب الشرطة) بهاتایە لە دیار سەری ڕاوەستایە ئەو لە کۆڕەکەی دانیشتبایە هەڵنەدەستا. وتیان بە (مالك):

---

١ الكفاية في علم الرواية: ص١١٢.

٢ مقدمة كتاب –الديباج المذهب– لأبن فرحون.

٣ (التعليق الممجد على موطأ محمد) لأبي الحسنات عبدالحي اللكنوي(١/٢٣٩) وعزاه لتذكرة الحفاظ للذهبي في سيرة نافع.

٤ عن كتاب –صفحات من صبر العلماء– ص٥٥ ط٢.

ئەم منداڵە دەڵێت ئەو فتوایە بێئاگایی و هەڵەیە، (مالك) پێی وت: ئەمەت لەکوێوە هێنا؟ (شافعی) وتی: ئەی هەر تۆ نەبوویت کە لە پێغەمبەری خواﷺوە بۆت باسکردین لە سەرگوزشتەی (فاطمة کچی قیس) کە بە پێغەمبەری خواﷺی وت: (ابو جهم) و (معاویە) خوازبێنیان کردووم، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی:((**أما أبو جهم فلا يضع العصا عن عاتقه، وأما المعاوية فصعلوك لا مال له**)). واتە: ((ابوجهم) گۆچانەکەی لەسەر ملی داناگرێت، و (معاویە)ش هەژارەو پارەو سامانی نیە).

جا ئایا گۆچانەکەی (ابوجهم) هەمیشە لەسەر ملی بوو، یاخود مەبەستی لەوە ئەوەبوو کە زۆر کات وایە، (مالك) شوێن و پلە و قەدری (شافعی) بۆ دەرکەوت.

(شافعی) دەڵێ: کاتێك ویستم لە شاری (مدینە) بچمە دەرەوە، چووم بۆ لای (مالك) و خواحافیزیم لێ کرد، لەکاتی جیابوونەوەماندا پێی وتم: رۆڵە، ئەو رووناکیەی خوای گەورە پێی بەخشیویت بە گوناه و سەرپێچی خامۆشی نەکەیت. (مەبەستی رووناکی زانین بوو) کە ئەوەش لەفەرمایشتی خوای گەورەدا هاتووە: ﴿وَمَن لَّمْ يَجْعَلِ اللَّهُ لَهُ نُورًا فَمَا لَهُ مِن نُّورٍ﴾ النور/٤٠. واتە: (هەرکەس خوا رووناکی بۆ دانەنێت، ئەوا رووناکی بۆ نیە).

بەمجۆرە لەم گێڕانەوەیەدا (بولبول)ەو لە گێڕانەوەی دیکەدا کۆترەباریکەیە.[١]

٤) منداڵیی ئیمام (احمد کوڕی حنبل):

(احمد کوڕی حنبل) هەر بە منداڵی قورئانی لەبەر کردوە، و خوێندنەوەو نووسین فێر بووەو پاشان رووی کردۆتە (دیوان)، و بەسەر نووسیندا چۆتەوەو لەبارەی خۆیەوە دەڵێت:منداڵ بووم هاتوچۆی لای نووسەرانم دەکرد، پاشان هاتوچۆی (دیوان)م دەکرد و لەو کاتەدا تەمەنم چواردە ساڵ بوو.. پەروەردەو گەورەبوونەکەی شوێنەواری هەڵکەوتوویی و پێگەیشتنی پێوە دیار بوو، هەتا هەندێك لە ئەدیبان دەیانوت: من چەند پارە بۆ کوڕەکەم خەرج دەکەم، و پەروەردەکاریان بۆ پەیدا دەکەم تا فێری ئەدەب بن، کەچی وا نابینم کە سەرکەوتوو بن، بەڵام ئەوەتا (احمد کوڕی حنبل) منداڵێکی هەتیووە، سەیری بکەن چۆنە؟ و سەرسوڕمانی خۆی بەرامبەر خووڕەوشت و هەڵس و کەوتی جوانی دەربڕی.[٢]

---

١ كتاب –الحيوان الكبرى- ١/١٥٦ للدميري.

٢ رجال الفكر والدعوة، لأبي الحسن الندوي، ص١٠٥.

٥) منداڵیی ئیمام (ابویوسف)ی هاوڕێی (ابوحنیفه):

(ابویوسف) وتوویەتی: من بەدوای فەرموودەو فیقهدا دەگەڕام لەکاتێکدا کە دەستکورت بووم و حاڵم خراپ بوو، رۆژێك لەلای (ابوحنیفه) بووم باوکم هات و لەگەڵی رۆیشتم، پێی وتم: کوڕم! لەگەڵ (ابوحنیفه) دامەنیشە و قاچ رابکێشی، ئەو نانەکەی برژاوەو تۆش پێویستت بە پارەیە، ئیدی تەنها بەدوای کاری زۆردا دەگەڕام و گوێڕایەڵی باوکم کرد، (أبوحنیفه) کە هەستی کرد نایەم پرسیاری کرد و چوومەوە بۆ لای، و پاش ئەوە بەردەوام دەچوومە کۆڕەکەی، لە یەکەم رۆژی پاش دابڕانەکەم پێی وتم: چی سەرقاڵی کردویت و نایەیتە لای ئێمە؟ وتم: سەرقاڵی نان پەیداکردن و گوێڕایەڵی باوکمم، جا دانیشتم، کە خەڵکەکە رۆشتن، کیسەیەکی پێدام، و وتی: بەکاری بهێنە، کە سەیرم کرد بینیم سەد درهەمی تێدایە، پێی وتم: پابەند بە بەدەورو دەرسەکەتەوە، کە ئەوەش تەواو بوو پێم بڵێ.. منیش پابەند بووم بە وانەکەیەوە، ماوەیەکی کەم تێپەڕی سەد درهەمی دیکەی پێدام و ئیدی بەو شێوەیە بەردەوام بوو لەگەڵم، منیش هەرگیز هەواڵی نەبوونی و تەواوبوونی شتێکم پێ نەدەدا، بەڵام ئەو وەك ئەوە وابوو کە هەواڵی تەواوبوونی پێبدرێت، هەتا وام لێهات دەوڵەمەند بووم و بوومە خاوەن سەرمایە.

گێڕانەوەیەکی دیکەش هەیە سەبارەت بە پێگەیشتنی ئیمام (ابویوسف):

(علی کوڕی جعد) وتوویەتی: (ابویوسف) هەواڵی دامێ و وتی: (ابراهیم کوڕی حبیب)ی باوکم مرد و بەبچووکی لەباوەشی دایکمدا بەجێی هێشتم، ئەویش بردمی بۆ لای جل سپی کەرەوەیەك تا ببمە شاگردی، بەڵام من ئەو کارەم بەجێ دەهێڵا و دەچووم بۆ کۆڕی (ابوحنیفه)و دادەنیشتم و گوێم دەگرت، دایکم بەشوێنمدا دەهات بۆ کۆڕەکەو دەستی دەگرتم و دەیبردمەوە بۆ لای جل سپیکەرەوەکە، (ابوحنیفه)ش گرنگی پێ دەدام بەهۆی ئەوەی کە من هەر ئامادە دەبوم و سوور دەبووم لەسەر فێربوون، کاتێ ئەوە لەسەر دایکم زۆر بوو، و راکردنم درێژەی کێشا، بە (ابوحنیفه)ی وت: ئەم منداڵەم هەر لەم خراپەیەی تۆی کەم بوو، ئەم منداڵە هەتیووەو هیچ شتێکی نیە، من بە چنینی خۆم بەخێوی دەکەم، و ئومێدم وایە کە پیشەیەك بدۆزێتەوەدو خۆی لەسەر رابهێنێت، (ابو حنیفه) وتی: تێپەڕە پیرەژن! ئەو ئێستا فێری خواردنی حەلوا بە رۆنی فستق دەبێت. هەستا لای و رۆیشت و پێی وت: تۆ پیر بوویت و هەڵ خەڵەفاویت و هۆشت لەدەست داوە.

(ابویوسف) دەڵێت: ئیدی لای (ابوحنیفه) مامەوەو هەموو جارێ لە پارەی خۆی پێی دەدام، و هیچ کەم و کورتی‌یەکی نەهێشتم، خوای گەورە لە زانین سوودمەندی کردم و پلەی بەرز کردمەوە هەتا گەیشتمە پلەی قازی، و هاونشینی (هارون رشید) بووم و لەگەڵیدا لەسەر سفرەو خوانەکەی ئەو نانم دەخوارد، ڕۆژێکیان هەندێ حەلوایان بۆ (هارون رشید) هێنا، ئەویش پێی وتم ئەی (یعقوب) لێی بخۆ، هەموو ڕۆژێ وەکو ئەمەمان بۆ ناکەن، منیش وتم: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەوە چیە؟ وتی: ئەوە حەلوایە بەرۆنی فستق، منیش پێکەنیم، وتی: بەچی پێدەکەنیت؟ وتم: خێرە، خوا ئەمیری باوەڕدارانمان بۆ بهێڵێ، وتی: هەر دەبێ پێم بڵێی، زۆر داوای کرد، منیش سەرگوزشتەکەم لەسەرتا تا کۆتایی بۆ گێڕایەوە، سەری لەوە سوڕما و وتی: سوێند بێ زانست و زانیاری مرۆڤ بەرز دەکاتەوەو سوودی دین و دنیاشی پێ دەگەیەنێ، و ڕەحمەتی بۆ (ابوحنیفه) نارد و وتی: بەراستی ئەو بەچاوی عەقڵ دەیڕوانی ئەوەی کە دەیبینی بەچاوی سەری بەدی نەدەکرد.[1]

٦) منداڵیی (محمد کوڕی حسن الشیبانی) لە گەڕان بەدوای زانست و زانیاریدا:

(الخطیب) بە سەنەدی خۆی لە (مجاشع کوڕی یوسف)ەوە گێڕاویەتیەوە کە وتویەتی: لەشاری مەدینە بووم لای ئیمام (مالك) لە کاتێکدا فتوای بۆ خەڵك دەدا، (محمد کوڕی حسن) کە هاوڕێی (ابو حنیفه) بوو هات بۆ لای -تازەپێگەیشتوو بوو-، ئەمە پێش چوونی بۆ لای بە مەبەستی بیستنی (الموطأ) لێی، (محمد) وتی:

چی دەڵێی دەربارەی کەسێك لەشی پیسە و تەنها لە مزگەوتدا ئاوی دەست دەکەوێت؟ (مالك) وتی: کەسی لەش پیس ناچێتە ناو مزگەوت، (محمد) پێی وت: ئەی باشە چی بکات ئەوا کاتی نوێژکردن هاتووەو ئاو دەبینێت، دەڵێ: (مالك) هەر دووبارەی دەکردەوە کە لەش پیس ناچێتە ناو مزگەوت، کە هەر زۆر لێی دووبارە کردەوە (مالك) وتی: ئەی باشە تۆ لەو بارەوە چی دەڵێی؟ وتی: تەیەموم دەکات و دێتە ناو مزگەوت و ئاو دەبات و دەڕواتە دەرەوەو خۆی پێ دەشوات، وتی: تۆ خەڵکی کوێیت؟ وتی: خەڵکی ئێرەم-ئاماژەی بۆ زەوییەکە کرد-، پاشان هەستایەوە، وتیان (محمد کوڕی حسن) هاوڕێی (ابوحنیفه)یە، (مالك) وتی: باشە (محمد کوڕی حسن) چۆن درۆ دەکات؟ وای باسکرد کە خەڵکی مەدینەیە؟ وتیان: نا، ئەو مەبەستی ئەوەبوو کە خەڵکی ئەمەیە-ئاماژەی بۆ زەویەکە کرد-، وتی: ئەمەم لەسەر گرانتر بوو لەوە.[2]

---

١ عن كتاب صفحات من صبر العلماء.

٢ بلوغ الأماني في سيرة الإمام محمد بن حسن الشيباني –للشيخ زاهد الكوثري ص١٢.

٧)منداڵیی ئیمام (ابن الجوزي) لە گەڕان بەدوای زانست و زانیاریدا:

ئیمام (ابن الجوزي) سەبارەت ئەو ناڕەحەتیو سەختیانەی کە هاتۆتە ڕێی لەسەرەتای گەڕانیدا بەدوای زانست و زانیاری و ئارامگرتنی لەسەریان، دەڵێت:

لەکاتی ئەوپەڕی خۆشی گەڕانم بەدوای زانستدا بوو ناڕەحەتیم دەهاتە ڕێ کە لە هەنگوین شیرینترە، لەپێناوی ئەوەی کە داوام دەکرد و جێی ئومێدم بوو، لەکاتی منداڵیمدا کولێرەی وشکم هەڵدەگرت و دەچوومە دەرەوەو بەدوای فێربوونی فەرمووددا دەگەڕام و لەرۆخی رووباری (عیسی) لە بەغداد دادەنیشتم، نەمدەتوانی بەبێ ئاو بیخۆم، هەر کە پارویەکم دەخوارد خێرا ئاوم بەدویدا دەخواردەوە، و چاوی هیممەتیشم تەنها چێژی بەدەستهێنانی زانست و زانیاری بەدی دەکرد، ئەوەش بەرهەمی خۆی هەبوو لام، ئەوەبوو بەهۆی زۆر گوێگرتنم لە فەرموودەی پێغەمبەری خواﷺ و حاڵەتەکانیو ئادابەکانی و دەنگ و باس و بەسەرهاتی هاوەڵان و شوێنکەوتوان شارەزا بووم.

هەروەها وتوویەتی: تەنها بە هونەرێك وازم نەهێنا و رازی نەبووم، بەڵکو گوێم لە فیقهـ و فەرموودە دەگرت و شوێنی دنیانەویستەکان دەکەوتم، پاشان زمانەوانیم خوێند، هیچ کەسێکم لەوانەی کە ڕیوایەتی کردبێت یاخود ئامۆژگاری خەڵکی کردبێت نەم بواردووە، و هیچ کەسێکی نامۆ و نەناسراو نەهاتووە نەچوومە لای و کارەباشەکانم هەڵدەبژارد، من بەسەر زانایاندا دەگەڕام بۆ بیستنی فەرموودە، لەبەر راکردنم تا کەس پێشم نەکەوێ هەناسەم دەبڕا، وە ڕۆژم دەکردەوە هیچ خواردنێکم شك نەدەبرد و شەویشم بەسەردادەهات و هیچ خواردنێکم نەبوو، بەو جۆرەش بووم خوا هەرگیز سەرشۆڕی بەردەم هیچ دروستکراوێکی خۆی نەکردم، گەر شەرحی حاڵی خۆم بکەم زۆری دەوێت.[1]

٨) منداڵیی ئیمام (ابن سینا) لە گەڕان بەدوای زانست و زانیاریدا:

کاتێ گەیشتە تەمەنی دەساڵی قورئانی پیرۆز بەجوانی فێربووبوو، لەگەڵ ئەدەب و لەبەرکردنی هەندێك لە بنەڕەتەکانی ئایین و بیرکاری و جەبر و بەراوردکاری، پاشان زانستی (منطق) و (اقليدس) و (المِجَسْطي) بەچاکی فێر بوو، چەند جار پێشی (حکيم ابو عبدالله الناتلي)ی مامۆستای کەوتەوەو لەو زاناتر دەرچوو، لەگەڵ ئەوەشدا لە فیقهدا دەچوو بۆ لای

---

١ صفحات من صبر العلماء ص٧٦ ط٢.

(اسماعیل الزاهد)، و سەرقاڵی بەدەستهێنانی زانست بوو، وەك زانستی سروشتی و ئیلاهی، خوای گەورەش دەروازەی زانستی بەروودا کردەوەو پاش ئەوە حەزی لە زانستی پزیشکی کرد، لەو کتێبانەی کە دەربارەی نووسرابوون، وەکو ئەدەب -واتە بۆ فێربوون و فێرکردن- چارەسەری دەکرد نەك بۆ کاسبی کردن، لە زانستی پزیشکیدا شارەزا بوو هەتا وای لێهات بە کەمترین ماوە لەوانەی پێش و پاش خۆی زیاتر لە زانست و زانیاریدا بەرز بوویەوە، و لەنێویاندا وێنەو هاوتای نەبوو، شارەزایانی ئەو هونەرەو سەردەستەکانی دەهاتنە لای و جۆرەکان و ئەو چارەسازییانەی بە ئەزموون بەدەستی هێنابوو لەلای دەیانخوێندەوە، تەمەنیشی لەو کاتەدا شازدە ساڵان بوو، بەدرێژایی ماوەی سەرقاڵ بوونی یەك شەو بەتەواوی نەخەوتووە و رۆژانەش بێجگە لە خوێندنەوە هیچ کاری دیکەی نەدەکرد، هەرکاتێکیش لەمەسەلەیەکدا گرێکوێرەیەکی بۆ دروست بوایە دەستنوێژی دەشت و دەچوو بۆ مزگەوت و نوێژی دەکرد و دەپاڕایەوە لە خوای گەورە کە بۆی ئاسان بکات، و داخراوەکانی لێ بکاتەوە، لە کارەکەیەو زیرەکی و دانراوەکانیدا تاقانەو دەگمەن و بێوێنەی سەردەمەکەی بوو، نزیکەی سەد کتێبی داناوە کە کتێبی درێژ و پوخت و نامە لە هەموجۆرە هونەرەکانی تێدایە.[1]

کۆتایی: نمونەیەکی منداڵانی هاوەڵان لە کۆکردنەوە لەنێوان زانست و قورئان و جیهاد و خزمەتکردنی پێغەمبەری خوادا:

(حاکم)[2] لە (زید کوڕی ثابت) دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: کاتی شەڕی (بعاث) من تەمەنم شەش ساڵان بوو، کە پێنج ساڵ پێش کۆچکردنی پێغەمبەری خوا بوو، کە پێغەمبەری خوا هاتە مەدینە من تەمەنم یازدە ساڵان بوو، هێنامیانە خزمەت پێغەمبەری خوا و وتیان: منداڵێکی خەزرەجییەو شازدە سورەتی قورئانی خوێندووە،[3] لە غەزای (بدر) و (احد)دا رێگەم پێنەدرا بەشدار بم، لە (خندق)دا مۆڵەتی بەشداربوونم درا، (ابن عمر) م وتوویەتی: (زید کوڕی ثابت) بەهەردوو شێوەکان دەینووسی، عەرەبی و عیبری، یەکەم دیمەنیش کە (زید کوڕی ثابت) بینیبێتی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا لە شەڕی (خەندەق) بوو، کە ئەو کاتە تەمەنی پازدە ساڵان بوو، وە لەو کەسانە بوو کە لەگەڵ موسڵماناندا خۆڵیان دەگواستەوە،

١ المرجع السابق ص٤٢.
٢ رواه حاكم في مستدركه (٤٢١/٣).
٣ وفي كنز العمال: قد قرأ سبع عشرة سورة، فقرأت على النبي.

پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((أما إنه نعم الغلام)) واتە: (ئەمە بەراستی باشترین کوڕە).

لەو کاتەدا چاوی دەنووسا بە یەکدا و خەوی لێکەوت، و (عمارە کوڕی حزم) هات و چەکەکەی برد بەبێ ئەوەی هەستی پێبکات، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((یا أبا رقاد نمت حتى ذهب سلاحك)) واتە: (ئەی خەواڵوو، نوستیت هەتا چەکەکەتیان برد).

پاشان فەرمووی: ((من له علم بسلاح هذا الغلام)) واتە: (کێ ئاگاداری چەکی ئەم کوڕەیە؟)

(عمارە کوڕی حزم) وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ من بردم، جا چەکەکەی پێ دایەوە.

پێغەمبەری خواﷺ قەدەغەی کرد کە بڕوادار بترسێنرێت و شت ومەکی ببردرێت جا بەراستی بێت یان بە گاڵتە.

# دەروازەی هەشتەم

## بنیاتنانی تەندروستی

**دەستپێك:**

**یەکەم: بنەماکانی بنیاتنانی تەندروستی.**

**بنەمای یەکەم: وەرزش کردنی منداڵ لە بواری مەلەوانی و تیرهاوێژی و ئەسپ سواری و زۆرانبازی و راکردندا.**

**بنەمای دووەم: راهێنانی منداڵ لەسەر سوننەتی سیواك کردن.**

**بنەمای سێیەم: گرنگی و بایەخدانی منداڵ بە پاکوخاوێنی و نینۆك کردن.**

**بنەمای چوارەم: پەیڕەوکردنی سوننەتەکانی پێغەمبەری خواﷺ لە خواردن و خواردنەوەدا.**

**بنەمای پێنجەم: نوستنی منداڵ لەسەر لای راستی.**

**بنەمای شەشەم: فێرکردنی منداڵ بە چارەسەری سروشتی.**

**بنەمای حەوتەم: نووستنی منداڵ دوای عیشا و زوو هەستانی بۆ نوێژی بەیانی.**

**بنەمای هەشتەم: دوورخستنەوەی منداڵان لەو منداڵەی کە تووشی نەخۆشیەکی درم بووبێت.**

**بنەمای نۆیەم: چارەسەری بۆ منداڵان بە دوعا لە چاوی پیس و جنۆکە.**

**دووەم: چارەسازییەکانی پێغەمبەر:**

**١ ـ پەلەکردن لە چارەسەرکردنی منداڵی نەخۆشدا.**

**٢ ـ بەسەرکردنەوەو سەردانی منداڵی نەخۆش.**

**٣ ـ چارەسەر بە بەکارهێنانی داری هیندی.**

**٤ ـ چارەسەرکردن بە کەڵەشاخ گرتن و ڕۆیشتن.**

**٥ ـ چارەسەرکردن بە نزا و روقیە.**

**٦ ـ چارەسەری ئەو کەسەی چاوی پیس کاری لێکردووە.**

**٧ـ حەرامی هەڵواسینی شتێك بە منداڵەوە کە قورئـان و فـەرموودەی پێغەمبـەرﷺ نەبێت.**

## دەستپێك:

ئیسلام گرنگی داوە بە تەندروستی مرۆڤ بەگشتی، و تەندروستی منداڵ بە تایبەتی، و لە زۆربەی رێنماییەکانیدا سوورە لەسەر تیمارکردن و خێرا بەدەمەوەچوونی چونکە لە چارەسازییە سەرەکیەکانی لەش ساغیە، بەو پێیەی کە لاشە سپاردراوێکە لای مرۆڤ لەبەر ئەوە پاراستنی ئەو سپاردەیە پێویست کراوە، تەنانەت تیمارکردنیشی کردۆتە یەکێك لە قەدەرەکانی خوای گەورەو ئەو قەدەرەی خوا لەسەر مرۆڤی لادەبات کە نەخۆشکەوتنیەتی.

(مسلم) و (احمد) لە (جابر کوڕی عبدالله)ەوەﷺ گێڕاویانەتەوە وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((**لكل داء دواء، فإذا أصاب الدواء برئ بإذن الله عز وجل**)).واتە: (هەر دەردەێك دەرمانی خۆی هەیە، ئەگەر دەرمانەکە دەردەکەی پێکا بەئیزنی خوای گەورە دەربازی دەبێ لێی و چاك دەبێتەوە).

ئیمام (احمد) و (نسائی)یش لە (اسامە کوڕی شریك)ەوە گێڕاویانەتەوە کە وتوویەتی: لە خزمەت پێغەمبەری خواﷺدا بووم، هەندێ خەڵکی دەشتەکی هاتن و وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا!ﷺ ئایا تیماری خۆمان بکەین؟

پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((**نعم، یا عباد الله تداوْوا، فإن الله عزوجل لم یضع داء الاّ وضع له شفاء غیر داء واحد**)). واتە: (بەڵێ، ئەی بەندەکانی خوا، تیماری خۆتان بکەن، ئەوەش بزان کە خوای گەورە هیچ دەردێکی دانەناوە دەرمان و چارەسازی بۆ دانەنابێت جگە لە یەك دەرد).

وتیان: ئەو دەردە چی یە؟ فەرمووی: ((**الهرم**)) واتە: پیری.

هەروەها ئیمام (احمد) و (ترمذی)یش لە (ابوهریرە)ەوەﷺ گێڕاویانەتەوە کە وتوویەتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خواﷺ! دوعا(رقیە)یەکت بەدی کردووە، یا دەرمان تیماری پێ بکەین، یا پارێزێك کە خۆمانی پێ دەپارێزین، ئایا ئەوانە هیچ لە قەدەری خوا دەگێڕێتەوە؟

فەرمووی: ((**هي من قدر الله**)) واتە: (ئەوانەش هەر لە قەدەری خوای گەورەن).

ئەم فەرموودانەش بەڵگەن لەسەر بایەخ و گرنگی پێدانی پێغەمبەری خواﷺ بە ساغ و دروستی تاکی موسڵمان لە نەخۆشی و ئێش و ئازار، و ((**المؤمن القوي خير وأحب الى الله من المؤمن الضعيف وفي كل خير**)) بڕواداری بەهێز چاکتر و خۆشەویستترە لای خوای گەورە لە بڕواداری لاواز، لە هەردووکیشیاندا خێر و چاکە هەیە.

بەڵام پایەکانی بنیاتنانی تەندروتی منداڵ بۆ دورخستنەوەی لە زۆر نەخۆشی کامەیە؟

ئەو ڕێسا تەندروستیە پێویستیانەی منداڵ چی یە تا کەمتر تووشی نەخۆشی ببێت؟

گەر لە فەرموودەکان و ژیاننامەی بەڕێزی پێغەمبەری خواﷺ رابمێنین ئەوا هەشت پایەی تەندروستی بەدی دەکەین کە پێغەمبەری خواﷺ بۆ چاودێریکردنی لەش ساغی منداڵ گرنگی پێداوە، جا دەبێ ئەو پایانە چی بن؟

## یەکەم: بنەماکانی بنیاتنانی تەندروستی منداڵ:

### بنەمای تەندروستی یەکەم: وەرزشی مەلەوانی و تیرهاوێژی و ئەسپ سواری و زۆرانبازی و راکردن:

لە بنەماکانی بنیاتنانی جەستەییدا مافی منداڵمان لە فێربوونی مەلەوانیو تیرهاوێژیدا خستە ڕوو لەگەڵ وەسیەتی ئیمام (عمر) بۆ سەرکارانی کە منداڵەکانیان فێر بکەن و چاك ئەسپ سواریشی بۆ زیاد کردووە، و پێغەمبەری خواﷺ منداڵانی ریز دەکرد و پێشبڕکێی راکردنی بۆ ساز دەکردن، هەروەها تەماشای زۆرانبازی دوو منداڵی کرد بەر لە غەزای (احد)، ئەو وەرزشە لەشیەش جەستەی منداڵ بەشێوەیەکی بەهێز بنیات دەنێت بەجۆرێك کە توانای بەرەنگاری نەخۆشیەکانی هەبێت لە خۆیدا، و جەستەی ببێتە رێگرێکی خۆیی لەبەرامبەر وەرگرتنی نەخۆشیەکاندا، مەگەر خوای گەورە شتێکی کەی لەچارە نووسیبێت، و بەجۆرێکی کە تاقی بکاتەوە.

لێرەدا هیچ پێویست ناکات کە سوودەکانی ئەو وەرزشانە باس بکەین، تەنها هێندە بەسە کە لای پزیشکێك دابنیشیت و گوێبیستی ئەو بیت و بگەیتە پلەی دڵنیایی (یقین) بۆ فەرموودەکەی پێغەمبەری خواﷺ.

ئەوەندە بەسە بزانیت کە مەلەوانی هەموو ماسولکەکانی جەستە دەجوولێنێ، و زۆر نەخۆشی لە لاشە لادەبات کە لێرەدا بوار نیە بۆ باسکردنی ولەکتێبە پزیشکیەکاندا باسکراوە.

## بنەمای تەندروستی دووەم: ڕاهێنانی منداڵ لەسەر سوننەتی سیواك كردن:

گرنگی پێدانی پێغەمبەری خواﷺ بە سیواك لای هەموان روون و ئاشكرایە، هەتا فەرمووی: ((لولا أن أشق على أمتي لأمرتهم بالسواك عند كل صلاة))[1] واتە: (ئەگەر لەبەر ئەوە نەبێت كە ببێتە ئازار و زەحمەت بۆ ئوممەتم، فەرمانم دەكرد پێیان كە بۆ هەموو نوێژێ سیواك بكەن).

خۆ گەر منداڵ لەسەر ئەم نەریتە ڕاهێنرا و دەستی كرد بە پاكژكردنەوەی ددانەكانی بە شێوەیەكی ڕێك و پێك، ئەوا بەو هۆیەوە بەسەر زۆر نەخۆشیدا زاڵ دەبێت كە زۆر كات بەهۆی كلۆربوونی ددانەوە یاخود بەهۆی نەخۆشی پووكەوە تووشی دەبێت، زانستی پزیشكی نوێش سەلماندوویەتی كە سیواك كاریگەری هەیەو ماددەی كیمیاوی وەهای تێدایە كە سوود بە ددان دەگەیەنێت و پووك بەشێوەیەكی كارا بەهێز دەكات.

سیواكیش نرخی هەرزانە، و لەنیوە دوورگەی عەرەبیدا زۆرە، ئیمام (نووی)یش لە ڕاڤەكەیدا بۆ (صحيح مسلم) باس دەكات كە دەگونجێت ئەو داری (ئیراك)ە بگۆڕدرێتەوە بە هەر شتێك، ئەوەش بۆ پاكژكردنی ددانەكان هەتا كە مرۆڤ هیچ شتێكی دیكەی بەدەستەوە نەبوو بۆ پاكژكردنەوەی ددانی با بە دەستی پاكژی بكات یاخود بە قوماشێكی زبر، گرنگ لەوەدا ئەوەیە كە منداڵ ڕابێت لەسەر سوننەتی سیواك كردن و پاكژكردنەوەی ددانی ئیدی بە هۆی هەر ئامێرێكەوە بێت.

## بنەمای تەندروستی سێیەم: گرنگی و بایەخدانی منداڵ بە پاكوخاوێنی و نینۆك كردنی:

پاكوخاوێنی یەكێكە لەو پایەسەرەكیانەی كە ئیسلام بانگەشەی بۆ دەكات، و ئەو منداڵەشی كە دەیەوێت نوێژ بكات دەبێت دەستنوێژ بگرێت، پێویستیشە كە جل و بەرگەكانی پاك و بێخەوش بێت، و دەبێت جێگاكەشی خاوێن بێت، ئەوانە هەمووی بۆ ئەنجامدانی فەرزی نوێژە كە لە حەوتساڵیدا فەرمانی كردنی پێدەكرێت و لە تەمەنی دە ساڵیدا لەسەر نەكردنی لێی دەدرێت.

---

١ صحيح. ورواه احمد والبخاري ومسلم والترمذي ومالك وابن ماجه عن أبي هريرة وأحمد وأبـوداود والنسائي عن زيد بن خالد الجهني. أنظر صحيح الجامع رقم ٥٣١٥.

نینۆك كردنیش یەكێكە لەو پێنج شتەی كە لە فیترەتەوەن، هەروەك لە فەرمودەی (صحیح)دا هاتووە: ((**خمس من الفطرة.... وتقليم الأظافر...**)) واتە: (پێنج شت لە فیترەتەوەیە... و نینۆك كردن... .، ئەو منداڵەش كە لەسەر نینۆك كردن رادێت بەو هۆیەوە دەستەكانی دوور دەخاتەوە لەو خڵتە پیسیانەی كە لە ژێر نینۆكدا كۆ دەبنەوەو دەبنە هۆی تووشبوون بە نەخۆشی كاتێك كە منداڵ دەستی بەو پیسییەوە دەخاتە نێو دەمیەوە).

## بنەمای تەندروستی چوارەم: پەیڕەوی كردنی سوننەتەكانی پێغەمبەری خواﷺ لە خواردن و خواردنەوەدا:

پێشتر لە ئادابی نانخواردندا ئەوەمان خستە روو كە منداڵ رابهێنرێت لەسەر ئەوەی كە لەبەردەمی خۆیەوە بخوات و دەستی بۆ ئەم لاو ئەو لای قاپەكە درێژ نەكات، خۆ ئەگەر رابهێنرێت لەسەر سوننەتی پێغەمبەری خواﷺ لە دووركەوتنەوە لە زۆرخۆری لەكاتی نانخواردندا ئەوە دەبێتە بردنەوەو سەركەوتنێك بۆیەو هۆی پاراستنی لە زۆر نەخۆشی هەناوی و ناوەكی.

ئیمام (احمد) و (ترمذي) گێڕاویانەتەوە لە (مقدام كوڕی معد یكرب)ەوە كە وتوویەتی: گوێم لێبوو پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((**ما ملأ آدمي وعاء شراً من بطنه، بحسب ابن آدم لقيمات يقمن صلبه، فإن كان لا محالة، فثُلث لطعامه، وثُلث لشرابه وثُلث لنفسه**)).[1]
واتە: (ئادەمیزاد هیچ زەرفێكی پڕ نەكردووە خراپتر لە ورگی، بۆ ئادەمیزاد چەند پاروویەك بەسە كە بەرپێكی رای بگرن، خۆ ئەگەر هەر چاری نەبوو، ئەوا سێیەكی بۆ خواردن و سێیەكی بۆ خواردنەوەو سێیەكی بۆ هەناسەدان).

بۆ خواردنەوەش بەهەمان شێوە لەسەر سوننەتی پێغەمبەری خواﷺ و شێوازی ئەو رادەهێنرێن:

(بخاری)و (مسلم)و (ترمذی) لە (انس كوڕی مالك)ەوەﷺ هێناویانە كە پێغەمبەری خواﷺ لە خواردنەوەدا بەسێ قوم لێدان دەیخواردەوەو لەدەرەوەی جامەكە هەناسەی دەدا.

لەگێڕانەوەی (ترمذی)یشدا ئەم زیادەی هەیە: كە ئەوە زیاتر تینویەتی دەشكێنێ و بێدەردتر و ئاسانتر قوت دەدرێ.

---

١ قال الترمذي حديث حسن صحيح، ورواه ايضاً ابن حبان وابن ماجه والحاكم وصححه الذهبي. أنظر جامع الأصول ٧/٤١٠.

(انس) دەڵێت: منیش بەبێ قوم لێدان ئاو دەخۆمەوەو لە نێوانیاندا هەناسە دەدەم.

لە گێڕانەوەی (ابوداود)یشدا پێغەمبەری خواﷺ گەر بیویستایە ئاو بخواتەوە بەسێ قوم لێدان دەیخواردەوەو لە نێوانیاندا سێ جار هەناسەی دەداو دەیفەرموو: ((هو أهنأ وأمرأ وأبرأ)) واتا: (ئەمە خۆشتر و ئاسانتر قوت دەدرێ و بێ‌دەردترە).

دەبێت ئاگاداری منداڵیش بکرێت کە لەکاتی خواردنەوەدا لەناو جامەکە هەناسە نەدات، جا بۆ هەرشلەمەنیەك بێت:

لە هەردوو (صحیح)ەکەدا لە (ابوقتادە)وە گێڕاویانەتەوە کە پێغەمبەری خواﷺ قەدەغەی کردووە لەوەی کە لەکاتی شت خواردنەوەدا لەناو جامەکەدا هەناسە بدرێت.

لە گێڕانەوەی (ترمذی)شدا: پێغەمبەری خواﷺ قەدەغەی کردووە لەوەی کە لەکاتی شت خواردنەوەدا لەناو جامەکەدا هەناسە بدرێت یاخود فووی لێ بکرێت.

بەدانیشتنەوە بخواتەوە -جگە لە ئاوی زەمزەم کە سوننەت وایە بەپێوەو روو لە قیبلە بخورێتەوە-

(مسلم) لە (ابوهریرە)وەﷺ گێڕاویەتیەوە کە دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:

((لا يشربنَّ أحدكم قائماً [1] فمن نسي فليسقئ)). واتە: (کەستان بەپێوە ئاو نەخواتەوە، ئەگەر لەبیرتان نەبوو بەسەر پێوە خوارتانەوە، خۆتان بڕشێننەوە).

## بنەمای تەندروستی پێنجەم: نوستن لەسەر لای راست:

ئەمەش پایەکی سەرەکی تەندروستی پێغەمبەری خواﷺیە لە ژیانی موسڵماندا، و سوودی تەندروستی زۆری هەیە، و پێغەمبەری خواﷺش وەسیەتی هاوەڵە بەڕێزەکانی بەوە دەکرد:

(بخاری) و (مسلم) گێڕاویانەتەوە: ((إذا أتيت مضجعك فتوضأ وضوءك للصلاة ثم اضطجع على شقك الأيمن، وقل: اللهم اسلمت نفسي اليك، ووجهت وجهي اليك، وفوّضت أمري اليك، وألجأت ظهرى اليك، رغبة ورهبة اليك، لا ملجأ و لا منجى منك الا إليك، آمنت بكتابك الذي أنزلت ونبيك الذي أرسلت، وأجعلهن آخر ما تقول)). واتە: (کاتێ ویستت بچیتە سەر نوێنی نوستنت، لەپێشدا دەست نوێژ بگرە، وەك دەستنوێژی

---

[1] أنظر جامع الأصول ٧٤/٥ حول الموضوع.

نوێژ، ئینجا لەسەر لای راست رابکشێ و بڵێ: خوایە! خۆم دایە دەستی تۆ، کاری خۆم سپارد بەتۆ، هانام هێناوە بۆ پەنای تۆ، پشتم بەستووە بەتۆ، ئەوەش کە دەیکەم چونکە مەترسیم لە قار و سزای تۆ هەیەو ئومێدم بە میهرەبانیو رەحمەتی تۆ هەیە، و هیچ پەناو پاسارێ لە قار و خەشمی تۆ نیە مەگەر هەر لەلای خۆت، پەنا هەر پەنای تۆیە، باوەڕم بەو کتێبە پیرۆزانە هەیە کە ناردووتن و یەکێکیان قورئانی گەورەیە، و باوەڕیشم بەو پێغەمبەرانەشت هەیە کە خۆت رەوانەت کردووە، جا ئەو دوعاو نزایە بکە بە دوا قسەت).

## بنەمای تەندروستی شەشەم: فێرکردنی منداڵ بە چارەسەری سروشتی:

مرۆڤ لەهەموو ژیانیدا پێویستی بە شێلانی ماسولکەکانی هەیە، ئەو منداڵەشی گەورە دەبێت و پێشتر مەشقی کردووە لەسەر شێلانی ماسولکەکانی دایك و باوکی کە ئەوان رێنماییان کردوە بەو هۆیەوە لێهاتوویەکی چاك و زانینێك بەدەست دەهێنێت کە ئەمڕۆ لە ریزی ئەو زانستانەدایە کە سوودی بۆ مرۆڤ هەیە.

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی فێری منداڵ کردووەو بە لاشەی پیرۆزی مەشقی پێکردوون، ئایە ئەمەت نەبیستووە؟ با هەردووکمان پێکەوە گوێبیستی بین:

لە (عمر)ەوە دەگێڕنەوە کە وتویەتی: چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ خزمەتکارێکی حەبەشی هەبوو پشتی دەشێلا، وتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ شوێنێکت ئازاری هەیە؟ فەرمووی: ((إن الناقة تقحمت بي البارحة(أي القتني في ورطة) )).[1] واتە☹حوشترەکەم دوێنی خستمیە خوارەوە).

## بنەمای تەندروستی حەوتەم: نووستن پاش عیشا و زوو هەستان بۆ نوێژی بەیانی:

راهێنانی منداڵ لەسەر بەجێهێنانی نوێژی بەیانی لەکاتی خۆیدا، ئەمە مانای ئەوەیە کە زوو لەخەو هەستێت، جا بۆ ئەوەی بتوانێت بە چوست وچالاکی و زوو لەخەو هەستێت و تێر بوبێت لەخەوتن، پێویست دەکات کە زوو بخەوێت.[2]

ئەوەتانێ (عمر)ﷺ بۆ نوێژی عیشا دەهاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ لەکاتێکدا کە منداڵەکانی خەواندبوو هەتا نوێژەکەی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺدا بکات:

---

١ رواه الطبراني والبزار وابن السني وابونعيم وسعيد بن منصور. أنظر كتر العمال ٤٤/٤.

٢ زاد المعاد لابن القيم١٦٩/٣.

(بخاری) و (مسلم) و (نسائی) لە (ابن عباس)ەوە م گێڕاویانەتەوە کە وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ دواکەوت لەنوێژی عیشا، (عمر)ﷺ چوویە دەرەوەو وتی: نوێژەکە ئەی پێغەمبەری خواﷺ، ژنان و منداڵان خەوتوون، جا هاتە دەرەوەو ئاو لەسەری تنۆك تنۆك دەهاتە خوارەوە، و فەرمووی: ((لو لا ان أشق على أمتي لأمرهم بالصلاة في هذه الساعة)).

ئەگەر لەبەر ئەوەنەبوایە، کە ئومەتەکەم تووشی نارەحەتی ببوایە، فەرمانم پێدەکردن کە لەم کاتەدا نوێژ بکەن.

لەگەڵ ئەمەدا منداڵی موسڵمان بە بەجێهێنانی فەرزەکانی ئایینەکەی چەند نەریتێکی تەندروستی زۆر باش بەدەست دەهێنێت، و جەستەو دەروونی بەهێز دەکات، وە گازی (ئۆزۆن)یش کە پێکهاتەی سێ گەردیلە ئۆکسجینە لەکاتی بەرەبەیاندا لە هەوادا بڵاودەبێتەوە، ئەوەش سەلماوە کە ئەم گازە لە چالاکی خانە زیندووەکان زیاد دەکات، و زۆر نەخۆشی ناهێڵێت، منداڵیش لەکاتی ئەنجامدانی فەرزی نوێژی بەیانیدا بەبێ ئەوەی کە بزانێت ئەو گازە هەڵدەمژێت و پێکهاتەی بەهێز دەبێت.

(حاکم)یش گێڕاویتیەوەو بە(صحیح)ی داناوەو (ذهبي) یەکدەنگە لەگەڵی، بە (مرفوع)ی دەگێڕنەوە: ((إياك والسمر بعد هدأة الليل، فإنكم لا تدرون ما يأتي الله من خلقه)).[1] واتە: (ئاگادارتان دەکەمەوە لە قسەکردنی شەو دوای ئەوەی کە خەڵك نوستوون، ئێوە نازانن و ئاگادار نین کە خوای گەورە چی بۆ دروستکراوەکانی خۆی دەهێنێت).

بەم جۆرە دەبینین جیاکردنەوەی دین و دنیا لە ئیسلامدا نیە، ئەو کەسەشی مەبەستی بێت ئایین بەسەر منداڵەکانیدا جێبەجێ بکات، دنیا بەرەورووی هاتووە بە ملکەچ بوویی، پاشان زووهەستان سوودێکی دیکەشی هەیە کە ئەویش زیادبوونی رزق و رۆزییە، ئەوەتانێ (ابن عباس) کاتێ کوڕێکی خۆی بینی دەمەوبەیانییەو ئەویش خەوتووە، پێی وت: هەستە ئایا لەکاتی دابەشکردنی رزق و رۆزیدا دەخەویت.[2]

(بیهقی) گێڕاویتیەوە کە پێغەمبەری خواﷺ بەیانی زوو بوو چوویە لای (فاطمة)، بینی خەوتووە، جا هەڵیساند و پێی فەرموو: ((قومي فاشهدي رزق ربك)). واتە: (هەستە ئامادەی وەرگرتنی رزق و رۆزی پەروەردگارت بە).

---

١ أنظر سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم ١٧٥٢.

٢ زاد المعاد لأبن القيم٣/١٦٩.

## بنەمای تەندروستی هەشتەم: دوورخستنەوی منداڵ لە نەخۆشیە درمەکان:

پێغەمبەری خواﷺ ڕێسایەکی گشتی بۆ هەموو ئوممەت داناوە، بە گەورەو بچوکیەوە، کە بریتیە لە نەهاتنی مرۆڤی تووش بوو بە نەخۆشی درم بۆ ناو کۆمەڵی خەڵك، وە با سەردانی هیچ کەسیش نەکات، ئەمەش بۆ پاراستنی موسڵمانانە.

لە قۆناغی منداڵێتیشدا نەخۆشی درم هەیە، ئاگاداری دایك و باوکان دەکرێت کە منداڵەکەیان نەبەن بۆ سەردانی هاوڕێ و خزمان، بەپێچەوانەی ئەوەشەوە باوکان و دایکان منداڵەکەی خۆیان نەبەن بۆ سەردانی ماڵێك کە لە نێویدا منداڵێکیان تووشی نەخۆشیەکی درم بووە، هەتا تەواو چاك دەبێتەوە، لەمەشدا جوانترین ڕێسای تەندروستی پێغەمبەر هەیە:

لە هەردوو (صحیح)ەکەدا لە(ابو هریرە)ەوەﷺ گێڕاویانەتەوە کە وتوویەتی: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((**لا یوردن ممرض علی مُصحٍّ**))[1] واتە: (با نەخۆش نەبردرێتە لای ساغ).

هەروەها دایك و باوك هەڵدەستن بە دوورخستنەوەی منداڵە تووشبووەکەیان لە براو خوشکەکانی دیکەی تا نەخۆشیەکەی نەگوێزرێتەوە بۆیان، بۆ ئەوەی ئەو منداڵە تووش بووەش تووشی گرێیەکی دەروونی نەبێت، هیچی تێدا نیە کە بە فەرمودەی پێغەمبەری خواﷺ ئامۆژگاری بکرێت، ئەمەش بۆ ئەوەی کە بزانێت ئەو فەرمانە لە پێغەمبەری خواوەیە ﷺو منداڵی موسڵمانیش پێغەمبەری خۆی خۆش دەوێت و شوێنی دەکەوێت و وەڵامی بانگەوازەکەی دەداتەوە.

## بنەمای تەندروستی نۆیەم: چارەسەری بە دوعا ( پەنادان )ی منداڵان لەچاوی پیس و جنۆکە:

ئەم چارەسازییەش تەنها تایبەتە بە پزیشکی پێغەمبەرﷺ بۆ منداڵان، و پایەکە لە پایەکانی پارێزگاری کردنی تەندروستی منداڵ لای پێغەمبەری خواﷺ، ئەو بەو جۆرەی ئەنجام دەدا لەگەڵ منداڵان وە دایکان و باوکانی هانداوە لەسەری، و ئیمامی (نووی) لە کتێبەکەیدا (الأذکار) دەروازەی -ما یعوذ بە الصبیان وغیرهم- خستوویەتیە روو کە:

لە (صحیح)ی (بخاری)دا گێڕامانەوە لە (ابن عباس)ەوەم کە دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ (حسن) و (حسین)ی پەنا دەداو دەیفەرموو: ((**أعیذُکما بکلمات الله التامّة، من کل شیطان**

---

[1] رواه احمد وأبوداود والنسائي.

وهامة، ومن كل عين لامّة)). واتە: (پەنای هەردووكتان دەدەم بە هەموو وشە تەواوەكانی خوای گەورە، لەهەموو شەیتانێك و هەموو ژەهردارێك و لەهەموو چاوێكی پیس). هەروەها دەیفەرموو: ((إن أباكما كان يعوذ بهما إسماعيل وإسحاق)).[1] واتە: ((ابراهیم)ی باوكتان بەمە پەنای (اسماعیل) و (اسحاق)ی دەدا).

(نووی) دەڵێ: وتم بۆ هەموو.

زاناكان وتویانە: (الهامّة) بریتیە لە هەموو خاوەن ژەهرێك كە بكوژێت وەك مار و هیدیكە.

بەڵام (العين اللامّة) بریتیە لەو كەسەی كە بەچاوی پیسەوە تەماشای شتێكی كرد زیانی پێبگەیەنێت.. ا.هـ. قسەی (نووی) ∴.

(ترمذی)یش لە (عبید كوڕی رفاعەی زرقی)ەوەﷺ گێڕاویەتیەوە كە (أسماء كچی عمیس) وتویەتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ مندالی (جعفر) زۆر خێرا چاوی پیس كاریان تێ دەكات، ئایا دوعایان بۆ بخوێنم؟ فەرمووی: ((نعم، فإنه لو كان شيء سابق القدر لسبقته العين)) واتە: (بەڵێ دوعایان بۆ بخوێنە، چونكە ئەگەر شتێك هەبوایە پێشی قەدەر بكەوتایە، ئەوا چاوی پیس پێشی دەكەوت).

ئیمام(مالك)یش لە كتێبی (الموطأ)دا گێڕاویەتیەوە لە (عروە كوڕی زبیر)ەوەﷺ كە پێغەمبەری خواﷺ چووە ماڵی (ام سلمە) و مندالێكی لێبوو دەگریا و وایان باسكرد كە چاوی پیس لێی داوە، فەرمووی: ((ألا تسترقون له من العين؟!)) واتە: (بۆ روقیەو دوعای چاوپیسی بۆ ناخوێنن).

ئیمام (احمد)یش بە سەنەدێكی (حسن) لە (عائشە)ەوە گێڕاویەتیەوە كە وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ هاتە ژوورەوە، گوێی لە دەنگی مندالێك بوو دەگریا، فەرمووی: ((ما لصبيكم هذا يبكي؟ فهلا استرقيتم له من العين؟!))[2] واتە: (ئەم مندالەتان چییەتی ئەگری؟ ئەوە بۆ دوعای چاوپیسی بۆ ناخوێنن).

---

١ رواه الحاكم في مستدركه ١٦٧/٣ وقال صحيح على شرط الشيخين.

٢ أنظر سلسلة الأحاديث الصحيحة. رقم١٠٤٨.

(عمرو کوڕی عاص)یش‌ﷺ نزاکانی پەناگرتن(معوذات)ی دەنووسی و دەیخستە ناو سەرینی منداڵەکەیەوە، ئەم خۆپاراستنە لە نەخۆشییەکان تەنها بڕواداری ڕاستگۆ بڕوای پێی هەیە، ئەو بڕوادارانەی کە ئەو بەرنامە پێغەمبەرییە دەگمەن و پڕ بایەخەیان وەرگرتووە.

## چاکسازییەکانی پێغەمبەرﷺ بۆ منداڵان:

ماوەتەوە بپرسین: ئەی گەر منداڵ تووشی نەخۆشی بوو، گرنگترین چارەسازییە سەرەکیەکانی پێغەمبەرﷺ بۆ منداڵان چی یە؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارەش پێویستە کە بڵێین ئەوەی کە هاتووە لە دەستپێکدا لە پێویستی و گرنگی تیمارکردن و پرس و راوێژ بە پزیشك، بەڵام ئەم چارەسازییانەی پێغەمبەریشیﷺ بۆ زیاد دەکرێت:

١- پەلە کردن لە چارەسەرکردنی منداڵی نەخۆشدا:

پەلەکردن لەبردنی منداڵی نەخۆش بۆ لای پزیشك ڕۆڵێکی گەورەی هەیە لە کەمکردنەوەی ئەو نەخۆشیەی توشی بووە، تەنانەت دەبێتە ڕەگەزێکی کارا، زۆر نەخۆشی هەیە هۆکارەکەی بۆ سستی و تەمبەڵی دایك و باوك دەگەڕێتەوە لە بردنی منداڵەکەیان بۆ لای پزیشك، لەبەر ئەوە دەبینین کە پێغەمبەری خواﷺ فێرمان دەکات کە خێرا و پەلە بین لە چارەسازیی منداڵدا.

لەم ڕووەوە (ابن سعد) لە (عائشە)ەوە‌ڵ گێڕاویەتیەوە کە وتوویەتی: (اسامە) لە پێشی دەرگاکەدا کەوت و نێوچەوانی بریندار بوو، وتی: ئەی (عائشە) ئەو خوێنەی لابەرە، منیش بێزم نەهات، دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ هات و شوێنی برینەکەی مژی و خوێنەکەی فڕێ دەدایەوەو دەیفەرموو: ((لو كان أسامة جارية لكسوته وحلَّيته حتى أنفقه)).[1] واتە: (گەر (اسامە) کچ بوایە پۆشاکم بۆ دەکرد و دەمڕازاندەوە، هەتا نەفەقەم بکێشایە).

لای (واقدی) و (ابن عساکر)یش لە (عطاء کوڕی یسار)ەوەﷺ گێڕاویانەتەوە کە وتوویەتی: (أسامە کوڕی زید)ﷺ کە هات بۆ (مدینە) تووشی ئاوڵە بوو، لەکاتێکدا کە منداڵ بوو بەردەوام چڵمی بە لووتدا هاتبووە خوارەوە، (عائشە) بێزی لێی دەهاتەوە، پێغەمبەری خواﷺ هاتە ژوورەوە دەستی کرد بە شۆردنی دەم و چاوی و ماچ کردنی، عائیشە

---

١ عن حياة الصحابة ٢/٤٤٦ ط مصرية.

دەڵێ: ئیدی وەڵاهی پاش ئەوە هەرگیز بێزم لێی نابێتەوە و خۆمی لێ بەدوور ناگرم.[١]

جا بینیت پێغەمبەری خواﷺ چۆن دەیشۆرد و ماچی دەکرد؟! ئا بەم جۆرە چارەسەری منداڵی بەدەستە پیرۆز و بەڕێزەکانی دەکرد و بێزی لێیان نەدەبوویەوەو دڵی تێک نەدەچوو پێیان.

## ٢- سەردانی منداڵی نەخۆش:

ئەمەش چارەسازییەکی دەروونیە بۆ منداڵی نەخۆش، چونکە کاتێك کە کەسانی گەورە لە دەوری خۆی دەبینێت هاتوون بۆ سەردانی، دەروونی بەهێزتر دەبێت لەبەرەنگاری نەخۆشیەکەیدا، و هێدی هێدی دەست دەکات بە جووڵەو قسەکردن لەگەڵ میوانەکاندا، خۆ ئەگەر ئەو سەردانە نزا و پاڕانەوەشی تێدا بێت بۆ منداڵەکە ئەوە هەر زۆر چاکە، ئەمەش چارەسازییەکی تاقانەی پێغەمبەری خواﷺیە بۆ منداڵان، لەم بارەیەشەوە (بخاری) لە (انس)ەوەﷺ هێناویەتی کە وتوویەتی:

کوڕێکی جولەکە هەبوو خزمەتی پێغەمبەری خواﷺی دەکرد، نەخۆش کەوت، پێغەمبەریشﷺ چووە سەردانی، و لای سەریەوە دانیشت، و پێی فەرموو: موسڵمان بە، کوڕەکەش سەیرێکی باوکی کرد کە لەوێ بوو، باوکی وتی: بەگوێی (ابوقاسم) بکە، کوڕەکەش موسڵمان بوو، پێغەمبەری خواﷺ کە هەستا و هاتە دەرەوە دەیفەرموو: ((**الحمد لله الذي أنقذه من النار**)) واتە: (سوپاس بۆ ئەو خوایەی لە ئاگر رزگاری کرد).

بەوجۆرە پێغەمبەری خواﷺ سەردانی منداڵانی بڕوادار و بێباوەڕانی دەکرد، و پەرۆشیان بوو، ئەمەش لە چاودێری و گرنگی پێدانی پێغەمبەرەوەیەﷺ بە منداڵان.

## ٣- چارەسازیی بە بەکارهێنانی (داری هیندی) و دەرمانی (السعوط)[٢]:

ئیمام (احمد) و (بخاری) و (مسلم) و (ابوداود) و (ابن ماجە) لە (أم قیس کچی محصن) ی خوشکی (عکاشە)ەوە هێناویانە کە دەڵێت: کوڕێکی بچووکی خۆم بردە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ کە هێشتا نانی نەدەخوارد -واتە شیرەخۆرە بوو- میزی پێدا کرد، ئەویش داوای ئاوی

---

١ عن حياة الصحابة ٢/٤٤٦ ط مصرية.

٢ السعوط: بریتیە لەو دەرمانانەی کە بە بۆنکردن یان بەشلی دەکرێتە لوتەوە بەمەبەستی چارەسەرکردن.

کرد و پرژاندی بە شوێنی میزەکەدا.. دەڵێت: کوڕێکی خۆم پێبوو چوومە خزمەتی پێغەمبەری خواﷺ، منیش بەهۆی گەرووکەوتنیەوە پەنجەم لە قوڕگیدا کردبوو،[1] فەرمووی: ((**علام تَدْغَرن أولادكُنَّ بهذا العِلاق؟ عليكن بهذا العود الهندي، فإن فيه سبعة اشفية من سبعة أدواء: منها ذات الجنب، ويسعطُ من العُذرة، ويُلدُّ بـه مـن ذات الجنـب**)). واتـە: (ئـەوە بۆچـی منداڵەکانتان بەوجۆرە گەروی دێننەوە، ئێوە ئەو داری هیندیيە بەکار بهێنن شیفای حەوت دەردی تێدایە: لەوانە سیل، بۆ گەروهێنانەوە دەکرێتە ئەو لاتەنیشتەی ئازارەکـەی لێیـە، بـۆ سیلیش بەهەمان شێوە دەخورێتەوە).

دکتۆر (حسين عبدالمجيد هاشم) لـەکاتی باسـکردنی ئـەو فەرموودەيـەدا لـە راڤـەکردنی وشەکانی فەرموودەکەدا دەڵێت:[2]

(تدْغَرْنَ):[3] (دال)ەکەی فەرامۆش بکرێ و (غەين)ەکەی (فتحه)ی لەسەر بێـت، واتـە بـەو پەنجانە دەست لە گەرووی منداڵەکانتان رادەکەن، واتە بەو دەردو بەڵایە، لە قسەکەشدا واتـای ناڕازیبوونی تێدایە، واتە: لەسـەر چ بناغەيـەك ئـەو دەردە بـەو بەڵايـەو بـەو چارەسـازیيە ناشیرینە چارەسەر دەکەن، جا وایان لێ مەکەن.

داری هیندی (العود الهنـدي): دارێکـە لـە پێـڕی داربـەڕوەکان، بەنـەرمی دەکوترێـت و دەتاوێنرێتەوە، ئینجا دەکرێتە ئەو لا گەرووەی کە ئازارەکەی تێدايـەو ئاوسـاويەکە ناهێڵێـت لەبەر ئەوەی گەرم و وشکە.

(ذات الجنب):[4] سیلە، (قرطبی) دەڵێ: ئێش و ئازارێکە تێیدا و بە (لوو) ناودەبرێت.

پزیشکەکە دەڵێت: بۆیە بە تایبەتی باسی کردووە لەبـەر ئـەوەی ناڕەحـەتترین دەردە، زۆر بەکەمیش کەسی تووش بوو لێی دەرباز دەبێت.

---

١ لە گێڕانەوەیەکی دیکـەدا وا هـاتووە: ((لا تعذبوا صبيانكم بالغمز في العذرة)) واتـە: منداڵـەکانتان ئازار مەدەن بە پەنجە خستنە قوڕگیانەوە.
(العذرة= گەرووکەوتن) نەخۆشیەکە لە قوڕگدا و بـە پەنجـە لەوزەتێنەکـەيان لـە کێم و چڵك پـاك دەکردەوە.

٢ في تحقيقه لكتاب البيان والتعريف في اسباب ورود الحديث الشريف، لأبن حمزة٣/١١.

٣ لـە (معجم الوسيط)دا دەڵێ: (دغر المـرأة الـصبي) واتـە: ئافرەتەکە پەنجـەی خستە گـەرووی منداڵەکەوە تاکو گەروی بێنێتەوە.

٤ (ابن القيم) لە کتێبەکەیدا (الطب النبوي) لا٨١ دەڵێت: هـەموو ئازارێك کە لەلاتەنیشتەوە بێـت پێی دەوترێت (ذات الجنب) و ئەم ناوەش لە شوێنی ئازارەکەوە وەرگیراوە.

(**ويسعَّط من العذرة**): ئازارێك یان گرێیەکە لە گەروو، بەزۆری تووشی منداڵان دەبێت، یاخود برین(قرحە)ی گوێ و و گەروو.

(**ويَلدُّ به**): واتە: (دەرژێنرێتە لایەکی دەمەوە).

(بخاري) دەڵێت: (القسط الهندي البحري) بریتیە لە دارێکی پیری بەڕووەکان وەك کافوورە.

(سفيان) لە وەسفی (العلاق)دا دەڵێت: بەدەست تێی دەهەسوون. (سفيان) پەنجەی کرد بە مەلاشووی خۆیا، و وتی: بەڵکو مانای بەرزکردنەوەی مەلاشووە بە پەنجەی.[1]

لە(جابر)یشەوەﷺ گێڕاویانەتەوە کە ئافرەتێك منداڵێکی خۆی هێنایە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ و وتی: گەرووی کەوتووە، فەرمووی: ((**تحرقون حلوق أولادكم، خذي قسطاً هندياناً وورساً فأسعطيه إياه**)).[2] واتە: (گەرووی منداڵەکانتان دەسوتێنن، بڕۆ (قسط)ێکی هیندی و زەعفەران تێکەڵ بکەو ئامادەی بکەو بە لایەکی دەمی دا بکە).

هەر لە (جابر)ەوەﷺ کە دەڵێت: منداڵێك لەلای (عائشە)ی دایکی ئیمانداران بوو، خوێن لە هەردوو کونەلووتی دەهات، پێغەمبەری خواﷺ هاتەژوورەوەو فەرمووی: ئەو منداڵە چیەتی؟ وتی: لەوزەتێنێتی، فەرمووی: ((**ويحكن يا معشر النساء لا تقتلن أولادكن، وأي امرأة يصيبها عذرة أو وجع برأسه فلتأخذ قسطاً هندياً**)). واتە: (ماڵ وێران ئەی کۆمەڵی ئافرەتان، منداڵەکانتان مەکوژن، هەرئافرەتێك تووشی لەوزەتێن بوو یاخود سەری ژانی کرد، با بە (قسط)ێکی هیندی چارەسەری بکات).

دەڵێ: وە فەرمانی کرد بە (عائشە)، ئەویش ئەنجامی داو منداڵەکە چاك بوویەوە.[3]

لە گێڕانەوەی (احمد) بەسەنەدێکی (صحيح) بەمجۆرە هاتووە: ((**فلتأخذ قسطاً هندياً فلتحكه بماء، ثم تسعطه إياه**))[4] واتە: (با(قسط)ێکی هیندی ببات و توێکڵەکەی بەئاو لێ بکاتەوە، پاشان پێی تیماری بکات).

(ابوداود)یش بە سەنەدێکی بەهێز باسی کردووە کە پێغەمبەری خواﷺ خۆی تیماری پێ کردووە.

---

١ أنظر جامع الأصول ٥٢٥/٧ ت.الأرناؤوط.
٢ رواه الحاكم في مستدركه٢٠٦/٤ وقال حديث صحيح على شرط مسلم و لم يخرجاه.
٣ رواه الحاكم في مستدركه٢٠٥/٤ وقال هذا حديث صحيح على شرط مسلم و لم يخرجاه.
٤ وقال الهيثمي٨٩/٥ رواه ابويعلى والبزار. ورجالهم رجال الصحيح.

(ابن القیم) لە کتێبەکەیدا (الطب النبوي) دەڵێت:[١] (قسط)و (کست) یەك واتایان هەیەو دوو جۆرن: سپی کە پێی دەوترێت دەریایی، ئەوی دیکەیان هیندییەو زیاتر گەرمە، سپیەکەشیان نەرمترەو زۆر سوودیان هەیە.

٤- چارەسازی بە کەڵەشاخ و دەرمانی رەوانی:

(ترمذی) گێڕاویەتیەوە[٢] لە (عبدالله کوڕی عباس) کە (عکرمە) وتویەتی: (ابن عباس)م سێ غولامی هەبوو کەڵەشاخیان دەگرت، دوانیان خزمەتی (خۆی و خاووخێزانی) دەکرد، و یەکێکیش کەڵەشاخی خاووخێزانی دەگرت، دەڵێ: (ابن عباس) وتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((نعم العبد الحجام، یذهب بالدم، ویُخِفُّ الصُّلب، ویجلو البصر)). واتە: (باشترین بەندە ئەو کەسەیە کە کەڵەشاخ بگرێت، خوێنەکە لادەبات، ئازار کەم دەکاتەوە، و چاو رۆشن دەکاتەوە).

چاکترین رۆژیش کە کەڵەشاخی تێدا بگرن رۆژی حەڤدە و نۆزدەو بیست و یەکە. ((خیر ما تداویتم به السعوط واللدود والحجامة والمشي)).[٣] باشترین شتێك کە تیماری پێبکەن (السعوط) و (اللدود)[٤] و کەڵەشاخ گرتن و دەرمانی رەوانی یە.

(لە (عائشە)ەوەڵ گێڕاویانەتەوە کە مۆڵەتی خواستووە لە پێغەمبەری خواﷺ تا کەڵەشاخ بگرێت، ئەویش فەرمانی بە (ابوطیبة) کردووە کە کەڵەشاخی بۆ بگرێت، دەڵێت: وا دەزانم کە وتی: برای شیری بووە یان منداڵێك بوو هێشتا باڵغ نەبووبوو.[٥] (واتە ابوطیبة)

٥) چارەسازی بە نزاو روقیە خوێندن:

ئیمام (مالك) لە (موطأ)دا لە (حمید کوڕی قیسی مالکی)ەوەﷺ گێڕاویەتیەوە کە وتوویەتی: هەردوو کوڕەکەی (جعفر کوڕی ابوطالب) بردرایە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ، بە دایەنەکەیانی فەرموو: ((مالي أراهما ضارعین؟)) ئەوە چییە بۆ لاواز دیارن، دایەنەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ! چاو خێرا کاریان لێ دەکات، ئەوەش وای لێکردووین روقیەی بۆ بخوێنین، بەڵام نازانین ئاخۆ تۆ بەوە رازیت؟ پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((أسترقوا لهما،

---

١ ص٣٥٣ ت.الأرناؤوط.

٢ قال ترمذي حدیث حسن.

٣ رواه الحاکم في مستدرکه ٢٠٩/٤ وقال هذا حدیث صحیح الأسناد و لم یخرجاه وأقره الذهبي.

٤ اللدود: ئەو دەرمانەیە کە زۆر ئازاری دەدات و دەکرێتە لایەکی دەمی نەخۆشەوە.

٥ رواه الحاکم في مستدرکه٤/٢١٠ وقال صحیح علی شرط مسلم و لم یخرجاه.

فإنه لو سبق شيء القدر لسبقته العين)) واتە: (روقیەیان بەسەردا بخوێنن، چونکە بەراستی گەر شتێك هەبوایە پێشی قەدەر بکەوتایە چاو دەبوو).

ئیمام (احمد) و (طبرانی) لە (ابن عباس)ەوە م گێڕاویانەتەوە کە ئافرەتێك منداڵێکی خۆی هێنایە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا! (لمم=فیَ)[1]ی لەگەڵدایەو لەکاتی نانخواردندا دەیگرێت و نانخواردنەکەمان لیَ تێك دەدات. پێغەمبەری خواﷺ دەستی هێنا بەسەر سینگیدا و بۆی پاڕایەوەو ئەویش رشایەوە، ئەوەی لەناو سکیدا بوو وەك بەردی رەش هاتە دەرێ و چاك بوویەوە.

(بخاری) و (مسلم) و (ترمذی) لە (سائب کوڕی یزید)ەوەﷺ هێناویانە کە وتوویەتی: پوورم بردمی بۆ خزمەت پێغەمبەری خواﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ! ئەم خوشکەزایەم ئێش و ئازاری هەیە، پێغەمبەریشﷺ دەستی هێنا بەسەرمداو بۆم پاڕایەوەو داوای فەڕ و بەرەکەتی بۆ کردم.

(جعید) وتوویەتی: (سائب کوڕی یزید)م بینی لە تەمەنی نەوەد و چوارساڵیدا بەهێز و ئاسایی بوو، وتی: چاك دەزانم ئەوەی پێمدراوە لە چاو و گوێ و ماوەتەوە بەهۆی پاڕانەوەکەی پێغەمبەری خواﷺوەیە.

(طبرانی) لە (ام أبان کچی وازع) لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە کە (وازع)ی باپیری کەوتە رێ بۆ خزمەت پێغەمبەری خواﷺ و کوڕێکی شێتی خۆی یان خوشکەزایەکی لەگەڵدابوو، باپیرم وتی: کاتێ گەیشتینە لای پێغەمبەری خواﷺ لە مەدینە، وتم: ئەی پێغەمبەری خواﷺ کوڕێکی خۆم (یان خوشکەزایەکم) هێناوەتە خزمەتت شێتە، بەڵکو لای خوای گەورە بۆی بپاڕێیتەوە، فەرمووی: بیهێنە لام، چووم لە سەر وڵاخەکە بوو هێنام، دەستیم کردەوە، جل و بەرگی سەفەرم لەبەر لابرد، و جل و بەرگێکی چاکم لەبەر کرد، و دەستیم گرت تا گەیاندمە لای پێغەمبەری خواﷺ، فەرمووی: ((أدْنِه مني، وأجعل ظهره مما يليني)) واتە: (نزیکی بکەرەوە لێم، و پشتی بکە من).

دەڵێ: پێغەمبەر جلەکانی لەسەرەوەو خوارەوە گرت و دەستی کرد بە لێدانی پشتی هەتا سپیایی بن باڵیم بینی، و دەیفەرموو: ((أخرج يا عدو الله، أخرج يا عدو الله)) واتە: (ئەی دوژمنی خوا برۆ دەرەوە، ئەی دوژمنی خوا برۆ دەرەوە).

---

١ اللمم: واتە بەشێکی شێتیە تووشی ئادەمیزاد دەبێت، یان نزیکی دەکاتەوە لێی.

ئیدی بە جۆرێکی ڕاست و دروست دەستی کرد بە تەماشاکردن، کە وەك سەیرکردنی پێشتری نەبوو، پاشان پێغەمبەری خواﷺ لەبەردەمی خۆیدا داینا و بۆی پاڕایەوە، و دەستی هێنا بە روخساریدا، پاش پاڕانەوەی پێغەمبەری خواﷺ لەنێو ئەو شاندەدا کەس نەبوو لەو چاکتر بێت.

لە کۆتایی ئەم گۆشەیەدا چەند نزاو روقیەیەکی سوننەت و موستەحەب دەخەینە بەر دەستت بە ئومێدی ئاشنابوونیان و بەکارهێنانیان گەر پێویستیت پێ هەبوو:

- (ترمذی) لە (عبدالله کوڕی عباس)ەوەﭭ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خواﷺ فێری روقیەو دوعای (تا) و ئازارەکانی تری دەکردن: ((**بسم الله الکبیر، أعوذ بالله العظیم، من کل عِرْقٍ نعّار ومن شرّ حرِّ النار**)). واتە: (بەناوی خوای گەورە، پەنادەگرم بەخوای مەزن، لەهەموو (تا)گرتنێك، و لەخراپەی گەرمی ئاگر. (عرق نعار: واتە خوێنی لێ هات: کاتێ کە پڕ خوێن بوو.)

- (بخاری) و(مسلم) و(ابوداود) لە(عائشە)ەوەﭬ گێڕاویانەتەوە کە وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ شوێنێکی مرۆڤ ئازاری هەبوایە یان هەوکردن یان برینێکی هەبوایە، دەڵێ: بە پەنجەکانی ئاوەها -پەنجەی شایەتمانی لەسەر زەوی داناو پاشان بەرزی کردەوە- و فەرمووی: ((**بسم الله تربة أرضنا بریقة بعضنا یشفي به سقیمنا یاذن ربنا**)). واتە: (بەپیرۆزی ناوی خوای گەورە دوعات بۆ دەکەم، ئەوە خاکی زەوی خۆمانە، لەگەڵ تەڕایی دەمی موسڵمانێ لەخۆمان، بە فەرمانی پەروەردگارمان دەبێ بە چارەسازی و دەرمان بۆ نەخۆشمان).

- (ترمذی) لە (علی)ەوەﭬ گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خواﷺ گەر بچوایە بۆ لای نەخۆشێك یاخود نەخۆشێکیان بهێنایە بۆ لای، دەیفەرموو: ((**أذهب البأس ربَّ الناس، إشف أنت الشافي لا شفاء الاّ شفاؤك، شفاءً لا یغادر سقماً**)). واتە: (ئەی پەروەردگاری هەموو خەڵك، ئەم هەموو ئێش و ئازارە لاببە، چارەی بکە هەر تۆ چارەسازی، و هیچ چارەیەك نیە جگە لە شیفای تۆ، شیفایەکی تەواوی وا کە هیچ دەردێ ناهێڵێ).

(بخاری) و (مسلم) (وابوداود) و (ترمذی) لە (عائشە)ەوەﭬ گێڕاویانەتەوە کە پێغەمبەری خواﷺ ئەگەر شوێنێکی خۆی ئازاری هەبوایە سورەتی (ناس) و (فلق)ی دەخوێند بەسەر خۆیداو فووی دەکرد، کاتێ ئازارەکەی توندتر بوو، من بەسەریدا دەمخوێند و دەستی راستیم بەسەردا دەهێنا بەئومێدی بەرکەوتنی پیت و فەڕی.

- بە دوعاو روقیەی (جبریل)✕ بۆپێغەمبەرمان (محمد)ﷺ کۆتایی بەم روقیانە دەهێنین:

(مسلم) و (ترمذی) لە (ابوسعید خدری)ەوە‌ﷺ گێڕاویانەتەوە کە (جبریل) ×هات بـۆ لای پێغەمبەری خواﷺ و فەرمووی: ئەی (محمد)! ئایـا ناسـاغیت؟ فـەرمووی: بـەڵێ، (جبریـل) فەرمووی: ((**بسم الله أرقيك من كل داء يؤذيك ومن شر كل نفـس وعـين، باسـم الله ارقيك، والله يشفيك**)). واتە: (بە پیرۆزی ناوی خوا نزات بۆ دەکـەم، کـە پـەنات بـدات لـە هەموو دەردێك کە ئازارت بدات، وە لە خراپەی هەموو کەس و چاوێك بتپارێزێت، بە پـیرۆزی ناوی خودا روقیەت بۆ دەکەم و خوای گەورە شیفات دەدا).

هەر لەبەر ئەوەیە کە (ابن عباس) لەکاتێکدا باسی پێویستی خوێندنی هـەردوو سـوورەتی (ناس) و (فلق) دەکات دەڵێ: هەموو منـداڵێك کـە لـەدایك دەبێـت (وەسوەسـەیەك) لەسـەر دڵیەتی، خۆ گەر یادی خوای گەورەی کرد ئەوە لا دەچێت، گەر بە پێـچەوانەشەوە بێئاگـابوو لێی، وەسوەسە دەکات، کە ئەوەش فەرمایشتی خوای گەورەیە ﴿الْوَسْوَاسِ الْخَنَّاسِ﴾.[١]

## ٦- چارەسازیی ئەوکەسەی چاوی پیس کاری لێکردووە:

لە (عائشە)ەوە‌ل‌گێڕاویانەتەوە کە وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمانی بە چاوپیسەکە دەکرد کە دەستنوێژ بگرێت، پاشان ئەوەی کە تووشی بـووە (بەچـاوی چاوپیسـەکە) بـە ئـاوی دەستنوێژەکە خۆی بشوات.[٢]

(مالك)یش لە (موطأ)دا لە (ابواسـامە کـوڕی سـهل کـوڕی حنیـف) گێڕاویەتیـەوە کـە وتوویەتی: (عامر کوڕی ربیعە) (سهل کوڕی حنیفە)ی بینی خۆی دەشۆرد، وتـی: هـیچ رۆژی وەك ئەمڕۆم نەدیوەو پێستی وا شاراوەم نەدیوە، (سهل) کەوت و تووشی ئازار بوو، هاتنە لای پێغەمبەری خواﷺ و پێیان وت: ئەی پێغەمبەری خـواﷺ! چیت هەیـە بـۆ (سـهل کـوڕی حنیف)؟ سوێند بەخوا سەری بەرز ناکاتەوە، فەرمووی: ئایـا کـەس تاوانبـار دەکـەن؟ وتیـان: (عامر کوڕی ربیعە) تاوانبار دەکەین، جا لێی تووڕە بوو و فەرمووی: ((**علام يقتل أحـدكم أخاه؟ الا بَرَّكْتَ اغتسل له**)). واتە: (بۆچی یەکێ لەئێوە براکەی خۆی دەکوژێ؟ نەدەبوو (بارك الله) بکەیت، دەی خۆتی بۆ بشۆ).

دەم و چاو و دەست و ئانیشکی و هەردوو ئەژنۆی و ئەملاولای قاچیو نـاوەوی جلـەکانی خۆی شۆرد و چۆڕاوەکەی کردە قاپێکەوەو پاشان کردی بەسەر (سهل)دا و چاك بوویەوەو لەگەڵ خەڵکەکەدا رۆشت و هیچ ئێش و ئازاری نەما.

---

١ رواه الحاكم في مستدركه ٢/٥٤١ وقال صحيح على شرط الشيخين و لم يخرجاه.

٢ رواه ابوداود.

لە گێڕانەوەیەكی دیكەی (مالك)دا هاتووە: ((علام يقتل أحدكم أخاه؟ الا بَرَّكْتَ، إن العين حق، توضأ له)). واتە: (بۆچی یەكێ لەئێوە براكەی خۆی دەكوژێ؟ نەدەبوو (بارك الله) بكەیت، ئەی نەتدەزانی كە چاوپیسی حەقە، دەی دەستنوێژی بۆ بشۆ).

جا (عامر) دەستنوێژی شۆرد، ئیدی (سهل) چاك بوویەوەو لەگەڵ پێغەمبەری خواﷺدا رۆشت و هیچ ئازاری نەمابوو.

<u>٧- حەرامكردنی هەڵواسینی شت بە منداڵەوە، گەر قورئان یاخود فەرموودەی پێغەمبەر نەبێت:</u>

لە كۆتایی ئەم دەروازەیەدا پێویست دەكات كە باسی حەرامی هەڵواسینی گوڵلەبەند و ملوانكەی موورو شین بكەین، یاخود پاوانەی لەبەر بكرێت و لەو باوەڕەدا بن كە لە چاوی پیس دەیپارێزێت، هەروەك بێئاگایان لە فەرمان و یاساكانی شەرع دەیكەن، و پێغەمبەری خواﷺش بە هاوبەش دانان بۆ خوا (شرك)ی داناوە گەر خاوەنەكەی هەر سوور بێت لەسەر هەڵواسینی پاش ئاگاداركردنەوە لێی.

لە (عمرو كوڕی حارق)ەوە دەگێڕنەوە كە (بكير) بۆی گێڕاوەتەوە كە دایكی بۆی باسكردووە كە (مخرمە)ی برای ناردووە بۆ لای (عائشە) ل ، كە تیماری برینی منداڵانی دەكرد، كاتێك تیماری كرد و لێبوویەوە، دوو پاوانە(خلخال)ی بە قاچیەوە بینی، (عائشە) وتی: ئایا وا گومانتان دەبرد كە ئەم دوو پاوانەیە شتێكی لێ لادەدەن كە خوای گەورە لەسەری نووسیبێت؟ گەر پێشتر بمدیبایە تیمارم نەدەكرد و دەستم لێ نەدەدا، سوێند بێ پاوانەی زیو لەمانە پاكترە.[1]

لەبەر ئەوەیە كە بە ئاگاهێنانەوەی زۆر توند لە پێغەمبەری خواﷺوە بەدی دەكەین بۆ دووركەوتنەوە لە كاروكردەوەی سەردەمی نەفامی و بیروباوەڕەكانیان بە هەڵواسینی شت بە سنگی منداڵەوە لە ترسی چاوپیسی، با ئێمە گوێبگرین و شوێنی پێغەمبەرمانﷺ بكەوین و خۆمان هیچ بیدعەیەك دانەهێنین.

(عبدالرزاق) لە (مصنف)ەكەیدا (٢٠٨/١١) لە (ابوقلابە) گێڕاویەتیەوە كە وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ ملوانكەی منداڵێك (واتە فضل كوڕی عباس)ی پچڕاند. وتی: لەوانەبوو كە دەكرانە ملی منداڵ بۆ پاراستن لە چاوپیسی.

---

١ رواه الحاكم في مستدركه ٢١٨/٤ وقال صحيح الإسناد و لم يخرجاه وسكت عنه الذهبي.

# دەروازەی نۆیەم

## پاکخوویکردنی زایەندی منداڵ

**دەستپێك:**

**بنچینەکانی پاکخوویکردن(تهذیب)[١]ی پاڵنەری زایەند( جنس )ی منداڵ.**

**بنچینەی پاکخوویکردنی یەکەم: مۆڵەت وەرگرتنی منداڵ بۆ چوونە ژوورەوە.**

**بنچینەی پاکخوویکردنی دووەم: راهێنانی منداڵ لەسەر چاو دانەواندن و پاراستنی شەرمگە(عورة)ی.**

**بنچینەی پاکخوویکردنی سێیەم: جیاکردنەوەی منداڵان لە نوێنی نوستندا.**

**بنچینەی پاکخوویکردنی چوارەم: نوستنی منداڵ لەسەر لای راستی.**

**بنچینەی پاکخوویکردنی پێنجەم: دوورکەوتنەوەی منداڵ لە تێکەڵاوی و وروژێنەرە زایەندیەکان.**

**بنچینەی پاکخوویکردنی شەشەم: فێرکردنی فەرزەکانی خۆشتن ( غوسڵ ) و سوننەتەکانی بە منداڵی پێگەیشتوو( ممیز ).**

**بنچینەی پاکخوویکردنی حەوتەم: راڤەکردنی سەرەتای سورەتی ( النور ) بۆ منداڵی پێگەیشتوو.**

**بنچینەی پاکخوویکردنی هەشتەم: باسکردنی زایەند ( جنس ) بە ئاشکرا بۆ منداڵی پێگەیشتوو، و ئاگادارکردنەوەی لە داوێن پیسی.**

**بنچینەی پاکخوویکردنی نۆیەم: زوو ژن هێنان و شووکردن.**

**کۆتایی: نیشانەکانی بالغ بوون.**

---

١ زایەند (جنس) پێویستی بە پاکخوویکردن و رێك و پێك کردن هەیە نەك بنیاتنانی، چونکە بەشێوەیەکی بەهێز لە دڵ و دەرووندا هەیە، جا پێویست بوون بە پاکخوویکردن و رێك و پێك کردنی کردەیەکی پەروەردەییە، بەپێچەوانەی نامۆسڵمانان کە لە گشت قۆناغەکانی تەمەن رێگە دەدەن زایەند(جنس) بە حەرامی ئەنجام بدرێ.

## دەستپێك:

ئیسلام سووره لەسەر پێگەیاندنی مرۆڤ بەشێوەیەکی هاوسەنگی وا کە پێکهاتەکەی لەگەڵ ئەو سروشتەی کە خوای گەوره دروستی کردووه، و لەگەڵ ئەو فیترەتەی تێیدا بەدی هێناوه گونجاو بێت، بەم جۆره دەبینین کە یەکێك لە تایبەتمەندیە جیاکەرەکانی ئیسلام هاوسەنگی راگرتنە لەهەمو کاروبارێکدا بەبێ زیادەرۆیی و بەزایەدان.

پاڵنەری زایەند(جنس)یش خوای گەوره لە دەروونی مرۆڤەکاندا دروستی کردووه تا ببێتە هۆیەکی بەردەوامی هەموو بوونەوەره زیندووەکان، لەنێوانیشیاندا مرۆڤ، خوای گەورەش کاتێکی دیاریکراوی داناوه بۆ تەقینەوەی ئەم وزەیە لە مرۆڤدا تا توانای خستنەوەی نەوەی هەبێت.. یاسا و رێسای ئیسلامیش ئەو تەمەنەی بە تەمەنی ئەرکباری ناوبردووه، بەو واتایەی کاتێ منداڵ پێدەنێتە ناو ئەو تەمەنەوه دەبێتە بەرپرسیار لە کردەوەکانی، و لەسەر کاروکردەوەی لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکرێت.

تاوەکو پاڵنەری زایەندیش لە دەروونی منداڵدا بەشێوەیەکی لەسەرخۆ بڕوات و بەبێ وروژێنەری دەرەکی کە بەرو لادان لە رەفتاری پەسەند و جوانی ببات، ئیسلام چاودێری ئەو منداڵەی کردووەو چەندین فەرمان و رێگری خستۆتە ئەستۆ، ئەوەش تا پاڵنەری جنسی پاکخوو بێت، و بە هاوسەنگی و بێگەردی و دوور لە لادان بمێنێتەوه، بە خاوێنی و بەبێ پیس بوون.

باشە ئەو پایەو رێسا رێککار(ضابطة)انە چی یە کە پێغەمبەری خواﷺ تایبەتی کردووه بۆ پاکخوویکردنی منداڵ لە رووی زایەندییەوه، ئەوەش بۆ ئەوەی دایکان و باوکان هەستن بە پەیڕەوکردنی، و بەهۆیەوه منداڵەکانیان بپارێزن لە لادانی زایەندی (انحراف الجنسي) و.. فیترەت بە پاکژی و بێگەردی و داوێن پاکی بمێنێتەوەو نەفامی بە زەلکاوه چڵکاویەکەی لەکەداری نەکات؟

## بنچینەی پاکخوویکردنی یەکەم: مۆڵەت وەرگرتنی منداڵ بۆ چوونە ژوورەوە:

منداڵ بەزۆریی لەنێو ماڵدا دەژی و، بەخێرایی هەموو لایەکی ماڵ دەگەڕێت، هەر بۆیە مۆڵەت خواستن لای ئەو لەهەموو کات و ساتێکدا گران و زەحمەتە، لەبەر ئەوەیە دەبینین کە قورئانی پیرۆز شێوازی مۆڵەت خواستنی منداڵی بچووکی دیاریکردووە بە ڕەچاوکردن و ڕێنماییەوە دەیخاتە روو، ئەوەش بە شێوازێکی زۆر جوان...

جا یەکەمجار کە ئەو منداڵێکی بچووکە ئەوەی بۆ دیاری کردووە کە لە سێ کاتی ناسکدا مۆڵەت بخوازێت، ئەوانیش بەر لە نوێژی بەیانی، و نیوەڕۆیان کاتی خەوتنی نیوەڕۆ(قیلولـة)و، پاش نوێژی خەوتنان.. تێبینی ئەوە دەکەین کە ئەو کاتانە کاتی نووستنی دایك و باوکە و چوونە ژووری خەوتنە.

کاتێك تەمەنیشی نزیك بوویەوە لە کاتی باڵغ بوون پێویست کراوە لەسەری کە لەنێو ماڵداو لە هەموو کاتێکدا و هەر کاتێك بینی دەرگاکە بەروویدا داخراوەو دایك و باوکیشی لەژوورەوەن مۆڵەت بخوازێ بۆ چوونە ژوورەوە بۆ لایان.

دەبا بۆ چەند ساتێ لەگەڵ ئەم ڕێنمونیە قورئانیەدا بگوزەرێین، کە بە دووروودرێژی و روونکردنەوەو بەبێ شتی دیکە تایبەتی کردووە بەم کارەوە، ئەوەش بەهۆی ئەو بایەخ و گرنگیەی کە لە تەرازووی شەرعدا هەیەتی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لِيَسْتَـْٔذِنكُمُ ٱلَّذِينَ مَلَكَتْ أَيْمَـٰنُكُمْ وَٱلَّذِينَ لَمْ يَبْلُغُوا۟ ٱلْحُلُمَ مِنكُمْ ثَلَـٰثَ مَرَّٰتٍ ۚ مِّن قَبْلِ صَلَوٰةِ ٱلْفَجْرِ وَحِينَ تَضَعُونَ ثِيَابَكُم مِّنَ ٱلظَّهِيرَةِ وَمِنۢ بَعْدِ صَلَوٰةِ ٱلْعِشَآءِ ۚ ثَلَـٰثُ عَوْرَٰتٍ لَّكُمْ ۚ لَيْسَ عَلَيْكُمْ وَلَا عَلَيْهِمْ جُنَاحٌۢ بَعْدَهُنَّ ۚ طَوَّٰفُونَ عَلَيْكُم بَعْضُكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْـَٔايَـٰتِ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٥٨﴾ وَإِذَا بَلَغَ ٱلْأَطْفَـٰلُ مِنكُمُ ٱلْحُلُمَ فَلْيَسْتَـْٔذِنُوا۟ كَمَا ٱسْتَـْٔذَنَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَـٰتِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴾النور/٥٨-٥٩. واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، با ئەو خزمەتکار و منداڵانەتان کە نەگەیشتوونەتە تەمەنی باڵغ بوون، لەسێ کاتدا مۆڵەت بخوازن ـلەچوونە ژووری نووستنی دایك و باوك-: پێش نوێژی بەیانی، کاتی نیوەڕۆ کە لەبەر گەرما و بۆ حەوانەوە پۆشاك دادەنێن، لەدوای نوێژی خەوتنان، ئەم سێ کاتە عەورەتن بۆ ئێوە، لەدوای

ئەو سێ کاتە ئیتر تاوان لەسەر ئێوە و ئەوان نیە بگەڕێن بەسەر یەکتردا و بچن بۆلای یەکتر، ئا بەم شێوەیە خوا ئایەتەکانتان بۆ روون دەکاتەوە، خوای گەورە زانا و دانایە. هەرکاتێك منداڵەکانتان گەیشتنە تەمەنی باڵغ بوون با مۆڵەت بخوازن، هەروەکو ئەوانەی پێش خۆیان مۆڵەتیان دەخواست، بەم شێوەیە خوا ئایەتەکانی خۆیتان بۆ روون دەکاتەوە، بەراستی ئەو خوایە زاناو دانایە).

لەم سێ کاتەدا هەر دەبێت خزمەتکار و منداڵی بچووکی هۆش کراوە و ئەوانەی کە هێشتا باڵغ نەبوون، مۆڵەت بخوازن، تاوەکو چاویان بە شەرمگە(عەورەت)ی کەسەکانیان (دایك و باوکیان) نەکەوێت.

ئەمەش ئەدەبێکە کە زۆر کەس لە ژیانی نێو ماڵیاندا بێئاگان لێی و بەبێ گوێدانە شوێنەوارە دەروونی و مێشکیو خووڕەوشتیەکانی، وا گومان دەبەن کە خزمەتکار چاویان نابڕنە شەرمگەی سەرکاریان.

منداڵانی بچووکیش پێش باڵغ بوون ئەو دیمەنانە زۆر جێگای سەرنجیان نیە، لەکاتێکدا کە دەروونناسانی ئەمڕۆ (پاش پێشکەوتنی زانستە دەروونیەکان) بڕیار دەدەن هەندێك دیمەن کە منداڵان بە بچووکی چاویان پێی کەوتووە کاریگەری دەبێت لەسەر هەموو ژیانیان، وتووشی نەخۆشی دەروونی ومێشکی وەهایان دەکات کە چارەساز ودەربازبوونیان لێی گران وئەستەم بێت.[1]

جا ئایا ئەی دایکان و باوکان! دەتانەوێت منداڵەکەتان نەخۆش بکەوێت؟ چ نەخۆشیەکیش، لە نەخۆشیەکانی دەروونیو مێشکی بێت کە زۆر نارەحەتە چارەسەر بوون و دەربازبوونی منداڵ لێی.

ئەرێ دەبێت هۆی ئەوە چی بێت؟ بەراستی هۆیەکەی سستی نواندن و بەسوکدانانی دایك و باوکە لە راهێنانی منداڵەکەیان لەسەر مۆڵەت خواستن بۆ چوونە ئەو ژوورەی دایك و باوکی لێیە لەو سێ کاتەدا، کە شەرمگەی دایك و باوکی تێدا دیارە، لەبەر ئەوەیە دەبینین کە پێغەمبەری خواﷺ (انس) فێری مۆڵەت خواستن دەکات هەروەك (بخاری) لە (الادب المفرد)[2]دا گێڕاویەتیەوە.

---

١ في ظلال القرآن ١٨/١٢٣.

٢ من الحديث ٨٠٧.

لە (انس)ەوەﷺ کە وتوویەتی: خزمەتکاری پێغەمبەری خواﷺ بووم، بەبێ مۆڵەت خواستن دەچوومە ژوورەوە، رۆژێکیان هاتم، فەرمووی: ((**کما أنت یا بني، فإنه قد حدث بعد أمر (لا تدخلنّ الا بإذن)** )). واتە: (لەشوێنی خۆت بە کورم، پاش تۆ شتێك رووی داوە کە ئەوەیە (بەبێ مۆڵەت وەرگرتن مەچنە ژوورەوە).

ئا لێرەوە ئەوەش لەسەر دایك و باوك پێویست کرا کەهەموو کات و ساتێ شەرمگەیان لەبەردەم منداڵەکەیاندا داپۆشن، تاوەکو یارمەتی بدەن لە رۆشتنی غەریزە زایەندیەکەی بەشێوەیەکی سروشتی و بێخێرایی کردن لە وروژێنەرەکاندا، دەبا ئێمەش خۆمان لا بدەین و، ئاگادار بین و، وەڵامی بانگەوازەکەی خوداو پێغەمبەرەکەی بدەینەوە بۆ ئەو شتەی کە بۆی بانگمان دەکات.

## حوکمی منداڵی پێنەگەیشتوو (غیر الممیز):

منداڵی بچووك کە هێشتا جوانیو ناشیرینی ئافرەت لە یەکدی جیاناکاتەوە، و ئەو کچەی کە نیشانەکانی باڵغ بوون تێیدا دەرنەکەوتووە، حوکمی تایبەتی خۆیان هەیە، هەروەك لەم ئایەتانەی خوارەوە خراونەتە روو: ﴿وَقُل لِّلْمُؤْمِنَٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَٰرِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ۖ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ۖ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ ءَابَآئِهِنَّ أَوْ ءَابَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَآئِهِنَّ أَوْ أَبْنَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَٰنِهِنَّ أَوْ بَنِىٓ إِخْوَٰنِهِنَّ أَوْ بَنِىٓ أَخَوَٰتِهِنَّ أَوْ نِسَآئِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُنَّ أَوِ ٱلتَّٰبِعِينَ غَيْرِ أُو۟لِى ٱلْإِرْبَةِ مِنَ ٱلرِّجَالِ أَوِ ٱلطِّفْلِ ٱلَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا۟ عَلَىٰ عَوْرَٰتِ ٱلنِّسَآءِ ۖ وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ ۚ وَتُوبُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾النور/٣١. واتە: (بە ئافرەتانی ئیمانداریش بڵێ چاویان بپارێزن (لەتەماشای حەرام)، و داوێنی خۆیان بپارێزن لە گوناه، وە زینەت و جوانی خۆیان دەرنەخەن جگە لەوەی کە دیارە (وەك دەم و چاوو دەست)، وە با سەرپۆشەکانیان سینەو بەرۆکیان داپۆشێ، وە جوانی و زینەتی خۆیان دەرنەخەن بە تەواوی بۆ هاوسەرەکانیان نەبێ، یا باوکیان یا باوکی مێردەکانیان، یا کوڕی خۆیان، یا کوڕی مێردەکانیان، یا بۆ براکانی خۆیان یا برازاکانیان، یا خوشکەزاکانیان، یا ئافرەتێك کە پەیوەندیان پێکەوە هەیە، یا ئەوانەش کە

کەنیزەکن (کە لە بارودۆخی تایبەتیدا هەبوون)، و ئەو پیاوانەی کە گومانیان لێ ناکرێ لە بینینی ئافرەتاندا (لەبەر پیری، یا نەخۆشی،...هتد.) یاخود ئەو منداڵانەی کە هێشتا شارەزاییان لە ئافرەتان نیەو (ئارەزووی زایەندی(جنسي)یان بۆ دروست نەبووە)، وە نابێ ئافرەتی ئیماندار قاچیان بدەن بە زەویدا (تا دەنگی خشڵ و پاوانەکانیان بێت) و بزانرێت کە زینەتدار و خشڵدارن، کەواتە هەمووتان ئەی ئیمانداران بەرەو لای خواو بەدەستهێنانی رەزامەندی ئەو بگەڕێنەوە بەڵکو رزگار و سەرفراز بن).

ئەوەتانێ (عائشه)ل کوڕانی بچکۆلە دەهاتنە لای و جلەکانیان دەبینی، (عطاء) دەڵێ: من و(عبید کوڕی عمیر) دەچووینە خزمەت (عائشه) کە لە تەنیشتمان بوو لە قوڵایی چیای (ثبیر)، وتم: ئەو کاتە حیجابەکەی چی بوو؟ وتی: لەناو رەشماڵێکی تورکیدا بوو، پەردەیەکی لەسەر بوو لەنێوان ئێمەو ئەودا، دەڵێ: بەڵام کە منداڵ بووم بینیم کراسێکی زەردی لەبەردا بوو.[1]

## بنچینەی پاکخوویکردنی دووەم: راهێنانی منداڵ لەسەر چاو دانەواندن و پاراستنی شەرمگەی:

چاو دەلاقەی منداڵە بەسەر جیهانی دەرەوەیدا، ئەوەشی کە بەدی دەکات لە هۆش و دەروون و یادەوەریدا زۆر بەخێرایی تۆمار دەبێت، خۆ گەر راهێنرا لەسەر داخستنی چاو لە ئاست شەرمگەکانی نێو ماڵ و دەرەوە بە پشت بەستنی بە چاودێری خوای گەورە بۆی، هەروەك منداڵی چاك (عبدالله تستری) دەیکرد، کە پێش نووستنی لەدڵی خۆیدا دەیوت: (الله شاهدي.. الله ناظري.. الله معي) (خودا دەمبینێ.. خودا سەیرم دەكات.. خودا لەگەڵمدایە)، جا ئەوە شیرینی ئیمان دروست دەكات و منداڵ لە دەروونی خۆیدا بەهۆیەوە هەستی پێ دەكات و دەیدۆزێتەوە.

هەندێ جار منداڵ کەمتەرخەمی دەکات و جاری واش هەیە لە یادی دەچێت، کاتی وەهاش هەیە هەواو ئارەزووی بەسەریدا زاڵ دەبێت و بەچاوی چێژ و ئارەزووەوە سەیری کچان دەکات، لەم جۆرە کاتەدا پێغەمبەری خواﷺ چی دەکرد؟

---

١ أخرجه عبدالرزاق في مصنفه ٦٧/٥ قال حبيب الرحمن الأعظمي معلقاً: وأخرجه البخاري دون قوله (وأنا صبي)٣١١/٣.

(بخاری) و (ترمذی) و (ابوداود) لە (عبدالله کوڕی عباس)ەوەم هێناویانە کە وتوویەتی: (فضل کوڕی عباس) لە دوای پێغەمبەری خوا ﷺ وە بوو، ئافرەتێکی هۆزی (خثعم) هاتبووە خزمەتی بۆ پرسیار کردن لێی، جا (فضل) سەیری ئافرەتەکەی دەکرد و ئەویش سەرنجی ئەمی دەدا، پێغەمبەری خوا ﷺ رووی (فضل)ی بەرەو ئەولا وەرگێڕا.[1]

ئیمام (احمد)یش لە (فضل کوڕی عباس)ەوە گێڕاویەتیەوە کە وتوویەتی: لە دواوەی پێغەمبەری خواوە ﷺ بووم، لەگەڵ کۆمەڵێ خەڵکدا دەچووین بۆ (منى)، لەکاتێکدا کە ئەو دەڕۆیشت، کابرایەکی دەشتەکی کیژێکی جوانی خۆی لە پشتەوە بوو خستیە روو بۆی، و لەگەڵیدا دەڕۆیشت، دەڵێت: منیش تەماشام دەکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ سەیری کردم و رووی وەرگێڕام لێی، پاشان سەیرم کردەوە، ئەمجارەش رووی وەرگێڕام، تا سێ جار ئەوەی کرد من وازم نەدەهێنا.. هەتا لە عەقەبە بەردەکانی فڕێدا هەر (لبيك اللهم لبيك)ی دەوت.[2]

(زَنْجُوية)ش لە (ابن عباس)ەوەم گێڕاویەتیەوە کە وتوویەتی: (فضل کوڕی عباس) لە پشتی پێغەمبەرەوە ﷺ بوو، بەدەستی رووی وەرگێڕا و فەرمووی: ((**ابن أخي، إن هذا يوم من غض فيه بصره وحفظ فرجه ولسانه غُفر له**)).[3] واتە: (برازاکەم، ئەمڕۆ رۆژێکە هەر کەس تێیدا چاوی خۆی داخست و داوێن و زمانی خۆی پاراست خوای لێی خۆش دەبێت).

لە گێڕانەوەی (ابن جریر)یش لە کتێبی (تهذيب الآثار)دا هاتووە کە (عباس) بە پێغەمبەری خوای وت: تۆم بینی رووی ئامۆزاکەت وەردەگێڕا؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((**رأيت جارية حدثة وغلاما حدثاً، فخشيت أن يدخل بينهما الشيطان**)).[4] واتە: (کوڕێکی تازەپێگەیشتوو و کیژێکی تازە پێگەیشتووم بینی، و ترسام شەیتان بکەوێتە نێوانیانەوە).

(ابن عباس) م وتویەتی: (فضل کوڕی عباس) لەپشت پێغەمبەری خواوە ﷺ بوو، ئافرەتێکی هۆزی (خثعم) هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ پرسیار کردن لێی، دەڵێ: جا (فضل) سەیری ئەوی کرد و ئەویش سەرنجی ئەمی دەدا، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بەدەستی رووی (فضل)ی وەرگێڕا بۆ لایەکی کە، ئافرەتەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا! حەج فەرزی

١ الكنز ٥/١٨٨ و٢٠٤، ورواه ابن خزيمة في صحيحه ٤/٢٦١.
٢ المسند ١/٢١١.
٣ الكنز ٥/١٨٨ و٢٠٤، ورواه ابن خزيمة في صحيحه ٤/٢٦١.
٤ الكنز ٥/١٨٨ و٢٠٤، ورواه ابن خزيمة في صحيحه ٤/٢٦١.

خوایە لەسەر بەندەکانی، و کەوتۆتە سەر باوکم، کە لەبەر پیری خۆی بەسەر وڵاخەوە ناگرێ، جا ئایا لەجیاتی ئەو دەتوانم حەجی بۆ بکەم؟ فەرمووی: بەڵێ.[١]

هەر بۆیە دەبێت منداڵ رابهێنرێت لەسەر چاوداخستن لە ئاست شەرمگەکان لە هەموو جێگایەکدا، هەتا غەریزەی زایەندی خێرا و بەشێوەیەکی ریزپەڕ پێنەگات، کە دەبێتە هۆی زیان و مەترسی خۆیی و جەستەیی‌و دەروونی و کۆمەڵایەتی و رەوشتی.

مامۆستای بەڕێز (شێخ عبدالحمید کشك)یش لە یەکێك لە وتارەکانیدا وتەی یەکێك لە زانایانی ئەڵمانی باس دەکات دەربارەی چاو داخستن، کە تاکە چارەسەری زایەندی‌یەو دەڵێت: لە زانستی زایەندی و دەرمانەکانیم کۆڵیەوە، هیچ دەرمانێکم بەدی نەکرد چاکتر و سەرکەوتووتر بێت لەو فەرمایشتەی لە کتێبێکدایە کە بۆ (محمدﷺ) دابەزیوە: ﴿قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ﴾ النور/٣٠.[٢]

بەڵام داپۆشینی شەرمگە ئەوا منداڵ لەسەرەتای فەرمانی نوێژکردنەوە لەسەری رادەهێنرێت، چونکە دەبێت هەر لە منداڵیەوە پۆشاکەکەی شەرمگەکانی داپۆشێت، ئەمەش بۆ ئەوەی کە نوێژەکەی ساغ و دروست بێت، بەو شێوەیەش لەسەر داپۆشینی شەرمگە پەروەردە دەبێت، ئیدی منداڵەکە کوڕ بێت یا کیژ.. منداڵی کوڕ کاڵایەك دەپۆشێت کە شەرمگەی داپۆشێت و کچیش بەهەمان شێوە، و ئەوەشی لەسەر زیاد دەبێت کە لەسەر پۆشینی باڵاپۆش (حجاب) رابێت، و لە باڵاپۆشی نوێژەوە دەست پێدەکات، و بەوجۆرە منداڵ بەشێوەیەکی راست و دروستی چاك و دەروونی پاکخوو، و خووڕەوشتی بەرز و باوەڕ بەتین گەورە دەبێت.

١ رواه ابن خزيمة في صحيحه ٣٤٣/٤ ورواه البخاري ومسلم.

٢ تۆ بە بڕواداران بڵێ: چاو داخەن و شورەیی خۆ بپارێزن، ئەمە بۆ ئەوان باشترەو خوداش ئاگاری لەهەموو ئاکاریان هەیە.

## بنچینەی پاککخوویکردنی سێیەم: جیاکردنەوەی منداڵان لە نوێنی نوستندا:

ئەمەش پاپەیەکی بنەڕەتیە لە پاکخوویکردنی زایەندی منداڵدا، و نەوروژاندنی غەریزەکەی بەشێوەیەکی خراپ، ئەمەش لە هەموو جیهاندا هیچ یاسایەك هاوشان و وێنەی نیە کە ئەوەش تێڕوانینی پێغەمبەریی و وردی ئەو زاتەیە لە پاکخوویکردنی منداڵان و گرنگیدانی پێیان.

(ابو داود) بە سەنەدێکی (صحیح) لە پێغەمبەری خواﷺوە گێڕاویەتیەوە: ((مروا أولادكم بالصلاة وهم أبناء سبع سنين وأضربوهم عليها وهم أبناء عشر سنين، وفرّقوا بينهم في المضاجع)). واتە: (منداڵەکانتان لە تەمەنی حەوت ساڵی فێری نوێژ بکەن، و لە تەمەنی دەساڵی لەسەر نوێژنەکردن لێیان بدەن، و جێگای خەوتنیان لێك جیا بکەنەوە (لەژێر یەك پێخەفدا پێکەوە نەخەون).

لە گێڕانەوەی (حاکم)یشدا وا هاتووە: ((إذا بلغ أولادكم سبع سنين ففرقوا بين فرشهم، وإذا بلغوا عشر سنين فأضربوهم على الصلاة)).[1] واتە: (اتێ منداڵەکانتان گەیشتنە تەمەنی حەوت ساڵی نوێنی خەوتنیان جیا بکەنەوە، و کە گەیشتنە دەساڵی لەسەر نوێژ لێیان بدەن).

ئەم جیاکردنەوەیە لە تەمەنی دەساڵیەوە دەست پێ دەکات، کە تێیدا غەریزە لە گەشەکردندایە، بەڵام ئەو جیاکردنەوەیەی شوێنی خەوتن چۆن دەبێت؟ ئەوەش بە نەخەوتنی دوو منداڵ لەژێر یەك پێخەفدا، بەڵام لەسەر یەك جێگا یان لەسەر یەك دۆشەك و بە دوو لێفە یا بەتانی جیا بنوون هیچی تێدا نیە و، هەرچەند لەیەك دوور بن چاکترە.

زانای فرەزان (شێخ ولی الله دهلوی) وتوویەتی: فەرمان کراوە بە جیاکردنەوەی شوێنی نوستن، چونکە ئەو تەمەنە تەمەنی هەرزەکارییە، هیچ دوور نیە کە پێکەوە نوستن لەژێر پێخەفدا ببێتە هۆی ئارەزووی پێکەوە جووت بوون، بۆیە دەبێت بەربەستی ڕێگای خراپ بوون بکرێت بەر لە ڕوودانی.[2]

١ رواه الحاكم في مستدركه ٢٠١/١ وقال صحيح على شرط مسلم وأقره الذهبي، ورواه الدارقطني ٢٣٠/١.

٢ حجة الله البالغة ١٨٦/١.

لەبەر ئەوە نوستن لەسەر یەك پێخەف و لەژێر یەك لێفەدا وا دەكات لە منداڵان كە غەریزەی جنسیان بەخێراییەكی زۆر گەشە بكات و بەتینتر بێت، و هیچ رێگەیەك نەدۆزێتەوە بۆ خاڵی كردنەوەی بە چەند دیاردەیەكی لادان و ریزپەڕی زایەندی (شذوذ الجنسي) نەبێت، چەند لەو كارەخراپانە لەژێر لێفەدا روویداوەو دایكان و باوكان هەستیان پێنەكردووەو بووەتە هۆكاری تیاچوونی ئەو منداڵە بێتاوانە، كە دایك و باوكیان كەمتەرخەمیان لەبارەیانەوە نواندووەو خستونیانەتە نێو سەرپێچی كردنی فەرمانەكانی پێغەمبەری خواﷺ.

پێغەمبەری خواﷺ ش ﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ ۝٣ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ ۝٤ ﴾النجم/٣-٤.[١] فەرمانێكی روون و ئاشكرامان پێدەكات : ((فرقوا)) جیایان بكەنەوە، بڕواداریش ئەو كەسەیە كە ئەو فەرمانە ئەنجام بدات و جیایان بكاتەوە، بەڵام جیاكردنەوە لە كوێدا؟ جیاكردنەوەیان لە نوێنگەدا.

جا پەروەردەی رۆژئاوایی و رۆژهەڵاتی لە كوێ و ئەم رێنمونیە جوانەی پێغەمبەریش لەكوێ؟

## بنچینەی پاكخوویكردنی چوارەم: نوستنی منداڵ لەسەر لای راستی و دوورخستنەوەی لە نوستن لەسەر سكی:

پەیڕەوكردنی سوننەتی پێغەمبەری خواﷺ بە نوستن لەسەر لای راست، منداڵ لەكاتی خەوتن دوور دەخاتەوە لە زۆر وروژێنەری زایەندی، و پێغەمبەری خواﷺ خەوتنی لەسەر دەم بە نووستنی شەیتان ناوزەد كردووە، خۆ گەر منداڵ لەسەر سكی نوست ئەوە دەبێتە هۆی زۆر خورانی ئەندامی زاوزێی كە لەو حاڵەتەدا دەبێتە هۆی وروژانی ئارەزوو(شهوة)ەكەی، كاتێ كە دایك و باوك منداڵەكەیان بینی وا خەوتبوو، ئەوا لەو حاڵەتەوە دەیگۆڕن و نووستنیان لەسەر لای راست لا خۆشەویست دەكەن، و دووركەوتنەوە لە نوستن لەسەر سینگیان لا خۆشەویست دەكەن، وێڕای ئەوەی كە نوستن بەدەمدا (لەسەر سك) زۆر نەخۆشی جەستەیی لێ دەكەوێتەوە و هەموو پزیشكانیش بەبێ جیاوازی ئەو ئامۆژگارییەیان هەیە كە دوور بكەونەوە لە نوستن لە سەر سك.

---

١ واتە: قسەو گوفتاری لە ئارەزووبازیو هەواو هەوەسەوە نیە، ئەمەی كە رای دەگەیەنێ بەدەر نیە لە نیگا و وەحی خوایی.

## بنچینەی پاکخوویکردنی پێنجەم: دوورکەوتنەوەی منداڵ لە تێکەڵاوی و وروژێنەرە زایەندیەکان:

لەژێر رۆشنایی ئەو رێسایەی کە دەڵێت (بەهۆی دژەکانیەوە شتەکان جیا دەکرێتەوە)، ئەزموونی ئەوروپا لە تێکەڵاوی کردن و ئەوەی لێی کەوتۆتەوە لە نێوان ئەو منداڵانە بە کوڕ و کچەوە دەخەینە بەر دەستت. ئەو کارەی کە لە ئاستیدا دەروونە بێگەردە داوێن پاکەکان هەست بە شەرمەزاری دەکەن، (شێخ وهبی سلیمان غاوجی) لەبارەی ئەزموونی ئەوروپاوە هێناویەتی، ئێمەش لەکاتێکدا کە ئەو ئەزموونە بێئاکامە بۆ باوکان و دایکان و پەروەردەکاران دەخەینە روو، دەزانین کە دەروونی موسڵمانی لاواز راهاتووە لەسەر ئەوەی کە ئەزموونی ئەوروپی جێگەی رێز و پێرازیبوونی بێت و وەریگرێت.. و گوێیەکانی قورس بکات لە ئاست ئامۆژگاری مامۆستا وتاربێژ و ئامۆژگاریکارەکانی نێو مزگەوت کە بە وتارەکانیان بەئاگای دەهێننەوە لە پەتای تێکەڵاوی، ئەمەش کۆمەڵێك لەو رووداوانەیە بۆت دەخەینە روو: لەمەشدا یادخستنەوە هەیە بۆ کەسێ کە گوێ هەڵدەخات و ئاگادارە:

جا وتی: مامۆستای پایەبەرز (احمد مظهر العظمة) بۆی باس کردم، لەکاتێکدا ئەو چەند ساڵێ بەر لە ئێستا بە گەشتێکی زانستی رۆشت بۆ بەلجیکا و لە قوتابخانەیەکی سەرەتایی ئەوێدا -لەکاتێکدا گەشتی دەکرد بەسەر قوتابخانەکانی ئەوێدا- تێبینی ئەوەی کرد کە هەموو قوتابیەکانی ئەو قوتابخانەیە کچن، بۆیە لە بەڕێوەبەرەکەی پرسی (کە ئافرەت بوو): بۆچی کوڕان و کچان لەم قۆناغەدا تێکەڵاو ناکەن؟ وتی: زۆر زیانی تێکەڵاویمان هەست پێکرد تەنانەت لە قۆناغی سەرەتاییشدا.

خۆ گەر بڕواش بەو قسەیە ناکەیت فەرموو با ژمارەکان لەگەڵتا بدوێن:

قازی (لندسی) لە کتێبەکەیدا کە بەناوی (یاخی بوونی نەوەی نوێ)یە وتوویەتی: کچانی منداڵ لە ئەمریکا وایان لێهاتووە بەر لەکاتی ئاسایی خۆیی هەرزەکار دەبن و، لە تەمەنی زۆر زووەوە هەستی زایەندی تیایاندا بەتین دەبێت.

وە ئەم قازیە دەربارەی بارودۆخی (٣١٢) منداڵی کچ وەك نمونە باس دەکات کە (٢٥٥) کچیان لەنێوان تەمەنی یازدە تا سیازدە ساڵی تەمەنیاندا گەیشتوونەتە بالغ بوون، کە دەرکەوتنی ئارەزووی زایەندی و داخوازی زایەندییان تێدایە کە بەشێوەیەکی سروشتی ئەو دەرکەوتانە لە کچانی تەمەن هەژدەساڵ بەرەو سەرتردا هەیە.

دکتۆر (ادیت هوکر) لە کتێبەکەی (یاسا زایەندییەکان) دەڵێت:

شتێکی نامۆی ناوازە(شاذ) نیە، هەتا لەنێو چینە رۆشنبیرەکانیشدا، کە کچی تەمەن حەوت ساڵی یان هەشت ساڵی چێژیان لەگەڵ کچاندا وەردەگرن و لەوانەشە تووشی داوێن پیسیش بن لە گەڵیاندا.

کچێکی تەمەن حەوت ساڵانی ماڵێکی شەرف مەند و سەروەری دێرین داوێن پیسی لەگەڵ براکەی و هەندێ لە هاورێکانیدا ئەنجام دابوو، هەندێکی دیکەش کە لە پێنج منداڵ، کە دوو کچ و سێ کوڕ پێکهاتبوو کە دراوسێ بوون و ماڵیان لەیەکەوە نزیك بوو دۆزرانەوە کە بە پەیوەندی زایەندی پێکەوە پەیوەست بووبوون و، منداڵانی دیکەشیان پاش خۆیان بۆ ئەوە هانداوە، کە بەتەمەنترینیان تەمەنی دەساڵان بوو، کچێکی دیکەشیان کە تەمەنی نۆ ساڵان بوو، لە رووکەشدا لەژێر چاودێرییەکی توندابوو، بینرا کە زۆر بەختەوەرە لەبەر ئەوەی خۆشەویستی چەند عاشقێکە!!

لە راپۆرتی پزیشکیشدا لە شاری (تیمور)دا هاتووە: لەماوەی یەك ساڵدا زیاد لە هەزار داواکاری بەرز کراوەتەوە بۆ دادگاکانی ئەو شارە کە هەمووی لە بارەی داوێنپیسی لەگەڵ کچانی خوار تەمەنی دوازدە ساڵەوەیە.

قازی (لندسی) ئەمریکی وای دەخەملێنێ کە ٤٥٪ی کچانی قوتابخانەکان بەر لە دەرچوونیان داوێنپیسی ئەنجام دەدەن، ئەو رێژەیە زیاتر دەبێت لە قۆناغەکانی خوێندنی باڵادا، دەنووسێت کە قوتابی کوڕ لە قوتابخانەی دواناوەندیدا سۆزی وەك سۆزی قوتابیانی کچ توند و بەهێز نیە، کچانن کە هەمیشە بەرەو پێش دەچن و، فەرمان دەردەکەن و کوڕیش ئەوەی لەسەرە کە شوێنی بکەوێت و فەرمانی بەسەردا بکرێت و جێبەجێی بکات.[١]

ئەوەی جێی پەژارەو خەم و داخە ئەوەیە، کە زۆرێك لە وڵاتە ئیسلامیەکان دەستیان کردووە بە پەیڕەوکردن و رۆیشتن لەسەر ئەو بەرنامەیە لە تێکەڵاوکردنی کوڕان لەگەڵ کچاندا، ئەمەش پیلانێکە بۆ خراپکردنی کۆمەڵگا و، بێهێزکردنی بنیاتنانی نەوەکان.

---

١ المرأة المسلمة ص٢٤٣.

## بنـچینەی پـاکخوویکردنی شەشـەم: فێرکردنـی فـەرزەکانی خۆشتن (غوسڵ)و سوننەتەکانی بە منداڵی پێگەیشتوو (ممیز):

کاتێ کە دایك و باوك پێشبینی ئەوە دەکەن کە کوڕەکەیان یا کـچەکەیان لـە بـاڵغ بـوون نزیك بۆتەوە، ئا لەو کاتەدا لەسەریان پێویستە، کە منداڵەکـەیان فێـری فـەرزەکانی لابردنـی لەش پیسی (جەنابەت =لەشگرانی) و سوننەتەکانی بکەن.

هەروەها دەربارەی هۆکارەکانی و، سروشتی ئەو ماددەیەی کـە دێتـە دەرەوەو رەنگـەکانی بۆی بدوێن، بە واتایەکی دی وانەیـەکیان لـە بـارەی فیقهـی غوسـڵ لـە کتێبـەکانی فیقهـی پێشکەش بکەن، خۆ گەر باوکان بەشێوەیەکی هێمن دەربارەی ئەو کارە بۆیـان بـدوێن چـاکترە لەوەی دەستی خراپیان پێ بگات، کە بە خێرایی بیانڕفێنێ و، ژەهری خێراکوژیان پێبدەن.

(عمر کوڕی خطـاب)یشﷺ دەڵێت: ئەڵقەکانی ئیسلام یەك لـەدوای یـەك دەپـسێت، ئـەو کەسەی لە ئیسلامدا گەورەبێت و نەفامی نەناسیبێت.

بۆیە دەبێت باوك بۆ کوڕەکەی و دایك بۆ کچەکەی باسی فەرموودەی پێغەمبەری خـواﷺ، دەربارەی فیقهی ئیسلامی بکات لەمەڕ ئەو ماددەیەی کە لـە لاشـەی مـرۆڤ دێتـە دەرەوە، و مرۆڤ چی بکات لە بەرامبەریدا، و دەرچوونی ئەو ماددەیە لە شەرعدا چی دەگەیەنێت؟

ئەوە واتای چوونە نێو تەمەنی ئەرکباری لەژیاندا دەدات، سەرەتای فـەرز و قەدەغـەکانی خوای گەورەیە لەسەر مرۆڤ، و بەم جۆرەش مرۆڤ لێپرسینەوەی لەسەر گەورەو بچووکی کـردارو گوفتارەکانی لەگەڵ دەکرێت، و هەردوو فریـشتەی (رقیـب) و (عتیـد) کـاری خۆیـان دەسـت پێکردووە لە تۆمارکردنی چاکەو خراپەکانیدا.. لەگەڵ ئامۆژگاری هێمنی دیکەدا کە منداڵ بە ئاگا بێنێتەوەو بەرەو کاری چاکە و رق لێبوونی کاری خراپ ئاڕاستەی بکات.

## بنچینەی پاكخوویكردنی حەوتەم: راڤەكردنی سەرەتای سورەتی (النور)و لەبەركردنی بۆ منداڵی پێگەیشتوو:

پاش ئەوەی منداڵ گەیشتە تەمەنی دەساڵی، شوێنی نوستنی جیا دەكرێتەوە لە خوشك و براكانی، ئەمەش واتای ئەوە دەگەیەنێ كە هەندێك لە نیشانە زایەندییەكان وردە وردە دەستی بە دەركەوتن كردووە.

لەم تەمەندا دەست دەكەین بە دانانی پاراستنی دەروونی و رێگرە ئیمانیەكان لە دەروونی منداڵدا تا بەهۆیەوە بتوانێت باڵادەست بێت بەسەر غەریزەكەی و بەند و بەست كردنی دەروونی، و پاراستنی لە ئەنجام دانی داوێن پیسی -پەنا بەخوای گەورە-.

پێشینانﷺ سورەتی (النور)یان وەك بەرگرییەك پێشكەش بە منداڵەكانیان دەكرد لەگەڵ راڤەو روونكردنەوەیدا، و گرنگییان دەدا بە لەبەركردنی لە تەمەنی هەرزەكاریدا، پێش باڵغ بوون، بەتایبەتی بە كچان.

(مجاهد) لە پێغەمبەری خواﷺوە گێڕاویەتیەوە كە فەرموویەتی: ((**علّموا رجالكم سورة المائدة، وعلّموا نساءكم سورة النور**)).[1] واتە: (پیاوەكانتان فێری سورەتی (مائدە) بكەن و ئافرەتەكانتان فێری سورەتی (النور) بكەن).

(جاحظ) روونی كردۆتەوە كە (مامۆستایان بایەخێكی تایبەتیان دەدا بە لەبەركردنی سورەتی (النور) بە كچان.[2]

ئەمیری باوەڕداران (عمر كوڕی خطاب)ﷺ لەسەر پێستە دەینووسی: هیچ ئافرەتێكی موسڵمان نەچێتە گەرماو(حمام) لەبەر نەخۆشی نەبێت، و ئافرەتانتان فێری سورەتی (النور) بكەن.[3]

---

١ رواه سعيد بن منصور في سننه والبيهقي في شعب الإيمان ورمز السيوطي لضعفه: أنظر الجامع الصغير ٣٢٨/٤.

٢ البيان والتبيين ٩٢/٢.

٣ رواه عبدالرزاق في مصنفه ٢٩٥/١.

## بنچینەی پاکخوویکردنی هەشتەم: باسکردنی زایەند (جنس) بە ئاشکرا بۆ منداڵی پێگەیشتوو، ئاگادارکردنەوەی لە داوێن پیسی:

وتمان منداڵ فێری سورەتی (النور) دەکرێت و پێی لەبەر دەکرێت کە بنیاتنانی خوورەوشت و پاکخوویکردنی زایەندی منداڵی لەخۆی گرتووە، و ئاگاداری دەکاتەوە لە کەوتنە نێو داوێن پیسی.

پاش ئەوەی کە فێری فەرزەکانی غوسڵ و لابردنی لەشگرانی دەبن، زۆر بەتوندی ئاگادار دەکرێتەوە لە روودانی داوێن پیسی و بۆی باس دەکرێت کە ئەوە چۆن روو دەدات.

بەپێی ئەو وڵات و شارەی کە منداڵەکە تێیدا دەژی، ئایا لە وڵاتێکی وەك رۆژئاوا ئەمریکایە کە ئەم کارەی تێدا حەڵاڵ کراوە؟ یان لە وڵاتێکی ئیسلامی پارێزکارە لەم کارە؟ وە بەپێی ئەو خێزانەی کە ئەو منداڵەی تێدا پێگەیشتووە، ئایا ئەو خێزانە ئیسلامیە یان رێگەپێدەری ئەم کارەیە، جا ئیباحیەت و رێگەدانی ئەم کارە لە هەرشوێنێك بێت پێویستە منداڵی موسڵمانی بالغ راڤەی ئەوەی بۆ بکرێ کە زینا چییە، تا لێی دوورکەوێتەوەو، لەبەر ئەوەش نەبادا بکەوێتە داوی زیناوە" پاشان دەڵێ: من نازانم زینا چۆنەو حوکمەکەی چیە؟ ئینجا ئەم فەرموودەیەی بۆ باس دەکرێت:

ئیمام (احمد) و (طبرانی) لە (ابوامامە)ەوە گێڕاویانەتەوە[١] کە لاوێکی قورەیشی هاتە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ مۆڵەتم بدە زینا بکەم، ئەو خەڵکەی لەوێ ئامادە بوون نارەزاییان دەربڕی و سەرزەنشتیان کرد و وتیان: مەه.. مەه..

پێغەمبەری خواﷺ فەرموی: نزیك بەوە، گەنجەکە نزیك بووەوە لێی.

فەرمووی: حەز دەکەیت زینا لەگەڵ دایکت بکرێت؟ وتی: نابەخوا، خوا بمکات بە فیدات.

فەرمووی: خەڵکیش بۆ دایکیان حەز ناکەن، ئەمجا فەرمووی: حەزدەکەیت زینا لەگەڵ کچەکەتدا بکرێت؟

وتی: نا بەخوا، خوا بمکات بە فیدات.

---

١ اسناده صحيح. أنظر سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم ٣٧٠.

فەرمووی: خەڵکیش بۆ کچەکانیان حەز ناکەن. ئەمجا فەرمووی: حەز دەکەیت زینا لەگەڵ خوشکەکەتدا بکرێت؟

وتی: نا بەخوا، خوا بمکات بە فیدات.

فەرمووی: خەڵکیش بۆ خوشکیان حەز ناکەن. فەرمووی: حەز دەکەیت، کە زینا لەگەڵ پورت(خوشکی باوکت)دا بکرێت؟ وتی: نا بەخوا، خوا بمکات بە فیدات.

فەرمووی: خەڵکیش بۆ پور(خوشکی باوك)یان حەز ناکەن. فەرمووی: حەز دەکەیت، کە زینا لەگەڵ پورت(خوشکی دایکت)دا بکرێت؟ وتی: نا بەخوا، خوا بمکات بە فیدات.

فەرمووی: خەڵکیش بۆ پور(خوشکی دایك)یان حەز ناکەن.

دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ دەستی خستە سەر سینگی و فەرمووی: **((اللهم أغفر ذنبه، وطهر قلبه، وحصِّن فرجه))**. واتە: (خوایە لەگوناهی خۆش ببە، دڵی پاك کەرەوە، داوێنی بپارێزە).

دەڵێت: پاش ئەوە گەنجەکە ئاوڕی بۆ هیچ شتێك نەدەدایەوە.

هەروەها ئاشنای سزای زینا و بەجێهێنانی سنووری شەرعی بکرێت:

لە هەردوو (صحیح)ەکەدا گێڕاویانەتەوە لە (ابوهریرە) و (زید کوڕی خالد الجهنی)یەوە دەربارەی ئەو دوو دەشتەکیەی کە هاتنە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ وتیان: یەکێکیان وتی: ئەم کوڕەی من کرێکار بوو لەلای ئەم پیاوە، زینای لەگەڵ ژنەکەیدا کردووە، منیش فیدیەی سەد مەڕ و کچێکی بچووکم داوە پێی، بەڵام پرسیارم لە شارەزایانی زانست کرد پێیان وتم کە کوڕەکەم لێدانی سەد دار و ساڵێك لەشار وەدەرنانی لەسەرە، و ژنەکەی ئەم پیاوەش دەبێت بەردباران بکرێت.

پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: **((والذي نفسي بيده، لأقضين بينكما بكتاب الله تعالى: الوليدة والغنم ردٌّ عليك، وعلى ابنك مئة جلدة وتغريب عام، واغْدُ يا أنيس –لرجلٍ من أسلم– الى إمرأة هذا الرجل فإن أعترفت فارجمها))**. واتە: (بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، بەپێی کتێبی خوای گەورە داوەریتان دەکەم: کچە بچووکەکەو مەڕەکان دەگەڕێندرێتەوە بۆت، کوڕەکەشت سەد دار لێدان و ساڵێك لەشار وەدەرنانی لەسەرە، ئەی (انیس) (کابرایەك بوو لە هۆزی اسلم) بەیانی بچۆ بۆ لای ئەو ئافرەتە، ئەگەر دانی پێدا نا ئەوا بەردبارانی بکە).

## بنچینەی پاکخوویکردنی نۆیەم: زوو ژن هێنان و شووکردن:

لەم سەردەمەی ئێستاماندا هەرچەند دەربارەی خراپەکانی زوو ژنهێنان و شووکردن بوترێت، ئەوا چاکەکانی زوو ژنهێنان و شووکردن زۆر لەو زیاترە، بەتایبەت گەر دابینکردنی ژیانی ماددی لەگەڵدا بێت، ئیدی لەلایەن دایك و باوکەوە بێت یاخود لە کاروکاسبی کردنی کوڕە تازە پێگەیشتووەکەوە بێت. هەموو نەخۆشیە دەروونی و کۆمەڵایەتیەکانی ئەو خەڵکە، و کارەساتەکانی تاوانکردن دەرئەنجامی دواخستنی هاوسەرگرتنە، زۆر لەسەر ئەم کارە ناڕۆین و موناقەشەی ناکەین، هێندەمان بەسە کە لە ژیانی پێشنی چاك ئەم نمونانە بخەینە روو کە ئیمامی فەرمووده گێڕەوە (عبدالرزاق) کە لە ساڵی ٢١١کۆچی وەفاتی کردووە، لە (مصنف)ەکەیدا لە دەروازەی (نکاح الصغيرين) بەرگی شەشەم لاپەڕە (١٦٢)دا باسی کردووە:

١- لە (عروە)وە گوتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ (عائشە)ی مارەکرد تەمەنی شەش ساڵان بوو، و لە نۆ ساڵانیدا گوێزایەوە، و شتە یارییەکانی لەگەڵ خۆی هێنابوو، و کاتێك وەفاتی کرد تەمەنی هەژدە ساڵان بوو.[1]

٢- لە (ابوجعفر)ەوە کە وتویەتی: (عمر)ﷺ داوای کچەکەی (علی)ﷺ کرد، ئەویش وتی: هێشتا منداڵە، بە (عمر)یان وت: مەبەستی لەوە نەدانی بووە، دەڵێت: قسەی لەگەڵدا کرد، (علی) وتی: دەینێرم بۆ لات، گەر پێی رازی بوویت ئەوا ژنی تۆیە، دەڵێت: ناردی بۆ لای، دەڵێت: (عمر) رۆیشت تەماشای قاچی کچەکەی کرد، کچەکە وتی: لەسەرخۆ، گەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە ئەمیری باوەڕدارانی دەمدا لە ملت.

عمر دەربارەی هێنانی کچەکەی (علی) کە بچووك بووە پاساوو هۆی ئەوە بووە کە وتویەتی:

لە (عکرمە)ەوە دەگێڕنەوە کە وتویەتی: (عمر کوڕی خطاب) کە (ام کلثوم)ی کچی (علی کوڕی ابوطالب)ی هێنا، لەو کاتەدا هێشتا کچێك بوو یاری لەگەڵ کچاندا دەکرد، هات بۆ لای هاوەڵەکانی و داوای فەڕ و بەرەکەتیان بۆ کرد، وتی: لەبەر چالاکی خۆم نەم هێناوە، بەڵام لە پێغەمبەری خواﷺم بیستووە کە دەیفەرموو: ((**إن كل سبب ونسب منقطع يوم القيامة، إلاّ بسببي ونسبي**)).[2] واتە: (هەموو پەیوەندیو دۆستایەتیو رەچەڵەکێك لە رۆژی قیامەتدا دەپچڕێت، تەنها پەیوەندی و دۆستایەتی من و رەچەڵەکی من نەبێت).

---

١ قال المحقق حبيب الرحمن الأعظمي: وأخرجه مسلم وفيه (لعبتها) ورواه ابوداود في النكاح.

٢ صحيح. أنظر صحيح الجامع ٤٥٢٧ وقال: رواه الطبراني والحاكم والبيهقي عن عمر والطبراني في الكبير عن ابن عباس وعن المسور.

منیش حەزم کرد کە پەیوەندی خرمایەتیو دۆستایەتی و رەچەڵەکێك لە نێوان من و پێغەمبەری خوادا ﷺ هەبێت.

٣- لە (حسن) و (زهری) و (قتادە)وە گێڕاویانەتەوە کە وتویانە: گەر باوکان منداڵەکانیان بەمنداڵی مارەبڕی، ئەوە مارەبڕینەکەیان دروستە. (عبدالرزاق)یش وتویەتی: ئێمەش وەری دەگرین(واتە کاری پێدەکرێت.).

٤- لە (ابوطاوس)وە کە لەباوکیەوە گێڕاویەتیەوە کە وتویەتی: گەر منداڵی بچووك (کوڕ یان کچ) باوکیان مارەیان بکەن، ئەوا کە گەورە بوون بە ئارەزووی خۆیانە جیابوونەوە یان پێکەوەبوون هەڵبژێرن.

٥- لە (زهری)وە گێڕاویانەتەوە کە (عروە کوڕی زبیر) کچێکی بچووکی (مصعب)ی بۆ کوڕێکی بچووکی خۆی مارەکرد.

٦- لە (هشام کوڕی عروە)وە کە وتویەتی: باوکم ژنی بۆ کوڕێکی بچووکی خۆی مارەکرد کە ئەم تەمەنی پێنج ساڵان بوو، ئەویش شەش ساڵان،[1] جا کوڕەکە مرد و میراتەکەی نزیکەی چوار هەزار دینار بوو.

## پرسیارێکی فیقهی: تەمەنی ژنهێنان و شووکردنی منداڵی بچووك چەندە؟

(مالك) و (شافعی) و (ابوحنیفە) وتویانە: کاتی ئەوە (تەمەنی ژن هێنان و شووکردن) ئەو وەختەیە کە توانای جووتبوونی هەبێت، ئەمەش دەگۆڕێت بەپێی جیاوازییان، و بە تەمەنێك بەند و بەست ناکرێت، هەر ئەمەش راست و دروستە، لە فەرموودەکەی (عائشە)شدا دیاریکردن و رێگریکردن نیە لەوە کە بەر لەنۆ ساڵی لەتەمەنی تواناییدا بووە و مۆڵەتدانیشی تێدا نیە بۆ کەسێ توانای بۆ دروست نەبووەو گەیشتۆتە نۆ ساڵی.[2]

## کۆتایی: نیشانەکانی باڵغبوون:

منداڵ کاتێك دەچێتە تەمەنی باڵغبوون و ئەرکباریەوە کە دوو نیشانەی هەیە، کە ئەوانیش ئیحتلام بوون یاخود دەرهاتنی مووی بەرە کە لەخوار ناوکەوەیە.

**١- ئیحتلام بوون:** لە دەقی ئایەتدا هاتووە ﴿وَإِذَا بَلَغَ ٱلْأَطْفَـٰلُ مِنكُمُ ٱلْحُلُمَ فَلْيَسْتَـْٔذِنُوا۟

---

١ لێکۆڵەر(حبيب الرحمن الأعظمي) دەڵێت: لەوانەیە راست وا بێت: (باوکم کچەکەی دابەشوو کە تەمەنی پێنج ساڵان بوو، کوڕەکەش شەش ساڵان بوو).

٢ أنظر بذل المجهود في حل ابىداود ١٥٤/١٠ طبع دار الكتب العلمية-بيروت.

﴿كَمَا ٱسْتَـْٔذَنَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾: النور/٥٩. واتـه: (هـەرکاتێك منداڵـەکانتان گەیـشتنە تەمەنی باڵغ بوون با مۆڵەت بخوازن، هەروەکو ئەوانەی پێش خۆیان مۆڵەتیان دەخواست).

(ابوداود)یش لە (علی)ەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە وتوویەتی: لە پێغەمبەری خوا ﷺ وە لەبەرم کردووە: ((لا يتم بعد الأحتلام، ولا صمات يوم الى الليل)) واتە: (لەدوای باڵغبوون هەتیوی نامێنێت، و قسەنەکردن و بێدەنگی شەو و رۆژێك نیە (واتە نابێ ئەوە بکرێ کـە نـەریتێکی نەفامی بوو دەکرا).

## ٢- دەرکەوتنی مووی بەر:

لە (عطیـة)ەوە کە وتویەتی: رۆژی (قریظـة) هێنراینـە بـەردەم پێغەمبـەری خـوا ﷺ هـەر کەسێك مووی بەری هاتبوو کوشتیان، ئەوەش کە مووی نەهاتبوو وازی لێ دەهێنرا، منـیش لەو کەسانەبوو کە موم نەهاتبوو، جا وازیان لێ هێنام.[١]

لە شێوە وتنێکی دیکەدا: هەرکەسێك گەورەو پێگەیشتوو بوو یـان مـووی بـەری هـاتبوو کوژرا، ئەوەش کە مووی نەهاتبایە وازی لێ دەهێنرا.[٢]

لە (سمرە کوڕی جندب)ەوە گێڕاویانەتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویـەتی: ((أقتلـوا شيوخ المشركين، وأستحيوا شرخهم)) واتە: (بەتەمەنەکانی بێباوەڕان بکوژن و ئەو کوڕانەی موویان لێ نەڕواوە وازیان لێ بهێنن).

(شرخ) واتە: ئەو منداڵانەی کە مووی بەریان لێ نەڕواوە.

٣- ((الصبي اذا بلغ خمس عشرة أقيمت عليه الحـدود)) واتـە: (منـداڵ کـە گەیـشتە تەمەنی پازدەساڵی سنوورەکان(حدود)ی خوای لەسەر جێبەجێ دەکرێت).[٣]

---

١ رواه الخمسة وصححه الترمذي.

٢ رواه احمد والنسائي ورواه الحاكم في مستدركه ٤/٣٩٠ بلفظ: (منداڵ بووم کاتێك (سعد کوڕی معاذ) فەرمانی دا کە (بني قريظة) شەڕکەرەکانیان بکوژرێت و ماڵەکانیان داگیر بکرێت و گومانیان لە من هەبوو، بەڵام زانیان کە مووی بەرم لێنەڕواوە، ئەوەتا ئێستا لەناوتانا دەژیم.)

٣ رواه البيهقي في الخلافيات عن أنس.

# کۆتایی یەکەم

## باوکان: ئەمە وتاری پێغەمبەرەﷺ بۆ ئێوە

کۆمەڵی دایکان و باوکان، ئەمە وتاری پێغەمبەرەﷺ کە ئاراستەی ئێوە کراوە، سوپاسگوزاری بۆ خوا و بە پشتیوانی خوا توانرا لە چل فەرموودەدا کۆبکرێنەوە" تا بکرێنە بەرنامەو چاکسازی، کە پوختەی ئەو ئەرکانەی دایك و باوکە، کە پێغەمبەری خواﷺ تایبەتی کردووە پێیان.

ئەمەش بەڵگەی سووربوونی پێغەمبەری خوایەﷺ وبەڵگەی بایەخ دانیەتی بە سازدانی دایك و باوك بە ئامادەکردن و پێکهێنان تا ببن بە چاکترین چرا بۆ منداڵەکانیان، هەروەها چارەسازی دایکان و باوکان بەباشی دەکات تا بۆ پێشەوە بڕۆن بەرەو لوتکەی بەرزی پەروەردەیی، و عەقڵیەتێکی پەروەردەیی مەردانە، و دەروونێکی پەروەردەیی هاوسەنگ، تا بە رۆڵی خۆی هەستێت بەشێوەیەکی گونجاو و رێك لەگەڵ قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەرﷺو ژیانی پێشینانی چاك.

## چل فەرموودە بۆ باوکان

| | | |
|---|---|---|
| ١ | روى النسائي من طريق جعفر بن سليمان عن ثابت أن النبيﷺ كان يزور الأنصار فيسلّم على صبيانهم ويمسح على رؤوسهم ويدعو لهم. | (ثابت) دەڵێ: پێغەمبەری خواﷺ سەردانی ئەنصارییەکانی دەکرد و سەلامی لە منداڵەکانیان دەکرد و دەستی بەسەریاندا دەهێنا و دوعا و نزای باشی بۆ دەکردن. |
| ٢ | روى الطبراني عن حفصة ﷺ أن النبيﷺ قال: ((لا يدع أحدكم طلب الولد فإن الرجل إذا مات وليس له ولد إنقطع اسمه)). | واتە: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: هیچ کەس لەئێوە وازنەهێنێت لە داواکردنی خستنەوەی منداڵ، چونکە ئەگەر مرۆڤ مرد و منداڵی نەبوو ناوی دەبڕێتەوە. |

| | | |
|---|---|---|
| ٣ | أخرج الشيخان عن ابن عمرﷺ قال: سمعت رسول الله ﷺ يقول: ((كلكم راع وكلكم مسؤول عن رعيته، والرجل راع في أهله ومسؤول عن رعيته، والمرأة راعية في بيت زوجها ومسؤولة عن رعيتها، والخادم راع في مال سيده ومسؤول عن رعيته وكلكم راع وكلكم مسؤول عن رعيته.)) | واتە: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ئێوە هەمووتان شوانن و بەرپرسیارن لەوەی لەبەردەستاندایە" پیاو چاودێرە لەنێو خێزانەکەیداو بەرپرسیارە لێیان، ژن چاودێری ماڵی مێردەکەیەتی و بەرپرسیارە لێی، خزمەتکار چاودێرە لەماڵی گەورەکەی و بەرپرسیارە لەوەی لەبەردەستیدایە، ئێوە هەمووتان شوانن و بەرپرسیارن لەوەی لەبەردەستاندایە. |

| | | |
|---|---|---|
| ٤ | روى مسلم ومالك وأبوداود والنسائي عن ابن عباسﷺ أن رسول اللهﷺ لقي ركباً بالروّحاء، قال: ((من القوم؟)) قالوا: المسلمون، فقالوا: من أنت؟ قال: ((رسول الله))، فرفعت امرأة صبياً فقالت: ألهذا حج؟ قال: ((نعم، ولك أجر)). | واتە: پێغەمبەرﷺ لە (الروحاء) کۆمەڵەسوارێکی بینی، فەرمووی: ئێوە کێن؟ وتیان: موسڵمانین، وتیان: ئەی تۆ کێی؟ فەرمووی: منیش پێغەمبەری خوام، ئافرەتێك منداڵێکی بەرزکردەوەو وتی: ئایا ئەم منداڵە حەجی بۆ هەیە؟ فەرمووی: بەڵێ، بۆتۆش پاداشت هەیە. |

| | | |
|---|---|---|
| ٥ | روى الإمام أحمد عن عائشة ﷺ أن رسول الله ﷺ قال لها: ((يا عائشة! ارفقي، فإن الله إذا أراد بأهل بيت خيراً دلهم على الرفق، وفي رواية: إذا اراد الله بأهل بيت خيراً أدخل عليهم الرفق)). | واتە: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ئەی (عائشە)! نەرم و نیان بە، ئەگەر خوا ویستی چاکەی بە خەڵکی هەر ماڵێك هەبێت، ئەوا نەرم و نیانیان نیشان دەدات. لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا: گەر خوا ویستی چاکە بۆ خەڵکی ماڵێك بنێرێت، ئەوا نەرم و نیانی دەخاتە نێویانەوە. |

| ٦ | روى الترمذي عن أبي موسى الأشعري رضي الله عنه أن رسول الله ﷺ قال: ((إذا مات ولد العبد قال الله تعالى لملائكته: قبضتم ولد عبدي؟ فيقولون: نعم، فيقول: قبضتم ثمرة فؤاده؟ فيقولون: نعم، فيقول: فماذا قال عبدي؟ فيقولون: حَمَدَكَ وأسترجَعْ، فيقول الله تعالى: ابنوا لعبدي بيتاً في الجنة وسمّوه بيت الحمد.)) | واتە: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: کاتێك منداڵی کەسێك دەمرێت، خوای گەورە بە فریشتەکانی دەفەرمووێت: گیانی رۆڵەی بەندەکەمتان کێشا؟ دەڵێن: بەڵێ، دەفەرمووێ: بەروبوومی دڵیتان کێشا؟ دەڵێن: بەڵێ، ئەمجا دەفەرمووێت: بەندەکەم چی وت؟ دەڵێن: سوپاسی تۆی کرد و وتی: (إنا لله وإنا اليه راجعون)، خوای گەورە دەفەرمووێت: لە بەهەشتدا خانوویەك بۆ بەندەکەم دروست بکەن و ناوی بنێن خانووی سوپاسگوزاری. |
|---|---|---|

| ٧ | روى أصحاب السنن عن سمرة قال: قال رسول الله ﷺ: ((كل غلام رهينة بعقيقته، تذبح عنه يوم السابع، ويُسمّى فيه ويحلق راسه)). | واتە: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: هەموو<br><br>منداڵێك بارمتەی هۆزەبانەکەیەتی، ئەوەی کە |
|---|---|---|

| ٨ | في الصحيحين عن عبدالله بن مسعود" قلت: يا رسول الله! أي الذنب أعظم؟ قال: ((أن تجعل لله نداً وهو خلقك))، قلت: ثم أي؟ قال: ((أن تقتل ولدك خشية أن يطعم معك))، قلت: ثم أي؟ قال: ((أن تزاني بحليلة جارك)). | (عبداللە کوڕی مسعود) دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خواﷺ! چ گوناهێك زۆر مەزن و گەورەیە؟ فەرمووی: هاوبەش بۆ خوا دابنێیت لەکاتێکدا کە ئەو دروستی کردوویت، وتم: چیتر؟ فەرمووی: منداڵەکەت بکوژیت لەترسی ئەوەی لەگەڵت نان بخوات، وتم: چیتر؟ فەرمووی: زینا لەگەڵ ژنی دراوسێکەت بکەیت. |
|---|---|---|

| | | |
|---|---|---|
| ٩ | روى البزار عن ابن عمر ﷺ عن النبيﷺ قال: ((إن لكل شجرة ثمرة، وثمرة القلب الولد، إن الله لا يرحم من لا يرحم ولده، والذي نفسي بيده لا يدخل الجنة الاّ رحيم)) قلنا: يا رسول الله! كلنا يرحم، قال: ((ليس رحمته أن يرحم أحدكم صاحبه، إنما الرحمة أن يرحم الناس)). | واتە: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: هەموو درەختێك بەروبوومێکی هەیە، بەرهەمی دڵیش منداڵە، خوای گەورە بەزەیی بە کەسێکدا نایەتەوە کە بەزەیی بە منداڵەکەیدا نەیەتەوە، سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە! تەنها کەسی میهرەبان دەچێتە بەهەشتەوە. وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا! هەموومان بەزەییمان هەیە؟ فەرمووی: بەزەیی ئەوە نیە کە بەرامبەر هاورێکەت بەبەزەیی بیت، بەڵکو بەزەیی ئەوەیە کە بەرامبەر هەموو خەڵك بەبەزەیی بیت. |

| | | |
|---|---|---|
| ١٠ | أخرج مسلم عن أبي هريرة ﷺ ان رسول اللهﷺ قال: ((إذا مات الإنسان انقطع عمله الاّ من ثلاث: صدقة جارية أو علم ينتفع به، أو ولد صالح يدعو له)). | واتە: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: کاتێك ئادەمیزادێك دەمرێت، کردەوەکانی هەڵدەگیرێت و لێی دەپچڕێت تەنها لەسێ شت نەبێت: خێرێکی بەردەوام، یاخود زانستێك کە سوودی لێوەربگیرێت، یان منداڵێکی چاك کە بۆی بپاڕێتەوە. |

| | | |
|---|---|---|
| ١١ | روى أحمد -بأسناد جيد- عن المقدام بن معدِ يْكَرِب ﷺ قال: قال رسول اللهﷺ: ((ما أطعمت نفسك فهو لك صدقة، وما أطعمت ولدك فهو لك صدقة، وما أطعمت زوجتك فهو لك صدقة، وما أطعمت خادمك فهو لك صدقة)). | واتە: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: هەرشتێکت دەرخواردی خۆت دا ئەوە بۆ تۆ خێرە، هەرچیت دەرخواردی منداڵەکەت دا ئەوە بۆ تۆ خێرە، هەرچیت دەرخواردی ژنەکەت دا ئەوە بۆ تۆ خێرە، هەرچیت دەرخواردی خزمەتکارەکەت دا ئەو بۆ تۆ خێرە. |

| | | |
|---|---|---|
| ١٢ | أخرج البخاري عن ابي هريرةﷺ قال: قال رسول اللهﷺ: ((ما من مولود يولد الا يولد على الفطرة، فابواه يهودانه أو ينصرانه أو يمجسانه، كما تُنتج البهيمةُ بهيمةً جمعاء، هل تحسّون فيها من جدعاء))، ثم يقول أبوهريرةﷺ: أقرأوا إن شئتم: ﴿فِطْرَتَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لاَ تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ﴾الروم/٣٠. | واتە: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: هەموو منداڵێك لەسەر فیترەتی خواپەرستی لەدایك دەبێت، جا باوك و دایكی دەیكەنە جولەكە یاخود گاور یا ئاگرپەرست، هەروەك چۆن ئاژەڵ ئاژەڵ بە تێرو تەواوی پەیدا دەبێ، ئایا هیچ دانەیەكی لوتبڕاویان تێدا دەبینن؟ پاشان (ابوهریرە) دەڵێ: ئەگەر حەز دەكەن ئەم ئایەتە بخوێننەوە:-ماناكەی- فیترەتی خوایە كە خەڵكی لەسەر ئەو فیترەتە دروست كردوە، هیچ گۆڕانكاریەك لە بەدیهێنراوانی خوادا نیە، ئا ئەوەیە دینی ڕاست و پتەو. |

| | | |
|---|---|---|
| ١٣ | روى البيهقي في (الشعب) من حديث الحسن بن علي، عن النبيﷺ قال: ((من وُلِدَ له مولود فاذّن في أذنه اليُمنى وأقام في أذنه اليسرى، رُفعت عنه أم الصبيان)). | واتە: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: هەر كەسێك منداڵێكی لەدایك بوو، جا بانگی دا بەگوێی ڕاستیدا و قامەتی بەگوێی چەپیدا خوێند، ئەوا دەست وەشاندنی (ام الصبیان)ی لەسەر هەڵدەگیرێ. (ام الصبیان) جنۆكەیەكە منداڵی تازە لەدایك بوو دەترسێنێ و دەستیان لێدەوەشێنێ. |

| | | |
|---|---|---|
| ١٤ | روى الحافظ أبو يعلى الموصلي في مسنده عن أنس ﷺ قال: قال رسول اللهﷺ: ((ما أنعم الله على عبد نعمة من أهلٍ، أو مالٍ، أو ولد، فيقول: ماشاء الله لا قوة الاّ بالله، فيرى فيه آفة دون الموت)). | واتە: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: هەركاتێك خوای گەورە نیعمەتی كەس و كار و ماڵی بە بەندەی خۆی بەخشی، یاخود منداڵی پێبەخشی، بڵێت (ما شاء الله، لا قوة الاّ بالله)، ئەوە هیچ بەڵایەكی لێنابینێ جگە لە مردن. |

| ژ | دەق | واتە |
|---|---|---|
| ١٥ | أورد البخاري في صحيحه (باب من طلب الولد للجهاد) عن أبي هريرةﷺ عن رسول اللهﷺ قال: قال سليمان بن داود: لأطوفَنَّ الليلة على مئةِ امرأة أو تسع و تسعين، كلّهن يأتي بفارس يجاهد في سبيل الله، فقال له صاحبه: قل إن شاء الله، فلم يقل إن شاء الله، فلم تحمل منهن الاّ إمرأة واحدة جاءت بشِقِّ رجل، والذي نفس محمد بيده، لو قال إن شاء الله لجاهدوا في سبيل الله فرساناً أجمعون)). | واتە: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: (سلیمان کوڕی داود) فەرمووی: من ئەم شەو دەچمە لای سەد ژنم، یاخود نەوەد و نۆ، هەریەکێکیان سوارچاکێکی دەبێت و لەپێناوی خوای گەورەدا جیهاد دەکات، هاوەڵەکەی پێی وت: بڵێ إن شاء الله، بەڵام ئەو نەیوت: إن شاء الله، جا لەو ئافرەتانە تەنها یەکێکیان سکی بوو، ئەویش نیوەپیاوێکی لێدەرچوو(واتە ناتەواو)، سوێند بەو کەسەی گیانی (محمد)ی بەدەستە! گەر بیوتایە إن شاء الله ئەوا هەموان دەبونە سوارچاك و لەپێناو خوادا جیهادیان دەکرد. |
| ١٦ | روى الحاكم عن ابن عباسﷺ عن النبيﷺ قال: ((افتحوا على صبيانكم أول كلمةٍ بلا إله الاّ الله، ولقنوهم عند الموت: لا إله إلاّ | واتە: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: یەکەم وشە کە زمانی منداڵەکانتانی پێ دەکەنەوە با (لا الە الا الله)بێت، و لەکاتی مردنیشدا (لا الە الا الله) بدەن بە گوێیاندا. |
| ١٧ | روى الطبراني وابن النجار عن علي كرم الله وجهه، أن النبيﷺ قال: ((أدبوا أولادكم على ثلاث خصال: حب نبيكم، وحب آل بيته، وتلاوة االقرآن، فإن حملة القرآن في ظل عرش الله يوم لا ظل الاّ ظله مع أنبيائه وأصفيائه)). | واتە: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: منداڵەکانتان لەسەر سێ ڕەوشت پەروەردە بکەن: خۆشەویستی پێغەمبەرەکەتان و خۆشەویستی ئال و بەیت و خێزانەکانی، و خوێندنی قورئان، |

| | | |
|---|---|---|
| ١٨ | روى ابن حبان عن أنس ﷺ عن النبي ﷺ أنه قال: ((الغلام يُعقّ عنه يوم السابع ويُسمّى ويماط عنه الأذى، فإذا بلغ ست سنين أُدِّب، وإذا بلغ تسع سنين عزل عن فراشه، فإذا بلغ ثلاث عشرة سنة ضُرب على الصلاة والصوم، فإذا بلغ ست عشرة زوجه أبوه، ثم أخذ بيده وقال: قد أدبتك و علمتك وأنكحتك، أعوذ بالله من فتنتك في الدنيا وعذابك في الآخرة)). | واتە: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: منداڵ لە حەوتەمین رۆژی لەدایکبوونیەوە هۆزەبانەی بۆ دەکرێ و ناودەنرێت و سەری دەتاشرێ، ئەگەر گەیشتە شەش ساڵان فێری خوورەوشت و ئەدەب دەکرێت، کە گەیشتە نۆ ساڵان جێگای نوستنی لێ جیا دەکرێتەوە، کاتێ کە گەیشتە |
| ١٩ | روى الحاكم وأبوداود عن ابن عمرو بن العاص ﷺ عن رسول الله ﷺ أنه قال: ((مروا أولادكم بالصلاة وهم أبناء سبع سنين وأضربوهم عليها وهم أبناء عشر، وفرقوا بينهم في المضاجع)). | واتە: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: منداڵەکانتان لە حەوت ساڵیدا فێری نوێژ بکەن، و لە دەساڵیدا لەسەر نوێژنەکردن لێیان بدەن، و جێگای خەوتنیان لەیەك جیابکەنەوە (با لەژێر یەك نوێندا پێکەوە نەخەون). |
| ٢٠ | في الصحيحين عن أبي موسى قال: ولد لي غلام، فأتيت به النبيﷺ فسماه إبراهيم وحنّكه بتمرة (وزاد البخاري) ودعا له بالبركة ودفعه الي. | واتە: (ابو موسا) وتوویەتی: کوڕێکم بوو، بردم بۆ لای پێغەمبەری خواﷺ، ئەویش ناوی نا (ابراهیم) و خورمایەکی لەناو دەمیدا نەرم و شل کردەوەو دەمی منداڵەکەی پێ شیرین کرد. (بخاری) ئەمەی بۆ زیاد کردووە: دوعای بۆ کرد کە بەرەکەت بکەوێتە ژیان و تەمەنیەوەو پاشان منداڵەکەی پێدامەوە. |

| | | |
|---|---|---|
| ٢١ | في الصحيحين عن ابي مسعود عقبة بن عمرو البدري ﷺ قال: جاء رجل الى النبيﷺ فقال: إني لأتأخر عن الصلاة الصبح من أجل فلان مما يطيل بنا، فما رأيت النبيﷺ غضب في موعظة قطّ اشدّ مما غضب يومئذٍ، فقال: ((ياأيها الناس؛ إن منكم مُنَفِّرين، فأيكم أمَّ الناس فليوجز؛ فإن من ورائه الكبير والصغير وذا الحاجة)). | واتە: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ و وتی: من بەهۆی فلأن کەسەوە درەنگ بۆ نوێژی بەیانی دێم، چونکە نوێژەکەی درێژ دەکاتەوە.. جا دەڵێ: هەرگیز نەمدیوە پێغەمبەری خواﷺ لەکاتی وتاردانەدا لەو رۆژە توڕەتر بێت، فەرمووی: ئەی خەڵکینە! لەناوتاندا کەسی وا هەیە خەڵك دەڕەوێننەوەو دوور دەخەنەوە، هەرکامتان پێشنوێژی بۆ خەڵك کرد، با نوێژەکەی کورت بکاتەوە، چونکە لەدوایەوە گەورەو بچووك و کەسانی خاوەن ئیش هەن. |

| | | |
|---|---|---|
| ٢٢ | روى الترمذي عن جابر بن سمرةﷺ قال: قال رسول اللهﷺ: ((لأن يؤدب الرجل ولده، خيرٌ من أن يتصدق بصاع)). | واتە: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: پیاو منداڵەکەی فێری ئەدەب و رێز بکات چاکترە لەوەی کە صاعێك بکاتە خێر. |

| | | |
|---|---|---|
| ٢٣ | روى ابن ماجه عن ابن عباس ﷺ عن النبيﷺ: ((أكرموا أولادكم وأحسنوا أدبهم)). | واتە: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: رێز لە منداڵەکانتان بگرن و بەچاکی پەروەردەیان بکەن. |

| | | |
|---|---|---|
| ٢٤ | روى الإمام أحمد عن أبي هريرةﷺ عن رسول اللهﷺ أنه قال: ((من قال لصبي تعال هاك أعطيك ولم يعطه، فهي كذبة)). | واتە: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: هەرکەسێ منداڵێك بانگ بکات و بڵێ وەرە ئەوەت بدەمێ و نەیداتێ ئەوە درۆی کردووە. |

| | | |
|---|---|---|
| ٢٥ | وروى الإمام أحمد والنسائي عن معاوية بن قرة عن أبيه أن رجلاً كان يأتي النبيﷺ ومعه ابنٌ له، فقال له النبيﷺ: ((أتحبُّه))؟ فقال: يا رسول الله! أحبَّك الله كما أحبُّه.. ففقده النبيﷺ فقال: ((ما فعل ابن فلان؟)) قالوا: يا رسول الله! مات، فقال النبيﷺ لأبيه: ((أما تُحبُّ ألاّ تأتي باباً من أبواب الجنة الا وجدته ينتظرك عليه؟)) فقال رجل: أله خاصة يا رسول الله، أو لكلنا؟ قال: ((بل لكلكم)). | واتە: کابرایەك هاتە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ و کوڕێکی خۆی پێبوو، پێغەمبەری خواﷺ پێی فەرموو: ئایا خۆشت دەوێت؟ وتی: من چەندم خۆش دەوێت ئەی پێغەمبەری خواﷺ، خواش ئەوەندە خۆشی بوێت.. ماوەیەك دیارنەما، پێغەمبەری خواﷺ لێی پرسیەوەو فەرمووی: کوڕی فلان چی لێهات؟ وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! مرد، پێغەمبەریشﷺ بەباوکەکەی فەرموو: حەزناکەیت لە هەردەرگایەکی بەهەشتەوە بچیت ئەو لەوێ چاوەڕوانت بکات؟ پیاوێکیش لەوێدا بوو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەمە تایبەتە بۆ ئەو یان بۆ هەموومان هەروایە؟ فەرمووی: بەڵکو بۆ هەمووتانە. |
| ٢٦ | روى البخاري عن سهل بن سعد ﷺ قال: قال رسول اللهﷺ: ((أنا وكافل اليتيم في الجنة هكذا)) واشار بالسبابة والوسطى وفرج بينهما. | واتە: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: من و سەرپەرشتیاری هەتیو لە بەهەشتدا ئاواین.. |
| ٢٧ | روى الشيخان ومالك والنسائي وأبوداود عن عبدالله بن عمرﷺ قال: فرض رسول اللهﷺ زكاة الفطر صاعاً من تمر أو صاعاً من شعير على كل عبد أو حر صغير أو كبير. | واتە: (عبداللە کوڕی عمر) ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ زەکاتی سەرفیترەی ڕەمەزانی واجب کرد (صاع)ێك لە خورما یاخود (صاع)ێك لە جۆ لەسەر هەموو کەسێکی بەندە و ئازاد، منداڵ بێت یان گەورە. |

| | | |
|---|---|---|
| ٢٨ | أخرج الشيخان عن الرُّبيّع بنت مُعوّذ قالت: أرسل رسول اللهﷺ صبيحة يوم عاشوراء الى قرى الأنصار: ((من **أصبح صائماً فليُتِم صومه ومن كان أصبح مفطراً فليصم بقية يومه**))، فكنا نصومه بعد ذلك و نُصَوِّم صبياننا الصغار منهم ونذهب الى المسجد فنجعل لهم اللعبة من العهن (أي الصوف) فإذا بكى أحدهم من الطعام أعطيناه إياه حتى يكون عند الأفطار. | واتە: (رُبَيّع کچی مُعَوِّذ) وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ بەیانی ڕۆژی (عاشوراء) هەواڵی نارد بۆ گوندەکانی دەوروبەری مەدینە کە (هەرکەسێك ڕۆژی کردۆتەوەو بەرۆژو بووە با ڕۆژوەکەی تەواو بکات، و هەرکەسێك بەرۆژو نەبووە با ئەوەی لە ڕۆژەکە ماوەتەوە بەرۆژو بێت، ئیتر ئێمەش ئەو ڕۆژە بەرۆژو دەبوین، و منداڵە بچوکەکانیشمان بەرۆژو دەبوون، و دەچوینە مزگەوت و لە خوری یاریمان بۆ دروست دەکردن، ئەگەر یەکێکیان لەبرسا بگریایان دەماندایە دەستی هەتا کاتی بەربانگ کردنەوە دادەهات. |

| | | |
|---|---|---|
| ٢٩ | روى الشيخان عن أبي هريرةؓ قال: قبَّل النبيﷺ الحسن بن عليؓ، فقال الأقرع بن حابس: إن لي عشرة من الولد ما قبّلتُ منهم أحداً!، فقال رسول اللهﷺ: ((**من لا يرحم لا يرحم**)). | واتە: پێغەمبەری خواﷺ (حسن کوڕی علی)ؓ ماچ کرد، (اقرع کوڕی حابس) وتی: من دە منداڵم هەیە تا ئێستا هیچ کامیانم ماچ نەکردووە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەوەی بەرەحم و بەزەیی نەبێت، ڕەحم و بەزەییشی پێ ناکرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| ٣٠ | روى الإمام أحمد والطبراني عن عبادة بن الصامت أن رسول اللهﷺ قال: ((**ليس من أمتي من لم يجل كبيرنا، ويرحم صغيرنا، ويعرف لعالمنا حقه**)). | واتە: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ئەو کەسەی ڕێز و قەدری گەورەکانمان نەگرێت و بەزەیی بە بچوکمانا نەیەتەوەو شوێن و ڕێزی زاناکانمان نەزانێت لە ئێمە نیە. |

| ژ | ده‌ق | واته‌ |
|---|---|---|
| ٣١ | روى أبوداود عن عمرو بن شعيب رحمه الله عن أبيه عن جده أن امرأة أتت رسول اللهﷺ ومعها ابنة لها وفي يد ابنتها مسكتان غليظتان من ذهب، فقال لها: ((أتُعطين زكاة هذا؟)) قالت: لا، قال: ((أيَسرُّك أن يُسوِّرك الله بهما يوم القيامة سوارين من نار؟)) قال: فخلعتهما فألقتهما الى النبيﷺ وقالت: هما لله ولرسوله. | واته: ئافرەتێك هاته خزمەت پێغەمبەری خواﷺ و کیژێکی خۆی پێبوو، کچەکەی دوو بازنگی ئاڵتونی زۆر ئەستووری لەدەستدا بوو (لە ئەندازە بەدەربوون)، پێغەمبەرﷺ پێی فەرمووو: ئایا زەکاتی ئەمە دەدەیت؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: پێت خۆشە لە رۆژی قیامەتدا خوای گەورە دوو بازنگ لە ئاگر بکاتە دەستت؟.. جا بازنگەکەی داکەند و دایە دەست پێغەمبەرﷺ و وتی: هەردووکیان بۆ خواو پێغەمبەرەکەی بێت. |

| ژ | ده‌ق | واته‌ |
|---|---|---|
| ٣٢ | روى الترمذي عن عمرو بن شعيب رحمه الله عن أبيه عن جده أن النبيﷺ خطب الناس فقال: ((ألا من وَلِيَ يتيماً له مال فليتَّجر فيه، ولا يتركه حتى تأكله الصدقة)). | واته: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: هەرکەسێك بەخێوکردنی هەتیوێکی کەوتە لا کە سامانی هەبوو، با بازرگانی پێوە بکات، و نەیهێڵێتەوە زەکات بیخوات. |

| ژ | ده‌ق | واته‌ |
|---|---|---|
| ٣٣ | روى الديلمي وابن عساكر عن ابي سفيان قال: دخلت على معاوية وهو مستلق على ظهره وعلى صدره صبي، أو صبية تناغيه، فقلت: أمط هذا عنك يا أمير المؤمنين، قال: سمعت رسول اللهﷺ يقول: ((من كان له صبي فليتصاب له)). | واته: (ابوسفيان) وتوویەتی: چوومە ژوورەوە بۆ لای (معاویە)، دیتم لەسەر پشت راکشابوو، منداڵێکی کوڕ یان کچ لەسەر سنگی بوو یاری و قسەی خۆشی بۆ دەکرد، منیش پێم وت: ئەی ئەمیری باوەڕداران! ئەمە لای خۆت لابە، ئەویش وتی: گوێم لە پێغەمبەری خواﷺ بوو دەیفەرموو: هەرکەسێك منداڵێکی هەبوو با خۆی وەك منداڵەکە لێبکات و یاری لەگەڵدا بکات. |

| ژمارە | دەق | واتە |
| --- | --- | --- |
| ٣٤ | روى أبوداود والترمذي عن ابي سعيد الخدري رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ: ((من كان له ثلاث بناتٍ أو ثلاث اخوات، أو بنتان أو أختان، فأحسن صحبتهن وأتقى الله فيهن، فله الجنة)). وفي رواية ابى داود قال: ((من عال ثلاث بناتٍ، أو ثلاث أخوات، أو أختين، أو بنتين، فأدبهن وأحسن اليهن وزوجهن، فله الجنة)). | واتە: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: هەرکەسێك سێ کچ یاخود سێ خوشکی هەبێت، یان دوو کچ یاخود دوو خوشکی هەبێت، و بەجوانی بەخێویان بکات و لەبارەیانەوە پارێزکار بێت و لەخوا بترسێت، بەهەشتی بۆ هەیە. لەگێڕانەوەی (ابوداود)یشدا دەفەرموێت: واتە: هەرکەسێك سێ کچ یاخود سێ خوشك یاخود دوو خوشك یاخود دوو کچی هەبێت، بەجوانی ئەدەبیان دابدات و فێریان بکات و بۆیان باش بێت و پاشان بەشوویان بدات، ئەوە بەهەشتی بۆ هەیە. |

| ژمارە | دەق | واتە |
| --- | --- | --- |
| ٣٥ | روى أبو داود وأبو يعلى عن عوف بن مالك عن النبي ﷺ قال: ((أنا وامرأة سفعاء الخدّين، أمرأة آمت من زوجها فصبرت على ولدها كهاتين في الجنة)). وزاد أبو داود: ((ذات منصب وجمال حبست نفسها على يتاماها حتى بانوا أو ماتوا)). | واتە: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: من و ئەو ئافرەتەی لەبەر زەحمەت و ناخۆشی رومەتەکانی رەش داگەڕاوە و بێوەژن کەوتووەو شوو ناکاتەوە و ئارام دەگرێت لەسەر منداڵەکەی، وەك ئەم دوو پەنجەیەیە واین لە بەهەشتدا.. (ابو داود) ئەوەشی بۆ زیاد کردووە: ژنەکە خاوەن پایەو جوانییە، و نەفسی خۆی دەگرێت لەسەر منداڵە هەتیوەکانی هەتا گەورە دەبن یا دەمرن. |

| ژمارە | دەق | واتە |
| --- | --- | --- |
| ٣٦ | روى أبوداود عن ابن عباس رضي الله عنهما قال: قال رسول الله ﷺ: ((من كانت له أنثى فلم يئدها، ولم يُهنْها ولم يؤثر ولده (أي الذكور عليها)، أدخله الله الجنة)). | واتە: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: هەرکەسێك لە ئێوە کچی هەبوو، زیندەبەچاڵی نەکرد، و سووکایەتی پێنەکرد، کوڕەکەی بەسەردا زاڵ نەکرد، خوای گەورە دەیخاتە بەهەشتەوە. |

| | | |
|---|---|---|
| ٣٧ | روى ابن عساكر عن واثلة بن الأسقعﷺ -كما في الجامع الكبير- أن رسول اللهﷺ خرج على عثمان بن مظعون ومعه صبي صغير له يلثمه، فقال له: ((ابنك هذا))، قال: نعم، قال: ((تحبه يا عثمان؟)) قال: إي والله يا رسول الله إني أحبه، قال: ((افلا أزيدك له حباً؟)) قال: بلى فداك أبي وأمي، قال: ((إنه من ترضى صبياً صغيراً من نسله حتى يرضى، ترضاه الله يوم القيامة حتى يرضى)). | واتە: پێغەمبەری خواﷺ چوو بۆ لای (عثمان کوڕی مظعون) کە منداڵێکی بچووکی خۆی لەگەڵ بوو ماچی دەکرد، پێغەمبەرﷺ پێی فەرموو: ئەمە کوڕتە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: ئەی (عثمان)! خۆشت دەوێ؟ وتی: ئەرێوەڵا ئەی پێغەمبەری خوا! خۆشم دەوێت، فەرمووی: خۆشەویستیەکەت بۆی زیاد بکەم؟ وتی: بەڵێ: دایك و باوکم بە فیدات بێ، فەرمووی: هەرکەسێك منداڵێکی بچکۆلانەی وەچەی خۆی رازی بکات تا رازی دەبێت، خواش لە رۆژی قیامەتدا رازی دەکات هەتا رازی دەبێت. |

| | | |
|---|---|---|
| ٣٨ | أخرج البخاري ومسلم والنسائي عن أنسﷺ أن رسول اللهﷺ قال: ((والذي نفسي بيده، لا يؤمن أحدكم حتى أكون أحب اليه من والده وولده والناس أجمعين)). | واتە: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: سوێند بەوەی نەفسی منی بەدەستە! باوەڕی کەستان تەواو دانامەزرێ تا منی لە دایك و باوك و منداڵەکانی و گشت خەڵك زیاتر خۆش نەوێت. |

| | | |
|---|---|---|
| ٣٩ | روى الحاكم عن ابي هريرةﷺ عن النبيﷺ أنه قال: ((عفّوا عن نساء الناس تعفّ نساؤكم، وبَرُّوا آباءكم تَبَرَّكم ابناؤكم، ومن أتاه أخوه متنصلاً فليقبل ذلك محقاً أو مبطلاً، فإن لم يفعل لم يرد علي الحوض)). | واتە: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: داوێن پاك بن بەرامبەر بە ئافرەتانی خەڵکی، ئافرەتانتان پاك داوین دەبن، چاك بن بەرامبەر دایك و باوکتان، منداڵەکانتان چاك دەبن بۆتان، هەرکەس لەئێوە براکەی داوای لێبووردنی لێکرد با لێی قبوڵ بکات جا گەر حەق بوو یان ناحەق، خۆ ئەگەر وانەکات ئەوا لەسەر حەوزی کەوسەر نایەتە لام. |

| ٤٠ | روى الإمام أحمد وابن ماجه والبخاري في (الأدب المفرد) عن معاذ ﷺ قال: أوصاني رسول الله ﷺ بعشر كلمات:<br>١) ((لا تشرك بالله شيئاً وإن قُتلت و حُرِّقت)).<br>٢) ((ولا تَعُقَنَّ والديك وإن أمراك أن تخرج من أهلك ومالك)).<br>٣) ((ولا تتركنَّ صلاة مكتوبة متعمداً، فإن من ترك الصلاة مكتوبة متعمداً فقد برئت منه ذمة الله)).<br>٤) ((ولا تشربن خمراً فإنه رأس كل فاحشة)).<br>٥) ((وإياك والمعصية، فإن بالمعصية حل سَخطَ الله)).<br>٦) ((وإياك والفرار من الزّحف وإن هلك الناس)).<br>٧) ((وإذا أصاب الناس موت وأنت فيهم فاثبت)).<br>٨) ((وأنفق على عيالك من طَولكَ)).<br>٩) ((ولا ترفع عنهم عصاك أدباً)).<br>١٠) ((وأخفهم في الله)) | واتە: (معاذ) وتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بە دە وشە ئامۆژگاری کردووم:<br>١) گەر بتکوژن و بتسوتێنن هاوبەش بۆ خوا بڕیار نەدەی.<br>٢) دڵی دایك و باوکت ئازار نەدەی، ئەگەریش فەرمانت پێ بدەن کە لە ماڵ و سامان و خاووخێزانت دەربچیت.<br>٣) هەرگیز نوێژە فەرزەکانت بە ئەنقەست واز لێ مەهێنە، چونکە ئەو کەسەی بە ئەنقەست واز لە نوێژی فەرز بهێنێت ئەوە لە زیمەی خوای گەورە بێبەری دەبێت.<br>٤) ئارەق مەخۆرەوە، چونکە سەری هەموو خراپەکاریەکە.<br>٥) ئاگاداربەو خۆت دوور بگرە لە سەرپێچیکردن، چونکە سەرپێچی کردن مایەی خەشم و توڕەیی خوای گەورەیە.<br>٦) ئاگاداربە لە راکردن لە رۆژی جەنگ و ڕووبەڕووبوونەوەدا، ئەگەریش خەڵك بەهیلاك چوون.<br>٧) ئەگەر خەڵکی تووشی مردن (پەتا) هاتن و تۆش لە ناویاندا بوویت، خۆڕاگربە.<br>٨) بەپێی توانای خۆت ژێواری منداڵەکانت بەڕێوە ببە و خەرجیان بۆ بکە.<br>٩) گۆچانت لەسەریان هەڵمەگرە بۆ تەمبێکردن.<br>١٠) وە لەخوا بیانترسێنە. |
|---|---|---|

# کۆتایی دووەم

## وتاری پێغەمبەرﷺ بۆ منداڵان

ئەمە کۆمەڵە فەرموودەیەکی پێغەمبەرەﷺ لە بابەتی ئەم کتێبەدا کۆم کردۆتەوە تا منداڵی موسڵمان لەبەری بکات، و ببێتە چرایەك بۆ ڕێنماییکردن و ڕەفتار و ڕەوشت جوانی بۆی، وە لەبەرنامەو پەیڕەوی پێغەمبەر ڕێنماییەکانی پەروەردە وەربگرێ، بەمەش یارمەتی باوکان و دایکان و پەروەردەکاران دەدات بە ویستی خوای گەورە بۆ ئاراستەکردنی منداڵی موسڵمان.

## چل فەرموودە بۆ منداڵان

| | | |
|---|---|---|
| ١ | أخرج الترمذي عن أنسؓ قال: قال رسول اللهﷺ: ((**يا بني! إذا دخلت على أهلك فسلم، يكن بركة عليك و على أهلك**)). | واتە: (انس) وتویەتی: پێغەمبەرﷺ فەرموی: ڕۆڵەکەم! کاتێ دەچیتەوە بۆ ماڵی خۆتان، سڵاو لە کەس و کارەکەت بکە، ئەو سڵاوە دەبێت بەمایەی فەڕ و بەرەکەت بۆ خۆت و کەس و کارەکەشت. |

| | | |
|---|---|---|
| ٢ | روى مسلم وابن خزيمة ٣/١٤٤ عن ابنة الحارثة بن النعمانؓ قالت: ما حفظت (ق) الاّ من فيّ رسول اللهﷺ يقرأ بها في كل جمعة. | واتە: کچی (حارثة کوڕی نعمان) وتوویەتی: سورەی (ق)م لەسەر زاری پێغەمبەری خواﷺ لەبەرکرد، چونکە هەموو هەینییەك دەیخوێندەوە. |

| | | |
|---|---|---|
| ٣ | أخرج البخاري ومسلم عن سمرة بن جندب ؓ قال: لقد كنت على عهد رسول اللهﷺ غلاماً، فكنت أحفظ عنه، فما يمنعني من القول الاّ أن | (سمره کوڕی جندب) وتوویەتی: لەسەردەمی پێغەمبەری خواﷺ منداڵ بوم، و شتم لە پێغەمبەری خوا دەبیست و لەبەرم دەکرد، بەڵام لەبەر ئەوەی کەسی لەخۆم بەتەمەنتر |

| واتە | الحديث | |
|---|---|---|
| واتە: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: منداڵەکانتان لە حەوت ساڵیدا فێری نوێژ بکەن، و لە دەساڵیدا لەسەر نوێژنەکردن لێیان بدەن، و جێگای خەوتنیان لەیەك جیابکەنەوە (با لەژێر یەك نوێندا پێکەوە نەخەون). | روى الحاكم وأبوداود عن عبدالله بن عمرو بن العاصﷺ قال: قال رسول اللهﷺ: ((**مروا أولادكم بالصلاة وهم أبناء سبع، وأضربوهم عليها وهم أبناء عشر، وفرّقوا بينهم في المضاجع**)). | ٤ |
| واتە: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: هەر منداڵێك لەخواپەرستیدا پەروەردە بێت و بەردەوام بێت تا مردن، خوای گەورە پاداشتی نەوەد و نۆ چاکەکاری راستگۆی دەداتەوە. | روى الطبراني عن ابى أمامةﷺ قال: قال رسول اللهﷺ: ((**ما من ناشيء ينشأ في العبادة حتى يدركه الموت، الاّ أعطاه الله أجر تسعة وتسعين صديقاً**)). | ٥ |
| واتە: (انس) وتویەتی: پێغەمبەرﷺ فەرموی: کوڕەکەم.. ئاگاداربە لەئاوڕدانەوە لە نوێژدا، چونکە ئاوڕدانەوە لەنوێژدا تیاچونە، بەڵام ئەگەر هەر ناچار بوی ئەوا لەنوێژی سوننەتدا نەك لە نوێژی فەرزدا. | أخرج الترمذي عن أنسﷺ قال: قال رسول اللهﷺ: ((**يا بني! إياك والألتفات في الصلاة فإن الإلتفات في الصلاة هلكة، فإن كان ولابُدَّ ففي التطوع، لا في الفريضة**)). | ٦ |
| واتە: (انس)ﷺ دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەرداﷺ چوینە لای کوڕێکی بەرگدروو، ئەویش قاپێکی خستە بەردەستی کە تێکوشەی تێدا بوو و کولەکەی بەسەرەوە بوو، کوڕەکە چوویەوە سەر کاری خۆی، دەڵێ: پێغەمبەری خواﷺ بەدوای کولەکەدا دەگەڕا، منیش دەگەڕام بۆی و دەمخستە بەردەستی، (انس) دەڵێ: لە دوای ئەوەوەو تا ئێستاش حەز بە کولەکە دەکەم. | أخرج البخاري ومسلم والترمذي والنسائي وابوداود -وهذا لفظ البخاري- عن أنس بن مالك ﷺ قال: دخلت مع النبيﷺ على غلام خياط، فقدم اليه قصعة، ثريد و عليه دباء، قال: واقبل على عمله -يعني الغلام- قال: فجعل النبيﷺيتتبع الدّباء (أي القرع) قال أنس: فجعلت أتتبعه وأضعه بين يديه، قال: وما زلت بعدُ أحب الدّبّاء. | ٧ |

| | | |
|---|---|---|
| ٨ | روى ابن السني عن ابن عمرﷺ قال: جاء غلام الى النبيﷺ فقال: إني اريد الحج، فمشى معه رسول اللهﷺ فقال: ((**يا غلام! زودك الله التقوى، ووجهك في الخير، وكفاك الهم**))، فلما رجع الغلام على النبيﷺ فقال: ((**يا غلام، قبل الله حجّك، وغفر ذنبك، وأخلف نفقتك**)). | واتە: کوڕێك هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ و وتی: من دەمەوێت حەج بکەم، پێغەمبەریشﷺ لەگەڵیدا ڕۆیشت و پێی فەرموو: ڕۆڵە! خوا پارێزکاری و لەخواترسانت زیاد بکات، و روت بکاتە خێر، و غەم و پەژارەت لەسەر لاببات. کاتێك کوڕەکە گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەرﷺ، پێی فەرموو: ڕۆڵە! خوا حەجەکەت قبوڵ بکات، و لە گوناهت خۆش بێت، و جێی خەرجیە سەرف کراوەکەت بۆ بگرێتەوە. |
| ٩ | وروى الطبراني عن عائشة ﷺ قالت: قال رسول اللهﷺ: ((**ما برَّ أباه من سدد اليه الطرف بالغضب**)). | واتە: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ئەو کەسە لەگەڵ دایك و باوکی چاك نەبووە کە بەچاوی توڕەییەوە تەماشای بکات. |
| ١٠ | روى الترمذي عن سعد بن العاص رحمه الله أن رسول اللهﷺ قال: ((**ما نَحلَ والدٌ ولداً من نَحلٍ أفضل من أدب حسن**)). | واتە: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: هیچ باوکێك شتێکی چاکتر لە ئەدەبی جوان بە منداڵەکەی نەبەخشیوە. |
| ١١ | أخرج البخاري ومسلم ومالك والنسائي وأبوداود عن عبدالله بن عمرﷺ قال: فرض رسول اللهﷺ زكاة الفطر صاعاً من تمر أو صاعاً من شعير على كل عبد أو حر، صغير أو كبير. | واتە: (عبدالله کوڕی عمر)ﷺ وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ زەکاتی سەرفیترەی رەمەزانی واجب کرد (صاع)ێك لە خورما یاخود (صاع)ێك لە جۆ لەسەر هەموو کەسێکی بەندە و ئازاد، منداڵ بێت یان گەورە. |

| | | |
|---|---|---|
| ١٢ | أخرج البخاري عن أنس ﷺ قال: كان غلام يهودي يخدم النبيﷺ فمرض، فأتاه النبيﷺ يعوده، فقعد عند رأسه، فقال له: ((أسلم)) فنظر الى أبيه وهو عنده، فقال: أطع أبا القاسم، فأسلم، فخرج النبيﷺ وهو يقول: ((الحمد لله الذي أنقذه من النار)). | واتە: کوڕە جولەکەیەك خزمەتی پێغەمبەریﷺ دەکرد، نەخۆش کەوت، پێغەمبەرﷺ چوو بۆ سەردانیو لەلای سەریەوە دانیشت و پێی فەرمووی: موسڵمان بە، کوڕەکەش سەیری باوکی کرد، کە لەلایدا بوو، باوکیشی پێی وت: بەقسەی (ابوقاسم) بکە، جا ئەویش موسڵمان بوو، پێغەمبەرﷺ کە هەڵسا فەرمووی: سوپاس بۆ خوا کە لە ئاگری دۆزەخ رزگاری کرد. |

| | | |
|---|---|---|
| ١٣ | روى أبو يعلي والطبراني عن عمرو بن حريث أن رسول اللهﷺ مر بعبدالله إبن جعفر وهو يبيع بيع الغلمان أو الصبيان، قال: ((اللهم بارك له في بيعه)) أو قال ((في صفقته)). | واتە: پێغەمبەری خواﷺ بەلای (عبدالله کوری جعفر)دا تێپەری کرد کە شتی مندالآنەی دەفرۆشت، و فەرمووی: خوایە بەرەکەت بخەرە فرۆشتنەکەیەوە -یان- مالّەکەیەوە. |

| | | |
|---|---|---|
| ١٤ | روى الإمام أحمد والطبراني عن عبادة بن الصامت أن رسول اللهﷺ قال: ((ليس من أمتي من لم يجل كبيرنا ويرحم صغيرنا ويعرف لعالمنا حقه)). | واتە: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ئەو کەسە لە ئێمە نیە کە قەدری گەورەکانمان نەگرێت و بەزەیی بە بچوکەکانمان نەیەتەوەو پایە و قەدری زاناکانمان نەزانێت. |

| | | |
|---|---|---|
| ١٥ | أخرج احمد وأبوداود عن عبدالله بن بسر صاحب النبيﷺ: أن النبيﷺ إذا أتى باباً يريد أن يستأذن لم يستقبله، جاء يميناً أو شمالاً، فإن أذن له وإلاّ إنصرف. | واتە: پێغەمبەرﷺ ئەگەر بچوایەتە بەردەرگایەك تا مۆڵەت وەربگرێت، بەرامبەر دەرگا نەدەوەستا، دەچووە لای راست یان چەپ، ئەگەر مۆڵەت بدرایە (دەچووە ژوورەوە)، ئەگینا دەگەڕایەوە. |

| | | |
|---|---|---|
| ١٦ | روى أحمد والشيخان عن أنس رضي الله عنه أن رجلاً سأل رسول الله ﷺ: متى الساعة؟ فقال رسول الله ﷺ: **((وما أعددت لها؟))**. فقال: لا شيء إلاّ أني أحب الله ورسوله. فقال ﷺ: **((أنت مع من أحببت))**. وفي رواية البخاري قال: ونحن كذلك؟ فقال ﷺ: **((نعم))**، قال أنس: فما فرحنا بشيء فرحنا بقول النبي ﷺ: **((أنت مع من أحببت))** قال أنس: فانا احب النبي ﷺ وأبابكر وعمر، وارجوا أن أكون معهم بحبي إياهم. | واتە: (انس) رضي الله عنه دەگێڕنەوە کە پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد: کەی قیامەت دادێ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: چیت بۆ ئامادەکردوە؟ وتی: هیچ، تەنها خۆشەویستی خواو پێغەمبەرەکەی دەستمایەمە، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: تۆ لەگەڵ ئەو کەسەدایت کە خۆشت ویستووە. لەگێڕانەوەی (بخاری)یشدا: ئێمەش بەهەمان شێوەین؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ.. (أنس) دەڵێ: هیچ شتێك هێندەی ئەو قسەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ دڵخۆشی نەکردووین کە دەفەرمووێ: **((أنت مع من أحببت))**. (انس) رضي الله عنه دەڵێت: من پێغەمبەر ﷺ و (ابوبكر) و (عمر)م خۆش دەوێت، و ئومێدەوارم کە بەهۆی ئەو خۆشەویستیەمەوە بۆیان لەگەڵ ئەواندا بم. |

| | | |
|---|---|---|
| ١٧ | أخرج الإمام أحمد عن أبي هريرة رضي الله عنه عن رسول الله ﷺ أنه قال: **((من قال لصبي تعال هاك أعطك، ولم يعطه، كتبت كذبة))**. | واتە: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: هەرکەسێ منداڵێك بانگ بکات و بڵێ وەرە ئەوەت بدەمێ و نەیداتێ ئەوە بەدرۆ لەسەری دەنووسرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| ١٨ | أخرج مسلم عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ: **((من أشار الى أخيه بحديدة، فإن الملائكة تلعنه حتى يدعه، وإن كان أخاه لأبيه وأمه))**. | واتە: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: هەرکەسێك بە پارچەئاسنێ بەمەبەستی ترساندنی ئاماژە بۆ برای خۆی بکات، ئەوا فریشتەکان نەفرینی لێدەکەن هەتا ئەوکاتەی وازی لێدێنی، با ئەو کەسە برای دایك و باوکیشی بێت. |

| | | |
|---|---|---|
| ١٩ | روى الطبراني وابن النجار عن علي كرم الله وجهه: أن النبيﷺ قال: ((أدبوا أولادكم على ثلاث خصال: حب نبيكم، وحب آل بيته، وتلاوة االقرآن، فإن حملة القرآن في ظل عرش الله يوم لا ظل الاّ ظله مع أنبيائه وأصفيائه)). | واتە: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: منداڵەکانتان لەسەر سێ ڕەوشت پەروەردە بکەن: خۆشەویستی پێغەمبەرەکەتان و خۆشەویستی ئال و بەیت و خێزانەکانی، و خوێندنی قورئان، چونکە هەڵگرانی قورئان لەژێرسێبەری عەرشی خوادان لە ڕۆژێکدا کە هیچ سێبەرێك نیە جگە لە سێبەری عەرشی خوا نەبێ و لەگەڵ پێغەمبەرەکانی و هەڵبژاردەکانیدان. |
| ٢٠ | روى الترمذي وأبوداود والبخاري في (الأدب المفرد) وابن حبان في صحيحه عن أبي سعيد الخدري عن النبيﷺ: ((من كان له ثلاث بناتٍ أو اخوات، أو بنتان أو أختان، فأحسن صُحبتهنَّ وصبر عليهنَّ، وأتقى الله فيهنَّ، دخل الجنة)). | واتە: هەرکەسێك سێ کچ یاخود سێ خوشکی هەبێت، یان دوو کچ یاخود دوو خوشکی هەبێت، و بەجوانی بەخێویان بکات و لەبارەیانەوە پارێزکار بێت و لەخوا بترسێت، بەهەشتی بۆ هەیە. |
| ٢١ | أخرج البخاري ومسلم ومالك وأبوداود والترمذي عن عمر بن أبي سلمة رضي الله عنه قال: كنت غلاماً في حجر رسول اللهﷺ فكانت يدي تطيش في الصحفة، فقال لي رسول اللهﷺ: ((يا غلام! سمِّ الله تعالى، وكل بيمينك، وكل مما يليك))، فما زالت طعمتي بعدُ. | واتە: (عمر کوڕی ابوسلمە) دەڵێت: منداڵ بووم لەکۆشی پێغەمبەری خواداﷺ نانم دەخوارد، و دەستم لەناوقاپەکە دەگێڕا، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ڕۆڵە! ناوی خوای گەورە بهێنە، و بەدەستی ڕاست بخۆ، و لەبەردەم خۆتەوە بخۆ.. هەتا ئێستاش هەر بەوشێوەیە نان دەخۆم. |
| ٢٢ | أخرج البخاري عن ابن عباس رضي الله عنه أن النبيﷺ دخل الخلاء، قال: فوضعت له وَضوءاً، فقال: ((من وضع هذا؟)) فأُخبر فقال: ((اللهم فقهه في الدين)). | (ابن عباس) رضي الله عنه وتویەتی: کە پێغەمبەری خواﷺ چوو بۆ سەر ئاو، منیش لەو شوێنەدا ئاوم بۆ دانا، فەرموی: کێ ئەمەی داناوە؟ هەواڵی پێدرا کە من بۆم داناوە، ئەویش فەرموی: خوایە لە ئاینین شارەزای بکە. |

٢٣

أخرج الترمذي عن ابن عباسﷺ قال: كنت خلف النبيﷺ يوماً، فقال: ((يا غلام.. إني أعلمك كلمات:
أحفظ الله يحفظك.
أحفظ الله تجده تجاهك.
اذا سألت فاسأل الله.
وإذا استعنت فأستعن بالله.
وأعلم أن الأمة لو اجتمعت على أن ينفعوك بشيء، لم ينفعوك الاّ بشيء قد كتبه الله لك.
وأن اجتمعوا على أن يضروك بشيء، لم يضروك الاّ بشيء قد كتبه الله عليك. رفعت الأقلام وجفت الصحف.))
وفي رواية غير الترمذي زيادة:
((- احفظ الله تجده أمامك.
تعرف الى الله في الرخاء يعرفك في الشدة.
وأعلم: أن ما أخطأك لم يكن ليصيبك، وما أصابك لم يكن ليخطئك.
وأعلم: أن النصر مع الصبر، وأن الفرج مع الكرب، وأن مع العسر يسراً)).

واتە: (انس) وتویەتی: رۆژێکیان لە پشت پێغەمبەرﷺ بووم فەرمووی: رۆڵە! چەند وشە و قسەیەکی بەسوودت فێر دەکەم، ئاگات لە خوا بێ (فەرمانی جێبەجێ بکە و قەدەغەی مەشکێنە) خوداش دەتپارێزێ (بەچاوی رەحمەت ئاگای لە ماڵ و منداڵ و ئایینت دەبێ)، خوا بپارێزە (لە ئاگاداری خوا غافڵ مەبە)، دەبینیت خوا لەگەڵتایە (لە تەنگانەدا فریات دەکەوێ)، هەرکاتێك ویستت شتێك داوا بکەی ئەوا لەخودای داوا بکە، هەرکاتێك ویستت داوای یارمەتی بکەیت، ئەوا هەر لە خودای داوا بکەو پشت تەنها بەو ببەستە، ئەوەش بزانە گەر هەموو خەڵك کۆ ببنەوە بۆ ئەوەی سوودێکت پێ بگەیەنن، سوودیان نابێت مەگەر ئەو سوودەی کە خوا بۆی نووسیویت، وە گەر هەموو خەڵك کۆببنەوە بۆ ئەوەی زیانێکت توش بکەن، ناتوانن مەگەر ئەو زیانەی کە خوای گەورە لەسەری نووسیوی، قەڵەمەکان هەڵگیران و نووسراوەکان وشك بونەوە (واتە: قەزا و بڕیاری خوا بەسەر هەموو دروستکراوەکانیدا تەواوبوو).

لەگێڕانەوەی کەسانی تردا (جگە لە ترمـژی) ئـەم زیادەیە هەیە:
واتە: ئاگاداری خودا بە، خودا ئاگـادارت دەبـێ، لەکاتی خۆشی و هەبونیو شادیدا خودات لە یـاد بێ (خۆت بەخوا بناسێنە)، خوداش لە تەنگانـەدا

| ژ | دەق | واتە |
|---|---|---|
| | | چاكە و خراپە، هەر لە یەكەم رۆژەوە بۆ تۆ دیاریكراوەو نادرێ بە یەكێكیتر، چاك بزانە سەركەوتن لەهەموو كارێكدا لەگەڵ خۆڕاگرتنا بەیەكەوە بەستراون، و دەرو لێكردنەوەش لەگەڵ مەینەت و ناخۆشیدایە، دیسان بزانە لەگەڵ هەموو سەختیەكدا ئاسانیەك هەیە. |

| ژ | دەق | واتە |
|---|---|---|
| ٢٤ | أخرج البخاري ومسلم والترمذي وأبوداود عن أنسﷺ قال: كان رسول اللهﷺ أحسن الناس خُلُقاً، وكان لي أخ يقال له: أبو عمير -وهو فطيم- كان إذا جاءنا قال: ((يا أبا عمير! ما فعل النُّغَير؟)) لنُغَر كان يلعب به وربما حضرت الصلاة وهو في بيتنا، فيأمر بالبساط الذي تحته فيكنس ثم يُنفخ، ثم يقوم ونقوم خلفه فيصلي بنا.. }النُغَير: تصغير النُغر، وهو طائر صغير كالعصفور{. | واتە: (انس)ﷺ وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ لەهەموو كەس زیاتر رەوشتی جوان بوو، برایەكم هەبوو پێیان دەوت (ابوعمیر) -لەشیر براوبویەوە-، پێغەمبەرﷺ كە دەهاتە ماڵمان پێی دەفەرموو: ئەی (ابوعمیر) باڵندەكە چیكرد؟ بەهۆی ئەوەی كە (نُغر = باڵندە)یێكی هەبوو یاری پێدەكرد، لەوانە بوو كاتی نوێژ داهتبێت و پێغەمبەرﷺ لەماڵمان بوو، فەرمانی كرد ئەو رایەخەی ژێرمان بماڵرێت و بتەكێنرێت، پاشان هەڵدەستاو ئێمەش لەدوایەوە هەڵدەستاین و نوێژی پێدەكرین. |

| ژ | دەق | واتە |
|---|---|---|
| ٢٥ | أخرج الترمذي عن ربيعة بن شيبان قال: قلت للحسن بن عليﷺ: ما حفظت من رسول الله؟ قال: حفظت منه: ((دع ما يريبك الى ما لا يريبك، فإن الصدق طمأنينة والكذب ريبة)). | (ربیعة كوڕی شیبان) وتوویەتی: بە (حەسەن كوڕی علی)مﷺ وت: چیت لە پێغەمبەرەوەﷺ وەرگرتووەو لەبەر كردووە؟ وتی: ئەو فەرموودەیەم لەوەوە لەبەر كردووە كە دەفەرمووێ: وازبێنە لەوەی گومانی تێدایە بۆ ئەوەی كە گومانی تێدا نیە، چونكە راستی دڵنیاییەو درۆش گومانە. |

| | | |
|---|---|---|
| ٢٦ | روى ابن السني عن أبي هريرةﷺ أن النبيﷺ رأى رجلاً معه غلام، فقال للغلام: ((من هذا؟)) قال: أبي، قال: ((فلا تمش أمامه، ولا تَستَسبّ لـه، ولا تجلس قبله، ولا تدْعُهُ بإسمه)) }لا تستسب لـه: أي لا تفعل فعلاً يتعرض فيه لأن يسبك أبوك زجراً لك وتأديباً على فعلك القبيح{. | واتە: پێغەمبەرﷺ پیاوێکی بینی کوڕێکی لەگەڵدا بوو، بەکوڕەکەی فەرموو: ئەوە کێیە؟ وتی ئەوە باوکمە، فەرمووی: لەڕێگادا لەپێشیەوە مەڕۆ، و مەبە هۆی جنێودانی، و لەپێش ئەو دامەنیشە، و بەناوی خۆی بانگی مەکە. (تستسب له = مەبە هۆی جنێودانی): واتا کارێك مەکە کە باوکت تووشی ئەوە بێت جنێوت پێ بدات وەك خۆتورەکردن و ئەدەب دادانت لەسەر کارە ناشیرینەکەت. |
| ٢٧ | وروى الطبراني عن ابن عباسﷺ قال: قال رسول اللهﷺ: ((إذا نظر الوالد الى ولده فسره، كان للولد عتق نسمة)) قيل: يا رسول الله! وإن نظر ثلاثمئة وستين نظرة؟ قال: ((الله أكبر)). | واتە: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ئەگەر باوك تەماشای منداڵەکەی کرد و دڵی پێی گەشایەوە، ئەوا وەك پاداشتی ئازادکردنی بەندەیەکە بۆ کوڕەکە. وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەی ئەگەر سێسەد و شەست جار سەیری کرد؟ فەرموی: خوا گەورەترە. |
| ٢٨ | أخرج الترمذي عن أنسﷺ أن رسول اللهﷺ قال لي: ((يا بنيَّ! إن قَدَرْتَ أن تُصبح وتُمسي وليس في قلبك غشٌ لأحد فافعل))، ثم قال: ((يا بني! وذلك من سنتي، ومن أحيا سنتي فقد أحياني، ومن أحياني كان معي في الجنة)). | واتە: (انس) دەڵێ: پێغەمبەری خواﷺ پێی فەرمووم: کوڕەکەم! گەر دەتوانی شەووڕۆژ بکەیتەوە و دڵت هیچ گەردی بەرامبەر کەس تێدا نەبێت، ئەوا بیکە.. کوڕەکەم! ئەوەش لە سوننەتی منە، و هەرکەس سوننەتی من زیندوو بکاتەوە ئەوا وەك ئەوە وایە کە من زیندوو بکاتەوە، ئەو کەسەش زیندووم بکاتەوە لە بەهەشتدا لەگەڵ مندایە. |

| ژ | الحديث | واتە |
|---|---|---|
| ٢٩ | أخرج أبوداود والترمذي والنسائي عن الحسن بن علي رضي الله عنه قال: علمني رسول الله ﷺ كلمات اقولهن في الوتر: ((اللهم أهدني فيمن هديت، وعافني فيمن عافيت، وتولني فيمن توليت، وبارك لي فيما أعطيت، وقني شرَّ ما قضيت، فإنك تقضي ولا يقضى عليك، وإنه لا يذلُّ من واليت، تباركت ربنا وتعاليت)). | واتە: (حسن کوڕی علی) وتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هەندێ وشەی فێرکردم کە لە نوێژی (ویتر)دا بیڵێم: خوایە ڕێڕوونیم بکە لەگەڵ ئەوانەدا کە ڕێڕوونیت کردوون، وە سەلامەت و بێبەلاّم بکە لەگەڵ ئەوانەدا کە سەلامەتت کردوون، مشورم لێبخۆ و سەرپەرشتیم بکە لەگەڵ ئەوانەدا کە مشورت لێخواردوون، پیت و پێزم بۆ بخە ناو ئەوەوە کە پێت بەخشیوم، لە زیان و خراپەی ئەوەی کە بڕیارت داوە بمپارێزە، چونکە هەرتۆ بڕیاردەدەی و بڕیارت بەسەردا نادرێ، بێگومان هەرکەسێك تۆ پشتی بگری زەبوون نابێ، هەرکەسێك تۆ دژایەتی بکەی زاڵ نابێ، هەرتۆی پایەدار و بەرز ئەی پەروەردگارمان. |
| ٣٠ | أخرج البخاري عن سهل بن سعد رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ: ((أنا وكافل اليتيم في الجنة هكذا)) واشار بالسبابة والوسطى، وفرَّج بينهما. | واتە: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: من و سەرپەرشتکاری هەتیو لەبەهەشتدا ئاواین.. ئاماژەی بەهەردوو پەنجەی شایەتمان و پەنجەی ناوەڕاست کرد و کەلێنی تێکردن. |
| ٣١ | أخرج مسلم عن أبي هريرة رضي الله عنه أن رسول الله ﷺ: كان يؤتى بأول الثمر فيقول: ((اللهم بارك لنا في مدينتنا، وفي ثمارنا، وفي مُدِّنا، وفي صاعنا، بركةً على البركة)) ثم يعطيه أصغر من يحضره من الولدان. | (ابوهریرە) رضي الله عنه وتوویەتی: یەکەم بەری بەروبوومیان دەهێنایە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش دەیفەرموو: خوایە پیت و فەڕ بخەرە شارەکەمان و بەروبومەکانمان و کێش و پێوانەکانمان، پیت و فەڕ لەسەر پیت و فەڕ. ئینجا دەیدا بە بچوکترین منداڵ لەنێو ئامادەبواندا. |

| | | |
|---|---|---|
| ٣٢ | أخرج مسلم وأبوداود عن أنس ﷺ أن فتى من أسلم قال: يا رسول الله! إني أردت الغزو، وليس معي ما أتجهز به؟ قال: ((أئت فلاناً قد كان تجهز فمرض))، فأتاه فقال: إن رسول الله ﷺ يقرئك السلام ويقول: أعطني الذي تجهزت به، فقال: يا فلانة أعطيه الذي تجهزت به ولا تحبسي منه شيئاً، فوالله لا تحبسين منه شيئاً فيبارك لنا فيه. | واتە: (انس)ﷺ وتویەتی: کوڕێك لە (اسلم) وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ! من دەمەوێت بچمە غەزاو هیچ شتێکم پێنیە تا خۆمی پێ چەکدار و ساز و ئامادە بکەم؟ فەرمووی: بڕۆ لای فلان، ئەو خۆی ئامادەو ساز کردبوو، بەڵام نەخۆش کەوت، چوو بۆ لای و پێی وت: پێغەمبەری خواﷺ سەلامت لێدەکات و دەفەرمووێ ئەوەی خۆتت پێ ساز و ئامادە کردبوو بمدەرێ، وتی: ئافرەت! ئەوەی خۆمم پێ ساز و ئامادەکردبوو بیدەرێ و هیچی لێ گل نەدەیتەوە، سوێند بەخوا هەرچی لێ گل دەیتەوە خوا فەڕ و بەرەکەتی ناخاتە ناویەوە. |
| ٣٣ | أخرج البخاري ومسلم والنسائي عن أنسﷺ أن رسول الله ﷺ قال: ((والذي نفسي بيده! لا يؤمن أحدكم حتى أكون أحب اليه من والده وولده والناس أجمعين)). | واتە: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: سوێند بەوەی نەفسی منی بەدەستە! باوەڕی کەستان تەواو دانامەزرێ تا منی لە دایك و باوك و منداڵەکانی و گشت خەڵك زیاتر خۆش نەوێت. |
| ٣٤ | أخرج البخاري عن ابن عباسﷺ قال: كان رسول اللهﷺ يعوّذُ الحسن والحسين: ((أُعيذكما بكلمات الله التامّة، من كل شيطان وهامّة، ومن كل عين لامّة)) ويقول: ((إن أباكما كان يُعوّذ بها اسماعيل واسحاق)). | واتە: (ابن عباس)ﷺ وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ (حسن) و (حسین)ی پەنا دەداو دەیفەرموو: پەنای هەردووکتان دەدەم بە هەموو وشە تەواوەکانی خوای گەورە، لەهەموو شەیتانێك و هەموو ژەهردارێك و لەهەموو چاوێکی پیس.<br>وە دەیفەرموو: (ابراهیم)ی باوکتان بەمە پەنای (اسماعیل) و (اسحاق)ی دەدا. |

| | | |
|---|---|---|
| ٣٥ | أخرج البخاري ومسلم وأبوداود وأحمد عن أنس بن مالكﷺ قال: خدمت النبيﷺ عشر سنين، والله ما قال لي أفّ قط ولا قال لشيء لم فعلت كذا وهلا فعلت كذا؟<br>وفي رواية مسلم (زيادة): كان رسول اللهﷺ من أحسن الناس خُلُقاً، فأرسلني يوماً لحاجة، فقلت: والله لا أذهب، وفي نفسي أن أذهب لما أمرني به نبيُّ اللهﷺ، فخرجت حتى أَمُرَّ على الصبيان وهم يلعبون في السوق، فإذا برسول اللهﷺ بقفاي من ورائي، فنظرت اليه وهو يضحك، فقال: ((يا أُنَيس! ذهبتَ لما أمرتُك؟)) قال: قلت: نعم أنا أذهب يا رسول الله، قال أنس: والله لقد خدمته تسع سنين ما علمته قال لشيء صنعته لم فعلت كذا أو كذا؟ أو لشيء تركته: هلا فعلت كذا وكذا؟<br>وفي رواية أحمد (زيادة): قال أنس: خدمت النبيﷺ عشر سنين فما أمرني بأمر فتوانيت عنه أو ضيعته فلامني، فإن لامني أحد من أهل بيته الاّ قال: **((دعوه فلو قدر أو قال قضي أن يكون كان))**. | (انس کوڕی مالك) دەڵێت: دە ساڵ خزمەتی پێغەمبەری خوامﷺ کرد، سوێند بەخوا هەرگیز پێی نەوتم ئۆف، و هەرگیز بە شتێکی نەوتووە بۆ وات کرد یان وات بکردایە.<br>لە گێڕانەوەی (مسلم)یشدا هاتووە: پێغەمبەرﷺ لەهەموو کەس ڕەوشت جوانتر بوو، ڕۆژێکیان ناردمی بۆ پێویستیەك، وتم: بەخوا ناچم، لە دەروونیشمدا وام دانابوو کە بچم بۆ ئەو کارەی پێغەمبەرﷺ فەرمانی پێکردم، چومە دەرەوە تا بەلای ئەو منداڵانەدا تێپەڕ ببم کە لەبازاڕ یاریان دەکرد، ئەوەندەم زانی پێغەمبەری خواﷺ لەدواوە پشت ملی گرتم، کە تەماشایم کرد پێدەکەنی، فەرموی: (ئەنیسۆکە) بۆ ئەو شوێنە ڕۆیشتی کە فەرمانم پێکردی؟ دەڵێ: وتم: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خواﷺ ئێستا دەچم.. (انس) دەڵێ: وەڵاهی نۆ ساڵ خزمەتی پێغەمبەرم کردووە نەمزانیوە ڕۆژێك شتێکم کردبێ و فەرمویێتی ئاواو ئاوات بۆ کرد؟ یاخود شتێك کە وازم لێهێنابێت پێی نەوتووم: دەبو ئاوا وئاوات بکردایە.<br>لە گێڕانەوەی (احمد)یشدا (انس)ﷺ دەڵێت: دەساڵ خزمەتی پێغەمبەرمﷺ کرد، لەسەر هیچ فەرمانێکی کە پێی کردبم و دوام خستبێت یان نەمکردبێت سەرزەنشتی نەکردووم، خۆ ئەگەر یەکێکیش لە خاووخێزانەکەی سەرزەنشتیان کردبام دەیفەرموو: وازی لێبێنن، ئەگەر قەدەر وابوایە کە ببێ دەبوو. |

| | | |
|---|---|---|
| ٣٦ | أخرج الإمام أحمد والبخاري ومسلم - واللفظ لأحمد- عن ثابت (البناني) عن أنس رضي الله عنه قال: خدمت رسول الله ﷺ يوماً حتى اذا رأيت أني فرغت من خدمتي، قلت: يقيل } أي ينام بعد الظهر { رسول الله ﷺ، فخرجت الى الصبيان يلعبون، قال: فجئت أنظر الى لعبهم، قال: فجاء رسول الله ﷺ فسلم على الصبيان وهم يلعبون، فدعاني رسول الله ﷺ فبعثني الى حاجة له، فذهبت فيها وجلس رسول الله ﷺ في فيء حتى أتيته، وأحتبست عن أمي عن الإتيان الذي كنت آتيها فيه، فلما أتيتها قالت: ما حبسك؟ قلت: بعثني رسول الله ﷺ في حاجة له، قالت: وما هي؟ قلت: هو سرٌّ لرسول الله، قالت: فاحفظ على رسول الله ﷺ سره، قال ثابت: قال لي أنس: لو حدثت به أحداً من الناس، أو لو كنت محدّثاً به لحدثتك به يا ثابت. | واتە: (انس) رضي الله عنه وتوویەتی: رۆژێکیان خزمەتی پێغەمبەری خوام ﷺ دەکرد، کە سەیرم کرد نیش و کارەکەم تەواو بووە، وتم: پێغەمبەری خوا ﷺ دوای نیوەڕۆیەو دەخەوێت، چومە دەرەوە بۆ لای منداڵان یاریان دەکرد، دەڵێت: منیش سەیری یاریەکەیانم دەکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ هات بە لامانداو سەلامی لە منداڵەکان کرد کە یاریان دەکرد، و بانگی کردم و ناردمی بۆ کارێکی خۆی، و پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەر سێبەرێك دانیشت تا گەڕامەوە، درەنگ کەوتم لەو کاتەی دەگەڕامەوە بۆلای دایکم، کە گەڕامەوە لای وتی: چی درەنگی خستی؟ وتم: پێغەمبەری خوا ﷺ ناردمی بۆ کارێکی خۆی، وتی: ئەو کارە چیبوو؟ وتم: نهێنی پێغەمبەرە ﷺ، وتی: نهێنی پێغەمبەری خوا ﷺ بپارێزەو لای کەس مەیڵێ، (ثابت) دەڵێ: (انس) پێی وتم: ئەگەر بۆ کەسێکم بگێڕایەتەوە یا باسم بکردایە، ئەوا ئەی (ثابت) بۆ تۆم باس دەکرد. |

| | | |
|---|---|---|
| ٣٧ | روى أحمد عن عبدالله بن الحارث رضي الله عنه قال: كان رسول الله ﷺ يَصُفُّ عبدالله و عبيدالله و كثيراً بني العباس رضي الله عنهم ثم يقول: ((من سبق اليَّ فله كذا وكذا)) قال: فيستبقون اليه فيقعون على ظهره وصدره، فيقبلهم يلتزمهم. | واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ (عبداللە) و (عبیداللە) و (کثیر)ی نەوەکانی (عباس)ی ریز دەکرد و دەیفەرموو: ئەوەی پێشتر بگاتە لام ئەوەو ئەوەی پێدەدەم.. ئەوانیش رایان دەکرد بۆ لای و دەکەوتن بەسەر پشت و سینگیدا، پێغەمبەری خوا ﷺ ماچی دەکردن و بەخۆیەوە دەگرتن. |

| | | |
|---|---|---|
| ٣٨ | روى ابو يعلى وابن عساكر عن زيد بن ثابتﷺ قال: أُتيَ بي عند مقدمه الى المدينة، فقالوا: يا رسول الله! إن هذا غلام من بني النجار، قد قرأ مما أنزل عليك سبع عشرة سورة، فقرأت على رسول اللهﷺ فأعجبه، فقال: ((يا زيد! تعلم لي كتاب يهود، فإني والله ما آمن اليهود على كتابي)) فتعلّمته، فما مضى لي نصف شهر حتى حذقته، فكنت أكتب لرسول اللهﷺ إذا كتب اليهم، وأقرأ كتبهم إذا كتبوا اليه.<br>وعندهما أيضاً وابن أبي داود عن زيد: قال لي رسول اللهﷺ: ((أتحسن السريانية، فإنها تأتيني كتب؟)) قلت: لا، قال: ((فتعلمها)) فتعلمتها في سبعة عشر يوماً. | (زيد كوڕی ثابت)ەوە دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: کاتێك پێغەمبەری خواﷺ هاتە مەدینە، بردمیانە خزمەتی، وتیان: ئەی پێغەمبەری خواﷺ! ئەم منداڵە لە هۆزی (بنی نجار)ەو حەڤدە سورەتی لەوەی بۆ تۆ دابەزیوە خوێندوە، منیش بۆم خوێندنەوە، زۆری بەلاوە چاك بوو، فەرمووی: ئەی زید! خۆت بۆم فێری زمانی جولەکە بکە، چونکە وەڵاهی دڵنیا نیم لە جولەکەکان بۆ نامەکانم.<br>دەڵێ: نیومانگ تێنەپەڕی منیش فێری بووم و تەواو شارەزا بووم، جا کاتێ پێغەمبەری خواﷺ نامەی بنووسیایە من بۆم دەنووسی، و نامەیان بۆ بنووسیایە من دەمخوێندەوە.<br>هەر ئەو دوانە لەگەڵ (ابوداود) لە (زید)ەوە گێڕاویانەتەوە کەدەڵێ: پێغەمبەری خواﷺ پێی فەرمووم: ئایا سریانی باش دەزانی، چونکە نامەم بەو زمانە بۆ دێت؟ منیش وتم: نەخێر، فەرمووی: فێری ببە. منیش لەماوەی حەڤدە ڕۆژدا فێری بووم. |

| | | |
|---|---|---|
| ٣٩ | أخرج البخاري والترمذي وأبوداود عن عبدالله بن عباس قال: كان الفضل بن العباس رديف رسول اللهﷺ، فجاءته امرأة من خشعم تستفتيه، فجعل الفضل ينظر اليها وتنظر اليه، فجعل رسول اللهﷺ يصرف وجه الفضل الى الشق الآخر. | واتە: (فضل کوڕی عباس) لە دوای پێغەمبەری خواﷺوە بوو، ئافرەتێکی هۆزی (خشعم) هاتبووە خزمەتی بۆ پرسیار کردن لێی، جا (فضل) سەیری ئافرەتەکەی دەکرد و ئەویش سەرنجی ئەمی دەدا، پێغەمبەری خواﷺ ڕووی (فضل)ی بەرەو ئەولا وەرگێڕا. |

| ٤٠ | روى أحمد والطبراني عن أبي أمامة" أن فتىً من قريش أتى النبيﷺ فقال: يا رسول الله! أئذن لي في الزنا، فأقبل القوم عليه وزجروه، فقالوا:..مه..مه، فقال: أدنه، فدنا منه قريباً، فقال: أتحبه لأمك؟ قال لا والله جعلني فداك، قال: ولا الناس يحبونه لأمهاتهم،، قال: أفتحبه لابنتك؟ قال: لا والله يا رسول الله جعلني الله فداك، قال: ولا الناس يحبونه لبناتهم، قال: أفتحبه لأختك؟ قال: لا والله يا رسول الله جعلني الله فداك، قال: ولا الناس يحبونه لأخواتهم، قال: أتحبه لعمتك؟ قال: لا والله يا رسول الله جعلني الله فداك، قال: ولا الناس يحبونه لعماتهم، قال: أتحبه لخالتك؟ قال: لا والله يا رسول الله جعلني الله فداك، قال: ولا الناس يحبونه لخالاتهم، قال: فوضع يده عليه، وقال: ((اللهم أغفر ذنبه، وطهر قلبه، وحصّن فرجه)) قال: فلم يكن بعد ذلك الفتى يلتفت الى الشيء. | واتە: لاوێکی قورەیشی هاتە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ مۆڵەتم بدە زینا بکەم، ئەو خەڵکەی لەوێ ئامادە بوون نارەزاییان دەربڕی و سەرزەنشتیان کرد و وتیان: مەهـ.. مەهـ..<br>پێغەمبەری خواﷺ فەرموی: نزیك بەوە، گەنجەکە نزیك بووەوە لێی.<br>فەرمووی: حەز دەکەیت زینا لەگەڵ دایکت بکرێت؟ وتی: نابەخوا، خوا بمکات بە فیدات. فەرمووی: خەڵکیش بۆ دایکیان حەز ناکەن، ئەمجا فەرمووی: حەزدەکەیت زینا لەگەڵ کچەکەتدا بکرێت؟ وتی: نا بەخوا، خوا بمکات بە فیدات. فەرمووی: خەڵکیش بۆ کچەکانیان حەزی لێناکەن. ئەمجا فەرمووی: حەز دەکەیت زینا لەگەڵ خوشکەکەتدا بکرێت؟ وتی: نا بەخوا، خوا بمکات بە فیدات. فەرمووی: خەڵکیش بۆ خوشکیان حەز ناکەن. فەرمووی: حەز دەکەیت کە زینا لەگەڵ پورت(خوشکی باوکت)دا بکرێت؟ وتی: نا بەخوا، خوا بمکات بە فیدات. فەرمووی: خەڵکیش بۆ پور(خوشکی باوك)یان حەز ناکەن. فەرمووی: حەز دەکەیت کە زینا لەگەڵ پورت(خوشکی دایکت)دا بکرێت؟ وتی: نا بەخوا، خوا بمکات بە فیدات. فەرمووی: خەڵکیش بۆ پور(خوشکی دایك)یان حەز ناکەن. دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ دەستی خستە سەر سینگی و فەرمووی: خوایە لەگوناهی خۆش ببە، دڵی پاك کەرەوە، داوێنی بپارێزە.<br>دەڵێت: پاش ئەوە گەنجەکە ئاوڕی بۆ هیچ شتێك نەدەدایەوە. |
|---|---|---|

# ناوەڕۆك